# ئینسایكلۆپیدیای دەرمان

دانـــــانـــی: جلال حاجی غوڵام & هاوكار علی احمد

پێداچوونەوەی (پزیشكی دەرمانسان):

د. صادق محمد رۆستەم   د. مقداد محمد عمر






- گـــروپەكانی دەرمـــــان
- لیستی هەموو دەرمانە گیاییەكان
- لیستی هەموو دەرمانە كیمیاییەكان


انتشارات ئاوین



# ئینسایکلۆپیدیای دەرمان


**ئامادەکردن و وەرگێران:** جلال حاجی غولام & هاوکار علی احمد

**تایپ:** جلال حاجی غولام ( ژ.م/ ٠٧٥٠٣٠٥٤٩٤٠ )

**دیزاین:** جمال غولام احمد

**رازاندنەوەی لاپەڕەکان:** بەرزان حسەینی

**تەرحی ڕوویەرگ:** ئەویندارا ن ( ژ.م/ ٠٩١٨٧٧٥٤٤٠٤ )

چاپی یەکەم، بەهاری ساڵی (٢٠١٣)، تیراژ ١٠٠٠ دانە

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان**

**ژمارەی ( ١٤٦٨ ) ی ساڵی ( ٢٠١٣ )ی پێ دراوە.**

**ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەوین:** مەریوان- کۆتایی شەقامی مەردۆخ

Email: awin٩٨٠٤@gmail.com Tel: ٠٨٧٥ ٣٢٢٦٦٦۴ -٠٩١٨٧٧۵۴۴٠۴

Web: www.awinbook.com

| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | حاجی غلام، جلال، ١٣۶٨ - |
| عنوان و نام پدیداور | : | ئینسایکلوپیدیای دەرمان/ ئامادەکردن ووەرگیران جلال حاجیغولام. |
| مشخصات نشر | | مریوان: ئەوین، ١٣٩٢. |
| مشخصات ظاهری | : | ٨٠٨ص. |
| شابک | : | ٩٧٨-۶٠٠-۶٨١۴-١٩-٣: |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی. نمایه |
| موضوع | : | داروشناسی — دایرەالمعارفها |
| رده بندی کنگره | : | ١٣٩٢ ٩ی٢ح/RS۵١ |
| رده بندی دیویی | : | ۶١۵/١٠٣ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ٣١۶٠٠۵۵ |

ISBN:٩٧٨-٦٠٠-٦٨١٤-١٩-٣


**نرخی ( ١٦٠٠٠ ) دینارە**

# ئینسایكلۆپیدیای دەرمان

## دانـــــــانی:


جلال حاجی غولام

هاوكار علی احمد


پێداچوونەوەی ( پزیشكی دەرمانساز ):


د. صادق محمد ڕۆستەم      د. مقداد محمد عمر






Awin Publications

ناوەندی چاپ و بڵاوكردنەوەی ئەوین

## پێشکەشە :

- ❖ بە باوک و دایکم کە هەمیشە و هەردەم لە خەمی تێگەیاندن و پێگەیاندنما بوون.
- ❖ بە عاشقان و شەیدایانی ڕێبازە جوانەکەی پێغەمبەری ئازیز (د.خ).
- ❖ بە هەموو شەیدایان و دۆستانی زانست.
- ❖ بەو کەسەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان وشەیەکی فێرکردووم.



بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**پێشەکی:**

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی کە زانست و زانیاری لەسەروی هەموو زانست و زانیارییەکی‌ترەوەیە و هەموو زانست و زانیارییەکان بەخششی پەروەردگارن و هیچ زانست و زانیارییەکمان نییە، جگەلەوەی کە خودای زانا و دانا پێی‌بەخشیوین.

لەبەر نەبوونی سەرچاوەیەکی دەرمان بەشێوەیەکی وەها و بە زمانی کوردی و بەکورتی و پوختی باس لە دەرمان بکات و بۆ ئەوەی کوردیش وەك هەموو نەتەوەیەکی‌تر بتوانێت بەهرەمەند بێت لە زانستی دەرمان و چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵی و بەکارهێنانی لە شوێنی گونجاودا و بۆ مەبەستی گونجاو، هەروەها بۆ ئاگادارکردنەوەی تاکی کورد لە زیان و کاریگەرییەکانی دەرمان و دوورکەوتنەوە لەوەی کە بەبێ دەستوری پزیشك دەرمان بەکاربهێنین، ئەم بەرهەمەمان پێکهێنا.

بەرزکردنەوەی توانای دەرونی و زیادبوونی باوەڕبەخۆبوون لە ناخی کەسەکاندا لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی سادە کە بەبێ دەرمان خۆیان چارەسەر دەبن و بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بەشێوەیەکی هەڕەمەکی و بەبێ دەستوری پزیشك و دوورکەوتنەوە لەدروستکردنی نەخۆشی بەهۆی لاوازی باری دەروونی. بەڕاستی دەرمان شوێنەواری خراپ و کاریگەری نێگەتیڤ بەجێدەهێڵێت، ئەگەر بەگونجاوی بەکارنەهێنرێت!

شایانی باسە ئەم کتێبە بەشێوەیەکی وەها دانراوە کە هەر کەسێك بتوانێت بخوێنێت و بنوسێت، دەتوانێت سودی لێ وەربگرێت. هیچ کارێك بێ‌هەڵە نییە، جگە لەکاری خودای گەورە. بە ڕەخنە و پێشنیارەکانتان گەورەمان بکەن.


بەڕاستی دەرمان
شوێنەواری خراپ و
کاریگەری نێگەتیڤ
بەجێدەهێڵێت،
ئەگەر بەگونجاوی
بەکارنەهێنرێت!



**ئەباكاڤیر:** ABACAVIR

**ناوی بازرگانی:** Ziagen

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراكی ٢٠ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەكارهێنان:** لەگەڵ دەرمانە دژەڤایرۆسەكانی تردا دژی هەوكردنی جۆری ڤایرۆسی كەمبوونەوەی بەرگری لەشی مرۆڤ (HIV) بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** هێڵنجدان، ئازاری سك، تا، ڕشانەوە، تێكچوونی خەو، سكچوون، ئازار، پەڵە، بلۆقكردن، نەمانی ئارەزوی خواردن، هەستیاربوون بە ڕوناكی، هیلاكی.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٦٠٠ میلیگرام لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشكراودا. منداڵانی ٣ مانگ تا ١٢ ساڵ ٨ میلیگرام/كیلۆگرام هەموو ١٢ سەعاتێك. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٦٠٠ میلیگرامە. كێشی ١٤ تا ٢١ كیلۆگرام ١٥٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك، كێشی ٢١ تا ٣٠ كیلۆگرام ١٥٠ میلیگرام لە بەیانی و ٣٠٠ میلیگرام لە ئێوارەدا، كێشی سەروی ٣٠ كیلۆگرام ٣٠٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك.

**ئەباكاڤیر و لامیوڤودین:** ABACAVIR & LAMUVODINE

**ناوی بازرگانی:** Epzicom

**شێوەی دەرمان:** حەبی (ئەباكاڤیر سەلفەیت ٦٠٠ میلیگرام و لامیڤودین ٣٠٠ میلیگرام).

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەكارهێنان:** دژی هەوكردنی ڤایرۆسی HIV بەكاردێت كە ئەبێتە هۆی ئایدز.

**كاریگەری لاوەكی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سكچوون، ئازاری سك، تا، پەڵە، ئازار، هیلاكبوونی گشتی، كۆكە، زەردبوونی چاو پێست، كەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، خەمۆكی، سەرئێشە، تێكچوونی خەو، دڵەڕاوكێ، لەرزین، گێژی.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان و تەمەنی سەروی ١٢ ساڵ كێشی سەروی ٤٠ كیلۆگرام ١ حەب ڕۆژانە ١ جار.



## ئەباکاڤیر و لامیوڤودین و زیدۆڤودین: ABACAVIR & LAMUVODINE & ZIDOVUDINE

**ناوی بازرگانی:** Trizivir

**شێوەی دەرمان:** حەبی (ئەباکاڤیر سەلفەیت ۳۰۰ میلیگرام و لامیڤودین ۱۵۰ میلیگرام و زیدۆڤودین ۳۰۰ میلیگرام).

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەتەنها یان لەگەڵ دەرمانەکانی تردا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن. سکچوون، سەرئێشە، ئازاری ماسولکە و جومگە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، بێهێزی، هیلاکبون، تا، پەڵە، ئازاری سك، خوران، بەگرانی هەناسەدان، کۆکە، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەروی ۱۸ساڵ ۱ حەب ڕۆژانە ۲ جار.

## ئەباریلیکس: ABARELIX

**ناوی بازرگانی:** Plenaxis

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی ماسولکەیی.

**گروپی دەرمان:** Anticancer

**بەکارهێنان:** بڕی تیستۆستیرۆن کەم دەکاتەوە لەلەشدا و وەك ئازارکەمکەرەوە لە چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتووی پرۆستاتدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی خەو، گەورەبوونی مەمك و ئازار. سکچوون، قەبزی، ئاوسان، هێڵنجدان، گێژی، سەرئێشە، هیلاکبوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۱۰۰ میلیگرامیان پێ دەدرێت لەناو ماسولکەدا بەسمت لەڕۆژی ۱ و ۱۵ و ۲۹ (٤ هەفتە) هەموو ٤ هەفتەیەك دوای ئەو.

## ئەباتاسێپت: ABATACEPT

**ناوی بازرگانی:** Orencia

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ۲۵۰ میلیگرام/۱۰ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Immunomodulator



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری رۆماتیزم و بەرگری لە تێکچوونی جومگەکان و بۆ چارەسەری هەوکردنی جومگەکان لەو منداڵانانەی بەلانی کەمەوە تەمەنی ٦ ساڵن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك، سکچوون، هێڵنجدان، سوربونەوە، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، گێژی، هیلاکبوون، تێکچوونی بینین، خەمۆکی، قەلەقی، هەوکردنی چاو، کۆکە، سەرگێژبوون، وشکبوونەوەی پێست، هەڵوەرینی موو، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، نەکەوتنە بێ نوێژی، سەرئێشە، هەوکردنی گەدە، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان کەمتر لە ٦٠ کیلۆگرام ٥٠٠ میلیگرام، ٦٠ تا ١٠٠ کیلۆگرام ٧٥٠ میلیگرام، زیاتر لە ١٠٠ کیلۆگرام ١ گرام بە IV بۆ زیاتر لە ٣٠ خولەك، دووبارەکردنەوەی لە ٢ و ٤ هەفتەدا پاشان هەموو ٤ هەفتەیەك. منداڵانی ٦ تا ١٧ ساڵ ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام (کەمتر لە ٧٥ کیلۆگرام)، کێشی ٧٠ تا ١٠٠ کیلۆگرام ٧٥٠ میلیگرام، IV×١ هەفتە ٠، ٢، ٤، پاشان هەموو هەفتەیەك (زیاتر لە ١٠٠ کیلۆگرام، وەك دۆزی گەورەکان).

## ئەبسیکسیماب: ABCIXIMAB

**ناوی بازرگانی:** ReoPro

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiplatelet

**بەکارهێنان:** دژی کەڵەکەبوونی پەرەکانی خوێنە و بۆ بەرگری لە سیسبوونی دڵ و جەڵدەی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە. تا، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، ئازاری پشت، کەمبوونەوەی پەرەکانی خوێن، خوێنبەربوون، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی دەرزی IV ٢٥٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام. بەڕێگەی IV ئینفیوشن ١٢٥ نانۆگرام/کیلۆگرام/خولەك. لایەنی زۆر بڕی دەرمان ١٠ مایکرۆگرام/خولەك.

## ئەبیراتیرۆن: ABIRATERONE

**ناوی بازرگانی:** Zytiga

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiandrogen

**بەکارهێنان:** لەگەڵ پریدنیزۆن بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پرۆستات بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ئازاری بەشی سەرەوەی سك، خوران، نەمانی ئارەزوی خواردن، تێکچوونی گەدە، زەردبوون، کۆکە، زۆرمیزکردن، ئارەقکردنەوە. سکچوون، دڵەکزە، کەمبوونەوەی کێش.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۱۰۰۰ میلی‌گرام بەشێوەی خۆراکی ڕۆژانە ۱ جار لەگەڵ ٥ میلی‌گرام پریدنیزۆن بەشێوەی خۆراکی ڕۆژانە ۲ جار.

## ئەبرەیسف ئە یجنت: AGENT ABRASIVE

**ناوی بازرگانی:** Brasivol

**شێوەی دەرمان:** مەعجونی no.۱ ئەلەمنیۆم ئۆکساید ۳۸,۰۹٪.

**گروپی دەرمان:** Antiacne

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیپکەی ئاسایی بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** لە جیاتی صابون بەکاردێت ڕۆژانە ۱ تا ۳ جار.

## ئەی – سی – ئەی: A-C-A

**ناوی بازرگانی:** Excedrin

**شێوەی دەرمان:** حەبی (ئەسیتامینۆفین ۱٦۲,٥ میلی‌گرام و کافائین ۳۲,٥ میلی‌گرام و ئەسپرین ۳۲٥ میلی‌گرام).

**گروپی دەرمان:** دژە ئازار Analgesic

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و تا و ئیلتیهاب بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان. ڕشانەوە، تێکچوونی هەرس، تێکچوونی گورچیلە، برینی دەستگای هەرس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان هەر ۳ تا ٤ سەعاتێك لەکاتی پێویست لایەنی زۆر ۸ حەب لە ڕۆژێکدا لایەنی زۆر تا ۱۰ ڕۆژ. منالآنی ۹ تا ۱۲ ساڵ ۱ حەب هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك لایەنی زۆر ڕۆژانە ٥ بڕی دەرمان. منالآنی ٤ تا ۹ ساڵ نیوەی حەبێك هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك لایەنی زۆر ڕۆژانە ٥ بڕی دەرمان. منالآنی ۲ تا ٤ ساڵ ۱ بەش لە ۳ بەشی حەبێك هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك لایەنی زۆر ڕۆژانە ٥ بڕی دەرمان. لە منداڵان و کەسانی بەتەمەن لایەنی زۆر تا ٥ ڕۆژ بەکاردەهێنرێت.

## ئەکامپرۆسەیت: ACAMPROSATE

**ناوی بازرگانی:** Campral

**شێوەی دەرمان:** حەبی ۳۳۳ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antialcoholic agent



**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری ئەو كەسانە بەكاردێت، كەخویان بە ئەلكهولەوە گرتووە.

**كاریگەری لاوەكی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سكچوون، ئازاری سك، غازات. خوران و سووربونەوە، ئارەقكردنەوە، گێژی، دڵەڕاوكێ، خەمۆكی، پەككەوتنی دڵ پەڵە، بێخەوی.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ٦٦٦ میلیگرام بەشێوەی خۆراكی ڕۆژانە ٣ جار.

## ئاكاربۆز: ACARBOSE

**ناوی بازرگانی:** Precose, prandese

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی

**گروپی دەرمان:** Hypoglycemic

**بەكارهێنان:** دژی نەخۆشی شەكرەی جۆری ٢ (شەكرەی ناپەیوەست بەئەنسۆلین) بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** هێڵنجدان، نەمانی ئارەزوی خواردن، خوێنبەربوون. خوران، خراپی ئیشی جگەر، هەوكردنی جگەر، زەردی، ئازاری سك، سكچوون، غازات، تێكچوونی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ٢٥ میلیگرام ٣ جار لەڕۆژێكدا لەگەڵ خۆراكدا. بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو ٥٠ تا ١٠٠میلیگرام ٣ جار لەڕۆژێكدا لەگەڵ خۆراكدا.

## ئەسیبیتۆلۆل: ACEBUTOLOL

**ناوی بازرگانی:** Sectral

**شێوەی دەرمان:** كەپسولی ١٠٠ و ٢٠٠میلیگرامی و حەبی ٤٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Beta-blocker

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری سنگ و نارێكی لێدانی دڵ بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** گێژی، سەرئێشە، هیلاكبون، ئازاری سنگ، پەككەوتنی دڵ بەگرانی هەناسەدان، بێخەوی، دڵەڕاوكێ، كەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، ئازاری سك.

بڕی دەرمان: بۆ پەستانی بەرزی خوێن ٤٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار یان ٢٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار. ئەگەر پێویست بێت پاش ٢ هەفتە زیاددەكرێت بۆ ٤٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار. بۆ ئازاری سنگ ٤٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار یان ٢٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار. ٣٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار لە ئازاری توندی سنگدا ڕۆژانە سەروی ١,٢ گرام بەكاردێت. بۆ نارێكی لێدانی دڵ ڕۆژانە ٠,٤ تا ١,٢ گرام لە ٢تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشكراودا.

**ئەسیکلۆفیناك:** ACECLOFENAC

**ناوی بازرگانی:** Almiral

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهابات و ئازار و ئیلتیهاب لە ڕۆماتیزم و هەوکردنی جومگەکان و فەقەرەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تەشەنوج، سەرئێشە، سەرگێژبوون، ئازاری سك، سکچوون، قەبزی، ئازاری قەفەسەی سنگ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، خوران، پەڵە، بیرۆ، هەستیاربوون بەڕوناکی، هێڵنجدان، گەورەبوونی سك، خوێنبەربوون، دروست بوونی برینی گەدەو دوانزەگرێ، کەمخوێنی، تەنگەنەفەسی، کەمبوونەوەی کێش، شەوکوێری، ڕەبۆ، کەمبوونەوەی شەکری خوێ، سوتانەوەی چاو، تێکچوونی پلەی گەرمی لەش، کەمبوونەوەی توانای بیستن، ڕوشان، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠ میلی گرام ڕۆژانە ٢ جار.

**ئەسیمیتاسین:** ACEMETACIN

**ناوی بازرگانی:** Emflex

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٦٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهاباتی نەخۆشی ڕۆماتیزم و تێکچوونی پەیکەرەماسوکە و بۆ نەهێشتنی ئازاری پاش نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان. ڕشانەوە، سەرگێژبوون، کەمخوێنی، پەڵە، تێکچوونی دەروونی، تەشەنوج، حەساسیەت، ئۆدیما، تێکچوونی بینین، ڕوشانی کۆم، خوێنبەربوونی گەدە، ناتەواوی توندی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٢٠ میلی گرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.ئەگەر پێویست بکات زیاد دەکرێت بۆ ١٨٠ میلی گرام ڕۆژانە.

**ئاسینۆ کیومارول:** ACENOCUMAROL

**ناوی بازرگانی:** Sinthrom , Acenocunarin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ و ٤ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** دژی خوێن مەیین Anticoagulant



**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری لە مەیینی خوێن و کەمبوونەوە یان ڕێنەدان بە ڕۆیشتنی خوێن لە نەخۆشی ڕۆماتیزمی دڵ یان لەرینەوەی گوێچکەڵەیی، بۆ پێشگرتن پاش لە ناشتنی دەستکردی زمانەی دڵ، بۆ پێشگرتن و چارەسەر لە مەیین و کڵۆبوونی خوێنی دەمار (خوێنهێنەر) و داخستن و مەیینی خوێنی دەماری سی و بۆ حەملە کۆتاکانی سیسبوون، جەڵدەی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، زەردی، خرابی فرمانی جگەر، هەوکردنی پەنکریاس، تا، هەڵوەرینی موو، پەڵە، لیر، هەوکردنی پێست، کەمبوونەوەی خرۆکەی سپی خوێن، مۆربوونەوەی پەنجەکانی پێ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤ میلیگرام لە ڕۆژی یەکەم و ٤ تا ٨ میلیگرام بڕی دەرمانی جێگیری ئاسایی ڕۆژانە ١ تا ٨ میلیگرام ڕێکدەخرێت بەپێی کاردانەوە.

## ئەسیتامینوفین کوداین: ACETAMENOPHEN CODEINE

**ناوی بازرگانی:** Acet-codeine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠/٣٠٠ میلیگرام (ئەسیتامینۆفین ٣٠٠ میلیگرام +کۆداین فۆسفەیت ٢میلیگرام) و کەپسول و سەسپێنشن.

**گروپی دەرمان:** دژە ئازار Analgesic

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی جگەر، گێژی، پەڵە، خوران، برینی دەم، سکچوون، ڕشانەوە، هێڵنجدان، ئازاری سك، تا، کەمبوونەوەی شەکری خوێن، هەناسە توندی.

**بەکارهێنان:** دژی ئازارە سوك و توندەکان و تا بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:**

گەورەکان ٣٢٥ تا ٤٥٠میلیگرام لەهەر ٤تا ٦سەعات دا یەك جار.

منداڵان١١تا ١٢ساڵ ٤٨٠میلیگرام لەهەر ٤تا ٦سەعات دا یەك جار.

منداڵان ٩تا ١٠ساڵ ٤٠٠ میلیگرام لەهەر ٤تا ٦سەعات دا یەك جار.

منداڵان ٦تا ٨ساڵ ٣٢٠ میلیگرام لەهەر ٤ تا ٦سەعات دا یەك جار.

منداڵان ٥ ساڵ ٢٤٠ میلیگرام لەهەر ٤ تا ٦سەعات دا یەك جار.

نابێ بەخوار ٥ ساڵ بدرێت لەبەر زیانەکانی.



## ئەسیتا مینوفین: ACETAMENOPHEN

**ناوی بازرگانی:** Panadol,paracetamol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلی‌گرامی ٣٢٥ میلی‌گرام و ٦٥٠ میلی‌گرامی و حەبی کرماندن ٨٠ و ١٦٠ میلی‌گرامی و قەترەی ١٠٠ میلی‌گرام و شافی ٨٠ و ١٢٠ و ١٢٥ و ٣٢٥ و ٦٥٠ میلی‌گرام و گیراوەی خۆراکی ١٢٠ میلی‌گرام و ١٠٠ میلی‌گرامی هەیە وئۆراڵ سەسپێنشن ١٢٠ میلی‌گرامی و دەرزی ١٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر , ١٠٠٠ میلی‌لیتر (IV، IM) و دەرزی١٥٠ میلی‌گرام/میلی لیتر, ٢ میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Analgesic

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و تا و ئیلتیهاب بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی جگەر.

**بڕی دەرمان:**

بۆ گەورەکان و گەورەترلە ١٢ساڵ ٦٥٠ تا ٣٢٥میلی‌گرام یەك جار.

مناڵانی ١١ تا ١٢ساڵ ٤٨٠ میلی‌گرام هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك یەك جار.

مناڵانی ٩ تا ١٠ساڵ ٤٠٠ میلی‌گرام هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك یەك جار.

مناڵانی ٦ تا ٨ساڵ ٣٢٠ میلی‌گرام هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك یەك جار.

منالانی ٥تا ٤ساڵ ٢٤٠ میلی‌گرام هەر ٤تا٦ سەعاتێك یەك جار.

منالانی ٣تا ٢ساڵ ١٦٠ میلی‌گرام هەر ٤تا ٦ سەعاتێك یەك جار.

منالانی ١٢تا ٢٤مانگ ١٢٠ میلی‌گرام هەر ٤تا ٦ سەعاتێك یەك جار.

منالانی ٤تا ١١مانگ ٨٠ میلی‌گرام هەر ٤تا ٦ سەعاتێك یەك جار.

منالانی بچوکترلە٣مانگ ٤٠ میلی‌گرام هەر ٤تا ٦ سەعاتێك یەك جار.

شاف:

بۆ گەورەکان و گەورەترلە ١٢ساڵ ٣٢٥تا ٦٥٠میلی‌گرام یەك جار.

منالانی ٢ تا ٥ساڵ ١٢٥ میلی‌گرام هەر ٤تا ٦ سەعاتێك یەك جار.

منالانی ٦تا ١٢ساڵ ٣٢٥ میلی‌گرام هەر ٤تا ٦ سەعاتێك یەك جار.



## ئەسیتازۆلەمایـد: ACETAZOLEAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Diamox, Dazamide

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٢٥ و ٢٥٠ میلیگرامی و كەپسولی ٥٠٠ میلیگرامی و و دەرزی ٢٥٠ میلیگرامی و دەرزی ٥٠٠ میلیگرام/ڤیاڵ هەیە (IM, IV).

**گروپی دەرمان:** Carbonic anhydrase inhibitor

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی گلوكۆما (ئاوی ڕەشی چاو) و كەمكردنەوەی پەستانی ئاوەوەی چاو و بۆ چارەسەری تەشەنوج و ئۆدیما بەهۆی پەككەوتنی دڵ و نەخۆشی شاخاوی بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** ژەهراوی بوونی پێست، دروست بوونی بەرد لەگورچیلە. گێژی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سكچوون، كەمخوێنی، كەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، حەساسیەت، كەمبوونەوەی خرۆكە سپی یەكانی خوێن، زیادبوونی شەكری خوێن.

**بڕی دەرمان:**

لە گەورەكاندا ٢٥٠میلیگرام خۆراكی هەر ٤ سەعات ١ جار.

لە گلوكۆما (ئاوی ڕەشی چاو) ٢٥٠ میلیگرام ١تا ٤جار لە ڕۆژێكدا.

ماسولكەیی یان دەمار ئەبێت لەسەرخۆ و بە هێواشی ئەنجام بدرێت.

بۆنەخۆشی ئۆدیما بەهۆی پەككەوتنی دڵی لە گەورەكان ڕۆژانە ٢٥٠ تا ٣٧٥ میلیگرام لە ڕێگەی خۆراكی، ماسولكەیی و دەمار.

لە منالآندا ڕۆژانە ٥ میلیگرام/كیلۆگرام لە ڕێگەی خۆراكی،گلوكوما (ئاوی ڕەشی چاو)ی گۆشەی كراوەی گەورەكان ٢٥٠ میلیگرام تا یەك گرام لە ڕێگەی خۆراكی یان ماسولكەیی یان دەمار دابەشكراو لە چوار ژەمدا ڕێی پێ دەدرێت.

لەتەشەنوجی گەورەكاندا ڕۆژانە ٣٧٥ میلیگرام لەڕێگەی خۆراكی، ماسولكەیی یان دەمار تا ٢٥٠ میلیگرام چوار جار لە ڕۆژێكدا ڕێی پێ دەدرێت.

لەتەشەنوجی منالآندا ڕۆژانە ٨ تا ٣٠ میلیگرام/كیلۆگرام لەڕێگەی خۆراكی ماسولكەیی یان دەمار بەشێوەی دابەش كراو لە چوار ژەمدا ڕێی پێ دەدرێت.



## ئەسیتیك ئەسید: ACETIC ACID

**ناوی بازرگانی:** vosol, Aci Jel

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی (BULK).

**گروپی دەرمان:** Antiseptic

**بەکارهێنان:** دژی میکرۆبە و توانایەکی تایبەتی باشی کوشتنی میکرۆبی هەیە لەبەرئەوە بۆپاکردنەوەو شۆردنەوەی میزەڵدان و ڕێڕەوی میزکردن و برینەکانی پێستی، بەرگری کردن لە خوێنبەربوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خاولێدانی دڵ زۆربوونی لیك، نیلتیهاب، سوتانەوە، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** بەپێ دەستوری پزیشکی چارەسەر بەکاردەهێنرێت ،بۆشۆردنەوەی هەمیشەیی یان بەنۆرەی میزەڵدان ٥٠٠تا ١٥٠٠ میلیگرامی گیراوەی ٢٥٪ لە ٢٤ کاتژمێردا پێویستە، بۆ شۆردنەوەی ڕێڕەوی میزکردن ML ٥٠ گیراوەی ٢٥٪ لە هەر جارێکدا بەکاردێت.بەشێوەی مەوزوعی ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار بڕی پێویست بەکاردێت.

## ئەستایل کولین کلۆراید: ACETYLECHOLINE CHLORIDE

**ناوی بازرگانی:** Miochol

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ١٪ و دەرزی١٪.

**گروپی دەرمان:** Cholinergic agonist

**بەکارهێنان:** بۆ تەسکردنەوەی بیلبیلەی چاو لە هەندێ لە نەشتەرگەرییەکانی چاودا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خابوونەوەی لێدانی دڵ تەنگەنەفەسی، سنگەکوژێ، تێکچوونی بینین، کەمبوونەوەی پەستانی خوێن، کرژبوونی سك، نارەقکردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالان ٠,٥ تا ٢ میلی لیتر دەکرێتە ژوری پێشەوەی ناوەوەی چاو.

## ئەستایل سیستین: ACETYLE CYSTEINE

**ناوی بازرگانی:** Acetadote, Ilube

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠٠ میلیگرام/میلیلیتر و حەبی ٢٠٠ میلیگرامی و حەبی ٦٠٠ میلیگرامی و گیراوەی ئیستینشاقی و خۆراکی ١٠٪ و ٢٠٪.

**گروپی دەرمان:** Antidote

**بەکارهێنان:** دژی ژەهراوی بوون بە ئەسیتامینوفین و وەك میکۆلایتیك (تونەرەوەی بەڵغەم) و بۆ کەمبوونەوەی فرمێسك و نەخۆشی موزمینی سنگ و سی و بۆرینچکەکانی هەوا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خاولیدانی دڵ زۆربوونی لیك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوران، پەڵە، ئیلتیهابی زمان، کرژبوونی بۆری هەوا، تا، بەرزبوونەوەی پەستان، تەشەنوج، نزمبوونەوەی پەستان. سەرگێژبوون، خەواڵوویی.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکان و منداڵان سەرەتا ١٥٠ ملیگرام لە ٢٠٠ ملی لیتر D.W ٥٪ بە شێوەی دەمار IV لە ماوەی ١٥ خولەك بەکاردەهێنرێت. پاشان ٥٠ ملیگرام/کیلۆگرام لە ٥٠٠ ملی لیتر گیراوەی D.W٥ ٪لە ڕێگەی دەمار لە ماوەی ٤ کاتژمێر پاش ئەوە ١٠٠ ملیگرام/کیلۆگرام ١٠٠٠ ملی لیتر گیراوە (٥٪ D.W) لە ماوەی ١٦ کاتژمێر لە ڕێی دەمارەوە پێی دەدرێت.بۆ ژەهراوی بوون بە ئەسیتامینۆفین گەورەکان ٧,٥ گرام،بۆ منداڵان ١٤٠ ملیگرام/کیلۆگرامە.بۆ میکۆلایتیك(توێنەرەوەی بەلغەم) گەورەکان و منداڵان قەترە قەترە چکاندی ١ تا ٢ ملیلیتر لە گیراوەی ١٠٪ تا ٢٠٪ هەر ١ تا ٤ سەعات بەپێی پێویست یان ٣ تا ٥ ملیلیتر لە گیراوەی ٢٠٪ یان ٦ تا ١٠ ملیلیتر لە گیراوەی ١٠٪ ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا.

## ئەسیتایل سیستین: ACETYLE CYSTEINE

**ناوی بازرگانی:** Ilube

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو (ئەسیتایل سیستین ٥٪، هایپرۆمیلۆز ٠.٣٥).

**گروپی دەرمان:** Tear deficiency,lubricants,astringent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونی فرمێسك و لاوازی یان نائاسایی دروستبوونی لینجەمادە بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار بەکاردێت.

## ئەسیترێتین: ACITRETIN

**ناوی بازرگانی:** Soriatane , neotigasol

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠و٢٥ ملیگرامی

**گروپی دەرمان:** Retinoid

**بەکارهێنان:** دژی سۆریاسیسی توند (نەخۆشیەکی پێستی یە لەسەر پێست پولەکە دروست دەبێت) و زیپکە بەکاردێت

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، خەمۆکی، بێخەوی، کۆبوونەوەی ئاو (ئۆدیما)، هەڵوەرینی موو، پەڵە، ئیلتیهابی لێو، شەوکوێری، هەوکردنی لوت، هێڵنجدان، سکچوون، ئازاری سك.

بڕدەرمان: لەگەورەکانداسەرەتا ٢٥ تا ٥٠ ملیگرام ١ جار لە ڕۆژێکدا و لەگەڵ ژەمەکانی خواردندا.

## ئەسیکلۆ ڤیری چاو و مەوزوعی: ACICLOVIR OPH.TOP

**ناوی بازرگانی:** Zovirax ,Avirax

**شێوەی دەرمان:** کرێمی مەوزوعی پێست ٥ ٪ و مەڵهەمی چاو ٥٪ و حەبی ٢٠٠و ٤٠٠ و ٨٠٠ میلی‌گرامی و دەرزی ٢٥٠ و ٥٠٠میلی‌گرامی هەیە.

**گروپی دەرمان:** دژەڤایرۆس Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی و بۆچارەسەری تامێسکی زایەندی ژنان، هەوکردنی مەوزوعی پێست و هەوکردنی کۆرنیەی چاو بەهۆی ڤایرۆسی تامێسکی سادەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، وشکبوونی لێو، خوران، وشکبوونی پێست، پەڵە، بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان، گێژی.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکاندا کرێم لە هەر ٣ کاتژمێر جارێك شوێنی مەبەستی پێ بمالرێت و ئەبێت ٦ جار لەرۆژێکدا دوبارە بکرێتەوە و بۆماوەی ٧ ڕۆژ بەکاربهێنرێت.

مەڵهەمی چاو بکرێتە ناو چاوەوە وە پێنج جار لە ڕۆژێکدا ئەم کارە ئەنجام بدرێت و ئاگادار بیت نوکی مەڵهەمەکە بەر چاو نەکەوێت.

لە تامێسکی دەزگای زایەندی ژنان ٢٠٠ میلی‌گرام هەر ٤ کاتژمێرێك، وە ٥ جار لە ڕۆژێکدا حەب بخۆیت ماوەی ١٠ ڕۆژ حەب بخورێت.

## ئەسیکلۆ ڤیر: ( ACICLOVIR ( systemic

**ناوی بازرگانی:** Zovirax ,Avirax

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلی‌گرامی و حەبی ٤٠٠ و ٨٠٠ میلی‌گرامی و کەپسولی ٢٠٠ میلی‌گرامی وسەسپێنشنی ٢٠٠ میلی‌گرام/٥ میلی‌لیتر و ڤیاڵی ٥٠٠ و ١٠٠٠ میلی‌گرامی و دەرزی ٢٥ و ٥٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی پێستی، تامێسك، دژە میکرۆب و ڤایرۆس، هەوکردنی تامێسکی و تامێسکی زایەندی سەبارەت بە ژنان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بوونی خوێن لە میزدا، دڵە کوتێ، سەرگێژبوون، لەرزین، سەرئێشە، تەشەنوج، کەمبوونەوەی پەستانی خوێن، سوتانەوەی چاو، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، خوران، پەڵە،



زیپکە، سوتانەوە، ئیلتیهاب لەشوێنی دەرزی لێدان، ئازاری جومگە، کەمخوێنی، تێکچوونی گورچیلە، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ میلیگرام لەهەر ٤ سەعاتدا ڕۆژانە ٥ جاربۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ. لە منالأنیشدا ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام بەشێوەی دەمار هەر ٨ سەعات جارێ تا ٧ ڕۆژ بەکاربهێنرێت.منالأنی گەورەتر لە ٢ سالَ ٤٠ کیلۆگرام و کەمتر ٢٠ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ڕۆژانە ٤ جار بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ.

## ئاسیکلۆمین: ACIGLUMINE

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠٠ میلیگرامی هەیە

**گروپی دەرمان:** ئەمینۆ ئەسید

**بەکارهێنان:** قەرەبوکەرەوەی کەمبوونی ترشی گەدە (ئەسید).

**کاریگەری لاوەکی:** کەمخوێنی، ژەهراویبوونی جگەر، مەیینی خوێن.

**بڕی دەرمان:** ١ تا ٣ حەب لە ڕۆژێکدا پێش خواردن پێی دەدرێت.

## ئەسیپیمۆکس: ACIPIMOX

**ناوی بازرگانی:** Olbetam

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antilipidemic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیادبوونی چەوری خوێن جۆری (IIB و IV) کە بە ڕژێمی خۆراکی چارەسەر ناکرێت.

**کاریگەری لاوەکی:** فراوانبوونی مولولەکانی خوێن، سوربونەوە، خوران، پەڵە، شەرا، دڵەکزە، سوربونەوەی پێست، ئازاری بەشی سەرەوەی گەدە، هێڵنجدان، سکچوون، سەرئێشە، خاوی، وشکی دەم، کرژبوونی بۆری هەوا، ئاوبەندی مولولە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ئاسایی ٥٠٠ تا ٧٥٠ میلیگرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## ئەکریزۆرسین: ACRISORCIN

**شێوەی دەرمان:** کرێمی ٢٪ هەیە

**گروپی دەرمان:** دژی کەڕوو Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی کەڕوو مەوزوعی و پێستی دەرمان و چارەسەری نەخۆشی پێست.

**بڕی دەرمان:** لەڕۆژێکدا ٢ جار پێیدا بماڵرێت تا ٦ هەفتە، لە پاش پاکبوونەوەی شوێنەکە کرێمەکە بەکاربهێنرێت.

## ئەکریڤاستین: ACRIVASTINE

**ناوی بازرگانی:** Bendaryl

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٨ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەرکردنی نیشانەکانی حەساسیەت وەك پوشەتا و شەرای موزمینی خۆیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، گیرانی میز. وشکی دەم، تێکچوونی بینین، تێکچوونی گەدە و ریخۆڵە، دڵەکوتێ، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، نارێکی لێدانی دڵ، خەمۆکی، تێکچوونی خەو، لەرزین، شڵەژان، تەشەنوج، پەڵە، کرژبوونی بۆری هەوا، ئاوبەندی مولولە، هەستیاربوون بە رووناکی، تێکچوونی خوێن، لاوازی جگەر، گلوکۆمای گۆشە داخراو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالانی سەرووی ١٢ سال، ٨ میلی‌گرام رۆژانە ٣ جار.

## ئەکتیڤەیتد پرۆ پرۆمبین کۆمپلێکس: ACT. PRO. COM. conc

**ناوی بازرگانی:** FEIBA,AUTOPLEX-T

**شێوەی دەرمان:** پاودەربۆ دەرزی ٥٠٠ یەکەیی و ١٠٠٠ یەکەیی.

**گروپی دەرمان:** دژی هیمۆفیلیا

**بەکارهێنان:** دژی خوێن بەربوونی بۆماوەیی (هیمۆفیلیا) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خورانی پێست، زیادبوونی لێدانی دڵ، تەنگەنەفەسی، سەرگێژبوون، هێڵنجدان، رشانەوە، حەساسیەت، ئازاری توند، پەستان لەسەر قەفەسەی سنگ، بلۆقکردنی پێست.

**بڕی دەرمان:** بۆ هیمۆفیلیای A,B ئەنتی بۆدی فاکتەری ژمارە ٨ بەکاردەهێنین وە هەروەها ئەنتی هیمۆفیلی (AHF)(AICC).

## ئای سی تی ئێچ (ئەدرینۆ کۆرتی کۆتروفین هۆرمۆن: ACTH

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٣٤٠ یەکەیی.

**گروپی دەرمان:** هۆرمۆن HORMONE

**بەکارهێنان:** کۆنترۆڵی دەردانی کۆرتیکۆستیرۆید هۆرمۆن دەکات کەلەرژێنی ئەدرینالینەوە دەردەدرێ ئەم هۆرمۆنە دروست دەکرێ و هەڵدەگیرێ لە کوێرەرژێنی نوخامیدا، دەرمانی یارمەتی لە تەشخیصی رژێنی سەرگورچیلە (Adrenal).بۆ نەخۆشی مێشکی (multiple seclerosis) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەوکردن، هەوکردنی پێست، هەستیاربوون بەڕووناکی.

**بڕی دەرمان:** لەنەخۆشی مێشکی فرەڕەقبوون (multiple seclerosis) گەورەکاندا، ڕۆژانە ٨٠ تا ١٢٠ یەکە لە ڕێگەی ماسولکەیی، دابەشکراوە لە ٤ ڕۆژدا بۆ چوار بەشی یەکسان لەماوەی ٢ تا ٣ هەفتە ڕێی پێ دەدرێت.

## ئەدالیمیوماب: ADALIMUMAB

**ناوی بازرگانی:** Humira

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠ میلی گرام/٠,٤ میلی‌لیتر و ٤٠ میلی گرام/٠,٨ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antirheumatic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ڕۆماتیزم و هەوکردنی فەقەرەکان و سۆریاسس (دروستبوونی پولەکەی پێستی) و هەوکردنی جومگەکان و هەوکردنی جومگەی خۆیی لە لاوەکاندا و پلاك سۆریاس و نەخۆشی کرۆن و هەوکردنی کۆڵۆنی خۆرەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری گەدە، سووربوونەوە، خوران، ئاوسان، ئازاری جومگە، ئازاری ماسولکە، تەشەنوج، برینی دەم، پەڵە، ئازاری سنگ، هیلاکبوون، کۆکە، تا، لەرز، برینی گەروو، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، ئارەقکردن بەشەودا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠ میلی گرام ژێرپێستی هەموو هەفتەیەك.

## ئەداپالین: ADAPALENE

**ناوی بازرگانی:** Differin

**شێوەی دەرمان:** کرێم ولۆشنی مەوزوعی ٠,١٪ و جێڵی مەوزوعی ٠,١٪ و ٠,٣٪ گیراوەی ٠,١٪.

**گروپی دەرمان:** Retinoid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیپکەی ئاسایی و سوك و مامناوەند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی پێست، سووربوونەوەی پێست، کرێشی پێستی، سوتانەوە، ڕوشان، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و مناڵانی سەروی ١٢ ساڵ ڕۆژانە ١ جار بەبەرگێکی تەنك پاش شۆردن لەکاتی خەودا.

## ئەدیفۆڤیر دیپیڤۆکسیل: ADEFOVIR DIPIVOXIL

**ناوی بازرگانی:** Hepsera

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بەکاردێت بۆ هەوکردنی ڤایرۆسی جگەر(هیپاتیتی مزمین )لەجۆری B.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تێکچوونی هەرس، ئازاری سك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، تا، پەڵە، کەمبوونەوەی کێشی لەش.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ١٠ میلی‌گرام.

## ئەدینۆساین: ADENOSINE

**ناوی بازرگانی:** Adenocor , Adenoscan, Adenocard

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٣ میلی‌گرام/میلی لیتر(٢ میلی لیتر).

**گرووپی دەرمان:** دژی نارێکی لێدانی دڵ Antiarrhythmic

**بەکارهێنان:** دژی نارێکی لێدانەکانی دڵ لە زۆرلێدانی دڵ (تاکیکاردیا) بۆ گەڕاندنەوەی دڵ بۆ بارێکی ئاسایی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، تێکچوونی بینین، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری مل، ئازاری قەفەسەی سنگ، تەنگەنەفەسی، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ٦ میلی‌گرام بەشێوەیIV بۆلۆس رێی پێ دەدرێت (١ تا ٢ چرکە). ئەگەر نارێکی لێدانی دڵ لە ماوەی ١ تا ٢ خولەکدا چاك نەبوویەوە، ١٢ میلی‌گرامی بە دەماری پێ دەدەین (لەکاتی پێویست ١٢ میلی‌گرامی تریش بەکاردەهێنرێت).

منداڵانی کەمتر لە ٤٠ کیلۆگرام ٠,٠٥ تا ٠,١ میلی‌گرام/کیلۆگرام.

## ئەدالت کۆڵد: ADULT COLD

**ناوی بازرگانی:** Corisan , Dristan

**شێوەی دەرمان:** حەبی ( ٣٢٥ میلی‌گرامی ئەسیتامینۆفین + ٥ میلی‌گرامی فینایلێفرین، ٢ میلی‌گرامی کلۆرفینرامین).

**گرووپی دەرمان:** دژی ئەنفلۆنزا (هەڵامەت) ANTI-FLU

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەڵامەت، سەرمابوون، جیوب، پوشەتا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، خەواڵویی، وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی بینین، تێکچوونی دەزگای هەناسەدان.



**بڕی دەرمان:** گەورەکان و تەمەنی سەرووی ١٢ ساڵ لە هەر ٤ تا ٦ کاتژمێر ٢ حەب بەکاربهێنرێ و بەلایەنی زۆر ڕۆژانە ١٢ حەب.

منداڵانی تەمەن ٦ تا ١٢ ساڵ ١ حەب لەهەر ٤ کاتژمێرێکدا لایەنی زۆر ڕۆژانە ٦ حەب.

## ئەگالسیدەیز ئەلفا و بیتا: AGALSIDASE ALFA & BETA

**ناوی بازرگانی:** Fabrazyme,replagal

**شێوەی دەرمان:** ئەگالسیدەیز بیتا دەرزی ٥ و ٣٥ میلیگرامی و ئەگالسیدەیز ئەلفا دەرزی ١ میلیگرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Endocrine-metabolic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی خەزنکردنی لایسۆسۆمە بەهۆی کەمبوونی ئەنزیمی ئەلفا گالاکتۆسیدەیز A (Fabry disease) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، تێکچوونی تام، زیادبوونی لێدانی دڵ، دڵەکوتێ، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، بەرزبونەوە و نزمبونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری سنگ، ئۆدیما، سووربونەوە، تەنگەنەفەسی، کۆکە، ئاوکردنی لوت، سەرئێشە، هیلاکی، گێژی، بێهێزی، کرژبوونی ماسولکە، تێکچوونی خەو، کرژبوونی ماسولکە، ئازاری ماسولکە و جومگە، ڕوشانی چاو، خوران، شەرا، پەڵە، زیپکە، ئازاری گوێ، لەرزین، تێکچوونی هەستی بۆنکردن.

**بڕی دەرمان:** ئەگالسیدەیز بیتا بەڕێگەی ئینفیوشنی دەماری گەورەکان و منداڵانی سەرووی ٨ ساڵ ١ میلیگرام/کیلۆگرام هەموو ٢ هەفتەیەك. ئەگالسیدەیز ئەلفا بەڕێگەی ئینفیوشنی دەماری گەورەکان و منداڵانی سەرووی ٧ ساڵ ٢٠٠ مایکرۆگرام/ کیلۆگرام هەموو ٢ هەفتەیەك.

## ئەگۆمیلاتین: AGOMELATINE

**ناوی بازرگانی:** Valdoxan

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی خەمۆکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، قەبزی، ئازاری سك، سەرئێشە، گێژی، خەواڵویی، بێخەوی، هیلاکی، قەلەقی، ئازاری پشت، ئارەقکردنەوە، تێکچوونی بینین، ئەکزیما، هەوکردنی جگەر، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەرووی ١٨ ساڵ، ٢٥ میلیگرام لەکاتی خەودا، ئەگەر پێویست بێت پاش ٢ هەفتە زیاددەکرێت بۆ ٥٠ میلیگرام لەکاتی خەودا.

## ئەلبێندازۆل: ALBENDAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Zentel , Albenza

**شێوەی دەرمان:** حەبی کرماندن ٢٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی، سەسپێنشنی ٢٠٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** دژی کرم Anthelmintic

**بەکارهێنان:** دژی زۆربەی کرمەکان بەکاردێت دژی کرمی تەنیاسۆلیوم و کرمی ( STRONGLOIDES STERCORALIS) نەخۆشی هیداتید (نەخۆشی بوونی هیداتید سیست لەجگەر و سی و مێشکدا ) و کرمی ئەسکارس و فیلاریاسس و ئینترۆبیەس ڤێرمیکولاریس و کرمی قولاپی و جیاردیاسس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون. تا، پەڵە، هەڵوەرینی موو، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، حەساسیەت، نیشانەکانی هەوکردنی پەردەی مێشك، شەرا.

**بڕی دەرمان:** بۆ تەنیاسۆلیۆم گەورەکان و منالانی گەورەتر لە ٦ ساڵ ئەگەر کێشی نەخۆش زیاتر لە ٦٠ کیلۆگرام بوو ١٥ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە خۆراکی، لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا لەگەڵ خواردندا. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٨٠٠ میلیگرامە. کێشی کەمتر لە ٦٠ کیلۆگرام ١٥ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە خۆراکی لەدوو بڕی دابەشکراودا و لەگەڵ خۆراکدا. بۆ نەخۆشی هیداتید ئەگەر کێشی نەخۆش زیاتر لە ٦٠ کیلۆگرام بوو ١٥ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە خۆراکی، لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا لەگەڵ خواردندا ڕێی پێ دەدرێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٨٠٠ میلیگرامە. لە نەخۆشانی کەمتر لە ٦٠ کیلۆگرام ٤٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار لەگەڵ خواردندا. ئەم دەرمانە بە ٣ خول ئەنجام دەدەین.

## ئەلبومین: ALBUMIN

**ناوی بازرگانی:** Albital,Albasol,Albuman,Albutein,Zenlab

**شێوەی دەرمان:** گیراوە بۆ IV ئینفیوشنی ٥٪ (٥٠ میلی لیتر) و ٢٠٪(١٠٠ میلی لیتر) و ٢٥٪.

**گروپی دەرمان:** Plasma volume expander

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شۆك، سوتاوی یەکان و کەمبوونی پرۆتین و خوێنبەربوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، زۆرلێدانی دڵ سەرئێشە، پەڵە، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمخوێنی، کۆبوونەوەی ئاو لە سی یەکاندا، تا، لەرز، ئازاری پشت.

**بڕی دەرمان:** لەشۆکی گەورەکاندا، سەرەتا ٥٠٠ میلی لیتر لە گیراوەی ٥٪ لە ڕێگەی دەمارەوە ڕێی پێ دەدرێت بەشێوەی پێویست ئەتوانی دوبارە ئەم بڕە دەرمانە دوبارەبکەیتەوە. لایەنی زۆر ٢٥٠ گرام لە ٤٨ کاتژمێردا، نابێت زیاتر لە ٢٥٠ گرام لە ٤٨ کاتژمێردا بەکاربهێنرێت.



لە منالآندا ٪٢٥ تا ٪٥٠ وەك گەورەكان ٠,٥ تا ١ گرام/كیلۆگرام لەبڕێكی دەرماندا، بۆ ساواكان ٠,٠٥ تا ٠,١ گرام/خولەك.لایەنی زۆر ٦ گرام/كیلۆگرام لە بڕێكی دەرماندا. لە سوتاوی یەكان ئەو برە بەپێی هەلومەرجی نەخۆش جیاوازی هەیە و البومین پلازما لە سنوری ٢تا٣ گرام پارێزگاری بكرێت.

لەگەورەكاندا لەكەمبوونەوەی پرۆتینا ١٠٠٠ تا ١٥٠٠میلیلیتر لەگیراوەی ٥٪ IV ئینفیوشن پێی دەدرێت. (لایەنی زۆری خێرایی ئینفیوشن ٥ تا ١٠میلی لیتر/ خولەكە) ٢٥ تا ١٠٠ گرام لە گیراوەی ڕۆژانە ٢٠٪، بە IV پێی دەدرێت. (لایەنی زۆری خێرایی ئینفیوشن ٣ میلی لیتر/خولەكە)

## ئەلكافتادین: ALCAFTADINE

**ناوی بازرگانی:** Lastacaft

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,٢٥ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەكارهێنان:** بۆ پێشگری لە حەساسیەت و ئیلتیهابی چاو و چاوئێشە و خوران بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** سەرئێشە، ڕوشانی چاو، خورانی چاو، سوربونەوەی چاو، هەلآمەت، گەورەبوونی لوت.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان و منالآنی گەورەتر لە ٢ ساڵ ١ قەترە بكرێتە هەر چاوێكەوە ڕۆژانە ١جار.

## ئەلكلۆمیتازۆن: ALCLOMETASONE

**ناوی بازرگانی:** Alcovate, modrasone

**شێوەی دەرمان:** كرێم و مەڵهەمی ٠,٠٥ ٪.

**گروپی دەرمان:** Corticisteroid

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی پێستی خوران و سوربونەوە و ئاوسان و ئیلتیهاب و ئەكزیما(بیرۆ) بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** ڕوشان، پەڵە، خوران، ئاوسان، سوربونەوەی پێست.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١ تا ٢ جار.

## ئەلكحول: ALCOHOL

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی پارچەی بچوك هەیە.

**گروپی دەرمان:** ANTISEPTIC

**بەكارهێنان:** توێنەرەوە, دژی هەوكردن.

**بڕی دەرمان:** دژی هەوكردن بە ئەلكهول ٧٠٪ ئەنجام دەدرێت.

**ئەلدیسلوكین:** ALDESLEUKIN

**ناوی بازرگانی:** Proleukin

**شێوەی دەرمان:** پاودەری گیراوەی دەرزی IV ٢٢ ملیۆن یەكەیی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی گورچیلە و پێست بەكاردێت، كە بلاوەدەبێتەوە بۆ بەشەكانی تری لەش.

**كاریگەری لاوەكی:** بێخەوی، ئازاری سنگ، خێرا لێدانی دڵ، كۆكە، خێراهەناسەدان، ئاوسان و ئازار، ڤێ، خرۆشان، خوێنبەربوونی پوكی ددان ولوت، برینی دەم، تا، لاوازی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری گەدە، هیلاكی، گێژی، خەمۆكی، سكچوون، كەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، بلۆقكردنی پێست، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ٠,٠٣٧ بە IV ئینفیوشن هەموو ٨ سەعات جارێك.

**ئەلیفاسێپت:** ALEFACEPT

**ناوی بازرگانی:** Amevive

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی IV و IM.

**گروپی دەرمان:** Antipsoriatic

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری سۆریاسسی موزمینی مامناوەند و توند (نەخۆشی دروستبوونی پولەكە لەسەر پێست) بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** هەوكردنی گەروو، ئازاری ماسولكە، ئاوسان، بەگرانی هەناسەدان، كۆكە، گێژی، سەرئێشە، هێڵنجدان، خوران، لەرز، ئازاری ماسولكە، ئازار و ئیلتیهاب لە شوێنی دەرزی لێدان.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ٧,٥ میلیگرام بە IV هەفتانە ١ جار. یان ١٥ میلیگرام بە IM هەفتانە ١ جار.

**ئەلیمتیوزیوماب:** ALEMTUZUMAB

**ناوی بازرگانی:** Campath

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ئینفیوشنی دەماری ٣٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Monoclonal antibody

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن لە جۆری زیادبوونی موزمینی لیمفەخانەی خڕۆكە سپی یەكان (CLL) بەكاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری گەدە، سکچوون، قەبزی، نەمانی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، ئازاری پشت و سنگ، پێخەوی، هیلاکی، ئارەقکردنەوە، خوران، پەڵە، ورێنە، شڵەژان، تا، لەرز.

**بڕی دەرمان:** بۆ شێرپەنجەی خوێن لیمفۆسایتیك لیوکیمیای موزمین (CLL) ڕۆژانە ٣ میلیگرام بەدەمار بۆ زیاتر لە ٢ سەعات. لایەنی زۆر ٩٠ میلیگرامە.

## ئەلیمیمازین: ALIMEMAZINE TARTARATE

**ناوی بازرگانی:** Alimemazine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلیگرامی و شروبی ٧.٥ و ٣٠ میلیگرام میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ خوران و شەرا و چارەسەری سەرەتایی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، گیرانی میز. وشکی دەم، تێکچوونی بینین، تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، شڵەژان، خەمۆکی، لەرزین، تەشەنوج، تێکچوونی خەو، پەڵە، کەمی کاری جگەر، کرژبوونی بۆری هەوا، ئاوبەندی مولولە، هەستیاربوون بەڕوناکی، گلوکۆمای گۆشە داخراو، نەخۆشی خوێن،

**بڕی دەرمان:** بۆ خوران و شەرا ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار، لە حاڵەتە توندەکاندا تا لایەنی زۆر ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرام بەکاردەهێنرێت. بۆ پیرەکان ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ تا ٢ جار. منالانی خوار ٢ ساڵ ٢٥٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام (لایەنی زۆر ٢,٥ میلیگرام) ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. منالی ٢ تا ٥ ساڵ ٢,٥ میلیگرام ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. منالی ٥ تا ١٢ ساڵ ٥ میلیگرام ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. بۆ چارەسەری سەرەتایی منالی ٢ تا ٧ ساڵ تا لایەنی زۆر ٢ میلیگرام/کیلۆگرام ١تا ٢ سەعات پێش لە نەشتەرگەری.

## ئەلیندرۆنەیت: ALENDRONATE

**ناوی بازرگانی:** Fosamax , Osteofos

**شێوەی دەرمان:** حەبی٥ و ١٠ و ٣٥ و ٤٠ و ٧٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ٧٠ میلیگرام/٧٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** BIOSPHOSPHONATE

**بەکارهێنان:** ڕێدەگرێت لە پوکانەوەی ئێسك بۆچارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی ئێسك وەك ئۆستیۆپۆرۆسس (پوکانەوەی ئێسك ) و نەخۆشی باجەت و پوکانەوەی ئێسکی پاش لە لەحەیزچونەوەی ژنان و ڕێکخستنی کالسیۆم لەلەشدا بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان، قەبزی، ئازاری سك، غازات، برینی قورگ، خوران، پەڵە، ئازاری قەفەسەی سنگ، ئۆدیما(کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا)، تێکچوونی گەدە، ئازاری ماسولکە، سووربوونەوە، ئازاری کەمەر.

**بڕی دەرمان:** ئەم دەرمانە نیوسەعات پێش نان خواردن، بەکاربهێنرێت باشترە، ڕۆژانە ٥ تا ١٠ میلیگرام لە ڕێی خۆراکی یەوە،یان ٧٠ میلیگرام هەفتانە ١ جار.

## ئەلفینتانیل: ALFENTANIL HCL

**ناوی بازرگانی:** D, Rapifen ,One Alfa Alpha , Alfenta

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,٥ میلیگرام/میلیلیتر.

**گرووپی دەرمان:** دژی ئازاری توند Narcotic Analgesic

**بەکارهێنان:** دژی ئازاری توند،وەك دەرمانی یارمەتیدەر لە بێهۆشی دا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵوویی، خرۆشان، بێخەوی، تەشەنوج، پەڵە، تێکچوونی بینین، وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی بینین، زیادبوون وکەمبوونەوەی لێدانی دڵ بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، خوران.

**بڕی دەرمان:** بێهۆشی لە گەورەکان و منالانی گەورەتر لە ١٢ ساڵ لە دەستپێکی ٨ تا ٢٥ مایکرۆگرام/کیلۆگرام لە ڕێگەی دەمارەوە پاشان ٣ تا ٧٥ مایکرۆگرام/ کیلۆگرام لەڕێگەی دەمارەوە یا ٠,٥ تا ١ مایکرۆگرام/کیلۆگرام/خولەك لەڕێگەی دەمارەوە.

منالانی کەمتر لە ١٢ ساڵ ٥ تا ١٥ مایکرۆگرام/کیلۆگرام ماوەی ٣ تا ٥ خولەك یا ٠,٥ تا ٣ مایکرۆگرام/کیلۆگرام/خولەك بەڕێگەی IV ئینفیوشن ڕێی پێ دەدرێت. بۆ کۆنترۆڵکردنی ئازاری دوای نەشتەرگەری ٢٠٠ مایکرۆگرام/سەعات.

## ئەلفیوزۆسین: ALFUZOSIN

**ناوی بازرگانی:** Uroxatral

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Alpha Adrenergic antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی گەورەبوونی بێوەی پرۆستات (BPH) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، هیلاکبوون، خوران و سووربوونەوە، پەڵە، شەرا، ئیلتیهابی گەروو، جیوب، هەوکردن و حەساسیەتی لوت، ئازاری سك، قەبزی، هێنجدان، سکچوون، تێکچوونی گەدە، لاوازی سێکسی، ئیلتیهابی بۆرینچکەکان، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، ئازاری سنگ، ئاوبەندی، برینی جگەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی ڕۆژانە ١ جار.



## ئەلگلوکۆسیدەیز ئەلفا: ALGLUCOSIDASE ALFA

**ناوی بازرگانی:** Myozyme

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلی‌گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Endocrine-metabolic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی خەزنکردنی لایسۆسۆم بەهۆی کەمبوونی ئەنزیمی ئەسید ئەلفا گلوکۆسیدەیز (Pompe disease) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، سووربوونەوە، زیادبوونی لێدانی دڵ، گۆڕانی پەستان، شینبوونەوە، هەناسەبڕکێ، کۆکە، خرۆشان، سەرئێشە، لەرزین، بێ ئارامی، گێژی، هیلاکی، کرژبوونی بۆری هەوا، ئازاری ماسولکە، تا، ئارەقکردنەوە، پەڵە، خوران، شەرا.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی ئینفیوشنی دەماری گەورەکان و منداڵان ٢٠ میلی‌گرام/ کیلۆگرام هەموو ٢ هەفتەیەك.

## ئەلیسکیرین: ALISKIREN

**ناوی بازرگانی:** Tekturna

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥٠ و ٣٠٠ میلی‌گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، ئازاری جومگە، کۆکە، بڕینی گەروو، ئاوسان، ئازاری پشت، خوران، پەڵەی پێست، هیلاکی، ئازار و تێکچوونی گەدە، سکچوون، دڵەکزە، ئاوسانی دەوروبەری چاو، هێڵنجدان، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تەشەنوج، تێکچوونی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥٠ میلی‌گرام بەشێوەی خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا، ئەگەر پەستانی خوێن کۆنترۆڵ نەکرا بڕەکەی زیاد دەکرێت بۆ ٣٠٠ میلی‌گرام.

## ئەلیتریتینۆین: ALITRETINOIN

**ناوی بازرگانی:** Toctino

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠ و ٣٠ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Retinoid



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئەکزیمای دەستی (نەخۆشی ئیلتیهابی پێستی) مقاوم بە کۆرتیکۆستیرۆیدە چالاکە مەوزوعی یەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی ترایگلیسراید و کۆلیسترۆڵ سووربونەوە، سەرئێشە، کەمخوێنی، ئازاری ماسولکە و جومگە، چاوئێشە، هەڵوەرینی موو، تێکچوونی بینین، وشکی پێست و لێو، وشکی چاو، لوتپژان، کاتاراکت، خوران، هەوکردنی کۆرنیەی چاو، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ڕوشانی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ، ٣٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، کەمدەکرێتەوە بۆ ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار ئەگەر تەحەمولی نەکرد. لەو نەخۆشانەی نەخۆشی شەکرە یان بۆ ماوەیەکی زۆر توشبوون بە چەوری خوێن یان مەترسی هۆکاری نەخۆشی مولولەی خوێنی دڵ سەرەتا ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، ئەگەر پێویست بێت زیاددەکرێت بۆ لایەنی زۆر ڕۆژانە ٣٠ میلیگرام. ماوەی چارەسەر ١٢ تا ٢٤ هەفتە بەردەوام نابێت ئەگەر کاردانەوەی نەبوو پاش ١٢ هەفتە.

## ئەلتیپلەیس: ALTEPLASE

**ناوی بازرگانی:** Actilyse

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ و ٢٠ و ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Fibrinolytic drug

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خوێنلێبڕانی تیژی ماسولکەیی دڵ و مەیینی خوێنی سی و سیسبوون و جەڵدەی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوێنبەربوون، تا، ئازاری پشت، تەشەنوج، ئۆدیمای سی، نزمبونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** خوێن لێبڕانی ماسولکەیی دڵ، بەپەلە پارێزکردن (دەست پێدەکات لە ٦ سەعاتی سەرەتای نیشانەکانی یەوە) ١٥ میلیگرام بەدەرزی دەمار یان بەدوایدا ئینفیوشنی دەماری ٥٠ میلیگرام سەرروی ٣٠ خولەك، پاشان ٣٥ میلیگرام سەرروی ٦٠ خولەك (سەرجەمی بڕی دەرمان ١٠٠ میلیگرام سەرروی ٩٠ خولەك). لەو نەخۆشانەی کەمتر لە ٦٥ کیلۆ گرامن ١٥ میلیگرام بە دەرزی دەمار، بەدوایدا ئینفیوشنی دەماری ٠,٧٥ میلیگرام/کیلۆگرام سەرروی ٣٠ خولەك،پاشان ٠,٥ میلیگرام/کیلۆگرام سەرروی ٦٠ خولەك (لانی زۆری سەرجەمی بڕی دەرمان ١٠٠ میلیگرام سەرروی ٩٠ خولەك).

خوێن لێبڕانی ماسولکەیی دڵ دەست پێدەکات لە ٦ تا ١٢ سەعات لە سەرەتای نیشانەکانی یەوە ١٠ میلیگرام بە دەرزی دەمار، بەدوایدا ئینفیوشنی دەماری ٥٠ میلیگرام سەرروی ٦٠ خولەك پاشان ٤ ئینفیوشن هەریەکەی ١٠

میلی‌گرام سەرووی ٣٠ خولەك (سەرجەمی بڕی دەرمان ١٠٠ میلی‌گرام سەرووی ٣ سەعات، لانی زۆر ١,٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام لەونەخۆشانەی کەمتر لە ٦٠ کیلۆگرامن).

مەینی خوێنی سی و گیرانی سی ١٠ میلی‌گرام بەدەرزی دەمار سەرووی ١ تا ٢ خولەك بەدوایدا ئینفیوشنی دەماری ٩٠ میلی‌گرام سەرووی ٢ سەعات، لانی زۆر ١,٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام لەونەخۆشانەی کەمتر لە ٦٥ کیلۆگرامن.

جەڵتەی تیژ (ئەبێت چارەسەر دەست پێبکات لە ٣ سەعات لە سەرەتای نیشانەکانی یەوە)، پێدانی دەرمان بەدەمار سەرووی ٦٠ خولەك، ٩٠٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام (لانی زۆر ٩٠ میلی‌گرام) سەرەتا لە ١٠٪ ی بڕی دەرمان بەدەرزی دەمارە ئەوەی کە ماوەتەوە بە ئینفیوشنی دەماری، بۆ پیرەکانی سەرووی ٨٠ ساڵ پێشنیار نەکراوە.

## ئەلۆپرینول: ALLOPURINOL

**ناوی بازرگانی:** Zyloprim , Zyloric,Aloprim

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٣٠٠ میلی‌گرامی و دەرزی ٥٠٠ میلی‌گرام.

**گرووپی دەرمان:** Antimetabolite

**بەکارهێنان:** بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی پاشاکان (دا ءالملوك) ئەویش بەکەم کردنەوەی ئاستی یوریك ئەسید لەشانەکان و لە خوێندا.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ێتخەوی، ئاوی سپی، خوێنبەربوونی لوت، هەڵوەرینی موو، خوران، هەوکردنی پێست، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، تێکچوونی هەرس، تێکچوونی گورچیلە، هەوکردنی جگەر، تا، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** بۆ پێشگرتن لە حەملە تیژەکانی نەخۆشی پاشاکان گەورەکان ڕۆژانە ١٠٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕێی پێ دەدرێت. لایەنی زۆر ڕۆژانە ٨٠٠ میلی‌گرامە. نەخۆشی پاشاکان و زیادبوونی یوریك ئەسیدی یەکەمی یان دووەمی دەرمان بەیەك بڕی دەرمان یان بڕی دەرمانی دابەشکراو پێی دەدرێت. بەڵام لە بڕی دەرمانی زیاتر لە ٣٠٠ میلی‌گرام دەرمان ئەبێت لە بڕی دابەشکراودا بێت. بۆ بەرگری لە حەملە تیژەکانی نەخۆشی پاشاکان گەورەکان ١٠٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە هەر هەفتەیەك ١ جار ئەتوانی کە بڕی ١٠٠ میلی‌گرامی بۆ زیادبکەین (لایەنی زۆر ٨٠٠ میلی‌گرامە) تا کاتێ کەبڕی ترشی یوریك بە ٦ میلی‌گرام یان کەمتر دەگات لە ڕۆژێکدا. بۆ دوبارە دروستبوونەوەی بەردەکانی ئۆگزالاتی کالسیۆم گەورەکان ٢٠٠ تا ٣٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە خۆراکی. بۆ بەرگری نەخۆشی گورچیلەیی یوریك ئەسیدی لە چارەسەری کیمیایی شێرپەنجەدا گەورەکان ٦٠٠ تا ٨٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە خۆراکی بۆ ماوەی ٢ تا ٣ ڕۆژ لەگەڵ وەرگرتنی بڕێکی زۆر شلەمەنی. زیادبوونی یوریك ئەسیدی دووەمی خراپ منداڵانی گەورەتر لە٦ساڵ ٣٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە خۆراکی( ١٠٠میلی‌گرام ٣ جار لە ڕۆژێکدا). منداڵانی کەمتر لە٦ ساڵ ١٥٠ میلی‌گرام ڕۆژانە خۆراکی (٥٠ میلی‌گرام ٣جار لە ڕۆژێکدا).

## ئەلمۆند ئۆیل: ALMOND OIL

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی بەستە و پارچەی بچوك.

**گروپی دەرمان:** نەرمکەرەوەEmoliant

**بەکارهێنان:** بۆ نەرم کردنەوەی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبوونی کێش، زیادبوونی زەخت، خەواڵویی.

**بڕی دەرمان:** مادەی خۆراکی و نەرمکەرەوەی خۆراکی هەیە وە نەرمکەرەوەی پێستیشی هەیە و هەریەکە بەپێستدا دەماڵرێت، لە ئیمەڵشنی خۆراکی ١٥ تا ٣٠ میلی گرام بەکاردەهێنرێت.

## ئەلمۆتریپتان: ALMOTRIPTAN

**ناوی بازرگانی:** Axert

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦,٢٥ و ١٢,٥ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Receptor agonist ٥HT١

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شەقیقە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکی دەم، تێکچوونی هەرس، گێژی، خەواڵویی، سەرئێشە، زیادبوونی لێدانی دڵ، ئازاری سنگ، دڵەکوتێ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ساڵ ٦,٢٥ تا ١٢,٥. ئەگەر سەرئێشە گەڕایەوە بڕی دەرمان دوبارەدەکەینەوە پاش ٢ سەعات، لایەنی زۆر ٢٥ میلی گرام/٢٤ سەعات.

## ئەلفا تۆکۆفیرۆڵ: ALPHA TOCOPHEROL

**ناوی بازرگانی:** Vedrop

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی خۆراکی ٥٠ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Vitamin

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونی ڤیتامین E بەهۆی خراپ مژین لە نەخۆشی زگماکی یان بۆماوەیی موزمینی کۆلیستاسیس(نەخۆشی ڕێگرتن لە چونی زەرداو لەهەر بەشێکی سیستمی زەرداوی لە جگەرەوە بۆ دوانزەگرێ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هەڵوەرینی موو. پەڵە، خوران. تێکچوونی خەستی ئاوگی پۆتاسیۆم و صۆدیۆم، لاوازی.

**بڕی دەرمان:** منداڵانی خوار ١٨ ساڵ، ڕۆژانە ١٧ میلی گرام/کیلۆگرام، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت هەر کاتێك پێویست بێت.



**ئەلفا تۆكۆفیرۆل:** ALPHA TOCOPHEROL ACETATE

**ناوی بازرگانی:** V.E susp.

**شێوەی دەرمان:** سەسپێنشنی ٥٠٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Vitamin

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری كەمبوونی ڤیتامین E بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** سكچوون، ئازاری سك بە بڕی دەرمانی زیاتر لە ڕۆژانە ١ گرام.

**بڕی دەرمان:** خراپ مژین لە نەخۆشی بوونەڕیشاڵی كیسەیی (Cystic fibrosis) نەخۆشی یەكی زكماكی یە كار دەكاتەسەر خانەكانی ڕژێنە دەردراوەكان وەك (ڕژێنی دەردانی چڵم و ئارەقە ڕژێنەكان و ئەوانی تر) گەورەكان ڕۆژانە ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام. مناڵانی ١ مانگ تا ١ ساڵ ڕۆژانە ٥٠ میلیگرام، ١ تا ١٢ ساڵ ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرام. خراپ مژین لەنەخۆشی كەمبوونی بێتالیپۆپرۆتین (بێتالیپۆپرۆتینیمیا) گەورەكان و مناڵان ڕۆژانە ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام/ كیلۆگرام. خراپ مژین لە نەخۆشی موزمینی كۆلیستاسیس و نەخۆشی توندی جگەر ساواكان ڕۆژانە ١٠ میلیگرام/كیلۆگرام. ١ مانگ تا ١٢ ساڵ سەرەتا ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرام بڕی دەرمان ڕێكدەخرێت بەپێی كاردانەوەكەی، تا ڕۆژانە ٢٠٠ میلیگرام/كیلۆگرام لەوانەیە پێویست بێت. مناڵانی ١٢ تا ١٨ ساڵ سەرەتا ڕۆژانە ٢٠٠ میلیگرام، بڕی دەرمان ڕێكدەخرێت بەپێی كاردانەوەكەی. تا ڕۆژانە ٢٠٠ میلیگرام/كیلۆگرام لەوانەیە پێویست بێت. بەدەرزی ماسولكەیی ساواكان ١٠ میلیگرام كیلۆگرام ١ جار لە مانگێكدا. مناڵی ١ مانگ تا ١٨ ساڵ ١٠ میلیگرام/ كیلۆگرام (لایەنی زۆر ١٠٠ میلیگرام) ١ جار لە مانگێكدا. بۆ كەمبوونی ڤیتامین E ساواكان ١٠ میلیگرام/كیلۆگرام ڕۆژانە ١ جار. مناڵانی ١ مانگ تا ١٨ ساڵ ٢ تا ١٠ میلیگرام//كیلۆگرام ڕۆژانە، تا ٢٠ میلیگرام/كیلۆگرام بەكاردەهێنرێت.

**ئەلۆسیترۆن:** ALOSETRON HCL

**ناوی بازرگانی:** Lotronex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٥ و ١ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** ٥HT٣ Receptor antagonist

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری سكچوونی زۆر توند و گرژبوونی كۆڵۆن(IBS) و تێكچوونی هەرس و هەرسنەكردن بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** ئازاری سك، سەرئێشە، هێڵنجدان، قەبزی، پەڵە، غازات، خوێنبەربوونی مایەسیری، هەوكردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، هەوكردنی میزەڕێ.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ٥,٠ تا ١ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار.

## ئەلپرۆستادیل: ALPROSTADIL

**ناوی بازرگانی:** Caverject

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥ و ١٠ و ٢٠ و ٤٠ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Prostaglandin

**بەکارهێنان:** بۆ باش کارنەکردنی سێکسی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونی لێدانی دڵ، سورهەڵگەڕان، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی لێدانی دڵ وەستانی دڵ، تۆدیما، لەرینەوەی سکۆڵەیی، تا، تەشەنوج، خوێنبەربوونی مێشك، سکچوون، ئازاری بۆری میز، هەناسە وەستان، ئازاری ئەندامی زاوزێی پیاوان. ئازاری پشت و حەوز.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢,٥ تا ٦٠ مایکرۆگرام لە ناوەوەی بۆشایی دەدرێت.

## ئەلپرۆزۆلام: ALPROZOLAM

**ناوی بازرگانی:** Xanax, xanor, Apo Alpraz ,Niravam

**شێوەی دەرمان:** حەبی٠,٢٥ و ٠,٥ و ١ و ٢ میلیگرامی و حەبی ٣ میلیگرامی و گیراوەی ١ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Anxiolytic

**بەکارهێنان:** ئارامکەرەوە و خەوهێنەرەو دژی قەلەقی و ترس وخەمۆکی و دڵەڕاوکێ و تێکچوون بەهۆی دڵەڕاوکێ و ترسەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، لەرزین، تێکچوونی هاوسەنگی، بێهۆشی، تەنگەنەفەسی، تێکچوونی بینین، کەمبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی لێدانی دڵ بێهێزی، ناجێگیری، گۆڕانی ECG، خەوالّویی، خەیاڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٢٥ تا ٠,٥ میلیگرام ٣ جار لە ڕۆژێکدا (پیرەکان و کەمتواناکان ٠,٢٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار)، لایەنی زۆری بری دەرمان ڕۆژانە ٤ میلیگرامە. منالآن ٠,٠٠٥ تا ٠,٠٢ میلیگرام/کیلۆ گرام ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## ئەلپرینۆلۆل: ALPRINOLOL HCL

**ناوی بازرگانی:** Aptin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Beta blocker



**بەکارهێنان:** دژی پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری سنگ و نارێکی لێدانی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێلاکبوون، کەمبوونەوەی ئارەزوی سێکسی، سەرگێژبوون، نەخۆشی دەماری موحیگی، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ نزمبوونەوەی پەستانی خوێن. هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون. بلۆقکردنی پێستی.

**بڕی دەرمان:** بۆپەستانی خوێن لە گەورەکان ۲۰۰ میلیگرام لەڕێگەی خۆراکی یەوە ڕۆژانە لە ٤ ژەمدا. لایەنی زۆر ڕۆژانە ۸۰۰ میلیگرام. بۆ ئازاری قەفەزەی سنگی گەورەکان ٥٠ تا ۱۰۰ میلیگرام لە ڕێگەی خۆراکی یەوە ٤ جار لە ڕۆژێکدا. لە پەککەوتنی جگەرو گورچیلەدا ئەبێت بڕی دەرمان کەمبکرێتەوە.

## ئەلتریتامین: ALTRETAMINE

**ناوی بازرگانی:** Hexalen

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Alkylating agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی هێلکەدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون. بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان، هیلاکبوون، بوونی خوێن لەپیسایی دا، خوران، خوێنبەربوون، تا، لەرز، ئازار، سوتانەوە، لەرزین. بێخەوی، هەڵوەرینی موو، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۲٦۰ میلیگرام/مەتردوجا لە هەر ڕۆژێکدا بەشێوەی خۆراکی لە ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا پاش لە خواردن یان لەکاتی خەودا بۆ ماوەی ١٤ تا ۲۱ ڕۆژی یەك لە دوای یەك بۆ خولی ٤ هەفتەیی.

## ئەلەمنیۆم ئەسیتەیت: ALUMINIUM ACETATE

**ناوی بازرگانی:** Domeboro

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گیراوەی مەوزوعی.

**گروپی دەرمان:** Astringent

**بەکارهێنان:** هێورکەرەوەی ئیلتیهابی پێست وبۆ چارەسەری ئیلتیهابی گوێی دەرەوە و زیپکە و پەڵە و خوران ونارەقکردنەوەی پێ و ئەکزیما و ئاوسان و ئیلتیهابی نێوان پەنجەکانی پێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێست، ئیلتیهاب و وشکبوونەوەی پێست.

**بڕی دەرمان:** ئەگەر پێست ئیلتیهابی هەبێت لەگیراوەی ۱۰٪ ۳ جار لە ڕۆژێکدا سودی لێوەردەگیرێت.



## ئەلەمنیۆم کاربۆنەیت: ALUMINIUM CARBONATE

**ناوی بازگانی:** Basaljel

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەب و کەپسول

**گروپی دەرمان:** Antacid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیادبوونی ترشەڵۆکی گەدە و لە نەخۆشی دڵەکزە و کاردانەوەی ترشەڵۆکی گەدە و هەرسنەکردنی ترشەڵۆکی گەدە و برینی گەدەو بۆ کۆنترۆڵکردن و ڕێکخستنی ئاستی فۆسفاتی لەش و لەگەڵ ژەمێکی کەمی فۆسفات بۆ بەرگری کردن لە دروستبوونی بەردی فۆسفاتی میزەڕۆ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەگرانی هەناسەدان، داخستنی گەروو، ئاوسان، قەبزی، زیادبوونی شلە.

**بڕی دەرمان:** لەگەڵ پەرداخێکی پڕ لەئاودا بەکاردێت.

## ئەلەمنیۆم کلوراید: ALUMINIUM CHLORIDE

**ناوی بازگانی:** Driclor , drysol

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گیراوەی ٢٠٪.

**گروپی دەرمان:** Antiperspirant

**بەکارهێنان:** دژی ئارەقکردنەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئەبێتە هۆی ڕوشانی پێست، سوتانەوە، خوران، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** پاش لە حەمام کردن یان خاوێن کردنەوەی شوێنی مەبەست شەوی ١ جار پێی دا بماڵرێت و پاش لە نەمانی ئارەقی زیادە هەفتەی ١ یان ٢ جار بماڵرێ بەشوێنی مەبەستدا.

## ئەلەمنیۆم هایدرۆکسید: ALUMINIUM HYDROXIDE

**ناوی بازرگانی:** Aludrox, Alegel

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠٠ و ٦٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ٣٢٠ و ٦٠٠ میلیگرام/٥میلیلیتر و مەڵهەمی ٠,٢٧٥٪.

**گروپی دەرمان:** Antiacid

**بەکارهێنان:** دژی ترشەڵۆکی گەدە، برینی گەدە و دوانزەگرێ و دڵەکزە و تێکچوونی گەدە و خوێنبەربوونی هەرس وبۆ هێنانەخوارەوەی فۆسفاتی خوێن نیلتیهابی سورێنچك بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** قەبزی، کەمبوونەوەی فۆسفات، نەمانی ئارەزوی خواردن. ژەهراوی بوون بە ئەلەمنیۆم، بێهێزی ماسولکەیی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ تا ١٥٠٠ میلیگرام یان ١٠ تا ٣٠ میلی لیتر لە سەسپێنشن هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك،منالآن ٥٠ تا ١٥٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا یان ٥ تا ١٥ میلی لیتر لە سەسپێنشن هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك.

**ئەلمنیوم ئیَم جی:** ALUMINIUM MG

**ناوی بازرگانی:** Almox, Gelotal, Maalox

**شێوەی دەرمان:** حەبی کرماندن هایدرۆکسید ئەلەمنیۆم ٢٠٠ میلیگرام و هایدرۆکسید مەگنسیۆم ٢٠٠ میلیگرام سەسپێنشنی هایدرۆکسید ئەلەمنیۆم ٢٢٥ میلیگرام/٥میلیلیتر و هایدرۆکسید مەگنسیۆم ٢٠٠ میلیگرام/٥میلی لیتر.

سەسپێنشنی هایدرۆکسید ئەلەمنیۆم ٢٢٥ میلیگرام/٥میلیلیتر و شەربەتی هایدرۆکسیدی مەگنسیۆم ٢٠٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر هەیە.

سەسپێنشنی هایدرۆکسیدی ئەلەمنیۆم ٥٦٤ میلیگرام و شەربەتی هایدروکسیدی مەگنسیۆم ١٧٤ میلیگرام.

**گروپی دەرمان:** Antiacid

**بەکارهێنان:** دژی ترشەڵۆکی گەدە ودڵەکزە و برینی گەدە و دوانزەگرێ و هەرسەکردن و بۆ هاوتاکردنی ترشەڵۆکی گەدە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کرژبوونی گەدە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی جوڵەی ڕیخۆڵە، سپی بوونەوەی پیسایی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان شەربەتی ٥تا٢٠میلی لیتر شەربەت ڕۆژی ٤ جار , ١تا٤حەب ٤ جار لەڕۆژێکدا. ئەبێت ٢٠ خولەك تا کاتژمێرێك پاش لە خواردن و پێش لە خەوتن بەکاردەهێنرێت.منالآن کەمتر لە ٦ سال ٥تا١٠ میلیلیتر شەربەت ٤جار لە ڕۆژێکدا.

**ئەلومنیوم ئیَم – جی – ئیَس:** ALUMINIUM MGS

**ناوی بازرگانی:** Magel,Simeco,Gilusil,Gastry

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٢٥ میلیگرامی هایدرۆکسیدی ئەلەمنیۆم و ٢٠٠ میلیگرامی هایدرۆکسیدی مەگنسیۆم و ٢٥ میلیگرامی سایمتیکون هەیە.

سەسپێنشنی(Sachet) ٢٢٥ میلی‌گرام/٥میلی‌لیتر هایدرۆکسیدی ئەلەمنیۆم و ٢٠٠ میلی‌گرام/٥میلی لیترهایدرۆکسیدی مەگنسیۆم و سایمتیکۆن ٢٥ میلی‌گرام/٥میلی لیتری هەیە.

سەسپێنشنی ٢٢٥ میلی‌گرام/٥میلی‌لیتر هایدرۆکسیدی ئەلەمنیۆم و ٢٠٠ میلی‌گرام/٥میلی لیترهایدرۆکسیدی مەگنسیۆم و سایمتیکۆن ٢٥ میلی‌گرام/٥میلی لیتری هەیە.

**گروپی دەرمان:** Antacid

**بەکارهێنان:** دژی ترشەڵۆکی گەدە و غازات و هەرسنەکردن و دڵەکزە و ترشبوونی گەدە و بۆ هاوتاکردنی ترشەڵۆکی گەدە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، قەبزی، پەڵە، خوران، ئاوسان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکان دا ١ تا ٢ حەب یان ٥ تا١٠ میلی لیتر سەسپێنشن هەر ٢ تا ٤ کاتژمێر لە نێوان ژەمەکانی خواردن وپێش خەوتن.

## ئەلڤێرین سیترەیت: ALVERINE CITRATE

**ناوی بازرگانی:** Spasmonal

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٦٠ و ١٢٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antispasmodic

**بەکارهێنان:** یارمەتیدەرە لە تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە کە دەناسرێتەوە بە کرژبوونی ماسولکەی خۆنەویست، ئازاری بێ نوێژی سەری مانگ لە ئافرەتاندا.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سەرئێشە، گێژی، پەڵە، خوران، هیپاتیت (ئیلتیهابی جگەر).

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ ساڵ، ٦٠ تا ١٢٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ تا ٣ جار.

## ئەمانتادین: AMANTADINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Symmetrel

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠٠ میلی‌گرامی و حەبی ١٠٠ میلی‌گرامی و گیراوەی ٥٠ میلی‌گرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی ڤایرۆسە و بۆ چارەسەر و پێشگری لە هەوکردنی ڤایرۆسی ئەنفلۆنزایی و چالاکی دۆپامین زیاد دەکات لەمێشکدا و بۆ چارەسەری پارکینسۆن (لەرزینی خۆنەویستی ئەندامەکان) بەکاردەهێنرێت.



**کاریگەری لاوەکی:** بێخەوی، بێهێزی، خەمۆکی، کۆبوونەوەی ناو لەلەشدا. سەرگێژبوون، وشکبوونەوەی دەم، زۆر میزکردن، ناجێگیری، خەواڵوویی، نزمبوونەوەی پەستان، تێکچوونی بینین. هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، پەڵە، نەکزیما(بیرۆ)، هەستیاربوونی بە ڕووناکی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری ئەنفلۆنزا گەورەکان ٢٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ڕێی پێ دەدرێت یان ٢ جار لە ڕۆژێکدا و هەرجارەی ١٠٠ میلی‌گرام.

لە منالآنی ١ تا ٩ ساڵ ٤,٤ تا ٨,٨ میلی‌گرام/کیلۆگرام ٢ جار لە ڕۆژێکدا لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٥٠ میلی‌گرامە.

منالآنی ١٠ تا ١٢ ساڵ ١٠٠ میلی‌گرام خۆراکی لە ڕۆژێکدا لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ نەخۆشی پارکنیـــون (لەرزینی خۆنەویستی دەستەکان، و ئەندامەکانی لەش) ١٠٠ میلی‌گرام ٢ جار لە ڕۆژێکدا.

## ئامبنونیۆم کلۆراید: AMBENONIUM

**ناوی بازرگانی:** Mytelase chloride

**شێوەی دەرمان:** حەب ١٠ میلی‌گرامی.

**بەکارهێنان**ی دەرمان: دژی نەخۆشی لاوازی ماسولکەیی و نەتوانیتی بەڕێدا ڕۆیشتن ( Myasthenia gravis) بەکاردێت.

**گرووپی دەرمان:** Anticgolinesterase

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، سەرئێشە، سکچوون، گێژی، هێڵنجدان، کۆکە، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ کەمبوونەوەی پەستانی خوێن، ڕشانەوە، زیادبوونی لیك، کرژبوونی ماسولکە، تێکچوونی بینین، فرمێسك ڕشتن، تا، لاوازی ماسولکەیی، کرژبوونی بۆری هەوا.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکاندا ئاسایی ٥ تا ٢٥ میلی‌گرام خۆراکی، ڕۆژانە ٣تا ٤ جار.

لە منالآنیش سەرەتا ٠,٣ میلی‌گرام/کیلۆگرام لەڕۆژێکدا ٣ جار. یان ١٠ میلی‌گرام/مەتردوجا، لایەنی زۆر ڕۆژانە ١,٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام هاوتای ٥٠ میلی‌گرام/مەتردوجا لە ٣ یان ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## ئەمبریسینتان: AMBRISENTAN

**ناوی بازرگانی:** Letairis

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ میلی‌گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Endothelin receptor antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبوونەوەی پەستانی سی یە خوێنبەر بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گیرانی لوت. کۆبوونەوەی ئاو لە لەشدا، قەبزی، ئاوسان، تەنگەنەفەسی، زیاد لێدانی دڵ ئازاری گەدە، سوربونەوە، جیوب. دڵەکوتێ، کەمبوونەوەی هیمۆگلۆبین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی زیاتر لە ١٨ساڵ ٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١جار.

## ئەمیفامپریدین: AMIFAMPRIDINE

**ناوی بازرگانی:** Firdapse

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Acetylcholine –release enhancer

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نیشانەی نەخۆشی (LEMS) نەخۆشی یەکی دەگمەنی ماسولکە و دەماری گەیاندنە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، نارێکی لێدانی دڵ دڵەکوتێ، نەخۆشی ڕایناد، کۆکە، ڕەبۆ، تێکچوونی خەو، تەشەنوج، قەلەقی، خەواڵویی. گێژی، بێهێزی، سەرئێشە، کرژبوونی ماسولکە، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ساڵ، سەرەتا ڕۆژانە ١٥ میلیگرام لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، زیاد دەکرێت لە هەنگاوەکانی ٥ میلیگرامی هەموو ٤ تا ٥ ڕۆژێك، بۆ لایەنی زۆر ڕۆژانە ٦٠ میلیگرام لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لایەنی زۆری یەك بڕی دەرمان ٢٠ میلیگرامە.

## ئەمیفۆستین: AMIFOSTINE

**ناوی بازرگانی:** Ethyol

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Cytoprotective agent

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری و کەمکردنەوەی تێکچوونی گورچیلەیی لەو نەخۆشانەی بڕێکی زۆری سیزپلاتینیان وەرگرتووە بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتووی هێلکەدان و بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی نەخۆشی مامناوەند و توندی وشکی دەم لەو نەخۆشانەی کە چارەسەری تیشکییان بۆکراوە لە ڕژێنی نزیکی گوێ دا بۆ شێرپەنجەی سەر و مل بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، گێژی. بێخەوی، تەشەنوج، پژمین، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، سوربونەوە، کەمبوونەوەی کالسیۆم، خەواڵویی.

**بڕی دەرمان:** ٩١٠ میلیگرام/مەتردوجا بەدەمار IV ڕۆژانە بۆ زیاتر لە ١٥ خولەك، ٣٠ خولەك پێش لە چارەسەری کیمیایی وەردەگیرێت.

## ئەمیکاسین سەلفەیت: AMIKACIN SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Amikin , Biklin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ و ٢٥٠ میلیگرام/میلیلیتر (٢ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنە توندەکانی ڕێڕەوی میز و هەناسەدان و ئێسك و جومگە و پەردەکانی مێشك و دڵ و هەوکردنی خوێن و هەوکردن بەهۆی گرام نێگەتیڤەکانی تر کە مقاومن بە جێنتامایسین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێهێزی، بێحاڵی، سکچوون، کەمبوونەوەی بیستن، حەساسیەت، سەرگێژبوون، ناتەواوی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** بۆ هەوکردنی توند و هەوکردنی ڕێڕەوی میز و هەناسەدان و هەوکردنی پەردەی دڵ و هەوکردنی خوێن و هەوکردن بەهۆی سیدۆمۆناس و گرامنێگەتیڤەکانی تر گەورەکان و منداڵان ١٥ میلیگرام/ کیلۆ گرام ڕۆژانە ماسولکەیی یان ئینفیوشنی دەماری. ( ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیلیتر تواوە لە ( D.W ٥٪) لە ماوەی ٣٠ تا ٦٠ چرکەدا بەڕێگەی IV ئینفیوشن دەبێت، هەر ٨ تا ١٢ سەعاتێك. لانی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١,٥ گرام یان ١٥ میلیگرام/کیلۆگرام. ساوایان ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام ماسولکەیی یان ئینفیوشنی دەماری (لە گیراوەی D.W ٥٪ تواوە و لە ماوەی ١ تا ٢ سەعات ئینفیوشن دەکرێت)، پاشان ٧,٥ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ١٢ سەعاتێك. بۆ هەوکردنی پەردەکانی مێشك گەورەکان وەك چارەسەری هەوکردنە توندەکانە. ئەتوانی تا ٢٠ میلیگرام لەناوکیفدا یان لەناو سکۆڵەدا ڕێی پێ دەدرێت. منداڵان وەك چارەسەری هەوکردنە توندەکانە. ئەتوانی تا ١ – ٢ ٢٠ میلیگرام لەناو سکۆڵەدا ڕێی پێ دەدرێت. هەوکردنی ڕێڕەوی میز گەورەکان ٢٥٠ میلیگرام ماسولکەیی یان دەماری ڕۆژانە ٢ جار ڕێی پێ دەدرێت. بۆ سیل ١٥ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ماسولکەیی ٥ جار لە هەفتەیەکدا (بڕی دەرمان دەبێت لەگەڵ بڕی دەرمانەکانی تری دژی نەخۆشی سیلدا ڕێکبخرێت).

## ئەمیلۆراید: AMILORIDE

**ناوی بازرگانی:** Amilamont

**شێوەی دەرمان:** حەب ئەمیلوراید ٥ میلیگرام و گیراوەی خۆراکی ٥ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Potassium –sparing diuretic

**بەکارهێنان:** میزهێنەرەو بۆ چارەسەری کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا (ئۆدیما) پەستانی بەرزی خوێن و پەککەوتنی دڵ و هایپۆکالیمیا (کەمی پۆتاسیۆم لەخوێندا) بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، وشکی دەم، پەڵە، شڵەژان، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی صۆدیۆم، زیادبوونی پۆتاسیۆم.

**بڕی دەرمان:** بە تەنها سەرەتا ڕۆژانە ١٠ میلی‌گرام یان ٥ میلی‌گرام ڕۆژانە ٢ جار، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بەپێی کاردانەوەکەی لانی زۆر ڕۆژانە ٢٠ میلی‌گرام. لەگەڵ میزپێکەرەکانی تردا، پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو یان پەستانی بەرزی خوێن سەرەتا ڕۆژانە ٥ تا ١٠ میلی‌گرام، نەخۆشی جگەری (Cirrhosis) لەگەڵ ئاوبەندی سەرەتا ڕۆژانە ٥ میلی‌گرام.

## ئەمیلۆراید – ئێچ: AMILORIDE-H

**ناوی بازرگانی:** Amilamont, Midamor Maduretic

**شێوەی دەرمان:** حەب ئەمیلوراید ٥ میلی‌گرام و هایدرۆکسیدکلۆروپایەزید ٥٠ میلی‌گرام.

**گروپی دەرمان:** Potassium –sparing diuretic

**بەکارهێنان:** میزهێنەرەو بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا (ئۆدیما) بەهۆی پەککەوتنی دڵەوە خوێنتێزراو و هایپۆکالیمیا(کەمی پۆتاسیۆم لەخوێندا) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، سەرئێشە. غازات، بێهێزی، خەوالوّیی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، نارێکی لێدانی دڵ زۆر میزکردن، کەمبوونەوەی ئارەزوی سێکسی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوران، قەبزی، ئازاری سك، خوێنبەربوونی GI، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، کەمبوونەوەی صۆدیۆم و کلۆرو، زیادبوونی پۆتاسیۆم، کرژبوونی ماسولکە. ئازاری پشت. ئازاری قەفەسەی سنگ، بلۆقکردنی پێست، گێژی، خەمۆکی.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکاندا ١ حەب لە ڕۆژێکدا. ئەتوانی زیادی بکەیت تا ٢ حەب لە ڕۆژێکدا. لایەنی زۆر ٤ حەب لە ڕۆژێکدا.

## ئەمینۆ ئەسیتیك ئەسید: AMINO ACITIC ACID

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گیراوە لە دەفری چەند لیتریدا.

**گروپی دەرمان:** ئەمینۆئەسیدەکان.

**بەکارهێنان:** بۆ شۆردنەوە و پاککردنەوەی ڕێڕەوی میزو، دژی هەوکردن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەیfolic acid ، تێکچوونی جگەر، تێکچوونی زیندە چالاکی.

**بڕی دەرمان:** بەپێی پێویستی بەکاردەهێنرێت.



## ئەمینوکا پرۆیك ئەسید: AMINOCAPROIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Amicar

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠ و ٤٠٠ میلی‌گرام / میلی‌لیتر (١٠میلی‌لیتر) و حەبی ٥٠٠ میلی‌گرامی و شروبی ٢٥٠ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antithrombotic agent

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵکردنی خوێنبەربوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، سەرئێشە، هێڵنجدان، ئازار و کرژبوونی سك، سکچوون، تەشەنوج، خەیاڵ بێهێزی، بێحاڵی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ناڕێکی لێدانی دڵ کەمبوونەوەی لێدانی دڵ گیرانی لوت، ناتەواوی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەعاتی یەکەم ٤ تا ٥ گرام بەڕێگەی IV دواتر ١ تا ١,٢٥ گرام/سەعات بەڕێگەی IV ئینفیوشنی بەردەوامی دەماری بۆ ماوەی ٨ سەعات یان تاکاتی کۆنترۆڵکردنی خوێنبەربوون، بەردەوام بێت، لایەنی زۆر بڕی دەرمان ٣٠ گرامە. منالآن سەعاتی یەکەم ١٠٠ میلی‌گرام/ کیلۆگرام یان ٣ گرام/ مەتردوجا بەڕێگەی IV دواتر ٣٣,٣ میلی‌گرام/کیلۆگرام یان ١ گرام/ مەتردوجا / سەعات بەڕێگەی IV ئینفیوشن، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٨ گرام/مەتردوجایە.

## ئەمینۆ ئەسید: AMINO ACID

**ناوی بازرگانی:** Aminosyn

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی دەرزی ١٠٪و ٥٪.

**گروپی دەرمان:** Amino Acid Combination

**بەکارهێنان:** بۆ خۆراك پێدانی خوێنهێنەر، پارێزگاری لە پرۆتینی لەش، خۆراکی یارمەتی لە نەخۆشی یەکانی شێرپەنجەیی، هەوکردنی جگەر نەخۆشی جگەر و سوتانەوە توندەکان و هەوکردن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی هۆشیاری، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، هێڵنجدان، سەرگێژبوون، کۆبوونەوەی ئاو لە سی یەکاندا، ئازاری ماسولکەیی، نەمانی هاوسەنگی ئەلیکترلیتەکان، ڕشانەوە، زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر، کەمبوونەوەی کالسیۆم، زیادبوونی شەکری خوێن، کەمبوونەوەی فۆسفات.

**بڕی دەرمان:** لەڕێگەی دەماری موحیگی١تا ١,٧ گرام/کیلۆگرام،لەڕۆژێکدا لەگەڵ مادە ئەلیکترولیتی یە پێویستەکان،لەڕێگەی دەماری ناوەندی ٥٠٠ میلی‌لیتر لە گیراوەی ئەمینۆئەسید و ٥٠٠میلی‌لیتر (D5W) لەگەڵ ئەلیکترۆلیتەکان و ڤیتامینەکان لە ماوەی ٨ سەعاتدا ڕێی پێ دەدرێت.

**ئەمینۆ گلوتیپیماید:** AMINOGLUTETHIMIDE

**ناوی بازرگانی:** Cytadren, Orimeten

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی کوشینگ و هایپەرپلازی ئەدرینالّ و برینی ئەدرینالّینی دەرمانی و دژی شێرپەنجەی مەمك و پرۆستات بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون. خەوالّویی، زیادبوونی لێدانی دلّ زیادبوونی پەستانی خوێن، خوران، پەڵە، گێژی، هێڵنجدان. ڕشانەوە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن، تا، ناتەواوی ئەدرینالّ، زۆربوونی موو، زیادبوونی پایرۆید، ئازاری ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ حەب ٤ جار لە ڕۆژێکدا، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢ گرامە.

**ئەمینۆفیلین:** AMINOPHYLINE

**ناوی بازرگانی:** Phyllocontin,Amoline

شێوە ی دەرمان: حەبی ١٠٠ و ٢٠٠ میلی گرامی و دەرزی ٢٥٠ میلی گرامی و ٢٥ میلی گرام/میلی لیتر و گیراوەی ١٠٥میلی گرام/میلی لیتر و شروب و گیراوەی ١٢٥ و ٢٥٠ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Bronchodialator

**بەکارهێنان:** بۆ فراوانکردنی بۆری هەوا و دژی نەخۆشی تە تەنگەنەفەسی و هەوکردنی بۆرێچکەکان و کرژبوونی بۆری هەواو ڕەبۆ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، تەشەنوج، ڕشانەوە، گێژبوون، خێرا لێدانی دلّ ناجێگیری، سەرئێشە، بێخەوی، تا، سکچوون، نارێکی لێدانی دلّ کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، زیادبوونی شەکری خوێن، ڕوشانی مەوزوعی، دابەزینی توندی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ٦ میلی گرام بەپێی هەر کیلۆگرامێك کێشی لەش لە ڕێی دەمارەوە بە هێواشی، پاشان ٠,٤ تا ٠,٩ میلی گرام/کیلۆگرام/سەعات بە ڕێگەی IV بەردەوام.منالاّن ٦ میلی گرام بەپێی هەر کیلۆگرامێك کێشی لەش لە ڕێی دەمارەوە بە هێواشی، منالّی ٦ مانگ ٠,٥ میلی گرام/کیلۆگرام /سەعات. ٦ مانگ تا ١ سالّ ٠,٦ تا ٠,٧ میلی گرام/کیلۆگرام /سەعات. ١تا ٩ سالّ ١ تا ١,٢ میلی گرام/کیلۆگرام/سەعات. منالّی ٩ تا ١٢ سالّ ٠,٩ میلی گرام/کیلۆگرام/سەعات. گەورەتر لە ١٢ سالّ میلی گرام/کیلۆگرام/سەعات بەڕێگەی ئینفیوشنی دەماری بەردەوام. منالاّن ٦,٣ میلی گرام/کیلۆگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا.



## ئەمایۆدارۆن: AMIODARONE HCL

**ناوی بازرگانی:** Cordarone, Pacerone

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٢٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی و دەرزی ٥٠ میلیگرام/ میلیلیتر (٣ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antiarrhythmic

**بەکارهێنان:** دژی نارێکی لێدانەکانی دڵ و بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕیتمی نائاسایی دڵ و زیادبوونی لێدانی دڵ و بۆ گەڕانەوەی دڵ بۆ بارێکی ئاسایی و بۆ چارەسەری ئازاری سنگ و نارێکی دڵی سکۆڵەیی و سەرو سکۆڵەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی فۆلیك ئەسید، تێکچوونی جگەر، بێهێزی، هیلاکبوون، ڕشانەوە، وشکبوونەوەی چاو، سەرئێشە، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، نارێکی لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستان، تێکچوونی بینین، هەستیاربوون بەڕوناکی، زیادبوون و کەمبوونی پایرۆید، هێڵنجدان، تێکچوونی زینده چالاکی، تێکچوونی سی یەکان.

**بڕی دەرمان:** لە تەمەنی گەورەکاندا سەرەتا ٨٠٠ تا ١٦٠٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا بە ماوەی ١ تا ٣ هەفتە، وە بۆماوەی یەك مانگ ٦٠٠ تا ٨٠٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا. وە دواتر ٢٠٠ تا ٤٠٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا. لە منالاّن ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا بۆماوەی ١٠ ڕۆژ و پاشان ٥ میلیگرام لە ڕۆژێکدا بە شێوەی دەرزی دەمار IV.

## ئەمیسەلپراید: AMISULPRIDE

**ناوی بازرگانی:** Solian

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ١٠٠ و ٢٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی و گیراوەی ١٠٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شیزۆفرینیا (کەرتبوونی ژیری) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بێخەوی، خەمۆکی، خرۆشان، خەواڵویی، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکی دەم، زیادبوونی پرۆلاکتین، کەمبوونی لێدانی دڵ، فێ، زیادبوونی کێش، گێژی، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، زیاد لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** بۆ نەخۆشی ڕوداوی مێشکی تیژ ٤٠٠ تا ٨٠٠ میلیگرام ڕۆژانە لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بەپێی کاردانەوەکەی. لایەنی زۆر ڕۆژانە ١.٢ گرام، بۆ منداڵی خوار ١٥ساڵ پێشنیارنەکراوە. بە زۆری بۆ نیشانە نەخوازراوەکان ڕۆژانە ٥٠ تا ٣٠٠ میلیگرام. بۆ منداڵی خوار ١٥ ساڵ پێشنیارنەکراوە.

**ئەمیتریپتیلین:** AMITRIPTYLIN HCL

**ناوی بازرگانی:** Amitril, Elavil,Endep,vanatrip

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٥ و ٥٠ و٧٥ و ١٠٠ و ١٥٠میلیگرامی و دەرزی ١٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** دژی خەمۆکی و دڵەڕاوکێ و قەلەقی و ئازاری موزمین و بۆ پێشگری شەقیقە و میزکردنی شەوانە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالویی، سەرگێژبوون. سەرئێشە، هیلاکبوون، تەشەنوج، دڵەڕاوکێ، گێژی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، سکچوون، ڕشانەوە. شۆك، بەرزبوونەوەی پەستان، گۆڕانی ECG، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، کرژبوونی سك، وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی بینین، وشکبوونەوەی چاو، گەورەبوونی چاو، نارەقکردنەوە، زیادبوونی هەستیاری، هەستیاربوون بەڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** بۆ خەمۆکی گەورەکان ٧٥ تا ١٠٠ خۆراکی ڕۆژانە لە ٣ بڕی دەررمانی دابەشکراودا یان بەیەك بڕی دەرمان پێش لە خەوتن. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣٠٠ میلیگرامە. ڕێکخستنی بڕی دەرمان لەکەسانی بەتەمەن و نەوجەواناندا ١٠ میلیگرام ٣ جار لە ڕۆژێکدا و ٢٠ میلیگرام پێش لە کاتی خەوتن. بۆ چارەسەری ئازاری نیورۆجینیك (دەمار). ٢٥ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٤ جار. بۆ میزکردنی شەوانە و (ADHD) لە چارەسەری میزکردنی شەوانە بڕی دەرمانی سەرەتایی ڕۆژانە ٢٥ میلیگرامە، لە نەوجەواناندا ئەتوانی تا ٧٥ میلیگرام دۆز بەکاربهێنیت. منالآنی گەورەتر لە ٦ ساڵ ١میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا. لە منالآنی ٦ تا ١٠ ساڵ ١٠ تا ٢٠ میلیگرام کاتی خەوتن. لە مندالآنی گەورەتر لە ١٠ ساڵ ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام کاتی خەوتن. بۆ پێشگرتن لە شەقیقە گەورەکان ١٠ تا ١٧٥ میلیگرام، ڕۆژانە خۆراکی.

**ئەمیلۆدیپین:** AMLODIPINE

**ناوی بازرگانی:** Norvasc, Amolor,Istin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢.٥ و ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Calcium antagonist

**بەکارهێنان:** دژی پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری جێگیر و ناجێگیری سنگ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوربونەوە، زۆرلێدانی دڵ سك ئێشە. هێڵنجدان، سەرئێشە، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا، ئازاری سنگ، بێهێزی، سەرگێژبوون. هیلاکبوون. بێخەوی، ناڕێکی لێدانی دڵ خوران، ئازاری چاو، پەڵە، ئازاری ماسولکەیی، تەنگەنەفەسی، ئازاری قەفەسەی سنگ.

**بڕی دەرمان:** لە پەستانی خوێندا ڕۆژانە ٢.٥ تا ٥ میلیگرامە. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٠ میلیگرامە. لە ئازاری سنگ دا ڕۆژانە ٥ تا ١٠ میلیگرامە.



## ئەمۆنیۆم: AMMONIUM ALUMINUM SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Alum

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ٢٪و پاودەر.

**گروپی دەرمان:** Astringent

**بەکارهێنان:** لە ئامادەکردنی دەرمانەکانی پێستی و ددان شۆرەکان بەکاردێت. بۆ وەستێنەرەوەی خوێن لە ڕوشانی ڕوکاری، بڕاوی لێو برینی لێو و چارەسەری ئارەقکردنی مەوزوعی و خوێنبەربوونی میزەڵدان و شتنی میزەڵدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوونی GI، زیادبوونی ڕوشان.

**بڕی دەرمان:** بەپێی پێویستی بەکاردێت. لە گیراوەی ١٪ تا ٢٪ (نۆرماڵ سەلاین) بۆ شتنی میزەڵدان سودی لێوەردەگیرێت.

## ئەمۆنیۆم کلۆراید: AMMONIUM CHLORIDE

**ناوی بازرگانی:** Chlorammonic, Ammorchlor

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی و دەرزی.

**گروپی دەرمان:** Expectorant

**بەکارهێنان:** بەڵغەم دەرکەرو میزهێنەر و ترشکەری میزە و بۆ چارەسەری زۆربوونی تفتێتی شلەی لەش و شانەکان (ALKALOSIS) و کەمبوونەوەی کلۆرو بۆ دەفعکردنی دەرمانە تفتەکان و بۆ ئۆدیمای پێش لە بێ نوێژی مانگانە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبوونەوەی صۆدیۆم، پەڵە، سەرئێشە، خەواڵوی، خرۆشان، تێکچوونی ECG، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، زۆرمیزکردن، وەستانی هەناسە، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم، زیادبوونی کلۆر، زیادبوونی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** ٤تا١٢ گرام خۆراکی هەر ٤ تا ٦ سەعات ١ جار. لە گەورەکاندا بۆ زیادبوونی میز و چارەسەری بەڵغەم و (ALKALOSIS) ٣ جار لەڕۆژێکدا هەر جارەو ١ حەبی ٥٠٠ میلیگرامی. لە منالآندا ٧٥ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا و لە ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

ت: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی. لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێک نەخۆشی



### ئەمۆنیۆم هایدرۆکساید: AMMONIUM HYDROXIDE

**ناوی بازرگانی:** Traspica

**شێوەی دەرمان:** گیراوە لە دەفری چەند لیتری.

**گروپی دەرمان:** Antipruritic

**بەکارهێنان:** دژی خورانی پێست و ڕوشان و ئیلتیهابی پێست، پوچەڵکردنەوەی پێوەدانی مێرووەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تۆدیمایی مەوزوعی، فرمێسك ڕشتن، ڕشانەوە، هەوکردنی سی یەکان، شۆك، کۆکە، تۆدیمای ڕێڕەوی هەناسە، ڕوشانی چاو، سوتانەوەی قوڕگ و گەدە.

**بڕی دەرمان:** بە ئەندازە و بڕی پێویست بەکاردێت.

### ئەمودیاکوین: AMODIAQUINE HCL

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلیگرام.

**گروپی دەرمان:** Antimicrobial

**بەکارهێنان:** دژی میکرۆب، دژی مەلاریای (ڤالسی پاروم)بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی جگەر.

**بڕی دەرمان:** لەگەورەکاندا لە حاڵەتی توند و لەکەسانی نائارام سەرەتا ٦٠٠ میلیگرام و پاشان ٢٠٠ میلیگرام هەر ٦ کاتژمێرێك پێ دەدرێت وە لە ٢ ڕۆژی دواتر ٤٠٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا ڕێی پێ دەدرێت. لە منداڵیش لە حاڵەتی توندا وسەرەتا ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام، لە ٢ ڕۆژ دواتر هەر جارێك ئەندازە وبڕی ٥ میلیگرام/کیلۆگرام ڕێی پێ دەدرێت.

### ئەمۆرۆلفین: AMOROLFINE

**ناوی بازرگانی:** Loceryl

**شێوەی دەرمان:** وارنیش بۆ بۆیاخکردنی نینۆك ٥٪.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی نینۆك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوربونەوە، خوران، کزانەوە.

**بڕی دەرمان:** بۆ نینۆکی هەوکردوو بەکاردێت هەفتانە ١ تا ٢ جار پاش لە پاك و خاوێن کردنەوەی و وە وشك کردنەوەی (نزیکەی ٣ خولەك)، چارەسەری نینۆکی پەنجەکان بۆ ماوەی ٦ مانگ، نینۆکی پەنجەی پێ بۆ ماوەی ٩ تا ١٢ مانگ ( پێداچونەوەی لە ماوەی ٣ مانگدا). دووربکەونەوە لە وارنیش (بریقەپێدانی نینۆك) یان **بەکارهێنانی** نینۆکی دەستکرد لە ماوەی چارەسەرکردندا.



### ئەمۆکسیسیلین: AMOXICILLIN

**ناوی بازرگانی:** Amoxil, Laratid,Polymox

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ۲٥۰ و ٥۰۰ میلی‌گرامی و حەبی کرماندن ۱۲٥ و ۲۰۰ و ۲٥۰ و ٤۰۰ میلی‌گرامی و سەسپێنشنی ٥۰ میلی‌گرام/میلی‌لیتر، ۱۲٥و۲۰۰ و ۲٥۰ و ٤۰۰میلی‌گرام/٥میلی‌لیتر و حەبی ٥۰۰ و ۸۷٥ و ۷۷٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنێك بەکاردێت بەهۆی ڕێژەیەکی زۆری بەکتریاوە یان وردەزیندەوەرەکانی ترەوە بێت.دژە هەوکردنی بەشە جیاوازەکانی لەش، دژی هەوکردنی گوێ و لوت و قورگ و پێست و ڕێڕەوی میز و بەشی خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسە و سوزەنەك و بەکتریایH pylori بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون. پەڵە، کەمخوێنی. تێکچوونی گەدە، دڵەڕاوکێ، گێژی، خەمۆکی، تەشەنوج، هیلاکبوون، هەوکردنی دەزگای زایەندی ژنان. کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، زیادبوونی حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکاندا ڕۆژانە ۲٥۰ تا ٥۰۰ میلی‌گرام ۳ جار لە ڕۆژێکدا. یان ٥۰۰ تا ۸۷٥ ڕۆژانە ۲ جار. لە نەخۆشی سوزەنەك ۳ گرام لەگەڵ ۱ گرام دەرمانی پرۆبێنسید بە یەك بڕ پێی دەدرێت. لەمناڵاندا ۲٥ تا ٤۰میلی‌گرام /کیلۆگرام ڕۆژانە ۳جار.

### ئەمۆکسیسیلین & کلاڤیولانیك ئەسید: AMOXICILLIN & CLAVULANIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Augmentin

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی حەبی ٦۲٥ میلی‌گرام ٥۰۰ میلی‌گرام ئەمۆکسیلین و ۱۲٥ میلی‌گرام کلاڤیولانیك ئەسید و حەبی ۱۲٥/۲٥۰ و ۱۲٥/۸۷٥ میلی‌گرام و حەبی کرماندن ۳۱,۲٥/۱۲٥ و ۲۸,٥/۲۰۰ و ٦۲,٥/۲٥۰ و ٥۷/٤۰۰ میلی‌گرام و سەسپێنشنی۳۱,۲٥/۱۲٥ و ۲۸,٥/۲۰۰ و ٦۲,٥/۲٥۰ و ٥۷/٤۰۰ میلی‌گرام/٥ میلی‌لیتر و سەسپێنشنی ES ٤۲,۹/٦۰۰ میلی‌گرام/٥ میلی لیترو حەبی ٦۲,٥/۱۰۰۰ میلی‌گرام.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنە و بۆ چارەسەری هەوکردنی گوێی ناوەڕاست و سی یەکان جیوب و هەوکردنی پێستی و ڕێڕەوی میزو هەوکردنی گورچیلە و بەشی خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرگێژبوون. سکچوون. تەشەنوج. حەساسیەت، هەوکردنی زایەندی ژنان، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۲٥۰ تا٥۰۰ میلی‌گرام هەموو ۸ سەعات جارێك. یان ۸۷٥ میلی‌گرام هەموو ۱۲ سەعاتێك. مناڵانیش ۲۰ تا ٤۰ میلی‌گرام/کیلۆگرام هەر ۸سەعات جارێك.

تێ: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لەبەکارهێنانی دەرمان بۆ کەمکردنەوەی



## ئەمفۆ تریسین – بی: AMPHOTERICIN – B(systemic)

**ناوی بازرگانی:** Amphocin,Fungizone,Abelcet

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی کەڕووە و دژی هەوکردنی توندی کەڕووی ناوەوە وەك هەوکردنی کاندیدا و هەوکردنی کەڕوویی دەم و سورێنچك و پەردەکانی دڵ و مێشك و بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان. ڕشانەوە، تا، سك ئێشە، سەرئێشە، تەشەنوج، نارێکی لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی کێش. سکچوون، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم و مەگنسیۆم، کەمخوێنی، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآن هەندێ لەکەسانی تایبەتمەند ئەتوانی پێشنیاری بکەن سەرەتا ١ میلی گرام لە ٢٠ میلی لیتری گیراوەی ٥٪ D.W ماوەی ٢٠ خولەك لە ڕێگەی ئینفیوشنی دەماری بەکاردێت. ئەگەر نەخۆش تەحەمولی ٠,٢٥ تا ٠,٣ میلی گرام/کیلۆگرام و زیادکردنی تەدریجی ٥ تا ١٠ میلی گرام ڕۆژانە تا بە بڕی دەرمانی ١ میلی گرام/کیلۆگرام ڕۆژانە بگات. زیادکردنی ماوەی چارەسەر پەیوەستە بەتوندی هەوکردنەوە. بۆ سترێپتۆکۆزیس ٠,٤ تا ٠,٥ میلی گرام/ کیلۆگرام ڕۆژانە بەدەمار بۆ ماوەی ٩ مانگ (سەرجەمی بڕی دەرمانی دەمار لە ماوەی ٩ مانگدا ٢,٥ گرامە). بۆ ئەسپێرجیلۆسس ٠,٥ تا ٠,٦ میلی گرام/کیلۆگرام لەسەرەتا و سەرجەمی بڕی دەرمانی دەماری لە ماوەی ١١ مانگدا ١,٥ تا ٤ گرامە. کاندیدیاز ٠,٤ تا ٠,٦ میلی گرام/کیلۆگرام بە دەرزی دەماری، چارەسەر لانی کەم ٧ تا ١٤ ڕۆژ و پەیوەستە بەتوندی و ئەبێت ٦ هەفتە بەردەوامی هەبێت. هیستۆپلازمۆسس ٠,٥ تا ٠,٦ میلی گرام/کیلۆگرام ماوەی ٤ تا ١٢ هەفتە.

## ئەمفوتریسین – بی: AMPHOTERICIN–B topical

**ناوی بازرگانی:** Amphocin, Abelcet

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی ٣٪.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی کەڕووی پێستی و بۆ چارەسەری مەوزوعی هەوکردنی کەڕوویی کاندیدیازی پێستی یان دەمی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، ڕوشان. تا، لەرز، بێهێزی، هێڵندان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکان و منالآندا ڕۆژی ٢ تا ٤ جار بەشوێنی مەبەستدا بماڵرێت.



## ئەمپی سیلین: AMPICILIN

**ناوی بازرگانی:** Ampicin,Omnipen,Principen

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلی‌گرامی و سەسپێنشنی ١٠٠ میلی‌لیتر و ١٢٥ و ٢٥٠ میلی‌گرام/٥ میلی‌لیتر و دەرزی ١٢٥ و ٢٥٠ و ٥٠٠ میلی‌گرامی دەرزی ١ و ٢ و ١٠ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی گشتی و زۆربەی هەوکردنە بەکتریاییە جیاوازەکان و هەوکردنی گوێ و نەخۆشی گرانەتا و سوزەنەك و هەوکردنی گەدە و هەوکردنی پەردەی بۆشایی سك و پێست و گەروو و هەوکردنی خوێن(سێپتیسیمیا) و هەوکردنی ڕێڕەوی هەناسەدان و میزو هەوکردنی پەردەکانی مێشك و دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمخوێنی، ئازاری سك، نەمانی ئارەزوی خواردن، تەشەنوج، تا، برینی گەروو، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** بۆ هەوکردنی هەموو لەش گەورەکان ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلی‌گرام خۆراکی هەر ٦ سەعاتێك. منالآن ٢٥ تا ١٠٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام خۆراکی دابەشکراو لە هەر ٦سەعاتێکدا یان ١٠٠ تا ٢٠٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام بەدەمار بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ و پاش لەنەو ماسولکەیی دابەشکراو لە هەر ٦ تا ٨ سەعاتێکدا. بۆ سێپتیسیمیا ١٥٠ تا ٢٠٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام لانی کەم بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ بەدەمار، پاشان هەر ٣ تا ٤ سەعاتێك ماسولکەیی بۆ ماوەی ٢ ڕۆژ لەکاتی بەکارهێنان بڕی دەرمانەکانی دوای ئەو ماسولکەیی بەکاردێت. بۆ هەوکردنی پەردەکانی مێشك گەورەکان ٨ تا ١٢ گرام ٠ە دەمار یان ١٥٠ تا ٢٠٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا هەر ٣ تا ٤ سەعاتێك، لەکاتی بەکارهێنانی بڕی دەرمانەکانی دوای ئەو ماسولکەیی بەکاردێت. منالآن ٢٠٠ تا ٤٠٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە دەمار دابەشکراو لە هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك. ساوایان تەمەنی کەمتر لە ١ هەفتە ٥٠ تا ٧٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە دەمار هەر ١٢ سەعاتێك (کەمتر لە ٢ کیلۆگرام) یان هەر ٨ سەعاتێك (زیاتر لە ٢ کیلۆگرام). ساوایان زیاتر لە ١ هەفتە ٥٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە دەمار هەر ٨ سەعاتێك (کەمتر لە ٢ کیلۆگرام) یان هەر ٦ سەعاتێك (زیاتر لە ٢ کیلۆگرام). بۆ سوزەنەك گەورەکان ٣,٥ گرام خۆراکی لەگەڵ ١ گرام پرۆبێنسید بە شێوەی ١ بڕی دەرمان.

## ئەمپیسیلین & سەلباکتام: AMPICILLIN & SULBACTAM

**ناوی بازرگانی:** Unasyn

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٧٥ و ٧٥٠ میلی‌گرامی و دەرزی ١گرام ئەمپیسیلین + ٠,٥ گرام سەلباکتام ،دەرزی ٢گرام ئەمپیسیلین + ١ گرام سەلباکتام

**گرووپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی پێستی و سك و هەوکردن بەهۆی گرام پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانەوە و هەوکردن لە ژناندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، رشانەوە. ئازاری شوێنی دەرزی، حەساسیەت، پەڵە، سکچوون، ئازاری سك، تا، لەرز. خوێنبەربوون، رووشانی زایەندی ژنان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١.٥ تا ٣ گرام ملسولکەیی یان دەمار هەموو ٦ سەعاتێك، منداڵانی ١ساڵ و کەمتر لە ٤٠ کیلۆگرام ٣٠٠ میلی‌گرام بە دەمار لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا هەموو ٦ سەعاتێك، نابێت دەرمان بۆ زیاتر لە ١٤ رۆژ بەکاربهێنرێت.

## ئەمپریناڤیر: AMPRENAVIR

**ناوی بازرگانی:** Agenerase

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی دەرزی ١٠٠ میلی‌گرامی و گیراوە و کەپسول.

**گرووپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت، کە ئەبێتەهۆی ئایدز.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون. ئازاری سك، تا، بڕینی گەروو، سەرئێشە، پەڵە، بلۆقکردن و سووربونەوەی پێست، زۆرمیزکردن، لەرز. ڤێ. رشانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٢٠٠ تا ١٤٠٠ میلی‌گرام خۆراکی ٢ جار لە رۆژێکدا. منداڵانی ٤ تا ١٢ ساڵ یان ١٣ تا ١٦ ساڵ و کەمتر لە ٥٠ کیلۆگرام ٢٠ تا ٢٢,٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام خۆراکی ٢ جار لە رۆژێکدا. نابێت بڕی دەرمان لە ٢٨٠٠ میلی‌گرام لە رۆژێکدا تێپەڕبکات. کێشی ٥٠ کیلۆگرام و زیاتر ١٢٠٠ تا ١٤٠٠ میلی‌گرام خۆراکی ٢ جار لە رۆژێکدا. دەرزی رۆژانە ١٠٠ میلی‌گرام ژێرپێستی.



**ئامرینۆن لاکتەیت: AMRINONE LACTATE**

**ناوی بازرگانی:** Inocor

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Inotropic Agent

**بەکارهێنان:** بۆ بەهێزکردنی دڵ و دژی نارێکی لێدانی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی پەڕەی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تا، نارێکی لێدانی دڵ تێکچوونی هەرس –ئازاری سك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان لە سەرەتا ٠,٧٥ میلی گرام کیلۆگرام لە ڕێگەی دەمار لە ماوەی ٢ تا ٣ خولەکدا بە هێواشی دەرزی لێ دەدرێت. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٥ تا ١٠میلی گرام/کیلۆ گرام لە خولەکێکدا دەرزی لێ دەدرێت. زیادکردنی بڕی ٠,٧٥ میلی گرام/کیلۆگرام ٣٠ خولەك دوای دەستپێکردنی چارەسەر. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ١٠ میلی گرام/کیلۆگرامە.

**ئەمساکرین: AMSACRINE**

**ناوی بازرگانی:** Amsidine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی خەستی ئینفیوشنی دەماری.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێنی زیادبوونی تیژی خڕۆکەی سپی تایبەت بەمۆخ (مایلۆید لیوکیمیای تیژ ( AML) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، کزانەوە، بوونی خوێن لە میز و پیساییدا. کۆکە، هەڵوەرینی موو، تێکچوونی بینین، شڵەژان، سکچوون، گێژی، خوران، هێڵنجدان، ڕشانەوە، دڵەکوتێ، زەردی چاو و پێست، خوێنبەربوونی پوك، پەڵە، ئازاری ماسولکە و ئێسك، نەمانی ئارەزوی خواردن، دڵەکوتێ، نارێکی لێدانی دڵ ئازاری سك، تا، لەرز.

**بڕی دەرمان:** بڕی دەرمان جیاوازدەبێت بۆ نەخۆشە جیاوازەکان.

**ئەمایل نایترەیت: AMYL NITRITE**

**ناوی بازرگانی:** Amyl nitrate

**شێوەی دەرمان:** ئەمپول ٠,٣ میلی لیتر ئیستینشاقی (Inhalation).

**گروپی دەرمان:** Vasodilator , nitrate

**بەکارهێنان:** فراوانکەری مولولەکانی خوێنە و بۆ چارەسەری ئازاری سنگ و دژی ژەهراویبوون بە سیانید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێهێزی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی لێدانی دڵ، فراوانکردنی مولولەکانی پێستی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان لەئازاری قەفەسەی سنگ سەرەتا ٠,٣ میلی لیتر بە ئیستینشاقی بەکاردێت. ١ تا ٦ جار ئیستینشاقی ١ ئەمپول ئاسایی کیفایەت دەبێت، پاش لە ٣ تا ٥ خولەك ئەتوانی کە ئەو بڕە دوبارەبکەیتەوە. لە ژەهراویبوون بە سیانید ٠,٣ میلیلیتر لەماوەی ١٥ تا ٣٠ چرکە، ئیستینشاقی هەر ٦٠ چرکە ١ جار ئەتوانی ئەم بڕە دوبارە دەبێتەوە.

## ئەناگریلاید: ANAGRELIDE HCL

**ناوی بازرگانی:** Agrylin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٠,٥ میلیگرامی و ١ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiplatelet

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی زۆربوونی پەڕەکانی خوێن و کەڵەکەبوونی پەڕەکانی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** دڵەکوتێ، ئاوبەندی، گێژی، ئازاری سك، سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، تەنگەنەفەسی، زیادبوونی لێدانی دڵ خوران، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا، هیلاکبوون، کەمخوێنی، پەڵە، پەککەوتنی دڵ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی خەو، تێکچوونی بینین، وشکبوونەوەی دەم، هەڵوەرینی موو.

**بڕی دەرمان:** ٠,٥ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٤ جار، یان ١ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا، یان ٢,٥ میلیگرام بەیەك بڕ.

## ئەناکینرا: ANAKINRA

**ناوی بازرگانی:** Kineret

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ژێرپێستی ١٠٠میلیگرام/٠,٦٧ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Immunomodulater

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ڕۆماتیزم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، جیوب، هێڵنجدان، ئازاری سك، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی زیاتر لە ١٨ ساڵ ١٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار.

## ئەناسترۆزۆل: ANASTROZOLE

**ناوی بازرگانی:** Arimidex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplasm

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی مەمکی پاش لە عوزر چونەوەی ژنان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی زایەندی ژنان، خوێنبەربوونی زایەندی ژنان، نەمانی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، پەڵە، سڕبوون، تێکچوونی بینین، لاوازی، ئازاری جومگە، خەمۆکی، ئازاری پشت، هەڵوەرینی موو، تێکچوونی مەزاج.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١ میلی‌گرام.

## ئەنیدولافەنجین: ANIDULAFUNGIN

**ناوی بازرگانی:** Eraxis

**شێوەی دەرمان:** پاودەر بۆ گیراوەی IV ٥٠ میلی‌گرامی و ١٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antifugal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕویی کاندیدیازی سورێنچکی و کاندیدیمیا و جۆرەکانی تری هەوکردنی کاندیدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم، سوربونەوە، تەشەنوج، سەرئێشە، پەڵە، خوران، زیادبوونی شەکری خوێن، شەرا، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی، کرژبوونی بۆری هەوا، ئیلتیهابی جگەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی زیاتر لە ١٨ ساڵ ٢٠٠ میلی‌گرام لەڕۆژی یەکەم و پاشان ١٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار.

## ئەنیستریپلەیس: ANISTREPLASE

**ناوی بازرگانی:** Eminase

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٣٠ یەکە/ڤیاڵ

**گروپی دەرمان:** Thrombolytic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خوێن لێبڕانی توندی ماسولکەیی دڵ (AMI)، جەڵتە و وەستانی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، نارێکی لێدانی دڵ، کەمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠ یەکە بە دەمار IV بۆ ماوەی زیاتر لە ٢ تا ٥ خولەك.



## ئەنتازۆلین: ANTAZOLINE SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Otrivine-Antistin

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو (ئەنتازۆلین سەلفەیت ٠,٥٪ و زایلۆمیتازۆلین هایدرۆکلۆراید ٠,٠٥٪).

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهاب و حەساسیەتی چاو بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالانی سەرووی ١٢ ساڵ ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار بەکاردێت. (لایەنی زۆر بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ).

## ئەنثوسیانۆزید A: ANTHOCYANOSIDE A

**ناوی بازرگانی:** Difrarel E

**شێوەی دەرمان:** حەبی (ئەنثوسیانوزید میرتیلەیس ١٠٠ میلیگرام و بیتاکاروتین ٥ میلیگرام)

**گروپی دەرمان:** چارەسەرکەری تێکچوونی مولولەکان.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری تێکچوونەکانی مولولەکان لە چاو و شەوکوێری و مولولەکانی لیمف و خوێن و ئۆدیما و تێکچوونی مولولەکانی پێست بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٣ تا ٦ حەب لەڕۆژێکدا ، بۆماوەی ٢٠ ڕۆژ لە مانگێکدا.

## ئەنپرالین: ANTHRALIN

**ناوی بازرگانی:** Anthra derm

**شێوەی دەرمان:** کریم و مەڵهەمی ٠,١٪ و ٠,٢٥٪و ٠,٤ ٪ و ٠,٥ ٪ و ١٪ و مەعجون.

**گروپی دەرمان:** Keratolytic dermatologic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی پێستی سۆریاسس (دروستبوونی پولەکە لەسەرپێست) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** پەڵەی پێست، سووربوونەوەی پێست، ڕوشانی پێست.

**بڕی دەرمان:** شەوی ١ جار.

## ئەنتی دی ئیمیون گلۆبیولین: ANTI D IMMUNE GLOBULIN

**ناوی بازرگانی:** Rhogam,Winrho

**شێوەی دەرمان:** دەرزی (Rhogam) ٣٠٠مایکرۆگرام تەنها بەماسولکەیی IM.

دەرزی (Winrho) ٣٠٠ میلیگرام بەماسولکەییIM و دەمارIV. پاودەری ٢٥٠، ٣٠٠ مایکرۆ گرام.

**گروپی دەرمان:** Antibody

**بەکارهێنان:** بەکاردێت بۆ ئەو ژن و مێردانەی هۆکاری ریسی (RH) یان جیاوازە و بۆ ئەوەی منداڵی دووەمیان سەلامەت بێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تا، لەرز، ئاوسانی شوێنی دەرزی لێدان.

**بڕی دەرمان:** دوای ٧٢ سەعات دوای منداڵبوون دەرزی لێ دەدرێت بۆئەوەی زیان بە منداڵی دووەم نەگەیەنێت، ئەگەر خوێنی ئاڵوگۆڕبوو کەمتر لە ٣٠ سیسی بێت، یەك ڤیاڵی ٣٠٠ مایکرۆگرامی کافی یە. وە ئەگەر خوێنی ئاڵوگۆڕبوو زیاتر بوو ئەوا بڕی دەرمانی دووەمی پێویستە.

## ئەنتی هموفیلیك: FACTOR ANTIHEHEMOPHILIC

**ناوی بازرگانی:** Helxate,bioclate,Alphanate

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠و ٥٠٠ و ١٠٠٠ و ١٥٠٠ و ٢٠٠٠ و ٣٠٠٠ یەکەیی.

**گروپی دەرمان:** Antihemophilic agent

**بەکارهێنان:** دژی هیمۆفیلیا (نەخۆشی خوێنبەربوونی بۆماوەیی) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سووربونەوە، سەرگێژبوون، هیلاکبوون، زیادبوونی لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ئازاری پشت، ڕشانەوە، تێکچوونی پێست، ئازاری قەفەسەی سنگ، تێکچوونی هۆشیاری، کرژبوونی بۆری هەوا، کۆکە، تا، لەرز.

**بڕی دەرمان:** لە خوێنبەربوونی سوك بە ئاستی هەر کیلۆ (١٠تا ٢٠) یەکە ١ جار ٨تا٢٤ سەعات بەرێگەی IV. وە لە خوێنبەربوونی مامناوەندی و نە شتەرگەری بچوك سەرەتا ١٥ تا ٢٥ میلیگرام وە بەشێوەی پێویست بەئاستی هەر کیلۆ (١٠تا١٥U) بەشێوەی جێگیر هەر ٦ تا ١٢ کاتژمێر دەرزی لێدەدرێت , وە لە خوێنبەربوونی توند و بەهێز یان خوێن بەربوونی ئەندامی ژیانی وەکو، مێشك سەرەتا ٤٠ تا ٥٠ یەکە بە ئاستی هەر کیلۆ کێشی کیلۆ گرام و بەشێوەی جێگیر و پارێزراو ٢٠ تا ٢٥ یەکە بە ئاستی هەر کیلۆ کێش هەر ٨ تا ١٢ کاتژمێر ڕێی پێ دەدرێت.

## ئەنتی هیمۆرۆید: ANTIHEMORRHOID

**ناوی بازرگانی:** Xyloproct

**شێوەی دەرمان:** ئەم دەرمانە بەشێوەی مەڵهەم و شاف هەیە. شافی لیدوکائین ٦٠ میلیگرام.شافی هایدروکورتیزون ئەسیتەیت ٥ میلیگرام.شافی زنیك ئۆکساید ٤٠٠ میلیگرام.شافی ئەلەمنیۆم سەبئەسیتەیت ٥٠ میلیگرام.

تۆ: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوور کەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی

مەڵهەمی لیدوکائین ٥٠ میلی‌گرام/گرام. مەڵهەمی هایدروکورتیزون ئەسیتەیت ٢,٧٥ میلی‌گرام/گرام. مەڵهەم ئەلەمنیۆم سەب ئەسیتەت ٣٥ میلی‌گرام/گرام. مەڵهەمی زنیك ئۆکساید ١٨٠ میلی‌گرام/گرام.

**گروپی دەرمان:** دژی مایەسیری Antihemorrhoid

**بەکارهێنان:** دژی هیمۆرۆید (مایەسیری)، دژی ئازاری کۆم و برینەکانی ناوچەی کۆم و خورانی دەزگای زایەندی ژنان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیاد بەکارهێنانی ئەبێتەهۆی هەوکردنی ئەو شوێنەی بۆی بەکاردێنیت.

**بڕی دەرمان:** شاف ماوەی ٥ ڕۆژ ڕۆژی ٢ جار لە کۆمدا دادەنرێت پێش لە خەوتن ، مەڵهەم ڕۆژی ٣ تا ٤ جار.

## ئەنتی هیستامین: ANTIHISTAMINE DECONEGESTANT

**ناوی بازرگانی:** Naldecon

**شێوەی دەرمان:** حەبی (کلۆرفینیرامین ماڵیت ٢,٥ میلی‌گرام + فینایل ئەفرین ٥ میلی‌گرام + فینایل پروپانول ئەمین ٢٠ میلی‌گرام)

**گروپی دەرمان:** Antihistamine,decongestant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئاو هاتنە خوارەوە بەلوتدا،هە وکردنی لوت و گیرانی لوت و تا و سەرئێشە و هەڵامەت و کۆکە و سووربونەوە و سەرما و پژمین و پوشەتا و دژی هەستیاری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، نەمانی ئارەزوی خواردن، تێکچوونی هەرس،خەواڵوی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ حەب ٣ تا ٤ جار لەڕۆژێکدا. لە منداڵانی ٦ تا ١٢ ساڵە ٢ تا ٣ جار لەڕۆژێکدا هەر جارەو ١ حەب.

## ئەنتی سکۆپیەن: ANTISCORPION AENOM SERUM

**ناوی بازرگانی:** Scorpion antivenom

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥ میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antibody

**بەکارهێنان:** دژی ژەهری دوپشك و پێوەدانی دوپشك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی حەساسیەت، کرژبوونی سی، هێڵنجدان، تا، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** پێش دەرزی لێدان تێستی حەساسیەت پێویستە ئەنجام بدرێت. بڕی دەرمان بەپێی بڕی ئەو ژەهرەیە کە چوەتە لەشەوە.

## ئەنتی سنەیك ئەینۆم سیرەم: ANTISNAKE AENOM SERUM

**ناوی بازرگانی:** Polyvalent,snake antivenom

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ماسولكەییIM و دەماری IV.

**گروپی دەرمان:** Antibody

**بەكارهێنان:** دژی ژەهری مار و پێوەدانی مار بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** هێڵنجدان، سكچوون، ڕشانەوە، تا، كرژبوونی سی، زیادبوونی حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** یەكەم جار ئەبێت تێستی پێستی بۆ ئەنجام بدرێت، بەشێوەی ماسولكەیی IM باشترە، لە كاتێكدا IV دەكرێت كە نەخۆش لەحاڵەتی شۆك دا بێت.

## ئەنتی پایمۆسایت ئیمیونۆگلۆبیولین: A.T.G.

**ناوی بازرگانی:** Atagam, thymoglobulin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥میلی گرامی،ئەتاگام ٥٠ میلی گرام/میلی‌لیتر (٥ میلی لیتر): ٢٥٠ میلی گرام.

**گروپی دەرمان:** Immunosuppressant

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری ڕەفزكردنی توندی ئەلۆگرافت (موتوربەكردنی شانەیكی زیندوو یان ئەندامێك لە نێوان دوو ئەندامی هەمان جۆر) لە چاندنی گورچیلە و دڵ دا بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، كەمبوونەوەی خڕۆكەی سپی و پەڕەی خوێن، قوتدانی بە ئازار، سكچوون، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تا، لەرز، ئازاری ماسولكە، خوران، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** بۆ چاندنی دڵ بەڕێگەی IV ئینفیوشن لانی كەم بۆ زیاتر لە ٦ سەعات، ١ تا ٢,٥ میلی‌گرام/كیلۆگرام ڕۆژانە بۆ ماوەی ٣ تا ٥ ڕۆژ. بۆ چاندنی گورچیلە بەڕێگەی IV ئینفیوشن لانی كەم بۆ زیاتر لە ٦ [illegible]ت، ١ تا ١,٥ میلی‌گرام/كیلۆگرام ڕۆژانە بۆ ماوەی ٣ تا ٩ ڕۆژ. مقاوەمەی كۆرتیكۆستیرۆیدەكان لە ڕەفزكردنی موتوربەكردنی گورچیلەدا بەڕێگەی IV ئینفیوشن لانی كەم بۆ زیاتر لە ٦ سەعات، ١,٥ میلی‌گرام/كیلۆگرام ڕۆژانە بۆ ماوەی ٧ تا ١٤ ڕۆژ.

## ئەپومورفین: APOMORPHINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Apo go , Apokyn

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Dopamine receptor agonist



**بەکارهێنان:** ڕشانەوە هێنەرە لە ژەهراویبوونی دەرمانی و بۆ چارەسەری نەخۆشی پارکینسۆن (لەرزینی خۆنەویستی ئەندامەکانی لەش) و لەکارکەوتنی پیاوەتی پیاوان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوئالودەبوون، گێژی، ناجێگیری، کەمبوونی لێدانی دڵ، زیادبوونی لێدانی دڵ، کەمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئارەقکردن، زیادبوونی لیک.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢تا ١٠ میلیگرام ژێر پێستی یان ماسولکەیی ١ جار دواتر نەخۆش دەبێت ٢٠٠تا ٣٠٠سیسی ئاو بخوات، ئەتوانین ٠,٠١ میلیگرام /کیلۆگرام بەڕێگەی IV لە منالانیش ٠,١تا ٠,٠٧ ژێر پێستی یان ماسولکەیی تەنها ١ جار.

## ئەپراکلۆنیدین: APRACLONIDINE

**ناوی بازرگانی:** Iopidine

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو (گیراوە) ٠,٥ ٪ و ١٪.

**گروپی دەرمان:** Alpha٢ adrenergic agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری گلوکۆماو کۆنترۆڵکردنی پەستانی ناوەوەی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی دەم، گێژی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی تامکردن، خوران، سەرئێشە، ڕوشانی چاو، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سووربوونەوەی پێست.

**بڕی دەرمان:** ١تا٢ قەترە لە گیراوەی ٠.٥ ٪ ٣ جار لەڕۆژێکدا و ١ قەترە لە گیراوەی ١٪ پێش یان لەپاش ئەنجامدانی نەشتەرگەری.

## ئەپریپیتانت: APREPITANT

**ناوی بازرگانی:** Emend

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٤٠ و ٨٠ و ١٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiemetic

**بەکارهێنان:** لەگەڵ دەرمانەکانی تردا بۆچارەسەر و بەرگری کردن لەهێڵنجدان و ڕشانەوە بەهۆی نەشتەرگەری یان چارەسەری کیمیایی شێرپەنجەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، هیلاکبوون، پەڵە، تێکچوونی خەو، غازات، دڵەڕاوکێ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، دڵەکزە، ئازاری گەدە، تا، لەرز، سکچوون، قەبزی، نەمانی ئارەزوی خواردن، شەرا، هەڵوەرینی موو، کۆکە، تێکچوونی تامکردن، برینی دوانزەگرێ، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، کەمخوێنی، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان١٢٥ میلیگرام ١ سەعات پێش لە چارەسەری کیمیایی پاشان ڕۆژانە ٨٠ میلیگرام.



## ئەپرۆتینین: APROTININ

**ناوی بازرگانی:** Trasylol

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ هەزار و ٢٠٠هەزار یەکە.

**گروپی دەرمان:** Antifibrinolytic

**بەکارهێنان:** دژی خوێن بەربوونی گشتی، هەوکردنی پەنکریاس، بەرگری لەخوێن بەربوونی توند کە ڕوودەدات لەهەندێ جۆری شێرپەنجەدا لەکاتی توێکاری دڵدا.

**کاریگەری لاوەکی:** ناتەواوی دڵ ڕەبۆ، تێکچوونی گورچیلە، زیادبوونی لێدانی دڵ زیادبوونی حەساسیەت، کۆبوونەوەی ئاو لە سی یەکاندا، تەنگەنەفەسی. هەوکردنی سی یەکان. تێکچوونی هەناسە.

**بڕی دەرمان:** لە هەوکردنی پەنکریاسی تیژ یەکسەر ٥٠٠ هەزار یەکە بەشێوەیەکی لەسەر خۆ بەIV دەرزی لێدەدرێت. وە پاش ٢٠٠ هەزار یەکە هەر ٤ سەعات لە ڕێگەی دەمار IV دەرزی لێدەدرێت، وەپێش نە شتەرگەری لە کەسانێ کە کێشەی خوێنبەربوونیان هەیە ٢٠٠ هەزار یەکە لەسەرخۆ بە IV، وە پاشان ٢٠٠ هەزار کاتی ئیشی نەشتەرگەری و پاش لە ئەو ٢٠٠ هەزار یەکە هەر ٤ سەعات لە ڕێگەی IV دەمار دەرزی لێدەدرێت، لە چارەسەری خوێنبەربووندا لە نەخۆشی خوێنی هیپرفیبرینولیز یەکسەر ٥٠٠ هەزاریەکە لەدەمار و پاشان هەر سەعاتێك ٥٠ هەزار یەکەی لیێ بدرێت، تا کاتێ کە خوێنبەربوون کۆنترۆڵ دەبێت و دەستی بەسەردا بگیرێت.

## ئاراچیس ئۆیل: ARACHIS OIL

**شێوەی دەرمان:** ڕۆن و زەیتی شل لە دەفری تایبەتی بچوك.

**گروپی دەرمان:** Emoliant

**بەکارهێنان:** بۆ نەرمکردنەوەی پێست بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** بەپێی پێویستی بەکاردێت.

## ئاردیپارین: ARDEPARIN

**ناوی بازرگانی:** Normiflo

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گیراوە و دەرزی ژێرپێستی SC.

**گروپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەکارهێنان:** دژی مەینی خوێنە و بۆ بەرگری لە کلۆبوونی خوێن و بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك پاش لە نەشتەرگەری گۆڕینی ئەژنۆ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، هێڵنجدان، لاوازی، تا، پەڵە، خوران، ئازار و سووربوونەوەی شوێنی دەرزی، ئازاری پشت، بەگرانی هەناسەدان، سەرئێشە، گێژی، سڕبوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان هەموو ١٢ سەعاتێك بۆ زیاتر لە٤٠ ڕۆژ پاش لە نەشتەرگەری. منداڵان نەبێت لە لایەن پزیشکەوە دیاری بکرێت.

## ئارفۆمۆتیرۆل: ARFORMOTEROL

**ناوی بازرگانی:** Brovana

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ئیستینشاقی ١٥ مایکرۆگرام/٢میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Beta agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی مزمینی داخستن و کرژبوونی بۆری یەکان و ئیلتیهابی مزمینی بۆرینچکەکانی هەوا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری پشت، تا، لەرزین، سکچوون، وشکبوونەوەی دەم، سەرئێشە، هێڵندان، ڕشانەوە، پەڵە، خوران، بەگرانی هەناسەدان، ئازاری سنگ، لاوازی، نارێکی لێدانی دڵ ئاوسان، گێژبوون، تەنگەنەفەسی، جێوب، کرژبوون و ئازاری ماسولکە، کۆکە، تێکچوونی خەو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥ مایکرۆگرام لەڕێگەی دەمەوە ڕۆژانە ٢ جار.

## ئارگاترۆبان: ARGATROBAN

**ناوی بازرگانی:** Acova

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ میلی گرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و بەرگری کردن لە مەین و کڵۆبوونی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، خوێنبەربوونی گەدەو ڕیخۆڵە -میزی خوێناوی، تا، ئازار، ئاوبەندی سی، تەنگەنەفسی، ئازاری سك، سەرئێشە، ئازاری پشت، تێکچوونی بینین، لەرزین، کۆکە، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ژەهراویبوونی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ مایکرۆگرام/کیلۆگرام بەدەمار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام. منداڵان ٠,٧٥ مایکرۆگرام/کیلۆگرام.



## ئارجنین: ARGININE HCL

**ناوی بازرگانی:** R gene

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** GH stimulant

**بەکارهێنان:** رۆڵێکی گرنگ دەبینێ لەدروست بوونی یوریا لەلایەن جگەرەوە ، تەشخیصی کەمی کاری هیپۆفیز دەکات، هاندەری هۆرمۆنی گەشە و نەش ونمایە GH و بۆ چارەسەری ئەکرۆمگالی و تێکچوونی هۆرمۆنی گەشە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، سوربونەوە، بێهەستی، ئیلتیهابی مەوزوعی خوێنهێنەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠٠ میلی لیتر بەرێگەی IV ئینفیوشن لە ماوەی ٣٠ خولەکدا. لەمناڵان ٥ میلی لیتر/کیلۆگرام بەرێگەی IV ئینفیوشن لە ماوەی ٣٠ خولەکدا.

## ئاریپیپرازۆڵ: ARIPIPRAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Abilify

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ و٥ و١٠ و١٥ و٢٠و ٣٠میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ١میلیگرام/میلی لیتری و گیراوەی دەرزی ٧,٥ میلیگرام/میلی لیتری و حەبی خۆراکی (discmelt) ١٠ و١٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی دەروونی شیزۆفرینیای گەورەکان و تەمەنی ١٣ تا١٧ساڵ و شێتی و تێکچوونی دووجەمسەری و خرۆشان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، سەرئێشە، زیادبوونی لێدانی دڵ هیلاکبوون، بێخەوی، گێژی، لەرزین، ئیلتیهابی پەنکریاس، ئیلتیهابی جگەر، زیادبوونی لیك، ئۆدیما، گیرانی میز، تێکچوونی بینین، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ تەشەنوج، کەمبوونەوەی صۆدیۆم، ئارەقکردنەوە، هەڵوەرینی موو، پەڵە، وشکبوونەوەی دەم، ئازاری سنگ، دڵەڕاوکێ، کەمبوونەوەی کێش، تێکچوونی خوێن.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١٠ تا١٥ میلیگرام،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٣٠ میلیگرامە.

## ئارمۆدافینیل: ARMODAFINIL

**ناوی بازرگانی:** Nuvigil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ١٥٠ و ٢٠٠ میلیگرامی.

جێ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی،



**گروپی دەرمان:** Binds dopamine receptor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نارکۆلیپسی (خەوئالودەبوونی توند) و پێدانی وریایی بەو نەخۆشانەی زۆر دەخەون و خەواڵون و بۆ چارەسەری تێکچوونی شیفتی کارکردن و خەو و گیران و وەستانی هەناسە لەخەودا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** پەڵە، سکچوون، هێڵنجدان، وشکی دەم، سەرئێشە، گێژی، بەدهەرسی، بێخەوی.

**بڕی دەرمان:** نارکۆلیپسی ١٥٠میلیگرام یان ٢٥٠ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی بەیەك بڕ لەبەیانیاندا و ١٥٠میلیگرام یان ٢٥٠ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی بەیەك بڕ لەبەیانیانداو ١٥٠میلیگرام بەشێوەی خۆراکی ڕۆژانە نزیکەی ١ سەعات لە پێش دەستپێکردنی شیفتی کارکردن.

## ئارسنیك تریۆکساید: ARSENIC TRIOXIDE

**ناوی بازرگانی:** Trisenox

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١میلیگرام/میلی لیتر(١٠میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی خوێن و مۆخی ئێسك کە پێی دەوترێت (پرۆمایلۆسایتیك لیوکیمیای توند) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبون، تەنگەنەفەسی، خوران، پەڵە، بێهێزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کۆکە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,١٥ میلیگرام /کیلۆگرام IVئینفیوشن.

## ئارتی فیشیال تیرز: ARTIFICIALTEARS

**ناوی بازرگانی:** Tearisol,Lacrisert

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو٠,٥٪.

**گروپی دەرمان:** Oculra lubricant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری وشکبوونەوەی چاو و قەرەبوو کەرەوەی کەم بوونی فرمێسك، بۆ ڕوشانی چاو، نەرمکردنی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی چاو، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکان و منالآن دا ١ تا ٢ قەترە ٣ تا ٤جار لەڕۆژێکدا.

## (ئەسیتایل سالیسیلیك ئەسید) ئەسپرین: ASPIRIN ،ASA

**ناوی بازرگانی:** Aspirin, Ecotrin, Dispirin,Empirin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٢٥ و ٥٠٠ میلیگرامی و حەبی(E.C) ٨٠ و ٨١ و١٦٥ و ٣٢٥ و ٥٠٠ و ٦٥٠ و ٩٧٥ میلیگرامی و حەبی فوارە ٣٢٥ و ٥٠٠ میلیگرامی و حەبی کرماندن ٨١ و ١٠٠میلیگرامی و حەبی SR ٦٥٠ و ٨٠٠ میلیگرامی و گرامی وشافی٣٢٥ و ١٢٥ و ٢٠٠ و ٣٠٠ و ٦٠٠ میلیگرام.

**گروپی دەرمان:** Analgesic, Antiplatelet

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهاب ، تاو، ڕۆماتیزم، بەرگری لە کلۆبوونی خوێن دەکات و خوێن تەڕ دەکاتەوە و ئەبێتەهۆی ڕوون کردنەوەی خوێن، بەرگری دەکات لە جەڵتەی مێشك و دڵ و بۆ ئازاری سنگ و دژی کەڵەکەبوونی پەڕەکانی خوێن و نەخۆشی کاواساکی (نەخۆشی یەکە توشی تەمەنی خوار ٥ ساڵ دەبێت و ئەناسرێتەوە بە تا و چاوئێشە و برینی گەروو و پەڵە و سووربونەوەی ناولەپی دەست و پێ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرسوڕان، تێکچوونی فرمانی جگەر، خوێن بەربوونی گەدە، تێکچوونی هەرس، برینی گەدە، تا، تێکچوونی گورچیلە، بێخەوی، سەرگێژبوون، سەرئێشە، زیادبوونی حەساسیەت، پەڵە، کرژبوونی بۆری هەوا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ئازارو تا ٣٢٥ تا٦٥٠ میلیگرام هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٤ گرامە. لەمنالأنیش ٣٠ تا ٦٥ میلیگرام ڕۆژانە دابەش دەکرێت لە هەر ٤تا٦ سەعاتدا. لەڕۆماتیزم گەورەکان ٤ تا ٨ گرام خۆراکی لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ پێشگری لەجەڵدە و وەستانی دڵ و مێشك لە گەورەکان ١٦٠ تا ٣٢٥ میلیگرام ڕۆژێکدا. بۆ نەخۆشی کاواساکی بە ٨٠ تا ١٠٠ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ڕۆژانە دابەشکراو لە ٤ بڕی دەرماندا دەست پێ دەکات و ٤تا ٨ هەفتە پاش دەستپێکردنی نەخۆشی ئەتوانی دەرمان بەکارنەهێنیت. بۆ ئازاری سنگ ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرام.

## ئەی – ئێس – ئەی کۆداین: ASA CODENIE

**ناوی بازرگانی:** Empirin

**شێوەی دەرمان:** حەبی (ASA ٣٢٥ میلیگرامی + کوداین ٣٠ میلیگرام، ASA ٣٢٥ میلیگرامی + کودایـن ٦٠ میلیگرام).

**گروپی دەرمان:** Narcotic analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری مامناوەند و توند و ئیلتیهاب و تا و ڕۆماتیزم و تا بەهۆی سەرمابوون و تای ڕۆماتیزمی و ئازاری ماسولکەیی و دەماری بەکاردێت.

ئینسایکلۆپیدیای دەرمان

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرگێژبوون، برینی گەدە، خوێن بەربوونی گەدە، تێکچوونی فرمانی جگەر، تێکچوونی هەرس، پەڵە، ئارەقکردنەوە.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکاندا ١تا ٢ حەب خۆراکی هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك. منداڵان نەسپرین ١٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام لە بڕێکی دەرماندا و کۆداین ٠,٥ تا ١ میلی‌گرام/کیلۆگرام لە بڕێکی دەرماندا هەموو ٤ سەعاتێك.

## ئەسیناپین: ASENAPINE

**ناوی بازرگانی:** Saphris

**شێوەی دەرمان:** حەبی ژێرزمانی ٥ میلی‌گرامی و ١٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی دەروونی یەکانی وەك شێتی و شیزۆفرینیا و تێکچوونی دووجەمسەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە، بێخەوی، وشکبوونەوەی دەم، قەبزی، گێژبوون، تەشەنوج، ئارەقکردنەوە، تا، لەرزین، خوێنبەربوون، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، لاوازی، خێرا لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ تا ١٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٢ جار.

## ئەسپاراجینەیز: ASPARAGINASE

**ناوی بازرگانی:** Erwinase,Elspar

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠٠٠ یەکە/ڤیاڵ ماسولکەیی IMو دەمار IV.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی خوێن ئەمەش بەهۆی بوونی خانەی نائاسایی لە خوێندا و زیادبوونی خرۆکە سپی یەکانی خوێن و بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن لە جۆری (لیمفۆبلاستیك لیوکیمیای توند (ALL) و لیمفۆسایتیك لیوکیمیا) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، تا، لەرز، ئازاری سك، خرۆشان، سەرگێژبوون، سەرئێشە، تەشەنوج، خەمۆکی، بێهۆشی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، حەساسیەت، ڤێ، شەرا، نەمانی ئارەزوی خواردن، هەوکردنی پەنکریاس، تێکچوونی گورچیلە، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکان.

**بڕی دەرمان:** بە ئاستی هەر کیلۆ کێش ٢٠٠ یەکە بۆ ماوەی ٢٨ ڕۆژ بە شێوەی دەمار IV. یان ٥٠٠ تا ٢٠٠٠٠ یەکە/مەتردوجا لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ١ تا ١٤ ڕۆژ.



## ئەستیمیزۆل: ASTEMIZOLE

**ناوی بازرگانی:** Hismanal

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** دژی حەساسیەتە و بۆ چارەسەری حەساسیەت و بەرگری کردن لە پژمین و خوران و ئاوکردنی چاو و شەرا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، سەرئێشە، ناجێگیری، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، ئازاری جومگە.

**بری دەرمان:** لە گەورەکان و منالانی سەروی ١٢ ساڵ خۆراکی ١٠ میلی گرام لە هەر برێکی دەرماندا.

## ئەتازانافیر: ATAZANAVIR

**ناوی بازرگانی:** Reyataz

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠٠ و ١٥٠ و ٢٠٠ و ٣٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** لەگەڵ دژەڤایرۆسەکانی تردا بۆ چارەسەری هەوکردنی ڤایرۆسی HIV، ١ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، تا، خەمۆکی، رشانەوە، سکچوون، پەڵە، ئازاری سك، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کۆکە، خوران، برینی دەم، وشکبوونەوەی دەم -بێخەوی، گێژی.

**بری دەرمان:** لەگەڵ برێکی کەمی ریتۆنافیر گەورەکان ٣٠٠ میلی گرام رۆژانە ١جار، منالانی سەروی ٦ ساڵ کێشی ١٥ تا ٢٠ کیلۆگرام ١٥٠ میلی گرام رۆژانە ١جار، کێشی ٢٠ تا ٤٠ کیلۆگرام ٢٠٠ میلی گرام رۆژانە ١جار، کێشی سەروی ٤٠ کیلۆگرام وەکو گەورەکانی بۆ بەکاردێنین.

## ئەتینولول: ATENOLOL

**ناوی بازرگانی:** Tenormin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ میلی گرامی و دەرزی ٥ میلی گرام/١٠ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Beta blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری سنگ و نارێکی لێدانی دڵ و خوێنلێبڕانی ماسولکەی دڵ و ناتەواوی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هیلاکبوون، خەمۆکی، تێکچوونی هەرس، لاوزبوونی توانای سێکسی، تەسکبوونەوەی بۆری هەوا، سکچوون، سەرگێژبوون، لاوازبوونی دڵ، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، خەواڵویی، کەمبوونی شکری خوێن، پەڵە، تێکچوونی بینین، تا، زیادبوونی شەکری خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکبوونەوەی چاو، بێهێزی.

**بڕی دەرمان:** بۆ پەستانی خوێن لە گەورەکان سەرەتا ٢٥ تا ٥٠میلیگرام ڕۆژانە ١ جار. ئەگەر پەستانی خوێنی نەخۆش کۆنترۆڵ نەکرا ئەتوانین دەرمانە میزهێنەرەکانی بۆ زیادبکەین یان ئەتوانین بڕی دەرمان بە ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرام بگەیەنین، پاش لە ٧تا١٤ ڕۆژ.

بۆ ئازاری سنگ گەورەکان سەرەتا ڕۆژانە ٥٠ میلیگرام ئەتوانین بڕی دەرمان بە ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرام بگەیەنین پاش لە ٧ ڕۆژ. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٠٠ میلیگرامە. بۆ خوێنلێبڕانی ماسولکەیی دڵ (جەڵتەی دڵ) ٥میلیگرام بە دەمار تا ٥ خولەك بەپێی پێویست ٥میلیگرامی تر بەدەمار پاش ١٠ خولەك.

## ئەتۆمۆکسیتین: ATOMOXETINE

**ناوی بازرگانی:** Strattera

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥ و ١٠ و ١٨ و ٢٥ و ٤٠ و٦٠ و ٨٠ و١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** C.N.S stimulant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونی سەرنج و هۆشیاری و چالاکی زیاد لەڕادە (ADHD) بەکاردێت.

**کاریگەریەلاوەکی:** نەمانی ئارەزوی خواردن، وشکبوونەوەی دەم، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، غازات، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، گێژی، بێخەوی، دڵەڕاوکێ، خەمۆکی، گەورەبوونی پێڵوی چاو، قەبزی، پەڵە، ئارەقکردنەوە، خوران، لەرزین، نیلتیهابی چاو، سەرئێشە، تێکچوونی جگەر، هیلاکبوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی زیاتر لە ٧٠ کیلۆگرام ڕۆژانە ٤٠ میلیگرام،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرامە. گەورەکان و منداڵانی کەمتر لە ٧٠ کیلۆگرام ڕۆژانە ٠,٥ میلیگرام/کیلۆگرام،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١,٤ میلیگرام/کیلۆگرام.

## ئەتۆرڤاستاتین: ATORVASTATIN

**ناوی بازرگانی:** Lipitor

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٠ و ٤٠ و ٨٠ میلیگرامی

**گروپی دەرمان:** Antilipemic

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندنی ڕێژەی نائاسایی کۆلیسترۆڵ و ترایگلیسراید و جەوری یەکانی تر لە خوێندا بەکاردێت.





**کاریگەری لاوەکی:** بێخەوی، ئازاری سنگ، ئازاری ماسولکە و جومگە، ئۆدیما، تێکچوونی گەدە، ئازاری سك، هێڵنجدان، سکچوون، غازات، سەرئێشە، تێکچوونی جگەر، پەڵە، حەساسیەت، هەوکردن، ئازاری کەمەر، هەوکردنی گەروو، جیوب.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان لەسەرەتادا ١٠میلیگرام ڕۆژانە خۆراکی،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٨٠ میلیگرامە.

منالآنی ١٠تا ١٧سالْ سەرەتا ١٠ میلیگرام خۆراکی یەك جار لە ڕۆژێکدا ، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٠ میلیگرامە.

گەورەکان منالآنی گەورەتر لە ٩ سالْ بۆ زیادبوونی کۆلیسترۆلی خوێن ١٠تا ٨٠ میلیگرام ١جار لە ڕۆژێکدا.

## ئەتۆسیبان: ATOSIBAN

**ناوی بازرگانی:** Tractocile

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٧,٥ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Obstetric,gynaecology

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری منداڵبوونی سادەی پێشوەخت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادبوونی لێدانی دڵ نزمبونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، گێژی، گەرمبوون و سوربونەوە، زیادبوونی شەکری خوێن، پەڵە، خوران، تا، بێخەوی.

**بڕی دەرمان:** بە دەرزی IV، سەرەتا ٦,٧٥ میلیگرام بۆ زیاتر لە ١ خولەك، پاشان بە ڕێگەی IV ئینفیوشن ١٨ میلیگرام/سەعات بۆ ماوەی ٣ سەعات، پاشان ٦ میلیگرام/سەعات تا ماوەی ٤٥ سەعات، لایەنی زۆری ماوەی چارەسەر ٤٨ سەعاتە.

## ئەتۆڤاکیوۆن: ATOVAQUONE

**ناوی بازرگانی:** Mepron

**شێوەی دەرمان:** سەسپێنشنی ٧٥٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiprotozoal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر وبەرگری ئیلتیهابی سی و بەهۆی هەوکردنی کەڕوویی پێی دەگوترێت (Pneumocystitis carinii) و بۆ چارەسەری مەلاریا و هەوکردن بەهۆی تۆکسۆپلاسما گۆندی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، گێژی، ئازاری سك، سکچوون، قەبزی، سەرئێشە، لاوازی، ئازاری ماسولکە، زەردی، پەڵە، ئارەقکردنەوە. تێکچوونی خەو، بلۆقکردنی پێست، دڵەڕاوکێ، نەمانی ئارەزوی خواردن، تا، کرژبوونی بۆری هەوا، کۆکە، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی صۆدیۆم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ چارەسەری هەوکردن ٧٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار لەگەڵ ژەمەکانی خواردندا بۆ ماوەی ٢١ ڕۆژ. بۆ بەرگری کردن ١٥٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار لەگەڵ ژەمەکانی خواردندا.

## ئەتۆڤاکیوۆن و پرۆگوانیل: ATOVAQUONE & PROGUANIL

**ناوی بازرگانی:** Malarone

**شێوەی دەرمان:** حەبی (ئەتۆڤاکیوۆن ٢٥٠میلیگرام/ پرۆگوانیل ١٠٠ میلیگرام و منالآن ٦٢,٥/٢٥ میلیگرام).

**گروپی دەرمان:** Antimalarial

**بەکارهێنان:** دژی نەخۆشی مەلاریایە و بۆ چارەسەر و پێشگری کردنی نەخۆشی مەلاریای فالسیاروم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، تا، پەڵە، ئازاری سك، نەمانی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، خوران، لاوازی، گێژی، بێخەوی، خەمۆکی، دڵەڕاوکێ، تێکچوونی خوێن، کەمبوونەوەی صۆدیۆم، هەڵوەرینی موو، ئیلتیهابی جگەر، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، برینی دەم، تەشەنوج.

**بڕی دەرمان:** بۆ پێشگری ١تا٢ ڕۆژ پێش چونەژوورەوەی بۆ ناوچەی نیشتەجێبوون و بەردەوام دەبێت بۆ ماوەی ١ هەفتە پاش بەجێهێشتنی، گەورەکان و منالآنی سەروی ٤٠ کیلۆگرام ڕۆژی ١ حەب، بۆچارەسەری مەلاریا ڕۆژی ٤ حەب.بۆپێشگری ١تا٢ ڕۆژ پێش چونەژوورەوەی بۆ ناوچەی نیشتەجێبوون و بەردەوام دەبێت بۆ ماوەی ١ هەفتە پاش بەجێهێشتنی.منالآن کێشی ١١ تا٢١ کیلۆگرام ١حەب ڕۆژانە ١ جار، منالآن کێشی ٢١تا٣١ کیلۆگرام ٢حەب ڕۆژانە ١ جار، منالآن کێشی ٣١تا٤٠ کیلۆگرام ٣حەب ڕۆژانە ١ جار،سەروی ٤٠ کیلۆگرام ڕۆژی ١ حەب بۆ چارەسەری مەلاریا کێشی ٥ تا٩ کیلۆگرام ٢ حەب ڕۆژانە ١ جار بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ، کێشی ٩تا١١ کیلۆگرام ٣ حەب ڕۆژانە ١جار بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ، سەروی ١١ کیلۆگرام ١ حەب ڕۆژانە ١جار بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ.

## ئەتراکیوریوم: ATRACURIUM

**ناوی بازرگانی:** Tracrium, Tracium

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلیگرام/میلیلیتر (١٠ میلی لیتر) (٥میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** خاوکەرەوەی پەیکەرە ماسولکە و دژی کرژبوونە و وەك دەرمانی یارمەتی دەر لە بێهۆشی نەشتەرگەری و بۆ ئاسان تێخستنی لوولە بۆ ناوەوەی قورقوڕاگە و فەراهەمکردنی کشانی پەیکەرەماسولکە لە کاتی نەشتەرگەری یان هەواگۆڕکێی میکانیکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادلێدانی دڵ کرژبوونی بۆری هەوا، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ سووربوونەوە، خوران، تەنگەنەفسی، زیادبوونی گەرمی لەش، پەڵە، کەمبوونەوەی صۆدیۆم، وەستانی هەناسە.

**بڕی دەرمان:** لەگەورەکان و منالی زیاتر لە ٢ ساڵ سەرەتا ٠,٤ تا ٠,٥میلیگرام بە شێوەی دەمار، پاشان ٠,١ تا ٠,٠٨ میلیگرام هەموو ٢٠ تا ٤٥ خولەکێك پاش لە بەکارهێنانی بڕی دەرمانی سەرەتا بە بڕی پێویست. لە منالانی ١ تا ٢٤ مانگ ٠,٣ تا ٠,٤ میلیگرام/کیلۆگرام بەشێوەی دەمار ڕێی پێ دەدرێت.

## ئەترۆپین سەلفەیت: ATROPINE SULFATE OPH.

**ناوی بازرگانی:** Atropair,Atrosulf,Minims Atropine

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاوی ١٪و٪ ٠,٥ مەڵهەمی چاو ١٪.

**گرووپی دەرمان:** Anticholinergic

**بەکارهێنان:** بۆ گەورەکردنی بیلبیلەی چاو و بۆ نەخۆشی گلوکۆما (ئاوی ڕەشی چاو) و لە ئیلتیهاباتی ڕەنگێنە و لەشی برژانگی چاودا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونی دەم، تێکچوونی بینین. کەمبوونەوەی هەموو دەردراوەکان، زیادبوونی پەستانی ناو چاو، ڕوشانی پێست، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا، سوتانەوە، زیادبوونی لێدانی دڵ سەرئێشە، خەوالویی، پەڵەی پێست، تا، بێهۆشی.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکاندا ١ تا ٢ قەترە لەگیراوەی ٠,٥٪، ١٪ لایەنی زۆر ٣ جار لە ڕۆژێکدا.منالان ١ تا ٢ قەترە لەگیراوەی ٠,٥٪، ١٪ لایەنی زۆر ١ تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا.مەڵهەمەکەش ڕۆژانە ٣جار.

## ئەترۆپین سەلفەیت: ATROPINE SULFATE SYS.

**ناوی بازرگانی:** Atropisol

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,٥ میلیگرام/١میلیلیتر و ١میلیگرام/میلیلیتر و ١٠ میلیگرام/٢میلی لیتر و ٢,٥ میلیگرام/میلیلیتر (٠,٨ میلی لیتر) و حەبی ٠,٥ و ٠,٤ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Anticholinergic

**بەکارهێنان:** گەورەکەری بیلبیلەی چاو، دژی نارێکی لێدانی دڵ دژی ئازارو کرژبوونی هەرس،دژی تەشەنوجی میزەڵدان و ڕیخۆڵەکان، برینی گەدە و ڕیخۆڵە، دژی ژەهراویبوون بە ئۆرگانۆ فۆسفەیتەکان بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونی دەم، تێکچوونی بینین، کەمبوونەوەی هەموو دەردراوەکان، سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، خرۆشان، گێژی، زیادبوونی لێدانی دڵ سوربونەوە، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، گەورەبوونی چاو.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکاندا ٠,٥ تا ١ میلیگرام هەر ٤ تا٦ سەعات، ماسولکەیی IM یان دەمار IV یان ژێرپێستی SC. لەمناڵاندا ٠,٠١ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ٤ تا ٦ سەعات، ژێرپێستی SC.

## ئەزاسیتیدین: AZACITIDINE

**ناوی بازرگانی:** Vidaza

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Atimetabolite

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەندێ جۆری شێرپەنجەی مۆخی ئێسك و نەخۆشی تێکچوونی خانەکانی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، قەبزی، ئازاری سك، دڵەڕاوکێ، هەوکردنی سی، تێکچوونی هەرس، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی، سەرئێشە، بێخەوی، گێژی، پەڵە، خوێنبەربوون، خوران، سوربونەوە، ئازاری ماسولکە، هێڵنجدان، نەمانی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٧٥ میلیگرام/مەتردوجا بە SCیان بە IV بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ، دوبارەکردنەوەی دەورەی دەرمانی هەمور ٤ هەفتەیەك. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٠٠ میلیگرام/مەتردوجا یە.

## ئەزاپینتاسین: AZAPENTACENE

**ناوی بازرگانی:** Cataxol

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو.

**گروپی دەرمان:** Opthalmologic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کاتاراکت (ناوی سپی چاو) پیری و زکماکی و کاتاراکتی برین و دووەمی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران و سوربونەوە لە دەورو بەری چاو و کاریگەری مەوزوعی هەیە.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ قەترە ٣ تا ٥ جار لە ڕۆژێکدا.

## ئەزاپرۆپازۆن: AZAPROPAZONE

**ناوی بازرگانی:** REUMAX

**شێوەی دەرمان:** لەرێی خۆراکی(دەم)ەوە.

**گروپی دەرمان:** NSAID



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری رۆماتیزم و هەوکردنی جومگەو هەوکردنی فەقەرەکان و داءالملوك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەستیار بوون بە رووناکی، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا، خوێنبەربوونی رِیخۆڵە.

**بڕی دەرمان:** بە پێی جۆری نەخۆشی یەکە بڕەکەی دەگۆڕێت.

## ئەزاتادین: AZATADINE

**ناوی بازرگانی:** Optimine

**شێوەی دەرمان:** لەرێی خۆراکی(دەم)ەوە.

**گرووپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری حەساسیەت وحەساسیەتی لوت و تای یۆنجەو شەرا و خوران و پێوەدان و بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بێخەوی، سەرئێشە، هێڵنجدان، رِشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، هیلاکبوون، گێژی، وشکبوونەوەی دەم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی سەروی ١٢ سالٚ ١تا٢ میلیگرام خۆراکی رۆژانە ٢ جار

## ئەزاثیۆپرین: AZATHIOPRINE

**ناوی بازرگانی:** Rheumox,Imuran,Azasan

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ٧٥ و ١٠٠ میلیگرامی و پاودەر بۆ دەرزی ١٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Immunsuppressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری رۆماتیزمی توند و ئیلتیهابی کۆڵۆن و فرە رەقبوون و ئەکزیما و ئیلتیهاب و بۆ بەرگری رەفزکردنی ئەندام پاش چاندنی گورچیلە و بۆ چارەسەری نەخۆشی کرۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری ماسولکە، رِشانەوە، تێکچوونی پێست، کەخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، تێکچوونی جگەر، تێکچوونی مۆخی ئێسك. پەڵە، هێڵنجدان، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئیلتیهابی قورِگ، هەڵوەرینی موو، تا، خوران، ئازاری جومگە.

**بڕی دەرمان:** یەك میلیگرام بەپێی هەر کیلۆگرامێك کێشی لەش (٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام خۆراکی). بۆ بەرگری رەفزکردنی ئەندام پاش چاندنی گورچیلە ٣ تا ٥ میلیگرام/کیلۆگرام.

## ئەزیلایك ئەسید: AZELAIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Azelex,Finacea, Skinoren

**شێوەی دەرمان:** کرێمی ٢٠٪ و جێڵی ١٥٪.



**گروپی دەرمان:** Antibacterial

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیپکەی ئاسایی سوك و مامناوەند و ئیلتیهابی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران. سوتانەوە، هەوکردنی پێست، ئۆدیما، ڕوشان، وشکبوونی پێست، پەڵە، ئیلتیهابی پێست، خراپتربوونی ڕەبۆ، سووربونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە دوو جار (بەیانیان و شەوان ).

## ئەزیلاستین: AZELASTINE

**ناوی بازرگانی:** Optilast, Rhinolast

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی سپرای لوت و قەترەی چاو هەیە.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری حەساسیەتی وەرزی لوت و خورانی لوت و پژمین و ئاو هاتنە خوارەوە بەلوتدا و جیوب و حەساسیەتی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشان، تێکچوونی تامکردن(تامی تاڵی).

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی گەورەتر لە ٥ ساڵ ١ سپرای بۆ هەر کونەلوتێك ڕۆژانە ٢ جار. گەورەکان و تەمەنی سەروی ١٢ ساڵ ١ قەترە بۆ هەر چاوێك ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار. لایەنی زۆر بۆ ماوەی ٦ هەفتە.

## ئەزیثرۆمایسین: AZITHROMYCIN

**ناوی بازرگانی:** Zithromax

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ و ٥٠٠ و ٦٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ٢٥٠ و ٥٠٠میلیگرامی و سەسپێنشنی ١٠٠ و ٢٠٠ و ٥٠٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و دەرزی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زۆربەی هەوکردنە بەکتریایی یە جیاوازەکان و دژی هەوکردنی بەکتریایی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسەدان و سی و پێست و گوێی ناوەڕاست و شانە نەرمەکان و ئەوانەی بەهۆی (کلامایدا تراکۆماتیس) توش دەبن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە، هێڵنجدان، سکچوون، ڕشانەوە، سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، ئازاری قەفەسەی سنگ، خرابی هەرس، غازات، هەوکردنی دەزگای زایەندی ژنان، کاندیداز، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** هەوکردنی گوێی ناوەڕاست منداڵانی گەورەتر لە ٦ساڵ ڕۆژی یەکەم ١٠ میلیگرام /کیلۆگرام پاشان ٥میلیگرام /کیلۆگرام بۆماوەی ٢تا٥ ڕۆژ.

ئیلتیهابی لەوزەو هەوکردنی گەروو منداڵانی گەورەتر لە دوو ساڵ١٢میلیگرام /کیلۆگرام خۆراکی ڕۆژانە بۆماوەی ٥ڕۆژ.

هەوکردنی سی یەکان گەورەکان ڕۆژی یەکەم ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی پاشان ٢٥٠میلیگرام بەخۆراکی ڕۆژانە تا ٥ ڕۆژ.

**ئەزیثرۆمایسین:** AZITHROMYCIN OPH.

**ناوی بازرگانی:** Azasite

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ١٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی چاو، کزانەوە، وشکبوونەوەی چاو، جیوب، گیرانی لوت، هەوکردنی کۆرنیە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ قەترە ڕۆژانە ٢ جار، هەموو ٨ تا ١٢ سەعاتێك بۆ ماوەی ٢ ڕۆژ. پاشان ١ قەترە هەموو ڕۆژێك بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ. منداڵانی گەورەتر لە ١ ساڵ ١ قەترە ڕۆژانە ٢ جار، هەموو ٨ تا ١٢ سەعاتێك بۆ ماوەی ٢ ڕۆژ. پاشان ١ قەترە هەموو ڕۆژێك بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ.

**ئەزتریۆنام:** AZTREONAM

**ناوی بازرگانی:** Azactam

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی ڤیالی ١و٢ گرام

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی سی یەکان و ئێسك و پێست و شانە نەرمەکان بەهۆی گرامنێگەتیفەکانەوە و بۆ هەوکردنی سی لە منداڵاندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، ڕشانەوە، پەڵەی پێست.

**بڕی دەرمان:** ١تا ٢ گرام هەمو ٨ بۆ ١٢ سەعاتێك. ٢ گرام هەموو ٦ تا ٨ سەعاتێك بۆهەوکردنی توند. بۆ تەمەنی سەرو ١٨ساڵ ٧٥ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار بۆماوەی ٢٨ ڕۆژ.

***

# B

## باسیتراسین: BACITRACIN

**ناوی بازرگانی:** Baciguent.Ak tracin

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی چاو و پێست باسیتراسین ٥٠٠ یەکە/گرام و باسیتراسین ٥٠٠ یەکە/پۆلیمیکسین بی سەلفەیت ١٠٠٠٠ یەکە/گرام & پاودەری باسیتراسین ٤٠٠ یەکە/نیۆمایسین ٣,٥ میلیگرام/ پۆلیمیکسین بی ٥٠٠٠ یەکە/گرام باسیتراسین ٤٠٠ یەکە/نیۆمایسین ٣,٥ میلیگرام/ پۆلیمیکسین بی ٥٠٠٠ یەکە/هایدرۆکۆرتیزۆن ١٠ میلیگرام/گرام باسیتراسین ٥٠٠ یەکە/نیۆمایسین ٣,٥ میلیگرام/ پۆلیمیکسین بی ٥٠٠٠ یەکە/لیدۆکاین ٤٠میلیگرام/گرام.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی چاو و ئیلتیهاب و ئازاری پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، خوران، ئیلتیهاب، حەساسیەت، ڕوشان.

**بڕی دەرمان:** لە مناڵ و گەورەکاندا ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار کاردێت.

## باکلوفین: BACLOFEN

**ناوی بازرگانی:** Lioresal,Gablofen

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٠ میلیگرام و ٢٥ میلیگرام و دەرزی ٥٠ مایکرۆگرام/میلیلیتر و ١٠ میلیگرام/٢٠ میلیلیتر و ١٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Askeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** بۆخاوکردنەوەی پەیکەرە ماسولکە (دژی کرژبوونی ماسولکە و ئازار و فرەڕەقبوون و شەلەلی مێشکی) بەکاردێت.

با ئاگادار بین، دەرمانە شێوەیەکی زۆری خراپ و کاریگەری نێگەتیڤ بەجێدەهێڵێت. ئەگەر بەگوێرەی بەکارهێنان...



**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، هێڵنجدان، سەرئێشە، نەمانی هاوسەنگی، گێژی، خەواڵویی، ئازاری قەفەسەی سنگ، تێکچوونی بینین، گەورەبوونی چاو، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، خەوزڕان، پەڵە، قەبزی، شەو میزکردن، زیادبوونی کێش، ئازاری ماسولکە، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە جار،بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٨٠ میلیگرامە.منداڵانی ٢ تا ٧ ساڵ ١٠ تا ١٥ میلیگرام ڕۆژانە خۆراکی، لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە٤٠ میلیگرامە.

## بالامین: BALAMINE DM

**ناوی بازرگانی:** Balamine DM

**شێوەی دەرمان:** قەترەی خۆراکی ١ میلی لیتری نەمانەی تێدایە ( کاربینۆکسامین ٢ میلیگرام + سیدۆئیفیدرین هایدرۆکلۆراید ٢٥ میلیگرام+ دێکسترۆمیپورفان هایدرۆبرۆماید ٣.٥ میلیگرام) و شروب ٥ میلی لیتری ئەمانەی تێدایە ( کاربینۆکسامین ٤ میلیگرام + سیدۆئیفیدرین هایدرۆکلۆراید ٦٠ میلیگرام+ دێکسترۆمیپورفان هایدرۆبرۆماید ١٢,٥ میلیگرام).

**گروپی دەرمان:** Decongstant ،antitussive ،Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کۆکە و گیرانی لوت و حەساسیەتی لوت و بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، سەرئێشە، تێکچوونی خەو، دووبینی، وشکبوونەوەی دەم، ڕشانەوە، سکچوون، سەرگێژبوون، هێڵنجدان، نەمانی ئارەزوی خواردن، دڵەکزە، تەشەنوج، ناڕێکی لێدانی دڵ، بەگرانی هەناسەدان، زیادبوونی لێدانی دڵ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، لەرزین، تێکچوونی خەو، لاوازی، میزکردنی بەئازار، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** قەترەی خۆراکی منداڵی ١ تا ٣ مانگ ٠,٢٥ میلیلیتر ٤ جار لە ڕۆژێکدا، ٣ تا ٦ مانگ ٠,٥ میلیلیتر ٤ جار لە ڕۆژێکدا،٦ تا ٩ مانگ ٠,٧٥ میلیلیتر ٤ جار لە ڕۆژێکدا،٩ تا ١٨مانگ ١میلیلیتر ٤ جار لە ڕۆژێکدا،شروب ١٨ تا ٦ ساڵ ٢,٥ میلیلیتر ٤ جار لە ڕۆژێکدا،گەورەکان و منداڵانی زیاتر لە ٦ ساڵ ٥ میلی لیتر(١ کەوچکی چا) ٤ جار لە ڕۆژێکدا.لە حاڵەتە سوکەکاندا یان بەتایبەتی لە نەخۆشە هەستیارەکاندا بڕی دەرمان کەمدەکەینەوە بە شێوەیەك شایستەو گونجاو بێت.



## بالانسد سالت: BALANCED SALT

**ناوی بازرگانی:** BSS

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ١٥ میلی‌گرام و ٥٠٠ میلی‌گرامی چاو.

**گروپی دەرمان:** Irrigating solution

**بەکارهێنان:** بۆ شتن و شۆردنی چاو کاتی نەشتەرگەری چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئیلتیهاب، برینی کۆرنیە، ئاوبەندی کۆرنیە.

**بڕی دەرمان:** بە پێی پێویست بەکاردێت.

## بالانسد سالت پلەس گلوتا پیون: BALANCED SALT P. G.

**ناوی بازرگانی:** BSS PLUS

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ١٢٠ میلی‌گرام و ٤٨٠ میلی‌گرام.

**گروپی دەرمان:** Irrigating solution

**بەکارهێنان:** شتن و شۆردنەوەی چاو کاتی نەشتەرگەری وەکو کاتاراکت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئیلتیهاب، برینی کۆرنیە، ئاوبەندی کۆرنیە.

**بڕی دەرمان:** بە پێی پێویست بەکاردێت.

## بالسالازاید: BALSALAZIDE

**ناوی بازرگانی:** Colazal

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٧٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Anti-inflammatory

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی کۆلۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك، سکچوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری جومگە، سەرئێشە، گێژی، ئیلتیهابی پەنکریاس، تێکچوونی جگەر، تێکچوونی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣ کەپسول ڕۆژانە ٣ جار، بۆ ماوەی ٨ تا ١٢ هەفتە.



## بامبیوتیرۆل: BAMBUTEROL HCL

**ناوی بازرگانی:** Bambec

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Beta٢ agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی ڕەبۆ و ئەو نەخۆشی یانەی ئەبنەهۆی تەسکبوونەوەی ڕێڕەوی هەوا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** لەرزینی دەست، سەرئێشە، توندی دەمار، کرژبوونی ماسولکە، دڵەکوتێ، زیادبوونی لێدانی دڵ، سیسبوونی دڵەماسولکە، تێکچوونی خەو، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار لەکاتی خەودا.

## باریۆم سەلفەیت: BARIUM SULFAT

**ناوی بازرگانی:** Barosperse,baricon,baroflave

**شێوەی دەرمان:** پاودەر بۆ سەسپێنشنی ١٣٥ گرم.

**گرووپی دەرمان:** مادەی تەشخیص کردن.

**بەکارهێنان:** لە ڕادیۆ گرافی گەدە و ڕیخۆڵەدابەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، حەساسیەت، قەبزی، هەوکردنی ڕیخۆڵەکوێرە، هێڵنجدان.

**بڕی دەرمان:** بۆ ڕادیۆگرافی گەدە ٦٠ تا ١٥٠ گرم بە شێوەو ڕێگەی خۆراکی لە ڕێ دەمەوە دەخورێت بۆ ڕادیۆ گرافی لەکۆلۆن و ڕیخۆڵە ١٥٠تا ٧٥٠ گرام بە شێوەی گیراوە لە ڕێی نیمیا (کۆم).

## باریۆم سەلفەیت ئێچ – دی: BARIUM SULFAT -HD

**شێوەی دەرمان:** پاودەری گیراوەی ٣٥٠ گرامی.

**گرووپی دەرمان:**: مادەی تەشخیص کردن.

**بەکارهێنان:** بۆ ڕادیۆ گرافی , لە بەشی سەرەوەی دەزگای هەرس بە کونتراست دوبڵ.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، غازات، هەوکردنی ڕیخۆڵە کوێرە.

**بڕی دەرمان:** پێش لە ئامادەکردنی گیراوەیباریۆم بۆ فەحصیقوڕگ٤٠تا ٦٠میلیگرام و فەحصی گەدە و دوانزەگرێ بە کونتراست دوبڵ ١٠٠تا ١٥٠ میلیگرام و فەحصی ڕیخۆڵەی بچوك ١٥٠تا ٢٥٠میلیگرام.

ۆ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لەبەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێک نەخۆشی

## باسیلیکسیماب: BASILIXIMAB

**ناوی بازرگانی:** Simulect

**شێوەی دەرمان:** دەرزی دەمار ١٠ میلی‌گرامی و ٢٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Immunosuppressant

**بەکارهێنان:** لەگەڵ سایکلۆسپۆرین و کۆرتیکۆستیرۆیدەکان دا بۆ بەرگری ڕەفزکردنی ئەندام پاش لە چاندنی گورچیلە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سکچوون، قەبزی، لەرز، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری گەدە، ئاوسان، تا، ئازاری لەش، لەرزین، تێکچوونی خەو، گێژی، ئاوبەندی، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمخوێنی، حەساسیەت، میزکردنی بەئازار، کۆکە، کاندیدیاز، تەنگەنەفەسی، تێکچوونی ئەلیکترۆتی لەش.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالانی کێشی زیاتر لە٣٥ کیلۆگرام ٢٠ میلی‌گرام ٢ سەعات پێش لە نەشتەرگەری چاندنی گورچیلە و ٢٠ میلی‌گرام ٤ ڕۆژ پاش لە نەشتەرگەری. منالانی کەمتر لە٣٥ کیلۆگرام ١٠ میلی‌گرام ٢ سەعات پێش لە نەشتەرگەری چاندنی گورچیلە١٠ میلی‌گرام ٤ ڕۆژ پاش لە نەشتەرگەری.

## بی سی جی ئینتراڤیسیکاڵ: INTRAVESICAL BCG

**ناوی بازرگانی:** Theracys

**شێوەی دەرمان:** ڤیالی ٧٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی میزەڵدان و ڕێڕەوی میز بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێحاڵی، کەمخوێنی، قەبزی –ئازاری سك، نەمانی ئارەزوی خواردن، تا، کۆکە، بوونی خوێن لەمیزدا.

**بڕی دەرمان:** قەترە قەترە دەکرێتە ناو میزەڵدان یەك ڤیاڵ ١ جار بۆماوەی ٦ هەفتە.

## بیکاپلیرمین: BECAPLERMIN

**ناوی بازرگانی:** Regranex

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی جێڵی ٠,٠١.

**گروپی دەرمان:** Growth facter

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری برینی مەوزوعی و برینی پێستی موزمینی توند بەهۆی نەخۆشی شەکرەوە.

**کاریگەری لاوەکی:** پەڵە، خوران، ئاوسان، ڕوشان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەرووی ١٦ ساڵ ١ جار لە ڕۆژێکدا و پێیەوە بمێنێتەوە بۆ ماوەی ١٢ سەعات، بڕی **بەکارهێنان** دەگۆڕێت بە پێی قەبارەی برینەکە.

## بیکلومیتازون: BECLOMETHASONE

**ناوی بازرگانی:** Becotide, Beconase,Beclovent

**شێوەی دەرمان:** سپرایی و ئایرۆسۆڵ ٥٠ و ٢٥٠ مایکرۆگرام/دۆز و سەسپێنشنی ٠.٨ میلیگرام/٢میلیلیتر و سەسپێنشنی ئاوەوەی لوت ٤٢ مایکرۆگرام.

**گروپی دەرمان:** CORTICOSTROID

**بەکارهێنان:** دژی ڕەبۆی موزمین و دژی هەوکردنی لوت و حەساسیەت و پوشەتاو ئیلتیهاباتی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی دەم، پەڵە، سەرئێشە، خوێنبەربوونی لوت، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کزانەوەی لوت، کەمبوونەوەی هەستی تامکردن، ئاوکردنی چاو، ئیلتیهابی گەروو.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری ڕەبۆی پەیوەست بە ستیرۆیدەکانەوە گەورەکان و منداڵانی سەرووی ١٢ ساڵ ٢ پاف ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. لە ڕەبۆی توندا ١٢ تا ١٦ پاف، ڕۆژانە بەتەدریجی و بڕی دەرمانی کەم دەست پێ دەکات. منداڵی ٦ تا ١٢ ساڵ ١ تا ٢ پاف، ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. لایەنی زۆر ڕۆژانە ١٠ پاف. لە منداڵی کەمتر لە ٦ ساڵ سەلامەتی ئەم دەرمانە پێشنیارنەکراوە. بۆ هەوکردن و حەساسیەتی لوت گەورەکان ١ پاف لە هەر کونەلوتێك، ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار. منداڵی ٦ تا ١٢ ساڵ ١ پاف ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## بیلادونا پی بی: BELLADONA P.B

**ناوی بازرگانی:** Donnatal , barbidona

**شێوەی دەرمان:** حەبی هایۆسین HBR ٦,٥ مایکرۆگرام، شەربەت (ELIXIR) هایۆسین HBR ٦,٥ مایکرۆگرام/٥ میلیلیتر و حەبی فینۆباربیتاڵ ١٦,٢ میلیگرام، شەربەت (ELIXIR) فینۆباربیتاڵ ١٦,٢ میلیگرام/٥ میلی لیترو حەبی ئەترۆپین سەلفەیت ١٩,٤ مایکرۆگرام، شەربەت (ELIXIR) ئەترۆپین سەلفەیت ١٩,٤ مایکرۆگرام/٥ میلیلیتر و حەبی هایۆسیامین سەلفەیت ١٠٣,٧ مایکرۆگرام، شەربەت (ELIXIR) هایۆسیامین سەلفەیت ١٠٣,٧ مایکرۆگرام/٥ میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antispasmodic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کرژبوونی سك و ئازاری سك و برینی گەدە و نەخۆشی گرژبوونی کۆڵۆن (IBS) و نەخۆشی ئیلتیهابی ڕیخۆڵە (IBD) و هەوکردنی تیژی ڕیخۆڵە و کۆڵۆن بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، خەوالّویی، بێهێزی، زیاد لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، گەورەبوونی سك، دڵەکزە، زیادبوونی پەستانی ناوەوەی چاو، گەورەبوونی چاو، گیرانی میز، تورەیی، قوتدانی بەئازار، خرۆشان، کەمبوونەوەی ئارەقکردن، تا، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ تا ١٠ میلیلیتر شەربەت ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. ١ تا ٢ حەب ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار. بۆ کۆنترۆڵکردنی دەردانی لیك ١ سەعات پێش لە کاری پزیشکی ددان گەورەکان ١ کەوچکی چێشتخۆری شەربەت. منداڵان ١ کەوچکی مرەباخۆری شەربەت.

**بلادونا ئێرگوتامین پی بی:** BELLADONA ERGOTAMINE PB

**ناوی بازرگانی:** BELLERGAL

**شێوەی دەرمان:** حەبی (بیلادۆنا ئەلکالۆید ٠,١ میلیگرام و ئێرگۆتامین تارتارەیت ٠,٣ میلیگرام و فینۆباربیتاڵ ٢٠ میلیگرام).

**گروپی دەرمان:** Alkaloid Beladona

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگرتن لە سەرئێشەی شەقیقە و سەرئێشەی پێش لە بێ نوێژی و کەمبوونەوەی نیشانەکانی لەحەیزچونەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خەوالّویی، بێهێزی، زیادلێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، قەبزی، گەورەبوونی سك، دڵەکزە، زیادبوونی پەستانی ناوەوەی چاو، گەورەبوونی چاو، خرۆشان. کەمبوونەوەی ئارەقکردن، تا، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** بۆ گەورەکان ١ حەب بەیانی ١ حەب نیوەڕۆ وە یان شەو ٢ حەب بەیانی ٢ حەب.

**بیمیپارین:** BEMIPARIN SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Zibor

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠٠ یەکەیی و ٣٥٠٠ یەکەیی و ٥٠٠٠ و ٧٥٠٠ و ١٠٠٠٠ یەکەیی.

**گروپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەکارهێنان:** دژی مەیین و کلۆبوونی خوێنە و بۆ پێشگرتنی مەیین و کلۆبوونی خوێنی دەماری قوڵ و مەیینی خوێنی سی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون. کەمبوونەوەی پەرەی خوێن، هەڵوەرینی موو، پوکانەوەی ئێسك، شەرا، زیادبوونی چەوری.

**بڕی دەرمان:** بەڕێگەی دەرزی ژێرپێستی ٢٥٠٠ تا ٣٥٠٠ یەکە ٢ سەعات پێش یان ٦ سەعات پاش لە نەشتەرگەری هەموو ٢٤ سەعاتێك. یان بەڕێگەی دەرزی ژێرپێستی ١١٥ یەکە/کیلۆگرام هەموو ٢٤ سەعاتێك.



## بێنازیپریل: BENAZEPRIL

**ناوی بازرگانی:** Lotensin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ و ٢٠ و ٤٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبوونەوەی پەستانی بەرزی خوێن و پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو و کەمی کاری سکۆڵەی چەپ و نەخۆشی شەکرەی گورچیلەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، گێژی، تا، لەرز. ئازار، خوێنبەربوون، بلۆقکردن، پەڵە، سوربونەوە، زیادبوونی کێش، ئازاری سنگ، زەردی، ئاوسان، کۆکە، خوران، نارێکی لێدانی دڵ گێژی، ئازاری گەدە، خەواڵویی، سەرئێشە، هێڵنجدان، قەبزی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلی‌گرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا، بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٢٠ تا ٤٠ میلی‌گرام خۆراکی لە ڕۆژێکدا لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٨٠ میلی‌گرامە لە ڕۆژێکدا.

## بێنداموستین: BENDAMUSTINE

**ناوی بازرگانی:** Treanda

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ میلی‌گرام.

**گروپی دەرمان:** Alkelating agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن لیمفۆسایتیك لیوکیمیای موزمین (CLL) و ناهوجکین لیمفۆما بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، قەبزی، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، خوێنبەربوون، دڵەکوتێ، ئازاری سنگ، نارێکی لێدانی دڵ بێخەوی، ئازار، لەرز، لاوازی ماسولکەیی، بلۆقکردنی پێست، پەڵە، سوربونەوە، تێکچوونی هەرس، ئاوسان. سەرئێشە، خەواڵویی. گێژی، کەمبوونی کێش، هێڵنجدان، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ لیمفۆسایتیك لیوکیمیای موزمین (CLL) ١٠٠ میلی‌گرام/مەتردوجا بە دەمار IV لە ڕۆژانی ١ و ٢ لە خولی ٢٨ ڕۆژیدا بۆ زیاتر لە ٦ خول. بۆ ناهوجکین لیمفۆما ١٢٠ میلی‌گرام/مەتردوجا بە دەمار IV لە ڕۆژانی ١ و ٢ لە خولی ٢١ ڕۆژیدا بۆ زیاتر لە ٨ خول.

## بیندرۆفلوازاید: BENDROFLUAZIDE

**ناوی بازرگانی:** Aprinox

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ و ٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Diuretic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئۆدیما (کۆبونەوەی ئاو لەلەشدا) و پەستانی بەرزی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی ئەلیکترۆلیتی لەش، کەمی صۆدیۆم و پۆتاسیۆم و مەگنسیۆم و کلۆر، زیادبوونی شەکری خوێن، زیادبوونی کالسیۆم، زیادبوونی یوریك ئەسید، کەمی پەڕەی خوێن و خرۆکەی سپی. لاوازی سێکسی، تێکچوونی بینین، هەوکردنی پەنکریاس، نارێکی لێدانی دڵ، سەرئێشە، گێژی، ئۆدیمای سی. هەوکردنی سی، هەستیاربوون بەڕووناکی.

**بڕی دەرمان:** بۆ ئۆدیما سەرەتا ٥ تا ١٠ میلی‌گرام ڕۆژانە لە بەیانیاندا، یان لە ڕۆژانی یەك بەدوای یەکدا، بڕی دەرمانی پاراستن ٥ تا ١٠ میلی‌گرام هەفتانە ١ تا ٣ جار. بۆ پەستانی بەرزی خوێن ٢,٥ میلی‌گرام ڕۆژانە لەبەیانیاندا، بڕی دەرمانی زۆر بەدەگمەن پێویستە.

## بێنپیریدۆل: BENPERIDOL

**ناوی بازرگانی:** Anquil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵکردنی لاساری هەڵسوکەوتی سێکسی دژکۆمەڵی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** پارکینسۆن، جوڵەی نارێك، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، لەرزینی ماسولکەیی، زیاد لێدانی دڵ ئارەقکردنەوە، گیرانی میز، خەواڵویی، گێژی، سەرئێشە، گیرانی لوت، بێخەوی، تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، وشکی دەم، قەبزی، بەگرانی میزکردن، تێکچوونی بینین، زیادبوونی کێش، گەورەبوونی مەمك، زەردی، لاوازی سێکسی، نارێکی بێ نوێژی، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٢٥ تا ١,٥ میلی‌گرام ڕۆژانە لەبڕی دەرمانی دابەشکراودا، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بەپێی کاردانەوەکەی، پیرەکان (یان کەم تواناکان) سەرەتا نیوەی بڕی دەرمانی گەورەکان. بۆ منداڵان پێشنیارنەکراوە.

## بێنزالكونیوم كلۆراید: BENZALKONIUM CHLORIDE

**ناوی بازرگانی:** CureChrome

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی گیراوە.

**گروپی دەرمان:** Antiseptic

**بەكارهێنان:** دژە هەوكەری پێست و برینەكانە، بۆ سوتان و ڕوشان و دژی هەوكردنی دەم و قورگ، بۆ شتنی دەستی جەراح، دژی هەوكردنی مێزەڵدان و هەوكردنی چاو و شتومەكەكانی نەخۆشخانە بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** ڕوشانی پێست، پەڵە، خوران. ئاوسان، سووربونەوە. ئازار.

**بڕی دەرمان:** بە خەستی شیاو گیراوەی ١,٧٥ تا ١.١٠٠٠٠ بە پێی پێویست سودی لێوەردەگیرێت.

## بێنزۆكائین: BENZOCAINE

**ناوی بازرگانی:** Americaine,Orajel

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی مەوزوعی ٥٪ و لۆزینج و شاف و سپرای.

**گروپی دەرمان:** Local anesthetic

**بەكارهێنان:** بێهۆشكەری مەوزوعی یەو بۆ كەمبوونەوەی ئازار و ئیلتیهابی پێستی و بە خۆراكی بۆ چارەسەری دڕانی دەم و زمان و برینی گەدە و ئازاری مەوزوعی و سوتانەوەی سوك بە تیشكی خۆر و ئازاری شوێنی مایەسیری و خوران و ئازار و سوتانەوە و گەستنی مێرووەكان بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** خوران، ئاوسانی مەوزوعی، سەرئێشە، سەرگێژبوون، سوتانەوە، هەستیاربوون بە تیشك، نەمانی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەكان و منداڵانی زیاتر لە ٢ ساڵ بەئەندازەی پێویست نەو شوێنەی پێ بماڵرێت.

## بێنزۆكاین & ئەنتیپایرین: BENZOCAINE & ANTIPYRINE

**ناوی بازرگانی:** Auralgan

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ٥,٤٪ ئەنتیپایرین ,١,٤٪ بێنزۆكاین.

**گروپی دەرمان:** Otic Anesthetic

**بەكارهێنان:** بۆ لابردنی ئازار لە هەوكردنی توندی گوێی ناوەڕاست بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** ڕوشانی مەوزوعی.

**بڕی دەرمان:** كەناڵی ناوەوەی گوێ پڕدەكەین هەموو ١ تا ٢ سەعاتێك. هەتا ئازارەكە لادەبات.



## بێنزۆیك ئەسید: BENZOIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Drazoic

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گیراوە یان (BULK) یان مەڵهەم.

**گروپی دەرمان:** Antiseptic

**بەکارهێنان:** دژی میکرۆب و کەڕووی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سووربونەوە، وشکبوونەوەی دەم.

**بڕی دەرمان:** بەشێوەی مەوزوعی سودی لێوەردەگیرێت ڕۆژانە ١ تا ٢ جار.

## بێنزۆین تینکچەر: BENZOIN TINCTURE

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گیراوە.

**گروپی دەرمان:** Skin Protectant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بالۆك، ترەکین و شەق بوونی نوکی مەمك و قڵیشی لێو و قڵیشی کۆم و بۆ پاراستنی پێست و ڕوشانی پێست و برینی پێستی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی پێستی، سووربونەوە، ئاوسان، ڕوشان، پەڵە، ئازار، خوران، بەگرانی هەناسەدان.

**بڕی دەرمان:** لە گیراوەی ٢٥٪ سود وەردەگیرێت.

## بێنزۆناتەیت: BENZONATATE

**ناوی بازرگانی:** Tessalon,Tessalon perles,Zonatuss

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠٠ و ٢٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antitussive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و لابردنی کۆکە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێوربوونەوە، ئازاری سنگ، تێکچوونی هەرس، گێژی، خەواڵوویی، خوران، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١٠ ساڵ ١٠٠ تا ١٥٠ میلی‌گرام خۆراکی ٣ جار لە ڕۆژێکدا، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٦٠٠ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا.

## بێنزۆیل پیرۆکساید: BENZOYL PEROXIDE

**ناوی بازرگانی:** Benoxyl, Benzac

**شێوەی دەرمان:** سابوون و لۆشن و جێل و کرێم.



**گرووپی دەرمان:** Antibiotic agent

**بەکارهێنان:** دژی بەکتریایە و بۆ چارەسەری زیپکە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی پێست، سوتانەوە، ڕوشانی پێست. توێك هەڵدانی پێست، بلۆقکردنی پێست، هەوکردنی پێست، حەساسیەتی پێست.

**بڕی دەرمان:** ١تا ٢ جار بە جێڵەکە. و ١تا ٤ جار لۆشنەکەی بەشێوەی مەوزوعی بەکاردێت.

## بێنزترۆپین: BENZTROPIN

**ناوی بازرگانی:** Akitan, Cogentin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٥ و ١ و ٢ میلی‌گرامی و دەرزی ١میلی‌گرام/میلی‌لیتر، ٢ میلی‌لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Anticholinergic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی ( پارکینسۆن ) و تێکچوونی دەرەوەی هەرەمی مێشکی و بۆ کەمکردنەوەی لەرزین و کرژبوونی ماسولکە لەنەخۆشی پارکینسۆندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، گیرانی میز، وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی بینین، سەرگێژبوون، سەرئێشە، بێحاڵی، خەمۆکی، خرۆشان، زیادلێدانی دڵ قەبزی، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** بۆ تێکچوونی دەرەوەی هەرەمی مێشکی گەورەکان ١ تا ٢ میلی‌گرام ڕۆژانە خۆراکی یان ماسولکەیی IMیان دەماری IV ١ جار. بۆ نەخۆشی پارکینسۆن ٠,٥ تا ٢ میلی‌گرام خۆراکی یان ماسولکەیی IMیان دەماری IV ١ جار. منداڵانی زیاتر لە ٣ ساڵ ٠,٠٢ تا ٠,٠٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ١تا ٢ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٦ میلی‌گرامە.

## بێنزیدامین: BENZYDAMINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Andolex,Difflam,tantum

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی مەوزوعی دەم ٠,١٥٪ و کرێم.

**گرووپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار وئیلتیهاب و بۆچارەسەری ئیلتیهابی برینی ناوچەی دەم و قورگ و بەشێوەی کرێمیش بۆچارەسەری ئازاری ماسولکە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت، سوتانەوە، سڕبوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,١٥٪ بەشێوەی مەوزوعی هەر ٨ سەعاتێك.

ن: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## بێنزایل بێنزووەیت: BENZYL BENZOATE

**ناوی بازرگانی:** Hemril,Pulmex,benylate

**شێوەی دەرمان:** لۆشنی مەوزوعی ٪٢٥.

**گروپی دەرمان:** Scabicide

**بەکارهێنان:** دژی گەڕی و دژی ئەسپێی سەر و عەورەت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێست، ڕوشانی چاو، تەشەنوج لەکاتی خواردنی.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری توشبوون بە ئەسپێ گەورەکان تەنها ١ جار، بۆ حاڵەتی توند چارەسەر دوبارەدەکرێتەوە ٢ یان ٣ جار پاش لە ٢٤ سەعات. بۆ منداڵان لەگەڵ ٣ بەشی ئاودا تەنها ١ جار. بۆ منداڵی گەورەتر لەگەڵ بڕێکی یەکسانی ئاودا تەنها ١ جار. گەورەکان بۆ چارەسەری توشبوونی گەڕی تەنها ١ جار، بۆ حاڵەتی توند چارەسەر دوبارەدەکرێتەوە پاش لە ٢٤ سەعات ١ جار هەر کاتێك لە ماوەی ٥ ڕۆژدا. بۆ منداڵان لەگەڵ ٣ بەشی ئاودا تەنها ١ جار. بۆ منداڵی گەورەتر لەگەڵ بڕێکی یەکسانی ئاودا تەنها ١ جار.

## بیفینیۆم هایدرۆکسی نەفپهیت: BEPHENIUM HYDROXY NAPHTHATE

**ناوی بازرگانی:** Alcopar

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گرانیوڵ لەبەستەی ٥ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Anthelmintic

**بەکارهێنان:** دژی کرمەو بۆ چارەسەری هەوکردن بەهۆی کرمی ئەسکارس و کرمی قولابداری ڕیخۆڵەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، سەرئێشە، سەرگێژبوون.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکاندا ٥ گرام ١ تا ٢ جار لە ڕۆژێکدا، لە منالآنی گەورەتر لە ٢ ساڵ ٢,٥ گرام ڕۆژانە بەرێگەی خۆراکی. منالی بچوکتر لە ٢ ساڵ ١,٢٥ گرام ڕۆژانە خۆراکی.

## بێراکتانت: BERACTANT

**ناوی بازرگانی:** Survanta

**شێوەی دەرمان:** سەسپێنشنی ٢٥ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Lung Surfactant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و پێشگری لە نەخۆشی سەختی ڕێڕەوی هەناسە(RDS) لە منداڵە تازەبووەکاندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی لێدانی دڵ زەردی پێست، بەگرانی هەناسەدان، کەمبوونەوەی میز، بوونی خوێن لە میزدا، خوێنبەربوونی ناوەوەی قوڕقوڕاگە.

**بڕی دەرمان:** منداڵان ١٠٠ میلیگرام/کیلۆگرام فۆسفۆلیپید لەکاتی لەدایکبوون (٤ میلی لیتر/کیلۆگرام) دووبارەکردنەوەی هەموو ٦ سەعاتێك، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٤ بڕی دەرمان لە ٤٨ سەعاتدا، ئەکرێتە ناو قوڕقوڕاگەوە.

## بیتاکارۆتین: BETACAROTENE

**ناوی بازرگانی:** Solatene, provatene, karotena

**شێوەی دەرمان:** کەپسول ١٥ و ٢٥و ٣٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** ڤیتامین A

**بەکارهێنان:** بۆ پارێزگاری کردنی پێست و بۆ پێشگری کەمبوونی ڤیتامین و کەمبوونەوەی کارلێکەکان بەهۆی هەستیاربوون بە ڕوناکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، تێکچوونی پێست، گۆڕانی ڕەنگی پێست بەزەرد، سکچوون، شلبوونەوەی پیسایی، ئازاری جومگە.

**بڕی دەرمان:** بۆ کەمبوونەوەی کارلێکەکان بەهۆی هەستیاربوون بە ڕوناکی گەورەکان ٣٠ تا ٣٠٠ میلیگرام خۆراکی،بەیەك بڕ یان لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.منالآنی بچوکتر لە ١٤ ساڵ ٣٠ تا ١٥٠ میلیگرام خۆراکی، بەیەك بڕ یان لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ پێشگری کەمبوونی ڤیتامین گەورەکان ١٠ تا ٢٥ هەزار یەکە ڕۆژانە ڤیتامین A. منالآن ٥ تا ١٠ هەزار یەکە ڕۆژانە ڤیتامین A.

## بێتاهیستین: BETAHISTINE ٢HCL

**ناوی بازرگانی:** Betaserc,Ribrain,vertilox,microser

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٨ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Analogue of histamine

**بەکارهێنان:** دژی سەرگێژبوون و نەخۆشی گوێی ناوەوە (مینیر) کە نەبێتەهۆی تێکچوونی هاوسەنگی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، تێکچوونی گەدە، خوران، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ١٦ میلیگرام لەرێی خۆراکیەوە ٢ تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە ٢٤ تا ٤٨ میلیگرامە.



## بیتاین: BETAINE

**ناوی بازرگانی:** Cystadane

**شێوەی دەرمان:** پاودەری ١٨٠ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihomocystinuria

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیادبوونی هۆمۆسیستین لە میزدا بەهۆی کەمبوونی هەندێ ئەنزیمەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئۆدیمای پێچەوانەی مێشکی، خرۆشان، خەمۆکی، تێکچوونی کەسایەتی، تێکچوونی خەو، گیرانی میز، هەڵوەرینی موو، شەرا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالانی سەروی ١٠ ساڵ، ٣ گرام ڕۆژانە ٢ جار، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بەپێی کاردانەوەکەی، لانی زۆر ٢٠ گرام لە ڕۆژێکدا، منالانی خوار ١٠ ساڵ ٥٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٢ جار، بڕی دەرمان یان فەوری ڕێکدەخرێت بەپێی کاردانەوەکەی، لانی زۆر ٧٥ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٢ جار.

## بێتامیتازۆن: BETAMETHASONE

**ناوی بازرگانی:** Betnesol

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی چاو ٠,١٪ و قەترەی چاو ولوت ٠,١٪.

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانی ئیلتیهابی چاو حەساسیەتی چاو هەوکردنی گوێی دەرەوە و لوت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بینین، فرمێسك ڕشتن، گلوکۆما، کاتاراکت، هەوکردنی توندی تامێسکی، درەنگ باشبوونەوەی برین، دروست بوونی گۆشتی زیادە لەچاو.

**بڕی دەرمان:** ١تا٢ قەترە هەر ١تا٢ سەعاتێك بکرێتە ناوەوەی چاو و ٠,٥تا١مەڵهەم ٢تا٣ جار ڕۆژانە یان کاتی خەوتن. بۆئیلتیهابی گوێ ٣ قەترە هەر ٢تا٣سەعات.

## بێتامیتازۆن: BETAMETHASONE

**ناوی بازرگانی:** Celestone

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٥ میلیگرامی و دەرزی ٤ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهاب و حەساسیەت و رۆماتیزم و ئیلتیهابی جومگەکان و ئیلتیهابی کیسەی جومگەیی و ناتەواوی ڕژێنی سەر گورچیلە (ئەدرینال) و ئیلتیهابی توند و کپکردنەوەی کۆئەندامی بەرگری بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، زیپکە، زیادبوونی پەستانی ناوەوەی مێشك، زۆربوونی موو، هیلاکبوون، بێهێزی، زیادبوونی کێش، بێخەوی، ناجێگیری، پوکانەوەی ئێسك، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٠,٦ تا ٧,٢ میلی‌گرام خۆراکی ١ جار، لایەنی زۆر ٩ میلی‌گرام بەدەمار IV یان بە ماسولکەیی IM، یان ٠,٥ تا ٩ میلی‌گرام بەدەمار IV. منالآن ١٧,٥ مایکرۆگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە خۆراکی، لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا یان (٥٠٠مایکرۆگرام/مەتردوجا خۆراکی ) یان ١٧,٥ مایکرۆگرام/کیلۆگرام بە IM هەر ٣ ڕۆژ یەك جار.

## بیتامیتازون نیل نەی: LA BETAMETHASONE

**ناوی بازرگانی:** Chrondose,celestone,soluspan

**شێوەی دەرمان:** دەرزی (بێتامیتازۆن ئەسیتەیت ٣میلی‌گرام/میلی‌لیتر + بێتامیتازۆن دای صۆدیۆم فۆسفەیت ٣میلی‌گرام/میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی توند و کپکردنەوەی کۆئەندامی بەرگری و هەوکردنی جومگەکان و ناتەواوی ڕژێنی سەرگورچیلە (ئەدرینالّ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، زیپکە، زۆربوونی موو، هیلاکبوون، بێهێزی، زیادبوونی کێش، بێخەوی، ناجێگیری، زیادبوونی پەستانی ناوەوەی مێشك، پوکانەوەی ئێسك، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم.

**بڕی دەرمان:** لەگەورەکاندا ١,٥ تا ١٢ میلی‌گرام دەرزی لە ناوی جومگە دەدرێت. بڕی دەرمان لەسەرەتادا ڕۆژانە ٠,٥ تا ٩ میلی‌گرامە , لە هەوکردنی جومگەکاندا بۆ جومگەی زۆر گەورە ١تا٢ سیسی بۆ جومگەی گەورە ١سیسی بۆ جومگەی مامناوەند ٠,٥ تا ١ سیسی و بۆ جومگەی بچوك ٠,٢٥ تا ٠,٥ سیسی یە.

## بیتامیتازون – نێن: BETAMETASONE N

**ناوی بازرگانی:** Betnesol n

**شێوەی دەرمان:** کرێم و مەڵهەم و لۆشنی (بێتامیتازۆن ٪٠,١ و نیۆمایسین سەلفەیت ٪٠,٥).

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری حەساسیەت و خوران و خورانی پێست بەهۆی گەستنی مێرووەکانەوە و سوتانی سوك و سوتانەوە بەتیشکی خۆر و نەخۆشی یەکانی پێستی و حەساسیەتی گوێی دەرەوە بەکاردێت

**بڕی دەرمان:** لەگەورەکان دا ڕۆژانە ٢ جار بە لۆشن یان ٣ جار بە کرێم یان مەڵهەم ڕووی شوێنی مەبەستی پێ دەماڵرێت، لەمنالآن دا ڕۆژانە ١ جار لەکرێم و لۆشن یان مەڵهەم بەڕووی شوێنی مەبەستدا دەماڵرێت.



## بیتامیتازون ڤالیرەیت: BETAMETHASONE VALERATE

**ناوی بازرگانی:** Valisone,betatrex

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم و کریم و لۆشنی ٪٠,١.

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهاب و ئازاری ستیرۆیدی بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** لەگەورەکاندا ڕۆژانە١تا ٢ جار لۆشن یان ١تا٣ جار لەمەڵهەم یان کریم ڕووی شوێنی مەبەستی پێ بماڵرێت، لەمناڵان ڕۆژانە ١ جار کریم یان مەڵهەم یان لۆشن بەڕووی شوێنی مەبەستدا بماڵرێت.

## بێتاکسۆلۆل: BETAXOLOL

**ناوی بازرگانی:** Kerlone

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Beta -blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و بۆ پێشگری لە ئازاری سنگ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نارێکی لێدانی دڵ هێڵنجدان. ئازاری گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئاوسان، زەردی، خەمۆکی، ئازاری جومگە، ڕشانەوە. لاوازی سێکسی. خەمۆکی، هیلاکی، خەوزڕان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلیگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا، زیاد دەکرێت بۆ ٢٠ میلیگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا. تا ٤٠ میلیگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا.

## بێتاکسۆلۆل: BETAXOLOL OPH.

**ناوی بازرگانی:** Betoptic

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاوی ٪٠,٥ و قەترەی چاوی ٪٠,٢٥.

**گروپی دەرمان:** Beta -blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبوونەوەی پەستانی چاو و گلوکۆمای موزمین (ئاوی ڕەشی چاو)ی گۆشەی کراوە بەکاردێت

**کاریگەری لاوەکی:** خەمۆکی، بێخەوی، فرمێسک ڕشتن، هەستیاربوون بە ڕوناکی، تێکچوونی بینین، ئازاری چاو، خوران، سوربونەوە، بەگرانی هەناسەدان. هیلاکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ قەترە، ڕۆژانە ٢ جار.



## بیثانیكۆل كلوراید: BETHANECHOL

**ناوی بازرگانی:** Urecholine,Duvoid,Myotonachol

**شێوەی دەرمان:** حەبی٥ و ١٠و٢٥ و ٥٠ میلی‌گرامی و دەرزی ٥ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Urinary cholinergic

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری بەگرانی میزكردن و كۆبوونەوەی میز كە ڕوودەدات پاش نەشتەرگەری و بۆ گەورەبوونی سك بەكاردێت، هەروەها كاردەكاتە سەر ڕیخۆڵە و میزەڵدان و هانی جوڵەی ڕیخۆڵەكان و میزەڵدان دەدات و دژی كۆبوونەوەی میزە لە میزەڵدان و هانی خاڵی كردنەوەی ئەم ئەندامانە دەدات.

**كاریگەری لاوەكی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، كرژبوونی سك، سەرئێشە، سكچوون، تەنگەنەفەسی، خیزەخیز، گێژی، خەوالوّیی، كەمبوونەوەی لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئارەقكردنەوە، بچوكبوونەوەی بیلبیلەی چاو، سەرگێژبوون، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** لەگەورەكاندا ١٠ تا ٥٠ میلی‌گرام خۆراكی ٣ جار لەڕۆژێكدا، ٢,٥ تا ٥ میلی‌گرام ژێرپێستی SC ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێكدا. لە منداڵانیش ٠,٣ تا ٠,٦ میلی‌گرام/كیلۆگرام خۆراكی ٣ تا ٤ جار لەڕۆژێكدا، ٠,١٥ تا ٢ میلی‌گرام/ كیلۆگرام ژێرپێستی SC ٣ تا ٤ جار لەڕۆژێكدا.

## بیڤاسیزوماب: BEVACIZUMAB

**ناوی بازرگانی:** Avastin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ میلی‌گرام/٤ میلی‌لیتر و ٤٠٠ میلی‌گرام/١٦ میلی‌لیتر و ٢٥ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەكارهێنان:** لەگەڵ فلۆرۆپایریمیدین بۆ چارەسەری شێرپەنجەی تەشەنەكردووی كۆلۆن و كۆم و شێرپەنجەی مێشك و هەروەها شێرپەنجەی گورچیلە و سی و هێلكەدان و مەمك بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** ئازاری سك، سكچوون، قەبزی، تێكچوونی تام، خوێنبەربوون، ئازاری گەدە، ڕشانەوە، بەگرانی هەناسەدان، ئازاری سنگ، خوێنبەربوون، تێكچوونی بینین، ئاوسان، سوربونەوە، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، بوونی خوێن لە میز و پیسایدا، سەرئێشە، هێڵنجدان، ئارەقكردنەوە، ناڕێكی لێدانی دڵ، تا، لەرز، نەمانی ئارەزوی خواردن، وشكبوونی دەم، گێژی، هەڵوەرینی موو.

**بڕی دەرمان:** بۆ شێرپەنجەی كۆم و كۆلۆن گەورەكان ٥ میلی‌گرام/كیلۆگرام یان ١٠ میلی‌گرام/كیلۆگرام بە دەمار هەموو ١٤ ڕۆژێك، بۆ شێرپەنجەی سی ١٥ میلی‌گرام/كیلۆگرام بە دەمار هەموو ٢١ ڕۆژێك، بۆ شێرپەنجەی هێلكەدان ١٥ میلی‌گرام/كیلۆگرام بە دەمار هەموو ٢١ ڕۆژێك، بۆ شێرپەنجەی مەمك و گورچیلە



١٠ میلیگرام/کیلۆگرام بە دەمار هەموو ١٤ ڕۆژێك، یەکەم بڕی دەرمان بۆ زیاتر لە ٩٠ خولەك و دووەم بڕی دەرمان بۆ زیاتر لە ٦٠ خولەك و سێیەم بڕی دەرمان بۆ زیاتر لە ٣٠ خولەك ئەگەر تەحەمولی بکات.

## بێکساڕۆتین: BEXAROTENE

**ناوی بازرگانی:** Targretin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٧٥ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری برینی پێستی خانەکانی T لیمفۆمای پێستی کە مقاومن بۆ دەرمانەکانی تر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی چەوری خوێن، کەمی پایرۆید، سەرئێشە، پەڵە، خوران، کەمی خڕۆکەی سپی، هێڵنجدان، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ٣٠٠ میلیگرام/مەتردوجا ڕۆژانە وەك ١ بڕی دەرمان لەگەڵ خواردندا، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بەپێی کاردانەوەکەی.

## بیزافایبرەیت: BEZAFIBRATE

**ناوی بازرگانی:** Bezalip

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Fibrates

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیادبوونی هەموو جۆرەکانی چەوری خوێن بەکاردێت، کە کاردانەوەیان نی یە بۆ ڕژێمی خۆراکی.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، نەمانی ئارەزوی خواردن، کۆلیستاسس، زیادبوونی کێش، گێژی، سەرئێشە، هیلاکی، خەواڵویی، لاوازی گورچیلە، زیادبوونی ئاوگی کارنیتین، لاوازی سێکسی، ئازار و لاوازی ماسولکە، بەردی زراو، کەمبوونی شەکری خوێن، کەمخوێنی، کەمی خڕۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، خوران، شەرا، هەستیاربوون بە ڕوناکی، زیادبوونی ژمارەی پەڕەی خوێن، هەڵوەرینی موو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار. منداڵانی ١٠ تا ١٨ ساڵ ٢٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بەپێ کاردانەوەکەی بۆ لانی زۆر ٢٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار. حەبی ٤٠٠ میلیگرامی گەورەکان ٤٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار ئەم شێوەیە ناگونجێت بۆ ئەو نەخۆشانەی گورچیلەیان لاوازە.



## بایکالوتامید: BICALUTAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Casodex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ١٥٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antiandrogen

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پرۆستات بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، گەورەبوونی مەمك، زیادبوونی کێش، نەمانی ئارەزووی سێکسی، کەمبوونەوەی چەوری، کەمخوێنی، هەڵوەرینی موو، خوران، ڕشانەوە، ئازاری سك، ئازاری سنگ، کۆکە، ئاوسان، زەردی، میزی خوێناوی، گێژی، برینی گەروو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥٠ میلیگرام خۆراکی ١ ڕۆژانە جار.

## بیماتۆپرۆست: BEMATOPROST

**ناوی بازرگانی:** Lumigan

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ١٠٠ و ٣٠٠ مایکرۆگرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Prostaglandin analogue

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبونەوەی پەستانی ناوەوەی چاو لە گلوکۆمای گۆشەی کراوە و بەرزبونەوەی زەختی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، لاوازی، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، هەوکردنی پێڵوی چاو، ئازار و ڕوشانی چاو، سوربونەوەی چاو، پەڵە، سەرئێشە، وشکی چاو، ترس لە ڕوناکی، هەوکردنی کۆرنیەی چاو، ئۆدیما، تێکچوونی بینین، ئازاری ماسولکە و جومگە، گێژی، تەنگەنەفەسی، ئازاری سنگ، دڵەکوتێ.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١ جار بەکاردێت، گونجاوترە لە ئێواراندا. بۆ خوار ١٨ ساڵ پێشنیار نەکراوە.

## بایپریدین: BIPERIDEN

**ناوی بازرگانی:** Akineton

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ و ٤ میلیگرامی بایپیریدن و دەرزی ٥ میلیگرامی بایپیریدین.

**گرووپی دەرمان:** Anticholinergic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی دەروونی و مێشکی (پارکینسۆن و دیسکینسیا) و نەخۆشی ماسولکەی بەهۆی دەرمانی کلۆرپرۆمازین و پێرفینازین و فلوفینازین بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونی دەم، ڕشانەوە. سەرئێشە، سەرگێژبوون، ناجێگیری، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان. قەبزی، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** لە تێکچوونەکانی دەرەوەی هەرەمی مێشکی لەگەورەکاندا ٢ میلیگرام لەڕێگەی خۆراکی ١ تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا. یان ٢ میلیگرام لەڕێگەی ماسولکەیی یان دەماری هەر نیو سەعاتێك ڕێی پێ دەدرێت. بڕو ئەندازەی دەرزی نابێت لە ٨ میلیگرام زیاتر بێت لە ڕۆژێکدا. لە پارکینسۆن گەورەکان ٢ میلیگرام لە ڕێگەی خۆراکی ٣ یان ٤ جار لە ڕۆژێکدا ڕێی پێ دەدرێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٦ میلیگرامە.

## بیزاکۆدیل: BISACODYL

**ناوی بازرگانی:** Biscolax,Dulcolax

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ میلیگرامی و شاف ٥ و ١٠ میلیگرامی و گیراوەی ئینیما(کۆم) ١٠ میلیگرام/٣٠ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Laxative

**بەکارهێنان:** ڕەوانکەرەو بۆچارەسەری قەبزی و خاڵی کردنەوەی ڕیخۆڵەکان پێش لە نەشتەرگەری و ئامادەکاری پێش لە منداڵبوون و نەشتەرگەری و پشکنینی کۆم و ڕیخۆڵەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، نەمانی ئارەزوی خواردن. خوێنبەربوون، ئازاری گەدە، گێژی، سکچوون، تینوێتی، پەلە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك. غازات، سوتانەوەی کۆم لەکاتی بەکارهێنانی شاف، تێکچوونی ئەلیکترۆلیتی لەش.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ٥ تا ١٥ میلیگرام خۆراکی، یان (١تا٣ حەب) پێش لە خەوتن یان پێش لە نانی بەیانی. لایەنی زۆر بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٣٠ میلیگرام خۆراکی. یان ئەتوانی یەك شافی ١٠ میلیگرامی بەکاربهێنی. لەمناڵی ٣ تا ١٢ ساڵ ٥ تا ١٠ میلیگرام لەڕێگەی خۆراکی یان ڕۆژانە نیوەی یەك شافی ١٠ میلیگرامی ، لە مناڵی کەمتر لە ٣ ساڵ ڕۆژانە نیوەی یەك شاف ٥ میلیگرام.

## بیسمەڤ سەبسیترەیت: BISMUTH SUBCITRATE

**ناوی بازرگانی:** Stomax

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidiarrheal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سکچوون و برینی گەدە و تێکچوونی هەرس و بۆ چارەسەر و پێشگری لە سکچوونی سەفەر بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** قەبزی، بەگرانی هەناسەدان، ڕەشبوونی پیسایی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ برینی گەدە ١٢٠ میلیگرام خۆراکی،ڕۆژانە ٤ جار. بۆ چارەسەر و پێشگری لە سکچوونی سەفەر ١ تا ٢ حەب هەر ٦ سەعاتێك پێش خواردن تا ٣ هەفتە. بۆ چارەسەری تێکچوونی هەرس و سکچوون گەورەکان ١ حەب هەر نیوسەعاتێك تا لایەنی زۆر ڕۆژانە ٨ بڕی دەرمان. منالآن نیوەی حەبێك هەر نیوسەعاتێك تا لایەنی زۆر ڕۆژانە ٨ بڕی دەرمان. منالّی ٣ تا ٦ سالّ یەك بەش لە سێ بەشی حەبەکە هەر نیوسەعاتێك تا لایەنی زۆر ڕۆژانە ٨ بڕی دەرمان. منالّی ٦ تا ٩ سالّ دوو بەش لە سێ بەشی حەبەکە هەر نیوسەعاتێك تا لایەنی زۆر ڕۆژانە ٨ بڕی دەرمان.

## بیسمەث سەبسیترەیت ومیترۆنیدازۆڵ و تێتراسایکلین:

## BISMUTH SUBCITRATE & METONIDAZOL & TETRACYCLINE

**ناوی بازرگانی:** Pylera

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی (١٤٠ میلیگرام بیسمەپ سەبسیترەیت و ١٢٥ میترۆنیدازۆڵ و ١٢٥ تێتراسایکلین).

**گروپی دەرمان:** Antibacterial,Antiprotozoal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری برینی گەدە و هەوکردن بە هۆی H pylori لەگەڵ ئۆمیپرازۆڵ دا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوونی ئاوی و خویناوی، ڤێ، کزانەوە، ئازار، ڕوشانی قوڕگ و سنگ و بەشی سەرەوەی گەدە، تا، لەرز، خوێنبەربوون، هێڵنجدان، نەمانی ئارەزوی خواردن، خوران، زەردی، سەرئێشە، گێژی، برینی دەم و لێو، خورانی زایەندی ژنان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣ کەپسول خۆراکی ڕۆژانە ٤ جار، پاش ژەمی خواردن و لە کاتی خەودا بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ، هەروەها ٢٠ میلیگرام ئۆمیپرازۆڵ خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار لە پاش ژەمی بەیانی و ئێوارە.

## بیسمەث سەبسالسیلەیت: BISMUTH SUBSALICYLATE

**ناوی بازرگانی:** Pepto bismol

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی حەبی ٢٦٢ میلیگرامی و سەسپێنشنی ٢٦٢ میلیگرام/ ١٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antidiarrheal

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری سکچوون و هێڵنجدان و دڵەکزە و هەرسەکردن و تێکچوونی گەدە و هەوکردنی بەکتریایی، H pylori بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** قەبزی، کەمبوونەوەی بیستن، بەگرانی هەناسەدان، زرنگانەوەی گوێ، ئاوسان، ڕەشبوونی پیسایی.

...: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ حەب یان ٣٠ میلی‌لیتر سەسپێنشن، لایەنی زۆر ٨ بڕی دەمان لە ٢٤ سەعاتدا. منالّی ٣ تا ٦ سالّ یەك بەش لە سێ بەشی حەبەکە یان ٥ میلی‌لیتر سەسپێنشن، لایەنی زۆر ٨ بڕی دەمان لە ٢٤ سەعاتدا. منالّی ٦ تا ٩ سالّ دوو بەش لە سێ بەشی حەبەکە یان ١٠ میلی‌لیتر سەسپێنشن، لایەنی زۆر ٨ بڕی دەمان لە ٢٤ سەعاتدا. منالّی ٩ تا ١٢ سالّ ١ حەب یان ١٥ میلی‌لیتر سەسپێنشن، لایەنی زۆر ٨ بڕی دەمان لە ٢٤ سەعاتدا.

## بیسمەث سەبسالیسیلەیت و میترۆنیدازۆل و تێتراسایکلین:
## BISMUTH SUBSALICYLAT&METONIDAZOL&TETRACYCLINE

**ناوی بازرگانی:** Helidac

**شێوەی دەرمان:** هێلیداك ئەمانەی تێدایە (١١٢بیسمەپ سەبسالیسیلەیت حەبی کرماندن ٢٦٢,٤ میلی‌گرام و ٥٦ حەبی میترۆنیدازۆلّ ٢٥٠ میلی‌گرام و ٥٦ کەپسولی تێتراسایکلین ٥٠٠ میلی‌گرام ).

**گروپی دەرمان:** H-pylori agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری برینی گەدە و دوانزەگرێ و ڕیخۆڵەباریکە و هەوکردن بە هۆی H-pylori بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، دڵەکوتێ، تا، لەرز، خوێنبەربوون، هێڵنجدان، نەمانی ئارەزوی خواردن، خوران، زەردی، سەرئێشە، خورانی زایەندی ژنان، بێخەوی، گێژی، خەمۆکی، پەڵە، هەوکردنی گەروو، قەبزی، سکچوون، ڕشانەوە، وشکی دەم، ئازاری پشت، هەوکردنی گەدە، غازات، برینی دوانزەگرێ، کۆکە، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ بیسمەپ سەبسالیسیلەیت حەبی کرماندن ٢٦٢,٤ میلی‌گرام/حەب و ١ حەبی میترۆنیدازۆلّ ٢٥٠ میلی‌گرام و ١ کەپسولی تێتراسایکلین ٥٠٠ میلی‌گرام ). پێکەوە وەردەگیرێت ڕۆژانە ٤ جار بۆ ماوەی ١٤ ڕۆژ.

## بایزۆپرۆلۆل: BISOPROLOL

**ناوی بازرگانی:** Cardicor, Emcor

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ میلی‌گرامی و حەبی ١,٢٥ و ٢,٥ و ٣,٧٥ و ٥ و ٧,٥ و ١٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Beta blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبونەوەی پەستانی خوێن و ئازاری سنگ و پەککەوتنی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، کەمبوونی لێدانی دڵ، پەککەوتنی دڵ، ترمبونەوەی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی، لاوازی سێکسی، گێژی، تێکچوونی هاوسەنگی، هیلاکی، تێکچوونی خەو، تێکچوونی بینین، هەڵوەرینی موو، وشکی چاو، پەڵە، لیر، کەمی پەرەی خوێن، خەمۆکی، لاوازی ماسولکەیی، گرژبوون، بێهۆشی، لاوازی بیستن، چاوئێشە، زیادبوونی ترایگلیسراید.

**بڕی دەرمان:** بۆ ئازاری سنگ و پەستانی بەرزی خوێن ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار (٥ میلیگرام لەبارە لەهەندێ نەخۆشدا)، لانی زۆر ڕۆژانە ٢٠ میلیگرامە. یارمەتیدەر لە پەککەوتنی دڵ سەرەتا ١.٢٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار لە بەیانیاندا بۆ ماوەی ١ هەفتە، پاشان ئەگەر تەحەمولی کرد، زیاد دەکرێت بۆ ٢,٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار بۆ ماوەی ١ هەفتە، پاشان ٣,٧٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار بۆ ماوەی ١ هەفتە، پاشان ٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار بۆ ماوەی ٤ هەفتە، پاشان ٧,٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار بۆ ماوەی ٤ هەفتە، پاشان ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار. لانی زۆر ڕۆژانە ١٠ میلیگرامە.

**بایڤالیرودین:** BIVALIRUDIN

**ناوی بازرگانی:** Angiomax

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەکارهێنان:** دژی مەینی خوێنە و بۆ بەرگری لە مەین و کلۆبوونی خوێن لەو کەسانەی کە ئازاری توندی سنگیان هەیە و بۆ کردنەوە و فراوانکردنی مولولەکانی خوێن لەو کەسانەی کە ئەنجیۆپلاستیان (داخران و تەسکبوونەوەی مولولەکانی خوێن) هەیە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، سەرئێشە، ئازاری پشت، تێکچوونی بینین، شڵەژان، ئاوسان، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، کۆکەی خوێناوی، ترمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری سنگ، ڕشانەوە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری گەدە، تا، بێخەوی، بەگرانی هەناسەدان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٧٥ میلیگرام/کیلۆگرام بە دەمار IV و پاشان ١.٧٥ میلیگرام/کیلۆگرام/سەعات.

**بلیۆمایسین سەلفەیت:** BLEOMYCIN SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Blenoxane

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٥ و ٣٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic,Antineoplastic

جێ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خانەکانی پولەکەیی پێست (SCC)، نەخۆشی هوجکین و ناهوجکین لیمفۆما، لیمف، سەر و مل و هێلکەگون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تەنگەنەفەسی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، زیپکە، خوران، هەڵوەرینی موو، ئاوسان، برینی زمان، تا، لەرز، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی کێش، سوربونەوە، خوران، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکان ١٠تا ٢٠ یەکە/مەتردوجا بەشێوەی ماسولکەیی و دەمار و ژێر پێستی ١ تا ٢ جار لە هەفتەیەکدا.

**بۆسیپریڤیر: BOCEPREVIR**

**ناوی بازرگانی:** Victrelis

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** لەگەڵ دەرمانی دژەڤایرۆسی تردا بۆ چارەسەری ئیلتیهابی جگەر (هیپاتیق C ) لە گەورەکاندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، وشکبوونەوەی پێست، هەڵوەرینی موو، ئازاری جومگە، تێکچوونی خەو، پەڵەی پێست، سەرئێشە، گێژی، هیلاکبون، برینی دەم و گەروو، تا، لەرز، ئازاری لەش، خێرا لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بڕی ٨٠٠ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی ڕۆژانە ٣ جار، لەگەڵ پێگئینتەرفیرۆن و ڕیباڤیرین بەکاردێت.

**بۆراکس: BORAX**

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی پاودەر.

**گروپی دەرمان:** Antibacterial

**بەکارهێنان:** دژی بەکتریایە و وەك نەرمکەرەوە لەکریمەکان و دەرمانەکانی پێستدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی مەوزوعی پێست، سکچوون، کاریگەری لەسەر جگەر و گورچیلە هەیە.

**بڕی دەرمان:** بەئەندازە و بڕی پێویست بەکاردێت.



**بۆریك ئەسید:** BORIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Hydralin,Bofax

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی (BULK).

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی بەکتریا و کەڕووی لاوازە و لە گیراوەکانی شۆردنی دەم و قەترەی چاو بۆ شۆردنی چاو و مێروکوژەکاندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی مەوزوعی پێست، سکچوون، کاریگەری لەسەر جگەرو گورچیلە هەیە.

**بڕی دەرمان:** بەئەندازە و بڕی پێویست بەکاردێت.

**بۆریك ئەسید:** BORIC ACID OPH.

**ناوی بازرگانی:** Collyrium Fresh

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گیراوە.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی بەکتریا و کەڕووی لاوازە و لە قەترەی چاو دا بۆ شۆردنی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کزانەوەی چاو، سوربونەوەی چاو، ئازاری توندی چاو، تێکچوونی بینین، ئاوکردنی چاو، ڕوشانی چاو.

**بڕی دەرمان:** بە بڕ و ئەندازەی پێویست بەکاردێت.

**بۆرتیزۆمیب:** BORTEZOMIB

**ناوی بازرگانی:** Velcade

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ٣,٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antneoplastic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی مۆخی ئێسك (مالتیپل مایلۆما) و لیمف (لیمفۆما) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، بێخەوی، گێژی، پەڵە، خوران، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، تەنگەنەفەسی، ئازاری جومگە و ماسولکە و ئێسك، ئۆدیما، ڕوشانی پێست، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، کۆکە، قەبزی، سکچوون، خوێنبەربوون، ڤێ، تا، لەرز، نارێکی لێدانی دڵ، ئازاری سك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١,٣ میلی‌گرام/مەتردوجا بە دەمار ٢ جار لە هەفتەیەکدا بۆ ماوەی ٢ هەفتە (لە ڕۆژەکانی ١ و ٤ و ٨ و ١١) ڕۆژی دەیەم ماوەی پشووە، ئەمەش دەکاتە ١ خولی چارەسەر.

نێ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## بۆسینتان: BOSENTAN

**ناوی بازرگانی:** Tracleer

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦٢,٥ میلیگرامی و ١٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Vasodilator antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبونەوەی پەستانی سی یە خوێنبەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ئازاری گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، زەردی، سەرئێشە، سوربونەوە، گێژی، هیلاکی، خوران، تێکچوونی گەدە، تەنگەنەفەسی، کەمخوێنی، پەڵە، ئازاری سنگ، وشکی دەم، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، دڵەکوتێ، ئۆدیما، تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، خوێنبەربوونی کۆم، لاوازی جگەر.

**بڕی دەرمان:** کێشی ٤٠ کیلۆگرام و زیاتر بڕی دەرمانی سەرەتا ٦٢,٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جاربۆ ماوەی ٤ هەفتە. بڕی دەرمانی پاراستن ١٢٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار. کێشی کەمتر لە ٤٠ کیلۆگرام بڕی دەرمانی سەرەتا ٦٢,٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار بۆ ماوەی ٤ هەفتە. بڕی دەرمانی پاراستن بەردەوام بڕی دەرمانی ٦٢,٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار. لانی زۆری بڕی دەرمان ٢٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار.

## بۆتیلیزم ئە نتی تۆکسین A: A BOTULISM ANTITOXIN

**ناوی بازرگانی:** Botox dysport

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ١٠ یەکەیی.

**گروپی دەرمان:** Neurotoxin

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خێلی چاو و تەشەنوجی پێڵوی چاو و کرژبوونی دڵ و تەشەنوجی ماسولکە و ئازاری کەمەر و تێکچوونەکانی ئیفلیجی مێشك و ئیفلیجی منداڵان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی چاو، فرمێسك ڕشتن، وشکبوونەوە و برینی کۆرنیەی چاو، وشکبوونەوەی دەم، هەستیاربوون بە روناکی.

**بڕی دەرمان:** بەپێی جۆری نەخۆشی یەکان بڕەکەی دەگۆڕێت.



## بۆتیلیزم مۆنۆڤالێنت ئەنتیتۆکسین: BOTULISM M. A.T.

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠٠٠/٢٠ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antitoxin

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگیری و چارەسەری ژەهراوی بوون بە ژەهری بۆتۆلیسم (بەهۆی ژەهری مێکرۆبی زۆر ترسناك لە هەنگوین و کەمپوتدا)بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت، بلۆقکردن، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** ٢٠ سیسی لە دژەژەهر لە ١٠٠ سیسی نۆرماڵ سەلاین ٠,٩٪ بتوێنینەوە تا نیو سەعات و دەرزی لێبدرێت و دوبارەکردنەوەی بۆماوەی ٢ سەعات ڕێگە پێدراوە.

## بریتیلیۆم توسیلەیت: BRETLYUM TOSYLATE

**ناوی بازرگانی:** Bretylol, Bretylate

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiarrhythmic

**بەکارهێنان:** دژی نارێکی لێدانی دڵ و زیادبوونی لێدانی دڵ و لەرینەوەی سکۆڵەی دڵ و وەستانی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرگێژبوون. نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** ٥ تا ١٠ میلی گرام/کیلۆگرام کێشی لەش.

## بریمۆنیدین: BRIMONIDINE

**ناوی بازرگانی:** Alphagan

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,٢٪ و ٠,١٥٪.

**گروپی دەرمان:** Alpha adrenergic agonist

**بەکارهێنان:** بۆ کەمکردنەوەی پەستانی ناوەوەی چاو و دژی گلوکۆما (ئاوی ڕەشی چاو)ی گۆشەی کراوە و بەرزبونەوەی زەختی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەواڵویی، خەمۆکی، دڵەڕاوکێ، بێخەوی، هێڵنجدان، سوربونەوەی پێڵوی چاو، سوتانەوەی چاو، خوران، دڵەکوتێ، ڕشانەوە، سکچوون، تێکچوونی بینین، کۆکە، وشکبوونەوەی دەم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵی ٢ ساڵ و زیاتر ١ قەترە ڕۆژانە ٢ جار.



## بریزنۆلەمایەد: BRINZOLAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Azopt

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ١٪.

**گروپی دەرمان:** Carbonic anhydrase inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ کەمکردنەوەی پەستانی ناوەوەی چاو و چارەسەری گلوکۆما (ئاوی ڕەشی چاو) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی چاو، کزانەوەی چاو، تێکچوونی بینین، فرمێسك ڕشتن، سەرئێشە، هێڵنجدان، سکچوون، سەرگێژبوون، ئازاری گورچیلە، ئازاری قەفەسەی سنگ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ قەترە هەر ٨ سەعات ١ جار.

## برۆمفیناك: BROMFENAC

**ناوی بازرگانی:** Xibrom , bromaday

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,٠٩ ٪.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** لەکاتی نەشتەرگەری کاتاراکت بۆ چارەسەر و لاردنی ئازار و ئاوسانی چاو ئیلتیهاب و ئازاری پاش نەشتەرگەری کاتاراکت (ئاوی سپی چاو) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ئازاری چاو، ڕوشانی چاو، سوتانەوە، ئاوسانی دەم، خوران، سووربونەوە، پەڵە، بەگرانی هەناسەدان، خوێنبەربوونی چاو، گۆڕانی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ قەترە ڕۆژانە ١ تا ٢ جار،١ ڕۆژ پێش لە نەشتەرگەری و ١ ڕۆژ پاش نەشتەرگەری بەردەوام دەبێت بۆ ٢ هەفتە پاش نەشتەرگەری.

## برۆم هیگزین: BROMHEXINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Bisolvon

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٨ میلیگرامی ئەلکزیر ٤ میلیگرام/٥میلی لیتری دەرزی ٢ میلیگرام/میلی لیتر, ٢میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Expectorant

**بەکارهێنان:** بەڵغەم دەرکەرەو دژی کۆکەی تەڕ و دژی ڕەبۆ و جیوب و هەوکردنی بۆریچکەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، پەڵەی پێست، نارەقکردن، ناڕەحەتی دەزگای هەرس.

**بڕی دەرمان:** لەگەورە کاندا خۆراکی ١٠ تا ٢٠ میلی لیتر شەربەت یان ١ تا ٢ حەب ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. لە گەورەکان و زیاتر لە ١٢ساڵ ٨ تا ٢٤ میلیگرام بەشێوەی دەماری لەسەرخۆ یان ماسولکەیی قوڵ. لە منداڵانی لە ٥ تا ١٢ ساڵ حەبی ٤ میلیگرام یان ٥ میلیلیتر شەربەت ڕۆژانە ٤ جار. لە منالّی کەمتر لە ٥ ساڵ ٤ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار.

## بڕۆمۆکریپتین: BROMOCRIPTINE

**ناوی بازرگانی:** Parlodel

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ میلیگرامی و کەپسولی ٥ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Dopamine receptor agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیادبوونی پڕۆلاکتین (هایپەرپڕۆلاکتینیمیا) و دژی پارکینسۆن و نەخۆشی نەکرۆمگالی (گەشەی نائاسایی ئەندامەکان ) و بۆ چارەسەری نەکەوتنە بێ نوێژی لە ژنی باڵغدا و نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی. خەمۆکی. وشکبوونەوەی دەم، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، سکچوون، ئازاری سك، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، زۆر میزکردن، تەنگەنەفەسی، تێکچوونی بینین، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١,٢٥ تا ٢,٥ میلیگرام و برەکەی بەپێی جۆری نەخۆشی یەکان دەگۆڕێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٠٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا.

## بڕۆمفینیرامین: BROMPHENIRAMINE

**ناوی بازرگانی:** Lodran

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦ و ١١ میلیگرامی و کەپسولی ١٢ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ١ میلیگرامی و ٢ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** دژی حەساسیەتە و بۆ چارەسەری حەساسیەت و هەوکردنی لوت و سەرمابوون و پژمین و خوران و ئاوکردنی چاو و شەرا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، هیلاکبوون، خەواڵویی، سەرئێشە، وشکبوونەوەی دەم، بەگرانی میزکردن، گەورەبوونی پرۆستات.

**بڕی دەرمان:** بەپێی نەخۆشی یەکان برەکەی دەگۆڕێت لە ٤ میلیگرامەوە تا٢٤ میلیگرام، تەمەنی ٢تا٦ ساڵ ١ تا ١٢ میلیگرام.



## بەدیسۆنایدە: BUDESONIDE

**ناوی بازرگانی:** Entocort ,rhinocort

**شێوەی دەرمان:** ئیستینشاقی ١٠٠و٦٤ و ٤٠٠ مایکرۆگرام بەرێگەی پرژاندن ٠,٥ و ١ میلیگرام /٢ میلیلیتر و کەپسولی ٣ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهابات و حەساسیەت و رەبۆ و هەوکردنی لوت و جیوب و گۆشتی زیادەی لوت و پوشەتا و بەشێوەی ئینیما و خۆراکی هەیەو بۆ چارەسەری نەخۆشی کرۆنی سوك و مامناوەند و ئیلتیهابی کۆلۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، وشکبوونەوەی دەم، هێڵنجدان، زیادبوونی کێش، هەوکردنی گەروو، ئازاری لوت، جیوب، کۆکە، خوران، پەڵە، حەساسیەت، ئۆدیما، کاندیدیاز.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ تا ٤٠٠ مایکرۆگرام خۆراکی ئیستینشاقی٢ جار لەرۆژێکدا. منالانی ٦ سالْ و گەورەتر ٢٠٠ مایکرۆگرام خۆراکی ئیستینشاقی٢ جار لەرۆژێکدا. منالانی ١ تا ٨ سالْ ٠,٢٥ میلیگرام بەرێگەی پرژاندن ١ جار لەرۆژێکدا. بۆ منالانی ٦ سالْ و گەورەتر ١ سپرایی بۆ هەر کونێکی لوت ١جار لەرۆژێکدا.بۆ نەخۆشی کرۆنی سوك و مامناوەند ٩ میلیگرام خۆراکی رۆژانە ١ جار لە بەیانیاندا و بۆ زیاتر لە ٨ هەفتە.

## بیومیتانایدە: BUMETANIDE

**ناوی بازرگانی:** Bumex,burinex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٥ و ١ و ٢ میلیگرامی و دەرزی ٠,٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Loop diuretic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کۆبوونەوەی ناو لەلەشدا (ئۆدیما) بەهۆی پەککەوتنی دڵ خوێنتێزراو و میزکردنی شەوانە و نەخۆشی گورچیلە و جگەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، زۆرمیزکردن، هێڵنجدان، گێژی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، خوێنبەربوون، تا، برینی قورگ، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم، نەمانی ئارەزوی خواردن، ڕشانەوە، ئازاری ماسولکە، بلۆقکردنی پێست، تێکچوونی بیستن، ئازاری گەدە، خوران، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٥ تا ٢ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی بەیەك بڕی دەرمان. دەرزی ٠,٥ تا ١ میلیگرام بە دەمار یان ماسولکەیی هەموو ٨ تا ٢٤ سەعاتێك، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٠میلیگرام لە رۆژێکدا. منالان ٠,٠١٥ تا ٠,١ میلیگرام/کیلۆگرام هەموو ٦ تا ٢٤ سەعاتێك.

## **بوپیڤاکائین:** BUPIVACAINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Marcaine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,٢٥٪ و ٠,٥٪/ ١٠ میلی لیتری و٠.٢٥٪ و٠,٥٪ ٢٠ میلی لیتری و ٠,٥٪/ ٤ میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** Local anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی مەوزوعی،لەکاتی منداڵبوونی ئاسایی و منداڵدان هەڵدڕین و حەبلی شەوکی و بلۆککردنی دەمار و نەشتەرگەری چاو و هێورکەرەوەی ئازار و لە پزیشکی دداندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، لەرزین، خەمۆکی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن. سەرگێژبوون، کەمبوونەوەی هۆشیاری، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ هێڵنجدان. ڕشانەوە، تەشەنوج.

**بڕی دەرمان:** لەگەورەکاندا ١٧٥ میلی‌گرام، بە یەك بڕی دەرمان لەڕۆژێکدا ڕێی پێ دەدرێت، **لایەنی زۆری بڕی** دەرمان ٤٠٠ میلی‌گرامە لەڕۆژێکدا ئەتوانرێ سودی لێ وەربگیرێت.

## **بوپرینۆرفین:** BUPRENORPHINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Buprenex

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,٣ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (١ میلی لیتر)و حەبی ٠,٤ میلی‌گرامی و کەپسولی ٠,٤ میلی‌گرامی و حەبی ژێرزمان ٢میلی‌گرامی و ٨ میلی‌گرامی و موشەمای ٥ و ١٠ و ٢٠ مایکرۆگرام/سەعات.

**گروپی دەرمان:** Narcotic analgesic

**بەکارهێنان:** دژی ئازاری سڕکەر و بۆ چارەسەری ئازاری مامناوەند و توند و بۆ کۆنترۆڵکردنی ئازاری پاش نەشتەرگەری و ئازاری توندی دەم و ددان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، نارێکی لێدانی دڵ خەواڵویی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، گیرانی میز، خوران، ئارەقکردن.

بڕی دەمان: لەگەورەکاندا ٠,٣ تا ٠,٦ میلی‌گرام هەر ٤تا ٦سەعاتێك لەسەرخۆ و بە دەمار یان ماسولکەیی. لەمناڵی ٢ تا ١٢ ساڵ بەئاستی هەر کیلۆ کێش ٢ تا ٦ مایکرۆگرام هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك. موشەما ٥ مایکرۆگرام/سەعات. لایەنی زۆر ٢٠ مایکرۆگرام سەعات.

پ: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## بوپرۆپیۆن: BUPROPION HBR

**ناوی بازرگانی:** Aplenzin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٧٤ و ٣٤٨ و ٥٢٢ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** دژی خەمۆکی و هەروەها بۆ تەرك کردنی جگەرە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی دەم، هێڵنجدان، بێخەوی، ئازاری سك، گێژی، نەمانی ئارەزوی خواردن، هەوکردنی گەروو، خرۆشان، خەمۆکی، لەرزین، دڵەکوتێ، ئارەقکردنەوە، ئازاری ماسولکە، پەڵە، زرنگانەوەی گوێ، تێکچوونی بینین، تێکچوونی هەرس، ناڕێکی لێدانی دڵ بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ١٧٤ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار لە بەیانیاندا، زیاد دەکرێت بۆ ٣٤٨ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار لە ڕۆژی چوارەمی چارەسەردا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٥٢٢ میلی‌گرامە.

## بوپرۆپیۆن: BUPROPION HCL

**ناوی بازرگانی:** Zyban,budeprion,wellbutrin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٧٥و ١٠٠ میلی‌گرامی و حەبی ١٠٠ و ١٥٠ و ٢٠٠ میلی‌گرامی و حەبی ١٥٠ و ٣٠٠ میلی‌گرامی و حەبی زایبان ١٥٠ میلی‌گرام.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** دژی خەمۆکی و هەروەها بۆ تەرککردنی جگەرە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێهێزی، بێخەوی، خەمۆکی، گێژی، پەڵە، ناڕێکی لێدانی دڵ بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی هەستی تامکردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، تێکچوونەکانی بیٚ نوێژی، وشکبوونەوەی دەم، خراپی هەرس، لاوازی سێکسی، تا، لەرز، هەوکردنی جومگە، تێکچوونی بینین، خوران، حەساسیەت، کرژبوونی بۆری هەوا، تێکچوونی بیستن.

**بڕی دەرمان:** بۆ تەرککردنی جگەرە لەسەرەتا ١٥٠ میلی‌گرام ڕۆژی ١ جار، ماوەی **بەکارهێنانی** دەرمان ٧ تا ١٢ هەفتەیە. بۆ خەمۆکی لەسەرەتا ١٠٠ میلی‌گرام ٢ جار لەڕۆژێکدا، لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٤٥٠ میلی‌گرامە.



### مەڵهەمی سوتان: BURN OINT.

**ناوی بازرگانی:** Dermilon

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی(كۆدلیڤەر ئۆیڵ٥٠٪ و زینك ئۆكساید ٣٠٪ )

**گروپی دەرمان:** Anti infective

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری سوتانەوەو بۆ پێشگری و چارەسەری ئیلتیهاب و ڕوشانی پێستی شیرخۆران و بۆ هێوركردنەوەی سوتان و برینی پێستی بەكاردێت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار بەشێوەی مەوزوعی بە ڕووی پێستدا بماڵرێت.

### بوسیریلین: BUSERELIN

**ناوی بازرگانی:** Suprecur,superfact

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١میلیگرام / میلیلیتر (٥,٥میلیلیتر ) و سپرای لوت ١٠٠ مایكرۆگرام/دۆز.

**گروپی دەرمان:** LHRH Analogue

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پرۆستات و ئیلتیهاباتی منداڵدان و بۆ هاندانی هێلكە بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** كەمبوونەوەی كێش، نەمانی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، ئۆدیما، بێخەوی، ڕشانەوە، هەوكردنی پێستی، سەرگێژبوون، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، گۆڕانی ECG، قەبزی، كەمخوێنی-هێڵنجدان، زیادبوونی ئارەقكردن، تەنگەنەفەسی، برینی لوت، زۆر میزكردن.

**بڕی دەرمان:** بۆشێرپەنجەی پرۆستات سپرای ٤٠٠ مایكرۆگرام هەر٨ سەعات جاری، دەرزی ٥٠٠ مایكرۆگرام هەر٨ سەعات جاری بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ. بۆ هاندانی هێلكە ٣٠٠ مایكرۆگرام ژێر پێستی ٢جار لەڕۆژێكدا لە ئیلتیهاباتی منداڵدان سپرای ١٥٠ مایكرۆ گرام ٣ جار لەڕۆژێكدا بۆماوەی ٦ مانگ.

### بەسپیرۆن: BUSPIRONE HCL

**ناوی بازرگانی:** Buspar

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و١٠ و ١٥ و ٣٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anxiolytic

**بەكارهێنان:** بۆچارەسەری قەلەقی و دڵەڕاوكێ بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** ئازاری سنگ، زۆرلێدانی دڵ، سكچوون، وشكبوونەوەی دەم، سەرئێشە، سەرگێژبوون، هێڵنجدان، بێهێزی.

**بڕی دەرمان:** حەبی ٥ میلیگرامی لە ڕێی خۆراكی بەوە ٣ جار لە ڕۆژێكدا. بڕی دەرمانی ئاسایی ٢٠ تا ٣٠ میلیگرامە لە ڕۆژێكدا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٦٠ میلیگرامە.

بۆ: بەرزكردنەوەی توانای دەروونی. لایەنێكی گرنگە بۆ دوور كەوتنەوە [illegible]



**بوسولفان:** BUSULFAN

**ناوی بازرگانی:** Busulfex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ میلیگرامی و دەرزی ٦٠ میلیگرام / ١٠میلیلیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antineoplastic agent

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی خوێن لیوکیمیا مایلۆبلاستیکی موزمن (CML) و بۆ چاندنی مۆخی ئێسك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، هیلاکبوون، خەوالّویی، ئازاری قەفەسەی سنگ، زیادبوونی لێدانی دڵ، سکچوون. قەبزی. هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، کەمخوێنی، گەورەبوونی مەمك، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، بەردی گورچیلە. تێکچوونی گورچیلە، پەڵە، وشکبوونەوەی پێست، هەڵوەرینی موو، کۆکە، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤ تا ٨ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە. منداڵان ٠,٠٦ میلیگرام /کیلۆگرام.

**بیوتاباربیتاڵ سۆدیۆم:** BUTABARBITAL SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Butisol sodium

**شێوەی دەرمان:** ئیلیکزیری خۆراکی ٣٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و حەبی خۆراکی ٣٠ میلیگرامی و ٥٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Sedative,barbiturate

**بەکارهێنان:** هێورکەرەوەیە و بۆ چارەسەری خەوزڕان و بێخەوی و هێورکەرەوەی پێش نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالّویی، گێژی، خرۆشان، تێکچوونی جگەر، حەساسیەت، تا، برینی گەروو، برینی ناودەم، ئازاری جومگەو ماسولکە، هێڵنجدان، ڕشانەوە. قەبزی. تێکچوونی گەدە.

**بڕی دەرمان:** بۆ بێخەوی ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام بە شێوەی خۆراکی و لەکاتی خەودا و بۆ هێورکەرەوەی پێش نەشتەرگەری ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی ٦٠ تا ٩٠ خولەك پێش لە نەشتەرگەری و وەك هێورکەرەوە ١٥ تا ٣٠ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. منداڵان بۆ هێورکەرەوەی پێش نەشتەرگەری ٢تا٦ میلیگرام/کیلۆگرام بەشێوەی خۆراکی ٦٠ تا ٩٠ خولەك پێش لە نەشتەرگەری،لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرامە.



**بیوتینافین:** HCL BUTENAFINE

**ناوی بازرگانی:** Mentax

**شێوەی دەرمان:** کرێمی مەوزوعی ١٪.

**گروپی دەرمان:** Antifungal agent

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی کەڕوویی نێوان پەنجەکانی پێ و نەخۆشی پێستی و پەڵەی پێستی و کەچەڵی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سووربوونەوەی پێستی، خوران، ڕوشانی پێستی، هەوکردنی پێستی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵی سەروی ١٢ ساڵ ڕۆژانە ١ تا٢ جار بەشێوەی مەوزوعی بۆ ماوەی ١ تا ٤ هەفتە.

**بیوتوکونازۆل:** BUTOCONAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Gynazole١ , Mycelex٣

**شێوەی دەرمان:** کرێمی زایەندی ژنان ٢٪.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی کاندیدای زایەندی ژنان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، برین، ئاوسان، سوتانەوەی زایەندی ژنان، ئازار و کرژبوونی سك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠ میلیگرام لە دەرمان ڕۆژانە ١ جار لەکاتی خەودا و بۆ ماوەی ٣ ڕۆژی یەك لە دوای یەك.

**بیوتۆرفانۆل:** BUTORPHANOL

**ناوی بازرگانی:** Stadol

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١ و ٢ میلیگرامی وسپرای لوت ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Narcotic analgesic

**بەکارهێنان:** دژی ئازارەو بۆ چارەسەر ئازاری مامناوەند و توند و لابردنی ئازاری پێش نەشتەرگەری و بەنج و شەقیقە و دژی ئازار لەکاتی منداڵبوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، خەواڵوویی، سەرئێشە، گێژی، گیرانی لوت، فراوانبوونی مولولەکانی خوێن، بێخەوی، دڵەکوتێ، تەشەنوج، خەمۆکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ سپرای بۆ هەرکونێکی لوت، دەرزی IMو IV بڕەکەی بەپێی جۆری ئازارەکە دەگۆڕێت لە ٠,٥ میلیگرامەوە تا ٤ میلیگرام هەموو ٣تا ٤ سەعاتێك لەکاتی پێویستی.

# C

## کابێرگۆلین: CABERGOLINE

**ناوی بازرگانی:** Dostinex,cabaser

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٥ و ١ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Dopamine receptor agonist

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری نەخۆشی پارکینسۆن و زیاد دەردانی پرۆلاکتین (هایپەرپرۆلاکتینیمیا) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون. بێهێزی، خەمۆکی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، سکچوون، غازات، ئازاری سك، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، بێخەوی، ئازاری مەمك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ نەخۆشی پارکینسۆن ٠.٥ میلی گرام١ جار لەڕۆژێکدا، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٥ میلی گرامە. بۆ چارەسەری زیاد دەردانی پرۆلاکتین (هایپەرپرۆلاکتینیمیا) ٠,٢٥ میلی گرام ٢ جار لەڕۆژێکدا، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١ میلی گرام ٢ جار لەڕۆژێکدا.

## کافاین: CAFFEINE

**ناوی بازرگانی:** Vinuphos

**شێوەی دەرمان:** لە پێکهاتەی ACAدا هەیە.

**گروپی دەرمان:** Alkaloid drug

**بەکارهێنان:** هانی ناوەندەکۆئەندامی دەمار دەدات و ئەبێتەهۆی زیادکردنی بێداری و هۆشیاری و چالاکی مێشك زیاد دەکات و میزپێکەرە و چالاکی کۆئەندامی هەناسەدان و ماسولکە زیاد دەکات و بۆ چارەسەری سەرئێشە بەکاردێت و لەگەڵ دژە ئازارەکانی ئەسپرین و کۆداین دا دەدرێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە. بێخەوی، تەشەنوج، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** بەبڕی جیاواز لەپێکهاتەی دەرمانەکاندا هەیە.



## کایدئۆیل: CADE OIL

**ناوی بازرگانی:** goodron

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گیراوە لە دەفرێکی تایبەتیدا ئیمۆلشن ٣٤٪ و مەلهەمی١٪تا ٥٪و شامپۆی ٤٪.

**گروپی دەرمان:** Antiseptic ,Keratolytic

**بەکارهێنان:** دژی خورانی مەوزوعی و بۆ چارەسەری نەخۆشی یەکانی پێستی وەکو سۆریاسس و ئەکزیما و کرێش بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیپکە، ئیلتیهابی پێست.

**بڕی دەرمان:** مەلهەمی١٪تا ٥٪ مەوزوعی ڕۆژی ١ جار، وە شامپۆی ٤٪ هەفتەیی ١ جار، ئیمۆلشنی ٣٤٪ بۆشۆردنی لەش ڕێی پێدەدرێت.

## کالامین – دی: D CALAMINE

**ناوی بازرگانی:** Calamox , ivarest

**شێوەی دەرمان:** لۆشنی ٨٪ (٦٠ میلی لیتر) و کرێمی مەوزوعی ٨٪ و مەلهەم.

**گروپی دەرمان:** Antipruritic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خوران و سوربونەوە وئیلتیهابی سوکی پێست و ئازار و ڕوشانی پێست و سوتانەوە بە تیشکی خۆر بەکاردێت و ئەبێتە هۆی فێنك کردنەوەی پێست.

**کاریگەری لاوەکی:** ئیلتیهابی سوکی پێست، سوربونەوە، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** بەشێوەی مەوزوعی ١تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## کالسیپۆتریۆل: CALCIPOTRIOL

**ناوی بازرگانی:** Dovonex

**شێوەی دەرمان:** مەلهەمی ٥٠ مایکرۆگرامی و لۆشنی ٥٠ مایکرۆگرام/میلیلیتر و کرێم. گیراوە و مەلهەم و کرێمی ٠,٠٠٥٪.

**گروپی دەرمان:** Antipsoriatic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی سۆریاسس (دروستبوونی پولەکەی پێست) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، ڕوشانی پێست، هەوکردنی پێست، پەڵە، خوران. سوربونەوە، وشکبوونەوەی پێست، سوتانەوە.

**بڕی دەرمان:** بەشێوەی مەوزوعی ڕۆژانە ١ یان ٢ جار.



## کالسی تونین: CALCITONIN

**ناوی بازرگانی:** Calcima,fortical,miacalcin,salmon

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ و ١٠٠ یەکە/میلی‌لیتر و سپرای لوت ١٠٠و ٢٠٠ یەکە/دۆز.

**گروپی دەرمان:** Antihypercalcaemia

**بەکارهێنان:** بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی کالسیۆم و فۆسفات لە خوێندا و چارەسەری زیادبوونی کالسیۆم (هایپەرکالسیمیا) و نەخۆشی باجەتی ئێسك و بۆ پێشگری لەپوکانەوەی ئێسك پاش لە لەجێچوونەوە و دروستبوونی ئێسکی ناتەواو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، هیلاکبوون، ئازاری سك، گیرانی لوت، ئازاری چاو، خوران، پەڵە، زۆر میزکردن، لەرز، حەساسیەت، شۆك، ئازاری کەمەر، خوێنبەربوون، سوتانەوە، هێڵنجدان، سکچوون، ئازاری سنگ، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** بۆ نەخۆشی باجەت گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ یەکەلە ڕۆژێکدا بەدەرزی لێدانی ماسولکەیی IM یا ژێر پێستی SC و یان یەك سپرای بۆ هەر کونێکی لوت.بۆ چارەسەری زیادبوونی کالسیۆم (هایپەرکالسیمیا) ٤ یەکە/کیلۆگرام بەدەرزی لێدانی ماسولکەیی IM یا ژێر پێستی SC هەر ١٢ سەعاتێك.

## کالسیتریۆل: CALCITRIOL

**ناوی بازرگانی:** Rocaltrol

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٠.٢٥ و ٠.٥ مایکرۆگرامی و گیراوەی ١ مایکرۆگرام/ میلی‌لیتر و دەرزی ١ مایکرۆگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Vitamin D analogue

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونی کالسیۆم و کەمبوونی کالسیۆم لەو کەسانەی چالاکی زیاد لە حەدی ڕژێنی پاراپایرۆید (هایپەرپاراپایرۆیدیزم) و کەمی چالاکی ڕژێنی پاراپایرۆید (هایپۆ پاراپایرۆید)ی یان هەیە و نەخۆشی زیندەچالاکی ئێسك لەوانەی نەخۆشی موزمینی پەککەوتنی گورچیلەیان هەیە و بۆ کەمبوونی ڤیتامین D و ئێسکەنەرمە و نەخۆشی سۆریاسس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێخەوی، بێهێزی، نارێکی لێدانی دڵ بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، هەوکردنی پەنکریاس. وشکبوونەوەی دەم، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، خوران، ناجێگیری، بەردی گورچیلە، ئازاری ماسولکەو ئێسك، کەمبوونەوەی کێش، کەمبوونەوەی ئارەزوی سێکسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی کەمتر لە ٥ ساڵ ٠.٢٥ تا ٢ مایکرۆگرام/ کیلۆگرام.



## کالسیۆم ئەسیتەیت: CALCIUM ACETATE

**ناوی بازرگانی:** Phoslo, phosex

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٦٦٧ میلیگرامی و حەبی و گیراوە.

**گروپی دەرمان:** Calcium supplement

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕێژەی فۆسفات و بۆ چارەسەری نەخۆشی زۆربوونی فۆسفات (Hyperphosphatemia) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی فۆسفات، قەبزی، زیادبوونی کالسیۆم. بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، وشکبوونەوەی دەم، زۆرمیزکردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ تا ٤ حەب یان ٣ تا ٤ کەپسول خۆراکی لەگەڵ هەر ژەمێکی خواردندا.

## کالسیۆم کاربۆنەیت: CALCIUM CARBONATE

**ناوی بازرگانی:** D٥، Cal

**شێوەی دەرمان:** حەبی کرماندن ٣٥٠ و ٤٢٠ و ٥٠٠ و ٥٥٠ و ٧٥٠ و ٨٥٠ میلیگرامی و سەسپێنشن.

**گروپی دەرمان:** Antacid

**بەکارهێنان:** دژی ترشەڵۆکی گەدەیە و بۆ چارەسەری برینی گەدە و دوانزەگرێ و تێکچوونی گەدە و زیادبوونی فۆسفات بەهۆی ناتەواوی گورچیلە و کەمی کالسیۆم و پوکانەوەی ئیسك و تێکچوونی گەدە و ئیلتیهابی سورێنچك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، سەرئێشە، کەمبوونەوەی فۆسفات، زۆربوونی کالسیۆم.

**بڕی دەرمان:** لەکەمی کالسیۆمدا بەبڕی ٥٠٠ میلیگرام تا ٢ گرام، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٧ گرامە لە ڕۆژێکدا.

## کالسیۆم کلۆرایدا: CALCIUM CHLORIDE

**ناوی بازرگانی:** Posture

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** جێگرەوەی کالسیۆم (لەتێکچوونی ئەلکترۆلیتەکان).

**بەکارهێنان:** لە کەمبوونی کالسیۆم و ژەهراویبوون بە مەگنسیۆم و چالاك کردنەوەی دڵدا بەکاردێت.

بۆ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی

**کاریگەری لاوەکی:** دروستبوونی بەردی گورچیلە، هەستکردن بەسوتانەوەی شوێنی دەرزی لێدان، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** لە کەمبوونەوەی کالسیۆمی توند دا ١٠٠ تا ٥٠٠ میلیگرام بۆ ماوەی ١ تا ٣ ڕۆژ دەرزی لێ دەردرێت.

## کالسیوم دی: D CALCIUM

**شێوەی دەرمان:** حەبی (کالسیۆم ٥٠٠ میلیگرامی و ڤیتامین D ٢٠٠ یەکە).

**گروپی دەرمان:** Antihypocalcemia

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمی کالسیۆم و ڤیتامین Dو پوکانەوەی ئێسک بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، نەمانی ئارەزوی خواردن، زۆربوونی کالسیۆم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٢ حەب.

## کالسیۆم فورت: CALCIUM FORTE

**ناوی بازرگانی:** Calcium sandozforte

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** ئەلیکترۆلیتەکان (جێگرەوەی کالسیۆم).

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونی کالسیۆم و پوکانەوەی ئێسك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، نەمانی ئارەزوی خواردن، زۆربوونی کالسیۆم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ حەب ٣ جار لەڕۆژێکدا بۆ ماوەی ١ هەفتە.

## کالسیوم دوبسیلەیت: CALCIUM DOBESILATE

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** تەواوکەری کاسیۆم،دژی تێکچوونی مولولەکان.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری تێکچوون و ناتەواوی مولولەکان و خراپبوونی تۆڕی چاو و ئۆدیمای ئەندامەکان و مایەسیری بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، نەمانی ئارەزوی خواردن، زۆربوونی کالسیۆم.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٥٠٠ تا ١٠٠٠ میلیگرام خۆراکی.

## کالسیۆم گلوبایۆنەیت: CALCIUM GLUBIONATE

**ناوی بازرگانی:** Calcionate,neo calglucon

**شێوەی دەرمان:** شروبی ١,٨ گرام/٥ میلیلیتر (توخمی کالسیۆم ١١٥ میلیگرام/٥ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Calcium Supplement

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونەوەی کالسیۆمی خوێن و کەمی چالاکی ڕژێنی پاراپایرۆید (هایپۆپاراپایرۆیدیسم) پوکانەوەی ئێسك و ئێسکەنەرمە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زۆربوونی کالسیۆم، کەمبوونی فۆسفات، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، قەبزی، وشکبوونی دەم، زیادبوونی میزکردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦ تا ١٨ گرام خۆراکی لە ڕۆژێکدا، لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، منداڵان ٦٠٠ تا ٢٠٠٠ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی لە ڕۆژێکدا ڕۆژانە لە ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٩ گرامە لە ڕۆژێکدا.

## کالسیوم گلوکونەیت: CALCIUM GLUCONATE

**ناوی بازرگانی:** Kalcinate

**شێوەی دەرمان:** حەب، دەرزی ١٠٪.

**گروپی دەرمان:** جێگرەوەی کالیسیۆم،دژی تێکچوونی ئەلیکترۆلیت.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونەوەی کالسیۆمی خوێن و بۆ دابەزاندنی پۆتاسیۆم و مەگنسیۆمی خوێن و چارەسەری وەستانی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زۆربوونی کالسیۆم، هێڵنجدان، ئازاری سك، بێهێزی، ناڕێکی لێدانی دڵ نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، خوێنبەربوون، ڕشانەوە، بەردی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** چارەسەری کەمبوونی کالسیۆم (هایپۆکالسیمیا) لە گەورەکاندا ٩٧٠ میلیگرامی لە ڕێگەی دەماری لەسەرخۆ ڕێی پێ دەدرێت، وە لە منداڵیش ٢٠٠ تا ٥٠٠ میلیگرام لەڕێگەی دەماری لەسەرخۆ ڕێی پێ دەدرێت، لەکاتی زیادبوونی پۆتاسیوم ١ تا ٢ گرام لەڕێگەی دەماری لەسەرخۆ ڕێی پێ دەدرێت ، زیادبوونی مەگنسیۆم لەش ١ تا ٢ گرام لەڕێگەی دەماری لەسەرخۆیی پێ دەدرێت ، لەکاتی گواستنەوەی خوێندا لەگەورەکان و منالاندا پاش لە گواستنەوەی هەر ١٠٠ میلیلیتر خوێن ٠,٥ میلیلیتر کالسیۆم گلوکۆنەیت بەIV ڕێی پێ دەردێت.



## کالسیوم پانتۆثینەیت: CALCIUM PANTOTHENATE

**ناوی بازرگانی:** Pantholin,pantenil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمانی:** ڤیتامین.

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەر و بەرگری لە کەمبوونی ڤیتامینی B٥ بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآن ڕۆژانە خۆراکی ٥ تا ١٠ میلی گرامە.

## کالسیۆم لاکتەیت: CALCIUM LACTATE

**ناوی بازرگانی:** Ridactate

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی خۆراکی.

**گروپی دەرمان:** Calcium Supplement

**بەکارهێنان: بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونەوەی کالسیۆمی خوێن و کەمی چالاکی ڕژێنی پاراپایرۆید (هایپۆپاراپایرۆیدیسم)، کەمی چالاکی درۆی ڕژێنی پاراپایرۆید (سیدۆهایپۆپاراپایرۆیدیسم) پوکانەوەی ئێسك و ئێسکەنەرمە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زۆربوونی کالسیۆم. کەمبوونی فۆسفات، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی نارەزوی خواردن، قەبزی، وشکبوونی دەم، زیادبوونی میزکردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٢٥ تا ٦٥٠ میلی گرام خۆراکی لە ڕۆژێکدا، لە ١ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. منالآن ٤٠٠ تا ٥٠٠ میلی گرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا خۆراکی لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك.

## کالفاکتانت: CALFACTANT

**ناوی بازرگانی:** Infasurf

**شێوەی دەرمان:** سەسپێنشنی ٣٥ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Surfactant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و پێشگری لە نەخۆشی سەختی ڕێڕەوی هەناسە(RDS) لە منداڵە تازەبووەکاندا بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، زەردی پێست، بەگرانی هەناسەدان، کەمبوونەوەی میز، بوونی خوێن لە میزدا، خوێنبەربوونی ناوەوەی قوڕقوڕاگە.

**بڕی دەرمان:** منداڵانی کەمتر لە ٧٢ سەعات ٣ میلی لیتر/کیلۆگرام ئەکرێتە ناو قوڕقوڕاگەوە، ئەتوانرێ دووبارەبکرێتەوە بۆ زیاتر لە ٣ بڕی دەرمان هەموو ١٢ سەعاتێک.

## کامفور: CAMPHOR

**ناوی بازرگانی:** Campholinict

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی کرێم و لینیمێنت و سپرای.

**گروپی دەرمان:** Antipruritic

**بەکارهێنان:** دژی ئازاری سوکی مەوزوعی و خوران بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، سەرئێشە، سەرگێژبوون، ڕەقبوونی ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** بەشێوەی مەوزوعی بە شوێنی خوراودا دەماڵرێت.

## کاندیسارتان: CANDESARTAN

**ناوی بازرگانی:** Atacand

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤ و ٨ و ١٦ و ٣٢ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، ئاوسان، ناڕێکی لێدانی دڵ، سەرئێشە، گێژی، کۆکە، برینی گەروو، سکچوون، ئازاری جومگە، ئازاری گەدە، سووربونەوە، شەرا.

**بڕی دەرمان:** بۆ پەستانی بەرزی خوێن گەورەکان ١٦ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار، بڕی دەرمانی ئاسایی ٨ تا ٣٢ میلیگرام ڕۆژانە ١ تا ٢ جار. بۆ پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو ٤ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار.

## کانابیس ئیکستراکت: CANNABIS EXTRACT

**ناوی بازرگانی:** Sativex

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی سپرای.

**گروپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** یارمەتیدەرە لە تەشەنوجی ماماوەند و توندا لە نەخۆشی مێشکی فرەڕەقبووندا بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوون و زیادبوونی ئارەزوی خواردن، تێکچوونی تام، قەبزی، سکچوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکی دەم، برینی دەم، ئازاری دەم، گێژی، تێکچوونی هاوسەنگی، خاوی، خەواڵویی، تێکچوونی بینین، هەوکردنی دەم، دڵەکوتێ، زیادبوونی لێدانی دڵ، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، هەوکردنی گەروو، بێهۆشی، وڕێنە، ڤێ.

**بڕی دەرمان:** بە بڕ و ئەندازەی پێویست بەکاردێت.

## کاپیسیتابین: CAPECITABINE

**ناوی بازرگانی:** Xeloda

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥٠ و ٥٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antneoplasm

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی مەمك و کۆم و کۆڵۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی خوێن. برینی دەم، گێژی، سەرئێشە، تا، بێخەوی، برینی گەروو، ئۆدیما، زەردی، ئازاری سك، قەبزی، هیلاکبوون، سکچوون، ڕشانەوە، هێڵنجدان، بێهێزی، وشکبوونەوەی پێست، لەرز، هەوکردنەکانی پێست، سوربونەوە، ئاوسان، ئازاری سنگ، ناڕێکی لێدانی دڵ، ڕوشانی چاو، نەمانی ئارەزوی خواردن، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠٠ میلی‌گرام/مەتردوجا خۆراکی ٢ جار لەڕۆژێکدا، هەر ١٢ سەعاتێك ١ جار. بۆ ماوەی ٢ هەفتە، پاشان ١ هەفتە دەرمان بەکارناهێنی و پاش ئەوە بە ٣ مەرحەلەی تر دووبارەدەکرێتەوە.

## کاپریۆمایسین: CAPREOMYCIN

**ناوی بازرگانی:** Capastat ,ogostal

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی دەرزی.

**گروپی دەرمان:** Antituberculosis

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی سیلی مقاوم بەدەرمانەکانی خەتی یەکەم بەکاردێت لەگەڵ دەرمانە دژە سیلەکانی تردا.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گوێ، سەرئێشە، تێکچوونی هاوسەنگی، تێکچوونی گورچیلە، حەساسیەت، ئازار، ئاوسان، لاوازی ماسولکەیی، پەڵە، ناڕێکی لێدانی دڵ، تا، لەرز، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ١٥ میلی‌گرام/ کیلۆگرام، لانی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١ گرامە (ماسولکەیی قوڵ). ئەم بڕی دەرمانە ٦٠ تا ١٢٠ ڕۆژ پێی دەدرێت و پاشان ١ گرام ٢ تا ٣ جار لە هەفتەیەکدا بۆ ماوەی ١٨ تا ٢٤ مانگ. لانی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٠ میلی‌گرام/کیلۆگرامە.



## کاپسایسین: CAPSAICIN

**ناوی بازرگانی:** Capsin,Zostrix

**شێوەی دەرمان:** کرێم و جێڵ و لۆشن.

**گروپی دەرمان:** Analgesic

**بەکارهێنان:** دژی ئازارو خوران و ئیلتیهابی مەوزوعی و بۆ ئازاری ماسولکەیی و جومگە و ئێسك و ئازاری دەمار بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی مەوزوعی، کۆکە، سووربونەوەی پێست.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار بەکاردێت.

## کاپتۆپریل: CAPTOPRIL

**ناوی بازرگانی:** Capoten,acepril

**شێوەی دەرمان:** حەبی١٢,٥ و ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** ACE inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێنی سوك تا توند و پەككەوتنی دڵ و کەمی کاری سکۆڵەی چەپ و نەخۆشی شەکرەی گورچیلەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** دابەزینی پەستانی خوێن، پەڵە، خوران، سەرگێژبوون، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم، ناتەواوی گورچیلە، زۆرمیزکردن، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن، زیادبوونی لێدانی دڵ تا، کۆکە، نەمانی ئارەزوی خواردن، نەمانی هەستی تامکردن.

**بڕی دەرمان:** بۆ پەستانی بەرزی خوێن گەورەکان ٢٥ میلیگرام خۆراکی ٢ تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا.لانی زۆری بڕی دەرمان ٤٥٠ میلیگرامە. ساوایانی بچوکتر لە ٢ مانگ ٠,٠٥ تا ٠.٥ میلیگرام/کیلۆگرام لە بڕێکی دەرماندا هەموو ٨ تا ٢٤ سەعاتێك. منالانی گەورەتر سەرەتا ٠,٣ تا ٠,٥ میلیگرام/کیلۆگرام لە بڕێکی دەرماندا، بۆ پەككەوتنی دڵ لەسەرەتا ٢٥ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ جار. بۆ نەخۆشی شەکرەی گورچیلەیی ٢٥ میلیگرام خۆراکی ٣ جار لە ڕۆژێکدا.



## کارباکۆل: CARBACHOL

**ناوی بازرگانی:** Carbastat, Corboptic, Miostat

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٣٪ (١٠ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Cholinergic agonist

**بەکارهێنان:** بیلبیلەی چاو بچوك دەکاتەوە و بۆ کەمبوونەوەی پەستانی ئاوەوەی چاو (IOP) لە گلوکۆما ( ئاوی ڕەشی چاو) و بەرزبوونەوەی پەستانی چاو پاش لە نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە. سکچوون، فرمێسك ڕشتن، زۆربوونی لیك، ئارەقکردن، خوران، بچووکبوونەوەی بیلبیلەی چاو، کزانەوەی چاو، تەشەنوج، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی بینین، ئازاری چاو، سەرئێشە، ڕوشان. سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکان و منداڵاندا ١ تا ٢ قەترە ١ تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## کاربامازیپین: CARBAMAZEPINE

**ناوی بازرگانی:** Atretol , Timonil ,Tegretol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٢٠٠ و ٣٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی و حەبی کرماندن ١٠٠ و ٢٠٠ میلیگرامی وحەبی XR ١٠٠ و ٢٠٠ و ٤٠٠ میلی گەرەمی و کەپسولی ١٠٠ و ٢٠٠ و٣٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ١٠٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Anticonvulsant

**بەکارهێنان:** دژی فێ و تەشەنوج و کرژبوونی ماسولکە و دژی ئازار و دژی مانیا ( شێتی) و دەمارەئێشەی سێ جمگەیی و تێکچوونی دووجەمسەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، سکچوون، تا، لەرز، کەمخوێنی، بێخەوی، بێهێزی، سەرگێژبوون، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری سك، وشکبوونەوەی دەم، پەڵە، تێکچوونی بینین، ئیلتیهابی برینی دەم و زمان.

**بڕی دەرمان:** بۆ تەشەنوج لە گەورەکان و منداڵانی سەرو ١٢ ساڵ ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام ٢ جار لە ڕۆژێکدا. منالانی ٦ تا ١٢ ساڵ ١٠٠ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لەڕۆژێکدا لە منالانی کەمتر لە ٦ ساڵ ١٠تا ٢٠ میلیگرام/ کیلۆگرام ڕۆژانەخۆراکی لە ٢ تا ٤ بڕی دابەشکراودا، بۆ مانیای تیژ ٤٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار. بۆ تێکچوونی دووجەمسەری ڕۆژانە ٤٠٠ میلیگرام.



**کاربارێل:** CARBARYL

**ناوی بازرگانی:** Carylderm

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی لۆشن و شامپۆ هەیە.

**گروپی دەرمان:** دژی ئەسپێ.

**بەکارهێنان:** بۆ کوشتنی ئەسپێی سەرو عەورەت بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** بەئەندازە و بڕی پێویست بەکاردێت.

**کاربامید پیرۆکساید:** CARBAMID PEROXIDE

**ناوی بازرگانی:** Murine

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گیراوە.

**گروپی دەرمان:** inflammatory Anti

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری ئیلتیهاب و هەوکردنی دەم وپوکی ددان و زمان و پێست و بۆلابردنی چڵکی گوێ بەکاردێت.

کاریگەری لاوەکیەکان: گێژی، پەڵە، ئازار، خوران، ڕوشان، خوێنبەربوونی گوێ، کەمبوونەوەی بیستن، ئاوسان.

**بڕی دەرمان:** لە گەورە کاندا و منالآن چەند قەترەیەك لە گیراوە دەکرێتە شوێنی هەوکردووەوە.

**کاربینیسیلین:** CARBENICILLIN

**ناوی بازرگانی:** Pyopen,Geocillin

**شێوەی دەرمان:** حەب و ڤیاڵ و کەپسول.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڕێڕەوی میز و هەوکردنی پەردەکانی مێشك و هەوکردنی پێست و هەوکردنی پرۆستات بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، سکچوون، هێڵنجدان، نازاری سك، تا، لەرز، پەڵە، خوران، ڤێ، ڕشانەوە، سەرئێشە.

بڕی دەرمان: لە گەورەکان لەچارەسەری هەوکردنی ڕێڕەوی میز ١ تا ٢ حەب هەر ٦ سەعاتێك، ١ تا ٢ گرام هەر ٦ سەعات ١ جار لە ڕێگەی ماسولکەیی یان دەمار، منالآنیش ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ٦ سەعات ١ جار لە ڕێگەی ماسولکەیی یان دەمار. لانی کەم ٥٠ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ٤ سەعات ١ جار لە ڕێگەی ماسولکەیی یان دەمار.

## کاربینۆکسۆلۆن: CARBENOXOLONE

**ناوی بازرگانی:** Bioplex , bioral

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی خۆراکی.

**گروپی دەرمان:** Anti inflammatory

**بەکارهێنان:** ئەبێتەهۆی کەمکردنەوەی ئیلتیهابات و بۆ چاکردنەوە و چارەسەری برینی گەدە و برینی دەم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کۆبوونەوەی خوێ و ئاو لەلەشدا(ئۆدیما)، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی کێش.

**بڕی دەرمان:** بەپێی جۆری نەخۆشی یەکە بڕەکەی دەگۆڕێت.

## کاربیتۆسین: CARBETOCIN

**ناوی بازرگانی:** Pabal

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ مایکرۆگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Prostaglandin

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری و کۆنترۆڵکردنی خوێنبەربوونی پاش منداڵبوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، سووربوونەوە، ئازاری سنگ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی، سەرئێشە، لەرزین، گێژی، کەمخوێنی، ئازاری پشت، لەرز، زیاد لێدانی دڵ ناڕەقکردنەوە، خوران، تامی کانزایی ناودەم، هەستکردن بەگەرمی.

**بڕی دەرمان:** بە شێوەی دەرزی دەماری لەسەرخۆ بۆ زیاتر لە ١ خولەك، ١٠٠ مایکرۆگرام، پاش لەدایکبوونی منداڵ.

## کاربیدۆپا & لیڤۆدۆپا: CARBIDOPA & LEVODOPA

**ناوی بازرگانی:** Sinemet,Parcopa

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی حەبی (١٠ میلیگرام کاربیدۆپا/١٠٠ میلیگرام لیڤۆدۆپا، ٢٥ میلیگرام کاربیدۆپا/١٠٠ میلیگرام لیڤۆدۆپا، ٢٥ میلیگرام کاربیدۆپا/٢٥٠ میلیگرام لیڤۆدۆپا) حەبی SR (٢٥ میلیگرام کاربیدۆپا ١٠٠ میلیگرام لیڤۆدۆپا، ٥٠ میلیگرام کاربیدۆپا/٢٠٠ میلیگرام لیڤۆدۆپا، حەبی ODT (١٠ میلیگرام کاربیدۆپا/١٠٠ میلیگرام لیڤۆدۆپا، ٢٥ میلیگرام کاربیدۆپا/١٠٠ میلیگرام لیڤۆدۆپا،٢٥ میلیگرام کاربیدۆپا ٢٥٠ میلیگرام لیڤۆدۆپا).



**گروپی دەرمان:** Dopamine Agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی پارکینسۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی دەروونی، ڕشانەوە، هێڵنجدان، سکچوون، خەمۆکی، خرۆشان، وشکبوونەوەی دەم. ئازاری سنگ، بەگرانی میز کردن، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، دیسکینسیا، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠/٢٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢٠٠٠/٢٠٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. منداڵان ٥ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا.

## کاربیمازۆل: CARBIMAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Neo mercazole

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antithyroid drug

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هایپەرپایرۆیدیسم (زیادبوونی پایرۆید) و بۆ کەمکردنەوەی دروستبوونی هۆرمۆنی پایرۆید لەکاتی زیادچالاکبوونی ڕژێنەکە و زیاد دروستبوونی هۆرمۆنی پایرۆید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، تێکچوونی هەرس، تا، خوران، سوربونەوە، تێکچوونی تامکردن، سەرئێشە، دڵەحەتی. پەڵە، خوران، ئازاری جومگە، هەڵوەرینی موو. کەمبوونەوەی نیوترۆفیل (جۆرێکە لە خرۆکەی سپی).

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٥ میلیگرام پێش لە نانی بەیانی. بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو ٥ تا ٢٠ میلیگرامە.

## کاربۆسیستین: CARBOCISTEINE

**ناوی بازرگانی:** Mucodyne

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٣٧٥ میلیگرامی و کاربۆسیستینی شلی خۆراکی ١٢٥ و ٢٥٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Mucolytics

**بەکارهێنان:** بۆ کەمکردنەوەی لینجی بەڵغەم و تواندنەوەی بەڵغەم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوونی گەدە و ڕیخۆڵە، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٢,٢٥ گرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، پاشان ڕۆژانە ١,٥ گرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا لە حاڵەتی چاکبوونەوەدا. منداڵی ٢ تا ٥ساڵ ٦٢,٥ تا ١٢٥ ڕۆژانە ٤ جار، منداڵی ٥ تا ١٢ ساڵ ٢٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار.



## کاربۆمێر: CARBOMERS (Polyacrylic acid)

**ناوی بازرگانی:** Liposic, gel tear, clinitas gel, liquivisic

**شێوەی دەرمان:** جێڵی چاو ٢،٠٪ و ٠.٢٥٪.

**گروپی دەرمان:** Tear deficiency,lubricants,astringent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری وشکبوونەوەی چاو بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار بەکاردێت، یان هەر کاتێك یان هەر کاتێك پێویست بێت.

## کاربۆپلاتین: CARBOPLATIN

**ناوی بازرگانی:** Carbosol ,Carbosin,Paraplatin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ و ١٠٠ میلی‌گرامی و ١٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر،٤٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Alkelating agent

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی هێلکەدان و سی و منالدان و لیوکیمیا و هێلکەگون و سەر و مل بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، کەمخوێنی، هەڵوەرینی موو، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن. میزی خویناوی، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٣٦٠ میلی‌گرام/مەتردوجا بە IV ئینفیوشن هەر ٤ هەفتە ١جار.

## کاربۆپرۆست: CARBOPROST

**ناوی بازرگانی:** Hemabate

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠ مایکرۆگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Prostaglandin

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خوێنبەربوونی توندی پاش منداڵبوون و لەبارچوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە. سکچوون، سووربونەوە، کرژبوونی بۆری هەوا، زیادبوونی گەرمی، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی، ئۆدیمای سی، لەرز، گێژی.

**بڕی دەرمان:** بە شێوەی دەرزی ماسولکەیی قوڵ ٢٥٠ مایکرۆگرام دووبارەدەکرێتەوە ئەگەر پێویست بێت ماوەکەی نابێت لە ١٥ خولەك کەمتر بێت. پێویستە بڕی تەواوی دەرمان لە ٢ میلی‌گرام تێپەڕنەکات (٨ بڕی دەرمان).



## کارگلومیك ئەسید: CARGLUMIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Carbaglu

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Nutrition & blood

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زۆربوونی ئەمۆنیا (هایپەرئەمۆنیمیا) تێکچوونێکی سوری یوریایە بەهۆی کەمبوونەوەی هەندێ ئەنزیمی جگەرەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئارەقکردنەوە، تا، لەرز، خێرا لێدانی دڵ، تێکچوونی بیستن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان سەرەتا ١٠٠ تا ٢٥٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە لە ٢ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا دەستبەجێ پێش لە خواردن، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بەپێی خەستی پلازما و ئەمۆنیا، بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ١٠ تا ١٠٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە لە ٢ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## کارمیلۆس صۆدیۆم: CARMELLOSE SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Optive

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,٥٪.

**گروپی دەرمان:** Tear deficiency,lubricants,astringent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری وشکبوونەوەی چاو بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** هەر کاتێك پێویست بوو بەکاردێت.

## کارمیلۆس صۆدیۆم: CARMELLOSE SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Orabase,orahesive

**شێوەی دەرمان:** مەعجونی دەم و پارودەر.

**گروپی دەرمان:** Antioral ulcer

**بەکارهێنان:** بۆ پاراستنی میکانیکی دەم یان برینی دەوری دەم بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** کاتێك پێویست بێت وەك چینێکی تەنك بەکاردێت، پاش ژەمەکانی خواردن. پاودەر دەپرژێنرێ لەو شوێنەی توشبووە.



## کاریسۆپرۆدۆل: CARISOPRODOL

**ناوی بازرگانی:** Soma

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ و ٣٥٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** ئەبێتەهۆی خاوکردنەوەی پەیکەرەماسولکە و لەگەڵ چارەسەری فیزیاییدا بۆ چارەسەری ئازار و کرژبوونی پەیکەرە ماسولکە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سووربوونەوە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، زیاد لێدانی دڵ خەواڵوویی، گێژی، سەرئێشە، خرۆشان، بێخەوی، ڤێ، لەرزین، تێکچوونی هاوسەنگی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ تا ٣٥٠ میلیگرام ٣ جار لە ڕۆژێکدا و لە کاتی خەودا.

## کارموستین: CARMUSTINE

**ناوی بازرگانی:** Bicnu

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ١٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Alkelating agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی مێشك و لیمف و هوجکین و ناهوجکین و میلانۆما و هیپاتۆما و مالتیپل مایلۆما (نەخۆشی مۆخی ئێسك) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گورچیلە. هەڵوەرینی موو، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، زەردی، ئاوسان، ئازاری سنگ. کۆکەی وشك، تا، خیزەخیز، بەخێرایی هەناسەدان، سووربوونەوەی چاو و پێست، برینی گەروو، خێرا لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** بڕی ١٥٠ تا ٢٠٠ میلیگرام/مەتردوجا بە دەمار IV هەموو ٦ تا ٨ هەفتەیەك.

## کارنیتین: CARNITINE

**ناوی بازرگانی:** Vitacarn,carnitor

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٣٠ میلیگرامی و حەبی کرماندن ١ گرامی و گیراوەی خۆراکی ٣٠٠ میلیگرام/میلیلیتر (٣٠٪) و کارنیتینی شلی خۆراکی ١٠٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Carnitine deficiency



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونەوەی کارنیتین سەرەتایی و دووەمی لە لەشدا و کەمی کارنیتین لەبەرنامەکانی لەش جوانی و لەش سازی (بەهێز کردنی ماسولکە ) و بەرگری لە جەمامبوونی ماسولکەکان لە هیمۆدیالیزدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، گۆڕانی بۆنی لەش، سەرئێشە، نەمانی ئارەزوی خواردن، ڕشانەوە، ئازاری سك، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** بۆ کەسێکی ٥٠ کیلۆگرامی ١ تا ٣ گرام لەگەڵ خواردن دا.

## کارتیلۆل: CARTEOLOL OPH.

**ناوی بازرگانی:** Teoptic

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاوی ١٪.

**گروپی دەرمان:** Beta blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی گلوکۆما(ئاوی ڕەشی چاو)ی گۆشەی کراوەی موزمین و بەرزبوونەوەی پەستانی ناوەوەی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سووربونەوە، ئازاری چاو، سوتانەوە.

**بڕی دەرمان:** ١ قەترە ڕۆژانە ٢ جار.

## کارتیۆلۆل: CARTEOLOL

**ناوی بازرگانی:** Cartrol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ و ٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Beta blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، بێخەوی، گێژی، سەرئێشە، هەڵوەرینی موو، خەمۆکی، پەڵە، تێکچوونی بینین، وشکی چاو، برینی گەروو، وشکی دەم، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، لاوازی سێکسی، بەگرانی میزکردن، کەمبوونەوەی پەرەی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢,٥ تا ١٠ میلیگرام هەموو ڕۆژێك.

## کارڤیدیلۆل: CARVEDILOL

**ناوی بازرگانی:** Eucardic,Coreg

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣,١٢٥ و ٦,٢٥ و ١٢,٥ و ٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Alpha & beta adrenergic blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری سنگ و پەککەوتنی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، سەرئێشە، تێکچوونی گەدە، وشکی دەم، وشکی چاو، تێکچوونی بینین، کەمی پەرەی خوێن، هەوکردنی گەروو، ئازاری سک، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی هاوسەنگی، بێخەوی، هیلاکبوون، کەمبوونەوەی ئارەزووی سێکسی، بەرزبوونەوەی شەکری خوێن، خەمۆکی، بێهێزی، ئۆدیما، ئازاری کەمەر.

**بڕی دەرمان:** بۆ پەستانی بەرزی خوێن گەورەکان ٦,٢٥ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٧ تا ١٤ ڕۆژ، لەکاتی تەحەمولی دەرمان ئەتوانی کە بڕی دەرمان تا ١٢,٥ میلیگرام لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٧ تا ١٤ ڕۆژ زیاد دەکرێت (لانی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٥٠ میلیگرام). بۆ ئازاری سنگ گەورەکان ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا. بۆ پەککەوتنی دڵی خوێن تێزراو گەورەکان ٣,١٢٥ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٢ هەفتە. لەکاتی تەحەمولی دەرمان ٦,٢٥ میلیگرام ٢ جار لە ڕۆژێکدا، دوو هەفتە ڕێی پێ دەدرێت. پاشان بڕی دەرمان ئەتوانیت کە هەر ٢ هەفتە ١ جار بکەیت بە دوو ئەوەندە. ٢٥ میلیگرام ٢ جار لە ڕۆژێکدا بۆ کەسانی خوار ٨٥ کیلۆ گرە و ٥٠ میلیگرام ٢ جار لە ڕۆژێکدا بۆ کەسانی سەرو ٨٥ کیلۆ گرام. بۆ نەخۆشی ماسولکەیی دڵی نەناسراو ٦,٢٥ تا ٢٥ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا.

## کاسپۆفەنجین ئەسیتەیت: CASPOFUNGIN ACETATE

**ناوی بازرگانی:** Cancidas

**شێوەی دەرمان:** پاودەر بۆ دەرزی ٥٠ و ٧٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی کەڕوویی هێرشبەری ئەسپەرجیلۆسس و هەوکردنی کەڕوویی سورێنچك و هەوکردنی کەڕوویی ناوەوە و هەوکردنی کەڕوویی کاندیدیاز بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تا، زیادبوونی لێدانی دڵ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم، ئازاری جومگە، نەمانی ئارەزووی خواردن، خوران، ئارەقکردن، پەڵە، لەرز، ئازاری سك.



**بڕی دەرمان:** گەورەکان بە IV ئینفیوشن ٧٠ میلی‌گرام لە ڕۆژی یەکەم و پاشان ٥٠ میلی‌گرام/مەتردوجا ڕۆژانە ١ جار ( ٧٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار ئەگەر کێشی لەشی لە ٨٠ کیلۆگرام زیاتر بوو). بە IV ئینفیوشن منالّی ١ مانگ تا ٣ مانگ ٢٥ میلی‌گرام/مەتردوجا ڕۆژانە ١ جار. منالّی ٣ مانگ تا ١ ساڵ ٥٠ میلی‌گرام/مەتردوجا ڕۆژانە ١ جار. منالّی ١ تا ١٨ ساڵ ٧٠ میلی‌گرام/مەتردوجا (لایەنی زور ٧٠ میلی‌گرام) لە ڕۆژی یەکەم و پاشان ٥٠ میلی‌گرام/مەتردوجا (لایەنی زۆر ٧٠ میلی‌گرام) ڕۆژانە ١ جار، زیاد دەکرێت بۆ ڕۆژانە ٧٠ میلی‌گرام/مەتردوجا (لایەنی زۆر ٧٠ میلی‌گرام) ئەگەر کەمترین بڕی دەرمانی تەحەمول کرد بەلاّم کاردانەوەیەکی تەواوی نەبوو.

## کاستەرئۆیل: CASTOR OIL

**ناوی بازرگانی:** Neoloid

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی ڕۆن.

**گروپی دەرمان:** Laxative

**بەکارهێنان:** نەهێشتن و لابردنی قەبزی و خالّی کردنی کۆلۆن و بۆ ڕادیۆگرافی و تەشخیص یان ئامادەکاری پێش نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سک.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥ تا ٦٠ میلی لیتر ١ جار لەڕۆژێکدا، منالاّن ٥ تا ١٥ میلی لیتر ١ جار لەڕۆژێکدا.

## سیفاکلۆر: CEFACLOR

**ناوی بازرگانی:** Distaclor

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلی‌گرامی و حەبی ١٢٥ و ١٨٧ و ٢٥٠ و ٣٧٥ میلی‌گرامی و سەسپێنشنی خۆراکی ١٢٥ و ١٨٧ و ٢٥٠ و ٣٧٥ میلی‌گرام/٥میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی بەشی سەرەوە و خوارەوەی کۆئەندامی هەناسە و میز و پێست و ئێسك و هەوکردنی گوێ ناوەڕاست و سك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، سەرئێشە، تا، گێژبوون، لەرز، هێڵنجدان. ڕشانەوە، ئازاری سك، غازات، دلّە کزە، نەمانی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکان، خوێنبەربوون، خوران، کەمخوێنی، پەلّە، شەرا، ئازاری جومگە، هەوکردنی پێست.



**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۲۵۰ تا ۵۰۰ میلیگرام ۳ جار لەڕۆژێکدا بەرێگەی خۆراکی ،بڕی دەرمان نابێت لە ٤ گرام لە ڕۆژێکدا تێپەڕێت و منالانی زیاتر لە ۱ مانگ ۲۰ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە خۆراکی ۳ جار لە ڕۆژێکدا، ئەکرێتە دووئەوەندە بۆ هەوکردنی توند. نابێت بڕی دەرمان لە ۱ گرام زیاتر بێت لە ڕۆژێکدا. یان ۱ مانگ تا ۱ ساڵ ٦۲,٥ میلیگرام هەموو ۸ سەعاتێك، منالی ۱ تا ٥ ساڵ ۱۲٥ میلیگرام، زیاتر لە ٥ ساڵ ۲٥۰ میلیگرام، بڕی دەرمان ئەکرێتە دووئەوەندە بۆ هەوکردنی توند.

## سیفادرۆکسیل: CEFADROXIL

**ناوی بازرگانی:** Baxan

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥۰۰ میلیگرامی و حەبی ۱ گرامی و سەسپێنشنی ۲٥۰ و ٥۰۰ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی ڕێڕەوی میزو بەشی سەرەوە و خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسە و پێست و هەوکردنی گەروو و لەوزەتێن و هەوکردنی گورچیلە و حەوز و ئاگرە و پەردەکانی دڵ و هەوکردنی ئێسك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، سەرئێشە، تا، گێژبوون، لەرز، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، غازات، دڵە کزە، نەمانی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکان، خوێنبەربوون، خوران، سووربونەوە، کەمخوێنی، پەڵە، شەرا، ئازاری جومگە، هەوکردنی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۱ تا ۲ گرام لە ۲ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. منالان ۳۰ میلیگرام/کیلۆگرام ۲ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## سیفالێکسین: CEFALEXIN

**ناوی بازرگانی:** Keflex , ceporex

**شێوەی دەرمان:** حەب و کەپسولی ۲٥۰ و ٥۰۰ میلیگرامی سەسپێنشنی خۆراکی ۱۲٥ و ۲٥۰ میلیگرام/٥ میلیلیتر و شروبی ۱۲٥ و ۲٥۰ و ٥۰۰ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی بەشی سەرەوە و خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسەدان و ڕێڕەوی میز و زاوزێ و هەوکردنی جومگە و ئێسك وپێست و هەوکردنی گوێی ناوەڕاست و دەم و ددان بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، تا، تەشەنوج، ئازاری سك، کەمخوێنی، تەنگەنەفەسی، حەساسیەت، سکچوون، تێکچوونی هەرس، خوران، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورە کان ٢٥٠ هەموو ٦ سەعاتێك یان ٥٠٠ میلیگرام هەموو ٨ تا ١٢ سەعاتێك ، زیاد دەکرێت بۆ ١,٥ گرام هەموو ٦ تا ٨ سەعاتێك بۆ هەوکردنی توند. لەمناڵاندا ڕۆژانە ٢٥ میلیگرام/کیلۆگرام لەبڕی دەرمانی دابەشکراودا، ئەکرێتە دووئەوەندە بۆ هەوکردنی توند. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرام/کیلۆگرامە، منداڵی خوار ١ ساڵ ١٢٥ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك، ١ تا ٥ ساڵ ١٢٥ میلیگرام هەموو ٨ سەعاتێك، ٥ تا ١٢ ساڵ ٢٥٠ میلیگرام هەموو ٨ سەعاتێك.

## سیفازولین: CEFAZOLIN

**ناوی بازرگانی:** Kefzol

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی و ١ و ١٠ و ٢٠ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی بەشی سەرەوە و خوارەوەی کۆئەندامی هەناسە و هەوکردنی ڕێڕەوی میز و ڕێڕەوی زراو و هەوکردنی ئێسك و پێست و جومگە و پەردەی ناوەوەی دڵ و هەوکردنی خوێن (سێپتیسیمیا) و هەوکردنی دەم و ددان و بۆ پێشگری هەوکردنی نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، تەشەنوج، هێڵنجدان، سکچوون، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، کرژبوونی سك، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکەی سپی، پەڵە، حەساسیەت، تا، خوران، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ میلیگرام تا ١ گرام هەر ٨ سەعاتێك ماسولکەیی یان دەمار، لەمناڵانی سەرو ١ مانگ ٢٥ تا ١٠٠ میلیگرام/کیلۆگرام ٣ جار لەڕۆژێکدا ماسولکەیی یان دەمار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٢ گرامە لە ڕۆژێکدا.

## سیفدینیر: CEFDINIR

**ناوی بازرگانی:** Omnicef

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٣٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ١٢٥ و ٢٥٠ میلیگرام/٥میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی بەشی سەرەوە و خوارەوەی کۆئەندامی هەناسە و هەوکردنی ڕێڕەوی میز و ڕێڕەوی زراو و هەوکردنی ئێسك و پێست و جومگە و هەوکردنی دەم و ددان و بۆ پێشگری هەوکردنی نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، سەرئێشە، زەردی، سەرگێژبوون، ئازاری سنگ، لەرز، خوێنبەربوون، بلۆقکردنی پێست، تەشەنوج، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، تا، کرژبوونی سك، کەمخوێنی، پەڵە، حەساسیەت، خوران، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار یان ٦٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١جار. منالآن ٧ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٢ جار، یان ١٤ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ١ جار.

## سیفدیتۆرین: CEFDITOREN

**ناوی بازرگانی:** Spectracef

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی بۆریچکەکان و لەوزەتێن و سی و هەوکردنی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، سەرئێشە، زەردی، سەرگێژبوون، ئازاری سنگ، لەرز، خوێنبەربوون، بلۆقکردنی پێست، تەشەنوج، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، تا، کرژبوونی سك، کەمخوێنی، پەڵە، حەساسیەت، خوران، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی ١٢ ساڵ و زیاتر ٢٠٠ تا ٤٠٠ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ١٠ تا ١٤ ڕۆژ.

## سیفیپیم: CEFEPIME

**ناوی بازرگانی:** Maxipime

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠ میلیگرامی و ١ گرامی و ٢ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی ڕێڕەوی میزو هەوکردنی پێست و هەوکردنی سی یەکان و هەوکردنی ناوەوەی سك و بەکتریایی بوونی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، ڕشانەوە، کرژبوونی سك، لاوازبوونی گورچیلە، هەوکردنی کاندیدیازی دەم، تا، سەرئێشە، ئازار، ئیلتیهاب، پەڵە، هەوکردنی دەزگای زایەندی ژنان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ گرام بەدەمار IV هەموو ٨ تا ١٢ سەعاتێك، بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ. منالآن ٥٠ میلیگرام/کیلۆگرام هەموو ٨ تا ١٢ سەعاتێك بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ.

## سیفیکسیم: CEFIXIME

**ناوی بازرگانی:** Suprax

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ٥٠ و ٢٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ١٠٠میلیگرام و ١٠٠میلیگرام/٥میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی ڕێڕەوی میز و هەوکردنی گوێی ناوەڕاست و گەروو و لەوزەتێن و سوزەنەك و هەوکردنی بۆریچکەکانی سی و پێست و ئێسك و هەوکردنی گورچیلە و حەوز و هەوکردنی ڕێڕەوی هەناسە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، غازات، خراپی هەرس، هیلاکبون، سەرگێژبوون، خوران، پەڵە، خوران و هەوکردنی زایەندی ژنان، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی زیاتر لە ١٠ ساڵ ڕۆژانە ٢٠٠ تا ٤٠٠ میلیگرام لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. لە سوزەنەکدا ٤٠٠ میلیگرام ١ جار لەڕۆژێکدا. منالآنی گەورەتر لە ٦ مانگ ٨ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. منالی ٦ مانگ تا ١ ساڵ ڕۆژانە ٧٥ میلیگرام. منالی ١ تا ٤ ساڵ ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرام. منالی ٥ تا ١٠ ساڵ ڕۆژانە ٢٠٠ میلیگرام.

## سیفۆپیرازۆن: CEFOPERAZONE

**ناوی بازرگانی:** Cefobid

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١ و ٢ و ١٠ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی ڕێڕەوی میز و هەوکردنی پێست و بەکتریایی بوونی خوێن و هەوکردنی ڕێڕەوی هەناسە و ناوەوەی سك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، ئازاری سك، نەمانی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، غازات، خراپی هەرس، هیلاکبون، سەرگێژبوون، خوران، پەڵە، خوێنبەربوون، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ تا ٤ گرام لە ڕۆژێکدا بە ماسولکەیی یان دەمار دابەشکراو لە هەموو ٨ تا ١٢ سەعاتێکدا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٦ گرامە لە ڕۆژێکدا.

پێ: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## سیفۆتاکسیم: CEFOTAXIME

**ناوی بازرگانی:** Claforan

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠ میلی‌گرامی و ١ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ و بۆ چارەسەری هەوکردنی بەشی خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسە و ڕێڕەوی میز و هەوکردنی پێست و بەکتریایی بوونی خوێن و هەوکردنی مێشك و جومگە و ئێسك و منداڵبوون بەنەشتەرگەری و هەوکردنی منداڵدان و حەوز و کۆم و سێپتیسیمیا و سوزەنەك و هەوکردنی ناوەندە کۆئەندامی دەمار بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تا، سەرگێژبوون، ڕشانەوە، بێهێزی، تەشەنوج، هێڵنجدان، نەمانی ئارەزوی خواردن، پەڵە، تەنگەنەفەسی، حەساسیەت، خوران، کرژبوونی سك، سکچوون، هەوکردنی کۆلۆن، سوربونەوەی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالأنی سەرو پەنجا کیلۆگرام ١ گرام ماسولکەیی یان دەماری هەر ٦ تا ١٢ سەعاتێك. لانی زۆر بڕی دەرمان ١٢ گرام منالأن تەمەنی زیاتر لە ١ مانگ تا ١٢ساڵ بە کێشی کەمتر لە ٥٠ کیلۆ گرام ٥٠ تا ١٨٠ میلی گرام / کیلۆگرام ڕۆژانە بەدەمار لەبڕی دەرمانی دابەشکراو هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك، منالأنی تەمەنی کەمتر لە ١ مانگ ٥٠ میلی‌گرام / کیلۆگرام بەدەمار هەر ٨ تا ١٢ سەعاتێك. بۆ پێشگرتنی هەوکردن پێش نەشتەرگەری گەورەکان ١ گرام بە دەماری یان ماسولکەیی ٣٠ تا ٩٠ خولەك پێش لە نەشتەرگەری. هەوکردنی سوزەنەکی بلاوبووەوە گەورەکان ١ گرام دەماری هەر ٨ سەعاتێك، منداڵان و ساوایان ٢٥ تا ٥٠ میلی‌گرام / کیلۆگرام دەماری ٨ تا ١٢ سەعاتێك بۆماوەی ٧ ڕۆژ یان ٥٠ تا ١٠٠ میلی‌گرام / کیلۆگرام ماسولکەیی یان دەماری هەر دوانزە سەعاتێك بۆماوەی ٧ ڕۆژ. سوزەنەکی بێ نیشانە گەورەکان و نەوجەوانان ١ گرام ماسولکەیی بەشێوەی یەك بڕی دەرمان.

## سیفۆتیتان: CEFOTETAN

**ناوی بازرگانی:** Cefotan

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١ و٢ و ١٠ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی بەشی سەرەوە و خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسە و ڕێڕەوی میز و هەوکردنی پێست و منداڵبوون بەنەشتەرگەری و هەوکردنی منداڵدان و حەوز و کۆم و ناوەوەی سك و جومگە و ئێسك بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، پەڵە، ئازاری سك، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، غازات، خراپی هەرس، کەمبوونەوەی میز، تەشەنوج، زەردی، ئاوسان، خوران، خوێنبەربوون، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٣ گرام بە دەمار هەموو ١٢ سەعاتێك. منداڵان ٢٠ تا ٤٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام بەدەمار هەموو ١٢ سەعاتێك، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٦ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا.

## سیفۆکسیتین: CEFOXITIN

**ناوی بازرگانی:** Mefoxin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١ و ٢ و ١٠ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporin,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی بەشی سەرەوە و خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسە و ڕێڕەوی میز و هەوکردنی پێست و منداڵبوون بەنەشتەرگەری و هەوکردنی منداڵدان و حەوز و کۆم و ناوەوەی سك و ئێسك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، پەڵە، ئازاری سك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، بلۆقکردنی پێست، خراپی هەرس، کەمبوونەوەی میز، تەشەنوج، زەردی، ئاوسان، خوران، تا، لەرز، برینی گەروو، سەرئێشە، خوێنبەربوون، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ میلی‌گرام بە دەمار هەموو ٦ تا ٨ سەعاتێك. منداڵان ٨٠ تا ١٦٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا دابەشکراو لە هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێکدا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٢ گرامە لە ڕۆژێکدا.

## سیفپۆدۆکسیم: CEFPODOXIME

**ناوی بازرگانی:** Vantin,Orelox

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٢٠٠ میلی‌گرامی و سەسپێنشنی ٤٠ و ٥٠ و ١٠٠ میلی‌گرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporin,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی بەشی سەرەوە و خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسە و ڕێڕەوی میز و هەوکردنی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، پەڵە، ئازاری سك، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، تا، برینی گەروو، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نارێکی لێدانی دڵ، خراپی هەرس، کەمبوونەوەی میز، تەشەنوج، زەردی، ئاوسان، خوران، خوێنبەربوون، کەمخوێنی، کۆکە، پژمین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠ تا ٤٠٠ میلی‌گرام خۆراکی هەموو ١٢ سەعاتێك، منداڵان ٥ تا ١٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار.

جێ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## سیفپرۆزیل: CEFPROZIL

**ناوی بازرگانی:** Cefzil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ١٢٥ و ٢٥٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Cephalosporin,Antibiotic

**بەكارهێنان:** دژی هەوكردنی بەكتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوكردنی بەشی سەرەوە و خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسە و ڕێڕەوی میز و هەوكردنی گوێی ناوەڕاست و هەوكردنی پێست و هەوكردنی گورچیلە و حەوز بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** سكچوون، پەڵە، ئازاری سك، كەمبوونەوەی ئارەزووی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تا، لەرز، برینی گەروو، گێژی، خرابی هەرس، تەشەنوج، زەردی، ئاوسان، خوران، خوێنبەربوون، كەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان و منداڵانی سەرووی ١٢ ساڵ ڕۆژانە ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلیگرام خۆراكی ڕۆژانە ٢ جار. منداڵان ٧,٥ تا ١٥ میلیگرام/كیلۆگرام خۆراكی ڕۆژانە ٢ جار.

## سیفتازیدیم: CEFTAZIDIME

**ناوی بازرگانی:** Fortaz,Tazidime,Ceptaz

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی ١ و ٢ و ٦ گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەكارهێنان:** دژی هەوكردنی بەكتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوكردنی ڕێڕەوی میزو هەناسە و ناوەوەی سك و پێست و ئێسك و جومگە و پەردەكانی مێشك و منداڵبوون بەنەشتەرگەری و هەوكردنی منداڵدان و حەوز و كۆم و بەكتریایی بوونی خوێن و سێپتیسیمیا بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، تەشەنوج، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری شوێنی دەرزی لێدان، پەڵە، خوران، سكچوون، كەمخوێنی، هەوكردنی زایەندی ژنان، كەمبوونەوەی خڕۆكە سپی یەكانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ٠,٥ تا ٢ گرام دەماری یان ماسولكەیی هەر ٨ تا ١٢ سەعاتێك. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٦ گرامە لە ڕۆژێكدا. منداڵانی ١ تا ١٢ ساڵ ٣٠ تا ٥٠ میلیگرام/كیلۆگرام بە دەمار هەر ٨ سەعاتێك، منداڵی ساوا تا ١ مانگ ٣٠ میلیگرام/ كیلۆگرام بە دەمار هەر ١٢ سەعاتێك.

با ئاگادار بین: دەرمان [illegible]



## سیفتیبیوتین: CEFTIBUTEN

**ناوی بازرگانی:** Cedax

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٤٠٠ میلی‌گرامی و سەسپێنشنی ٩٠ میلی‌گرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporin,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی بەشی سەرەوە و خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسە و ڕێڕەوی میز و هەوکردنی گوێی ناوەڕاست و هەوکردنی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، پەڵە، ئازاری سك، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تا، لەرز، میزی خوێناوی، خراپی هەرس، تەشەنوج، زەردی، ئاوسان، خوران، خوێنبەربوون، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار، منالان ٩ میلی‌گرام/کیلۆگرام خۆراکی لە ڕۆژێکدا.

## سیفتیزۆکسیم: CEFTIZOXIME

**ناوی بازرگانی:** Cefizox

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠ میلی‌گرامی ١ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی بەشی سەرەوە و خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسە و سوزەنەك و ڕێڕەوی میزو ناوەوەی سك و پێست و ئێسك و جومگە و بەکتریایی بوونی خوێن و سێپتیسیمیا و هەوکردنی پەردەکانی مێشك و نەخۆشی ئیلتیهابی حەوز بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، تەشەنوج، بێهێزی، هێڵنجدان، کرژبوونی سك، کەمخوێنی، پەڵە، هەوکردنی زایەندی ژنان، ژەهراوی بوون، تا، تەنگەنەفەسی، حەساسیەت، ڕشانەوە، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ میلی‌گرام تا ٢ گرام هەر ٨ تا ١٢ سەعات ماسولکەیی یان دەماری، بەپێی توندی و جۆری هەوکردن ئەتوانین بڕی دەرمان بۆ ٣ تا ٤ گرام بە دەمار هەر ٨ سەعاتێك زیاد بکەین. لەمنالاندا ٥٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام هەر ٦ تا ٨ سەعات ماسولکەیی یان دەماری.



## سیفتریاکسۆن: CEFTRIAXONE

**ناوی بازرگانی:** Rocephalin, Rocephin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی و ١ و ٢ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆچارەسەری هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە و بەکتریایی بوونی خوێن و سێپتیسیمیا و پێست و ئێسك و ڕیڕەوی میز و جومگە و هەوکردنی بەکتریایی گوێی ناوەڕاست وپەردەی دڵ و مێشك و نەخۆشی ئیلتیهابی حەوز و هەوکردنی ناوەوەی سك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، خوران، حەساسیەت، تا، لەرز، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، ئازاری شوێنی دەرزی لێدان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ساڵ ١ تا ٢ گرام،١ تا ٢ جار لە ڕۆژێکدا ماسولکەیی یان دەماری. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٤ گرامە، منداڵانی کەمتر لە ١٢ ساڵ ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام/کیلۆگرام ماسولکەیی یان دەماری ڕۆژانە لە١ تا ٢ بڕی دابەشکراودا و هەر ١٢ تا ٢٤ سەعاتێك ١جار.

## سیفیورۆکسیم: CEFUROXIME

**ناوی بازرگانی:** Zinacef,Ceftin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٢٥ و ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی و دەرزی ٢٥٠ و ٧٥٠ میلیگرامی و ١,٥ و ٧,٥ گرامی و سەسپێنشنی ١٢٥ و ٢٥٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی بەشی سەرەوە و خوارەوەی ڕیڕەوی هەناسە و ڕیڕەوی میز و هەوکردنی پێست و منداڵبوون بەنەشتەرگەری و هەوکردنی منداڵدان و حەوز و گورچیلە و ناوەوەی سك و جومگە و ئێسك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تا، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، سکچوون، کەمخوێنی، تێکچوونی ئەنزیمی جگەر، خوران، سووربونەوەی پێست، لەرز. ئازاری سنگ، پەڵە، ناڕێکی لێدانی دڵ، قێ، زەردی، برینی گەروو، بلۆقکردنی پێست، بەگرانی میزکردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٧٥٠ میلیگرام تا ١,٥ گرام بە دەمار هەموو ٦ سەعاتێك یان ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار. منداڵان ٧٥ تا ١٥٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا بە دەمار دابەشکراو لە هەر ٨ سەعاتێکدا یان ٢٠ تا ٣٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار. گەورەکان بۆ هەوکردنی



ڕێژەوی هەناسە ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار. بۆ هەوکردنی ڕێژەوی میز ١٢٥ تا ٢٥٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار. بۆ هەوکردنی گوێی ناوەڕاست منالانی گەورەتر لە ٣ مانگ ١٢٥ تا ٢٥٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار. گەورەکان و منالانی گەورەتر لە ١٢ سالّ ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار. دەرزی ماسولکەیی یان دەمار گەورەکان ٧٥٠ میلیگرام تا ١.٥ گرام هەموو ٦ تا ٨ سەعاتێك، منالان بڕی دەرمانی ئاسایی ڕۆژانە ٦٠ میلیگرام/کیلۆگرام (ڕێژەی ٣٠ تا ١٠٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە) لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا (لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا لە ساواکاندا).

## سیلیکۆکسیب: CELECOXIB

**ناوی بازرگانی:** Celebrex,Onsenal

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥٠ و ١٠٠ و ٢٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهاب و بۆچارەسەری ڕۆماتیزم و ئیلتیهابی جومگەکان و ئیلتیهاب و ئازاری فەقەرەکان و ئازاری بێ نوێژی سەرەتایی لە ئافرەتاندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی لێدانی دلّ ئازاری سنگ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، بێهێزی، خەمۆکی، هێلّنجدان، ڕشانەوە، وشکبوونەوەی دەم، هەوکردنی گەدە، کەمخوێنی، هەوکردنی گەروو، کۆکە، تێکچوونی بینین، کەمبوونەوەی بیستن، سووربونەوەی پێست، قەبزی، خوران، ئازاری سك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لەڕۆژێکدا. ئازاری بێ نوێژی سەرەتایی لە ئافرەتاندا ڕۆژانە ٤٠٠ میلیگرام. بۆ هەوکردنی جومگە گەورەکان ٢٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە بە یەك بڕی دەرمان یان دابەشکراو لە بڕی دەرمانی یەکساندا.

## سیلیپرۆلۆل: CELIPROLOL HCL

**ناوی بازرگانی:** Celectol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Beta blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێنی سوك و مامناوەند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، هیلاکی، هێلّنجدان، خەوالّویی. کەمبوونەوەی لێدانی دلّ کرژبوونی بۆری هەوا، خەمۆکی، هەوکردنی سی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار لە بەیانیاندا، زیاد دەکرێت بۆ ٤٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار ئەگەر پێویست بێت.



## سیفالۆتین: CEPHALOTIN

**ناوی بازرگانی:** Keflin

**شێوەی دەرمان:** ڤیالی ١ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆچارەسەری هەوکردنی ڕێڕەوی میزو هەناسە و هەرس و هەوکردنی پێست وئێسك و جومگەو هەوکردنی پەردەکانی مێشك و دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تەشەنوج. پەڵە، ئازار لە شوێنی دەرزی لێدان، کرژبوونی سك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، تا، تەنگەنەفەسی، هەوکردنی زایەندی ژنان، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورە کان ٠,٥ تا ١ گرام هەر ٤ تا ٦ سەعات بەشێوەی دەمار یان ماسولکەیی، لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٢ گرام هەر ٤ سەعاتێك. لە منالآنیش ١٤ تا ٢٧ میلیگرام/کیلۆگرام بە شێوەی دەمار یان ماسولکەیی لە هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك.

## سیفرادین: CEPHARADINE

**ناوی بازرگانی:** Velosef

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ١٢٥و ٢٥٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و دەرزی ٢٥٠ و ٥٠٠ و١٠٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Cephalosporine,Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆچارەسەری هەوکردنی گوێی ناوەڕاست و ڕێڕەوی هەناسەدان و میز و هەوکردنی پێست و سێپتیسیمیا و هەوکردنی ئێسك و پێشگری لەهەوکردنی نەشتەرگەری یەکان و جومگە و هەرس و هەوکردنی گورچیلە و حەوز بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، ئازارو حەساسیەتی شوێنی دەرزی لێدان، سووربونەوەی پێست، سکچوون، هێڵنجدان، تا، زەردی، نەمانی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، پەڵە، تەشەنوج، ڕشانەوە، کرژبوونی سك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلیگرام هەر ٦ سەعاتێك ١ جار. لە هەوکردنی توندا ١ گرام هەر ٦ سەعاتێك، هەوکردنی ڕێڕەوی هەناسەدان و هەوکردنی پێست و سێپتیسیمیا و هەوکردنی ئێسك و پێشگری لە هەوکردنی نەشتەرگەری یەکان ٢ تا ٤ گرام ڕۆژانە لە ٤ بڕی دەرمان دا ماسولکەیی IM یان دەمار IV. لەمنالآنی گەورەتر لە ٦ مانگ خۆراکی ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە هەر ٦ سەعاتێکدا ١جار.

## سیریڤاستاتین: CERIVASTATIN

**ناوی بازرگانی:** Lipobay

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەب.

**گروپی دەرمان:** Antilipidimia

**بەکارهێنان:** بۆ کەمکردنەوەی زۆربوونی نائاسایی ڕێژەی کۆلیسترۆڵ و چەوریەکانی تر لە خوێندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بێخەوی، ئازاری سك، غازات، هێڵنجدان، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** بە بڕ و ئەندازەی پێویست بەکاردێت.

## سێرتۆلیزیوماب: CERTOLIZUMAB

**ناوی بازرگانی:** Cimzia

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Cytokine modulator

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی کرۆن و ڕۆماتیزم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری سنگ، ناڕێکی لێدانی دڵ سەرئێشە، هیلاکبوون، خەمۆکی، پەڵە، هەڵوەرینی موو، سووربونەوە، هەوکردنی پێست، خوێنبەربوون، هەوکردنی ڕێڕەوی میز، کەمخوێنی، هەوکردنی جگەر، هەوکردنی ڕێڕەوی هەناسە، ئازاری جومگە، جەڵتە، سیسبوونی دڵ

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ سەرەتا ٤٠٠ میلیگرام ژێرپێستی دووبارەدەکرێتەوە ٢ هەفتە یان ٤ هەفتە پاش دەرزی لێدانی سەرەتا، پاشان ٢٠٠ میلیگرام هەموو ٢ هەفتەیەك

## سیتیریزین: CETIRIZINE

**ناوی بازرگانی:** Zyrtec

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ میلیگرامی و کەپسولی ١٠ میلیگرامی و جێڵی ١٠ میلیگرامی و شروبی ٥میلیگرام /٥ میلیلیتر (٦٠میلیلیتر ).

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** دژی حەساسیەت و خوران و سووربونەوە و پژمین و پوشەتا و شەرای موزمینی خۆیی و هەوکردن و حەساسیەتی وەرزی لوت بەکاردێت.

ۆ: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك لەخۆشی



**کاریگەری لاوەکی:** بێخەوی، بێهێزی، سەرگێژبوون، هەوکردنی گەروو، کرژبوونی بۆری هەوا، کۆکە، وشك بوونەوەی دەم، تێکچوونی هەرس، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالانی زیاتر لە ٦ ساڵ خۆراکی ڕۆژانە ٥ تا ١٠ میلیگرام و منالی ١ تا ٢ ساڵ ٢٥٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٢ جار. منالانی ٢ تا ٦ ساڵ ٢,٥ میلیگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٥ میلیگرامە.

## سیتریمایڤ -سی: CETRIMIDE - C

**ناوی بازرگانی:** Cetavlon,Salvon,crodex

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی گیراوەی خەستی (سیتریمایڤ ١٥٪ و کلۆرهێکسیدین گلوکۆنەیت ١,٥٪).

**گروپی دەرمان:** Disinfectant

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی مەوزوعی و عمومی برین و پێست و سوتان و بۆ پاکردنەوەی پێست و ئیلتیهابی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕوشانی پێست، بێهۆشی، سووربوونەوەی پێست، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** بڕی دەرمان بەپێی شێوەی هەوکردنەکان دەگۆڕێت.

## سیترۆریلیکس: CETRORELIX

**ناوی بازرگانی:** Cetrotide

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ژێرپێستی ٠.٢٥ و ٣ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** GNRH analogue

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سکپڕنەبوون و نەزۆکی و نەکەوتنە عادەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان، سووربونەوە، خوران، ئاوسانی شوێنی دەرزی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٢٥ تا ٣ میلیگرام ژێرپێستی ١ جار لە ڕۆژێکدا.

## سیتیوکسیماب: CETUXIMAB

**ناوی بازرگانی:** Erbitux

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ میلیگرام/٥٠ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی کۆڵۆن و کۆم و سەرو مل بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تەنگەنەفەسی، گێژی، تا، لەرز، پەڵە، خوران، کرژبوونی بۆری هەوا، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، شۆك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، سەرئێشە، زیپکە، وشکبوونەوەی پێست، تێکچوونی نینۆك، چاوئێشە، کەمبوونەوەی مەگنسیۆم و کالسیۆم، ئازاری سك، کۆکە، برینی گەروو، قەبزی.

**بری دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٤٠٠ ملیگرام/مەتردوجا لەماوەی ٢ سەعاتدا بە IV ئینفیوشن (لایەنی زۆری ڕێژەی ئینفیوشن ٥ ملی لیتر/خولەك. ٢٥٠ ملیگرام/مەتردوجا لەماوەی ١ سەعاتدا بە IV ئینفیوشن (لایەنی زۆری ڕێژەی ئینفیوشن ٥ ملی لیتر/خولەك) ١ جار لەهەفتەیەکدا.

## ستایل پیریدینیوم کلۆراید: CETYL PYRIDINIUM CHLORIDE

**ناوی بازرگانی:** Cepaco

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گیراوە و دەمشۆر.

**گروپی دەرمان:** Disinfectant

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنەو بۆ دژی هەوکردنی پێست و برین و سوتان و ئیلتیهابی دەم و ددان و هەوکردنی پوکی ددان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە.

**بری دەرمان:** ٣ جار لەڕۆژێکدا غەرغەرەی پێ بکرێت.

## چارکول: CHARCOAL

**ناوی بازرگانی:** Charcoaid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ ملیگرامی و سەسپێنشنی ٣٠ گرام/ ٢٤٠ ملیلیتر و پاودەر بۆ سەسپێنشنی ٥٠ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidote

**بەکارهێنان:** دژی غازاتی سك و سکچوون و تێکچوونی هەرس و ژەهراوی بوونی دەزگای هەرس و ژەهراویبوونی دەرمانی و کیمیایی و بۆ چارەسەری خوران بەهۆی ناتەواوی گورچیلەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، کەمبوونەوەی کالسیۆم، قەبزی. گیرانی ڕیخۆڵە، ڕەشبوونی پیسایی، خوێنبەربوون، کەمبوونەوەی صۆدیم.

**بری دەرمان:** لە ژەهراویبوونی دەرمانی و کیمیاییدا گەورەکان ٣٠ تا ١٠٠ گرام بە شێوەی خۆراکی لە ٨٠ تا ٢٤٠ ملیلیتر ئاودا بەکاردێت. بۆ منداڵان ١ گرام/کیلۆگرام بە شێوەی خۆراکی، بۆ غازات ١ تا ٤ گرام خۆراکی ٣ جار لە ڕۆژێکدا دوای نان خواردن بۆ تێکچوونی هەرس و خراپی هەرس ٢ تا ٤ حەب بە شێوەی خۆراکی دوای هەر ژەمێکی نان خواردن. لایەنی زۆری بری دەرمان ڕۆژانە ٥ گرامە.



## چیلدرین کۆلد: CHILDREN COLD

**ناوی بازرگانی:** Demilets

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەبی (کلۆرفینرامین مالێت ٠,٥ میلیگرام + سیودۆئیفیدرین هایدرۆکلۆراید ٧,٥ میلیگرام + ئەسیتامینوفین ٨٠ میلیگرام).

**گروپی دەرمان:** Antihistamine,analgesic

**بەکارهێنان:** دژی سەرمابوونی منالأن و حەساسیەت و دژی ئازار و تا و هەوکردن و حەساسیەتی لوت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالّویی، ناجێگیری، سەرگێژبوون، قەبزی، سکچوون، بێهێزی عمومی.

**بڕی دەرمان:** لەمنالأنی ٦تا ١٢ ساڵ ١تا ٢ حەب هەر ٤ سەعاتێك ١جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٢ حەبە.

## چیلدرین کەف: CHILDREN COUGH

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی شەربەت.

**گروپی دەرمان:** Antitussive

**بەکارهێنان:** دژی کۆکە و سەرمابوونی مندالأن و هەوکردنی لوت بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** منالأنی ٢ تا ١٢ ساڵە ٥ میلیگرام هەر ٦ سەعات ١ جار.

## کلورال هایدرەیت: CHLORAL HYDRATE

**ناوی بازرگانی:** Welldorm,somnote

**شێوەی دەرمان:** ئیلیکزیری ٢٠٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و گیراوەی خۆراکی ٢٥٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و شروبی ٥٠٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و سەسپێنشنی ٣٢٥ و ٥٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ٥٠٠ میلیگرامی و حەبی ٧٠٧ میلیگرامی و ئیلیکزیری ١٤٣.٣ میلیگرام/٥ میلیلیتر و شاف.

**گروپی دەرمان:** Hypnotic & Sedative

**بەکارهێنان:** هێورکەرەوە و خەوهێنەرە و بۆ چارەسەری بێخەوی کورتخایەن و دژی دڵەڕاوکێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالّویی، گێژی، سەرگێژبوون، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، سکچوون، غازات، هێڵنجدان، ڕشانەوە، پەڵە، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ بێخەوی ٥٠٠ میلیگرام تا ١ گرام ١٥ تا ٣٠ خولەك پێش کاتی خەوتن. بۆ هێورکردنەوە ٢٥٠ میلیگرام ٣ جار لە ڕۆژێکدا پاش ژەمی خواردن ڕێی پێ دەدرێت.



## کلۆرامبیوسیل: CHOLORAMBUCIL

**ناوی بازرگانی:** Leukeran

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Alkylating agent

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی خوێن و لیمف هوجکین و لیمفۆما و لیوکیمیا و بۆ چارەسەری ڕۆماتیزم و نەخۆشی ـحەت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەڵوەرینی موو، کەمخوێنی، پەڵە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، کەمبوونەوەی ـرەزوی خواردن، برینی دەم، کۆکە، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** لەگەورەکان و منداڵان ٠,١ تا ٠,٢ میلیگرام/ کیلۆگرام لەڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٣ تا ٦ هەفتە.

## کلۆرامفینیکۆل: CHLORAMPHENICOL

**ناوی بازرگانی:** Chlorofair

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاوی ٠,٥٪و مەڵهەمی چاو ١٪ قەترەی چاوی ٥٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنە و بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی چاو و ئیلتیهابی کۆرنیە و هەوکردن و ـتیهـی پێڵوی چاو و چاوئێشە و هەوکردنی بەکتریایی دەرەوەی گوێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشان، خوران، سوتانەوە، تێکچوونی بینین، حەساسیەت، تا، زەردهەڵگەڕانی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ١ تا ٢ قەترە لەماوەی هەر ٤ تا ٦ سەعاتێکدا. مەڵهەم شەوانە ١ جار. بۆ قەترەی گوێ ٢ تا ٣ قەترە ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار.

## کلۆرامفینیکۆل: CHLORAMPHENICOL SYS.

**ناوی بازرگانی:** chlorpmycetin

**شێوەی دەرمان:** حەب و کەپسول ٢٥٠ میلیگرامی و ڤیاڵی ١ گرامی وسەسپێنشنی ١٥٠ میلیگرام/٥میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی یە و بۆ چارەسەری نەخۆشی گرانەتا و هەوکردنە توندەکانی پەردەکانی مێشك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمخوێنی، سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سوتانەوە، خوران، سکچوون، سووربونەوە، وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی مۆخی ئێسك، تێکچوونی جگەر، تێکچوونی هەرس، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** منالی تازەبووی کەمتر لە ٢ هەفتە ٢٥ میلیگرام /کیلۆگرام خۆراکی یان دەماری دابەشکراو لە هەر ٦ سەعاتێکدا، لە منالان ڕۆژانە ٥٠ میلیگرام/ کیلۆگرام دابەشکراو لەهەر ٦ سەعاتێکدا، لە گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام/ کیلۆگرام خۆراکی یان دەماری لە بڕی دەرمانی دابەشکراو لەهەر ٦ سەعاتێکدا، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٠٠ میلیگرام/کیلۆگرامە.

## کلۆردایازیپۆکساید: CHLORDIAZEPOXIDE

**ناوی بازرگانی:** Tropium,Librum

**شێوەی دەرمان:** کەپسول و حەبی ٥ و ١٠ میلیگرامی و دەرزی ١٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Anxiolytic & hypnotic

**بەکارهێنان:** خەولێخەرەو بۆ چارەسەری دڵەڕاوکێ و قەلەقی و ترس و کرژی و خووگرتن بەئەلکهولەوەو بۆ چارەسەری دڵەڕاوکێی پێش لەنەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، خەوآلویی، لەرزین، گێژی، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی نارەزوی خواردن، وشکبوونەوەی دەم، پەڵە، هەڵوەرینی موو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ ڕۆژانە ٦٠ تا ١٠٠ میلیگرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. منالانی گەورەتر لە ٦ ساڵ ٠,٥ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی یان دەرزی لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.بۆ قەلەقی توند ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام بە دەرزی ماسولکەیی یان دەمار.

## کلۆرهێکسیدین: CHLORHIXADINE

**ناوی بازرگانی:** Peridex , periogard,ochlorobex

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گیراوە.

**گرووپی دەرمان:** Antibacterial

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنە و بۆ شۆردنی پێست پێش لەنەشتەرگەری و برینی پێستی و بۆ چارەسەری هەوکردنی دەم وبرینی ناودەم و پوکی ددان بۆ کەمکردنەوەی سووربونەوە و ئاوسان و خوێنبەربوونی پوکی ددان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەوکردنی پێست. ڕوشانی پێست و ناودەم، گۆڕانی هەستی تامکردن، هەستیاربوون بە ڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** بە پێی پێویست چەند میلی لیترێك بەکاردێت.



## کلۆرمیثین: CHLORMETHINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Mustargen

**شێوەی دەرمان:** ڤیالی ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی خوێن و سی و لیمف و شێرپەنجەکانی CML و CLL وPCV و هوجکین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، برینی گەدە، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن، کەمخوێنی –خوێنبەربوون، سەرئێشە، سەرگێژبوون، تەشەنوج، خەواڵویی، بێهێزی، بێهۆشی – تێکچوونی مۆخی ئێسك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٠,٤ میلیگرام/کیلۆگرام بە دەمار بەشێوەی یەك بڕ یان ڕۆژانە ٠,١ تا ٠,٢ میلیگرام/کیلۆگرام لەبڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## کلۆرۆکوین: CHLOROQUINE

**ناوی بازرگانی:** Nivaquine ,resochin,Aralen

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥٠ و ٢٥٠ میلیگرام شروبی ٥٠ میلیگرام/٥میلیلیتر، ٢٥میلیگرام/٥میلیلیتر و دەرزی ٣٠ میلیگرام/میلیلیتر، ٥میلیلیتر و ٤٠ میلیگرام/میلی لیتر، ٥میلیلیتر و ٥٠ میلیگرام/میلیلیتر، ٥میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antimalaria

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و بەرگری لە مەلاریا و دژی هەوکردنی ئەمیبی ڕیخۆڵەیی و برینی ڕیخۆڵە ئەستورە و هەوکردنی ئەمیبی ناوەوە و دەرەوەی ڕیخۆڵە و ئیلتیهابی جومگە و ڕۆماتیزم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، تەشەنوج، ناجێگیری، بێهێزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، ئازاری سك، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** بۆ ڕۆماتیزم ٢٥٠ میلیگرام لەگەڵ نانی ئێوارەدا، بۆ پێشگرتن و چارەسەری مەلاریا گەورەکان **بەکارهێنان**ی سەرەتایی دەرمان لە گەورەکان ٦٠٠ میلیگرام و پاشان ٣٠٠ میلیگرام ٦ و ٢٤ و ٤٨ سەعات پاش لە یەکەمین بڕی دەرمان بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ. لەسەرەتا منداڵان ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی پاشان ٥ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ٦ و ٢٤ و ٤٨ سەعات پاش لە یەکەمین بڕی دەرمان (بڕی دەرمان نابێت زیاتر لە بڕی دەرمانی گەورەکان بێت). بۆ ئەمیبیای دەرەوەی ڕیخۆڵەیی گەورەکان ٦٠٠ میلیگرام ڕۆژانە، بۆ ماوەی ٢ ڕۆژ و پاشان ٣٠٠ میلیگرام ڕۆژانە بۆ ماوەی ٢ تا ٣ هەفتە. منداڵان ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە بۆ ماوەی ٢ هەفتە، لانی زۆر تا ٣٠٠ میلیگرام ڕۆژانە.



**کلۆرۆثایەزاید:** CHLOROTHIAZIDE

**ناوی بازرگانی:** Diuril

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ٢٥٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و دەرزی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا (ئۆدیما) بەهۆی پەککەوتنی دڵی خوێنتێژراوەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی صۆدیۆم و پۆتاسیۆم، گێژی، سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری ماسولکە، تەشەنوج، بەرزبوونەوەی شەکرو چەوری خوێن، هەستیاربوون بەڕوناکی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، پەڵە، سووربونەوە، تا. زەردی، سکچوون، قەبزی، ئازاری سك، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ تا ١٠٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار یان بۆ ئۆدیما ١٠٠ تا ١٠٠٠ میلیگرام بە دەمار لە ڕۆژێکدا. منالآنی گەورەتر لە ٦ مانگ ١٠ تا ٢٠ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی لە ڕۆژێکدا ڕۆژانە ٢ جار یان ٤ میلیگرام/کیلۆگرام لەڕۆژێکدا بە دەمار لەگەڵ خواردندا.

**کلۆرفنیرامین:** CHLORPHENIRAMINE

**ناوی بازرگانی:** Alermine , piriton

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤ میلیگرامی و حەبی ٨ میلیگرامی و حەبی ٤ میلیگرامی و دەرزی ١٠ میلیگرام/میلیلیتر و شروبی ٢ میلیگرام/٥میلیلیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** دژی حەساسیەتە و بۆ چارەسەری حەساسیەت و ئیلتیهابی لوت و ئاوکردنی لوت و پوشەتا و شەرا و نەخۆشییەکانی ئیلتیهابی پێستی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵوی، بێهێزی، خوماری، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، پەڵە، گیرانی میز.

**بڕی دەرمان:** بۆ حەساسیەت و ئیلتیهابی لوت گەورەکان و منالآنی سەروی ١٢ ساڵ ٤ میلیگرام حەب یان شەربەت لە ٤ تا ٦ سەعات یان ٨ تا ١٢ میلیگرام حەبی کاریگەری ماوە درێژ ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار یان ٥ تا ٢٤ میلیگرام ماسولکەیی یان دەماری یان ژێرپێستی بەیەك بڕی دەرمان. منالآنی ٦ تا ١١ ساڵ ٢ میلیگرام حەب یان شەربەت هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك یا ٨ میلیگرام حەبی ER ڕۆژانە، یان ٨٧,٥ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ٦ سەعاتێك ژێرپێستی، لانی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٢ میلیگرام منالی ٢ تا ٥ ساڵ ١ میلیگرام هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك شەربەت لانی زۆر ی بڕی دەرمان ڕۆژانە ٦ میلیگرامە.



## کلۆرپرۆمازین: CHLORPROMAZINE

**ناوی بازرگانی:** Largactile,Thorazine

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی شافی ٢٥ و ١٠٠ میلی‌گرامی و حەبی ١٠ و ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ و ٢٠٠ میلی‌گرامی و گیراوەی خۆراکی ٢٥ میلی‌گرام/٥ میلی‌لیتر و دەرزی ماسولکەیی IM ٢٥ میلی‌گرام/میلی‌لیتر، (٢میلی‌لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** دژی نەخۆشی و تێکچوونی دەروونی و هێڵنجدان و نزگەرە و ڕشانەوە و قەلەقی توند و خرۆشان و نازار و شێتی و بۆ زیادکردنی کاریگەری دژە ئازارەکان و بۆ چارەسەری شیزۆفرینیا و قەلەقی پێش نەشتەرگەری و بۆ دەردەکۆپان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵوویی، تەشەنوج، سەرئێشە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، زیادبوونی لێدانی دڵ پەڵە، حەساسیەت. گەورەبوونی بیلبیلەی چاو، بەرزبوونەوەی زەختی چاو، کەمخوێنی، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** بۆ هێڵنجدان و ڕشانەوە گەورەکان ١٠ تا ٢٥ میلی‌گرام خۆراکی یان ماسولکەیی هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك، منداڵانی گەورەتر لە ٦ مانگ ٠,٥٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام، خۆراکی هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك. بۆ تەرککردنی ئەلکهول ٢٥ تا ٥٠ میلی‌گرام ماسولکەیی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. بۆ هێورکردنەوەی پێش لە نەشتەرگەری گەورەکان ٢٥ تا ٥٠ میلی‌گرام خۆراکی ٢ تا ٣ سەعات پێش لە نەشتەرگەری، یان ١٢,٥ تا ٢٥ میلی‌گرام ماسولکەیی ١ تا ٢ سەعات پێش لە نەشتەرگەری (لە کاتێکدا نەشتەرگەری ١٢,٥ میلی‌گرام ماسولکەیی لە ماوەی ٣٠ خولەکدا دوبارە بێتەوە). منداڵان ٠,٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام خۆراکی، ٢ تا ٣ سەعات پێش لە نەشتەرگەری یان ماسولکەیی ١ تا ٢ سەعات پێش لەنەشتەرگەری (لە ماوەی نەشتەرگەری ٠,٢٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام ماسولکەیی لە ماوەی ٣٠ خولەکدا دوبارە بێتەوە). بۆ نزگەرەی بەردەوام گەورەکان ٢٥ تا ٥٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جاربۆ ماوەی ٢ تا ٣ ڕۆژ. بۆ دەردەکۆپان گەورەکان ٢٥ تا ٥٠ میلی‌گرام ماسولکەیی ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا. منداڵانی سەروی ٦ مانگ ٠,٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام ماسولکەیی هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك. بۆ نەخۆشی دەروونی گەورەکان ٣٠ تا ٧٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە، لە ٢ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. لەوانەیە بڕی دەرمانی ٨٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە، بۆ هەندێ لە نەخۆشەکان پێویستە. منداڵان ٠,٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام خۆراکی، هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك، یان ٠,٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام ماسولکەیی هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك.

## کلۆرپرۆپامایـد: CHLORPROPAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Diabinese

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٢٥٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Hypoglycemic,Sulfonylurea

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ بەکاردەهێنرێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی سۆدیۆم، کەمبوونەوەی شەکری خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، دڵەکزە، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن، خوران، حەساسیەت، بیرۆ، هەستیاربوون بەڕووناکی، بێهێزی، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢٥٠ میلیگرام لەگەڵ نانی بەیانیان دا، بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو ڕۆژانە ١٠٠ تا ٢٥٠ میلیگرامە. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٧٥٠ میلیگرامە. بۆ پیرەکان سەرووی ٦٥ ساڵ ١٠٠ تا ١٢٥ میلیگرام خۆراکی ١ جار لەڕۆژێکدا لەگەڵ نانی بەیانیاندا.

## کلۆرثالیدۆن: CHLORTHALIDONE

**ناوی بازرگانی:** Hygroton,Thalitone

**شێوەی دەرمان:** حەبی١٥ و ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Diuretic

**بەکارهێنان:** میزهێنەرە و بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و ئۆدیما(کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا) لە لەشدا و پەککەوتنی دڵ و شەکرەی درۆ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت، ئازاری سك، سکچوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، پەڵە، ئیلتیهابی پەنکریاس، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم و صۆدیۆم، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمخوێنی، زیادبوونی شەکری خوێن، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥ تا ١٠٠ میلیگرام خۆراکی بەیەك بڕی دەرمان، لەمناڵان ڕۆژانە ٢ میلیگرام/ کیلۆگرام خۆراکی ٣ ڕۆژ لە هەفتەیەکدا. بۆ پەستانی بەرزی خوێن گەورەکان ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام ڕۆژانە بەیەك بڕی دەرمان لە بەیانیاندا. مناڵان ١ تا ٢ میلیگرام/کیلۆگرام، ڕۆژی ١ جار ڕێی پێ دەدرێت.



## کلۆرۆکسیلینۆل: CHLOROXYLENOL

**ناوی بازرگانی:** Dettol

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ٥٪ (١٥٠ میلی لیتر/١٠٠ میلی لیتر/٤ لیتر).

**گروپی دەرمان:** Disinfectant

**بەکارهێنان:** وەك دژەهەوکەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێست.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار.

## کلۆرزۆکسازۆن: CHLORZOXAZONE

**ناوی بازرگانی:** Paraflex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** لەگەڵ چارەسەری فیزیایی بۆ چارەسەری گرژبوونی ماسولکە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ئازاری گەدە. نەمانی ئارەزوی خواردن. خوران، لیڵبوونی میز، زەردی، کۆکە، خەواڵویی، گێژی، هیلاکی، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلی‌گرام خۆراکی ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا. منداڵان ٢٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام خۆراکی لە ڕۆژێکدا لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## کۆلیستیرامین: CHOLESTYRAMINE

**ناوی بازرگانی:** Questran

**شێوەی دەرمان:** پاودەری ٤ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihyperlipidemia

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندن و هێنانە خوارەوە چەوری خوێن و کۆلیسترۆلی خوێن و دژی خوران بەهۆی گیرانی تورەکەی زراو و نەخۆشی زەردبوونی سەرەتایی و بۆ بەرگری لەسەکتەی دڵ و سکچوون بەهۆی نەخۆشی کرۆن بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سک، دڵەکزە، خوێنبەربوونی گەدە و ڕیخۆڵە، سەرئێشە، ئیلتیهابی پێست، زیادبوونی ئارەزوی سێکسی، پەڵە. پوکانەوەی ئێسک، دڵەڕاوکێ، نەمانی ئارەزوی خواردن، خراپی هەرس، سکچوون، کەمبوونی ڤیتامین k.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ چەوری خوێن و کۆلیسترۆلی خوێنی سەرەتایی ٤ گرام خۆراکی لەگەڵ خواردن و پێش لە خەوتن، دابەشکراو لە ٦ بڕی دەرماندا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣٢ گرامە. خوران بەهۆی گیرانی تورەکەی زراو گەورەکان ڕۆژانە ٤ تا ٨ گرام. منداڵی ١ مانگ تا ١ساڵ ١گرام ڕۆژانە ١ جار. لایەنی زۆر ڕۆژانە ٩ گرامە. منداڵی ١ تا ٦ ساڵ ٢ گرام ڕۆژانە ١ جار. لایەنی زۆر ڕۆژانە ١٨ گرامە. منداڵی ٦ تا ١٢ ساڵ ٤ گرام ڕۆژانە ١ جار. لایەنی زۆر ڕۆژانە ٢٤ گرامە. یان لە منداڵانی گەورەتر لە ٦ ساڵ ٨٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٣ جار.

## سیکلیسۆناید: CICLESONIDE

**ناوی بازرگانی:** Alvesco,Omnaris

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی ئیستینشاقی ٨٠ و ١٦٠ مایکرۆگرامی و سپرای ٥٠ مایکرۆگرام.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ فراوانکردنی بۆری هەوا و پێشگری لە نەخۆشی ڕەبۆ و بۆ چارەسەری ئیلتیهابی وەرزی لوت و ئیلتیهابی هەمیشەیی لوت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، هیلاکبوون، گیرانی لوت، جیوب، ئیلتیهابی چاو، ئازاری گوێ، هەوکردنی کەڕوویی ناودەم، حەساسیەت، ئازاری جومگە، هەوکردنی سی، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، شەرا، ئیلتیهابی گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ ساڵ ڕۆژانە ٨٠ تا ١٦٠ مایکرۆگرام بە ١ بڕی دەرمان. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٣٢٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە ٢ جار، ئەگەر پێویست بێت لە ڕەبۆی توند دا. بۆ چارەسەری ئیلتیهابی وەرزی لوت و ئیلتیهابی هەمیشەیی لوت ٢ سپرای بۆ هەر کونەلوتێك ڕۆژانە ١ جار.

## سیکلۆپیرۆکس: CICLOPIROX

**ناوی بازرگانی:** Loprox

**شێوەی دەرمان:** کرێم و جێلی ٠,٧٧ ٪ و سەسپێنشنی مەوزوعی ٠,٧٧ ٪ شامپۆی ١٪ ڕەنگی لاکی نینۆك گیراوەی مەوزوعی ٨٪.

**گروپی دەرمان:** Antifungal



**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی کەڕوویی یەو بۆ چارەسەری سیبۆریا و هەوکردنی پێستی سەر و کەچەڵی و کەچەڵی لەش و پێ و هەوکردنی کەڕوویی نێوان پەنجەکانی پێ و کاندیدیاز بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، ڕوشانی مەوزوعی، کزانەوە، سووربونەوە، پەڵە، تێکچوونی پێست.

**بڕی دەرمان:** بە بڕێکی دیاریکراو و پێویست بەڕووی شوێنی مەبەستدا بمالرێت.

## سیدۆفۆڤیر: CIDOFOVIR

**ناوی بازرگانی:** Vistide

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٧٥ میلی گرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی چاو کە پێی دەوترێت سایتۆمیگالۆڤایرەس ڕیتینیتس (هەوکردنی تۆڕی چاوی سایتۆمیگالۆڤایرەس) لەو کەسانەی کە توشی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بوون.

**کاریگەری لاوەکی:** ژەهراویبوونی گورچیلە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، تەنگەنەفەسی، سەرئێشە، کەمبوونەوەی نیوترۆفیل، کەمبوونەوەی IOP، هەڵوەرینی موو، پەڵە، ئیلتیهابی پەنکریاس، ئیلتیهابی ڕەنگێنەی چاو، نەمانی ئارەزووی خواردن، قەبزی، تا، لەرز، زۆر میزکردن، کۆکە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ میلی گرام/کیلۆگرام بەدەمار IV ١ جار لە هەفتەیەکدا بۆ ماوەی ٢ هەفتە.

## سیلازا پریل: CILAZAPRIL

**ناوی بازرگانی:** Vascace

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٥ و ١ و ٢,٥ و ٥ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** ACE inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبونەوەی پەستانی خوێن، لاوازی گورچیلەیی، کۆکەی وشک، ئاوبەندی مولولە، خوران، شەرا، جیوب، هەوکردنی لوت، برینی قوڕگ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خراپی هەرس، سکچوون، قەبزی، ئازاری سک، زەردی، هەوکردنی جگەر، پەککەوتنی جگەر، کەمبوونەوەی شەکری خوێن، زیادبوونی پۆتاسیۆم، کەمی پەڕەی خوێن و خڕۆکەی سپی، کەمخوێنی، سەرئێشە، گێژی، نەمانی ئارەزووی خواردن، ئازاری سنگ، زیادبوونی لێدانی دڵ، دڵەکوتێ، تەنگەنەفەسی، لاوازی سێکسی، ئارەقکردنەوە، هەوکردنی بۆریچکەکان، گەورەبوونی مەمک، نەخۆشی دەماری موحیگی.

**بڕی دەرمان:** بۆ پەستانی بەرزی خوێن ١ میلی گرام ڕۆژانە ١ جار، بڕی دەرمان کەمدەکرێتەوە بۆ ٠,٥ میلی گرام ڕۆژانە ١ جار، بڕی دەرمانی پاراستن ٢,٥ تا ٥ میلی گرامە ڕۆژانە ١ جار. لانی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٥ میلی گرامە. بۆ پەککەوتنی دڵ ٠,٥ میلی گرام ڕۆژانە ١ جار لانی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٥ میلی گرامە.



**سیلۆستازۆل:** CILOSTAZOL

**ناوی بازرگانی:** Pletal

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ١٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Vasodilator

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شەلی بەنۆبەت بەکاردێت، ئەم نەخۆشی یە ئەبێتەهۆی کەمبوونەوەی ڕۆیشتنی خوێن بۆ قاچەکان ئەبێتەهۆی ئازار لە کاتی ڕۆیشتندا.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، دڵەکوتێ، ئازاری سنگ، نارێکی لێدانی دڵ، ئۆدیما، هەوکردنی لوت، گێژی، سەرئێشە، پەڵە، خوران، میزی خوێناوی، ئازار لەکاتی میزکردن، تا، لەرز، ئاوسان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری جومگە، کۆکە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠ میلی‌گرام ڕوژانە ٢ جار ٣٠ خولەك پێش یان ٢ سەعات پاش خواردن.

**سیمیتدین:** CIMETIDINE

**ناوی بازرگانی:** Tagamet,Dyspamet

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ و ٣٠٠ و ٤٠٠ و ٨٠٠ میلی‌گرامی و دەرزی ١٠٠ میلی‌گرام/٢میلی‌لیتر و شروبی ٢٠٠ میلی‌گرام/٥میلی‌لیتر و گیراوەی خۆراکی ٢٠٠ میلی‌گرام/٥میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** H٢ receptor antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری برینی گەدە و دوانزەگرێ و دڵەکزە و گەڕانەوەی مەوادەکانی گەدە بەرەو سورێنچك و تێکچوونی هەرس و ئیلتیهابی سورێنچك و زۆربوونی ترشەڵۆکی گەدە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، سکچوون، پەڵە، ئازاری ماسولکە، سەرئێشە، سەرگێژبوون، گیرانی میز، گەورەبوونی مەك، کەمخوێنی، تا، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، هەوکردنی پەنکریاس، هەڵوەرینی موو، زەردی، ئازاری ماسولکە و جومگە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، سوربونەوەی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ برینی توند ٢٠٠ تا ٤٠٠ میلی‌گرام خۆراکی یان ٢٠٠ میلی‌گرام بە دەمار هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك. بۆ پێشگرتن لە زیادبوونی ترشەڵۆکی گەدە گەورەکان ٤٠٠ میلی‌گرام خوراکی ٩٠ تا ١٢٠ خولەك پێش لە بێهۆشی. منالان ٢٠٠ میلی‌گرام خۆراکی، ٩٠ تا ١٢٠ خولەك پێش لە بێهۆشی. بۆ پێشگرتن لە کزانەوەی شەوانەی سەردڵ گەورەکان ٢٠٠ میلی‌گرام خۆراکی لانی زۆر ٢ جار لە ڕۆژێکدا. بۆ گەڕانەوەی مەوادەکانی گەدە بەرەو سورێنچك گەورەکان ٤٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٤ جار یان ٨٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٢ جار پێش لە خەوتن لەگەڵ خواردندا. بۆ برینی گەدە و دوانزەگرێ گەورەکان ٣٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە لەگەڵ خواردندا و پێش لە خەوتن.



## سیناکالسێت: CINACALCET

**ناوی بازرگانی:** Sensipar,mimpara

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠ و ٦٠ و ٩٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Hyperparathyroidism agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هایپەرپاراپایرۆیدیسم ( فرمان و چالاکی زیاد لە حەدی رژێنی پاراپایرۆید ) لە ئەو کەسانەی نەخۆشی گورچیلەیان هەیە و هایپەرکالسیمیا (زیادبوونی کالسیۆم ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، رشانەوە، سکچوون، ئازاری ماسولکە، گێژی، نەمانی ئارەزوی خواردن، پەڵە، فێ، کەمبوونەوەی پەستانی خوێن، پەککەوتنی دڵ حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی زیاتر لە ١٨ساڵ بۆ هایپەرپاراپایرۆیدیسم سەرەتا ٣٠ میلی‌گرام رۆژانە ١ جار، بڕەکەی هەموو ٢ تا ٤ هەفتەیەك رێك دەخرێت تا لایەنی زۆری رۆژانە ١٨٠ میلی‌گرام. گەورەکان زیاتر لە ١٨ ساڵ بۆ هایپەرکالسیمیا سەرەتا ٣٠ میلی‌گرام رۆژانە ٢ جار. بڕەکەی هەموو ٢ تا ٤ هەفتەیەك رێك دەخرێت بە پێی کاردانەوەکەی تا لایەنی زۆری رۆژانە ٩٠ میلی‌گرام.

## سیناریزین: CINARIZINE

**ناوی بازرگانی:** Stugeron

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥ و ٢٥ و ٧٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری گێژبوون و تێکچوونی هاوسەنگی و هێڵنجدان و رشانەوە و نەخۆشی مینیر (نەخۆشی گوێی ناوەوە ) و رشانەوەی سەفەری و تێکچوونەکانی مولولەی مێشك و مولولەی موحیگی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالوویی، سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، تەشەنوج، زیادبوونی لێدانی دڵ سکچوون، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی هەرس، تێکچوونی بینین، کەمخوێنی. کەمبوونەوی خرۆکە سپی یەکانی خوێن. وشکبوونەوەی دەم.

**بڕی دەرمان:** بۆ نەخۆشی سەفەر گەورەکان ٣٠ میلی‌گرام خۆراکی، ٢ سەعات پێش لە سەفەر، ١٥ میلی‌گرام خۆراکی لە ماوەی سەفەردا رۆژانە ٣ جار. بۆ چارەسەری نیشانەکانی هێڵنجدان و سەرگێژبوونی نەخۆشی گوێی ناوەوە (منیر) گەورەکان ٣٠ میلی‌گرام خۆراکی رۆژانە ٣ جار. بۆ تێکچوونی مولولەکانی مێشك و مولولەی موحیگی گەورەکان ٧٥ میلی‌گرام خۆراکی ١ تا ٣ جار لە رۆژێکدا و بە پێی کاردانەوەی نەخۆش رێی پێ دەدرێت. منالآنی ٥ تا ١٢ ساڵ ١٥ میلی‌گرام رۆژانە ٣ جار.

## سیپرۆفایبرەیت: CIPROFIBRATE

**ناوی بازرگانی:** Modalim

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihyperlipidemia

**بەكارهێنان:** بۆ دابەزاندنی چەوری خوێن (triglyceride) و چەوری خوێن كە بەرژێمی خۆراكی چارەسەرنابێت بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** پەڵە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری ماسولكە، سكچوون.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرام.

## سیپرۆفلۆكساسین: CIPROFLOXACIN

**ناوی بازرگانی:** Ciproxin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٢٥٠ و ٥٠٠ و ٧٥٠ میلیگرامی و حەبی XR ٥٠٠ و ١٠٠٠ میلیگرامی و دەرزی ١٠ میلیگرام/میلیلیتر، ٢٠ میلیلیتر و IV ئینفیوشنی ٢ میلیگرام/میلیلیتر (١٠٠میلی لیتر) و سەسپێنشنی ٢٥٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەكارهێنان:** دژی بەكتریا گرامنێگەتیڤەكانی وەك سیدۆمۆناس بەكاردێت، بۆ چارەسەری هەوكردنی ڕێڕەوی میزو هەوكردنی سی و هەوكردنی پێست و بۆ گرەناتا و هەوكردنی ئێسك و جومگە و هەوكردنی جیوب و سكچوونی ئیلتیهابی و سوزەنەك و پێست و ڕێڕەوی هەناسە و بۆ پێشگری ئیلتیهابی نەشتەرگەری و هەوكردنی پەردەكانی مێشك و هەوكردنی پرۆستات بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، هەوكردنی زایەندی ژنان، بێخەوی، ناجێگیری، تەشەنوج، خەمۆكی، پەڵە، خوران، هیلاكبوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سكچوون، خوێنبەربوونی GI، كاندیدیازی دەم، سووربونەوە، كاندیدیازی پێستی، كەمخوێنی، ناتەواوی گورچیلە، خرابی هەرس، ئازاری سك، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ٢٥٠ تا ٧٥٠ میلیگرام خۆراكی ٢ جار لە ڕۆژێكدا و بۆ هەوكردنی توند ١٠٠٠ میلیگرام، یان ٢٠٠ تا ٤٠٠ میلیگرام بە دەمار IV ئینفیوشن ٢ جار لەڕۆژێكدا، بۆ هەوكردنی توند ٨٠٠ میلیگرام. منالان ١ تا ١٨ ساڵ ١٠ تا ٢٠ میلیگرام/كیلۆگرام خۆراكی ڕۆژانە ٢ جار. بڕی دەرمان دووئەوەندە ئەكرێت لە هەوكردنی توند دا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٧٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار. بەIV ئینفیوشن ٦ میلیگرام/كیلۆگرام هەموو ٨ سەعاتێك، زیاد دەكرێت بۆ ١٠ میلیگرام/كیلۆگرام هەموو ٨ سەعاتێك لە هەوكردنی توند دا لایەنی زۆر ٤٠٠ میلیگرام هەموو ٨ سەعاتێك.



## سیپرۆفلۆکساسین: CIPROFLOXACIN OPH.

**ناوی بازرگانی:** Ciloxan

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,٣٪ و مەڵهەمی چاو ٠,٣٪.

**گرووپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی چاو و هەوکردن و برینی کۆرنیەی چاو و هەوکردنی گوێی ناوەڕاست و گوێی دەرەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوەی چاو، فرمێسك ڕشتن. تێکچوونی بینین. حەساسیەت. ئاوسانی پێڵوی چاو، بەرزبوونەوەی پەستانی چاو، سووربوونەوە، هەستیاربوون بە خوران، ڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** ١تا ٢ قەترە هەر ٢ سەعات لەڕۆژانی بێداربوونی نەخۆشدا بۆماوەی ٢ ڕۆژ و لەکاتی خەودا هەر ٦ تا ٨ سەعات و ١ تا ٢ قەترە هەر ٤ سەعات تا ٥ ڕۆژ بەردەوام بێت. بۆ مەڵهەم لە شەو یا ڕۆژدا ١,٢٥ سم لە مەڵهەم هەموو ١ تا ٢ سەعات بۆ ماوەی ٢ ڕۆژ پاشان هەموو ٤ سەعاتێك بۆ ١٢ ڕۆژی تر بەکاردێت.

## سیساپراید: CISAPRAIDE

**ناوی بازرگانی:** Alimix,Propulsid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ میلیگرامی و شروب.

**گرووپی دەرمان:** Prokinetic agent

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری هەست کردن بە ترش بوونی گەدە و دڵەکزە و تێکچوونی گەدە و کەمبوونەوەی جوڵەی دەستگای هەرس و گەڕانەوەی ترشەڵۆکی گەدە بەرەو سورێنچك و خراپی هەرس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بێخەوی، ئازاری سك، سەرئێشە، سکچوون، زۆر میزکردن، دڵەڕاوكێ، قەبزی، هێڵنجدان، غازات، کۆکە، پەڵەی پێست، ئازار، تا، هەوکردنی لوت، هەوکردنی زایەندی ژنان، نارێکی لێدانی دڵ، هەوکردنی ڕیڕەوی هەرس.

**بڕی دەرمان:** بۆ کزانەوەی سەردڵ بەهۆی گەڕانەوەی مەوادەکانی گەدە بەرەو سورێنچك گەورەکان ١٠ میلیگرام، خۆراکی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار، بۆ ماوەی ١٢ هەفتە. بۆ کەمبوونەوەی جوڵەی گەدە و ڕیخۆڵە گەورەکان ١٠ میلیگرام خۆراکی ١٥ تا ٣٠ خولەك پێش لە خواردن و لەکاتی خەودا و هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك تا ٦ هەفتە. بۆ خراپی هەرس گەورەکان ١٠ میلیگرام خۆراکی ٣ جار لە ڕۆژێکدا ئاسایی تا ٤ هەفتە.

## سیزاتراکیوریۆم: CISATRACURIUM BESYLATE

**ناوی بازرگانی:** Nimbex

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (٥، ١٠ میلی‌لیتر).

**گرووپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری بلۆکبوونی دەمار و ماسولکە لەبەشە چاودێری یە تایبەتەکان و دەرمانی یارمەتیدەر لە بێ هۆشیدا لەبارەی شلکردنەوەی ماسولکەکان و ئاسانکردنی تێخستنی لولە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، پەڵەی پێست، گرژبوونی بۆری هەوا، سوربونەوەی پێست.

**بڕی دەرمان:** بۆچارەسەری بلۆك بوونی دەمار و ماسولکە لەبەشە چاودێرییە تایبەتەکان گەورەکان ٣ مایکرۆگرام/کیلۆگرام/چرکە بە IV ئینفیوشن. دەرمانی یارمەتیدەر لە بێ هۆشیدا لەبارەی شلکردنەوەی ماسولکەکان و ئاسانکردنی تێخستنی لولە، گەورەکان و منالانی سەرویی ١٢ ساڵ ٠,١٥ تا ٠,٢ میلی‌گرام بەدەمار IV و پاشان ٠,٠٣ میلی‌گرام/کیلۆگرام بەدەمارIV و هەر ٤٠ تا ٥٠ خولەك پاش لەبڕی دەرمانی یەکەم ٠,١٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام و هەر ٥٠ تا ٦٠ خولەك پاش لەبڕی دەرمانی یەکەم ٠,٢ میلی‌گرام/کیلۆگرام بەعینوانی بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو لە نەشتەرگەری یە درێژخایەنەکان. منالانی ٢ تا ١٢ ساڵ ٠,١ میلی‌گرام/کیلۆگرام لە ماوەی ٥ تا ١٠ چرکەدا و پاشان ٣ مایکرۆ گرام/کیلۆگرام/خولەك بە IV ئینفیوشن بە عینوانی دۆزی جێگیرو پارێزراو پاش لەبڕی دەرمانی یەکەم و پاش ئەوە ٢ مایکرۆگرام/کیلۆگرام/خولەك بەشێوەی پێویست و درێژبوونەوەی ماوەی کاری نەشتەرگەری ڕێی پێ دەدرێت.

## سیسپلاتین: CISPLATIN

**ناوی بازرگانی:** Platinol

**شێوەی دەرمان:** پاودەر بۆ دەرزی ١٠ و ٥٠ میلی‌گرام/ ڤیاڵ و گیراوە بۆدەرزی ٠,٥ میلی‌گرام/میلی‌لیتر ، ١٠٠ میلی‌لیتر و دەرزی ٠,٥ میلی‌گرام/میلی‌لیتر ، ٢٠ میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Alkylating agent

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی میزەڵدان و سی و هێلکەدان و هێلکەگون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون. هەڵوەرینی موو، تێکچوونی گورچیلە، تەشەنوج، سەرئێشە، حەساسیەت، هیلاکبوون، زیادبوونی یوریك ئەسید، تێکچوونی بینین، تێکچوونی جگەر، زەردی، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان بۆ شێرپەنجەی هێلکەگون ٢٠ میلی گرام/مەتردوجا ڕۆژانە بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ لە خولە ٣ هەفتەیی یەکان بۆماوەی ٣ خول لەگەڵ بیلیۆمایسین و ڤینبلاستین. بۆ شێرپەنجەی میزەڵدان ٥٠ تا ٧٠ میلی گرام/مەتردوجا هەر ٣ تا ٤ هەفتە ١ جار. بۆ شێرپەنجەی هێلکەدان ٧٥ تا ١٠٠ میلی گرام/مەتردوجا هەر ٤ هەفتەیەك لەگەڵ سایکلۆفۆسفاماید. بۆ شێرپەنجەی سی ٦٠ تا ١٠٠ میلی گرام/مەتردوجا بە دەمار لە ڕۆژی یەکەم هەمور ٢١ ڕۆژێك لەگەڵ دەرمانە دژە لووەکانی تر.

## سیتالۆپرام: CITALOPRAM

**ناوی بازرگانی:** Cipramil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٠ و ٤٠ میلی گرامی و قەترەی خۆراکی ٤٠ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خەمۆکی و ترس و دڵەڕاوکێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، لەرزین، بێهێزی، تەشەنوج، دڵەڕاوکێ، ئازاری سنگ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، غازات، خراپی هەرس، کۆکە، تا، لەرز، زۆر میزکردن، پەڵە، هەڵوەرینی موو، لاوازی سێکسی، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠ میلی گرام خۆراکی ڕۆژانە ١جار، پاش لەتێپەڕبوونی ١ هەفتە ئەتوانی بڕی دەرمان ڕۆژانە تا ٤٠ میلی گرام زیادبکەیت.

## سیتیکولین: CITICOLINE

**ناوی بازرگانی:** Acticolin,citidel

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٢٥ میلی گرام/میلی لیتر، ٢ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Coline&citidine derivative

**بەکارهێنان:** بۆ زیادکردنی ڕۆیشتنی خوێنی مێشك و بۆ چارەسەری برین و ناتەواوی مولولەکانی مێشك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، بێخەوی، پەرێشانی.

**بڕی دەرمان:** بۆ موشکیلەکانی زەبر گەیشتن بە سەر گەورەکان ٢٥٠ میلی گرام ڕۆژانە بەڕێگەی ماسولکەیی. لەمنداڵان ٢٥٠ میلی گرام ٢ جار لەڕۆژێکدا بەماسولکەیی. بۆ تێکچوونی مولولەکانی مێشکی گەورەکان لە قۆناغی تیژدا، ٥٠٠ تا ٧٥٠ میلی گرام بە دەمار بەشێوەی دابەشکراو. لە قۆناغی خوار تیژدا ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلی گرام ماسولکەیی ڕۆژانە بەشێوەی دابەشکراو.

تێ: بەهێزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لەبەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## سیتریك ئەسید: CITRIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Citrosteril

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی پاودەر.

**گرووپی دەرمان:** دژی بەردی ڕیڕەوی میز.

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری بەردەكانی ڕیڕەوی میز و گورچیلە و نەخۆشی پاشاكان و میتابۆلیك ئەسیدۆزی موزمین بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** تێكچوونی هەرس، زیادبوونی صۆدیۆم و پۆتاسیۆم.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ١٥ تا ٣٠ سیسی لە گیراوەی تواوە لەئاودا،پێش لە خەوتن، منالآن ٥ تا ١٠ سیسی لەگیراوەی تواوە لەئاودا،پێش لە خەوتن.

## كلادریبین: CLADRIBINE

**ناوی بازرگانی:** Leustatin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١میلیگرام/میلیلیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antineoplastic agent

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن لیوكیمیای جۆری (HCL و CLL) بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** سەرئێشە، ئازاری سك، سەرگێژبوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سكچوون، بێهێزی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تا، هیلاكی، قەبزی، پەڵە، خوران، كۆكە، كەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** بۆ شێرپەنجەی خوێن لیوكیمیای خانەی مویی گەورەكان ڕۆژانە ٠,٠٩ تا ٠,١ میلیگرام/كیلۆگرام، بەIV ئینفیوشن بۆ ماوەی ١ هەفتە. شێرپەنجەی لیمفۆمای خانەی T پێستی لیمفۆمای پیس و كەمخوێنی ٠,١ میلیگرام/كیلۆگرام ڕۆژانە، بە IV ئینفیوشن بۆ ماوەی ١ هەفتە.

## كلاریثرۆمایسین: CLARYTHROMYCINE

**ناوی بازرگانی:** Biaxin, klacid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ١٢٥ و ٢٥٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و پاودەر بۆ سەسپێنشن ٢٥٠ میلیگرام /٥ میلیلیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antibiotic



**بەکارهێنان:** دژە زیندەگی یەو بۆ چارەسەری هەوکردنی گەروو و لەوزەتێن وجیوب و هەوکردنی سیەکان بەهۆی مایکۆبەکتریۆم ئەڤیۆم و هەوکردنی بۆریچکەکان و بۆ پێشگری لە هەوکردنی پەردەکانی دڵ و برینی گەدە بەهۆی (H pylori) و هەوکردنی گوێی ناوەڕاست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی ئەنزیمی جگەر، سکچوون، ئازاری سک، ناڕێکی لێدانی دڵ، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری سنگ، زەردی، تا، برینی گەروو، بلۆقکردن و پەڵەی پێست، تێکچوونی بیستن، سەرئێشە، کەمبوونەوەی پەڕەکانی خوێن، بەرزبوونەوەی زەختی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی هەر ١٢ سەعات ١ جار یان ١٠٠٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا بۆ مایکۆبەکتریۆم ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار ، منالان ٧,٥ تا ١٥ میلیگرام خۆراکی هەر ١٢ سەعات ١ جار.

## کلماستین فیومارەیت: CLEMASTINE FUMARATE

**ناوی بازرگانی:** Tavegil ,tavist

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ میلیگرامی و دەرزی ١میلیگرام/میلیلیتر، ٢ میلیلیتر و شروبی ٠,٦٧ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** دژی حەساسیەتەو حەساسیەتی لوت و پوشەتا و شەراو و هەوکردنی چاو و ناوبەندی مولولە و ناوکردنی لوت و ئەو نەخۆشیە پێستیانەی کەخورانیان هەیە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالوی، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، کەمخوێنی، قەبزی، پەڵە، وشکبوونەوەی دەم، زیادبوونی لێدانی دڵ تەشەنوج، لەرزین، گێژی، تێکچوونی گەدە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان خۆراکی ١ میلیگرام ٢ جار لە ڕۆژێکدا، زیاد دەکرێت بۆ ڕۆژانە ٦ میلیگرام ئەگەر پێویست بێت. بۆمنداڵی خوار ١ ساڵ پێشنیارنەکراوە. لەمنالانی ١ تا ٣ ساڵ ٢٥٠ تا ٥٠٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە ٢ جار. منالی ٣ تا ٦ ساڵ ٥٠٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە ٢ جار. منالی ٦ تا ١٢ ساڵ ٠,٥ تا ١میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار،لانی کەم ١ حەب ٢ جار لە ڕۆژێکدا یان ٢تا ٦ گرام لەرێی دەرزی ماسولکەیIM یان دەماری IV.



## کلیدینیۆم - سی: CLIDINIUM-C

**ناوی بازرگانی:** Clindex , corium, Librax

**شێوەی دەرمان:** حەبی ( کلیدینیۆم برۆماید ٢,٥ میلی گرام + کلۆردایەزیپۆکساید ٥ میلی گرام).

**گروپی دەرمان:** Antispasmodic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری برینی گەدە و ڕیخۆڵە و دژی کرژبوونی گەدە و ڕیخۆڵە و دژی گرژبوونی کۆڵۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، بێهێزی، دڵەڕاوکێ، سەرئێشە، بێخەوی، زیاد لێدانی دڵ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، لاوازی سێکسی، گیرانی میز، تا، خەواڵوویی، گەورەبوونی بیلبیلەی چاو، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری برینی گەدە و دوانزەگرێ و گرژبوونی کۆڵۆن و هەوکردنی تیژی ڕیخۆڵە و کۆڵۆن گەورەکان ١ تا ٢ حەب خۆراکی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار پێش خواردن و پێش لە خەوتن. کەسانی بەتەمەن و بێ توانا ١ حەب خۆراکی، ڕۆژانە ٢ جار لەپێش خواردن. لایەنی زۆر ڕۆژانە ٨ حەب.

## کلینداماسین: CLINDAMYCIN

**ناوی بازرگانی:** Dalacin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٥٠ و ٣٠٠ میلی گرامی و سەسپێنشنی ٧٥ میلی گرام/٥میلی لیتر و دەرزی ١٥٠ میلی گرام/میلی لیتر (٢میلی لیتر ).

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنەکانی ڕێڕەوی هەناسەدان و هەوکردنی توندی پێست و جومگە و ئێسك و دەم و ددان و بۆچارەسەری هەوکردنی سی و دەرمانی یارمەتیدەر بۆ نەخۆشی ئایدز و هەوکردنی میکرۆبی زایەندی ژنان و مەلاریا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، نەمانی ئارەزوی خواردن، پیسایی خوێناوی، پەڵە، خوران، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی کێش، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥٠ تا ٤٥٠ میلی گرام هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك، یان ٦٠٠ تا ٢٧٠٠ میلی گرام ڕۆژانە ماسولکەییIM یان دەمار IV لە ٢ تا ٤ بڕی دابەشکراوی یەکساندا. لە منداڵان ٨ تا ٢٥ میلی گرام/کیلۆگرام هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك یان ١٥ میلی گرام/کیلۆگرام ماسولکەییIM یان دەمار IV هەر ٦ سەعاتێك.

## کلیندامایسین: ( CLINDAMYCIN ( TOPICAL

**ناوی بازرگانی:** Dalacin

**شێوەی دەرمان:** سەسپێنشن و گیراوەی مەوزوعی ١٪ و ٢٪ و جێڵی مەوزوعی ١٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی زیپکەی دەم و چاو و هەوکردنەکانی پێست و برین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی پێست، خورانی پێست، ڕوشانی پێست، ئازاری سك، سکچوون، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ساڵ ڕۆژی ٢ جار گیراوە یان جێڵ بەڕووی ئەو شوێنەدا دەهێنرێت.

## کلیندامایسین: ( CLINDAMYCIN ( VAGINAL

**ناوی بازرگانی:** Dalacin

**شێوەی دەرمان:** کریمی زایەندی ژنان ٢٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی زایەندی ژنان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئیلتیهابی مەوزوعی، ڕوشان، خوران.

**بڕی دەرمان:** یەك ئەپلیکاتۆرفول (١٠٠ میلیگرام)ی لە کریمی ٢٪ یەك جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٣ تا ٧ ڕۆژ.

## کلیۆکوینۆل: CLIOQUINOL

**ناوی بازرگانی:** Locorten-vioform

**شێوەی دەرمان:** قەترەی گوێ (فلومیتازۆن پیڤالەیت ٠,٠٢٪ و کلیۆکوینۆل ١٪).

**گروپی دەرمان:** Anti-infective

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی سوکی بەکتریایی یان کەڕوویی گوێی دەرەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەستیاربوونی مەوزوعی، گۆڕینی ڕەنگی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ٢ ساڵ ٢ تا ٣ قەترە بەکاردێت بۆ هەر گوێ یەك ڕۆژانە ٢ جار بۆ ماوەی ٧ تا ١٠ ڕۆژ.

بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## کلۆبازام: CLOBAZAM

**ناوی بازرگانی:** Frisium

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Hypnotic&Anxiolytic

**بەکارهێنان:** خەولێخەرە و بۆ چارەسەری دڵەڕاوکێ و قەلەقی و تەشەنوج و ئازار بەکاردەهێنرێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵوویی، سەرئێشە، لەرزین، تێکچوونی هەرس، سەرئێشە، سەرگێژبوون، پەڵە، قەبزی، خەمۆکی، هیلاکبوون، تێکچوونی هاوسەنگی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، وشکبوونەوەی دەم.

**بڕی دەرمان:** دەرمانی یارمەتیدەر لەنەخۆشی فێدا گەورەکان ٢٠ تا ٣٠ میلی گرام ڕۆژانە خۆراکی، منداڵانی سەروی ٣ ساڵ ١٠ تا ١٥ میلی گرام ڕۆژانە خۆراکی بەشێوەی بڕی دەرمانی دابەشکراو. تێکچوونی دڵەڕاوکێ (چارەسەری ماوەکورتا) گەورەکان لە دڵەڕاوکێی سوك ٢٠ تا ٣٠ میلی گرام خۆراکی ڕۆژانە لە چەند بڕێکی دەرمانی دابەشکراودا. یان بەیەك بڕ پێش لە خەوتن. بۆ دڵەڕاوکێی توند ٦٠ میلی گرام خۆراکی ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. منداڵانی ٣ ساڵ و گەورەتر نیوەی بڕی دەرمانی گەورەکان. بۆ پیرەکان و نەخۆشە بێ تواناکان ١٠تا ٢٠میلی گرام/دۆز خۆراکی.

## کلۆبیتازۆل: PROPIONATE CLOBETASOL

**ناوی بازرگانی:** Temovate ,Dermovate

**شێوەی دەرمان:** کرێم و مەڵهەم و لۆشن و شامپۆ و جێڵی مەوزوعی ٠,٠٥٪.

**گرووپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهابی توندی مەوزوعی و تێکچوونەکانی پێست و نەخۆشیەکانی ئیلتیهابی پێست و خورانی مەوزوعی و ئاوسان و سۆریاسس و ئەکزیما بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی مەوزوعی، کزانەوە، خوران، سوتانەوە، قڵیشانی پێست، گۆڕینی ڕەنگی پێست، سووربونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ١ تا ٢ جار، چینێکی تەنکی مەڵهەم یان کرێم ڕووی ئەو شوێنەی پێدەماڵرێت. ڕۆژانە تا ٤ هەفتە.شامپۆ بۆ سۆریاسسی پێستی سەر گەورەکانی سەرووی ١٨ ساڵ ڕۆژانە ١ جاربۆ ماوەی ٤ هەفتە.



## کلۆبیتازۆن بیوتیرەیت: CLOBETASONE BUTYRATE

**ناوی بازرگانی:** Eumovate

**شێوەی دەرمان:** کرێم و مەڵهەمی ٠,٠٥٪.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئەکزیما و هەموو جۆرە ئیلتیهابێکی پێستی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی مەوزوعی، کزانەوە، خوران، سوتانەوە، قلیشانی پێست، گۆڕینی ڕەنگی پێست، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٢ جار، چینێکی تەنکی مەڵهەم یان کرێم ڕووی ئەو شوێنەی پێدەماڵرێت. لانی زۆری ماوەی **بەکارهێنان** ٢ هەفتەیە. بڕی هەفتانەی دەرمان نابێت لە ٥٠ گرام تێپەڕبێت.

## کلۆبوتینول: CLOBUTINOL

**ناوی بازرگانی:** Silomat ,lomisat

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠ میلیگرامی و قەترەی خۆراکی ٦٠ میلیگرامی و دەرزی ١٠ میلیگرام/میلیلیتر، ٢ میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antitussive

**بەکارهێنان:** دژی کۆکەی وشك و کۆکەی توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالۆیی، هێڵنجدان، بێخەوی، سەرگێژبوون.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری کۆکە بزوێنەرەکان یان بەبێ هۆکاری دیاریکراو، بۆ کۆکەی توند گەورەکان خۆراکی ١ تا ٢ حەب (٣٠ تا ٤٠ قەترە) ڕۆژانە ٣ جار. لەڕۆژێکدا یان ٢٠ میلیگرام ژێرپێستی SC و ماسولکەیی IM یان دەماریIV دەرزی لێ دەدرێت، منالانی سەروی ٣ ساڵ ١٠ تا ٢٠ قەترە ڕۆژانە ٣ جار، منالانی کەمتر لە ٣ ساڵ ١ قەترە/کیلۆگرام ڕۆژانە ٣ جار.

## کلۆفارابین: CLOFARABINE

**ناوی بازرگانی:** Clolar

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن جۆری (لیمفۆبلاستیك لیوکیمایی توند ALL ) بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی پەڕەی خوێن و خرۆکەی سپی، زەردی، ئارێکی لێدانی دڵ لاوازی ماسولکەیی، میزی خویناوی، ئاوسان، ئازاری گەدە، سەرئێشە، ئازاری ماسولکە و جومگە، خوران، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٢ میلی‌گرام/مەتردووجا بە دەمار بۆ زیاتر لە ٢ سەعات ڕۆژانە بۆ ماوەی ٥ ڕۆژی یەك لەدوای یەك و دوبارەدەکرێتەوە هەموو ٢ تا ٦ هەفتەیەك.

## کلۆفازیمین: CLOFAZIMINE

**ناوی بازرگانی:** Lamprene

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥٠ و ١٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antileprotic drug

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی گولی کە بلاوترین لایەنی **بەکارهێنانی** ئەم دەرمانەیە و هەروەها ئەم دەرمانە بەشێوەی یارمەتیدەر لەگەڵ دەرمانەکانی تری دژی نەخۆشی گولی داو بۆ چارەسەری نەخۆشی گولی مقاوم بە داپسۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالّویی، خوێنبەربوونی دەزگای هەرس، ئاوکرنی چاو، پەڵە، خوران، سەرگێژبوون، سکچوون، تێکچوونی بینین، وشکبوونەوەی چاو، ئازاری سك، سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠ تا ٢٠٠ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا و لەگەڵ دوو دەرمانی تردا. زیاد دەکرێت بۆ ٣٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە لانی زۆر بۆ ماوەی ٣ مانگ.

## کلۆفایبرەیت: CLOFIBRATE

**ناوی بازرگانی:** Atromid S

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥٠٠ میلی‌گرام.

**گروپی دەرمان:** Antihyperlipidemia

**بەکارهێنان:** بۆدابەزاندنی چەوری خوێن (triglyceride) و کۆلیسترۆل و کۆلیسترۆلی جۆری (VLDL) کە بەرژێمی خۆراکی چارەسەرنابێت و بۆ چارەسەری شەکرەی درۆ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە. کەمبوونەوەی کێش، کەمبوونەوەی ئارەزوی سێکسی، هەڵوەرینی موو، سکچوون، پەڵە، هەوکردنی گەدە، ئازاری ماسولکە، سەرئێشە، بێهێزی، خەوالّویی، ئازاری سنگ، خوران، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ گرام خۆراکی ڕۆژانە لە ٢ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ نەخۆشی شەکرەی درۆ گەورەکان ١,٥ تا ٢ گرام ڕۆژانە خۆراکی، لە ٢ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا بەکاردەهێنرێت.



## کلۆمیثیازۆل: CLOMETHIAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Heminevrin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٩٢ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Hypnotic

**بەکارهێنان:** خەوهێنەرە و بۆ چارەسەری بێخەوی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گیرانی لوت، ڕوشانی لوت، پەڵە، شەرا، سەرئێشە، تێکچوونی هەرس، زیادبوونی دەردراوەکانی بۆریچکەکان و گەروو، شڵەژان.

**بڕی دەرمان:** بۆ بێخەوی توند لە پیرەکاندا (**بەکارهێنانی** ماوەکۆتا) ١ تا ٢ کەپسول لەکاتی خەودا. بۆ منداڵان پێشنیارنەکراوە. بۆ بێ ئارامی و وروژان لە پیرەکاندا ١ کەپسول ڕۆژانە ٣ جار. بۆ وازهێنان لە ئەلکهول سەرەتا ٢ تا ٤ کەپسول، ئەگەر پێویست بوو دوبارە دەکرێتەوە پاش چەند سەعاتێك، ڕۆژی ١ (٢٤ سەعاتی یەکەم ) ٩ تا ١٢ کەپسول لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. (ڕۆژی ٢ ) ٦ تا ٨ کەپسول لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. (ڕۆژی ٣ ) ٤ تا ٦ کەپسول لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. پاشان بەتەدریجی کەمدەکرێتەوە ڕۆژەکانی سەروی ٤ تا ٦. سەرجەمی چارەسەر نابێت زیاتر بێت لە ٩ ڕۆژ.

## کلۆمیفین: CLOMIPHENE

**ناوی بازرگانی:** Clomid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antioestrogen

**بەکارهێنان:** هاندەری ڕژێنی جنسی یەو بۆ چارەسەری نەزۆکی و سکپڕنەبوون و ناتەواوی هێلکەدان و هەندێ حاڵەتی نەزۆکی پیاوان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادبوونی کێش، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، غازات، سکپڕی، پەڵە، ئازاری مەمك، هیلاکبون، سەرئێشە، سەرگێژبون، بێهێزی، بێخەوی، سکچوون، قەبزی، ئازاری سك، ئارەق کردنەوە، هەڵوەرینی موو، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** ٥٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ، لە ڕۆژی پێنجەی بێ نوێژی. ئەتوانی لە کاتێك کاردانەوەی نەبوو، کەبڕی دەرمان بە ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرام بگات. دەورەی دووەمی چارەسەر ئەتوانی کە هەر ٣٠ ڕۆژ ١ جار و لانی زۆر تا ٣ قۆناغ دوبارە دەکرێتەوە.

## کلۆمیپرامین: CLOMIPRAMINE

**ناوی بازرگانی:** Anafranil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٥و ٥٠ و ٧٥ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری حاڵەتە جیاوازەکانی خەمۆکی و وەسواسی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، گێژی، وشکبوونەوەی چاو، تێکچوونی بینین، سەرئێشە، خەواڵویی، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تەشەنوج. شۆك، هێڵنجدان، ئازاری سك، بەرزبوونەوەی پەستانی چاو، لەرزین، پەڵە، قەبزی، هیلاکبوون، ڕشانەوە، سکچوون، ئارەقکردن، خوران.

**بڕی دەرمان:** بۆ خەمۆکی و تێکچوونی وەسواسی ئیجباری گەورەکان حەبی ٢٥ میلی گرام ڕۆژی ٣ جار، لایەنی زۆر ڕۆژانە ٢٥٠ میلی گرام. زیادکردنی بڕی دەرمان دەبێت بەتەدریجی بێت. پاش لە ڕێکخستنی بڕی دەرمان ئەتوانی تەواوی بڕەکە ڕۆژانە پێش خەوتن بەکاربێنیت. منالآن حەبی ٢٥ میلی گرام ڕۆژانە ١جار، تا لایەنی زۆر ڕۆژانە ٣ میلی گرام/کیلۆگرام ئەتوانی بەکاربێنیت. بۆ نەخۆشی هیلاکی موزمین گەورەکان ٧٥ میلی گرام ڕۆژانە. بۆ نەخۆشی پێش لە بیّ نوێژی ژنان PMS ٢٥ تا ٧٥ میلی گرام ڕۆژانە لە ڕۆژی ١٤ی سوڕەکە تا ٢ ڕۆژ پاش لە دەستپێکردنی بیّ نوێژی.

## کلۆنازیپام: CLONAZEPAM

**ناوی بازرگانی:** Rivotril,Clonopin

**شێوەی دەرمان:** حەبی٠,٥ و ١و ٢ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticonvulsant

**بەکارهێنان:** دژی تەشەنوج و فیّ و تێکچوونی ماسولکەیی لەکاتی فیّ دا و تێکچوونی دووجەمسەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، لەرزین، سەرئێشە، گێژی، هێڵنجدان، قەبزی، پەڵە، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن، بەرزبوونەوەی کاسیۆم، وشکبوونەوەی دەم، گیرانی میز، تەنگەنەفەسی، زیاد لێدانی دڵ، تێکچوونی خەو، بەرزبوونەوەی پەستانی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٥ تا ١ میلی گرام ڕۆژانە ٣ جار، لانی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٠ میلی گرامە. لەمنالآن ٠,٠١ تا ٠,٠٣ میلی گرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٣ جار.



## کلۆنیدین: CLONIDINE

**ناوی بازرگانی:** Dixarit,Catapres

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١,٠ و ٢,٠ و ٣,٠ میلیگرام.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و پێشگری لە شەقیقە و دەرمانی یارمەتیدەر لە بەکارنەهێنانی نیکۆتیندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی دەم، قەبزی، هێڵنجدان، ئازاری سك، بێهێزی، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، سەرئێشە، سەرگێژبوون، خوران، گیرانی میز، لاوازی سێکسی.

**بڕی دەرمان:** بۆ پەستانی بەرزی خوێن بڕی ١,٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار، ئەتوانی کە بڕی دەرمان بەتەدریجی زیادبکەیت، بڕی دەرمانی ئاسایی ڕۆژانە ٢,٠ تا ٦,٠ میلیگرامە. بۆ پێشگرتن لە سەرئێشەی شەقیقە ٠,٠٥ خۆراکی ڕۆژانە ٣ جار. منداڵان ٥ تا ١٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام ٢ تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا. لایەنی زۆر ٩,٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. دەرمانی یارمەتیدەر لە تەرککردنی نیکۆتیندا گەورەکان ١,٠ میلیگرام ڕۆژی ٢ جار تا لانی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٤,٠ میلیگرام، بۆ ماوەی ٣ تا ٤ هەفتە.

## کلۆپیدۆگرێل: CLOPIDOGREL

**ناوی بازرگانی:** Plavix

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٧٥ و ٣٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiplatelet

**بەکارهێنان:** دژی کەڵەکەبوونی پەڕەکانی خوێن و بۆ چارەسەری کلۆبوونی خوێنی مولولەکانی خوێن و دڵ و بۆ بەرگری کردن لەجەڵتە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، هەوکردنی لوت، کۆکە، قەبزی، پەڵە، سەرئێشە، بێهێزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوێنبەربوون، هەوکردنی ڕێڕەوی میز، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی، ئازاری قەفەسەی سنگ، سکچوون، ئازاری سك، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٧٥ میلیگرام ١ جار لە ڕۆژێکدا.

## کلۆرازیپەیت: CLORAZEPATE

**ناوی بازرگانی:** Tranxene

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەبی ٣.٧٥ و ٧,٥ و ١٥ میلی گرامی و حەبی ١١,٢٥ و ٢٢,٥ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Anxiolytic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری قەلەقی و دڵەڕاوکێ و ترس و خرۆشان و تەشەنوج و بۆ هێورکردنەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، تێکچوونی هەرس، تێکچوونی بینین، بێخەوی،.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥ تا ٦٠ میلی گرام لە ڕۆژێکدا بە ١ بڕ یان لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، گەورەکان و منالانی زیاتر لە ١٢ سال ٣,٧٥ تا ٧,٥ میلی گرام لە بڕێکدا ڕۆژانە ٢ جار بۆ لایەنی زۆر ٦٠ میلی گرام لە بڕێکدا ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار. بەتەمەنەکان ٧,٥ تا ١٥ میلی گرام لە ڕۆژێکدا.

## کلوتریمازۆل: CLOTRIMAZOLE (TOPICAL)

**ناوی بازرگانی:** Mycelex,Canesten

**شێوەی دەرمان:** گیراوە و کرێمی مەوزوعی ١٪.

**گرووپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی کەڕوویی مەوزوعی و کەچەڵی لەش و ڕان و پێ و کاندیدیازی پێستی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، سوتانەوە. ئازاری سك، ڕوشان.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٢ جاربەیانیان و شەوان ڕووی شوێنی هەوکردووی پێ بماڵرێت.

## کلوتریمازۆل: CLOTRIMAZOLE (VAGINAL)

**ناوی بازرگانی:** Lotrimin

**شێوەی دەرمان:** کرێمی زایەندی ژنان ١٪ وحەبی زایەندی ژنان ١٠٠ و ٢٠٠ و ٥٠٠ میلی گرامی و شاف زایەندی ژنان ١٠٠ و ٢٠٠ و ٥٠٠ میلی گرام.

**گرووپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی کەڕوویی (کاندیدیاز) دەزگای زایەندی ژنان و کەچەڵی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** برینی زایەندی ژنان، زۆرمیزکردن، ڕوشانی زایەندی ژنان، ئازاری سك، سوربونەوە، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** کاتی خەو ١حەب لەناو زایەندی ژناندا دادەنرێت،بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ بەکاردێت. یان ١ ئەپیکالیتۆر (٥ گرام) کاتی خەوتن، لە ناوەوەی زایەندی ژنان دەدرێت بۆ ماوەی ٧ تا ١٤ ڕۆژ.

## کلۆکساسیلین: CLOXACILIN

**ناوی بازرگانی:** Orbenin, Tegopen

**شێوەی دەرمان:** کەپسول و حەبی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی وپاودەر و شەربەتی ١٢٥ میلیگرامی و ڤیاڵی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی و ١ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی جیاواز بەکاردێت بەهۆی بەکتریای ستافیلۆکۆکەس وەك هەوکردنی دەم وپێست و سی یەکان و ڕێڕەوی هەناسە و میزەڵدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سوربونەوەی پێست، ئازاری سك، ڤێ، خوران، ئاوسان، حەساسیەت، ڕشانەوە، سکچوون، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** گەورە کان ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلیگرام ڕۆژی ٤ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٤ گرمە لە ڕۆژێکدا. منالآن ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژی ٤ جار یان ١٢٥ میلیگرام شەربەت ڕۆژی ٤ جار.

## کلۆزاپین: CLOZAPINE

**ناوی بازرگانی:** Clozaril

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ١٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ٥٠ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی دەروونی شیزۆفرینیا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژبوون، زیادبوونی لیك، خەواڵویی. لەرزین، بێخەوی، خرۆشان، تەشەنوج، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری قەفەسەی سنگ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، دڵەکزە. وشکبوونەوەی دەم، تا، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، گیرانی میز. خوران، میزی خوێناوی، کەمبوونەوەی کێش، کەمبوونەوەی ئارەزوی سێکسی، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٢,٥ میلیگرام ١ تا ٢ جار ڕۆژانە ئەگەر نەخۆش تەحەمولی دەرمان بکات، لەکۆتایی هەفتەی دووەم ئەتوانی بڕی دەرمان بە ٣٠٠ تا ٤٥٠ میلیگرام بگەیەنیت. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٩٠٠ میلیگرامە. زیادکردنی بڕی دەرمان نەبێت بە تەدریجی بێت.

## کۆل تار: COAL TAR

**ناوی بازرگانی:** Polytar

**شێوەی دەرمان:** لۆشن و شامپۆ ٪١ و ٢ ٪.

**گروپی دەرمان:** Antidandruff

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سۆریاسس و کرێشی سەر و نەخۆشی خورانی پێست و ئەکزیما و ئیلتیهابی پێستی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی پێست، زیپکە، هەستیاربوون بە ڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** ٢ جار لەهەفتەیەکدا لەشامپۆ و لۆشن سود وەردەگیرێت.

## کۆدلیڤەرئۆیل: CODLIVER OIL

**ناوی بازرگانی:** Adecaps

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی ڕۆن هەیە.

**بەکارهێنان:** بەشێوەی مەوزوعی بۆنەخۆشیەکانی پێست و برینەکان بەکاردێت. ڤیتامینی A وD و ترشەچەوریەکانی پێویستەکانی تێدایە.

**بڕی دەرمان:** یەك تا چەند جار لە ڕۆژێکدا بەشێوەی مەوزوعی.

## کۆکاین: COCAINE

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی مەوزوعی.

**گروپی دەرمان:** Narcotic analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی تامکردن و بۆنکردن، هەوکردنی موزمینی لوت، هاندانی ناوەندە کۆئەندامی دەمار.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ میلیگرام/ کیلۆگرام.

## کۆداین فۆسفەیت: CODEINE PHOSPHATE

**شێوەی دەرمان:** حەبی١٥ و ٣٠ و ٦٠ میلیگرامی و گیراوەی ١٥ میلیگرام/٥میلیلیتر و دەرزی ١٥ و ٣٠ میلیگرام/میلیلیتر گیراوەی خۆراکی ٣ میلیگرام/٥ میلیلیتر و شروبی ٢٥ میلیگرام/٥ میلیلیتر و دەرزی ٦٠ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Analgesic,Antitussive



**بەکارهێنان:** دژی ئازاری سوك و مامناوەند و توند و دژی کۆکەی وشك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، سەرئێشە، سەرگێژبوون، لەرزین، گێژی، تەشەنوج، شۆك، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی لێدانی دڵ وشکبوونەوەی دەم، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزووی خواردن، قەبزی، پەڵە، عارەق کردنەوە.

**بڕی دەرمان:** بۆ کۆکەی وشك گەورەکان ١٥ تا ٣٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٢٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. منداڵی گەورەتر لە ٢ ساڵ ڕۆژانە ١ تا ١,٥ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە دابەشکراو لەهەر ٤ تا ٦ سەعاتێکدا. لانی زۆر ٦٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. بۆ ئازاری سوك و مامناوەند گەورەکان ١٥ تا ٦٠ میلیگرام هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك. منداڵان ٠,٥ تا ١ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك.

## کۆلشیسین: COLCHICINE

**ناوی بازرگانی:** Colchimax , colgout

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ میلیگرامی و حەبی ٥٠٠ مایکرۆگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Anti gout

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی دا الملوك (نەخۆ شی پاشاکان) و دژی ئازار و ئیلتیهابی جومگە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەوکردنی پێست، سکچوون، ئازاری سك، گێژی، کەمخوێنی، هەڵوەرینی موو، زۆرمیزکردن، خوێنبەربوونی هەرس، پەڵە، تێکچوونی گورچیلە و جگەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٥ تا ٠,٦ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ جار. لە نەخۆشی توند ١ تا ١,٨ میلیگرام خۆراکی یە.

## کۆلیسیڤیلام: COLESEVELAM

**ناوی بازرگانی:** Welchol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦٢٥ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antilipemic

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندن و کەمکردنەوەی چەوری خوێن و کۆلیسترۆڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** قەبزی، تێکچوونی گەدە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری ماسولکە، بێهێزی.

**بڕی دەرمان:** ٣ حەب ڕۆژانە ٢ جار یان ٦ حەب ڕۆژانە لەگەڵ ژەمی خواردندا.

## کۆلیستیپۆل: COLESTIPOL

**ناوی بازرگانی:** Colestid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ گرامی و گرانیولی ٥ گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antilipemic

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندن و کەمکردنەوەی چەوری خوێن و کۆلیسترۆڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** قەبزی، ئازاری سك، خوێنبەربوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ڕوشانی گەدە و ڕیخۆڵە.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ٥ گرام ڕۆژانە ١ تا ٢ بە شلی، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ ٥ گرام. لەماوەی ١ مانگدا زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆری ڕۆژانە ٣٠ گرام لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## کۆلفۆسیریل پالمیتەیت: COLFOSCERIL PALMITATE

**ناوی بازرگانی:** Exosurf nedvatal

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی دەرزی.

**گرووپی دەرمان:** Lung Surfactant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و پێشگری لە مەترسی نەتوانینی هەناسەدان لە منداڵە تازەبووەکاندا بەتایبەت ساواکان و کەمبوونی سورفێکتانتی زگماکی ناوەوە لە سی دا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، هەوکردنی سی، تەشەنوج، وەستانی هەناسە، هەوکردنی پەردەکانی مێشك.

**بڕی دەرمان:** بڕی ٦٧,٥ میلیگرام/کیلۆگرام هاوتای ٥ سیسی لە ڕێگەی قوڕقوڕگەوە.

## کولیستین سەلفەیت: COLISTIN SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Colomycin

**شێوەی دەرمان:** باودەری (گیراوە، سەسپێنشن).

**گرووپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی توندی کۆئەندامی هەرس و گرامنێگەتیڤەکانی وەك (سیدۆمۆناس) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خورانی پێست، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کاریگەری لاوەکی لەسەر گورچیلە، تێکچوونی ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١,٥ تا ٣ملیۆن یەکە ٣ جار لەڕۆژێکدا.



## کۆلۆدیۆن: COLLODION

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی گیراوەی مەوزوعی (پایرۆکسیلین ٤٠ میلی‌لیتر +ئیپەر ٧٥٠ میلی‌لیتر + ئەلکهول ٢٥٠ میلی لیتر) / ١٠٠٠ میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** دژی نەخۆشی پێست.

**بەکارهێنان:** بۆ پارێزگاریکردنی پێست لە تێکچوونەکان و ئیلتیهابی پێستی و لە دروستکردن و پێکهاتەی دەرمانەکانیشدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی مەوزوعی.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٢ جار بۆ ماوەی ١ هەفتە سودی لێوەردەگیرێت.

## کۆنیڤاپتان: CONIVAPTAN

**ناوی بازرگانی:** Vaprisol

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠ میلی‌گرام/٤ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Vasopressin receptor antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونەوەی صۆدیۆم لە خوێندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن. کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم، وشکبوونەوەی دەم، سەرئێشە، بێخەوی، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، خوران، هەوکردنی میزەڕۆ، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠ میلی‌گرام بە دەمار بۆ زیاتر لە ٣٠ خولەك پاشان ٢٠ میلی‌گرام بەردەوام بە IV ئینفیوشن بۆ زیاتر لە ٢٤ سەعات.

## کۆنجوگەیتد ئیستروجین: CONJUGATED ESTROGEN

**ناوی بازرگانی:** Premarin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٦٢٥ و ١,٢٥ میلی‌گرام ودەرزی ٥ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (٥ میلی لیتر) ماسولکەیی و دەماری و کرێمی زایەندی ژنان ٠,٦٢٥ میلی‌گرام/گرام.

**گروپی دەرمان:** Antineoplasm

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری وشکی وپوکانەوەی دەزگای زایەندی ژنان و شێرپەنجەی پرۆستات کە قابیلی نەشتەرگەری نی یە و خوێنبەربوونی نائاسایی منداڵدان و بۆ پێشگری لەپوکانەوەی ئێسك و کەمی ئیسترۆجین و شێرپەنجەی مەمك کە قابیلی نەشتەرگەری نی یە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سەرئێشە، دڵەڕاوکێ، هەڵوەرینی موو، کرژبوونی سك، سکچوون، خوران، سەرگێژبوون، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، زیپکە، ڕشانەوە، قەبزی، زیادبوون و کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، کاندیدیازی زایەندی ژنان، زیادبوونی کالسیۆم، زیادبوونی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** بۆ پوکانەوەی زایەندی ژنان گەورەکان ١,٢٥ تا ٠,٣ میلیگرام خۆراکی بۆ ماوەی ٢١ ڕۆژ و پاش ٧ ڕۆژ بەکارنایەت و خولی چارەسەر زیاتر تا دەرکەوتنی خوێنبەربوونی زایەندی ژنان دوبارە دەبێتەوە. نیشانەکانی ڕێکخەری کرژبوون و فراوانی مولولەی خوێن پاش لەحەیزچونەوە گەورەکان ١,٢٥ میلیگرام ڕۆژانە، بۆ ماوەی ٢١ ڕۆژ. پاشان دەرمان ٧ ڕۆژ بەکارنایەت و بەرێکی خولی چارەسەر دوبارەدەکرێتەوە. بۆ شێرپەنجەی پرۆستات کە قابیلی نەشتەرگەری نی یە ١,٢٥ تا ٢,٥ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار. بۆ شێرپەنجەی مەمك کە قابیلی نەشتەرگەری نی یە ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار لانی کەم بۆ ماوەی ٣ مانگ. بۆ پێشگرتن لە پوکانەوەی ئێسك ١,٢٥ میلیگرام خۆراکی بۆ ماوەی ٢١ ڕۆژ و پاشان ٧ ڕۆژ دەرمان بەکارنایەت و پاشان بەرێکی خولی چارەسەر دوبارە دەکرێتەوە. بۆ خوێنبەربوونی نائاسایی منداڵدان ٢٥ میلیگرام ماسولکەیی یان دەمار بەشێوەی لەسەرخۆ.

## کونتراسێپتیف: CONTRACEPTIVES

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەبی LD و HDو DEو ترای فازیك.

**گروپی دەرمان:** Contraceptive

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری سکپڕی و چارەسەری و نەکەوتنەبێ نوێژی و زۆربوونی موو و ئازاری بێ نوێژی و خوێنبەربوونی زیاد لە ڕادە و خوێنبەربوونی نائاسایی منداڵدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ئاوسانی جگەر، سکچوون، قەبزی، خەمۆکی، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، گۆڕانی ئارەزوی سێکسی، خراپبوونی پێست، زیادبوونی کێش، ئازاری سك، سەرگێژبوون، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** بۆ بەرگری لە سکپڕبوون بەشێوەی ڕژێمی ٢١ ڕۆژی بەکاردەهێنرێت.

## کوپەر سەلفەیت: COPPER SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Coppertarce, metacuprol

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی (BULK).

**گروپی دەرمان:** Skin Protectant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سوتانەوەی پێست و ژەهراویبوون بەفۆسفۆر، زەردە برین، کەمخوێنی و بۆ چارەسەر و بەرگری لە کەمبوونی مس بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تەشنوج، سوتانەوەی قورگ و گەدە ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، سکچوونی خوێناوی.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەر و بەرگری لە کەمبوونی مس گەورەکان ٠,٥ تا ١,٥ میلی‌گرام، ڕۆژانە بەعینوانی بەرگری تا لایەنی زۆر ٣ میلی‌گرام. ڕۆژانە بۆ چارەسەر. لەژەهراویبوونی فسفۆر شۆردنەوەی گەدە بەگیراوەی ٠,٠١٪ لەسوتانەوە لە گیراوەی ١٪ سود وەردەگیرێت. بۆ کەمخۆینی گەورەکان بڕێکی زۆر کەم لەگەڵ ئاسندا.

## کۆریفۆلیترۆپین ئەلفا: CORIFOLLITROPIN ALFA

**ناوی بازرگانی:** Elonva

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ و ١٥٠ مایکرۆگرام/٠,٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Gonadotrophins

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵکردنی هاندانی هێلکەدان لەگەڵ ڕێگری (GhRh) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سەرئێشە، هیلاکی، هاندانی زیاد لە ڕادەی هێلکەدان، ئازاری حەوز، گەورەبوون و ئازاری سک، سکچوون، قەبزی، گێژی، لاربوونەوەی هێلکەدان، منداڵ لەبارچوون، فرە سکپڕی، ئازاری مەمك.

**بڕی دەرمان:** بە دەرزی ژێرپێستی کێشی لەشی خوار ٦٠ کیلۆگرام ١٠٠ مایکرۆگرام، کێشی لەشی سەروی ٦٠ کیلۆگرام ١٥٠ مایکرۆگرام.

## کۆرتیکۆترۆپین: CORTICOTROPIN

**ناوی بازرگانی:** Acthar

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٤٠ و ٨٠ یەکەیی.

**گروپی دەرمان:** Hormone

**بەکارهێنان:** کۆنترۆڵی دەردانی هۆرمۆنی کۆرتیکۆستیرۆید دەکات و بۆ فەحصی فرمانی رژێنی ئەدرینالٓ و حەساسیەت و چارەسەری فرەڕەقبوون و تەشەنوج و ئیلتهاب و نەخۆشی سۆریاسس و هەوکردنی جومگە و ئیتیهابی کۆڵۆن و ڕۆماتیزم و هەوکردنی فەقەرەکان و بۆ کپکردنەوەی سیستمی بەرگری لەش و نەخۆشی کۆلاجین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، خوێنبەربوونی گەدە، تەشەنوج، پەککەوتنی دڵ هێڵنجدان، زیپکە، حەساسیەت، هێڵنجدان، ڕشانەوە، لاوازی ماسولکەیی، پوکانەوەی ئێسك، کەمبوونەوەی گەشەی منالآن.

**بڕی دەرمان:** بڕی ٤٠ تا ١٢٠ یەکە بە ماسولکەییIM یان ژێرپێستیSC لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

بۆ بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێک نەخۆشی



## کورتیزۆن ئەسیتەیت: CORTISONE ACETATE

**ناوی بازرگانی:** Cortisone

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ میلی‌گرامی و دەرزی ٥٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهاب و ئازار و حەساسیەت، ناتەواوی ڕژێنی ئەدرینال و کەمبوونی هۆرمۆنی کۆرتیکۆستیۆید لە نەخۆشی ئەدیسۆن دا بۆ کپکردنەوەی سیستمی بەرگری لەش و هەوکردنی جومگە و فەقەرەکان و ئێسك و نەخۆشی پێستی و نەخۆشی کۆلاجین و حەساسیەتەکان و ئیلتیهاب و حەساسیەتی چاو و نەخۆشی ڕێڕەوی هەناسە و فرە ڕەقبوون و هەوکردنی پەردەکانی مێشك و نەخۆشی لووەکان و نەخۆشی گەدە و ڕیخۆڵە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** برینی گەدە، خوێنبەربوون، تێکچوونی ماسولکە و ئێسك، گێژی، بێخەوی، هیلاکبوون، سەرئێشە، سووربوونەوە، هەوکردنی پێست. کاتاراکت، گلوکۆما، زیادبوونی IOP، هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، تێکچوونی هۆرمۆن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان خۆراکی ٢٥ تا ٣٧,٥ میلی‌گرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## کۆتینیدۆن: CO-TENIDONE

**ناوی بازرگانی:** Tenoret ٥٠, tenoretic

**شێوەی دەرمان:** حەبی ئەتینۆلۆل و کلۆرتالیدۆن ( ٥٠ میلی‌گرام ئەتینۆلۆل ١٢,٥ میلی‌گرام کلۆرتالیدۆن) حەبی ئەتینۆلۆل و کلۆرتالیدۆن ( ١٠٠ میلی‌گرام ئەتینۆلۆل ٢٥ میلی‌گرام کلۆرتالیدۆن).

**گروپی دەرمان:** Beta blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبونەوەی پەستانی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، پەککەوتنی دڵ، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی، کرژبوونی بۆری هەوا، سەرئێشە، هیلاکی، تێکچوونی خەو، گێژی، تێکچوونی هاوسەنگی، نەخۆشی دەروونی، لاوازی سێکسی، گۆڕانی خەستی چەوری پلازما، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم و سۆدیۆم و مەگنسیۆم و کلۆر، زیادبوونی یوریك ئەسید، زیادبوونی کالسیۆم، زیادبوونی شەکری خوێن، نەخۆشی پاشاکان، لیر، کەمبوونەوەی خڕۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، تێکچوونی بینین، سۆریاسس، هەڵوەرینی موو، هەوکردنی پەنکریاس، زەردی، نارێکی لێدانی دڵ، پەڵە، ئۆدیمای سی، هەوکردنی سی، هەستیاربوون بەڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ بەرزبونەوەی پەستانی خوێن ڕۆژانە ١ حەب (بەڵام بڕی دەرمانی زیاتر لە ٥٠ میلی‌گرام ئەتینۆلۆل بەدەگمەن پێویست ئەبێت).

## کۆ ترایمۆکسازۆل: CO- TRIMOXAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Sulmeprin,Sulfatrim,Bactrim,Septrin

**شێوەی دەرمان:** حەبی گەورەکان ٤٠٠ میلیگرام سەلفامیوکسازۆل و ٨٠ میلیگرام ترای میوپریم، حەبی منالآن ١٠٠ میلیگرام سەلفا میوکسازۆل و ٢٠ میلیگرام ترای میوپریم ، سەسپێنشنی خۆراکی منالآن ٢٤٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر، سەسپێنشنی گەورەکان ٤٨٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و دەرزی ٤٠٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر سەلفا میوکسازۆل و ٨٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر ترای میوپریم و دەرزی ٩٦ میلیگرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antibacterial,(Antibiotic)

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنەکانی ڕێڕەوی میزو ڕێڕەوی هەناسە و هەوکردنی گەدە و ڕیخۆڵە و هەوکردنی گوێی ناوەڕاست و سکچوون بەهۆی بەکتریاو هەوکردنی پرۆستات بەشێوەی کاتی یان مزمین و هەوکردنی سی یەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** دروستبوونی بەردی کریستاڵی، کەمخوێنی، بلۆقکردنی پێست، خوران، پەڵە، سکچوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، تەشەنوج، تێکچوونی گورچیلە، سەرئێشە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکاندا ٢ حەب (٩٦٠ میلیگرام) بەیانی و ٢ حەب ئێوارە هەر ١٢ سەعاتێك ١جار یان ١ تا ٢ حەب هەر ١٢ سەعاتێك ١ جار، منالی ٦ هەفتە تا ٥ مانگ ١٢٠ میلیگرام، ٦ مانگ تا ٥ ساڵ ٢٤٠ میلیگرام، ٦ تا ١٢ ساڵ ٤٨٠ میلیگرام. دەرزی ٩٦٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك زیاد دەکرێت بۆ ١,٤٤ گرام هەموو ١٢ سەعاتێك لە هەوکردنی توند دا. منالآن ٣٦ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا زیاد دەکرێت بۆ ٥٤ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە لە هەوکردنی توند دا.

## کریسانتاسپەیس: CRISANTASPASE

**ناوی بازرگانی:** Erwinase

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ١٠٠٠٠ یەکەیی.

**گرووپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی خوێن (ALL) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەوکردنی دەم، زیادبوونی یوریك ئەسید، لاوازی فرمانی جگەر، هەوکردنی پەنکریاس، سکچوون، مەیینی خوێن، بێهێزی، خەواڵوویی، شڵەژان، گێژی، ژەهراویبوونی ڕەگ،



تەشەنوج، سەرئێشە، گۆڕانی چەوری، زیادبوونی شەکری خوێن، کپبوونەوەی سیستمی بەرگری لەش، ئازاری ماسولکە، ئازاری سك، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی ماسولکەیی یان دەمار یان ژێرپێستی بەکاردێت.

## کرۆمولینی صۆدیۆم: CROMOLYN SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Nasalcrom,intal

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ئیستینشاقی(هەڵمژین) ٢٠ و ١٠٠ میلیگرام و سپرای لوت ٢٠ میلیگرام/میلیلیتر و ئایرۆسۆڵی ١میلیگرامی گیراوەی ئیستینشاقی ٢٠ میلیگرام /٢میلیلیتر و گیراوە بۆ پرژاندن ١٠میلیگرام / میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** allergic Athma Anti

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری ڕەبۆ و حەساسیەت و حەساسیەت و هەوکردنی لوت و کرژبوونی بۆری و بۆریچکەکانی هەوا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکبوونەوەی دەم، کرژبوونی بۆری هەوا، ڕوشانی گەروو، کۆکە، سەرئێشە، ئازاری سك، سەرگێژبوون، زۆر میزکردن، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** بۆ پێشگرتن و چارەسەری هەوکردن و حەساسیەتی لوت گەورەکان و منالآنی سەروی ٢ ساڵ ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار ١ سپرای بۆ هەر کونێکی لوت. بۆ پێشگرتن لە کرژبوونی بۆریچکەکان گەورەکان و منالآنی گەورەتر لە ٥ ساڵ یەك بڕی سپرای یان ١ کەپسول ١ سەعات پێش لە هاندانی لاشەیی، لە حەساسیەتی خۆراکی لە کەپسول سود وەردەگیرێت. بۆ پێشگرتن لە حەملەکانی ڕەبۆ گەورەکان و منالآنی سەروی ٥ ساڵ ڕۆژانە ٢ ئیستینشاق بۆ ماوەی ١٤ ڕۆژ. ١ کەپسوڵی ٢٠ میلیگرامی ڕۆژانە ٤ جار.

## کرۆمۆلینی صۆدیۆم: CROMOLYN SODIUM OPH.

**ناوی بازرگانی:** Opticrom

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٢٪ (٥میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antiallergic

**بەکارهێنان:** دژی حەساسیەتی چاو و ئازاری چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی مەوزوعی، سوتانەوەی کاتی چاو، خورانی چاو، ئیلتیهابی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی سەروی ٥ ساڵ ١ تا ٢ قەترە، ڕۆژانە ٤ تا ٦ جار. لە منالآنی بچوکتر لە ٤ ساڵ، نەبێت بە **ئیحتیات** بەکاربێت.

## کرۆتامیتۆن: CROTAMITON

**ناوی بازرگانی:** Eurax

**شێوەی دەرمان:** کرێمی و لۆشنی ١٠٪.

**گروپی دەرمان:** Scabicide

**بەکارهێنان:** دژی گەڕی (نەخۆشی پێستی) و خورانی پاش گەڕی و خورانی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی زۆر، خوران، ڕوشان، سوربونەوە، هەوکردنی پێست، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار، منالآنی کەمتر لە ٣ ساڵ ڕۆژانە ١ جار بەکاردێت.

## کیومارین: CUMARIN ER

**ناوی بازرگانی:** Venalot,Lodema,Lysedem

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** دژی ئۆدیمای لیف.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئۆدیما و ئاوسانی لیمفی لە نەخۆشی یەکانی فیلاریازیس و پاش لەکاری نەشتەرگەری مەمك (مەمك هەڵدڕین) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی جگەر، تێکچوونی هەرس، ژەهراویبوونی جگەر.

**بڕی دەرمان:** بڕی ١حەب (١٠٠ میلیگرام) لەڕۆژێکدا بۆماوەی ١ مانگ و وە نیوەی حەبێك (٥٠ میلیگرام) لەڕۆژێکدا بۆماوەی ٢ ساڵ.

## سایکلیزین: CYCLIZINE

**ناوی بازرگانی:** Valoid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ میلیگرامی و دەرزی ٥٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری هێڵنجدان و ڕشانەوە و ڕشانەوە لەسەفەردا و تێکچوونی هاوسەنگی و گێژبوون و تێکچوونی گوێی ناوەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، گێژبوون، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی بینین، وڕێنە، گیرانی میز، زۆرلێدانی دڵ، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن.

بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێک نەخۆشی

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە بۆ زیاتر لە ٣ جار. منداڵانی ٦ تا ١٢ ساڵ ٢٥ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە بۆ زیاتر لە ٣ جار. بۆ ڕشانەوە لەسەفەردا ١ تا ٢ سەعات پێش لە سەفەرکردن ٥٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە بۆ زیاتر لە ٣ جار. بە دەرزی ماسولکەیی IM و دەمار IV سایکلیزین لاکتەیت ٥٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٣ جار.

## سایکۆبێنزاپرین: CYCLOBENZAPRINE

**ناوی بازرگانی:** Amrix,Flexeril

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ER ١٥ و ٣٠ میلی‌گرامی و حەبی ٧,٥ میلی‌گرامی و حەبی ٥ و ١٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کرژبوونی ماسولکە و ئازاری ماسولکە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی لێدانی دڵ، دڵەکوتێ، سەرئێشە، لەرزین، هیلاکبوون، خەمۆکی، خرۆشان، زیپکە، ئارەقکردنەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، ڕشانەوە، وشکبوونەوەی دەم، خەواڵویی، گێژی، هێڵنجدان، تێکچوونی بینین، زەردی، هیپاتیت، خوران، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ تا ١٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار.لایەنی زۆر ٢ تا ٣ هەفتە. یان کەپسول ١٥ تا ٣٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار لایەنی زۆر ٣٠ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا.

## سایکلۆپێنثایەزاید: CYCLOPENTHIAZIDE

**ناوی بازرگانی:** Navidrex

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەبی ٥٠٠ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Diuretic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئۆدیما (کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا) و پەستانی بەرزی خوێن و پەککەوتنی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆمی خوێن، تێکچوونی گەدە، سەرئێشە، گێژی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هەستیاری پێست، قەبزی، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** بۆ پەککەوتنی دڵ ٢٥٠ تا ٥٠٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە لە بەیانیاندا و ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ ڕۆژانە ١ میلی‌گرام (کەمدەکرێتەوە لە کەمترین کاریگەریدا بۆ بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو). بۆ بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن ٢٥٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە لە بەیانیاندا و ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ ڕۆژانە ٥٠٠ مایکرۆگرام. بۆ ئۆدیما تا ٥٠٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە بۆ ماوەیەکی کورت.

## سایکلۆپینتۆلەیت: CYCLOPENTOLATE

**ناوی بازرگانی:** Cyclogel , mydrilate

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاوی ١٪ و ٠,٥٪ و ٢٪.

**گروپی دەرمان:** Anticholinergic

**بەکارهێنان:** بۆ گەورەکردنی بیلبیلەی چاو بۆ پشکنینی چاو و بۆ چارەسەرکردنی شەلەلی ماسولکەی برژانگ و هەروەها بۆ چارەسەری هەندێ جۆری ئیلتیهاباتی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بەرزبوونەوەی پەستانی چاو، تێکچوونی خەو. فرمێسك ڕشتن، ورێنە، تێکچوونی بینین. سووربونەوەی چاو، تا، وشکبوونەوەی دەم، زیادلێدانی دڵ ڕوشان و ئازاری چاو، لەرزین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵ ١ قەترە ٤٠ تا ٥٠ خولەك پێش لە پشکنین و دووبارەی کردنەوەی ماوەی ٥ تا ١٠ خولەك.

## سایکلو فۆسفامید: CYCLOPHOSPHAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Cytoxan,Endoxana,Neosar

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ میلیگرامی و دەرزی ٢٠٠ و ٥٠٠میلیگرامی و دەرزی ١ و ٢ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Alkylating agent

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی خوێن وسی و هێلکەدان و مەمك ولیمفۆمای هوچکین و ناهوچکین و نەخۆشی مۆخ مالتیپل مایلۆما) و نەخۆشی گورچیلە لە منداڵاندا و بۆ چارەسەری ڕۆماتیزم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، بەگرانی هەناسەدان، ڕەشبوونی پیسایی، ئازاری پشت، ئاوسان، ئازاری سنگ. ئازاری سك، سکچوون، برینی دەم، بوونی خوێن لەمیزدا، خوێنبەربوون، سکچوون، هەڵوەرینی موو، تا، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، هەوکردنی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠ تا ٥٠ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی یان دەماری لە چەند بڕێکی دەرماندا بۆماوەی ٢ تا ٥ ڕۆژ. بڕی جێگیری دەرمان ڕۆژانە ١ تا ٥ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی.

## سایکلۆسرین: CYCLOSERINE

**ناوی بازرگانی:** Seromycin,Closina

**شێوەی دەرمان:** کەپسول و حەبی ٢٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

پێ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە [illegible]

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردن بەکاردێت بەهۆی ڕێژەیەکی زۆری بەکتریاوەو بۆ چارەسەری نەخۆشی سیل و هەوکردنی ڕێرەوی میز بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان، خەواڵویی، ڕشانەوە، لەرزین، شڵەژان، هیلاکبوون، پەلە، ناجێگیری، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** دەرمانی یارمەتیدەر لە سیلی سی و دەرەوەی سی گەورەکان ٥٠٠ ملیگرام تا ١ گرام ڕۆژانە خۆراکی لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بڕی دەرمانی سەرەتا ٢٥٠ ملیگرام ڕۆژانە ٢ جار بە ماوەی هەر ١٤ سەعاتێك بۆ ماوەی ٢ هەفتە. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١ گرامە. منداڵان ڕۆژانە ١٠ تا ١٥ ملیگرام/کیلۆگرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ هەوکردنی ڕێرەوی میز ٢٥٠ ملیگرام خۆراکی هەر ١٢ سەعاتێك بۆ ٢ هەفتە.

## سایکلۆسپۆرین: CYCLOSPORINE

**ناوی بازرگانی:** Neoral,Sandimmun, gengraf

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی خۆراکی ١٠٠ ملیگرام/ملیلیتر و دەرزی ٥٠ملیگرام/ملیلیتر و کەپسولی ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ ملیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Immunosuppressant

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری ڕەفزکردنی ئەندام پاش لە چاندنی گورچیلە و جگەر و دڵ و مۆخی ئێسك بەکاردێت و کپکەرەوەی سیستمی بەرگری لەشە و بۆ چارەسەری ڕۆماتیزم و ئەکزیما و سۆریاسس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، لەرزین، زیادبوونی گەشەی موو، ئاوسانی پوکی ددان، گێژبوون، سەرئێشە، سکچوون، تەشەنوج، سووربونەوە، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، جیوب، تێکچوونی هەرس، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، کەمخوێنی، زیپکە، گەورەبوونی مەمك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ڕۆژانە ١٥ ملیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ڕۆژانە ٤ تا ١٢ سەعات پێش لە چاندن و بەردەوام بۆ ماوەی ١ تا ٢ هەفتە پاش لەنەشتەرگەری و پاشان کەمکردنەوەی دەرمان بەتەدریجی بۆ ٥٪ تا بڕی دەرمانی پاراستن ڕۆژانە ٥ تا ١٠ ملیگرام/کیلۆگرام.

## سایکلۆسپۆرین: CYCLOSPORINE OPH.

**ناوی بازرگانی:** Restasis

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو.

**گروپی دەرمان:** Anti inflammatory

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری وشکبوونەوەی چاو و بۆ زیادکردنی دروستبوونی فرمێسك لەو کەسانەی کە نەخۆشی سیستیەی چاویان هەیە.

**کاریگەری لاوەکی:** کزانەوەی چاو، سوربونەوەی چاو. تێکچوونی بینین، ئازاری چاو، خوران و سوربونەوەی پێست. ئاوکردنی چاو.

**بری دەرمان:** گەورەکان ١ قەترە بکرێتە ناو چاو هەموو ١٢ سەعاتێك.

## سایپرۆهێپتادین: CYPROHEPTADINE

**ناوی بازرگانی:** Periactin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤ میلیگرامی و شروبی ٢ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** ئارەزوی خواردن زیاد دەکات و دژی حەساسیەت و خوران و شەرا و حەساسیەتی لوت و بۆ چارەسەری سەرئێشەی کلاستەر و شەقیقە و نەخۆشی کوشینگ و نەمانی ئارەزوی خواردن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالویی، زیادبوونی کێش، سەرئێشە، گیرانی میز، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، تەشەنوج، زرنگەنەوەی گوێ، نارێکی لێدانی دڵ، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی لێدانی دڵ، کەمخوێنی، تێکچوونی بینین.

**بری دەرمان:** گەورەکان ٤ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. لایەنی زۆری بری دەرمان ٠,٥ میلیگرام کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا. منالآنی ٢ تا ٦ سال ٢ میلیگرام خۆراکی هەر ٨ تا ١٢ سەعات جارێك. لایەنی زۆری بری دەرمان ١٢ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. منالی ٧ تا ١٤ سال ٤ میلیگرام ٢ تا ٣ جار لەڕۆژێکدا. لایەنی زۆری بری دەرمان ڕۆژانە ١٦ میلیگرامە.

## سایپرۆتیرۆن: CYPROTERONE ACEATE

**ناوی بازرگانی:** Androcur,cyprostat

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anti androgen

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیادبوونی لە ڕادە بەدەری ئارەزوی سێکسی لە پیاوان و وەك ئازار کەمکەرەوە بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتوی پرۆستات و پرمووی ناسروشتی لەژناندا و زیپکەی توند بەکاردێت

**کاریگەری لاوەکی:** نەزۆکی، گەورەبوونی مەمك، هەوکردنی جگەر، خەمۆکی، خەوالویی، پەڵەی پێستی، گۆڕانی کێش. ڕێ لەدروستبوونی تۆو دەگرێت.



**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری پرمووی ٥٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢جار بە ماوەی ١٠ ڕۆژ لەمانگێکدا، دەستپێکی دەرمان لەڕۆژی پێنجەمی بێ نوێژی یەوەیە. گەورەکان بۆ زیادبوونی لە ڕادە بەدەری ئارەزوی سێکسی لە پیاوان ٥٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار پاش لە خواردن. بۆ شێرپەنجەی پرۆستات ڕۆژانە ٣٠٠ میلیگرام لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا و پاشان ڕۆژانە ٢٠٠ تا ٣٠٠ میلیگرام لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا بە عینوانی دەرمانی پاراستن.

## سایپرۆتیرۆن کامپاوند: CYPROTERONE COMPOUND

**ناوی بازرگانی:** Diane

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەبی (٢میلیگرام سایپرۆتیرۆن ئەسیتەیت +٣٥میلیگرام ئەپینیل ئیسترادیۆڵ)

**گروپی دەرمان:** Anti androgen

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری لەسکپڕی، دژی زیبکەی توند و پرمویی ناسروشتی ژنان (هیرسوتیزم) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گەورەبوونی مەمك، هیلاکبوون، خەمۆکی، پەڵە، کەمخوێنی، تەنگەنەفەسی، هەوکردنی جگەر، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** دەستپێکردنی دەرمان لەڕۆژی پێنجەمی بێ نوێژی هەر ڕۆژانە ١ حەب بۆ ماوەی ٢١ ڕۆژ، ٧ ڕۆژ پاش لە بەکارنەهێنانی دیسان دەرمان دوبارە دەکرێتەوە.

## سیستیماین: CYSTEAMINE

**ناوی بازرگانی:** Cystagon

**شێوەی دەرمان:** پاودەرو کەپسولی ١٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** دژی کەڵەکەبوونی سیستین.

**بەکارهێنان:** دژی کۆبوونەوەی سیستین و چارەسەر و پێشگیری (سیتینۆسس) لە گورچیلەدا بەکاردێت و ئەبێتەهۆی پەککەوتنی گورچیلە.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، ئازاری گەدە، کۆکە، ڕشانەوە، خەواڵویی، سەرئێشە، خەمۆکی، تەشەنوج، لەرزین، هێڵنجدان، قەبزی، ئازاری جومگە و ئێسك، تا، برینی گەروو، سکچوون، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن. بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن. پەڵە، زرنگانەوەی گوێ، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەر و پێشگرتنی سیستینۆسس کەسانێك کێشیان لەسەروی ٥٠ کیلۆگرامەوەیە ڕۆژانە ٢ گرام خۆراکی، هەر ٦ سەعاتێك لەبڕە دابەشکراوەکاندا. کەسانێك کێشیان لەخوار ٥٠ کیلۆگرامەوەیە ڕۆژانە ١,٣ گرام/ مەتردوجا خۆراکی، هەر ٦ سەعاتێك لە بڕە دابەشکراوەکاندا و دەبێت بڕی دەرمان بە تەدریجی زیاد بکرێت لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ١,٩ گرام/مەتردوجا یە.

## سیتارابین: CYTARABINE

**ناوی بازرگانی:** Cytosar

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ و ٥٠٠ میلیگرامی ١ و ٢ گرامی و دەرزی ٢٠ میلیگرام /میلیلیتر (٥٠میلی لیتر) و دەرزی ٢٠ میلیگرام /میلیلیتر (٥ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەکانی خوێنی CML ,ALL ,AML بەکاردێت

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تا، سەرئێشە، برینی دەم، کەمخوێنی، زیادبوونی ئەنزیکانی جگەر، پەڵە، ئازاری ماسولکە و ئێسك، سکچوون، تێکچوونی خانەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالان ١٠٠تا ٢٠٠ میلیگرام/ مەتردوجا ڕۆژانە بەIV ئینفیوشن یان دەرزی IV بەخێرایی، لەبڕی دەرمانی دابەشکراودا بۆماوەی ٥ تا ١٠ ڕۆژ. بڕی دەرمانی جێگیری و پارێزراو ١ میلیگرام/کیلۆگرام SC ١ تا ٢ جار لەهەفتەیەکدا.

## سیتارابین: CYTARABINE LIPOSOMAL

**ناوی بازرگانی:** Depocyt

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی لیمف (لیمفۆما) پێکەوە لەگەڵ هەوکردنی پەردەکانی مێشك دا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، تێکچوونی بینین و بیستن و قسەکردن، تا، فێ، ئازاری مل، خەوالویی، نەمانی کۆنترۆڵی ماسولکە، خرۆشان، تێکچوونی خەو، نەمانی کۆنترۆڵی میزەڵدان و ڕیخۆڵە، لەرزین، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی نیوترۆفیل(جۆرێکە لە خرۆکەی سپی)، زیادلێدانی دڵ سکچوون، قەبزی، ئازاری گەدە، ئاوسان. گێژی، ئازاری جومگە و پشت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ میلیگرام بە(لەناو کیفدا IT) هەموو ١٤ ڕۆژێك بۆ ٣ بڕی دەرمان، لە (هەفتەی ٥ و ٧ و ٩).پاشان ٥٠ میلیگرام بە(لەناو کیفدا IT) هەموو ٢٨ ڕۆژێك بۆ ٤ بڕی دەرمان، لە (هەفتەی ١٧ و ٢١ و ٢٥ و ٢٩).



## سایتۆمیگالۆڤایرەس ئیمیون گلۆبیولین: CYTOMEGALOVIRUS I.G.

**ناوی بازرگانی:** Cytogam

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Immune Globulin

**بەکارهێنان:** بۆ کەمکردنەوەی زیانی نەخۆشی (سایتۆمیگالۆڤایرەس) لە کاتی چاندنی ئەندامێکدا و هەروەها وەك یارمەتیدەر بۆ بەرگری لە هەوکردن بەهۆی (سایتۆمیگالۆڤایرەس)ەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سووربوونەوە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کرژبوونی ماسولکە، تا، خێزەخێز، ئازاری جومگە، ئارەقکردنەوە، لەرز.

**بڕی دەرمان:** ١٥٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام لە بڕێکی دەرماندا لە ماوەی ٧٢ سەعات لەکاتی چاندندا بۆ ١٦ هەفتە پاش چاندن.

***



## دابیگاتران: DABIGATRAN ETEXILATE

**ناوی بازرگانی:** Pradaxa

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٧٥ و ١٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەکارهێنان:** دژی مەیینی خوێنە و بۆ بەرگری لە کلۆبوون و مەیینی خوێن بۆ کەمکردنەوەی زیانی سەکتە لەو کەسانەی هەندێ جۆری تێکچوونی ڕیتمی دڵیان هەیە وەك لەرینەوەی گوێچکەڵەی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، تێکچوونی گەدە، ئازاری سك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٧٥ تا ١٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار.

## داکاربازین: DACARBAZINE

**ناوی بازرگانی:** Dtic Dome

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠و٢٠٠ و ٥٠٠میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Alkylating agent

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی خوێن هوجکین لیمفۆما و شێرپەنجەی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕشانەوە، هێڵنجدان، سکچوون، برینی دەم، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، هەڵوەرینی موو، سەرئێشە، گێژی، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** بۆ شێرپەنجەی تەشەنەکردووی پیسی پێست گەورەکان ٢ تا ٤,٥ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە بە دەمار بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ دوبارەکردنەوەی دەرمان هەموو ٤ هەفتەیەك یان ٢٥٠ میلیگرام/ مەتردوجا ڕۆژانە بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ هەر ٣ هەفتەیەك. بۆ شێرپەنجەی خوێن هوجکین لیمفۆما ڕۆژانە ١٥٠ میلیگرام/مەتردوجا ڕۆژانە دەماری، بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ و دوبارەکردنەوەی دەرمان هەر ٤ هەفتەیەك یان ٣٧٥ میلیگرام/مەتردوجا ڕۆژی یەکەمی ڕێکخستنی دەرمانی و دوبارەکردنەوەی هەر ١٥ ڕۆژێك.



## داکلیزوماب: DACLIZUMAB

**ناوی بازرگانی:** Zenapax

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥ میلی گرام میلی‌لیتر (٥ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Immunosuppressant

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری لە ڕەفزکردن لە چاندنی گورچیلە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، هیلاکبوون، خەمۆکی، لەرزین، زیاد لێدانی دڵ ئازاری قەفەسەی سنگ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن. گیرانی میز، پەڵە، کۆکە، تێکچوونی بینین، زیپکە، هەوکردنی لوت.

**بڕی دەرمان:** ١میلی گرام/کیلۆگرام لە٥ بڕی دەرمانی دابەشکراودا کە یەکەمین دۆز ئەبێت لە کەمتر لە ٢٤ سەعات پێش لە کاری نەشتەرگەری دەرزی لێدرێت و ئەو ٤ بەشەی کەماوەتەوە لە ماوەی ١٤ ڕۆژدا دوای کاری نەشتەرگەری ڕێی پێدەدرێت.

## داکتینومایسین: DACTINOMYCIN

**ناوی بازرگانی:** Cosmegen

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,٥ میلی گرام/٣میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic,Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ چارەسەری شێرپەنجە لەمناڵاندا و بۆ چارەسەری جۆرە جیاوازەکانی شێرپەنجە بەکاردێت، کە کاریگەرییان لەسەر گورچیلە هەیە (شێرپەنجەی منداڵدان و هێلکەگون و ئێسک و ماسولکە و جومگە و شانە نەرمەکان) دژی شێرپەنجەی هێلکەگون و منداڵدان و شێرپەنجەی گورچیلە (ویلمز) و ماسولکە (ڕابیدۆمیوساکرەم) و ئاوسانی ئێسک بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەوکردنی گەروو، کەمخوێنی، زیپکە، هەڵوەرینی موو، هیلاکبوون، بێهێزی، ئازاری ماسولکە، تا، سکچوون. ئازاری سک، برینی دەم.

**بڕی دەرمان:** ١٠ تا ١٥ مایکرۆ گرام/ کیلۆگرام بە دەمار، یان ٤٠٠ تا ٦٠٠ مایکرۆگرام/مەتردوجا بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ.



## دالتیپارین: DALTEPARIN

**ناوی بازرگانی:** Fragmin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠٠٠ یەکە/میلی‌لیتر و ٧٥٠٠ یەکە/٠,٣ میلی‌لیتر و ٥٠٠٠ یەکە/٠,٢میلی‌لیتر و ٢٥٠٠ یەکە ٠.٢ میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەکارهێنان:** دژی خوێن مەیینە و ڕێ لەکلۆبوون و مەیینی خوێن دەگرێت و بۆ چارەسەری ئازاری سنگ و جەڵدە و کلۆبوونی خوێنی ناو مولولەکانی خوێن و مەیینی خوێنی سی و دڵ و مەیینی خوێن لە قوڵایی دەماردا (مەیینی خوێنی دەماری قاچ) و بۆ ئەو نەخۆشانەی کەلە ژێر نەشتەرگەری سکدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، تا، خوران، پەڵە، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠٠ تا ٥٠٠٠ یەکە ژێر پێستی SC و لانی زۆری بڕی دەرمان ١٨٠٠٠ یەکەیە.

## داناپارۆید: DANAPAROID SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Orgaran

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٢٥٠ یەکە/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەکارهێنان:** دژی مەیینی خوێنە و بۆ بەرگری لە مەیینی خوێنی دەمار و کلۆبوونی خوێن و مەیینی خوێنی سی و مولولەکانی قاچ و بۆ جەڵدە و بۆ بەرگری لە مەیینی خوێن بەگشتی یان لە نەشتەرگەری پزیشکی ئێسکدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، پەڵە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، سەرئێشە، بێخەوی، گێژی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٧٥٠ یەکە ژێرپێستی ڕۆژانە ٢ جار.

## دانازول: DANAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Danol,Danocrine

**شێوەی دەرمان:** کەپسول ١٠٠ و ٢٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Progestogen

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانی ئیندۆمیترێۆسس (ئیلتیهابی ناوپۆشی منداڵدان) و بەرگری لە نەخۆشی منداڵدان و نەخۆشی بوونەرپشاڵی تورەکەیی مەمك و ئاوبەندی مولولەیی بۆماوەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیپکە، قەڵەوی. زۆربوونی موو، دەردانی چەوری پێست، بچوکبوونەوەی مەمك، هێڵنجدان، سوتانەوە، ئازاری ماسولکە، خەمۆکی، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، خوێنبەربوونی دەزگای زایەندی ژنان، تێکچوونی بینین، سەرئێشە، سەرگێژبوون، لەرزین، وشکی زایەندی ژنان، هەوکرنی دەزگای زایەندی ژنان.

**بڕی دەرمان:** بۆ ئیندۆمیتریۆسسی سوك گەورەکان ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار ئەم دەرمانە بۆ ماوەی ٣ تا ٩ مانگ نەبێت بەردەوام بێت. بۆ ئیندۆمیتریۆسسی مامناوەند و توند ٤٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار ئەم دەرمانە بۆ ماوەی ٣ تا ٩ مانگ نەبێت بەردەوام بێت. بۆ پێشگرتن لە ئاوبەندی مولەی بۆماوەیی گەورەکان ٢٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار.

**دانترولین:** DANTROLENE

**ناوی بازرگانی:** Dantrium

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی و دەرزی ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کرژبوونی ماسولکە و دژی ڕەقبوونی ماسولکە بەهۆی شەلەلی مێشك و بڕینی دڕکەپەتك و فرەڕەقبون و کرژبون بەهۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تێکچوونی جگەر. لەرزین، فێ، کەمبوونەوەی کێش، تێکچوونی بینین، تێکچوونی تەوازن، سەرگێژبوون، بێهێزی. هیلاکبون، خەواڵویی، زیادبوونی لێدانی دڵ خوران، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، کرژبوونی سك، تا، ئارەقکردن، بیرۆ.

**بڕی دەرمان:** بۆ کرژبونی ماسولکە ٢٥ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە. بۆ چارەسەر بەرزبونەوەی پیسی گەرمی گەورەکان و منالان ١ میلیگرام کیلۆگرام بە دەرزی IV. بۆ پێشگرتن لە بەرزبونەوەی پیسی گەرمی گەورەکان ٤ تا ٨ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ٣ تا ٤ جار لەڕۆژێکدا.

**دانترۆن:** DANTRONE

**ناوی بازرگانی:** Normax,codalax,danlax,co danthramer

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی (دانترۆن ٢٥ میلیگرام/پۆلۆکسامێر ٢٠٠ میلیگرام) و کەپسولی بەهێز (دانترۆن ٣٧,٥میلیگرام/پۆلۆکسامێر ٥٠٠ میلیگرام) و سەسپێنشن (دانترۆن ٢٥ میلیگرام/پۆلۆکسامێر ٢٠٠ میلیگرام لە ٥ میلی لیتردا ) سەسپێنشنی بەهێز (دانترۆن ٧٥ میلیگرام/پۆلۆکسامێر ١٠٠٠ میلیگرام لە ٥ میلی لیتردا) و کەپسولی (دانترۆن ٥٠ میلیگرام/دۆکیوسەیت کالسیۆم ٦٠ میلیگرام) و سەسپێنشنی (دانترۆن ٥٠ میلیگرام/دۆکیوسەیت کالسیۆم ٦٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر).



**گروپی دەرمان:** Laxative

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری قەبزی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، گۆڕانی ڕەنگی میز بۆ سور یان پەمەیی.

**بڕی دەرمان:** کەپسولی (دانتڕۆن ٢٥ میلیگرام/پۆلۆکسامێر ٢٠٠ میلیگرام) گەورەکان ١ تا ٢ کەپسول لەکاتی خەوتن، منالآن ١ کەپسول لەکاتی خەوتن. کەپسولی بەهێز (دانتڕۆن ٣٧,٥میلیگرام/پۆلۆکسامێر٥٠٠ میلیگرام) گەورەکان و منالآنی سەروی ١٢ سالّ ١ تا ٢ کەپسول لە لەکاتی خەوتن. سەسپێنشن (دانتڕۆن ٢٥ میلیگرام/پۆلۆکسامێر ٢٠٠ میلیگرام لە ٥ میلی لیتردا ) گەورەکان ٥ تا ١٠ میلیلیتر لە شەودا، منالآن ٢,٥ تا ٥ میلیلیتر. سەسپێنشنی بەهێز (دانتڕۆن ٧٥ میلیگرام/پۆلۆکسامێر ١٠٠٠ میلیگرام لە ٥ میلی لیتردا) گەورەکان و منالآنی سەروی ١٢ سالّ ٥ میلیلیتر لە شەودا. کەپسولی (دانتڕۆن ٥٠ میلیگرام/دۆکیوسەیت کالسیۆم ٦٠ میلیگرام) گەورەکان ١ تا ٣ کەپسول لە شەودا. منالآنی ٦ تا ١٢ سالّ ١ کەپسول لە شەودا. سەسپێنشنی (دانتڕۆن ٥٠ میلیگرام/دۆکیوسەیت کالسیۆم ٦٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر) گەورەکان ٥ تا ١٥ میلیلیتر لە شەودا، منالآنی ٦ تا ١٢ سالّ ٥ میلیلیتر لە شەودا.

## داپسون: DAPSONE

**ناوی بازرگانی:** Sulfona,Avlosulfon

**شێوەی دەرمان:** حەبی٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antileprotic,Antimalarial

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی گولی و هەوکردنی پێستی تامێسکاوی و مەلاریا و توشبوون بە تۆکسۆپلاسمۆز و هەوکردنی سی لەو نەخۆشانەی بەرگریان کەمە (ئایدز) و بۆ توشبوون بە کەڕوو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێلّنجدان، ڕشانەوە، تەشەنوج، بێخەوی، کەمخوێنی، سەرئێشە، سەرگێژبوون، ئازاری سك، پەلّە، حەساسیەتی لوت، هەوکردنی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام، منالآن ڕۆژانە ١ تا ١,٥میلیگرام/ کیلۆگرام خۆراکی.

## داپسون: DAPSONE

**ناوی بازرگانی:** Aczone

**شێوەی دەرمان:** جیلّی ٥٪.

**گروپی دەرمان:** Antiacne

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیپکەی ئاسایی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوە و سوربونەوەی پێست، پەلّە، خوران، توێك هەلّدانی پێست.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ جار بە شێوەی چینێکی تەنك بە ڕووی شوێنی مەبەستدا بمالّرێت.



## داپتۆمایسین: DAPTOMYCIN

**ناوی بازرگانی:** Cubicin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلی گرام/١٠ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی پێست و پەردەی ناوەوەی دڵ و هەوکردنی بەکتریایی مولولەی خوێن بەهۆی ستافیلۆکۆکەس ئۆوریەس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، غازات، سکچوون، قەبزی، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، خەمۆکی، بێخەوی، گێژی، کەمخوێنی، ئازاری جومگە، پەڵە، هەوکردنی کۆڵۆن، خوران، تێکچوونی گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، سوربونەوە، نارێکی لێدانی دڵ لەرزین، زیادبوونی شەکری خوێن، پەککەوتنی گورچیلە، ئۆدیما، کۆکە، ئازاری پشت، برینی گەروو.

**بڕی دەرمان:** بۆ هەوکردنی پێست ٤ میلی گرام/کیلۆگرام بە دەمار هەموو ڕۆژێك بۆ ماوەی ٧ تا ١٤ ڕۆژ. بۆ هەوکردنی پەردەکانی دڵ و مولولەکانی خوێن ٦ میلی گرام/کیلۆگرام بەدەمار هەموو ڕۆژێك بۆ ماوەی ٢ تا ٦ هەفتە.

## داربیپۆیتین: DARBEPOETIN ALFA

**ناوی بازرگانی:** Aranesp

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥ و ٤٠ و ٦٠ و ١٠٠ و ٢٠٠ و ٣٠٠ مایکرۆ گرام/میلی لیتر و ١٥٠ مایکرۆگرام/٠.٠٧٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Hematopoietic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمخوێنی (کەمبوونەوەی خرۆکە سورەکان لە لەشدا) بەهۆی پەککەوتنی موزمینی گورچیلە و چارەسەری کیمیایی یەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری گەدە، سکچوون، قەبزی، پژمین، برینی گەروو، ئازاری ماسولکە، ئازاری جومگە، سەرئێشە، گێژی، پەڵە، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری سنگ، قەلەقی، تێکچوونی بینین، تەشەنوج، تا، لەرز، ئازار و سوربونەوەی شوێنی دەرزی.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری کەمخوێنی بەهۆی پەککەوتنی موزمینی گورچیلەوە گەورەکان سەرەتا ٠,٤٥ مایکرۆگرام/کیلۆگرام بە دەمار یان ژێرپێستی هەفتانە ١ جار. بۆ چارەسەری کەمخوێنی بەهۆی چارەسەری کیمیایی یەوە سەرەتا ٢,٢٥ مایکرۆگرام/کیلۆگرام ژێرپێستی هەفتانە ١ جار. بە نۆبەت ٥٠٠ مایکرۆگرام/ کیلۆگرام ژێرپێستی پێ دەدرێت هەموو ٣ هەفتەیەك ١ جار.



## دارِیفیناسین: DARIFENACIN

**ناوی بازرگانی:** Emselex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٧,٥ و ١٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antispasmodic

**بەکارهێنان:** بۆ کەمکردنەوەی کرژبوونی ماسولکەیی میزەڵدان و ڕێرەوی میز و بۆ چارەسەری

**کاریگەری لاوەکی:** ئۆدیما، کۆکە، تێکچوونی بینین، هەوکردنی لوت. بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی، بێخەوی. لاوازی سێکسی، هەوکردنی زایەندی ژنان، وشکبوونەوەی دەم، وشکبوونەوەی چاو و پێست، قەبزی، سکچوون، هێڵنجدان، تێکچوونی گەدە، گێژی، بێهێزی، سەرئێشە، تا، بڕینی قوڕگ، ئازار و کزانەوە لەکاتی میزکردن، ئازاری گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ٧,٥ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ ١٥ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار پاش ٢ هەفتە.

## داروناڤیر: DARUNAVIR

**ناوی بازرگانی:** Prezista

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٧٥ میلی‌گرامی و ١٥٠ میلی‌گرامی و ٤٠٠ میلی‌گرام و ٦٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت، کەئەبێتەهۆی ئایدز لەگەڵ دەرمانە دژەڤایرۆسەکانی تردا.

**کاریگەری لاوەکی:** نارێکی لێدانی دڵ بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، سووربونەوە، جەڵدە، ئازاری سنگ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری گەدە، سەرئێشە، پەڵە، تێکچوونی بینین، خەواڵویی، وشکبوونەوەی دەم، وشکبوونەوەی پێست و چاو، زیادبوونی شەکری خوێن، زۆر میزکردن. کەمبوونەوەی کێش، زەردی، نەمانی ئارەزوی خواردن، تا، بلۆقکردنی پێست، ئارەقکردنەوە، هەڵوەرینی موو. ئازاری جومگە، پەککەوتنی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ٦ ساڵ ٦٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٢ جار، لەگەڵ ١٠٠ میلی‌گرام ڕیتۆناڤیر ڕۆژانە ٢ جار پێی دەدرێت لەگەڵ خواردندا.



## داساتینیب: DASATINIB

**ناوی بازرگانی:** Sprycel

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ و ٥٠ و ٧٠ و ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێنی لیوکیمیا لەجۆری (CML, ALL) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، گۆڕانی کێش، ئازاری سك، تێکچوونی تامکردن، تێکچوونی گەدە، هەوکردنی کۆڵۆن. قەبزی، ناڕێکی لێدانی دڵ هەوکردنی گەدە، پەککەوتنی دڵ بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری سنگ، سوربونەوە، خوێنبەربوون، دڵەکوتێ، تەنگەنەفەسی، کۆکە، ئۆدیما، سەرئێشە، گێژی، خەمۆکی، تێکچوونی بینین. پەڵە، خوران، زیپکە، تەشەنوج، هەستیاربوون بەڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار.

## دانوروبیسین: DAUNORUBICIN

**ناوی بازرگانی:** Cerubidine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠ و ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anthracycline, Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی خوێنی لیوکیمیای توند (AML و ALL ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، هەڵوەرینی موو، تێکچوونی دڵەماسولکە، تێکچوونی مۆخی ئێسك. کەمبوونەوەی لێدانی دڵ کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، کەمخوێنی، سوربوونی میز، تا، لەرز، پەڵە، برینی دەم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٥ میلیگرام /مەتردوجا لە خولی یەکەم لەڕۆژانی ١ و ٢ و ٣ و لەخولی دووەمدا لەڕۆژەکانی ١ و ٢ لەگەڵ سیتارابیندا، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٥٥٠ میلیگرام/مەتردوجایە.

## دیبریسۆکوین: DEBRISOQUINE

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی خۆراکی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سەرئێشە. ئارەقکردن، خاوبوونەوەی گشتی.

**بڕی دەرمان:** بەئەندازە و بڕی پێویست بەکاردێت.



## دیسیتابین: DECITABINE

**ناوی بازرگانی:** Dacogen

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەندێ شێرپەنجەی خوێن و مۆخی ئێسک (MDS) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی نیوترۆفیل، کەمبوونەوەی پەرەی خوێن، کەمخوێنی، کەمی خڕۆکەی سپی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، هیلاکبوون، تا، کۆکە، ئازاری سنگ، ئازاری گەدە، زۆر میزکردن، ئازاری جومگە، بێخەوی، سەرئێشە، گێژی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥ میلی گرام/مەتردوجا بە IV ئینفیوشنی بەردەوام بۆ زیاتر لە ٣ سەعات، دووبارەکرێتەوە هەموو ٨ سەعاتێك بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ.

## دیفەراسیرۆکس: DEFERASIROX

**ناوی بازرگانی:** Exjade

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٢٥ و ٢٥٠ و ٥٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Chelating agent

**بەکارهێنان:** دژی ژەهراویبوون بە ئاسن و زیادبوونی ئاسن بە شێوەی موزمین بەهۆی کاریگەری گواستنەوەی خوێنەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژبوون، زۆرهیلاکبوون، تا، سەرئێشە، هەوکردنی لەوزەتێن، تێکچوونی بیستن، هەوکردنی گەروو، هەوکردنی لوت، تێکچوونی بینین، ئازاری سك، سکچوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ژەهراوی بوونی جگەر، ئازاری جومگە و ماسولکە، کۆکە، هەوکردنی بۆریچکەکان، هەوکردنی ڕێڕەوی هەناسە، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ٢ ساڵ ٢٠ میلی گرام/کیلۆگرام خۆراکی بەگەدەی خاڵی ٣٠ خولەك پێش لە خواردن بە کۆنترۆڵکردنی فیریتین بە شێوەی مانگانە بڕی دەرمان هەر ٣ تا ٦ مانگ بەشێوەیەك ڕێکدەخرێت کەبڕی دەرمان لە خوار ٥ تا ١٠ میلی گرام/کیلۆگرام بێت و نابێت ڕۆژانە زیاتر لە ٣٠ میلی گرام کیلۆگرام بێت. لە کاتێکدا کەڕوبەری سیرەمی فیریتین بۆخواری ٥٠٠ مایکرۆگرام/لیتر کەم بکات دەرمان بەکارناهێنرێت.



## دیفیریپرۆن: DEFERIPRONE

**ناوی بازرگانی:** Ferriprox

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ١٠٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Chelating agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ژەهراوی بوون بەهۆی ئاسنی زیاد لەلەشدا و ئەوانەی توشی تالاسیما هاتوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە – کەمبوونەوەی نیوترۆفیل، کەمبوونی زینك، سور یان قاوەیی بوونی ڕەنگی میز.

**بڕی دەرمان:** لەو نەخۆشانەی توشبورن بە تالاسیما گەورەکان و منالانی زیاتر لە ٦ ساڵ ئاسایی ٢٥ میلیگرام/کیلۆگرام ٣ جار لە ڕۆژێکدا و لایەنی زۆر تا بڕی ١٠٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا ڕێی پێ دەدرێت.

## دیفیرۆکسامین: DEFEROXAMINE

**ناوی بازرگانی:** Desferal, desfonac

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠ میلیگرامی و ٢ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Chelating agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ژەهراوی بوونی موزمین بە ئاسن و نەخۆشی تالاسیما و ژەهراوی بوون بە ئەلەمنیۆم و هیمۆسیدروز و بەمەبەستی تەشخیصی زیادبوونی ئاسنی خوێن و ژەهراوی بوون بەئاسن بەهۆی گواستنەوەی خوێنەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی لێدانی دڵ نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، پەڵە، خوران، تێکچوونی بینین، شەوکوێری، سکچوون، تا، کەمبوونەوەی بیستن، گێژی، کۆکە، خیزەخیز.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ١ گرام و پاشان ٠,٥ گرام هەر ٤ سەعاتێك بەشێوەی ماسولکەیی پاشان هەر ١٢ سەعاتێك ٠,٥ میلیگرام. لانی زۆری بڕی دەرمان ٦ گرامە. لە منالانیش ٩٠ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ٨ سەعاتێك ماسولکەیی یان دەماری.



## دیفلازاکۆرت: DEFLAZACORT

**ناوی بازرگانی:** Calcort

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و کپکردنەوەی ئیلتیهاب و حەساسیەت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە، هەوکردنی پەنکریاس، شەکرە، پوکانەوەی ئێسک، زیادبوونی کێش، بێخەوی، لاوازی ماسولکەیی.

**بڕی دەرمان:** بڕی دەرمانی ئاسایی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە ٣ تا ١٨ میلیگرام ( بۆ نەخۆشی توند سەرەتا ڕۆژانە تا ١٢٠ میلیگرام. منداڵان ڕۆژانە ٠,٢٥ تا ١.٥ میلیگرام/کیلۆگرام یان لە ڕۆژانی یەك لەدوای یەکدا.

## دیگاریلیکس: DEGARELIX

**ناوی بازرگانی:** Firmagon

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٨٠ و ١٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** GnRH antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتووی پرۆستات بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، خەواڵویی، بێخەوی، سووربوونەوە، ئارەقکردنەوە، وشکبوونەوەی دەم، زیادبوونی کێش، گێژی، سکچوون، قەبزی، نەمانی ئارەزوی خواردن، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، حەمۆکی، قەڵەقی، گەورەبوونی مەمك، کەمخوێنی، پەڵە، شەرا، هەوکردنی پرۆستات، ئازاری حەوز، ئازاری گون، لاوازی سێکسی، هەڵوەرینی موو.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی دەرزی ژێرپێستی لە ناوچەی سك دەدرێت، گەورەکان سەروی ١٨ ساڵ سەرەتا ٢٤٠ میلیگرام بە ٢ دەرزی لێی دەدرێت هەریەکەیان ١٢٠ میلیگرام، پاشان ٨٠ میلیگرام هەموو ٢٨ ڕۆژێك.

## دیهایدرۆئیمیتین: DEHYDROEMETINE ٢HCL

**ناوی بازرگانی:** Mebadin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٣٠ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** دژی ئەمیبا.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی ئەمیبیاسس و فاسیۆلیاسس(کرمی جگەر) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، ئازار، لەرزین، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادلێدانی دڵ ئازاری قەفەسەی سنگ، ئۆدیما، هێڵنجدان، رشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، قەبزی، لاوازی ماسولکەیی.

**بڕی دەرمان:** نەخۆشی ئەمیباسس (نەخۆشی بەهۆی ئەمیباوە) ١ میلیگرام/ کیلۆگرام رۆژانە تالایەنی زۆری ٦٠ میلیگرام رۆژانە بەماسولکەیی، بۆ ماوەی ٤ تا ٦ رۆژ (لە منالانی ٥رۆژ). لەمنالان بەشێوەی دابەشکراو لە ٢ بڕی دەرماندا رۆژانە رێی پێدەدرێت. نەخۆشی فاسیۆلیاسس ١ میلیگرام/کیلۆگرام رۆژانە ماسولکەیی بۆ ماوەی ١٠ رۆژ لەگەڵ ١٥٠ میلیگرام کلۆرۆکین ٣ جار لەرۆژێکدا بۆ ماوەی ٢١ رۆژ.

## دیلاڤیردین: DELAVIRDINE

**ناوی بازرگانی:** Rescriptor

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٢٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت، کە دەبێتەهۆی ئایدز.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، رشانەوە، سکچوون، هیلاکبوون، پەڵە، تا، سەرئێشە، بلۆقکردن و توێکهەڵدانی پێست، لەرز، ئازاری گەدە، تێکچوونی بینین، کۆکە، ئازاری جومگە و ماسولکە، بێخەوی، قەبزی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٠ میلیگرام بە شێوەی خۆراکی ٣ جار لە رۆژێکدا.

## دیمیکلۆسایکلین: DEMECLOCYCLINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Diclomycin,Ledermycin

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی کەپسولی ١٥٠ میلیگرامی و حەبی ١٥٠ و ٣٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antbiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردن بەهۆی رێژەیەکی زۆری بەکتریاوە و هەوکردنی رێڕەوی میز و هەوکردنی رێڕەوی هەناسە و زیپکە و سوزەنەك و هەروەها بۆ چارەسەری کەمبوونەوەی صۆدیۆم و کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا بەهۆی دەردانی نەشیاوی هۆرمۆنی دژەمیزپێکەرەکان (SIADH) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، کەمبوونەوەی کێش، کۆکەی وشك، ئازاری سنگ، هەناسەبڕکێ، تەشەنوج، زۆربوونی میز، رشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** بڕی ١٥٠ میلیگرام/٦ سەعات، ٣٠٠ میلیگرام/١٢ سەعات. بۆ (SIADH) سەرەتا ٠,٩ تا ١,٢ گرام رۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا پێی دەدرێت، کەمدەکرێتەوە بۆ ٦٠٠ تا ٩٠٠ میلیگرام.



## دینۆسوماب: DENOSUMAB

**ناوی بازرگانی:** Prolia

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٦٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Monoclonal antibody

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری لە شکانی ئێسك و بۆ چارەسەری پوکانەوەی ئێسك و بۆ چارەسەری پوکانەوەی ئێسك پاش لەعوزرچونەوەی ژنان و شێرپەنجەی ئێسك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** قەبزی، هەوکردنی ڕێڕەوی میز، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، ئازاری سمت، کەتەراکت. پەڵە، هەوکردنی گوێ، ئەکزیما، کەمبوونەوەی کالسیۆم.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی دەرزی ژێرپێستی ٦٠ میلیگرام هەموو ٦ مانگێك.

## دیسفلوران: DESFLURANE

**ناوی بازرگانی:** Suprane

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی گیراوەی ئیستینشاقی.

**گروپی دەرمان:** General anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی عمومی لەپێش یان لەکاتی نەشتەرگەریدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشاندنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، کۆکە، وەستانی هەناسە.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێژەی گونجاو بەکاردێت.

## دیزیپرامین هایدرۆکلۆراید: DESIPRAMINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Pertofrane,Norpramin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٥ و ٥٠ و ٧٥ و ١٠٠ و ١٥٠ میلیگرامی و کەپسولی ٢٥ و ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** دژی خەمۆکی موزمین و ئازاری موزمین و خەمۆکی بەهۆی **بەکارهێنانی** کحول و کۆکاینەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێهێزی، خەواڵویی، تێکچوونی خەو، تەشەنوج، وشکبوونی دەم، تێکچوونی بینین، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، حەساسیەت، ئارەقکردن، زیادبوونی کێش، خوران، گیرانی میز، خێرایی لێدانی دڵ، دابەزینی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام خۆراکی بە یەك بڕ یان ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣٠٠ میلیگرامە.



## دیسلۆراتادین: DESLORATADINE

**ناوی بازرگانی:** Clarinex,neoclarityn

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ میلیگرامی و شرووبی ٠.٥ میلیگرام/میلیلیتر و گیراوەی خۆراکی ٢,٥ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری حەساسیەتی وەرزی و هەمیشەیی لوت و بۆ پژمین و خوران و ئاوکردنی چاو و شەرا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ئازاری ماسولکە، تا، کۆکە، زەردی، هێڵنجدان، سکچوون، خەواڵوویی، وشکبوونەوەی دەم، برینی گەروو، تەشەنوج.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، منالی ١ تا ٦ ساڵ ١,٢٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، منالی ٦ تا ١٢ ساڵ ٢,٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار.

## دیسمۆپریسین: DESMOPRESSINE

**ناوی بازرگانی:** Desmotabs , Desmospray, octostim

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,١ و ٠,٢ میلیگرامی و گیراوەی لوتی ٠,١ و ١,٥ میلیگرام/میلیلیتر و دەرزی ٤ مایکرۆگرام/میلیلیتر و ١٥مایکرۆگرام/میلیلیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antidiuretic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری میزکردنی شەوانە و خوێنبەربوونی هیمۆفیلیا A و نەخۆشی شەکرەی درۆ و نەخۆشی ڤۆنویلبراند بەکاردێت.

کاریگەری لاوەکیەکان: سەرئێشە، خوێنبەربوونی لوت، سووربونەوەی پێست، هێڵنجدان، ئازاری سك، زیادبوونی کێش، گیرانی لوت، سەرگێژبوون، کۆکە، لەرز، ئازاری گەروو، بێهێزی.

**بڕی دەرمان:** بۆ میزکردنی شەوانەی سەرەتایی ٠,١ سیسی شەوانە کاتی خەوتن، بکرێتە ناو هەر کونێکی لوت. بری دەرمانی پاراستن ١٠ تا ٤٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە. بۆ نەخۆشی شەکرەی درۆ و زیاد میزکردنی کاتی ٠,١ تا ٠,٤ سیسی بۆ ناوەوەی لوت ڕۆژانە لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بری دەرمانی پاراستن ٠,١ تا ١,٢ میلیگرام ڕۆژانە لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. منالانی ٣ تا ١٢ مانگ ٠,٠٥ تا ٠,٣ سیسی بۆ ناوەوەی لوت ڕۆژانە لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ نەخۆشی هیمۆفیلیا و نەخۆشی ڤۆنویلبراند ٠,٣ مایکرۆگرام/کیلۆگرام بە نۆرماڵ سەلاینی ٠,٩ بتوێتەوە لە ماوەی ١٥ تا ٣٠ خولەکدا ئینفیوشن بکرێت.



## دیسڤینلافاکسین: DESVENLAFAXINE

**ناوی بازرگانی:** Pristip

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ١٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خەمۆکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، گێژی، بێخەوی، زۆر ئارەقکردن، قەبزی، خەواڵوویی، کەمبوونی ئارەزووی خواردن، فنەقی، تێکچوونی بینین، تەشەنوج، کۆکە، بوونی خوێن لە میز و پیسایدا، لەرزین، لاوازی سێکسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ میلی گرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار.

## دیزۆکسی کورتیکوستیرۆن: DESOXY CORTICOSTERONE

**ناوی بازرگانی:** Doca Acetate

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Mineralocorticoid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ناتەواوی ڕژێنی سەر گورچیلە ئەدرینال و نەخۆشی ئەدیسۆن و ئەدرینۆجینیتاڵی ڕگمەکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن. ئۆدیما، زیادبوونی قەبارەی خوێن، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم، لاوازی ئەندامەکان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵ ١ تا ٥ میلی گرام ڕۆژانە بە ماسولکەیی IM.

## دیکسامیثازۆن: DEXAMETHASONE

**ناوی بازرگانی:** Dexon, deronil,Decadron

**شێوەی دەرمان:** ئیلیکزیر ٠,٥ میلی گرام/٥میلی لیتر و حەبی ٠,٥ میلی گرامی و دەرزی ٨ میلی گرام/٢میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** دژی حەساسیەتی توند و ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانی ڕژێنی سەر گورچیلە و وەرەمی مێشك و حەساسیەت و ئیلتیهابی جومگە و وەرەمی ڕێڕەوی هەناسەدان و ڕۆماتیزم و دەرمانی یارمەتیدەر لە هەوکردنی بەکتریایی پەردەکانی مێشك و بۆ چارەسەری هێڵنجدان و ڕشانەوە بەهۆی چارەسەری کیمیاییەوە و تەشخیصی کوشینگ و ئیلتیهابی کۆلۆن و ئیلتیهابی پێست و بۆ نەخۆشی سۆریاسس بەکاردێت.

بۆ بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ناجێگیری، بێخەوی، لاوازی ماسولکەیی، تەشەنوج، تێکچوونی تەوازن، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، زیپکە، پەڵە، برینی گەدەو دوانزەگرێ، زۆربوونی ئارەزوی خواردن – ڕشانەوە، ئاوی ڕەشی چاو، ئاوی سپی چاو، پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو، پوکانەوەی ئێسك، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم، زیادبوونی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** لە ئیلتیهابی مێشکدا ١ تا ٢ ئەمپوڵ هەر ٦ تا ١٢سەعاتێك. لە هەوکردنی پەردەکانی مێشك ٠,٦ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ٦ سەعاتێك لەڕۆژی یەکەم تاچوارەمی **بەکارهێنانی** دەرمان،یان ١٠ میلیگرام دەرزی بەدەمار و پاشان ٤ میلیگرام هەر ٦ سەعاتێك.

## دیکسامیثازون: DEXAMETHASONE NASAL

**ناوی بازرگانی:** Dexacort

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی سپرای.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری حەساسیەت و حەساسیەتی وەرزی لوت و ئیلتیهابی لوت و بۆ چارەسەری هەندێ جۆری گۆشتی زیادەی ناو لوت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوونی لوت، کزانەوە، پژمین، بەرزبوونەوەی زەختی چاو، سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕوشان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی مناڵانی زیاتر لە ١٢ساڵ ٢ سپرای بۆ هەر کونەلوتێك ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار. لایەنی زۆر ١٢ سپرای لە ڕۆژێکدا. منالانی ٦ تا ١٢ ساڵ ١ تا ٢ سپرای بۆ هەر کونەلوتێك ڕۆژانە ٢ جار. لایەنی زۆر ٨ سپرای لە ڕۆژێکدا.

## دیکسامیثازون: DEXAMETHASONE OPH.

**ناوی بازرگانی:** Decadron

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاوی ٠.١٪ و مەڵهەمی چاوی ٠,٠٥٪.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهاب و حەساسیەتی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبوونەوەی پەستانی ناوچاو، کاتاراکت، کزانەوە، ڕوشان، خوران، سوربونەوە، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** ١ تا ٢ قەترە ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار دەکرێتە چاوەوە.

با ئاگادار بین: دەرمان شێوەوازی جیاواز و کاریگەری [illegible]، ئەگەر بەگوێرەی [illegible] بەکاربهێنرێت



## دێکسامیثازون فۆسفەیت: DEXAMETHASONE PHOSPHATE

**ناوی بازرگانی:** Decadron,maxidex

**شێوەی دەرمان:** قەترەی گوێ و چاو ١٪.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهابی گوێ و چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بینین، خوران، سوتانەوە، وشکی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و مناڵ ١ تا ٤ قەترە ڕۆژی ٣ تا ٤ جار.

## دێکسکلۆرفینیرامین: DEXCHLORPHNIRAMINE

**ناوی بازرگانی:** polaramine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ میلیگرامی و شروبی ٢ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiallergic

**بەکارهێنان:** دژی حەساسیەتە و بۆ حەساسیەت و هەوکردنی لوت و حەساسیەتی چاو و نەخۆشی پێستی ئالۆشدار بۆ چارەسەری نیشانەکانی حەساسیەت و لیر و بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵوبی، تێکچوونی خوێن، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ میلیگرام هەر ٤ تا ٦ سەعات ، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٢ میلیگرامە، منالآنی ٦ تا ١٢ساڵ ١ میلیگرام هەر ٤ تا ٦ سەعات، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٦ میلیگرام، منالآنی ٢ تا ٥ ساڵ ٠,٥ میلیگرام هەر ٤ تا ٦ سەعات،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣ میلیگرامە.

## دێکسپانثینول: DEXPANTHENOL

**ناوی بازرگانی:** Bepanthene,panthoderm

**شێوەی دەرمان:** کرێمی مەوزوعی ٥٪.

**گروپی دەرمان:** دژی ئیلتیهابی پێست.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی مەوزوعی پێست و ئەکزیما و خوران و حەساسیەت و ڕوشانی پێست و وشکبوونەوەی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێست، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە کرێم ١ تا ٢ جار بەشێوەی مەوزوعی.



## دێکسرازۆکسان: DEXRAZOXANE

**ناوی بازرگانی:** Cardioxane,Savene

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠ میلیگرامی و دەرزی ١٠×٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Cardioprotective agent

**بەکارهێنان:** بۆ پاراستنی ژنان لە زیانەکانی دڵ بەهۆی **بەکارهێنانی** چارەسەری ئەنپراپایکلینەکانەوە بۆ شێرپەنجەی مەمك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی گەدە، ئازاری سك، سکچوون، هەوکردنی گەدە، خوێنبەربوونی زایەندی ژنان. وشکبوونەوەی دەم، نەمانی ئارەزوی خواردن، تەنگەنەفەسی، گێژی، لەرزین، هیلاکبون. خەواڵویی، تا، ئازاری ماسولکە. کەمخوێنی، کەمبوونەوەی نیوترۆفیل، کەمی خرۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، هەڵوەرینی موو، خوران. ئۆدیما، هەوکردنی خوێنهێنەر، ئاوسان، برینی گەروو.

**بڕی دەرمان:** بۆ بەرگری لە دروستبوونی ژەهراوی بوونی دڵ بەهۆی ئەنپراپایکلینەکانەوە گەورەکان سەروی ١٨ ساڵ بە ڕێگەی IV ئینفیوشن ( ٣٠ خولەك پێش لە پێدانی ئەنپراپایکلینەکانەکان) ٢٠ ئەوەندەی هاوهێزی بڕی دەرمانی دۆکسۆروبیسین یان ١٠ ئەوەندەی هاوهێزی بڕی دەرمانی ئیپیروبیسین. بۆ دژەکردنی ئەنپراپایکلینەکان گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ بە ڕێگەی IV ئینفیوشن ١ گرام/مەتردوجا (لایەنی زۆر ٢ گرام) ڕۆژانە بۆ ماوەی ٢ ڕۆژ، پاشان ٥٠٠ میلیگرام/مەتردوجا بۆ ماوەی ١ ڕۆژ.

## دێکستران: DEXTRAN

**ناوی بازرگانی:** Dextranan

**شێوەی دەرمان:** ئینفیوشنی ٥٠٠میلی لیتری.

**گروپی دەرمان:** Plasma substitutes

**بەکارهێنان:** قەبارەی پلازما زیاد دەکات و بۆچارەسەری شۆك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە. هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوران، خوێنبەربوون، گیرانی لوت، کەمبوونەوەی خەستی خوێن.

**بڕی دەرمان:** ئەتوانی ٥٠٠ تا ١٠٠٠ میلیگرام بەIV ئینفیوشن بکرێت لەماوەی ٣٠ خولەکدا و (بەخێرایی ٢٠ تا ٤٠میلی لیتر/خولەك)

## دیکسترۆئەمفیتامین: DEXTROAMPHETAMINE

**ناوی بازرگانی:** Dexedrine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** C.N.S STIMULANT

**بەکارهێنان:** دەبێتەهۆی هاندانی ناوەندە کۆئەندامی دەمار و بۆچارەسەری نارکۆلیپسی (خەوالّوبی توند) و نەخۆشی کەمبوونی هۆشیاری و ئاگاداری و نەخۆشی زۆر چالاکبوون (ADHD) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ناجێگیری، بێخەوی، زیادبوونی لێدانی دڵ ئازاری سك. کەمبوونەوەی کێش، تێکچوونی خەو، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** بۆ نارکۆلیپسی ٥ تا ٦٠ میلی گرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. منالآنی ٦ تا ١٢ ساڵ ٥ میلی گرام رۆژانە خۆراکی زیادکردنی بڕی دەرمان لەکاتی پێویست هەر هەفتەیەك ٥ میلی گرام منالآنی زیاتر لە ١٢ ساڵ ١٠ میلی گرام خۆراکی رۆژانە زیادکردنی بڕی دەرمان لەکاتی پێویست هەر هەفتەیەك ١٠ میلی گرام. بۆ ADHD منالآنی ٦ ساڵ و گەورەتر ٥ میلی گرام ١ یان ٢ جار لە رۆژێکدا. زیادکردنی بڕی دەرمان لەکاتی پێویست هەر هەفتەیەك ٥ میلی گرامە. بڕی دەرمان هەمووی بەدەگمەن لە ٤٠ میلی گرام تێدەپەڕێت. منالآنی ٣ تا ٥ ساڵ ٢,٥ میلی گرام خۆراکی زیادکردنی بڕی دەرمان لەکاتی پێویست هەر هەفتەیەك ٢,٥ میلی گرامە. بۆ چارەسەری دەوەکۆتای قەڵەوی نائاسایی گەورەکان ٥ تا ٣٠ میلی گرام رۆژانە خۆراکی ٣٠ تا ٦٠ خولەك پێش لە خواردن لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## دیکسترۆمیثۆرفان: HBR DEXTROMETHORPHAN

**ناوی بازرگانی:** Mediquel,Benylin,koffex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥ میلی گرامی و کەپسولی ١٥ میلی گرامی و قەترەی خۆراکی ٤ میلی گرامی شروبی ١٥ میلی گرام/٥میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antitussive

**بەکارهێنان:** دژی کۆکەیەکی وشکی موزمین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، تەمەڵی، رشانەوە، هێڵنجدان، تێکچوونی هەرس، گێژی، ئازاری سك، خەوالّوبی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و تەمەنی سەروی ١٢ ساڵ ١٠تا ٣٠ میلی گرام رۆژانە هەر ٤ تا ٨ سەعات جارێك، لایەنی زۆری بڕی دەرمان رۆژانە ١٢٠ میلی گرامە، منالآنی ٦ تا ١٢ ساڵ ٥ تا ١٠ میلی گرام هەر ٤ تا ٨ سەعات جاری، منالآنی ٢ تا ٦ ساڵ ٢,٥ تا ٧,٥ میلی گرام هەر ٤ تا ٨ سەعات جارێك،لایەنی زۆری بڕی دەرمان رۆژانە ٦٠ میلی گرامە.



## دێکسترومیثورفان پی: P DEXTROMETHORPHAN

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی شەربەتی دیکسترۆمیپورفان هایدرۆبرۆماید ١٥میلی گرام /٥ میلی لیتر+ سیودۆئیفیدرین هایدرۆکلۆراید ٣٠میلی گرام/٥میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antitussive

**بەکارهێنان:** دژی کۆکەی وشك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، تەمەڵی. ڕشانەوە. هێڵنجدان، ئازاری سك، خەواڵویی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ١٠ سیسی هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك، تا لایەنی زۆر ڕۆژانە ٤٠ سیسی. منداڵانی ٦ تا ١٢ ساڵ ڕۆژانە ٥ سیسی هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك. منداڵانی ٢ تا ٦ ساڵ ڕۆژانە ٢,٥ سیسی هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك.

## دێکسترۆمۆرامايد: DEXTROMORAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Palfium

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی و شاف و خۆراکی هەیە.

**گروپی دەرمان:** Analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری مامناوەند و توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خەواڵویی.

**بڕی دەرمان:** بەبڕی دەرمانی پێویست و گونجاو بەکاردێت.

## دێکسترۆپرۆپۆکسیفین: DEXTROPROPOXYPHENE

**ناوی بازرگانی:** Doxolene

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی خۆراکی هەیە.

**گروپی دەرمان:** Analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری سوك و مامناوەند لەگەڵ دژە ئازارەکانی تردا وەك کۆپرۆکسامۆڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژبوون، هێڵنجدان. ڕشانەوە، بێخەوی.

**بڕی دەرمان:** بەپێی پێویست بەکاردێت.



## دێکستڕۆز: (DEXTROSE (D GLUCOSE

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٪ و ١٠٪ و ٢٠٪و ٥٠٪.

**گروپی دەرمان:** کاربۆهایدرەیت.

**بەکارهێنان:** دابینکەری وزە و خۆراکی پێویستی لەشە و بۆ چارەسەری کەمبوونەوەی شەکری خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژبوون، کۆبوونەوەی ئاو لەسی دا، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٥ میلیگرام/کیلۆگرام لە هەر سەعاتێکدا و منالان ٠,٢٥ گرام لەگیراوەی ٢٠٪.

## دێکستڕۆز و ئەلکهولی ٥٪: DEXTROSE ٥٪ ALCOHOL٥٪

**شێوەی دەرمان:** ئینفیوشنی دەمار IV ١٠٠٠میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** دابینکەری وزەی لەش.

**بەکارهێنان:** بۆ دابین کردنی خۆراك و وزەی پێویستی لەش بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ لیتر IV ئینفیوشنی لەسەرخۆ، منالانیش ٤٠ میلیگرام/ کیلۆگرام IV ئینفیوشن. بە ٣٥٠ تا ١٠٠٠ میلیلیتر لە ٢٤ سەعاتدا.

## دایەزیپام: DIAZEPAM

**ناوی بازرگانی:** Diastat, Valium,diazemuls

**شێوەی دەرمان:** حەب ٢ و ٥ و ١٠ میلیگرامی ودەرزی ٥ میلیگرام/میلیلیتر و شاف ٥ و ١٠میلیگرام ئینیما ـەری کۆمەوە ٥ و ١٠میلیگرام.

**گروپی دەرمان:** Hypnotic, Anxiolytic, sedative

**بەکارهێنان:** خەوهێنەر و هێورکەرەوەیە و دژی دڵەڕاوکێ و فێ و لەرزین و گرژبوونی ماسولکە و ترس و قەلەقی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەمۆکی، هیلاکبوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، دابەزینی پەستانی خوێن، گیرانی میز، پەڵە، ناڕەحەتی سك، زۆرلیدانی دڵ، قەبزی، گێژی، خەواڵوی، وشکبوونەوەی دەم، تەنگەنەفەسی، کەمخوێنی، نازاری ماسولکە، تێکچوونی بینین، سوربونەوەی پیست.

**بڕی دەرمان:** بڕی دەرمان پەیوەندی بە جۆری نەخۆشی یەوە هەیە بۆ چارەسەری تەشەنوج گەورەکان ٢ تا ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار. منالانی گەورەتر لە ٦ مانگ ١ تا ٢,٥ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار.

بڕی دەرمان بەپێی تەحەمول و پێویستی نەخۆش زیاد دەکرێت. بۆ دڵەڕاوکێ پەیوەستە بەتوندی نەخۆشی یەوە بۆ کرژبوونی ماسولکە گەورەکان ٢ تا ١٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار. یان ٢ تا ١٠ میلی‌گرام ماسولکەیی یان دەماری هەر ٣ تا ٤ سەعاتێك لەکاتی پێویست. منداڵانی گەورەتر لە ٦ مانگ ١ تا ٢,٥ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. زیادکردنی تەدریجی بڕی دەرمان بەپێی تەحەمول و پێویستی نەخۆشە. بۆ تەرکردنی ئەلکهول گەورەکان ١٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار لە ٢٤ سەعاتی یەکەم و پاشان ٥ میلی‌گرام ٣ تا ٤ جار ڕۆژانە لەکاتی پێویست و بە ١٠ میلی‌گرام ماسولکەیی یان دەماری لەسەرەتادا و پاشان ٥ تا ١٠ میلی‌گرام هەر ٣ تا ٤ سەعات لەکاتی پێویست. بۆ چارەسەری یارمەتیدەر بۆ ئاندۆسکۆپی گەورەکان ٥ تا ١٠ میلی‌گرام ماسولکەیی ٣٠ خولەك پێش لە نەشتەرگەری و یان دەماری لەسەرخۆ پێش لە ئاندۆسکۆپی.

**دایەزۆکساید: DIAZOXIDE**

**ناوی بازرگانی:** Hyperstat,eudemine, Proglycem

**شێوەی دەرمان:** کەپسوڵی ٥٠ و ١٠٠میلی‌گرامی و دەرزی ١٥میلی‌گرام/میلی‌لیتر (٢٠میلی لیتر).

**گرووپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** دژی پەستانی بەرزی خوێن و کەمی ڕێژەی شەکری خوێن بەهۆی زیادبوونی ئەنسۆلینەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێتەوی، بێهێزی، تەشەنوج، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، شۆك، ئازاری سنگ، خوران، سووربوونەوە. زۆرلێدانی دڵ. قەبزی، ئازاری سك، پەڵە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی بینین. کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن، زیادبوونی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٣ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە IV هەر ٥ تا ١٥ خولەکێك، (لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٥٠ میلی‌گرامە)، لە هایپۆگلیسیمیا(کەمی ڕێژەی شەکری لە خوێن) دا گەورەکان و منداڵان ٣ تا ٨ میلی‌گرام/کیلۆگرام خۆراکی، ڕۆژانە لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراوی یەکساندا.

**دیکلۆفیناك داینەثیل ئەمۆنیۆم: DICLOFENAC DIETHYL AMMONIUM**

**ناوی بازرگانی:** Emul gel,voltaren

**شێوەی دەرمان:** جێلی ١٪.

**گرووپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازارو ئیلتیهابی مەوزوعی ماسولکەو ڕۆماتیزم و جومگە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سووربوونەوەی پێست. ڕوشانی مەوزوعی، بلۆقکردنی پێست.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٣ تا ٤ جار و بەبڕی پێویست و بەمەوزوعی بەو شوێنەدا بماڵرێت.

**دیکلوفیناك صۆدیۆم:** DICLOFENAC SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Voltaren,Volraman,Voltarol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ و ٧٥ میلیگرامی و شافی ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی و دەرزی ٧٥ میلیگرامی ماسولکەیی و حەب و کەپسولی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازارو ئیلتیهاب و هەوکردنی فەقەرەکان و ڕۆماتیزم و ئێش و ئازاری جومگەکان و هەوکردنی جومگەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تەشەنوج، سەرئێشە، سەرگێژبوون. ئازاری سك. سکچوون، قەبزی. ئازاری قەفەسەی سنگ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، خوران، پەڵە، بیرۆ. هەستیاربوون بەڕوناکی، هێڵنجدان، گەورەبوونی سك، خوێنبەربوون، دروست بوونی برینی گەدەو دوانزەگرێ. کەمخوێنی. تەنگەنەفەسی، کەمبوونەوەی کێش، شەوکوێری، ڕەبو، کەمبوونەوەی شەکری خوێن، سوتانەوەی چاو، تێکچوونی پلەی گەرمی لەش، کەمبوونەوەی توانای بیستن، ڕوشان، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥ تا ١٥٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٣ جار، یان ١ تا ٢ حەب یان ١شاف ١ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا. بۆ ڕۆماتیزم گەورەکان ١٥٠ تا ٢٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە بەشێوەی دابەشکراو. ئیلتیهابی جومگە گەورەکان ١٠٠ تا ١٥٠ میلیگرام خۆراکی یان لەڕێگەی کۆمەوە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا لە ماوەی ڕۆژێکدا. بۆ چارەسەری ڕۆماتیزمی نەوجەوانان منالآن ١ تا ١٢ ساڵ ١ تا ٣ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی یان لە ڕێگەی کۆمەوە. بۆ هەوکردنی فەقەرەکان گەورەکان ٢٥ میلیگرام خۆراکی ٤ جار لە ڕۆژێکدا و یەك بڕی دەرمانی زیادکراو ٢٥ میلیگرامی پێش لە خەوتن. دژی ئازاری بێ نوێژی سەرەتایی گەورەکان ٥٠ میلیگرام خۆراکی ٣ جار لە ڕۆژێکدا. بۆ بەرگری لە ئازار و ئیلتیهابی دەم و ددان ٢٥ یان ٥٠ میلیگرام حەبی خۆراکی بەپێی پێویست، ٢ تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا یان ماسولکەیی ٢ جار لە ڕۆژێکدا بەکاردێت.

**دیکلوفیناك سۆدیۆم:** DICLOFENAC SODIUM OPH.

**ناوی بازرگانی:** Voltaren

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,١٪

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهاب و ئیلتیهابی چاو دوای نەشتەرگەری ئاوی سپی چاو (کاتاراکت) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشان، کزانەوەی چاو، هەوکردنی کۆرنیەی چاو، ئیلتیهابی چاو، خوران.

**بڕی دەرمان:** ١ قەترە ڕۆژانە ٤ جار لە ٢٤ سەعاتدا پاش لە نەشتەگەری تا ٢ هەفتە پاش لە نەو کاتە.

### دیکلۆکساسیلین: DICLOXACILLIN

**ناوی بازرگانی:** Dynapen

**شێوەی دەرمان:** کەپسوڵی ١٢٥ و ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی و گیراوەی ٦٢,٥ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی سی و بۆریچکەکان و پێست و هەوکردنی شانە نەرمەکان و هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە و هەوکردنی گەروو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، ئازاری سك، نەمانی ئارەزوی خواردن، زەردی، پەڵە، خوران، سەرئێشە، ڕشانەوە، تەشەنوج.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥٠ تا ٥٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٤ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢ گرامە لە ڕۆژێکدا. منداڵانی کەمتر لە ٤٠ کیلۆگرام ١٢.٥ تا ١٠٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا و دابەشکراو لە ڕۆژانە ٤ جار دا و بەگەدەی خاڵی.

### دیسایکلومین: DICYCLOMINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Dilomine, Merbentyl

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٠ میلیگرامی و شروبی ١٠ میلیگرام/٥میلیلیتر و دەرزی ١٠ میلیگرام/میلیلیتر (٢میلی لیتر).

**گرووپی دەرمان:** Anticholinergic

**بەکارهێنان:** بۆ کەمکردنەوەی کرژبوونی لوسەماسولکە و دژی ئازارەکانی دەزگای هەرس، دەرمانی یارمەتیدەر لە سکچوون،تێکچوونی فرمانی گەدە و ڕیخۆڵە و گرژبوونی کۆڵۆن (IBS) و ئازاری سکی شیرخۆران ، برینی گەدەو ڕیخۆڵە، هەوکردنی کۆڵۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی دەم، زیاد لێدانی دڵ، تینویەتی، گێژبوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، تا، سەرئێشە، سەرگێژبوون، تێکچوونی بینین، زیادبوونی پەستانی چاو IOP، گیرانی میز، هیلاکبوون.

**بڕی دەرمان:** بۆ تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە و گرژبوونی کۆڵۆن گەورەکان خۆراکی ١٠ تا ٢٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار، یان ٢٠ میلیگرام ماسولکەیی هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك، بۆ منداڵی گەورەتر لە ٢ساڵ ١٠ میلیگرام خۆراکی ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا. بۆ منداڵی گەورەتر لە ٦ مانگ بچوکتر لە ٢ ساڵ ٥ تا ١٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. بۆ ژانی شیرخۆرەکان منداڵی گەورەتر لە ٦ مانگ ٥ تا ١٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار.

## دیدانۆساین: DIDANOSINE

**ناوی بازرگانی:** Videx

**شێوەی دەرمان:** حەب و کەپسولی ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسیHIV بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەوکردنی پەنکریاس، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمخوێنی، بێخەوی، تەشەنوج، سەرئێشە، سوربونەوەی پێست، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان زیاتر لە ٦٠ کیلۆگرام ٢٠٠ میلیگرام خۆراکی هەر ١٢سەعاتێك، گەورەکانی کەمتر لە ٦٠ کیلۆگرام ١٢٥میلیگرام خۆراکی هەر سەعاتێك ، منالان ١٢٠میلیگرام/مەتردوجا خۆراکی هەر ١٢سەعاتێك، بۆ بەرگری لە تێکشکانی بە ترشەڵۆکی گەدە، منالانی زیاتر لەیەك ساڵ ٢ حەب لە بڕێکی دەرماندا و کەمتر لە١ساڵ ١حەب لە بڕێکی دەرماندا.

## داینسترول: DIENESTROL

**ناوی بازرگانی:** Estraguard , cycladiene

**شێوەی دەرمان:** کرێمی ژنانە ٠,٠١٪.

**گروپی دەرمان:** Vaginal oestrogen

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پوکانەوەی زایەندی ژنان و وشکبوونەوە و چرچبوونی زایەندی ژنان بەهۆی کەمبوونی ئیسترۆجین پاش لە لەحەیزچونەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی هەرس، خوێنبەربوونی منداڵدان، ئازاری مەمك.

**بڕی دەرمان:** ١ نەپیکالیتۆر لە دەرمان ١ تا ٢ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ١ تا ٢ هەفتە. بڕی دەرمانی پاراستن ١ نەپیکالیتۆر ١ تا ٣ جار لەهەفتەیەکدا بۆ ماوەی ٣ هەفتە لە مانگێکدا.

## دایەثیل کاربامازین: DIETHYLCARBAMAZINE CITRATE

**ناوی بازرگانی:** Hetrazon, filarridan

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anthelmintic

**بەکارهێنان:** دژی کرمە و دژی کرمی ئەسکاریس و فیلاریاسس بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری جومگە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، خاوی، خەواڵویی، نەمانی ئارەزوی خواردن، تێکچوونی هاوسەنگی، تەنگەنەفەسی. تا، خراپبوونی پێست، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان لە نەسکاریاسس و ئەنۆزینۆفیلی ترۆپیکاڵ ١٣ میلیگرام/کیلۆگرام بەیەك بڕ، ڕۆژانە بۆ ماوەی ٧ تا ١٠ ڕۆژ. منالآن ٦ تا ١٠میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٣ جار بۆ ماوەی ٧ تا ١٠ ڕۆژ. لەفیلاریاسس ٢ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٣ جار بو ماوەی ٣ تا ٤ هەفتە.

**داینەئیستیبیسترول:** DIETHYLSTILBESTROL

**ناوی بازرگانی:** Apstil,tampovagan,Stilbestrol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ و ٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplasm

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پرۆستات و مەمك و بەرگری لە سکپڕی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، کۆبوونەوەی صۆدیۆم لەلەشدا، ئۆدیما، گەورەبوونی مەمك لەپیاواندا، لەپیاوەتی کەوتن.

**بڕی دەرمان:** لە شێرپەنجەی پرۆستات ڕۆژانە ١ تا ٣ میلیگرام. بۆ شێرپەنجەی مەمك ڕۆژانە ١٠ تا ٢٠ میلیگرام. لە بەرگری سکپڕیدا ٢٥ میلیگرام ٢ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ (ئەڵبەتە لایەنی زۆر ٧٢ سەعات پاش لە نزیکی نەبێت **بەکارهێنان**ی دەرمان دەست پێبکات).

**دیفلونیسال:** DIFLUNISAL

**ناوی بازرگانی:** Dolobid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهابی جومگەکان و بۆ چارەسەری ئیلتیهاب و تا و هەوکردنی جومگەکان و بۆ لابردنی ئازار بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تێکچوونی گەدە، خوێنبەربوون، زرنگانەوە، پەڵە، سکچوون، گێژبوون، دڵەکزە، کرژبوونی سك، پەڵە، برینی گەدە و ڕیخۆڵە، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا.

**بڕی دەرمان:** بۆ ئازار ٥٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار، بۆ هەوکردنی جومگەکان ٥٠٠ تا ١٥٠٠ میلیگرام لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.



## دایجێستیف: DIGESTIVE

**ناوی بازرگانی:** festal,onoton

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەب.

**گرووپی دەرمان:** ئەنزیمی هەرس.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری تێکچوونەکانی هەرس بەهۆی نەخۆشی کیسەی زراو جگەرو پەنکریاسەوەو کاری نەشتەرگەری گەدە و بۆ چارەسەری غازاتی سك و نەخۆشیە موزمینەکانی گەدە و ریخۆڵە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، ئازاری سك.

**بڕی دەرمان:** رۆژانە ٢ تا ٣ حەب لەگەڵ خواردن یان پاش لەخواردن بەکاردێت.

## دیجۆکسین: DIGOXIN

**ناوی بازرگانی:** Lanoxin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٢٥ میلیگرامی و دەرزی ٠,٢ میلیگرام/میلیلیتر،٢میلیلیتر و شەربەتی ٠,٠٥ میلیگرام/میلی لیتر(٦٠میلی لیتر) و قەترەی خۆراکی ٠,٥ میلی گرم میلیلیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antiarrhythmic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەککەوتنی دڵ و ناریکی لێدانەکانی دڵ ناتەواوی دڵ و پەککەوتنی دڵی خوێنتێراو و لەرزین و لەرینەوەی سکۆڵە و گوێچکەڵە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، هیلاکبوون، هێڵنجدان، تێکچوونی بینین، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری سك، سکچوون، گۆرینی ECG - رشانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان لەسەرەتادا ٠,٥ تا ١ میلیگرام خۆراکی یان دەمار رۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا دۆزی جێگیر و پارێزراو ٠,١٢٥ تا ٠,٥ میلیگرام رۆژانە خۆراکی یان بەدەمار، تەمەنی زیاتر لە ٦٥ ساڵ لەسەرەتادا ٠,١٢٥ رۆژانە خۆراکی، منالآنی گەورەتر لە ٢ سال لەسەرەتادا ٠,٠٢ تا ٠,٠٤ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی رۆژانە هەر ٨ سەعاتێك، دۆزی جێگیرو پارێزراو ٠,٠١٢ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی رۆژانە هەر ١٢ سەعاتێك. منالآنی ١مانگ تا ٢ ساڵ لە سەرەتادا ٠,٠٣٥ تا ٠,٠٦ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی رۆژانە لە٣ دۆزدا، دۆزی جێگیرو پارێزراو ٠,٠٢ تا ٠,٠١ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی رۆژانەدابەشکراو لە هەر ١٢ سەعاتێکدا. منالآنی بچوکتر لە ١ مانگ لەسەرەتادا ٠,٠٣٥ میلیگرام/ کیلۆگرام رۆژانە خۆراکی دابەشکراو لە هەر ٨ سەعاتێکدا، دۆزی جێگیرو پارێزراو ٠,٠١ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی رۆژانە دابەشکراو لە هەر ١٢ سەعاتێکدا. ساوایان لەسەرەتادا ٠,٠٢٥ میلیگرام/ کیلۆگرام بە دەمار رۆژانە لە ٣ دۆزی دابەشکراودا. دۆزی جێگیرو پارێزراو ٠,٠١ میلیگرام/کیلۆگرام رۆژانە بەدەمار دابەشکراو لە هەر ١٢ سەعاتێکدا.

## دیجۆکسین ئیمیون فاب: DIGOXIN IMMUNE FAB

**ناوی بازرگانی:** Digibind

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ٤٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidote

**بەکارهێنان:** دژی ژەهراوی بوون بە دیجۆکسین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی توند. نارێکی لێدانی دڵ، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆمی لەش، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** ٤٠ میلیگرام لە AB ٠٫٦ میلیگرام دیجۆکسین لادەبات.

## دایهایدرۆکۆداین: DIHYDROCODEINE

**ناوی بازرگانی:** DHC continus,DF١١٨ Forte

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦٠ و ٩٠ و ١٢٠ میلیگرامی و حەبی ٤٠ میلیگرامی و حەبی ٣٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ١٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و دەرزی ٥٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری مامناوەند و توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان. گێژبوون. قەبزی. ئازاری سك، وشکی دەم، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ. گێژی، سوربونەوە، پەڵە، خوران، تێکچوونی خەو، لاوازی سێکسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بە خۆراکی ٣٠ میلیگرام هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك لە کاتێکدا پێویستدا بێت. منداڵانی گەورەتر لە ٤ ساڵ ٠٫٥ تا ١ میلیگرام/کیلۆگرام هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك.بە ژێرپێستی قوڵ یان ماسولکەیی قوڵ تا ٥٠ میلیگرام دووبارەدەکرێتەوە هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك ئەگەر پێویست بێت. منداڵانی گەورەتر لە ٤ ساڵ ٠٫٥ تا ١ میلیگرام/کیلۆگرام هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك. حەبی(DF١١٨ Forte ) گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١٢ ساڵ بۆ ئازاری توند، ٤٠ تا ٨٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣جار. لایەنی زۆر ڕۆژانە ٢٤٠ میلیگرامە.حەبی ( DHC continus) گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١٢ ساڵ بۆ ئازاری توندی موزمین، ٦٠ تا ١٢٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك.

## دایهایدرۆئێرگۆتامین: DIHYDROERGOTAMINE

**ناوی بازرگانی:** Migranal

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٫٥ و ٢٫٥ میلیگرامی و دەرزی ١ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Ergot Alkaloid



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەرو بەرگری لە ئازاری توندی سەر و سەرئێشە موزمینەکان و شەقیقە و کلاستەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی بینین. وشکبوونەوەی دەم، زیادبوون و کەمبوونەوەی لێدانی دڵ بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، هەوکردنی لوت، هەوکردنی گەروو، جیوب، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان خۆراکی ١ تا ٣ میلیگرام ڕۆژانە خۆراکی و یان ١ تا ٢ حەب و دووبارەکردنەوەی هەر ٣٠ خولەکێك یان ١ میلیگرام ئەمپول لەڕێی ماسولکەیی یەوە. لانی زۆری بڕی دەرمان ٦ میلیگرامە.

## دایهایدرۆئێر گۆتۆکسین: DIHYDROERGOTOXINE

**ناوی بازرگانی:** Hydergine , gerimal

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١,٥ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Ergot Alkaloid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی عەقڵی لەپیریدا (لەبیرچوون و بێ ئاگابوون، تێکچوونەکانی دەروونی و عەقڵی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، برینی دەم، سەرگێژبوون، ئیلتیهابی زمان.

**بڕی دەرمان:** ١ میلیگرام ٣ جار لە ڕۆژێکدا و بەتەدریجی بە ٦ میلیگرام دەگات لە ڕۆژێکدا تا ٦ مانگ.

## دای هایدرۆتاکیسترۆل: DIHYDROTACHYSTEROL

**ناوی بازرگانی:** Hytakerol

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی خۆراکی ٠,٢٥ میلیگرام/میلیلیتر.

**گرووپی دەرمان:** Vitamin، D analogue

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونی کالسیۆم بەهۆی هایپۆپاراپایرۆدیسم و سیدۆ هایپۆپاراپایرۆدیسم و کەمی عوستت و کەمی ڤیتامین D و ناتەواوی گورچیلە و پوکانەوەی ئێسك و بۆ پێشگری کەمبوونی کالسیۆم بەهۆی پایرۆدیکتۆمی (برینی پایرۆد) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، خەمۆکی، ڕشانەوە، سەرئێشە، وشکبوونەوەی دەم، نەمانی ئارەزوی خواردن، بێهۆشی. قەبزی، هیلاکبوون، ئارەقکردن، ئازاری سك.

**بڕی دەرمان:** بۆ کەمبوونەوەی کالسیۆم بەهۆی هایپۆپاراپایرۆدیسم و سیدۆ هایپۆپاراپایرۆدیسم گەورەکان ٠,٨ تا ٢.٤ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە لەسەرەتادا، بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە ٠,٢ تا ٢ میلیگرامە. ٣ جار



لەرۆژدا و منالآن ١ تا ٥ میلیگرام رۆژانە، بۆ ماوەی ٤ رۆژ خۆراکی پاشان رۆژانە ٠,٥ تا ١,٥ میلیگرامە. ساواکان ٠.٠٥ تا ٠.١ میلیگرام رۆژانە خۆراکی. بۆ پێشگری کەمبوونی کالسیۆم بەهۆی پایرۆدیکتۆمی گەورەکان ٠.٢ میلیگرام رۆژانە لەگەڵ کالسیۆمی تەواو تا نەهێشتنی هایپۆکاسیۆمی (کەمبوونەوەی کالسیۆم).

**دایلۆکسانید:** DILOXANIDE

**ناوی بازرگانی:** Furamid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی

**گروپی دەرمان:** Amoebicides

**بەکارهێنان:** دژی ئەمیبا و مشەخۆرەکان و دژی هەوکردنی ئەمیبی ریخۆڵەیی و ئالودەبوون پێیانەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، ئازاری سک، غازات، رشانەوە، شەرا، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ میلیگرام رۆژی ٣ جار بۆ ١٠ رۆژ و منالآن کێشی سەروی ٢٥ کیلۆگرام ٢٠ تا ٢٥ میلیگرام/کیلۆگرام رۆژانە لە ٣ بڕی یەکساندا بۆ ماوەی ١٠ رۆژ. کێشی خواری ٢٥ کیلۆگرام منالی ١ مانگ تا ١٢ ساڵ ٦.٦ میلیگرام/کیلۆگرام رۆژانە ٣ جار بۆ ماوەی ١٠ رۆژ.

**دیلتیازم:** DILTIAZEM HCL

**ناوی بازرگانی:** Adizem , dilzem, cardizem

**شێوەی دەرمان:** حەب و ٣٠ و ٩٠ و ٦٠ و ١٢٠میلیگرامی و کەپسولی ١٢٠ و ١٨٠ و ٢٤٠ و ٣٠٠ و ٣٦٠ و ٤٢٠ و ٣٠ و ٩٠ و ٦٠ میلیگرامی و ڤیالی ١٠٠ میلیگرامی..

**گروپی دەرمان:** Calcium antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری مۆزمینی سنگ و بۆ بەرگری لە جەڵدەی دڵ و نارێکی لێدانی دڵ و بۆ پێشگری لە شەقیقە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، کەم لێدانی دڵ، دابەزینی پەستانی خوێن، سەرئێشە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، شەومیزکردن، سەرگێژبوون، خەمۆکی، خەواڵویی، نارێکی لێدانی دڵ هێڵنجدان، رشانەوە، پەڵە، ئۆدیما، گێژبوون، خوێنبەربوون.

**بڕی دەرمان:** بۆ ئازاری سنگ ٣٠ میلیگرام ٣ تا ٤ جار لەرۆژێکدا پێش لە خواردن و پێش لە خەوتن. ئەگەر پێویست بکات زیاد دەکرێت بۆ ٣٦٠ میلیگرام لە رۆژێکدا لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ پەستانی بەرزی خوێن گەورەکان ١٨٠ تا ٢٤٠ میلیگرام خۆراکی حەب یان کەپسول رۆژانە جار. بۆ لەرزین و لەرینەوە و زیاد لێدانی دڵ سەروسکۆڵەیی ٠.٢٥ میلیگرام/کیلۆگرام بە دەماری لە ماوەی ٢ خولەکدا.

**دایمێن هایدرینەیت: DIMENHYDRINATE**

**ناوی بازرگانی:** Dramamine , dramilin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiemetic

**بەکارهێنان:** دژی هێڵنجدان و سەرگێژبوون و ڕشانەوەی سەفەر و تێکچوونی تەوازن بەهۆی هەوکردنی گوێی ناوەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، وشکبوونەوەی دەم، سەرگێژبوون، خەوالویی. تەشەنوج، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن. قەبزی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار. منداڵی ٦ تا ١٢ ساڵ ٢٥ تا ٥٠ میلی‌گرام هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك ( لایەنی زۆر ڕۆژانە ١٥٠ میلی‌گرامە). منداڵی ٢ تا ٦ ساڵ ١٢.٥ تا ٢٥ میلی‌گرام هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك ( لایەنی زۆر ڕۆژانە ٧٥ میلی‌گرامە).

**دایمێرکاپرول: DIMERCAPROL**

**ناوی بازرگانی:** Bal

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (٣میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Chelating agent

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری ژەهراوی بوون بە ئارسنیك و ئاڵتون و بیسمۆس وپالیۆم و جیوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بێهۆشی، سەرئێشە، ناجێگیری، دڵەڕاوکێ، سوتانەوەی لێو. ئازاری ددان، ئازاری سك، تا، ڕەقکردنەوە. زیاد لێدانی دڵ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە. ئازاری ماسولکە، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** ٣میلی‌گرام/کیلۆگرام هەر ٤ سەعاتێك لە ٤٨ سەعاتی یەکەمدا و بە پێوانەی ٤ جار لەڕۆژی سێیەمدا و ٢ جار لە ڕۆژەکانی دواتر تا دەیەمین ڕۆژ بە شێوەی ماسولکەیی قوڵ دەرزی لێدەدرێت.

**دایمیثیکۆن: DIMETHICONE**

**ناوی بازرگانی:** Degas , mylicon

**شێوەی دەرمان:** حەبی کرماندن ٤٠ میلی‌گرامی و قەترەی خۆراکی ٤٠ میلی‌گرام/ میلی‌لیتر و ٤١,٢ میلی‌گرام میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** دژی غازاتی سك.

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری غازات و وەك دەرمانی یارەتیدەر بۆ چارەسەری برینی گەدە و ڕیخۆڵە و تێکچوونی هەرس و هەزم و ژانی شیرخۆر و وەك دەرمانی یارمەتیدەر لە ڕادیۆگرافی ڕیخۆڵەدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، دڵەکزە، قەبزی، سکچوون، لەرزین.

**بڕی دەرمان:** وەك چارەسەری یارمەتیدەر بۆ کۆبوونەوەی غازات لە گەدە و ڕیخۆڵدا گەورەکان ١٢٥ تا ٢٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار پاش لە خۆراك و لەکاتی خەودا. وەك دەرمانی یارمەتیدەر لە ڕادیۆگرافی ڕیخۆڵەدا ٤٧ میلیگرام لە ٢,٥ میلیلیتر ناودا، بەیەك بڕی دەرمان،لە ژانی منالی شیرەخۆردا ٢٠ تا ٤٠ میلیگرام لەگەڵ خۆراکدا.

## دای مەثیل سەلفۆکساید: DIMETHYL SULFOXIDE

**ناوی بازرگانی:** Rimso٥٠

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ٪٥٠ (٥٠ میلیلیتر /ڤیاڵ).

**گروپی دەرمان:** Antiinflammatory

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی میزەڵدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** پەڵە، حەساسیەت، ڕوشانی پێست، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** ٥ میلیلیتر لە گیراوەی ٥٠٪نەکرێتە ناوەوەی میزەڵدان.

## دیفنهایدرامین کەمپاوند: DIPHENHYDRAMINE COMPOUND

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی شروبی (دیفین هایدرامین هایدرۆکلۆراید ١٢,٥میلیگرام /٥میلیلیتر + کلۆریدی ئەمۆنیۆم ١٢٥میلیگرام/٥میلیلیتر +صۆدیۆم سیترەیت ٥٠ میلیگرام/٥میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antitussive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سەرمابوون و دژی کۆکە و حەساسیەت و بۆ کپکردنەوەی کۆکە و حەساسیەتی لوت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بێخەوی، لەرزین، سەرگێژبوون، سەرئێشە، وشکبوونەوەی دەم، قەبزی، خەواڵویی، تەشەنوج، ڕەبۆ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ تا ١٠ میلی لیتر هەر ٢ تا ٣ سەعات ١ جار،لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٤٠ میلی لیترە. منالی ٦ تا ١٢ ساڵ ٥ میلی لیتر هەر ٣ تا ٤ سەعاتێك، منالی ١ تا ٥ ساڵ ٢,٥ میلی لیتر هەر ٣ تا ٤ سەعاتێك.



## دیفینهایدرامین: DIPHENHYDRAMINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Benadryl,mednex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ میلیگرامی و دەرزی ٥٠ میلیگرام/میلیلیتر و حەبی کرماندن ١٢,٥ میلیگرام و ئیلیکزیر ١٢,٥ میلیگرام/٥میلیلیتر و شروبی ١٢,٥ میلیگرام/٥میلیلیتر و کرێمی ٢٪.

**گرووپی دەرمان:** H١-receptor antagonist

**بەکارهێنان:** دژی حەساسیەت و خەوهێنەرە و بۆچارەسەری کۆکە و ناوکردنی چاو و پرخوێنی چاو و نەو نەخۆشی یە پێستیانەی خورانیان لەگەڵدایە و بۆ بێخەوی و سەرمابوون و پژمین و شەرا و حەساسیەتی توند و حەساسیەتی لوت و نەخۆشی پارکینسۆن و بۆ چارەسەری سەرگێژبوون و هێڵنجدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تەشەنوج، تێکچوونی بینین، وشکبوونەوەی دەم، قەپزی. سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، تا، زیادبوونی لێدانی دڵ. هێڵنجدان، رشانەوە، سکچوون، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، گیرانی میز. کەمبوونەوەی خرۆکەسپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** بۆ هەوکردنی لوت و نیشانەکانی حەساسیەت و نەخۆشی سەفەر و نەخۆشی پارکینسۆن گەورەکان و منداڵی سەروی ١٢ ساڵ ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام خۆراکی هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك، لانی زۆری بڕی دەرمانی رۆژانە ٤٠٠ میلیگرامە. منالی خوار ١٢ ساڵ یان بەلانی کەم کێشی ١٠ کیلۆگرام ١٢,٥ تا ٢٥ میلیگرام خۆراکی ٣ تا ٤ جار لەرۆژێکدا (لانی زۆری بڕی دەرمانی رۆژانە ٣٠٠ میلیگرامە). بۆ چارەسەری سەرگێژبوون و هێڵنجدان گەورەکان ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام خۆراکی هەر ٦ سەعاتێك. خەوهێنەر گەورەکان و منالانی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام پێش لە خەوتن. بۆ کۆنترۆڵکردنی جوڵەی نارێك گەورەکان ٢٥ میلیگرام رۆژانە ٣ جار پاشان ٥٠ میلیگرام رۆژانە ٤ جار. بۆ کۆکەی بێ بەڵغەم گەورەکان و منالانی سەروی ١٢ ساڵ ٢٥ میلیگرام خۆراکی هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك، لانی زۆر ١٥٠ میلیگرامە. منالانی ٦ تا ١٢ ساڵ ١٢,٥ میلیگرام خۆراکی هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك، لانی زۆر ٧٥ میلیگرامە. منالانی ٢ تا ٦ ساڵ ٦,٢٥ میلیگرام خۆراکی هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك. لانی زۆر ٢٥ میلیگرامە.

## دایفینۆکسیلەیت و ئەترۆپین: DIPHENOXYLATE&ATROPINE

**ناوی بازرگانی:** Lomotil,lonox

**شێوەی دەرمان:** حەبی (٢,٥ میلیگرام دایفینۆکسیلەیت هایدرۆکلۆراید + ٢٥ مایکرۆگرام ئەترۆپین سەلفەیت ).

**گرووپی دەرمان:** Antidiarrheal

**بەکارهێنان:** دژی سکچوونی توند بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك. نەمانی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، خوران، تا، ناجێگیری، وشکبوونەوەی دەم، قەبزی، ڕشانەوە، خەوالّویی، زیادبوونی لێدانی دڵ، سەرگێژبوون، هێڵنجدان، گەورەبوونی چاو، گەورەبوونی سك، گیرانی میز.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٤ حەب، کەمدەکرێتەوە بۆ ٢ حەب هەموو ٦ سەعاتێك تا سکچوون کۆنترۆڵ دەکرێت. منالّانی ٢ تا ٤ ساڵ نیوەی حەبێك ڕۆژانە ٣ جار، منالّی ٤ تا ٩ ساڵ ١ حەب ڕۆژانە ٣ جار. منالّی ٩ تا ١٢ ساڵ ١ حەب ڕۆژانە ٤ جار. منالّی ١٢ تا ١٦ ساڵ ٢ حەب ڕۆژانە ٣ جار. منالّی ١٦ تا ١٨ ساڵ سەرەتا ٤ حەب، پاشان ٢ حەب ڕۆژانە ٤ جار.

## دیپیپانۆن: DIPIPANONE HCL

**ناوی بازرگانی:** Diconal

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٣٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Opioid analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری مامناوەند و توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکی دەم، قەبزی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، لەرزین، کەمبوونەوە و زیادبوونی لێدانی دڵ، تۆدیما، دڵەکوتێ، گێژی، خەوالّویی، تێکچوونی خەو، تێکچوونی هاوسەنگی، لاوازی سێکسی، گیرانی میز، سوربونەوە، نارەقکردنەوە، پەڵە، شەرا، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ ئازاری توند ١ حەب بەتەدریجی زیاد دەکرێت بۆ ٣ حەب هەموو ٦ سەعاتێك.

## دیپیڤیفرین: DIPIVEFRIN

**ناوی بازرگانی:** Propine

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,١٪.

**گروپی دەرمان:** Alpha adrenergic agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری گلوکۆما (ئاوی ڕەشی چاو)ی گۆشەی کراوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی چاو، سوتانەوەی چاو، سەرگێژبوون، تێکچوونی بینین، سەرئێشە، سوربونەوەی چاو، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، هەستیاربوون بە ڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ قەترە، ١ قەترە هەر ١٢ سەعات ١ جار.



## دیپایریدامۆڵ: DIPYRIDAMOLE

**ناوی بازرگانی:** Persantine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (٢میلی لیتر) وحەبی ٢٥ و ٧٥ و ١٠٠ میلی‌گرامی و کەپسولی ١٠٠ و ٢٠٠ میلی‌گرامی و سەسپێنشنی ٥٠ میلی‌گرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Vasodialator,Antiplatelet

**بەکارهێنان:** بۆ فراوانکردنی مولولەکانی خوێنی دڵ و کەمکردنەوەی کەڵەکەبوونی پەڕەکانی خوێن و ئازاری سنگ و بۆ بەرگری لەجەڵدەی دڵ و کلۆبوونی خوێن لە ناو مولولەکانی خوێندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، تێکچوونی بینین، سەرئێشە، تێکچوونی گەدە، گێژبوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، هیلاکبوون، پەڵە، ئازاری قەفەسەی سنگ، سکچوون، سوتانەوە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری ماسولکە، زیادبوونی لێدانی دڵ شەرا، کەمبوونەوەی پەڕەی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بڕی دەرمانی ئاسایی ٧٥ تا ١٠٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لەگەڵ ئەسپرین و وارفاریندا. بە دەرزی ٠,٥٧ میلی‌گرام/کیلۆگرام (تا ٦٠ میلی‌گرام) بەدەمار بۆ زیاتر لە ٤ خولەك.

## دیپایریدامۆڵ و ئەسپرین: DIPYRIDAMOLE & ASPIRIN

**ناوی بازرگانی:** Aggrenox

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی (٢٥ میلی‌گرام ئەسپرین/٢٠٠ میلی‌گرام ER دیپایریدامۆڵ)

**گروپی دەرمان:** Vasodialator,Antiplatelet

**بەکارهێنان:** بۆ فراوانکردنی مولولەکانی خوێن و ڕوونکردنەوەی خوێن و بۆ بەرگری لە جەڵدەی دڵ و ڕێ لە کلۆبوونی خوێنی ناو مولولەکانی خوێن دەگرێت و دژی کۆبوونەوە و کەڵەکەبوونی پەڕەکانی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** برین و خوێنبەربوونی دەزگای هەرس، حەساسیەت، پەڵە، گێژی، سەرئێشە، خەواڵویی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، خوێنبەربوون، تێکچوونی بیستن، کرژبوونی بۆری هەوا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ کەپسول (٢٥ میلی‌گرام ئەسپرین/٢٠٠ میلی‌گرام دیپایریدامۆڵ) خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا، بەیانیان و ئێواران.

بۆ: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## دیزۆپایرامید: DISOPYRAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Napamide,rythmodan,Norpace

**شێوەی دەرمان:** کەپسوڵی ١٠٠ و ١٥٠ و ٢٥٠ میلیگرامی و دەرزی ١٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiarrhythmic

**بەکارهێنان:** دژی نارێکی لێدانی دڵی سکوڵەیی، بەتایبەتی پاش لە خوێنلێبڕانی ماسولکەیی دڵ (سەکتەی دڵ) و نارێکی لێدانی دڵی سەرووسکوڵە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** قەبزی، سەرئێشە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، خرۆشان، سەرگێژبوون، هیلاکبوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئۆدیما، غازات، وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی بینین، گیرانی میز، کەمبوونەوەی شەکری خوێن، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان لەسەرەتادا ٣٠٠ میلیگرام خۆراکی و بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە ١٥٠ تا ٢٠٠ میلیگرام هەر ٦ سەعات ١ جار. بە IV ئینفیوشن لایەنی زۆر ٣٠٠ میلیگرام لە یەکەم سەعاتدا و ڕۆژانە ٨٠٠ میلیگرام. بە دەرزی IV لایەنی زۆر ١٥٠ میلیگرام.

## دیستیگمین: DISTIGMINE

**ناوی بازرگانی:** Ubretid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticholinesterase

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری (myasthenia gravis) بێهێزی ماسولکەیی و نەبوونی توانایی ڕێ ڕۆیشتن و گیرانی میز پاش نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی، زیادبوونی ئارەقکردنەوە. سکچوون، زیادبوونی لیك.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٥ میلیگرام نیوسەعات پێش نانی بەیانی.

## دیسولفیرام: DISULFIRAM

**ناوی بازرگانی:** Antabuse

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anti alcoholism

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خوگرتنی موزمین بەئەلکهولەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، هیلاکبوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خەمۆکی، شیزۆفرینیا، شێتی، تەشەنوج، زەردی، گێژی. سکچوون، سەرئێشە، لاوازی سێکسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٨٠٠ میلیگرام بەیەك بڕی دەرمان لە یەکەم ڕۆژدا، کەمدەکرێتەوە زیاتر لە ٥ ڕۆژ بۆ ڕۆژ نە ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام، نابێت بەردەوام بێت بۆ ماوەی زیاتر لە ٦ مانگ بەبێ پێداچونەوە.

## دیثرانول: DITHRANOL

**ناوی بازرگانی:** Anthraforte,Lasan,psorin

**شێوەی دەرمان:** کرێمی مەوزوعی ٠,٢٥.

**گرووپی دەرمان:** Antipsoriatic

**بەکارهێنان:** دژی سۆریاسیی موزمین (دروستبوونی پولەکە لەسەرپێست) و هەڵوەرینی مووی ناوچەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێست، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ١ جار ڕووی پێستی پێ بماڵن و شەو ڕووی شوێنی مەبەستی پێ بماڵرێت و پاشان دەی بشۆرێت.

## دوبیوتامین: DOBUTAMINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Dobutrex

**شێوەی دەرمان:** دەرزی دەماری ١٢,٥ میلیگرام/میلیلیتر (٢٠ میلی لیتر).

**گرووپی دەرمان:** Inotropic B١ Adrinergic agonist,

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی پەککەوتنی کاتی دڵ و لە شۆکی دڵ یان هەوکردن یان تویکاری دڵ و درێژبوونی ماوەی لێدانەکانی دڵدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە. حەساسیەت، گێژبوون، خێرا لێدانی دڵ ئازاری سنگ، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، دڵە کوتێ، تەنگەنەفەسی، کرژبوونی بۆری هەوا، تا، ئیلتیهابی خوێنهێنەر. پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢,٥ تا ١٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام/خولەك، بە IVئینفیوشن، ڕێکدەخرێت بەپێی کردنەوەکەی.



## دۆسیتاکسیل: DOCETAXEL

**ناوی بازرگانی:** Taxotere

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلی‌گرام/ میلی‌لیتر و ٨٠ میلی‌گرام/٢ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی مەمك و سی و پرۆستات و هێلکەدان و گەدە و سەر و مل بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەڵوەرینی موو، برینی دەم، ئازاری کەمەر، پەڵە، کەمخوێنی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، بێهێزی، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦٠ تا ١٠٠میلی‌گرام/مەتردوجا IV، لەماوەی ١ سەعات هەر ٣ هەفتە ١جار.

## دۆکیوسەیت کالسیۆم، صۆدیۆم، پۆتاسیۆم: DOCUSATE Ca,K,Na

**ناوی بازرگانی:** Surfak,dialose,colace

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی کالسیۆم ٥٠ و ٢٤٠ میلی‌گرامی و کەپسولی پۆتاسیۆم ١٠٠ و ٢٤٠ میلی‌گرامی و کەپسولی صۆدیۆم ٥٠ و ١٠٠ میلی‌گرامی و شروبی ٥٠ و ٦٠ میلی‌گرام/١٥ میلی‌لیتر و شل ١٥٠ میلی‌گرام/١٥ میلی‌لیتر و گیراوەی ٥٠ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Laxative

**بەکارهێنان:** ڕەوانکەرەو بۆ چارەسەری قەبزی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کرژبوونی سك، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ تا ٥٠٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ٤ جار. منالّی ساوا تا ٣ ساڵ ١٠ تا ٤٠ میلی‌گرام/٢٤ سەعات ڕۆژانە ٤ جار. منالّی ٣ تا ٦ ساڵ ٢٠ تا ٦٠ میلی‌گرام/٢٤ سەعات ڕۆژانە ٤ جار. منالّی ٦ تا ١٢ ساڵ ٤٠ تا ١٢٠ میلی‌گرام/٢٤ سەعات ڕۆژانە ٤ جار.

## دۆکیوسەیت صۆدیۆم و سۆربیتۆڵ: DOCUSATE Na & SORBITOL

**ناوی بارزرگانی:** Madane, disonate, colace

**شێوەی دەرمان:** ئینیما (دۆکیوسەیت سۆدیم ٠,٠١ گرام + سۆربیتۆڵ ١٣,٤ گرام (RECTAL (کۆم))

**گروپی دەرمان:** Laxative

**بەکارهێنان:** ڕەوانکەرە و بۆچارەسەری قەبزی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، کرژبوونی سك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالاّنی گەورەتر لە ١٢ ساڵ بەشێوەی ئینیما (لەرێگەی کۆمەوە) بەکاردێت.

## دۆفیتیلید: DOFETILIDE

**ناوی بازرگانی:** Tikosyn

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٢٥ و ٢٥٠ و ٥٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiarrhythmic

**بەکارهێنان:** بۆ یارمەتی پاراستنی لێدانی ئاسایی دڵ بەکاردێت لەوانەی هەندێ تێکچوونی ڕیتمی دڵیان هەیە لە گوێچکەڵەدا ( ژووری سەرەوەی دڵە کە ڕێ بە خوێن دەدات بۆ ئەوەی بچێت بۆ دڵ). لەوانەشدا بەکاردێت سەرەوە و هەزەی گوێچکەڵەی دڵیان هەیە.

**کاریگەری لاوەکی:** نارێکی لێدانی دڵ ئازاری سنگ، سەرئێشە، ئازاری پشت، گێژی، هێڵنجدان، سکچوون، ئازاری سك. تێکچوونی خەو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٢٥ تا ٥٠٠ مایکرۆگرام ١ تا ٢ جار لە ڕۆژێکدا.

## دۆلاسیترۆن: DOLASETRON

**ناوی بازرگانی:** Anzemet

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ١٠٠ میلی‌گرامی و دەرزی ٢٠ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiemetic

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری و چارەسەری هێڵنجدان و ڕشانەوەی پاش نەشتەرگەری و هێڵنجدان و ڕشانەوە بەهۆی چارەسەری کیمیایی شێرپەنجەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی لێدانی دڵ زیادبوونی لێدانی دڵ سووربونەوە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە. گێژی، هیلاکبوون، لەرزین، تێکچوونی خەو، تێکچوونی هاوسەنگی. خرۆشان. ئارەقکردنەوە، پەڵە، سکچوون. تێکچوونی گەدە، ئازاری سك، نەمانی ئارەزوی خواردن، قەبزی، ئازار، تا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان زیاتر لە ١٦ ساڵ ١٠٠ میلی‌گرام خۆراکی ١ سەعات پێش لە چارەسەری کیمیایی. بەدەمار ١٢,٥ میلی‌گرام پێش لە وەستاندنی بەنج و بۆ چارەسەری هێڵنجدان و بەرگری لە ڕشانەوە. منداڵانی ٢ تا ١٦ ساڵ ١.٨ میلی‌گرام/کیلۆگرام خۆراکی ١ سەعات پێش لە چارەسەری کیمیایی، ١,٢ میلی‌گرام/ کیلۆگرام خۆراکی بۆ بەرگری لە ڕشانەوە و ٢ سەعات پێش نەشتەرگەری. بەدەمار ٠,٣٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام ( لایەنی زۆری ١٢.٥میلی‌گرام ) بۆ بەرگری ١٥ خولەك پێش لەوەستاندنی بەنج بۆ چارەسەری هێڵنجدان و بەرگری لە ڕشانەوە پێی دەدرێت.



## دۆمپیریدۆن: DOMPERIDONE

**ناوی بازرگانی:** Motilium

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی حەبی ١٠ میلیگرامی و شرووبی ٥ میلیگرام/٥میلیلیتر و شاف ٣٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antiemetic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هێڵنجدان و ڕشانەوە و تێکچوونی هەرس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، گەورەبوونی مەمك، زیادبوونی پرۆلاکتین، تێکچوونی هەرس، کەمبوونەوەی کێش، قورسبوونی هەناسە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان کێشی سەروی ٣٥ کیلۆگرام ١٠ تا ٢٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار، لایەنی زۆر ڕۆژانە ٨٠ میلیگرام. منداڵان کێشی تا ٣٥ کیلۆگرام (تەنها بۆ هێڵنجدان و ڕشانەوە) ٢٥٠ تا ٥٠٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار، لایەنی زۆر ڕۆژانە ٢,٤ میلیگرام/کیلۆگرام. لە ڕێگەی کۆمەوە گەورەکان و منداڵان کێشی سەروی ٣٥ کیلۆگرام ٦٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار. منداڵی ١٥ تا ٣٥ کیلۆگرام (تەنها بۆ هێڵنجدان و ڕشانەوە) ٣٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار. پێشنیار نەکراوە بۆ کێشی خوار ١٥ کیلۆگرام.

## دۆنیپیزل: DONEPEZIL

**ناوی بازرگانی:** Aricept

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Acetylecholinestrase inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شێتی سوك یان مامناوەند لە نەخۆشی ئەلزایمەردا بەکاردێت.

کاریگەری لاوەکیەکان: سەرئێشە، بێخەوی، سکچوون، ڕشانەوە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، برینی گەدە و ڕیخۆڵە، نەمانی ئارەزوی خواردن، کرژبوونی ماسولکە، هیلاکبوون، گێژی، پەڵە، خوران، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ٥ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار کاتی خەوتن، پاش لە ١ مانگ زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆری ١٠میلیگرام ڕۆژانە، ئەگەر پێویست بێت.

## دۆپامین: DOPAMINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Dopastat,intropin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٤٠ و ٨٠ و ١٦٠ میلیگرام /میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Vasopressor



**بەکارهێنان:** بزوێنەر و بەهێزکەری دڵ،تەسککەرەوەی دەمار، بۆ چارەسەری پەستانی خوێن و شۆك وپەککەوتنی دڵ و پەککەوتنی گورچیلە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری قەفەسەی سنگ، زیادبوونی لێدانی دڵ بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، دڵەراوکێ، تەنگەنەفەسی، تێکچوونی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ٢ تا ٥ مایکرۆگرام/کیلۆگرام/خولەك بە IV ئینفیوشن و لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٥٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام/خولەك.

## دۆریپینیم: DORIPENEM

**ناوی بازرگانی:** Doribax

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی ناوەوەی سك و میزەڵدان و هەوکردنی حەوز و گورچیلە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، سەرئێشە، ئیلتیهابی خوێنهێنەر، خوران، پەڵە، تەشەنوج، کەمبوونەوەی بڕەی خوێن و خڕۆکەی سپی(نیوترۆفیل)، ئیلتیهابی کۆڵۆن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی زیاتر لە ١٨ ساڵ بە ڕێگەی IV ئینفیوشن ٥٠٠ میلیگرام هەموو ٨ سەعاتێك، لایەنی زۆری ماوەی چارەسەر ١٤ڕۆژە.

## دۆرنەیس ئەلفا: DORNASE ALFA

**ناوی بازرگانی:** Pulmozyme

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ئیستینشاقی ١ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Mucolytic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی بوونەڕیشاڵی کیسەیی (Cystic fibrosis) نەخۆشی یەکی زکماکی یە کە کاردەکاتەسەر خانەکانی ڕژێنە دەردراوەکان (ڕژێنی دەردانی چڵم و ئارەقەڕژێنەکان و ئەوانی تر)، بۆ چاکترکردن و تەواوکردنی فرمانی سییەکان لەوانەی نەخۆشی بوونەڕیشاڵی کیسەییان هەیە ( Cystic fibrosis) بە تواندنەوەی دەردراوەکانی سی و کەمکردنەوەی زیان و مەترسی هەوکردنی ڕێڕەوی هەناسە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە، ئازاری سنگ، هەوکردنی قوڕگ، تەنگەنەفەسی، هەوکردنی گەروو، سەرئێشە، تا، پەڵە، هەوکردنی لوت، گۆڕانی دەنگ، شەرا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ٥ ساڵ ٢,٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ تا ٢ جار.



## دۆرزۆلەماید: DORZOLAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Cosopt,Trusopt

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاوی ٢٪.

**گروپی دەرمان:** Carbonic anhydrase inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندنی پەستانی بەرزی چاو و بۆ چارەسەری گلوکۆما(ئاوی ڕەشی چاو )ی گۆشەی کراوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئیلتیهابی مەوزوعی، حەساسیەتی چاو، سوتانەوەی چاو، هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکبوونەوەی چاو، بەردی گورچیلە، پەڵە، زۆربوونی فرمێسك، گێژبوون، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ١ قەترە ٣ جار لەڕۆژێکدا.

## دۆسولیپین: DOSULEPIN HCL

**ناوی بازرگانی:** Dosulepin,prothiaden

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥ میلیگرامی و حەبی ٧٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی خەمۆکی، بە تایبەتی لە شوێنێکدا هێورکەرەوەی پێویست بێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی پەستانی ناو چاو. کەمبوونەوەی لێدانی دڵ گێژی، قەلەقی، خرۆشان، بێخەوی، خەوالوویی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٧٥ میلیگرام (پیرەکان ٥٠ تا ٧٥ میلیگرام) ڕۆژانە لەبڕی دەرمانی دابەشکراودا یان بەیەك بڕ لەکاتی خەودا، لەکاتێکدا پێویست بێت بەتەدریجی زیاد دەکرێت بۆ ڕۆژانە ١٥٠ میلیگرام ( پیرەکان ٧٥ میلیگرام لەوانەیە کافی بێت)، تا ڕۆژانە ٢٢٥ میلیگرام لە هەندێ بارودۆخدا (بۆ نمونە **بەکارهێنان**ی لە نەخۆشخانە).

## دۆکسازۆسین: DOXAZOSIN

**ناوی بازرگانی:** Cardura

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەبی ١و ٢ و ٤و٨ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Alpha blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و نەخۆشی گەورەبوونی باشی پرۆستات (BPH) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هاوسەنگی، تەنگەنەفەسی، کۆکە، هیلاکبوون، تێکچوونی خەو، ئازاری ماسولکە و پشت، ئازاری سنگ، لەرزین، ئازاری جومگە، ئازاری سنگ، هەوکردنی جگەر، گەورەبوونی مەمك، زەردی، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ هەڵوەرینی موو. کەمی خرۆکەی سپی و پەرەی خوێن، سەرئێشە، گێژبوون، لاوازی سێکسی، بێهێزی.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١ملیگرام لە برێکی دەرماندا، پاش لە ١ تا ٢ هەفتە زیاد دەکرێت بۆ ٢ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار. پاش ئەوەش ٤ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، ئەگەر پێویست بێت لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٦ میلیگرامە.

**دوکساپرام:** DOXAPRAM HCL

**ناوی بازرگانی:** Dopram

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠ میلیگرام/میلی لیتر، ٥ میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Analeptic

**بەکارهێنان:** بۆ هاندانی دەستگای هەناسەدان و ناوەندە کۆئەندامی دەمار CNS و گەڕانەوەی هۆشیاری نەخۆش لە نەخۆشی کۆما (بێهۆشی) دا و کاردەکاتە سەر CNS بۆ هاندانی ماسولکەکانی هەناسەدان و بۆ چارەسەری نەخۆشی موزمینی داخستنی سی یەکان بەهۆی زۆربوونی دوانەئۆکسیدی کاربۆن لە خوێندا و پەککەوتنی توندی ڕێڕەوی هەناسە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، بڕینی دەم، تەشەنوج، سەرگێژبوون، سەرئێشە، سکچوون، ئازاری سنگ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، کۆکە، کرژبوونی بۆری هەوا، گیرانی میز، لەرزین، تەنگەنەفەسی، کەمبوونی لێدانی دڵ، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٣ میلیگرام/کیلۆگرام بەڕێگەی ئینفیوشنی دەماری بەلانی کەم لە ماوەی ٣٠ چرکەدا، هەر ١ سەعاتێك دوبارەدەکرێتەوە ئەگەر پێویست بێت. لانی زۆر ٤ میلیگرام/کیلۆگرامە.

**دۆکسیپین:** DOXEPINE

**ناوی بازرگانی:** Sinequan,Adopin,sinepin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠ و ٢٥ و ٥٠ و ٧٥ و ١٠٠ و ١٥٠ میلیگرامی و حەبی ١٠ و ٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** دژی خەمۆکی و ئازاری موزمین و ترس و دڵەڕاوکێ و قەلەقی و بەشێوەی مەوزوعی و بۆ چارەسەری خوران و سوربونەوە بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون. زیادبوونی لێدانی دڵ بێهێزی، سەرئێشە، هەستیاربوون بەڕوناکی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، گیرانی میز، نەمانی ئارەزوی خواردن. تەشەنوج، خەواڵویی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، وشکبوونەوەی دەم، قەبزی، پەڵە، تێکچوونی بینین، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٢٥ تا ١٥٠ میلی‌گرام خۆراکی، لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣٠٠ میلی‌گرامە.

## دۆکسیپین: DOXEPINE TOPICAL

**ناوی بازرگانی:** Zonalon,prudoxin

**شێوەی دەرمان:** کرێمی ٥٪.

**گروپی دەرمان:** Antipruritic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خوارن بەهۆی نەخۆشی پێستی وەك ئەکزیما بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، ئاوسانی شوێنی **بەکارهێنان**، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، خەواڵویی، زیادبوونی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** بە شێوەی چینێکی تەنك ٤ جار لە ڕۆژێکدا، لایەنی زۆر بۆ ماوەی ٨ ڕۆژ.

## دوکسوروبیسین: DOXORUBICIN

**ناوی بازرگانی:** Adriamycin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ و ٥٠ میلی‌گرامی و دەرزی گیراوەی خەستی ٢ میلی‌گرام /میلی‌لیتر،٢٥ میلی‌لیتر و دەرزی گیراوەی خەستی ٢میلی‌گرام میلی‌لیتر.٥ میلی‌لیتر و ٢٠٠ میلی‌گرامی دەرزی گیراوەی ٢ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (١٠میلی‌لیتر و ٢٥ میلی لیتر) دۆکسۆروبیسین لیپۆسۆماڵ

**گروپی دەرمان:** Antibiotic,Antineoplastic

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی خوێن لیوکیمیا و شێرپەنجەی هێلکەدان و میزەڵدان و ئێسك و مەمك و گورچیلە و جگەر و سی و پرۆستات و گەدە و ڕژێنی پایرۆید و شێرپەنجەی مۆخی ئێسك و هوجکین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە. برینی دەم، هەڵوەرینی موو، پەککەوتنی دڵ کەمخوێنی، سکچوون، ئۆدیمای سی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، ناڕێکی لێدانی دڵ تێکچوونی جگەر، تەشەنوج، ڕوشان و ئاوکردنی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦٠ تا ٧٥ میلی‌گرام/مەتردوجا بەدەمار، بە ١ بڕی دەرمان ٣ هەفتە ١جار.



## دۆکسی سایکلین: DOXYCYCLINE

**ناوی بازرگانی:** Vibramycin,Atridox,Doryx

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٤٠ و ٥٠ و ٧٥ و ١٠٠ و ١٥٠ میلیگرامی و حەبی ٢٠ و ٥٠ و ٧٥ و ١٠٠ و ١٥٠ میلیگرامی و شروبی ٥٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و سەسپێنشنی ٢٥ میلیگرام/٥ میلیلیتر و دەرزی ١٠٠ و ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردن بەهۆی بەکتریایی گرامنێگەتیف و پۆزەتیڤەکان و بۆ چارەسەری زیپکە و بۆ پێشگری مەلاریا و هەوکردنی دەم و ددان و هەوکردنی منداڵدان و هەوکردنی توندی ئەمیبی ڕیخۆڵە و بۆ چارەسەری تەراخوما و هەوکردنی کاتی سوزەنەك و هەوکردنی دەزگای زایەندی ژنان و دژی هەوکردن بەهۆی ڕێژەیەکی زۆری بەکتریاوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری دڵ، گۆڕانی ڕەنگی ددان، پەڵە، برینی گەدە، تێکچوونی پێست، هەستیاربوون بەتیشك، تێکچوونی ڕیخۆڵە و گەدە، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام ٢ جار لەڕۆژێکدا،لە منداڵانی سەروی ٨ ساڵ ٢,٢ میلیگرام/کیلۆگرام ٢ جار لەڕۆژێکدا.

## درۆنابینۆڵ: DRONABINOL

**ناوی بازرگانی:** Marinol

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢,٥ و ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiemetic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هێڵنجدان و ڕشانەوەی توند بەهۆی چارەسەری کیمیایی و بۆ چارەسەری نەمانی ئارەزوی خواردن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، خەمۆکی، تێکچوونی مەزاج، زیادلێدانی دڵ، تەشەنوج، هێڵنجدان، گێژی، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری گەدە، بێخەوی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان دژی هێڵنجدان و ڕشانەوە ٥ تا ١٥ میلیگرام/مەتردوجا لە بڕێکدا هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك. گەورەکان بۆ کردنەوەی ئارەزوی خواردن ٢,٥ میلیگرام پێش نانی نیوەڕۆ و ئێوارە. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٠ میلیگرامە.

## درۆنیدارۆن: DRONEDARONE

**ناوی بازرگانی:** Multaq

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiarrhythmic

**بەکارهێنان:** دژی نارێکی لێدانی دڵە و بۆ چارەسەری هەزە و لەرینەوەی گوێچکەڵەو نارێکی و زیادبوونی لێدانی سەرو سکۆڵەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، هیلاکبوون، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ پەڵە، خوران، سوربونەوە، ئەکزیما، ئیلتیهابی پێست، هەستیاربوون بەڕوناکی، نەمانی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، کۆکە، ئازاری سنگ، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٠ میلی گرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار.

## درۆپریدۆل: DROPERIDOL

**ناوی بازرگانی:** Inapsine,Xomolix

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢,٥ میلی گرام/میلی لیتر (١٠میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و هێورکەرەوەی پێش لە جەراحی و پاش لەجەراحی یەو بۆ پێشگری و چارەسەری هێڵنجدان و ڕشانەوەی پاش نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن. تێکچوونی خوێن، سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەواڵویی توندی دوای عەمەلیات، هەناسە وەستان، نارێکی لێدانی دڵ ڕەقبوونی ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢,٥ تا ١٠میلی گرام بە شێوەی دەمارIV یان ماسولکەیی IM ٣٠ تا ٦٠ خولەك پێش لە نەشتەرگەری، لە منداڵان ٠,١ تا ٠,١٥ میلی گرام کیلۆگرام بە شێوەی دەمار یان ماسولکەیی.

## درۆسپیرینۆن & ئەثینیل ئیسترادیۆل: DROSPIRENONE & ETHINYL ESTRADIOL

**ناوی بازرگانی:** Angeliq

**شێوەی دەرمان:** حەبی (ئەثینیل ئیستڕادیۆل ١میلی گرام، درۆسپیرینۆن ٢ میلی گرام) و (ئەثینیل ئیستڕادیۆل ٢٠ مایکرۆگرام، درۆسپیرینۆن ٣ میلی گرام).

**گروپی دەرمان:** Female hormone



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەندێ نیشانەی ماماوەند و توندی لە حەیزچونەوە (وشکبوونەوە و خوران و سوتانەوە)ی دەوروبەری زایەندی ژنان و بۆ پێشگری لە پوکانەوەی ئێسك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سنگ، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، ئازاری گەدە، ئاوسان، زەردی، گەورەبوونی مەمك، گێژی، خەمۆکی، ناڕێکی ماوەی بێ نوێژی، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، زۆربوونی پۆتاسیۆم.

**بڕی دەرمان:** بۆ نیشانەکانی پاش لە عوزرچونەوە ١ حەب خۆراکی هەر ڕۆژێك.

## دڕۆتریکۆجین ئەلفا: DROTRECOGIN ALFA

**ناوی بازرگانی:** Xigris

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥ و ٢٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی هەوکردنی توندی خوێن بەهۆی خراپبوون و تێکشکانی شانەکان بەهۆی بەکتریا و ژەهر ئیحتمالی زۆری مردن بەهۆی پەککەوتنی زۆربەی ئەندامەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، سەرئێشە، ئازار، بوونی خوێن لە میز و پیسایدا، کۆکەی خویناوی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ٢٤ مایکرۆگرام/کیلۆگرام لە سەعاتێکدا بە IV ئینفیوشن بۆ ماوەی ٩٦ سەعات.

## دولۆکسیتین: DULOXETINE

**ناوی بازرگانی:** Cymbalta,Yentreve

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٠ و ٣٠ و ٤٠ و ٦٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خەمۆکی و قەلەقی و ئازاری موزمین و ئازاری ماسولکە و جومگە و ئازار بەهۆی تێکچوونی دەمار لەوانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ئازاری سك، گێژی، خەواڵویی، هیلاکبوون، خوران، ئارەقکردنەوە، خێرا لێدانی دڵ بەگرانی میزکردن، سەرئێشە، لەرزین، زەردی، وشکبوونەوەی دەم، قەبزی، نەمانی ئارەزوی خواردن، لاوازی سێکسی.



**بڕی دەرمان:** بۆ ئازار ٦٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار. بۆ نەخۆشی خەمۆکی ٦٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، بۆ نەخۆشی قەلەقی سەرەتا ڕۆژانە ٣٠ میلیگرام، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ ٦٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٢٠ میلیگرامە. ئازار بەهۆی تێکچوونی دەمار لەوانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە ٦٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٢٠ میلیگرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## دوتاستیرید: DUTASTERIDE

**ناوی بازرگانی:** Avodart

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥٠٠ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Androgen inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری گەورەبوونی باشی پرۆستات (BPH) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** لەکارکەوتنی ئارەزوی سێکسی، گەورەبوونی مەمك، زیادبوونی تێستۆستیرۆن، کەمبوونەوەی تۆو.

**بڕی دەرمان: گەورەکان ٥٠٠ مایکرۆگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا.**

## دیدرۆجیسترون: DYDROGESTERONE

**ناوی بازرگانی:** Duphaston

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Progetogen

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بێ عوزری و نارێکی بێ نوێژی و بۆ پێشگری لەبارچوون و بۆ چارەسەری بێ نوێژی سوڕی مانگانەی ترسناك و خوێنبەربوونی منالدان و ئیلتیهابی منالدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هیلاکبوون، هێلنجدان، بیهێری، نارێکی بێ نوێژی مانگانە، گۆڕانی ئارەزوی خواردن و کێشی لەش.

**بڕی دەرمان:** بڕی ١٠ میلیگرام خۆراکی ٣ جار لەڕۆژێکدا لە ڕۆژی پێنجەم و تا ڕۆژی ٢٥ بێ نوێژی.

***



## ئیکۆثایۆفەیت: ECHOTHIOPHATE IODIDE

**ناوی بازرگانی:** Phospholine Iodide

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,٠٦٪ و ٠,١٢٥٪و ٠,٢٥ ٪.

**گرووپی دەرمان:** Cholinesterase inhibitor

**بەکارهێنان:** دژی گلوکۆما (ئاوی ڕەشی چاو)ی موزمینی گۆشەی کراوە یان گلوکۆما کاری نەشتەرگەری ئاوی سپی(کاتاراکت) و وەك چارەسەری شیاو بۆ خێلی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تێکچوونی بینین، تێکچوونی دڵ زۆرمیزکردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، گرژبوونی سك، ئازاری چاو، ئارەقکردن، بێهێزی، فرمێسك ڕشتن.

**بڕی دەرمان:** ١ قەترە ڕۆژانە ٢ جار.

## ئیکۆنازۆڵ: ECONAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Spectazole,pevaryl

**شێوەی دەرمان:** کرێمی مەوزوعی ١٪.

**گرووپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی کەڕوویی یەو بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی پێست و کاندیدیازی دەزگای زایەندی ژنان و هەوکردنی کەڕوویی نینۆك و هەوکردنی کەڕوویی نێوان پەنجەکانی پێ و کەچەڵی و کەچەڵی لەش و کەچەڵی پێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سووربونەوە، خوران، سوتانەوە.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١ تا ٢ جار.

## ئیکولیزوماب: ECULIZUMAB

**ناوی بازرگانی:** Soliris

**شێوەی دەرمان:** ڤیالی ٣٠٠ ملی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Monoclonal antibody

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری لە تێکشکانی خرۆکە سورەکانی خوێن لەوانەی نەخۆشی کتوپڕی شەوانەی میزی هیمۆگلۆبینی (PNH) یان هەیە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، ئودیما، کۆکە، سەرئێشە، گێژی، هیلاکی، پەڵە، خوران، هەڵوەرینی موو، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری سنگ، زەردی، خەمۆکی، کرژبوونی ماسولکە، ئارەقکردنەوە، تێکچوونی بینین، سوربونەوە، دڵەکوتێ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری ماسولکە و جومگە.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی IV ئینفیوشن گەورەکان سەروی ١٨ ساڵ، سەرەتا ٦٠٠ ملیگرام ١ جار لە هەفتەیەکدا بۆ ماوەی ٤ هەفتە، پاشان ٩٠٠ ملیگرام لە هەفتەی ٥ دا، بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٩٠٠ ملیگرام هەموو ١٢ تا ١٦ ڕۆژێك ١ جار.

## ئیدیتەیت کالسیۆم دایسۆدیۆم: EDETATE CALCIUM DISODIUM

**ناوی بازرگانی:** Ledclair

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ ملی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Chelating agent

**بەکارهێنان:** دژی ژەهراویبوون بە کانزاقورسەکانی وەك قورقوشم و کادمیۆم و کۆباڵت و مس و مەگنسیۆم و نیکڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، کەمبوونەوەی میز، کەمبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی پێست، ئازاری سنگ، زیاد لێدانی دڵ بێهێزی، تێکچوونی گورچیلە، تێکچوونی خوێن، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** بڕی ٦٠ تا ٨٠ ملیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا بە دەمار یان ماسولکەیی لە ٢ تا ٣ جاردا بۆ ماوەی ١ تا ٢ هەفتە.

## ئیدیتەیت دای کۆبالت: EDETATE DICOBALT

**ناوی بازرگانی:** Kelocyanor

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٥ میلی گرام/میلی لیتر (٢٠ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Chelating agent

**بەکارهێنان:** دژی ژەهراویبوونی توند بە سیانید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئارەقکردن، کەمبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی پێست، ئازاری سنگ، زیاد لێدانی دڵ بێهێزی، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** ٣٠٠ میلی گرام لەیەك خولەکدا لەڕێگەی دەمارەوە دەرزی لێ بدرێت و دووبارەکردنەوەی ٥خولەك دواتر.

## ئیدیتەیت دای سۆدیۆم: EDETATE DISODIUM

**ناوی بازرگانی:** Endrate

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٥٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Chelating agent

**بەکارهێنان:** دژی ژەهراویبوون بە کانزاقورسەکانە و بۆ کۆنترۆڵکردنی زیادبوونی کاسیۆم و بۆ چارەسەری پەککەوتنی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تەشەنوج، کرژبوونی سك، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تا، لەرز، کەمبوونەوەی کالسیۆم، نەمانی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٦٠ تا ٧٠ میلی گرام/کیلۆگرام، لەگەڵ نۆرماڵ سەلاین دا.

## ئیدیتەیت سۆدیۆم: .EDETATE SODIUM OPH

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی قەترەی چاو.

**گروپی دەرمان:** Chelating agent

**بەکارهێنان:** دژی ژەهراویبوون بە کانزاقورسەکانەو بۆ ڕێکخستنی کالسیۆم و وەك دەرمانی یارمەتیدەر بۆ ڕوشانی کۆرنیەی چاو بەهۆی هەڵمژینەوەی پێکهاتەکانی کالسیۆم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** فرمێسك ڕشتن، پەڵەی پێست، سوربونەوەی لوت، خوران، سوتانەوە.

**بڕی دەرمان:** شۆردنی کۆرنیەی چاو بەم گیراوەیە بۆ ماوەی ١٥ خولەك ئەنجام بدرێت.



## ئیدرۆفۆنیۆم کلۆراید: EDROPHONIUM CHLORIDE

**ناوی بازرگانی:** Tensilon , reversol

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticholinesterase

**بەکارهێنان:** وەك دەرمانی یارمەتیدەر لە تەشخیصی نەخۆشی لاوازی ماسولکەیی ( Myathenia gravis) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، خەواڵویی، کرژبوونی سك، تێکچوونی بینین، تەشەنوج، تەنگەنەفەسی، ئازاری ماسولکە، ئارەقکردن. کرژبوونی بۆری هەوا.

**بڕی دەرمان:** ٢ میلی‌گرام ماسولکەیی ئەگەر پاش ٤٥ چرکە کاردانەوەی نەبوو ٨ میلی‌گرام بە ڕێگەی دەمار لێی دەدرێت.

## ئیفالیزوماب: EFALIZUMAB

**ناوی بازرگانی:** Raptiva

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ١٢٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antipsoriatic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی پێستی موزمینی مامناوەند و توندی پلاگ سۆریاسس (دروستبوونی پولەکەی پێست) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بینین، تەشەنوج، کۆکە، خیزەخیز، ئازاری سنگ، سوربونەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، خوێنبەربوون، سەرئێشە، هێڵنجدان. ڕشانەوە، ئازاری جومگە و پشت، ئازاری ماسولکە، ئاوسان.

**بڕی دەرمان:** بڕی دەرمانی سەرەتا ٠,٧ میلی‌گرام کیلۆگرام ژێرپێستی ١ جار. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ١ میلی‌گرام/کیلۆگرام هەفتانە ژێرپێستی. لایەنی زۆری ١ بڕی دەرمان نابێت لە ٢٠٠ میلی‌گرام تێپەڕ بکات.

## ئیفاڤیرینز: EFAVIRENZ

**ناوی بازرگانی:** Sustiva

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی خۆراکی ١٠ و ١٠٠ و ٢٠٠ میلی‌گرامی و حەبی خۆراکی ٢٠٠ و ٦٠٠ میلی‌گرامی و گیراوەی خۆراکی ١٥٠ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiviral



**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خرۆشان، گێژی، خەمۆکی، زۆرهیلاکبوون، خەوالّویی. سەرئێشە، تا، هێلّنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، غازات، هەوکردنی پەنکریاس. بەردی گورچیلە. بێخەوی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی ٣ سالّە و گەورەتر کە١٠ تا ٤٠ کیلۆگرام کێشیان هەیە ٢٠٠ تا ٦٠٠ میمی گرام ١ جار بەسکی خالّی و لەکاتی خەوتن.

## ئیفلۆرنیثین: EFLORNITHINE

**ناوی بازرگانی:** Vaniqa

**شێوەی دەرمان:** کرێمی ١١,٥٪.

**گرووپی دەرمان:** Hair growth retardant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هیرسوتیزم (بریتی یە لەبوونی مووی گەورەی ڕەنگدار لە سەر دەم وچاو و سنگ و بەشی سەرەوەی پشت و یان سك لە ئافرەتدا بەهۆی زیاد دروستبوونی ئەندرۆجین) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیپکە، سوتانەوە، پەلّە، سووربونەوە.

**بڕی دەرمان:** بە شێوەیەکی تەنك ڕۆژانە ٢ جار بەکاردێت.

## ئیلیتریپتان: ELETRIPTAN

**ناوی بازرگانی:** Relpax

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ و ٤٠ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** ٥HT١ receptor agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شەقیقەی توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك، وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی گەدە. زیادبوونی لێدانی دلّ دلّەکوتێ، خەوالّویی، سەرئێشە، هەوکردنی گەروو. هەوکردنی لوت. تا. لاوازی ماسولکەیی، ئارەقکردنەوە، ئازاری ماسولکە، سکچوون، قەبزی، نەمانی ئارەزوی خواردن. تەنگەنەفەسی، بێخەوی، خەمۆکی، خوران، پەلّە، تێکچوونی بینین، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠ تا ٨٠ میلی گرام خۆراکی بە یەك بڕی دەرمان، لایەنی زۆری ٨٠ میلی گرامە لە ڕۆژێکدا.



## ئیلترۆمبۆپاگ: ELTROMBOPAG

**ناوی بازرگانی:** Revolade,Promacta

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antithrombocytopenia

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری لەخوێنبەربوون بەهۆی کەمبوونی پەرەی خوێن لە خوێندا (ITP) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، ئازاری سك، قەبزی، ئۆدیما، سەرئێشە، بێخەوی، هیلاکی، ئازاری جومگە، ئازاری ئێسك، ئازاری ماسولکە، کاتاراکت، تێکچوونی هاوسەنگی، هەوکردنی میزەڕۆ، میزکردنی شەوانە، میزکردنی شەوانە، کەمخوێنی، ئارەقکردنەوە. گێژی، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی لێدانی دڵ، خوران، پەڵە، هەڵوەرینی موو، نەمانی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥ تا ٥٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار بە گەدەی خاڵی. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٧٥ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار بەگەدەی خاڵی.

## ئیمیداستین: EMEDASTINE

**ناوی بازرگانی:** Emadine

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ٠,٠٥٪.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری حەساسیەت و ئیلتیهابی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بینین، ڕوشان، هەوکردنی کۆرنیە، وشکی چاو – سەرئێشە، کزانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی زیاتر لە ٣ساڵ ڕۆژانە ٢ جار هەر جارەی ١ قەترە بەکاردێت.

## ئیمتریسیتابین: EMTRICITABINE

**ناوی بازرگانی:** Emtriva

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی خۆراکی ١٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر و کەپسولی ٢٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV١ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ئازاری گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، زەردی، نارێکی لێدانی دڵ، ڕشانەوە، ئازاری ماسولکە، سەرئێشە، بێخەوی، کۆکە، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** کەپسول، گەورەکان و منداڵانی کێشی لەشی سەروی ٣٣ کیلۆگرام، ٢٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار. گیراوە، گەورەکان و منداڵانی کێشی لەشی سەروی ٣٣ کیلۆگرام، ٢٤٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار. منداڵی ٤ مانگ تا ١٨ ساڵ، کێشی لەشی کەمتر لە ٣٣ کیلۆگرام، ٦ میلی‌گرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ١ جار.



## ئینالاپریل: ENALAPRIL

**ناوی بازرگانی:** Vasotec, innovace

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ و ٥ و ٢٠ و ١٠میلیگرامی و دەرزی ١,٢٥ میلیگرام /میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و پەککەوتنی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تەنگەنەفەسی، خەمۆکی، تێکچوونی بینین، برینی گەدە و دوانزەگرێ، دابەزینی پەستانی خوێن، خوران، سەرئێشە، گێژی، هیلاکبوون، سکچوون، سەرگێژبوون، بێخەوی، کۆکە، نەمانی ئارەزوی خواردن، پەڵە، ئازاری قەفەسەی سنگ، هێڵنجدان، لاوازی سێکسی، تێکچوونی هاوسەنگی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢,٥ تا ٤٠ میلیگرام خۆراکی لە ڕۆژێکدا. ١,٢٥ میلیگرام بە دەمار هەموو ٦ سەعاتێك. منداڵان ٠,٠٥ تا ٠,٠٨ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا خۆراکی هەموو ١٢ تا ٢٤ سەعاتێك کەمدەکرێتەوە لە کاتی لاوازی گورچیلە.

## ئێن فلوران: ENFLURANE

**ناوی بازرگانی:** Efrane,Ethrane

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی ئیستینشاقی (هەڵمژین).

**گروپی دەرمان:** General anaesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی عمومی بەڕێگەی ئیستینشاقی و بۆ دروستبوونی بەنج و پارێزگاری بەنج بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ڤێ، تەنگەنەفەسی، دابەزینی پەستانی خوێن، هەوکردنی جگەر، تێکچوونی گورچیلە، خەواڵویی، ناجێگیری، زیادبوونی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** لە نەشتەرگەری دا٪ ٠,٥ تا ٪٣ وە لە مامانی و منداڵبووندا ٪٠,٢٥ تا ٪١.

## ئینفیوڤیرتاید: ENFUVIRTIDE

**ناوی بازرگانی:** Fuzeon

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی ٩٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** لەگەڵ دەرمانە دژە ڤایرۆسەکانی تردا دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV١ بەکاردێت



**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، هەوکردنی سی، هیلاکی، زیپکە، هەوکردنی پەنکریاس، وشکی پێست، نەمانی ئارەزوی خواردن، سوربونەوە، جیوب، چاوێشە، بوونی خوێن لە میزدا، خەمۆکی، سەرئێشە، ئازاری ماسولکە، بێخەوی، کەمبوونی کێشی لەش.

**بڕی دەرمان:** بە دەرزی ژێرپێستی گەورەکان و لاوی سەروی ١٦ ساڵ، ٩٠ میلیگرام رۆژانە ٢ جار. منالّی ٦ تا ١٥ ساڵ ٢ میلیگرام/کیلۆگرام رۆژانە ٢ جار ( لایەنی زۆر ٩٠ میلیگرام رۆژانە ٢ جار).

## ئینۆکساپرین: ENOXAPARIN

**ناوی بازرگانی:** Clexan,Lovenox

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠میلیگرام/میلیلیتر (٠,٢ و ٠,٤ و ٠,٦و٠,٨و١میلیلیتر ).

**گروپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەکارهێنان:** دژی کلۆبوونی خوێن و مەیینی خوێنە لەدەمارو مولولەکانی خوێندا و مەیینی خوێن لەقولایی دەمارەکاندا پاش لەنەشتەرگەری ئەژنۆ و سمت و سك و دژی کلۆبوونی خوێنی سی و ئازاری توندی سنگ و جەڵدە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، سکچوون، کەمبوونی پەرەی خوێن، تا، ئازار، لاوازبوونی دڵ، هێڵنجدان، کەمخوێنی، سوربونەوەی شوێنی دەرزی لێدان، ئۆدیما، زیاد بوونی ئیشی جگەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠ میلیگرام هەر ١٢ سەعاتێك ژێرپێستی یان لە جەراحی یەکانی تردا ٤٠ میلیگرام ١ جار لە رۆژێکدا.

## ئینتاکاپۆن: ENTACAPONE

**ناوی بازرگانی:** Comtan

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiparkinson

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی پارکینسۆن (لەرزینی خۆنەویستی ئەندامەکان) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك، سکچوون، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، وڕێنەکردن، هیلاکبون، لەرزین، سەرئێشە، گێژی، خرۆشان، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری سك، وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی هەرس، پەڵە، ئارەقکردن، هەڵوەرینی موو، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ میلیگرام خۆراکی لەگەڵ کاربیدۆپا/لیڤۆدۆپا،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٦٠٠ میلیگرامە.

## ئینتیکاڤیر: ENTECAVIR

**ناوی بازرگانی:** Baraclude

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ مایکرۆگرامی و ١ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ٥٠ مایکرۆگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هیپاتیتی موزمین (ئیلتیهابی جگەر) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی گەدە، سکچوون، سەرئێشە، هیلاکبوون، گێژی، تێکچوونی خەو، پەڵە، هەڵوەرینی موو، کەمی پەڕەی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٥ تا ١ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار.

## ئیفیدرین: EPHEDRINE

**ناوی بازرگانی:** Efedvon,Ephedrine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ میلیگرامی (هایدرۆکلۆراید) و دەرزی ٥٠ میلیگرام/ میلیلیتر (سەلفەیت یان هایدرۆکلۆراید).

**گروپی دەرمان:** Bronchodialator

**بەکارهێنان:** ئەبێتەهۆی فراوانکردنی بۆری هەوا و بۆ چارەسەری ڕەبۆ و گیرانی لوت و کرژبوونی بۆریچکەکان و بۆری هەوا و پەستانی نزمی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زۆر لێدانی دڵ، نەمانی ئارەزوی خواردن، سەرگێژبوون، بێخەوی، ڕشانەوە، نارێکی لێدانی دڵ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، سەرئێشە، ناجێگیری، گیرانی میز، وشکبوونەوەی دەم، ئارەقکردن.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری نزمبونەوەی پەستانی خوێن گەورەکان ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام ماسولکەیی یان ژێرپێستی یان ١٠ تا ٢٥ میلیگرام دەماری لەسەرخۆ. لانی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ١٥٠ میلیگرامە. بۆ کرژبوونی توندی بۆری هەوا گەورەکان ١٢,٥ تا ٢٥ میلیگرام ماسولکەیی یان دەمار یان ژێرپێستی بەکاردێت. بۆ نزمبونەوەی پەستانی وەزعی گەورەکان ٢٥ میلیگرام خۆراکی ١ تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا. منداڵان ٣ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە دابەشکراو لە ٤ تا ٦ بڕدا. بۆ فراوانکردنی بۆری هەوا گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ ساڵ ١٢,٥ تا ٥٠ میلیگرام خۆراکی هەر ٣ تا ٤ سەعاتێك لەکاتی پێویست لانی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ١٥٠ میلیگرامە. منداڵانی ٦,٢٥ تا ١٢,٥ میلیگرام خۆراکی هەر ٤ سەعاتێك، لانی زۆری بڕی دەرمان لە ماوەی ٢٤ سەعاتدا ٧٥ میلیگرامە.

## ئیفیدرین: EPHEDRINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Ephedrine

**شێوەی دەرمان:** قەترەی لوت ٠,٥٪ و ١٪.

**گروپی دەرمان:** Nasaldecongestant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری گیرانی لوت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی شوێنەکی، هێڵنجدان، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەرووی ١٢ ساڵ ١ تا ٢ قەترە بۆهەر **کونەلوتێك** ڕۆژانە ٣ یان ٤ جار. لایەنی زۆر بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ. منداڵانی ٦ تا ١٢ ساڵ ١ تا ٢ قەترە بۆ هەر **کونەلوتێك** لە قەترەی (٠,٥٪) ڕۆژانە ٣ یان ٤ جار. لایەنی زۆر بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ.

## ئیپیناستین: EPINASTINE

**ناوی بازرگانی:** Relestat

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٥٠٠ مایکرۆگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهاب و حەساسیەتی وەرزی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کزانەوەی چاو، وشکی دەم، تێکچوونی تام، ڕوشانی لوت، هەوکردنی لوت، سەرئێشە، سوربونەوەی چاو، خوران، دووبینی، وشکی چاو، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و لاوانی سەرووی ١٢ ساڵ ڕۆژانە ٢ جار بەکاردێت. لایەنی زۆری ماوەی چارەسەر ٨ هەفتەیە.

## ئیپینفرین: EPINEPHRE

**ناوی بازرگانی:** Epifrin,Adrenalin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١میلیگرام/میلی لیتر(ترشی تارتارەیت) یان هایدرۆکلۆراید و دەرزی ١ میلیگرام/میلیلیتر (٢میلی لیتر)

**گروپی دەرمان:** Adrinergic agonist

**بەکارهێنان:** لەبێتەهۆی فراوانکردنی بۆری و بۆرێچکەکانی هەوا و بۆ چارەسەری ڕەبۆ و وەستانی دڵ و بۆخوێنبەربوون و چالاککردنی دڵ و کرژبوونی بۆری و بۆرێچکەکانی هەوا و حەساسیەتی دەرمانی بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** زۆرلێدانی دڵ، سەرگێژبوون، سەرئێشە، کەمبوونەوەی کێش، دڵەڕاوکێ، تەنگەنەفەسی، بەرزبوونەوەی پەستان، هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەناسەوەستان، تێکچوونی بینین، بێهێزی، بێخەوی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,١تا ٠,٥ میلی‌گرام بەIMیان SCدووبارەکردنەوەی هەر ١٢ سەعاتێك بەشێوەی پێویست تا ١ میلی‌گرامی بۆ زیاد دەکەین،منداڵانیش ٠,٠١میلی‌گرام/کیلۆگرام بە SC.

## ئیپنیفرین: EPINEPHRE( OPH )

**ناوی بازرگانی:** Glaucon,Epifrin

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ١٪.

**گروپی دەرمان:** Adrinergic agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری گلوکۆما (ناوی ڕەشی چاو)ی گۆشەی کراوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیاد لێدانی دڵ، سووربوونەوەی چاو، سوتانەوەی کاتی، ئازاری چاو، حەساسیەت، ڕوشانی چاو، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ قەترە، ڕۆژانە ١ تا ٢ جار بکرێتە ناوەوەی چاوەوە.

## ئیپی روبیسین: EPIRUBICIN HCL

**ناوی بازرگانی:** Formorubicin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ و ١٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplasm

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی خوێن (لیوکیمیاو لیمفۆما) و مەمك و هێلکەدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، هیلاکبوون، ڕشانەوە، سکچوون، هەڵوەرینی قژ، سووربوونەوە.

**بڕی دەرمان:** ٧٥تا ٩٠ میلی‌گرام/مەتردوجابۆ هەر دەورەیەکی دەرمان لەبڕی دەرمانی دابەشکراودا،لە ٢ ڕۆژی یەك لە دوای یەکدا بە لولەی ئینفیوشن کلۆریدی سۆدیۆم ٠,٩٪ ماوەی تا ٥ خولەك دەرزی لێ بدرێت و ئەم دەرمانە هەر ٢١ ڕۆژ ١ جار دووبارە بێتەوە.لە کەسانی بەتەمەن و کەسانێ دوچاری لاوازی فرمانی مۆخی ئێسك هاتوون، بڕی دەرمان دەبێت کەمبکرێتەوە.

## ئیپلیرینۆن: EPLERENONE

**ناوی بازرگانی:** Inspra

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو پاش خوێن لێبڕانی ماسولکەیی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، هێڵنجدان، نزمبوونەوەی پەستان، گێژی، زیادبوونی پۆتاسیۆم، پەڵە، غازات، ڕشانەوە، لەرینەوەی گوێچکەڵەی دڵ، هەوکردنی گەروو، سەرئێشە، بێخەوی، هەوکردنی گورچیلە و حەوز، کەمبوونەوەی صۆدیۆم، گەورەبوونی مەمك، خوران، لاوازی فرمانی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ٢٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، لە ماوەی ٤ هەفتەدا زیاد دەکرێت بۆ ٥٠ ڕۆژانە ١ جار.

## ئیپۆیتین: EPOETIN ALFA

**ناوی بازرگانی:** Epogen

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠٠٠ و ٣٠٠٠ و ٤٠٠٠ و ١٠٠٠٠ و ٢٠٠٠٠ و ٤٠٠٠٠ یەکە/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antianemia

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمخوێنی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هیلاکبوون، کۆکە، بێهێزی، هێڵنجدان، سکچوون، ڕشانەوە، تەشەنوج، سەرئێشە، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرگێژبوون. کاریگەری پێستی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ یەکە کیلۆگرام ٣ جار لە هەفتەیەکدا بە شێوەی دەمار IV یان ژێرپێستیSC ڕێی پێدەدرێت.

## ئیپۆپرۆستینۆل: EPOPROSTENOL

**ناوی بازرگانی:** Flolan

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,٥ و ١,٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبوونەوەی پەستانی سی یە خوێنبەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوون و کەمبوونی لێدانی دڵ، ئارەقکردنەوە، بێ ڕەنگی، بوونی خوێن لە میزپیسایدا، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری گەدە، سەرئێشە، ئازاری سنگ، قەلەقی، خرۆشان، وشکی دەم، زیادبوونی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ نانۆگرام/کیلۆگرام/خولەك.

## ئیپرۆسارتان: EPROSARTAN

**ناوی بازرگانی:** Teveten

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠٠ و ٦٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** غازات، ئازاری جومگە، هەوکردنی لوت، سەرئێشە، کەمخوێنی -پەڵە، خوران، شەرا، هێڵنجدان.

**بڕی دەرمان:** ٦٠٠ میلیگرام رۆژانە ١ جار (پیرەکان سەروی ٧٥ ساڵ لە لاوازی سوك و مامناوەندی جگەر و گورچیلە سەرەتا ٣٠٠ میلیگرام رۆژانە ١ جار ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ ٨٠٠ میلیگرام رۆژانە ١ جار پاش ٢ تا ٣ هەفتە.

## ئیپتیفیباتید: EPTIFIBATIDE

**ناوی بازرگانی:** Integrilin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,٧٥ و ٢ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiplatelet agent

**بەکارهێنان:** دژی مەینی خوێن و کەڵەکەبوونی پەرەکانی خوێنە و بۆ بەرگری لە کلۆبوونی خوێن و جەڵدەی دڵ و ئازاری توندی سنگ و بۆ کردنەوەی مولولە گیراوەکانی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، تێکچوونی گەدە، بوونی خوێن لەمیزدا، سەرئێشە، هێڵنجدان، پەڵە، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا بە دەرزی IV ١٨٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام پاشان بە IV ئینفیوشنی بەردەوام ٢ مایکرۆگرام/کیلۆگرام/خولەك.

## ئێردۆستین: ERDOSTEINE

**ناوی بازرگانی:** Erdotin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٣٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Mucolytic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نیشانەی نەخۆشی گران و قورسی تیژ لە نیلتیهابی موزمینی بۆرێچکەکانی هەوا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، تێکچوونی تام، سەرئێشە، پەڵە، شەرا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ٣٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار تا ماوەی ١٠ ڕۆژ.

## ئێرگۆمێترین: ERGOMETRINE

**ناوی بازرگانی:** Ergometrine,Syntometrine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠ مایکرۆگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Prostaglandin

**بەکارهێنان:** هانی بچوکبوونەوەی منداڵدان دەدات و یارمەتی منداڵبوون دەدات و لەگەڵ ئۆکسیتۆسین بۆ کۆنترۆڵکردنی خوێنبەربوونی منداڵدان پاش منداڵبوون یان لەبارچوونی منداڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، ئازاری سنگ، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، دڵەکوتێ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، بچوکبوونەوەی مولولەکانی خوێن. زرنگانەوەی گوێ، ئۆدیمای سی، سەرئێشە، گێژی، پەڵە، خوێن لێبرانی ماسولکەیی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ تا ٥٠٠ مایکرۆگرام بەدەرزی ماسولکەیی IM یان بە دەرزی دەمار IV هێواش. یان لەگەڵ ئۆکسیتۆسین ١ میلیلیتر بە دەرزی IM.

## ئێرگوتامین، سی: ERGOTAMINE- C

**ناوی بازرگانی:** Cafatine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ئێرگۆتامین تارترەیت ١میلیگرام + کافائین ١٠٠ میلیگرام.

**گروپی دەرمان:** Ergot Alkaloid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و پێشگری لە سەرئێشە دەماریەکانی شەقیقە و کلاستەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، بێخەوی، بێهێزی، ئازاری قەفەسەی سنگ، ئازاری سك، ئۆدیمای مەوزوعی، سەرگێژبوون، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورە کان ١ حەب لەسەرەتای حەملەکەدا و پاشان دوبارەکردنەوەی هەر نیوسەعاتێك دواتر تا چاکبوونەوەی نیشانەکانی و لایەنی زۆری بڕی دەرمانی هەر حەملەیەك ٦ حەبە. لانی زۆری بڕی دەرمان لە هەفتەیەکدا ١٠ حەبە.



## ئێرگۆتامین: ERGOTAMINE TARTRATE

**ناوی بازرگانی:** Ergostat,Ergomar

**شێوەی دەرمان:** حەبی ژێرزمان ٢ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Ergot Alkaloid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شەقیقە (Migraine) و کلاستەر (هێشوویی) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، خەواڵویی، هیلاکبوون، تەشەنوج، بێهێزی، ئازاری قەفەسەی سنگ، سکچوون، خوران، ئازاری سك، ئۆدیمای مەوزوعی، سەرگێژبوون.

**بڕی دەرمان:** لەسەرەتادا ٢ میلی‌گرام، ژێرزمانی دواتر ١ تا ٢ میلی‌گرام ژێرزمانی هەر نیوسەعاتێك بەکاردێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٦ میلی‌گرامە لەهەر حەملەیەکدا یان لە ٢٤ سەعاتدا و ١٠ میلی‌گرام لە هەر هەفتەیەکدا.

## ئێرلۆتینیب: ERLOTINIB

**ناوی بازرگانی:** Tarceva

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ١٠٠ و ١٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی سی (NSCLC) و شێرپەنجەی پەنکریاس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدا، سەرئێشە، خەمۆکی، تێکچوونی گەدە، غازات، ڕشانەوە، سکچوون، پەڵە، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری سك، هیلاکی، کۆکە، تەنگەنەفەسی، ئۆدیما، هەوکردنی گەدە، خوران، هەوکردنی چاو، وشکی پێست.

**بڕی دەرمان:** شێرپەنجەی سی (NSCLC) ١٥٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار. شێرپەنجەی پەنکریاس ١٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار لەگەڵ جێمسیتابین.

## ئێرتاپینیم: ERTAPENEM

**ناوی بازرگانی:** Invanz

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ١ گرمی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ناوەوەی سك و سی و هەوکردنی گورچیلە و حەوز و هەوکردنی پێست و شانە نەرمەکان و هەوکردنی ڕێڕەوی میزو هەوکردنی نەخۆشی ژنان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، هەوکردنی زایەندی ژنان، سەرئێشە، تەشەنوج، لەرزین، خوران، تا، پەڵە، زیادبوونی ژمارەی پەڕەی خوێن، وشکی دەم، تێکچوونی تامکردن، نەمانی ئارەزوی خواردن، قەبزی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ ئازاری سنگ، بێخەوی، خەمۆکی، قەلەقی، کەمبوونی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** بە IV ئینفیوشن گەورەکان و لاوانی سەروی ١٣ساڵ ١ گرام ڕۆژانە ١ جار، منداڵانی ٣ مانگ تا ١٣ ساڵ ١٥ میلیگرام/کیلۆگرام هەموو ١٢ سەعاتێك (لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١ گرامە). بۆ پێشگری نەشتەرگەری، نەشتەرگەری کۆڵۆن و کۆم، گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ١ گرام بەتەواوی لە ١ سەعاتدا پێش لە نەشتەرگەری.

## ئەریثرۆمایسین: ERYTHEROMYCIN

**ناوی بازرگانی:** Erythrocin ,Erymax,Benzamycin

**شێوەی دەرمان:** حەبی کرماندنی ٢٠٠ میلیگرامی و حەبی ٤٠٠ میلیگرامی و دەرزی ٥٠٠ میلیگرامی و ١ گرامی حەبی ٢٥٠ و ٣٣٣ و ٥٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ٢٥٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ١٢٥ و ٢٥٠ و ٢٠٠ و ٤٠٠ میلیگرام /٥میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنێك بەکاردێت بەهۆی ڕێژەیەکی زۆری بەکتریاوە و بۆ چارەسەری هەوکردنی ڕێڕەوی هەناسە و قوڕگ و گوێ و هەوکردنی سی و کۆکەڕەشەو تای ڕۆماتیزمی و هەوکردنەکانی کۆجیلەی سمت و هەوکردنی ئەمیبی ڕیخۆڵە و هەوکردنی پێست و چاو بۆ چارەسەری زیپکە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، پەڵە، ناڕێکی لێدانی سکۆڵەیی، ڕشانەوە، ئازاری سك، سکچوون، تێکچوونی بیستن، زەردی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی هەموو ٦ تا ١٢ سەعاتێك، یان ئەیپل سەکسینەیت ٤٠٠ تا ٨٠٠ میلیگرام خۆراکی هەموو ٦ تا ١٢ سەعاتێك، ٥٠٠ میلیگرام تا ١ گرام بە دەمار هەموو ٦ سەعاتێك، پرۆکاینتیك ٢٥٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ جار ٣٠ خولەك پێش لە خواردن، منداڵان ٣٠ تا ٥٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا دابەشکراو لە هەموو ٦ تا ٨ سەعاتێك، یان ٢٠ تا ٤٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا بە دەمار دابەشکراو لە هەموو ٦ سەعاتێکدا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢ گرامە لە ڕۆژێکدا.

## ئەریترۆمایسین( چاوی ): ERYTHEROMYCIN ( OPH )

**ناوی بازرگانی:** Ilotycin

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی چاو ٠,٥ ٪.

**گرووپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی چاوی منداڵی ساوا و هەوکردنی گلێنە و کۆرنیەی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی چاو.

**بڕی دەرمان:** ٢ تا ٦ جار لە ڕۆژێکدا.

## ئەریترۆمایسین( مەوزوعی ): ERYTHEROMYCIN( TOPICAL )

**ناوی بازرگانی:** Eoymax

**شێوەی دەرمان:** گیراوەو جێڵی مەوزوعی ٢٪و ٤٪.

**گرووپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری مەوزوعی زیپکەی ناسایی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی پێست، خوران، سوتانەوە، ڕوشان.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ جار لەگیراوەی مەوزوعی یان جێڵی مەوزوعی ٢٪ ڕووی ئەو شوێنەی پێ بماڵن،ماوەی **بەکارهێنان**ی دەرمان ٨ تا ١٢ هەفتەیە.

## ئیسیتالۆپرام: ESCITALOPRAM

**ناوی بازرگانی:** Lexapro

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ و ٢٠ میلی‌گرامی و گیراوەی ١ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری قەلەقی و خەمۆکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، لەرزین. تا، ئارەقکردنەوە. نارێکی لێدانی دڵ لەرزین، سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، بێهێزی –تەشەنوج. خەواڵویی، گێژی. بێخەوی، غازات، دڵەکزە، قەبزی، تێکچوونی گەدە، لاوازی سێکسی، وشکبوونەوەی دەم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ١٠ تا ٢٠ میلی‌گرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا.



## ئیزمۆلۆل: ESMOLOL

**ناوی بازرگانی:** Brevibloc

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠ میلی‌گرام /میلی‌لیتر (١٠ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Beta blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نارێکی لێدانی دڵ و زیادبوونی لێدانی دڵی سەروسکۆڵەیی و پەستانی بەرزی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، دابەزینی زەخت، ئازاری شوێنی دەرزی لێدان، تەسکبوونەوەی بۆری هەوا، هیلاکبوون، ئارەقکردن، گێژی، سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێهێزی، بێخەوی، تەنگەنەفەسی، گیرانی لوت.

**بڕی دەرمان:** بڕی سەرەتایی ٥٠٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام تا ١ خولەك بە دەمار و بڕی جێگیر و پارێزراو ٥٠٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرامە بەماوەی ٤ خولەك.

## ئیزۆمیپرازۆل: ESOMEPRAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Nexium

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٠ و ٤٠ میلی‌گرامی و ڤیاڵی ٢٠ و ٤٠ میلی‌گرامی و سەسپێنشنی ٢٠ و ٤٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Proton pump inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری برینی گەدە و دوانزەگری و برینی گەدەی دروست بوو بەهۆی بەکتریایی (H Pylori) و گەڕانەوەی ترشەڵۆکی گەدە بۆ سورێنچك و زیادبوونی ترشەڵۆکی گەدە و تێکچوونی سورێنچك بەهۆی ترشەڵۆکی گەدەوە و دڵەکزە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، غازات، سکچوون، ئازاری سك، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی جگەر، هەوکردنی جگەر، پەڵە، وشکبوونەوەی پێست، پەککەوتنی دڵ کۆکە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ساڵ ٢٠ تا ٤٠ میلی‌گرام بۆ ماوەی ٤ تا ٨ هەفتە.

## ئیستازۆلام: ESTAZOLAM

**ناوی بازرگانی:** Prosom

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ و ٢ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Hypnotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بێخەوی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ئازاری گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، زەردی، تا، لەرز، خرۆشان، ناڕێکی لێدانی دڵ، خەواڵویی، ئازار، ڕشانەوە، وشکبوونەوەی دەم، سەرئێشە، دڵەکوتێ، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ میلیگرام خۆراکی لە کاتی خەودا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢ میلیگرامە لە کاتی خەودا.

## ئیسترادیول: ESTRADIOL SR

**ناوی بازرگانی:** Estraderm

**شێوەی دەرمان:** هیمیهایدرەیت و پلاستەری نۆرماڵ ١٠٠ مایکرۆگرام/٢٤سەعات و ٢٥مایکرۆگرام/٢٤سەعات و ٥٠مایکرۆگرام /٢٤سەعات.

**گروپی دەرمان:** ئیسترۆجین.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ڤەجاینیتس ئەترۆفیك (هەوکردن و پوکانەوەی دەزگای زایەندی ژنان) و کەمی ئیسترۆجین و ناتەواوی سەرەتایی هێلکەدان و پوکانەوەی ئێسك بەهۆی لەحەیزچونەوەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەمۆکی، گۆڕانی ڕەنگی پێست، هەڵوەرینی موو، ئازاری سك، ئیلتیهابی ڕیخۆڵە، ئیلتیهابی دەزگای زایەندی، زیپکە، چەوری دەردان، سکچوون، قەبزی، زیادبوون و کەمبوونی ئارەزوی خواردن، غازات، زیادبوونی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** یەك پلاستەر ٢٥ تا ٥٠ مایکرۆگرام هەر هەفتەیەك یان هەر ٤ ڕۆژ جارێك بیگۆڕیت.

## ئیسترادیول: ESTRADIOL VALERATE

**ناوی بازرگانی:** Delestrogen

**شێوەی دەرمان:** حەبی١ و ٢ میلیگرامی و دەرزی ١٠ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** ئیسترۆجین.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی مەمك کە شایەنی نەشتەرگەری نی یە و ڤەجاینیتس ئەترۆفیك (هەوکردن و پوکانەوەی دەزگای زایەندی ژنان) و گەرەبوونی مەمك پاش منداڵ بوون و ناتەواوی سەرەتایی هێلکەدان و نیشانەکانی لەحەیز چوونەوە و هایپۆگنادیسم و شێرپەنجەی پرۆستات بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، سەرگێژبوون. خەمۆکی، گۆڕانی ڕەنگی پێست، هەڵوەرینی موو، ئازاری سك، ئیلتیهابی ڕیخۆڵە. ئیلتیهابی دەزگای زایەندی، زیپکە، چەوری دەردان، سکچوون، قەبزی، زیادبوون و کەمبوونی ئارەزوی خواردن، غازات، زیادبوونی شەکری خوێن.



**بڕی دەرمان:** بۆ شێرپەنجەی مەمك كە شایەنی نەشتەرگەری نی یە ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار بۆ ماوەی ٦ مانگ. گەورەبوونی مەمك پاش منداڵ بوون ١٠ تا ٢٥ میلیگرام بە IV، پاش لە یەكەمین قۆناغی منداڵبوون. ڤەجاینیتس نەترۆفیك (هەوكردن و پوكانەوەی دەزگای زایەندی ژنان) و ناتەواوی سەرەتایی هێلكەدان و نیشانەكانی لەحەیزچوونەوە و هایپۆگنادیسم و ئوراكتۆمی ١ تا ٢ میلیگرام خۆراكی ڕۆژانە بۆ ماوەی ٢١ ڕۆژ،پاش لە ٧ ڕۆژ بەكارنەهێنانی دەرمان،دوبارە دەورەی دەرمان دوبارە دەكرێتەوە. ڕێگەیەكی تری ڕێپێدراو، بە ماسولكەیی IM ٠,٢ تا ١ میلیگرام هەر هەفتەیەك. هایپۆگنادیسمی ژنان ١,٥ تا ٢ میلیگرام ماسولكەیی بە ماوەی مانگانە.

## ئیسترادیول: ESTRADIOL TOPICAL

**شێوەی دەرمان:** جێڵی ٠,٠٦٪ و جێڵی هیمیهایدرەیت ٥٠٠ مایكرۆگرامی و حەبی زایەندی ژنان ٢٥ میلیگرام و ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ مایكرۆگرام/٢٤سەعات (هیمیهایدرەیت) (Transdermal patch ER).

**گروپی دەرمان:** ئیسترۆجین.

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوكردن و پوكانەوەی دەزگای زایەندی ژنان بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** زیپكە، هەڵوەرینی موو، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سكچوون، قەبزی، كاندیدای دەزگای زایەندی ژنان، سەرئێشە، زیادبوونی ئارەزوی خواردن ـسەرگێژبوون، نەكەوتنەعوز.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ تا ٤ گرام، جێڵ بۆماوەی ١ تا ٢ هەفتە، بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ١ گرام هەفتەی ١ تا ٣ جارە.

## ئیستراموستین: ESTRAMUSTINE

**ناوی بازرگانی:** Estracyt,Emcyt

**شێوەی دەرمان:** كەپسولی ١٤٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Alkylating agent

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پرۆستات بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** سكچوون، پەككەوتنی دڵی خوێنتێزراو، سیسبوونی دڵ سەكتە، خوران، ئۆدیما، لاوازی سێكسی، بێخەوی، وشكی دەم، گەورەبوونی مەمك، دڵەڕاوكێ، گەورەبوونی مەمك، هێڵنجدان، كەمبوونەوەی خرۆكەی سپی خوێن، تەنگەنەفەسی، ڕشانەوە، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** ٠,١٤ تا ١,٤ گرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشكراودا ( بڕی دەرمانی ئاسایی سەرەتا ڕۆژانە ٥٦٠ تا ٨٤٠ میلیگرام).



## ئیسزۆپیکلۆن: ESZOPICLONE

**ناوی بازرگانی:** Lunesta

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ و ٢ و ٣ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Hypnotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بێخەوی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، خرۆشان، قەلەقی، خەمۆکی، خەواڵویی، گێژی، سەرئێشە، ئازاری گەدە، قەبزی، نەمانی ئارەزوی خواردن، وشکی دەم، تامی ناخۆشی ناودەم، پەڵە، خەیاڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ تا ٣ میلی‌گرام خۆراکی دەستبەجێ پێش لە کاتی خەوتن. پیرەکان ١ تا ٢ میلی‌گرام خۆراکی دەستبەجێ پێش لە کاتی خەوتن.

## ئیتامسیلەیت: ETAMSYLATE

**ناوی بازرگانی:** Dicynene

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antifibrinolytic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری لە دەستچوونی خوێن بەهۆی زۆری خوێنی بێنوێژی یەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، تا، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٤ جار لە کاتی بێ نوێژی مانگانەدا.

## ئیتانێرسێپت: ETANERCEPT

**ناوی بازرگانی:** Enbrel

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥ میلی‌گرامی و دەرزی منداڵان ٢٥ میلی‌گرام و دەرزی ٢٥ و ٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antirheumatic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ڕۆماتیزم و هەوکردنی جومگە لە لاوان و ئیلتیهابی فەقەرەکان و سۆریاسس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ئۆدیما، هەوکردنی گەروو، پەڵە، هەوکردنی جیوب، هەوکردنی لوت، هێڵنجدان، ئازاری سك، کەمخوێنی، کۆکە، هەوکردنی بەشی خوارەوەی سی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ میلی‌گرام ١ جار لە هەفتەیەکدا و یان لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراوی یەکساندا هەر جارەی ٢٥ میلی‌گرام بەژێرپێستی SC لە ٢ شوێنی جیاواز، منداڵان ٤ تا ١٧ساڵ ٠,٤ میلی‌گرام/کیلۆگرام (لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢٥ میلی‌گرام) ٢ جار لە هەفتەیەکدا بۆ ماوەی ٣ مانگ.

ت: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ



## ئیثاکریدین: ETHACRIDINE LACTATE

**ناوی بازرگانی:** Acrinol,Rivanol

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی (BULK).

**گروپی دەرمان:** Antiseptic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی پێست و برینەکان و سوتان و سوتانەوەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سەرئێشە، سوربونەوەی پێست.

**بڕی دەرمان:** لە گیراوەی ١٪و بەبڕی پێویست و مەوزوعی سودی لێوەردەگیرێت.

## ئیثاکرینیک ئەسید: ETHACRYNIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Edecrin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Loop diuretic

**بەکارهێنان:** میزهێنەرەو بۆچارەسەری ئۆدیما بەهۆی پەککەوتنی دڵ و تێکچوونی جگەر و گورچیلەوە و دژی پەستانی بەرزی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوونی گەدە و ڕیخۆڵە. کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم و کلۆر لەلەشدا، هیلاکبوون، زیادبوونی چەوری خوێن، بێهێزی، سەرئێشە، تێکچوونی بینین و بیستن، هەوکردنی پەنکریاس، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، سکچوون، ژەهراویبوونی جگەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٥٠ تا ٢٠٠ میلیگرام خۆراکی. منالأن ڕۆژانە ٢٥ میلیگرام خۆراکی. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٤٠٠ میلیگرامە.

## ئیثامبیوتول: ETHAMBUTOL HCL

**ناوی بازرگانی:** Myambutol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antituberculosis

**بەکارهێنان:** لەگەڵ دەرمانەکانی تردا بۆچارەسەری نەخۆشی سیلی سی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، خوێن بەربوونی گەدە و ڕیخۆڵە، گیرانی میز، ئازاری سك، تا، پەڵە، خوران، شەرا، کەمبوونەوەی پەرەی خوێن، سەرئێشە، سەرگێژبوون، تێکچوونی جگەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالأنی سەروی ١٢ ساڵ ١٥ تا ٢٥ میلیگرام/کیلۆگرام ١جار لە ڕۆژێکدا تا ٢ جار لە هەفتەیەکدا.



**ئیثەر:** ETHER

**ناوی بازرگانی:** OG

**شێوەی دەرمان:** گازی ئیستینشاقی

**گروپی دەرمان:** Anesthesia

**بەکارهێنان:** وەك بەنجی ئیستنشاقی (هەڵمژین) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تەشەنوج، زیادبوونی شەکری خوێن، زیادبوونی لیک، ڕشانەوە، کرژبوونی قوڕگ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** بڕەکەی پەیوەستە بە وەزعیەتی نەخۆشەوە.

**ئەثینیل ئیسترادیول:** ETHINYL ESTRADIOL

**ناوی بازرگانی:** Feminone,Estinyl,Marvelon

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٥ میلی‌گرامی و حەبی ٠,٠٥ میلی‌گرام.

**گروپی دەرمان:** Antineoplasm

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و ئازارکەمکەرەوەی شێرپەنجەی تەشەنەکردووی مەمك و ( لانی کەم ٥ ساڵ پاش لەحەیزچونەوە ) و بۆ چارەسەر و ئازارکەمکەرەوەی شێرپەنجەی ناشایەنی نەشتەرگەری و تەشەنەکردووی پرۆستات و بۆچارەسەری نیشانەکانی لەحەیزچوونەوە و گەورەبوونی مەمك پاش لە منداڵبوون و هایپۆگۆنادیسمی ژنان (لاوازی و خراپی کاری هێلکەدان کە ئەبێتەهۆی نەمان یان لاوازی لە توخمە سیفەتە دووەمی یەکاندا، وەك گەورەبوونی مەمك و گەشەی مووی عەورەت) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەوکردنی دەزگای زایەندی ژنان، زیادبوونی کێش، تۆدیما.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٠٢ تا ١,٥ میلی‌گرام ڕۆژانە ٣ جار.

**ئیثایوناماید:** ETHIONAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Trecator SC

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی سیلی چالاك (لە کاتی نەمانی چارەسەر بە دەرمانەکانی خەتی یەکەم) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی دەروونی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، پەڵە، هەوکردنی جگەر، گەورەبوونی مەمك –ئازاری سك، سکچوون، نەخۆشیەکانی جگەر، لەرزین، نەمانی ئارەزوی خواردن، ڤێ، زەردی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٥٠٠ تا ١٠٠٠ میلیگرام خۆراکی لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## ئیثۆسەکسیمایدە: ETHOSUXIMIDE

**ناوی بازرگانی:** Emeside,Zarontin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥٠ میلیگرام و شروبی ٢٥٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر (٢٤٠میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antiepileptic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری فێی سوك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، گێژی، خەمۆکی، پەڵە، ئازاری سك، کەمبوونەوەی کێش، قەبزی، تێکچوونی خوێن، کەمخوێنی، سەرئێشە، هیلاکبوون، خەواڵوویی، خوران، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالأنی سەروی ٦ ساڵ سەرەتا ٥٠٠میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، زیاد دەکرێت بەبڕی ٢٥٠ میلیگرام هەموو ٤ تا ٧ ڕۆژێك بۆ بڕی دەرمانی ئاسایی لە ١ تا ١,٥ گرام ڕۆژانە لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، جار جار ڕۆژانە تا ٢ گرام لەوانەیە پێویست بێت. منالی ١ مانگ تا ٦ ساڵ سەرەتا ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام (لایەنی زۆر بڕی ٢٥٠ میلیگرام) ڕۆژانە لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، بەتەدریجی زیاددەکرێت بۆ زیاتر لە ٢ تا ٣ هەفتە بۆ بڕی دەرمانی ئاسایی لە ٢٠ تا ٤٠ میلیگرام/کیلۆگرام (لایەنی زۆر ١ گرام) ڕۆژانە لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، سەرجەمی بڕی دەرمانی ڕۆژانە ئەبێت وەربگیرێت لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## ئیتیدرونەیت: ETIDRONATE DISODIUM

**ناوی بازرگانی:** Etidron,Didronel

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Bisphosphonate

**بەکارهێنان:** دژی زۆربوونی کالسیۆم و ئۆستیۆپۆرۆسس (پوکانەوەی ئێسك) و نەخۆشی باجەتی ئێسك بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری ئێسك، ئازاری ماسولکە، سکچوون، تەشەنوج، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، سەرئێشە، خراپبوونی پێست، تەنگەنەفەسی، قەبزی، حەساسیەت، هەڵوەرینی موو، ئیلتیهاب و ئاوسانی زمان.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە بڕی ٥ تا ٢٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام بۆ ماوەی ٣ تا ٦ مانگ. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢٠ میلی‌گرام/کیلۆگرامە.

## ئیتۆدۆلاك: ETODOLAC

**ناوی بازرگانی:** Etopan XL,Lodine SR,Eccoxolac

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠٠ و ٥٠٠ میلی‌گرامی و حەبی ٤٠٠ و ٥٠٠ و ٦٠٠ میلی‌گرامی و کەپسولی ٢٠٠ و ٣٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهابی ڕۆماتیزم و هەوکردنی جومگەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەوکردنی گەدە، دڵەکوتێ، تەنگەنەفەسی، هیلاکی، لەرزین، زۆرمیزکردن، خوران، تا، شڵەژان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەرووی ١٨ ساڵ ڕۆژانە ٦٠٠ میلی‌گرام لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## ئیتومیدەیت: ETOMIDATE

**ناوی بازرگانی:** Amidate

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (١٠میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** General Anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی عمومی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، نارێکی لێدانی دڵ، ئازاری شوێنی دەرزی لێدان، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوران، وەستانی هەناسە، لاوازی ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١٠ ساڵ ٠.٢ تا ٠,٦ میلی‌گرام/ کیلۆگرام بەدەمار کە بە ماوەی ٣٠ تا ٦٠ چرکە دەرزی لێ دەدرێت.

بۆ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## ئیتۆپۆساید: ETOPOSIDE

**ناوی بازرگانی:** Eposin ,toposar,Vepesid

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥٠ و ١٠٠ میلیگرام و ئینفیوشنی ٢٠ میلیگرام/میلیلیتر (٥میلی لیتر) و ٢٠میلیگرام/میلیلیتر (١٠میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Cytotoxic drug

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی سی و هێلکەگون و هێلکەدان و لیمفۆما و ئایدزی پەیوەست کاپۆسی سارکۆما (لوویەکی پیسە دروست دەبێت لە مولولەکانی خوێن لە پێستدا و بەشێوەی گرێ یان پەڕەیەکی بچوك بەڕەنگی مۆر بۆ قاوەیی یەکی تاریك دەردەکەوێت ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادبوونی لێدانی دڵ، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن، هەڵوەرینی موو، کرژبوونی سك، تێکچوونی خوێن، ئارەقکردن، ئازار لە شوێنی دەرزی لێدان، سکچوون، ئازاری سك، نەمانی هەستی بۆن کردن.

**بڕی دەرمان:** بۆ شێرپەنجەی هێلکەگون گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام/مەتر دوجا ڕۆژانە لە ڕێگەی دەمارەوە لەڕۆژەکانی ١ تا ٥ یان ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرام/ مەتر دوجا، لەڕۆژانی ١ و ٣ و ٥ کەهەر ٣ تا ٤ هەفتە ١ جار، ئەبێت دەرمان دووبارەبکرێتەوە. شێرپەنجەی سی لە جۆری خانەی بچوك گەورەکان ڕۆژانە ٧٠ میلیگرام/مەتردوجا، خۆراکی بۆ ماوەی ٤ ڕۆژ یان ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرام/ مەتردوجا، بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ هەر ٣ تا ٤ هەفتە ١ جار، دەرمان دووبارە دەکرێتەوە. بەهەمان شێوە ئەتوانی ڕۆژانە ٣٥ میلیگرام/مەتردوجا، بەدەمار بۆماوەی ٤ ڕۆژ یان ٥٠ میلیگرام/مەتردوجا ڕۆژانە بەدەمار بۆماوەی ٥ ڕۆژ ڕێی پێدەدرێت. هەر ٣ تا ٤ هەفتە ١ جار، دەرمان دووبارە دەکرێتەوە. ئایدزی پەیوەست بە کاپۆسی سارکۆما ١٥٠ میلیگرام/مەتردوجا بەدەمار ڕۆژانە بۆماوەی ٣ ڕۆژی یەك لە دوای یەك هەر ٤ هەفتەیەك. بەشێوەی پێویست ئەتوانی کە بڕی دەرمان دووبارەبکەیتەوە.

## ئیتۆریکۆکسیب: ETORICOXIB

**ناوی بازرگانی:** Arcoxia

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠ و ٦٠ و ٩٠ و ١٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهابی جومگە و ڕۆماتیزم و هەوکردنی فەقەرەکان و نەخۆشی توندی پاشاکان(داءالملوك) بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** دڵەکوتێ، هیلاکی، وشکی دەم، تێکچوونی تام، برینی دەم، گۆڕانی ئارەزوی خواردن و کێش، ئازاری سنگ، سوربونەوە، کۆکە، تەنگەنەفەسی، قەلەقی، ئازاری ماسولکە و جومگە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٦ ساڵ بۆ هەوکردنی جومگە ٣٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، ئەگەر پێویست زیاد دەکرێت بۆ ٦٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار.بۆ ڕۆماتیزم و هەوکردنی فەقەرەکان ٩٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار. بۆ نەخۆشی توندی پاشاکان (داءالملوك) ١٢٠ میلیگرام ڕۆژانە ١جار لایەنی زۆر بۆ ماوەی ٨ ڕۆژ.

## ئیتراڤیرین: ETRAVIRINE

**ناوی بازرگانی:** Intelence

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** لەگەڵ دەرمانە دژەڤایرۆسەکانی تردا دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، غازات، ئازاری سك، پەڵە. هەوکردنی گەدە، سەکتە، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی چەوری خوێن، کەمخوێنی، هەوکردنی پەنکریاس و جگەر، وشکبوونەوەی دەم، ئازاری سنگ، خەواڵویی، تێکچوونی بینین، ئارەقکردن، گەورەبوونی مەمك، کرژبوونی بۆری هەوا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ٢٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار پاش خواردن.

## ئیتریتینەیت: ETRETINATE

**ناوی بازرگانی:** Tegison

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠ و٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antipsoriatic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی پێستی سۆریاسس (دروستبوونی پولەکەی پێست) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك، هێڵنجدان، تا، هەوکردنی جگەر، خوران، وشکی لوت، هەستیاربوون بەڕوناکی، تێکچوونی بینین، سەرگێژبوون، دڵەڕاوکێ، هەوکردنی گوێ. وشکبوونەوەی دەم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بڕی ١میلیگرام/کیلۆگرام لەڕۆژێکدا لەجۆرە توندەکاندا بڕی دەرمان زیاد دەکرێت.

## ئیڤیرۆلیمەس: EVEROLIMUS

**ناوی بازرگانی:** Afinitor

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Immunosuppressant



**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری لە ڕەفزکردنی ئەندام پاش لە چاندنی گورچیلە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، وشکبوونەوەی دەم، ئازاری سک، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری سنگ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی چەوری خوێن، ئۆدیمای پێڵوی چاو، هەوکردنی سی، هیلاکی، سەرئێشە، بێخەوی، هەوکردنی جگەر، زیادبوونی شەکری خوێن، خوێنبەربوون، پەککەوتنی دڵی خوێنتێزاو، زیادبوونی کۆلیسترۆڵی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار.

**ئیکسیمیستان:** EXEMESTANE

**ناوی بازرگانی:** Aromasin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplasm

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتووی مەمك لە ژنانی لە حەیز چووەوەی موقاوم بە تامۆکسیفین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، قەبزی، خەمۆکی، بێخەوی، دڵەڕاوکێ، هیلاکبون، ئازار، تەنگەنەفەسی، نەمانی ئارەزوی خواردن، لاوازی دڵ، دروستبوونی برینی گەدە، هەڵوەرینی موو، ئارەقکردنەوە، خەواڵویی، پەڵە، سوربونەوە، کەمی پەڕەی خوێن وخرۆکەی سپی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٢٥ میلیگرام خۆراکی پاش لە خواردن.

**ئیکسیناتید:** EXENATIDE

**ناوی بازرگانی:** Byetta

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی دەرزی ٢٥٠ مایکرۆگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Hypoglycemic

**بەکارهێنان:** کۆنترۆڵی شەکری خوێن دەکات و بۆ چارەسەری شەکرەی جۆری ٢ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، تێکچوونی گەدە، ئازاری سك، کەمبوونی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، گێژی، خرۆشان، کەمبوونەوەی شەکری خوێن، زۆر ئارەقکردن، قەبزی، غازات، خەواڵویی، پەڵە، خوران، شەرا.

**بڕی دەرمان:** بەرێگەی ژێرپێستی گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ سەرەتا ٥ مایکرۆگرام ڕۆژانە ٢ جار ١ سەعات پێش لە ٢ ژەمی خواردن (لانی کەم ٦ سەعات بۆ هەر بەشێك)، ئەگەر پێویست بێت بەلانی کەم پاش لە ١ مانگ زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆر ١٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە ٢ جار.



## ئیکسپێکتورانت: EXPECTORANT

**شێوەی دەرمان:** شروبی گوایفینیسین ١٠٠میلی‌گرام +کلۆرفینرامین مالییت ٢میلی‌گرام + فینایلپرۆپانۆلامین ١٢.٥میلی‌گرام هایدرۆکلۆراید ٥میلی‌گرام/٥میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Expectorant

**بەکارهێنان:** دژی کۆکە و بەڵغەم دەرکەرەو بۆ چارەسەری نیشانەی کۆکە و گیرانی لوت بەهۆی سەرمابوون وحەساسیەت و هەوکردنی ڕێڕەوی هەناسەدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالّویی، هێڵنجدان، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ تا ١٠ سیسی ڕۆژانە خۆراکی هەر ٦ سەعاتێك. منالاّن ٢ تا ٦ ساڵ ١,٢٥ تا ٢,٥ سیسی ڕۆژانە خۆراکی هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك، لەمنالاّنی ٦ تا ١٢ساڵ ٢,٥ تا ٥ سیسی ڕۆژانە خۆراکی هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك.

## ئیکسپێکتورانت کۆداین: EXPECTORANT CODEINE

**شێوەی دەرمان:** شروبی گوایفینیسین ١٠٠میلی‌گرام + فینایل پرۆپاندامین ١٢.٥ میلی‌گرام + کۆداین فۆسفەیت ١٠میلی‌گرام/٥میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Expectorant

**بەکارهێنان:** بەڵغەم دەرکەرە و بۆ چارەسەری کۆکە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالّویی، هێڵنجدان، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ تا ١٠ سیسی ڕۆژانە خۆراکی هەر ٦ سەعاتێك، منالاّن ٢ تا ٦ ساڵ ١,٢٥ تا ٢,٥ سیسی ڕۆژانە خۆراکی هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك، لەمنالاّنی ٦ تا ١٢ساڵ ٢,٥ تا ٥ سیسی ڕۆژانە خۆراکی هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك.

## ئیزێتیمایب: EZETIMIBE

**ناوی بازرگانی:** Zetia,ezetrol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antilipemic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبوونەوەی چەوری خوێن و کۆلیسترۆڵی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هەوکردنی گەروو، جیوب، زۆرهیلاکبون، تێکچوونی هەرس، ئازاری ماسولکە و جومگە، هەوکردنی جگەر و پەنکریاس، پەڵە، کەمی پەرەی خوێن، ئازاری قەفەسەی سنگ، ئازاری سك، سکچوون، ئازاری پشت، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالاّنی سەروی ١٠ ساڵ حەبێکی ١٠میلی‌گرامی ڕۆژانە ١جار.



## فاکتەر ٩ کۆمپلێکس: FACTOR IX COMPLEX

**ناوی بازرگانی:** Poplex,Monomine,Alphanine SD

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠ و ٥٠٠ و ١٠٠٠ یەکە/ڤیال/ڕونکەرەوە.

**گروپی دەرمان:** دژی هیمۆفیلیا.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونی فاکتەری ٩ (خوێنبەربوونی بۆماوەیی لە هیمۆفیلیای جۆری B و نەخۆشی کریسمس) و **بەکارهێنان**ی زیاد لە ڕادەی دەرمانە دژە خوێن مەیینەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، زیادبوونی لێدانی دڵ، ڕشانەوە، سوربونەوە، تا، سەرئێشە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، لەرز.

**بڕی دەرمان:** ١ یەکە/کیلۆگرام ڕێی پێدەدرێت کە ١٪ کاریگەری و چالاکی فاکتەری ٩ زیاد دەکات. لە خوێنبەربوونەکاندا ٣٠ تا ١٠٠ یەکە/کیلۆگرام ڕێی پێدەدرێت، بە پێی پێویست نیوەی ئەم بڕانە دوبارە دەکرێتەوە.

## فاکتەری ٧: FACTOR "VII"

**ناوی بازرگانی:** Novoseven

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی.

**گروپی دەرمان:** دژی هیمۆفیلیا.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەرو پێشگری لە خوێنبەربوونی بۆماوەیی هیمۆفیلیای جۆری A و B بەکاردێت (ئەم فاکتەرە پەیوەستە بە ڤیتامین Kەوە).

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، خوران، پەڵە، تا، حەساسیەت، ئازار لە شوێنی دەرزی لێدان، تێکچوونی پێست، تێکچوونی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** ٩٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام هەر ٢ سەعاتێك تا کاتی وەستانەوەی خوێنبەربوون.



## فامسیکلۆڤیر: FAMCICLOVIR

**ناوی بازرگانی:** Famvir

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٢٥ و ٢٥٠ و ٥٠٠ و ٧٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ڤایرۆسی تامێسکی سادە و تامێسکی پشتێنەیی و زایەندی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، سکچوون، سەرئێشە، ئارەقکردنەوە، خەواڵویی، وڕێنە، پەڵە، کەمی پەرەی خوێن، قەبزی، زەردی، تا، هیلاکبوون، گێژی، خوران.

**بڕی دەرمان:** تامێسکی پشتێنەیی ڕۆژانە ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی هەموو ٨ سەعاتێك، بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ. تامێسکی زایەندی ڕۆژانە ٢٥٠ میلیگرام هەموو ٨ سەعاتێك، بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ.تامێسکی سادە ١٢٥ تا ٢٥٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار، کەمدەکرێتەوە لەگەڵ لاوازبوونی گورچیلەدا.

## فامۆتیدین: FAMOTIDINE

**ناوی بازرگانی:** Pepcid,Famotal

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ و ٤٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** H٢ receptor antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری برینی گەدە و ڕیخۆڵە و دوانزەگری بۆ چارەسەری ماوە کۆتایی نەخۆشی گەڕانەوەی مەوادەکان گەدە بۆ سورێنچك (GERD) و نەخۆشی (Zollinge –Ellison Syndrome) نەخۆشییەکی دەگمەنە کە دەبێتەهۆی زیاد لە ڕادە دەردانی ناوگی گەدەیی (ترشەڵۆکی گەدە) بەهۆی زیادبوونی ئاستی هۆرمۆنی گاسترینی بڵاوبووەوە لە لەشدا، کە دروست دەبێت بەهۆی (گاسترینۆما) جۆرێکی شێرپەنجەی دەگمەنە کە دەبێتەهۆی دەردانی زیاد لە ڕادە هۆرمۆنی گاسترین، نەبێتەهۆی (Zollinge –Ellison Syndrome) و بۆ بەرگری لە سەرهەڵدانەوەی برینی دوانزەگری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، دڵەڕاوکێ، خەموکی، بێهێزی، هەڵوەرینی موو، زیپکە، خوران، سکچوون، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکبوونەوەی دەم، گەورەبوونی مەمك، تێکچوونی پێست، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی ئارەزوی سێکسی، ئازاری ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری برینی گەدە و دوانزەگری گەورەکان لە حاڵەتی تیژ، ٤٠ میلیگرام خۆراکی پێش لە خەوتن بۆ ماوەی ٤ تا ٨ هەفتە. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٢٠ میلیگرام خۆراکی پێش لە خەوتن. بۆ چارەسەری ماوە کۆتایی نەخۆشی گەڕانەوەی مەوادەکان گەدە بۆ سورێنچك (GERD) گەورەکان ٢٠ تا ٤٠ میلیگرام خۆراکی، ٢ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ١٢ هەفتە. منداڵان و نەوجەوانانی ١ تا ١٦ ساڵ ١

میلی‌گرام/کیلۆگرام خۆراکی پێش لە خەوتن یان دابەشکراو لە ٢ بڕی دەرماندا ( لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٤٠ میلی‌گرام ٢ جار لە ڕۆژێکدا. بۆ زیاد لە ڕادە دەردانی ترشەلۆکی گەدە وەك (ZES) گەورەکان ڕۆژانە ٢٠ میلی‌گرام خۆراکی، هەر ٦ سەعاتێك. بۆ بەرگری لەسەرهەڵدانەوەی برینی دوانزەگرێ ٢٠ میلی‌گرام پێش لە خەوتن.

## فیبا: FEIBA

**ناوی بازرگانی:** Autoplex

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی.

**گروپی دەرمان:** دژی خوێنبەربوون.

**بەکارهێنان:** دژی خوێبەربوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، جەڵدە، پەڵە، تا، شەرا، ئازاری ماسولکە، سوربونەوە، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** ٧٥یەکە/کیلۆگرام لەڕێی دەمارەوە و دوبارەکردنەوەی لە ماوەی ٦ تا ١٢ سەعاتدا.

## فیبیوکسۆستات: FEBUXOSTAT

**ناوی بازرگانی:** Adenuric

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٨٠ و ١٢٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** gout Anti

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیادبوونی موزمینی یوریك ئەسید لە نەخۆشی داءالملوك دا تەنها بۆ ئەو نەخۆشانەی کە تەحەمولی ئەلۆپرینۆل ناکەن و یان بۆ ئەوانەی کە ناتوانن ئەلۆپرینۆل بەکاربێنن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، فرمانی نائاسایی تێستی جگەر – سەرئێشە، پەڵە، تێکچوونی تام، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، ئۆدیما، سوربونەوە، گێژی، خەواڵویی، میزی خوێناوی، زوو زوو میزکردن، ئازاری ماسولکە، ئیلتیهابی پێست، خوران، شەرا، دڵەکوتێ، لاوازی جگەر، بێخەوی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ٨٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار، ئەگەر پاش لە ٢ تا ٤ هەفتە یوریك ئەسید لە ئاوگی خوێندا زیاتر لە ٦ میلی‌گرام/١٠٠ میلی‌لیتر بوو، زیاد دەکرێت بۆ ١٢٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار.

## فیلۆدیپین: FELODIPINE

**ناوی بازرگانی:** Plendil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ و ٥ و ١٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری سنگ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سووربوونەوە، کەمبوونی لێدانی دڵ ئۆدیما، سەرئێشە، دڵەکوتێ، هیلاکی، پەڵە، خوران، لاوازی سێکسی، تا، زوو میزکردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢,٥ تا ١٠ میلی‌گرام لە بەیانیاندا.

## فینبیوفین: FENBUFEN

**ناوی بازرگانی:** Fenbufen

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠٠ و ٤٥٠ میلی‌گرامی و کەپسولی ٣٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهابی نەخۆشی ڕۆماتیزم و نەخۆشی یەکانی تری پەیکەرە ماسولکە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، هێڵنجدان، پەڵە، سکچوون، خوێنبەربوون و برینی گەدە و ڕیخۆڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠٠ میلی‌گرام لە بەیانیاندا یان ٦٠٠ میلی‌گرام لەکاتی خەودا یان ٤٥٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٢ جار.

## فینفلورامین: FENFLURAMINE

**ناوی بازرگانی:** Pondimin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ میلی‌گرام.

**گروپی دەرمان:** دژی ئیشتیها.

**بەکارهێنان:** بۆ کەمکردنەوەی ئارەزوی خواردن و دژی قەڵەوی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، خراپی هەرس، سکچوون، ئارەقکردن. بێهێزی، سەرگێژبوون، بێخەوی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠ میلی‌گرام ٣ جار لە ڕۆژێکدا، ١ سەعات پێش لە نان خواردن.

## فینۆفایبرەیت: FENOFIBRATE

**ناوی بازرگانی:** Lipofen,Lofebra,Antara

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥٠ و ١٠٠ و ١٥٠ میلی‌گرامی و کەپسولی لۆفیبرا ٦٧ و ١٣٤ و ٢٠٠ میلی‌گرامی و کەپسولی ئەنتارا ٤٣ و ١٣٠ میلی‌گرامی و حەبی ٥٤ و ١٦٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antilipemic

**بەكارهێنان:** بۆ دابەزاندنی چەوری خوێن بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** تێكچوونی بینین، بێهێزی. گێژی، كەمبوونەوەی چەوری، هەوكردنی لوت، زۆرهیلاكبوون، سەرئێشە، بێخەوی، ئازاری گوێ، جیوب، ئازاری سك، تێكچوونی ئیشی جگەر، قەبزی، سكچوون، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، هەوكردنی پەنكریاس، ڕشانەوە، كەمخوێنی، كۆكە، خوران، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ٤٣ تا ١٦٠ میلیگرام/كیلۆگرام لە ڕۆژێكدا، لەگەڵ خواردندا بەكاردێت، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٠٠ میلیگرامە. كەم دەكرێتەوە لەگەڵ لاوازبوونی گورچیلەدا.

## فیلبامەیت: FELBAMATE

**ناوی بازرگانی:** Taloxa,felbatol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiepileptic

**بەكارهێنان:** ئەم دەرمانە بەهۆی بوونی كاریگەری توندی تەنها بۆ حاڵەتەكانی تەشەنوجی مقاوم بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** سەرئێشە. بێخەوی، كەمخوێنی، ڕشانەوە، كەمبوونەوەی كێش، كەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، تا، شێتی، كاریگەری توندی لەسەر هەرس و چاو هەیە.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ١٢٠٠ میلیگرام لە ڕۆژێكدا، لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشكراودا. منالآنی گەورەتر لە ٢ ساڵ تا ١٤ ساڵ ١٥ میلیگرام/كیلۆگرام لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشكراودا.

## فینۆلدۆپام: FENOLDOPAM

**ناوی بازرگانی:** Corlopam

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەكارهێنان:** لەحاڵەتی فریاكەوتندا لە نەخۆشخانەكاندا لە چارەسەركردنی پەستانی بەرزی خوێنی توندا بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئۆدیما، هێڵنجدان، ڕشانەوە، لەرینەوە و لەرزینی گوێچكەلە، سووربونەوە، ئازاری سنگ، كەمبوونی لێدانی دڵ پەككەوتنی دڵ دڵەكوتێ، سیسبوون و جەڵدەی دڵ سەرئێشە، تا، خوێنبەربوون.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ٠,٠٣ تا ٠,١ مایكرۆگرام/كیلۆگرام لە خولەكێكدا بە IV ئینفیوشن،پێوانەكردنی هەموو ١٥ خولەك بە ١,٦ مایكرۆگرام/كیلۆگرام لە خولەكێكدا بۆ لایەنی زۆر ٠,٠٥ تا ٠,١ مایكرۆگرام/كیلۆگرام لە خولەكێكدا.



## فینۆپرۆفین: FENOPROFEN

**ناوی بازرگانی:** Nalfon,Fenopron

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٠٠ و ٣٠٠ و ٦٠٠ میلیگرامی و حەبی ٣٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهاب لە ڕۆماتیزم و نەخۆشی یەکانی تری پەیکەرە ماسولکە و ئازاری سوك و مامناوەند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە وڕیخۆڵە، گێژی، پەڵە. هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، هەوکردنی میزەڵدان، خوێنبەربوون و برینی گەدە و ڕیخۆڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠٠ تا ٦٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار لە گەڵ خواردندا، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣ گرامە. کەپسول ٢٠٠ تا ٦٠٠ میلیگرام هەموو ٤ تا ٨ سەعاتێك تا لایەنی زۆری ٣٢٠٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا لەگەڵ خواردندا.

## فینتانیل: FENTANYL CITRATE

**ناوی بازرگانی:** Sublimaze, duragesic

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ مایکرۆگرام/میلیلیتر ( ٢ میلیلیتر، ٥ میلیلیتر، ١٠ میلی لیتر) پلاستەری ٢٥ و ٥٠ و ٧٥ و ١٠٠ مایکرۆگرام/سەعات و حەبی ١٠٠ و ٢٠٠ و ٣٠٠ و٤٠٠ و ٦٠٠ و ٨٠٠ مایکرۆگرامی و لۆزینج ٢٠٠ و ٤٠٠ و ٦٠٠ و ٨٠٠ مایکرۆگرامی و ١,٢ میلیگرامی و ١,٦ میلیگرامی و سپرای لوت ٥٠ و ١٠٠ و ٢٠٠ مایکرۆگرامی و سپرای لوت ١٠٠ و ٤٠٠ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Narcotic analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری توند و ئازاری پێش لە نەشتەرگەری و پاش لە نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، تەشەنوج، تێکچوونی خەو، گێژی، خرۆشان، خوران، پەڵە، سوربونەوە، زیادلێدانی دڵ کەمبوونەوەی لێدانی دڵ ئۆدیما، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، شۆك، وشکبوونەوەی دەم، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، گیرانی میز. هەناسەوەستان، تێکچوونی بینین، کەمبوونەوەی ئارەزوی سێکسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ مایکرۆگرام IM، نیوسەعات پێش لە جەراحی، لەبێهۆشکەری مەوزوعی و عومومیشدا بەکاردێت. بڕی دەرمان بەپێی جۆری دەرمانەکە دەگۆڕێت.



## فیریك کاربۆکسیمالتۆز: FERRIC CARBOXYMALTOSE

**ناوی بازرگانی:** Ferinject

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antianemia

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمی ئاسن لە نەخۆشی کەمخوێنی دا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، سەرئێشە، گێژی، پەڵە، ئازاری سنگ – ئزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سوربونەوە، هیلاکبوون، ئازاری جومگە و ماسولکە، ئازاری پشت، خاوی، تا، خوران، شەرا، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** بە دەرزی IV هێواش یان بە IV ئینفیوشن گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٤ ساڵ، بڕەکەی حساب دەکرێت بەپێی کێشی لەش یان کەمی ئاسن.

## فیریك ئۆکساید: FERRIC OXIDE

**ناوی بازرگانی:** Ferrivenin,venofer

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠ میلی گرام/میلی گرام.

**گروپی دەرمان:** Antianemia

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمخوێنی بەهۆی کەمی ئاسنەوە بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠تا٢٠٠ میلی گرام ڕۆژانە بەدەمار IV.

## فیرەس فیومارەیت: FERROUS FUMARATE

**ناوی بازرگانی:** Fersaday,fersamal,galfer

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٢٢ میلی گرام(١٠٠ میلی گرام ئاسن) و بۆ بەرگری لە کەمخوێنی ڕۆژانە ١ حەب. بۆ چارەسەر ١ حەب ڕۆژانە ٢ جار.حەبی ٢١٠ میلی گرام(٦٨ میلی گرام ئاسن) و بۆ بەرگری ١ حەب ڕۆژانە ١ تا ٢ جار، بۆ چارەسەر ١ حەب ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار. شروبی ١٤٠ میلی گرام(٤٥ میلی گرام ئاسن)/٥ میلی لیتر. بۆبەرگری ٥ میلی لیتر ڕۆژانە ٢ جار بۆ چارەسەر ١٠ میلی لیتر ڕۆژانە ٢ جار. منداڵی ١ مانگ تا ٦ ساڵ ٢,٥ تا ٥ میلی لیتر.منداڵی ٦ تا ١٨ ساڵ ١٠ میلی لیتر ڕۆژانە ٢ جار. کەپسولی ٣٠٥ میلی گرام (١٠٠ میلی گرام ئاسن) گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ ساڵ بۆ بەرگری ڕۆژانە ١ کەپسول بۆ چارەسەر ١ کەپسول ڕۆژانە ٢ جار. شروبی ١٤٠ میلی گرام (٤٥ میلی گرام ئاسن)/٥ میلی لیتر. گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ ساڵ بۆ بەرگری ١٠ میلی لیتر ڕۆژانە ١ جار. بۆ چارەسەر ١٠ میلی لیتر ڕۆژانە ١ تا ٢ جار منداڵی ١ مانگ تا ١٢ ساڵ بۆ بەرگری و چارەسەر ٠,٥ میلی لیتر/کیلۆگرام ڕۆژانە لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. لایەنی زۆر ڕۆژانە ٢٠



میلی‌لیتر.منداڵی کۆرپە کێشی تا ٣ کیلۆگرام بۆ بەرگری ڕۆژانە ٠,٥ میلی لیتر. بۆ کۆرپە بۆبەرگری و چارەسەر ٠.٢٥ میلی لیتر/کیلۆگرام ڕۆژانە ٢ جار لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

**گرووپی دەرمان:** Antianemia

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمی ئاسن لە نەخۆشی کەمخوێنی دا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی گەدە و ڕیخۆڵە، هێڵنجدان، قەبزی، سکچوون، ڕشانەوە، دڵەکزە، ئازاری گەدە، ئازاری سنگ.

**بڕی دەرمان:** لە شێوەی دەرماندا باسکراوە.

## فیرەس گلوکۆنەیت: FERROUS GLUCONATE

**ناوی بازرگانی:** Fergon

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠٠ میلی‌گرام(٣٥ میلی‌گرام ئاسن).

**گرووپی دەرمان:** Antianemia

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمی ئاسن لە نەخۆشی کەمخوێنی دا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی گەدە و ڕیخۆڵە، هێڵنجدان، قەبزی، سکچوون، ڕشانەوە، دڵەکزە، ئازاری گەدە، ئازاری سنگ.

**بڕی دەرمان:** بۆ بەرگری ڕۆژانە ٢ حەب پێش خواردن، بۆ چارەسەر ٤ تا ٦ حەب لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا پێش خواردن. منداڵی ٦ تا ١٢ساڵ بۆ بەرگری و چارەسەر ڕۆژانە ١ تا ٣ حەب.

## فیرەس سەلفەیت: FERROUS SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Ferralyn,Feosol

**شێوەی دەرمان:** قەترەی خۆراکی ١٢٥ میلی‌گرام (٢٥ میلی‌گرام ئاسن)/ میلی‌لیتر و (فیرەس سەلفەیت ٧H٢O) حەبی ٥٠ میلی‌گرامی و شرووبی ٢٠٠ میلی‌گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antianemia

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمخوێنی،پێشگری و چارەسەر لە کەمخوێنی و کەمی ئاسن دا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری دڵ، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، ڕەشبوونی پیسایی، ڕەنگبوونی ددان، تێکچوونی گەدە.

ڕاتین: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێک نەخۆشی

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری کەمی ئاسن گەورەکان ٣٠٠ میلیگرام خۆراکی، ڕۆژانە ٢ جار،بە تەدریجی ئەتوانی کە بڕی دەرمان تا ٣٠٠ میلیگرام، ڕۆژانە ٤ جار زیاد بکەیت. مناڵی ٢ تا ١٢ ساڵ ٣ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا. منالی ٦ مانگ تا ٢ ساڵ ٦ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. شیرخۆران ١٠ تا ٢٥ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ پێشگری لە کەمخوێنی بەهۆی کەمی ئاسن گەورەکان ڕۆژانە ٣٠٠ میلیگرام خۆراکی. منالان ٥ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە خۆراکی،لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## فیسۆتیرۆدین: FESOTERODINE FUMARATE

**ناوی بازرگانی:** Toviaz

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤ و ٨ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticholinergic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری میز ڕانەگرتن و دوبارە میزکردن و زوومیزکردن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی دەم، قەبزی، غازات، تێکچوونی تام، تێکچوونی بینین، وشکبوونەوەی چاو، خەوالوی، گێژی، هیلاکی، بەگرانی میزکردن - دڵەکوتێ، پەڵە، وشکی پێست، هەستیاربوون بە ڕوناکی، سەرئێشە، سکچوون، گیرانی میز، زیاد لێدانی دڵ ورێنە، تا، بێخەوی، کۆکە، تێکچوونی هاوسەنگی، وشکبوونەوەی لوت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ، ٤ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆری ٨ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار.

## فیکسۆفینادین: FEXOFENADINE

**ناوی بازرگانی:** Allegra

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦٠ و ١٢٠ و ١٨٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** H١، receptor antagonist

**بەکارهێنان:** دژی حەساسیەتە و بۆ چارەسەری ئیلتیهاب و حەساسیەتی لوت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەوالوی، هیلاکبوون، خراپی هەرس، هێڵنجدان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار.



## فایبرینۆجین: FIBRINOGEN

**ناوی بازرگانی:** Fibrinogen Human

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Hemostatics

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵی خوێنبەربوون، لەخوێنبەربووندا بەهۆی (DIC) و یان زوو جیاکردنەوەی دوانە لە سکپڕی و پاش لە نەشتەرگەری دڵ و سی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تا، زیادلێدانی دڵ تێکچوونی بینین، ئازاری سنگ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کۆکە.

**بڕی دەرمان:** ٣ تا ٨ گرام فایبرینۆجین بە خێرایی ٥ تا ١٠ میلی‌لیتر لە خولەکێکدا بە IV ئینفیوشن.

## فایبرینولایسین: FIBRINOLYSIN

**ناوی بازرگانی:** plasmin

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی فایبرینۆلایسین ٣٠ یەکە + دیسۆکسی ڕایبۆنیوکلیس ٢٠.٠٠٠ یەکە/٣٠ گرام.

**گروپی دەرمان:** ئەنزیمەکان(پاککەرەوەی مەوزوعی برینەکان)

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر لە سوتان و بۆ چارەسەرکردنی برینەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێست، ئیلتیهاب.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٢ تا ٣ جار بە شێوەی مەوزوعی ئەو شوێنەی پێ بماڵن.

## فیلگراستیم: FILGRASTIM

**ناوی بازرگانی:** Neupogen

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٣٠٠ و ٦٠٠ مایکرۆگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Hematopoietic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمی خڕۆکەی سپی لە جۆری هاوتاکان (نیوترۆپینیا) بەهۆی شێرپەنجە و چارەسەری کیمیایی و چاندنی مۆخی ئێسکەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تا، قەبزی، هەڵوەرینی موو، ئازاری ئێسك، گەورەبوونی سپڵ ئازاری گەدە، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ٥ مایکرۆگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا یان بە IV ڕۆژانە لە ١ بڕی دەرماندا.

## فیناستیراید: FENASTERIDE

**ناوی بازرگانی:** Proscar, propecia

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ و ٥ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiandrogen

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری گەورەبوونی باشی پرۆستات (BPH) و ڕووتانەوەی سەری پیاوان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی ئارەزوی سێکسی، گێژی، سەرئێشە، پەڵە، گەورەبوونی مەمك.

**بڕی دەرمان:** بۆ ڕوتانەوەی سەری پیاوان گەورەکان ١ میلی گرام ١ جار لە ڕۆژێکدا. بۆ چارەسەری گەورەبوونی باشی پرۆستات (BPH) ٥ میلی گرام ١ جار لە ڕۆژێکدا.

## فلیکاینایدی: FLECAINIDE

**ناوی بازرگانی:** Tambocor

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ١٠٠ و ١٥٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiarrhythmic

**بەکارهێنان:** دژی نارێکی لێدانی دڵە و بۆ کۆنترۆڵکردنی لێدانی نائاسایی دڵ و زیادبوونی لێدانی دڵی توندی سکۆڵەیی و لەرزین و لەرینەوەی گوێچکەڵە و زیادبوونی بە نۆرەی لێدانی دڵی سەرو سکۆڵەیی بەکاردێت.

کاریگەری لاوەکی یەکان: هێڵنجدان، ڕشانەوە، گێژی، تێکچوونی هاوسەنگی، تێکچوونی بینین، تێکچوونی دەمار، ئازاری قەفەسەی سنگ، سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، ئۆدیما، سووربوونەوە، سکچوون، قەبزی، ئازاری سك، خرابی هەرس، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠میلی گرام هەر ١٢ سەعاتێك ١ جار، هەموو ٤ ڕۆژێك تا لایەنی زۆر ٤٠٠ میلی گرام لە ڕۆژێکدا.

## فلاڤۆکسەیت: FLAVOXATE

**ناوی بازرگانی:** Urispas

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٢٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antispasmodic

**بەکارهێنان:** دژی کرژبوونی میزەڵدانە و بۆ چارەسەری میزڕانەگرتن و دووبارە میزکردن و بەگرانی میزکردن و بەپەلە میزکردن و میزکردنی شەوانە و ئازاری سەرووی عەورەت بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، تێکچوونی هاوسەنگی، وشکبوونەوەی دەم، خەواڵویی، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** ١٠٠ تا ٢٠٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار.

## فلۆکسوریدین: FLOXURIDINE

**ناوی بازرگانی:** Fudr

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antimetabolite

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی کۆئەندامی هەرس و جگەر و گورچیلە و کۆلۆن و پەنکریاس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، نەمانی نارەزوی خواردن، کرژبوونی سك، هەڵوەرینی موو، پەڵە، تێکچوونی بینین، خەمۆکی، تێکچوونی هاوسەنگی، خوێنبەربوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** ٠,١ تا ٠,٦ میلی‌گرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ١ تا ٦ هەفتە.

## فلوکۆنازۆل: FLUCONAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Fungata,Diflucan

**شێوەی دەرمان:** کەپسول و حەبی ٥٠ و ١٠٠ و ١٥٠ میلی‌گرامی و سەسپێنشنی ١٠ و ٤٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر و دەرزی ٢ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی کەڕوویی کاندیدیازی دەرەوە و ناوەوە و کاندیدیازی دەم و قوڕگ و لەگەروو و هەوکردنی پەردەی مێشکی کریپتۆکۆکی و هەوکردنە گشتی یەکانی تر و هەوکردنی زایەندی ژنان و هەوکردنی ڕێڕەوی میز بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، پەڵە، سەرئێشە، سوتانەوە و ئازاری گەدە، ڕشانەوە، سکچوون، حەساسیەتی پێستی، ژەهراویبوونی جگەر.

**بڕی دەرمان:** ٢٠٠ میلی‌گرام لەسەرەتا و ١٠٠میلی‌گرام ڕۆژانە، تا ٤٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە. منداڵان ٣ تا ٦ میلی‌گرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا خۆراکی یان دەمار.

بۆ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## فلوسایتوسین: FLUCYTOSINE

**ناوی بازرگانی:** Ancotil,Alcobon

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی توندی (کاندیدا، کریپتۆکۆکەس) بەکاردێت

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، پەڵە، تێکچوونی خوێن، ئازاری دڵ سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەواڵویی، گێژی، خەیاڵ کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی زیاتر لە ٥٠ کیلۆگرام ڕۆژانە ٥٠ تا ١٥٠میلی گرام/کیلۆگرام خۆراکی هەر ٦ سەعاتێك بە شێوەی دابەشکراو. لە هەوکردنە توندەکانی تر، ئەتوانی لە بڕی دەرمانی ٢٥٠ میلی گرام/کیلۆگرامیش سود وەربگریت. ساوایان ڕۆژانە ٨٠ تا ١٦٠ میلی گرام/کیلۆگرام لە ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## فلودارابین: FLUDARABINE

**ناوی بازرگانی:** Fludara

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antimetabolite

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەکانی خوێن CLL و لیمفۆمای ناهوجکین و لیوکیمیای خانەی موین و هوجکین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کۆکە، تا، ئازاری سك، کەمخوێنی. ژەهراویبوونی هەناسە، سەرئێشە، هیلاکبوون، سەرگێژبوون، خەمۆکی، خرۆشان، تێکچوونی خەو، نارێکی لێدانی دڵ ئازاری سنگ، تێکچوونی بینین، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، کەمبوونەوەی توانای بیستن، خوێنبەربوونی لوت، ناتەواوی دڵ و گورچیلە و جگەر، هەوکردنی سی، تەنگەنەفەسی، هەڵوەرینی موو، زیادبوونی فۆسفات، ئازار، خوران، پەڵە، ئارەقکردن، زیادبوونی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥ میلی گرام/مەتر دوجا ڕووی لەش ماوەی ٣٠ خولەك لە ڕێگەی دەمارەوە.



**فلودرۆکۆرتیزۆن:** FLUDROCORTISONE

**ناوی بازرگانی:** Florinef

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,١ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەککەوتنی موزمینی ڕژێنی سەرگورچیلە ئەدرینالّ و نەخۆشی ئەدرینۆجینیتالّ و پەستانی نزمی خوێن پەیوەست بە بارودۆخ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، پەککەوتنی دڵ لاوازی، تێکچوونی ئێسک، تێکچوونی هەرس، تێکچوونی پێست، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا –بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرگێژبوون، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١ حەب.

**فلودرۆکسیکۆرتید:** FLUDROXYCORTIDE

**ناوی بازرگانی:** Haelan

**شێوەی دەرمان:** کرێم و مەڵهەم.

**گروپی دەرمان:** Topical corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی ئیلتیهابی پێستی وەك ئەکزیما بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، خوران، ڕوشان، وشکبوونەوەی پێست.

**بڕی دەرمان:** بە شێوەی چینێکی تەنك ڕۆژانە ١ تا ٢ جار.

**فلومازینیل:** FLUMAZENIL

**ناوی بازرگانی:** Romazicon,Anexate,Lanexate

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,١ میلی گرام/میلی لیتر (٥میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antidote

**بەکارهێنان:** پێچەوانەکردنەوەی کاریگەری هێورکردنەوە لە بێنزۆدیازیپینەکان و بەنجی عمومی و دژی ژەهراویبوون بە بێنزۆدیازیپینەکان (دژی دایەزیپام) و زۆر بەکارهێنیان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، تەشەنوج، بێخەوی، خرۆشان، لەرزین، نارێکی لێدانی دڵ بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری قەفەسەی سنگ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تەنگەنەفەسی، ئازار لە شوێنی دەرزی لێدان.



**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۰,۲ میلیگرام بە دەمار بۆ زیاتر لە ۱٥ چرکە، دوبارەکردنەوەی بەبڕی پێویست، بۆ لایەنی زۆر ۱ میلیگرام (لایەنی زۆر ٥ میلیگرام لە زیادبەکارهێنانی بێنزۆدیازیپینەکان ) منالآن ۰,۰۱ میلیگرام/کیلۆگرام ( لایەنی زۆر ۰,۲ میلیگرام/بڕی دەرماندا) بەدەمار بۆ زیاتر لە ۱٥ چرکە، دوبارەکردنەوەی ۰,۰۰٥ میلیگرام/کیلۆگرام لە ماوەی ۱ خولەکدا بۆ لایەنی زۆری هەمووی ۱ میلیگرام، بڕەکەی کەمدەکرێتەوە لە لاوازبوونی جگەردا.

## فلونیسۆلید: FLUNISOLIDE

**ناوی بازرگانی:** Syntaris

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی سپرای لوت ۰,۲٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری لە ئیلتیهاب و حەساسیەتی لوت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی لێدانی دڵ تامی تاڵی ناودەم، هەوکردنی کاندیدیازی دەم، برینی لوت، سەرئێشە، زیادبوونی IOP، کرژبوونی بۆری هەوا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥۰ مایکرۆگرام ( ۲ سپرای) بۆ هەر کونەلوتێك ڕۆژانە ۲ جار، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆر ڕۆژانە ۳ جار پاشان کەمدەکرێتەوە بۆ بڕی جێگیر و پارێزراو، منالآنی ٥ تا ١٤ ساڵ سەرەتا (۲٥ مایکرۆگرام (۱ سپرای ) بۆ هەر کونەلوتێك تا ڕۆژانە ۳ جار.

## فلوسینۆلۆن: FLUOCINOLONE ACETONIDE

**ناوی بازرگانی:** Fluonex , synalar

**شێوەی دەرمان:** کرێم و مەڵهەم و جێڵی مەوزوعی.

**گروپی دەرمان:** Topical corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری ئیلتیهابی سوکی پێستی، نەخۆشی پێستی کە خورانیان هەیە و ئەکزیما و سۆریاسس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، سوتانەوە، وشکبوونەوەی پێست، بەرزبوونەوەی زەختی چاو، ئیلتیهابی چاو.

**بڕی دەرمان:** بە شێوەی چینێکی تەنك ڕۆژانە ۱ تا ۲ جار.



## فلوسینۆنید: FLUOCINONIDE

**ناوی بازرگانی:** Metosyn

**شێوەی دەرمان:** کرێم و مەڵهەم.

**گروپی دەرمان:** Topical corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی ئیلتیهابی پێستی توند وەك ئەکزیما کە کاردانەوەیان نی یە بۆ کۆرتیکۆستیرۆیدە کەمتر چالاکەکان، سۆریاسس بەکاردێت

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، خوران، ڕوشان، وشکبوونەوەی پێست.

**بڕی دەرمان:** بە شێوەی چینێکی تەنك ڕۆژانە ١ تا ٢ جار.

## فلوکۆرتۆلۆن: FLUOCORTOLONE

**ناوی بازرگانی:** Ultralanum plain

**شێوەی دەرمان:** کرێم و مەڵهەم.

**گروپی دەرمان:** Topical corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی ئیلتیهابی پێستی توند وەك ئەکزیما کە کاردانەوەیان نی یە بۆ کۆرتیکۆستیرۆیدە کەمتر چالاکەکان، سۆریاسس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، خوران، ڕوشان، وشکبوونەوەی پێست.

**بڕی دەرمان:** بە شێوەی چینێکی تەنك ڕۆژانە ١ تا ٢ جار.

## فلۆریسین: FLUORESCEIN SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Minims fluorescein sodium

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ١٪ و ٢٪.

**گروپی دەرمان:** Ocular Diagnostic

**بەکارهێنان:** بۆ دۆزینەوەی برین و تەنە بێگانەکان لە چاودا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گۆڕینی ڕەنگی چاو.

**بڕی دەرمان:** بە پێی پێویست بەکاردێت.



## فلوراید: FLUORIDE

**ناوی بازرگانی:** Duraphat,Zymafluor,Fluocal

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٢٥ و ١ میلیگرام و ٢٠ میلیگرام و جێڵی ددان ١,٢٣٪ و (دەمشۆر ٠,٢٪ و (٢٥٠ میلیلیتر )) و قەترەی ٥٥٠ مایکرۆگرام/٠,١٥ میلیلیتر.

**گرووپی دەرمان:** مادەی کانزایی.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پوکانەوەی ئێسك و لەمناڵاندا بۆ بەرگری لە خراپبوونی ددانەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت، بیرۆ. نارەحەتی گەدە، سەرئێشە، گۆڕانی ڕەنگی ددان، تێکچوونی پێست.

**بڕی دەرمان:** خواردنەوەی بڕی ١ (ppm) لە فلۆر لەگەڵ ئاودا. بۆ پوکانەوەی ئێسك ڕۆژانە ٦٠ میلیگرام لەگەڵ کالسیۆم و ڤیتامین دی یان ئیسترۆجین.

## فلۆرۆمیثۆلۆن: FLUOROMETHOLONE

**ناوی بازرگانی:** Flarex ,Eflone,FML

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,١٪.

**گرووپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهاب و حاڵەتەکانی حەساسیەتی کۆرنیەی چاو و ئیلتیهابی چاو و سپێنەی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی IOP، ئازاری چاو، کاتاراکت(ئاوی سپی چاو)، گلوکۆما(ئاوی ڕەشی چاو)، زیادبوونی هەوکردنی کەڕوویی و ڤایرۆسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و مناڵان لە حاڵەتی توندا هەر ١ تا ٢ سەعاتێك ٢ قەترە. لە حاڵەتی مام ناوەند و سوکدا، ١ تا ٢ قەترە ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار بکرێتە چاوەوە.

## فلورۆیۆراسیل: FLUOROURACIL

**ناوی بازرگانی:** Efudex,Fluoroplex

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥٠ میلیگرامی و دەرزی ٢٥ و ٥٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antimetabolite

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و ئازارکەمکەرەوە لە شێرپەنجەی مەمك و هێلکەدان و کۆڵۆن و کۆم و جگەرو قوڕگ و گەدەو پەنکریاس و پێست بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ڕشانەوە. نەمانی ئارەزوی خواردن، پەڵە، وشکبوونەوەی پێست، هەوکردنی خوێنهێنەر، تێکچوونی هەرس، برینی دەم. هەستیاربوون بەڕوناکی، هەڵوەرینی موو. تێکچوونی خوێن، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالان ڕۆژانە ٧ تا ١٢ میلیگرام/کیلۆگرام. بە دەمار بۆ ماوەی ٤ ڕۆژ یان ٣٧٠ تا ١٠٠٠ میلیگرام/مەتردوجا لە ڕۆژێکدا بە دەمار بۆ ماوەی ١ تا ٥ ڕۆژ. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٨٠٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. کەپسول بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو هەفتانە ١٥ میلیگرام/کیلۆگرام. لایەنی زۆر لە ڕۆژێکدا ١ گرامە.

## فلورۆیوراسیل: FLUOROURACIL TOPICAL

**ناوی بازرگانی:** Efudex

**شێوەی دەرمان:** کرێمی ٥٪.

**گروپی دەرمان:** Antimetabolite

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خانەی بنچینەیی (BCC) و گەشەکردنی پێست بەهۆی بەرکەوتنی تیشکی خۆر و ڕوناکی پەیوەست بە کاریگەری کیمیایی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی پێست، پەڵە، هەستیاربوون بەڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** کرێمی ٥٪ ڕۆژانە ٢ جار بەسەر ڕووی پێستدا بماڵرێت بۆ ماوەی ٢ تا ٦ هەفتە.

## فلۆکسیتین: FLUOXETINE

**ناوی بازرگانی:** Prozac

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠ و٢٠ میلیگرامی و حەبی ٢٠ میلیگرامی و شروبی ٢٠میلیگرام/٥میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خەمۆکی و تێکچوونی دووجەمسەری و وەسواسی و کاتاپلیکسی و میوکلونوس پەیوەستبوون بە ئەلکهولەوە و تێکچوونی وەسواسی ئیجباری (OCD) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، هیلاکبوون، بێخەوی، خەواڵویی، خرۆشان، لەرزین، شێتی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، سکچوون، وشکبوونەوەی دەم، ئازاری سك، هەوکردنی گەدە و ڕیخۆڵە، تێکچوونی کاری سێکسی، پەڵە، خوران، ئازاری ماسولکە و جومگە، کۆکە، سوربونەوەی لوت، تەنگەنەفەسی، کەمبوونەوەی کێش، هەوکردنی لوت، سوربونەوەی پێست، جیوب.



**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٢٠ میلیگرام خۆراکی (ئاسایی بەیانیان)،لەکاتی پێویست ئەتوانی بڕی دەرمان پاش لە چەندین هەفتە بەکارهێنان تا ڕۆژانە ٤٠ میلیگرام بگەیەنیت. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٨٠ میلیگرامە. منالآنی ٨ تا ١٨ ساڵ ( تەنها بۆ خەمۆکی) ڕۆژانە ٥ تا ١٠ میلیگرام و ئەتوانی تا ٢٠ میلیگرام ڕۆژانە، بە تەدریجی بڕی دەرمان زیاد بەکەیت. بۆ تێکچوونی وەسواسی ئیجباری (OCD) بە بڕی دەرمانی سەرەتایی ٢٠ میلیگرام ڕۆژانە دەست پێدەکات، لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٨٠ میلیگرامە.

## فلوۆکسیمیستیرۆن: FLUOXYMESTERONE

**ناوی بازرگانی:** Halotestin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Hormone

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری دواکەوتنی باڵغبوون لە کوڕاندا و هایپۆگنادیسم لە پیاوان و لە ژناندا بۆ چارەسەری شێرپەنجەی مەمك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، زەردی، نازاری بەشی سەرەوەی گەدە، ئاوسان، زیپکە، سەرئێشە، قەلەقی، خەمۆکی، سوتانەوە، گۆڕانی ماوەی بێ نوێژی، ئاوسانی مەمك، هەڵوەرینی موو.

**بڕی دەرمان:** بۆ شێرپەنجەی مەمك ١٠ تا ٤٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا دابەشکراو × ١ تا ٣ مانگ. هایپۆگنادیسم ٥ تا ٢٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## فلوپێنتیکسول: FLUPENTIXOL

**ناوی بازرگانی:** Depixol,Fluanxol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٥ و ٣ میلیگرامی (٢HCL) و دەرزی ٢٠ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری تێکچوونی دەروونی و شیزۆفرینیا و فێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی کێش، وشکبوونەوەی دەم، ڕەقبوونی ماسولکە، گەورەبوونی مەمك، خەواڵویی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، گێژی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٢ میلیگرامە. ٢٠ تا ٤٠ میلیگرام بە شێوەی ماسولکەیی قوڵ هەر ٢ تا ٤ هەفتە ١ جار.

## فلوفینازین: FLUPHENAZINE

**ناوی بازرگانی:** Modecate,Moditen,Prolixin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥ و ١٠٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر و دەرزی ٢,٥ میلی‌گرام/ میلی‌لیتر و حەبی ١و ٢,٥ و ٥ و ١٠ میلی‌گرامی و ئیلیکزیری ٢,٥ میلی‌گرام/٥ میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی دەروونی و تێکچوونی دەروونی و شیزۆفرینیا و دڵەڕاوکێ بەکار دێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، کەمبوونەوەی پەستانی خوێن، بێهێزی، خەواڵوویی، سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، تێکچوونی بینین، زیادبوونی IOP، وشکبوونەوەی دەم. قەبزی، ڕشانەوە، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکان، هەستیاربوون بەروناکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٠,٥ تا ١٠ میلی‌گرام خۆراکی لە ڕۆژێکدا لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا هەموو ٦ تا ٨ سەعاتێك، تێکڕای بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٥ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا، یان ١,٢٥ میلی‌گرام ماسولکەیی، پاشان ٢,٥ تا ١٠ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا هەموو ٦ تا ٨ سەعاتێك بە ئەندازەی پێویست، بڕەکەی کەمدەکرێتەوە لە پیرەکاندا.

## فلورازیپام: FLURAZEPAM

**ناوی بازرگانی:** Somnol,Dalmadorm,Dalmane

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٥ و ٣٠ میلی‌گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Hypnotic

**بەکارهێنان:** خەولێخەر و هێورکەرەوەیە و بۆ چارەسەری بێخەوی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی دەم، خەواڵوویی توند، گێژی، قەبزی، سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەمۆکی، هێڵنجدان، پەڵە، لەرزین، هیلاکبوون، ئازاری قەفەسەی سنگ، زیادلێدانی دڵ، هەناسەتونی، تێکچوونی بینین، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ کەپسولی ١٥ میلی‌گرامی ٣٠ تا ٦٠ خولەك پێش لە خەوتن.

## فلوربیپرۆفین: FLURBIPROFEN

**ناوی بازرگانی:** Ansaid,Froben

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ١٠٠ میلی‌گرامی و کەپسولی ٢٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهابی ڕۆماتیزم و نەخۆشی یەکانی تری پەیکەرە ماسولکە و ئازاری سوك و مامناوەند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، تێکچوونی گەدە، خوێنبەربوون و برینی گەدە و ڕیخۆڵە، پەڵە، هیلاکی، وڕێنە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ میلی‌گرام دابەشکراو لە ڕۆژانە ٢ تا ٤ جاردا. لایەنی زۆر ڕۆژانە ٣٠٠ میلی‌گرامە. ڕۆژانە ١ کەپسول.

## فلوربیپرۆفین: FLURBIPROFEN

**ناوی بازرگانی:** Strefen

**شێوەی دەرمان:** لۆزینج(حەبێکە شەکری تیادایە پێویستە بەهێواشی لە دەمدا بتوێتەوە) ٨,٧٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** بۆ چاکردنەوەی برینی قورگ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی تامکردن، برینی دەم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ ساڵ، ڕێدەدرێت ١ لۆزینج بۆ ئەوەی بە هێواشی لە ناو دەمدا بتوێتەوە هەموو ٣ تا ٦ سەعاتێك، لایەنی زۆر ٥ لۆزینج لە ٢٤ سەعاتدا، لایەنی زۆر بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ.

## فلوربیپرۆفین: FLURBIPROFEN OPH.

**ناوی بازرگانی:** Ocufen

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری لە بچوکبوونەوەی بیلبیلەی چاو یان تەسکبوونەوەی چاو لە کاتی نەشتەرگەری چاودا و بۆ چارەسەری ئیلتیهابی چاو پاش لە نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازار و سوربونەوەی چاو. کزانەوە، خوران، گۆڕانی بینین.

**بڕی دەرمان:** ١ قەترە هەموو ٣٠ خولەکێك ×٤، ٢ سەعات پێش لەنەشتەرگەری دەست پێدەکات.

ئاگادار بن: دەرمان شوێنەواری خراپ و کاریگەری نەگەتیڤ بەجێدەهێڵێت، ئەگەر بەگوێرەی بەکارنەهێنرێت!



## فلوتامايد: FLUTAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Drogenil,Eulexin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Anti، androgen

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتووی پرۆستات (قۆناغی٢) لەگەڵ LHRH analogue دا وەك سُیوپرۆلاید ئەسیتەیت و بۆ چارەسەری پرمووی ناسروشتی (هیرسوتیزم) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گەورەبوونی مەمك، زیادبوونی نارەزوی خواردن، بێخەوی، سووربوونەوەی پێست، خەمۆکی، سەرئێشە، ناجێگیری، خەوالّویی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمخوێنی، تێکچوونی جنسی، کەمبوونی خرۆکەی سپی، پەڵەی پێست.

**بڕی دەرمان:** پیاوان ڕۆژانە٢٥٠ میلی‌گرام خۆراکی هەر ٨ سەعاتێك.

## فلوتیکازۆن: FLUTICASONE

**ناوی بازرگانی:** Floveat,Cultivate

**شێوەی دەرمان:** سپرای ٥٠ و ١٢٥ و ٢٥٠ مایکرۆگرام/بڕی دەرمان، ئیستینشاقی لوت ٥٠ مایکرۆگرام/بڕی دەرمان.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهاب و هەوکردنی لوت و ڕەبۆ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، کوشینگ، تا، تێکچوونی گەدە، ئازاری جومگە، زیادبوونی شەکری خوێن، گیرانی سنگ، هەوکردنی بۆریچکەکان.

**بڕی دەرمان:** بۆ ئیلتیهاب و حەساسیەتی لوت گەورەکان ڕۆژانە ١جار هەر جارەی ٢ پاف، لەهەر کونەلوتێك یان ١ پاف لە هەر کونەلوتێك، ڕۆژانە ٢ جار. منالآنی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ڕۆژانە ١ پاف، لەهەر کونەلوتێك. دەرمانی پاراستن یان بەرگری کردن لە ڕەبۆ گەورەکان ٨٨ تا ٢٢٠ مایکرۆگرام لە ئایرۆسۆڵ ٢ جار لە ڕۆژێکدا و ڕێکخستنی بڕی دەرمان بە لایەنی زۆر ڕۆژانە ٤٤٠ میلی‌گرامە. منالآنی ٦ تا ١٢ ساڵ ٥٠ مایکرۆگرام پاودەری ئیستینشاقی ٢ جار لە ڕۆژێکدا و ڕێکخستنی بڕی دەرمان بەلایەنی زۆر ١٠٠ مایکرۆگرام ٢ جار لە ڕۆژێکدا.

## فلوڤاستاتین: FLUVASTATIN

**ناوی بازرگانی:** Lescol

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٠ و ٤٠ میلی‌گرامی و کەپسولی ٨٠ XL میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antilipemic



**بەکارهێنان:** دژی بەرزبوونەوەی چەوری خوێن (کۆلیسترۆڵ و ترایگلیسراید ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە. سەرئێشە، هێڵنجدان، سکچوون، ئازاری دڵ کۆکە، بێهێزی، ئازاری سك، جیوب، تێکچوونی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ حەب ٢ جار لە ڕۆژێکدا یان حەبی XL ٨٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا ١ جار.

## فلوڤۆکسامین: FLUVOXAMINE

**ناوی بازرگانی:** Faverin,Luvox

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خەمۆکی و وەسواسی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، خرۆشان، وشکبوونەوەی دەم، ئارەقکردن، لەرزین، ڕشانەوە، سکچوون، سەرئێشە، غازات، قەبزی، سەرگێژبوون، بێخەوی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا، کاتی خەو بەکاردێت. بە پێی پێویست، ئەتوانی بە بڕی ٥٠ میلیگرام ٤ تا ٧ ڕۆژ بە تەدریجی بڕی دەمان زیاد بکەیت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣٠٠ میلیگرامە (هەموو بڕێکی دەرمان ڕۆژانە زیاد لە ١٠٠ میلیگرامە لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## فۆلیك ئەسید: FOLIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Lexpec,Folvite

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٤ و ٠,٨ و ١ میلیگرامی و ٥ میلیگرامی و دەرزی ٥ میلیگرام/میلیلیتر (١٠میلی لیتر).

**گرووپی دەرمان:** Vitamin، supplement

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمخوێنی (میگالۆبلاستیك ئەنیمیا) بەهۆی کەمبوونی فۆلیك ئەسید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس. خوران، سووربوونەوەی پێست، کرژبوونی بۆری هەوا، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی تەمەنی ٤ ساڵ و گەورەتر ٠,٤ میلیگرام لە ڕۆژێکدا خۆراکی و ژێرپێستی و دەمار و ماسولکەیی. لە ژنانی سکپڕ و شیردەردا ٠,٨ میلیگرام لە ڕۆژێکدا. منداڵانی تەمەنی گەنجتر لە ٤ ساڵ تا ٠,٣ میلیگرام لە ڕۆژێکدا خۆراکی و ژێرپێستی و دەمار و ماسولکەیی. لە ساواکاندا ٠,١ میلیگرام لە ڕۆژێکدا خۆراکی و ژێرپێستی و دەمار و ماسولکەیی.



## فۆلیترۆپین ئەلفا & بیتا: FOLLITROPIN ALFA & BETA

**ناوی بازرگانی:** Gonal, puregon

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ و ٢٠٠ و ٣٠٠ و ٤٠٠ یەکە/میلی لیتر و دەرزی ٧٥ یەکەیی و دەرزی ٤٥٠ و ٩٠٠ و٣٠٠ و ٦٠٠ یەکەیی و دەرزی ٤٥٠ (٠,٧٥ میلی لیتر) و ٦٠٠ (٠,٥ و ٠,٧٥ و١,٥ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Gonadotrophins

**بەکارهێنان:** هانی هۆرمۆنی (FSH) دەدات کەهۆرمۆنێکە لە ژێرمێشکە رژێندا دروست دەکرێت و یارمەتی گەشەی هێلکە دەدات لە هێلکەداندا و هانی گەشەی تۆو دەدات لە گون دا و هانی سکپڕبوون دەدات و بۆ چارەسەری نەزۆکی لە پیاوان و ژناندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری گەدە و سك، سوربونەوە و ئازار و ئاوسانی شوێنی دەرزی، زیپکە، هەڵوەرینی موو، پەڵە، گێژی، تا، لەرز، سکچوون، خوێنبەربوونی زایەندی ژنان، نارێکی لێدانی دڵ، سەرئێشە، خەواڵویی، نەمانی ئارەزوی خواردن، هەوکردنی گەروو، غازات، هەوکردنی میزەڕۆ.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی دەرزی ژێرپێستی یان ماسولکەیی بەپێی کاردانەوەی لەسەر نەخۆشەکە بەکاردێت.

## فۆندا پارینیوکس: FONDAPARINUX

**ناوی بازرگانی:** Arixtra

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی ٢,٥ میلیگرام/٠,٥ میلیلیتر و ٥ میلیگرام/٠,٤ میلیلیتر و ٧,٥ میلیگرام/٠,٦ میلیلیتر و ١٠ میلیگرام/٠,٨ میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەکارهێنان:** دژی مەیینی خوێنە و بۆ بەرگری لەمەیینی خوێنی لە قولاّیی دەمار دا و مەیینی خوێنی سی و مەیینی خوێنی لە قولاّیی دەمار دا پاش لە هەندێ جۆری نەشتەرگەری و جەڵدە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، کەمخوێنی، تێکچوونی هەرس، ئازاری سنگ، تەنگەنەفەسی، پەڵە، خوران، پێخەوی، گێژی، سەرئێشە، تا، کەمبوونی لێدانی دڵ خەواڵویی، سوربونەوە، کۆکە، قەلەقی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢,٥ میلیگرام ژێرپێستی.

## فۆرماڵدیهاد: FORMALDEHYDE

**ناوی بازرگانی:** Veracur

**شێوەی دەرمان:** جێڵی ٠,٧٥٪.

**گروپی دەرمان:** Anti، warts

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بالۆك، بەتایبەتی بۆ بالۆکی بنی پێ بەکاردێت

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێست.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ جار بەکاردێت.

## فۆرمۆتیرۆل: FORMOTEROL FUMARATE

**ناوی بازرگانی:** Foradil

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی ئیستینشاقی (inhalation)ی ١٢ مایکرۆگرامی و ٤،٥ مایکرۆگرامی و ٤ مایکرۆگرامی و ١٢ مایکرۆگرام/کەپسول.

**گروپی دەرمان:** Bronchodialator

**بەکارهێنان:** ئەبێتەهۆی فراوانکردنی بۆریچکەکان و بۆری هەوا و بۆ چارەسەری ڕەبۆ و کرژبوونی بۆری هەوا و داخرانی بۆری و بۆریچکەکان و نەخۆشی موزمینی داخرانی سی و ئاوسانی سی بەهۆی کۆبوونەوەی هەوا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، لەرزین، گێژی، زۆرهیلاکبوون، بێخەوی، ئازاری سنگ، نارێکی لێدانی دڵ – زیادلێدانی دڵ ئازاری قەفەسەی سنگ، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، وشکبوونەوەی دەم، هێڵنجدان، زیادبوونی شەکری خوێن. کرژبوونی ماسولکە، هەوکردنی بۆریچەکان، هەوکردنی سنگ، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٢ مایکرۆگرام هەر ١٢ سەعاتێك ١ جار. نابێت بڕی دەرمان لە ٢٤ مایکرۆگرام زیاتر بێت.

## فۆسامپرێناڤیر: FOSAMPRENAVIR

**ناوی بازرگانی:** Lexiva

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٧٠٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ٥٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** لەگەڵ دەرمانە دژەڤایرۆسەکانی تردا دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری گەدە، سەرئێشە، تا، بلۆقکردنی پێست، پەڵە، ئازار و کزانەوە لەکاتی میزکردن، ئازاری سنگ، ئارەقکردنەوە، هیلاکبوون.

**بڕی دەرمان:** لەگەڵ بڕێکی کەمی ڕیتۆناڤیر گەورەکان و منداڵانی سەروی ٦ ساڵ کێشی سەروی ٣٩ کیلۆگرام ٧٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار، منداڵانی سەروی ٦ ساڵ کێشی ٢٥ تا ٣٩ کیلۆگرام ١٨ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٢ جار.



## فۆسا پرێپیتانت: FOSAPREPITANT

**ناوی بازرگانی:** Emend

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١١٥ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiemetic

**بەکارهێنان:** لەگەڵ دەرمانی تردا بۆ بەرگری لە هێڵنجدان و ڕشانەوە بەهۆی چارەسەری کیمیای یەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونی لێدانی دڵ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، نەمانی ئارەزوی خواردن، دڵەکزە، ئازاری گەدە، نزگەرە، زرنگانەوەی گوێ – تا، لەرز، بێخەوی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١١٥ میلی گرام بەIV ئینفیوشن لەگەڵ دەرمانەکانی تردا. (دێکساميازۆن و ئەپریتانت).

## فۆسکارنێت: FOSCARNET

**ناوی بازرگانی:** Foscavir

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٤ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی سایتۆمیگالۆڤایرەسی تۆڕی چاو لەوانەی ئایدزیان هەیە و هەوکردنی ڤایرۆسی تامێسکی سادە و سایتۆمیگالۆڤایرەس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، تێکچوونی گەدە – ئازاری سك، نەمانی ئارەزوی خواردن، گۆڕانی پەستان و ECG، سەرئێشە، هیلاکبوون، گێژی، پەڵە، پەککەوتنی گورچیلە، کەمبوونی کالسیۆم، خەواڵویی، نەمانی ئارەزوی خواردن، تەشەنوج، ڤێ، سەرئێشە، کۆکە، ئارەقکردنەوە، ئازاری ماسولکە و جومگە.

**بڕی دەرمان:** بەIV ئینفیوشن سەرەتا ٦٠ میلی گرام/کیلۆگرام هەموو ٨ سەعاتێك یان هەموو ٩٠ میلی گرام/کیلۆگرام هەموو ١٢ سەعاتێك، بۆ ماوەی ٢ تا ٣ هەفتە بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە ٦٠ میلی گرام/کیلۆگرام، زیاد دەکرێت بۆ ٦٠ میلی گرام/ کیلۆگرام ئەگەر تەحەمولی کرد. ئەگەر نەخۆشی پەرەی سەند لە بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو، سیستمی سەرەتا دووبارەدەکرێتەوە. بەIV ئینفیوشن هەوکردنی ڤایرۆسی تامێسکی سادە لینجەپێست ٤٠ میلی گرام/کیلۆگرام هەموو ٨ سەعاتێك بۆ ماوەی ٢ تا ٣ هەفتە یان تا چاکبوونەوەی برینەکە.

## فۆسفۆمایسین: FOSFOMYCIN

**ناوی بازرگانی:** Monurol

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گرانیول لە پاکەتی ٣ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی ڕێڕەوی میز و میزەڵدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، هێڵنجدان، سکچوون، ئازاری گەدە، سەرئێشە، گێژی، بێهێزی، ئازاری پشت، برینی گەروو، ئازاری بێ نوێژی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣ گرام (١ پاکەت) توابێتەوە لە ٩٠ تا ١٢٠ میلی‌لیتر ئاودا خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا.

## فۆسینۆپریل: FOSINOPRIL

**ناوی بازرگانی:** Monopril

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٠ و ٤٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و پەککەوتنی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، ئازاری پەیکەرە ماسولکە، سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، گێژی، کۆکە، خوران، پەڵە، کەمبوونی لێدانی دڵ بلۆقکردنی پێست، تا، لەرز.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ١٠ میلی‌گرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٢٠ تا ٤٠ میلی‌گرامە خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٤٠ میلی‌گرامە.

## فۆسفیسترۆل: FOSFESTROL

**ناوی بازرگانی:** Honvan,Stilphostrol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلی‌گرامی و دەرزی ٥٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (٥میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antineoplasm

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتووی پرۆستات بەکاردێت

کاریگەری لاوەکی یەکان: هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی هەرس، بێهێزی، نەمانی ئارەزوی خواردن، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، ئۆدیما، سکچوون، قەبزی، نەکەوتنە عوزر، خەمۆکی، زیپکە، زیادبوونی شەکری خوێن.



**بڕی دەرمان:** بۆ شێرپەنجەی پێشکەوتووی پرۆستات ٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار، لە دەرمانی خۆراکی ڕێی پێ دەدرێت ( لایەنی زۆر ٢٠٠ میلیگرام ٣ جار لە ڕۆژێکدا) بۆ **بەکارهێنانی** شێوەی دەرزی ئەم دەرمانە ٥٠٠ تا ١٠٠٠ میلیگرام ڕۆژانە، لانی کەم بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ ڕێی پێ دەدرێت و پاشان دەرمانی جێگیر و پارێزراو، ڕێی پێ دەدرێت.

## فۆسفینیتۆین: FOSPHENYTOIN

**ناوی بازرگانی:** Cerebyx

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٧٥ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Anticonvulsant

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵکردنی فێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی تام، تێکچوونی بینین، زیادبوونی شەکری خوێن، لەرز، خوران، فراوانبوونی مولولەکانی خوێن، گێژی، خەواڵویی، زرنگانەوەی گوێ، نەمانی ئارەزوی خواردن، زەردی، پەڵە و بلۆقکردنی پێست، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥ تا ٢٠ میلیگرام هاوهێزی (فینایتۆین)/کیلۆگرام. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٤ تا ٦ میلیگرام هاوهێزی (فینایتۆین)/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا بە دەمار.

## فرۆڤاتریپتان: FROVATRIPTAN

**ناوی بازرگانی:** Frova,migrad

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** ٥HTI agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شەقیقەی تیژ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی گەدە، ئازاری سك، خەواڵویی، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، ئارەقکردنەوە، سکچوون، غازات، کەمبوونی لێدانی دڵ، دڵەکوتێ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، هەوکردنی لوت وگەروو، جیوب، لەرزین، بێخەوی، ئازاری جومگە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری ئێسك، تا، ئازاری سنگ، گێژی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢,٥ میلیگرام خۆراکی دووبارەکردنەوەی لە ٢ سەعاتدا بە بڕی پێویست. لایەنی زۆری بڕی دەرمان خۆراکی ٧,٥ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا.



## فولڤیسترانت: FULVESTRANT

**ناوی بازرگانی:** Faslodex

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Anti، oestrogen

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی مەمکە و بۆ چارەسەری هەندێ هۆرمۆنی پەیوەست بەشێرپەنجەی مەمك و پاش لە لەحەیزچونەوەی ژنان کە شێرپەنجەی مەمك پەرەی سەندووە پاش چارەسەر بە دەرمانە دژە ئیسترۆجینەکانی تر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، سەرئێشە، هەوکردنی میزەڕۆ، نەمانی ئارەزوی خواردن، پەڵە، ئازاری پشت، سوربونەوە، قەبزی، ئازاری سك، هەوکردنی گەروو، خوێنبەربوونی زایەندی ژنان، کاندیدای زایەندی ژنان.

**بڕی دەرمان:** بە دەرزی ماسولکەیی قوڵ بۆ سمت ٥٠٠ میلی گرام لە ڕۆژەکانی ١ و ١٥ و ٢٩، پاشان ٥٠٠ میلی گرام هەموو مانگێك.

## فیورازولیدون: FURAZOLIDONE

**ناوی بازرگانی:** Vifuran,Furaben,Furoxone

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلی گرامی و سەسپێنشنی ٥٠ میلی گرام/١٥میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antibacterial

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردن بەهۆی بەکتریا و پرۆتۆزوا (گیانەوەرێکی تاك خانەیە) و بۆ چارەسەری کۆلێرا و هەوکردنی کۆڵۆن و دژی سکچوون بەهۆی بەکتریاو پرۆتۆزوا و جیاردیاوە بەکاردێت.بۆ چارەسەری گرانەتا و هەوکردنی گەدە و ڕیخۆڵە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تا، لەرزین، ئازاری جومگە، سوربونەوەی پێست، ئازاری دڵ خوران، تێکچوونی پێست.

**بڕی دەرمان:** بۆ هەوکردنی گەدە و ڕیخۆڵە گەورەکان ١٠٠ میلی گرام خۆراکی، ڕۆژانە ٤ جار. منداڵان ٥ تا ١٢ ساڵ ٢٥ تا ٥٠ میلی گرام خۆراکی، ڕۆژانە ٤ جار. منداڵی ١ تا ٤ ساڵ ١٧ تا ٢٧ میلی گرام خۆراکی، ڕۆژانە ٤ جار. منداڵی ١ تا ١١ مانگ ٨ تا ١٧ میلی گرام خۆراکی، ڕۆژانە ٤ جار.لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٨/٨ میلی گرام/کیلۆگرامە، لایەنی زۆری دەورەی دەرمان، ٧ ڕۆژە.

## فیورۆسیمایدا: FUROSEMIDE

**ناوی بازرگانی:** Lasix,Uritol,Furosemide

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ و ٤٠ و ٥٠٠ میلی‌گرامی و دەرزی ١٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر و گیراوەی خۆراکی ٢٠ و ٤٠ و ٥٠ میلی‌گرام/٥ میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** Loop diuretic

**بەکارهێنان:** میزهێنەرە و بۆ دابەزاندنی پەستانی خوێن و بۆ چارەسەری ئۆدیما و هایپەرکالسیمیا (زیادبوونی کالسیۆم ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، ئازاری دڵ تێکچوونی بینین، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، تێکچوونی پێست، تێکچوونی ئەلیکترۆلیتەکان، سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠ تا ٨٠ میلی‌گرام خۆراکی یان بە دەمار ڕۆژانە ٢ جار، منالآن ١ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە دەمار هەمور ٦ تا ١٢ سەعاتێك، ٢ میلی‌گرام/کیلۆگرام خۆراکی هەمور ١٢ تا ٢٤ سەعاتێك. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٦ میلی‌گرام/کیلۆگرام لە بڕێکی دەرماندا. بڕی دەرمان زیاد دەکرێت لە لاوازی گورچیلەدا. بۆپەستانی خوێن ٤٠ میلی‌گرام ڕۆژی ٢ جار. بۆ هایپەرکالسیمیا ٨٠ تا ١٠٠ میلی‌گرام بە دەمار هەر ١ تا ٢ سەعاتێك یان ڕۆژانە ١٢٠ میلی‌گرام خۆراکی. بۆ ئۆدیمای تیژی سی ٤٠ میلی‌گرام بەدەماری لەسەرخۆ، ڕێی پێ دەدرێت. پاشان ئەگەر پێویست بێت، ٨٠ میلی‌گرام بە دەمار لە ماوەی ١ سەعات ڕێی پێ دەدرێت. شیرخۆران و منالآن ١میلی‌گرام/کیلۆگرام، ماسولکەیی یان دەماری هەر ٢ سەعاتێك تا گەیشتن بە ڕووی دەرمانی داواکراو ڕێی پێ دەدرێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٦ میلی‌گرام/کیلۆگرامە. بۆ پەککەوتنی موزمینی گورچیلە گەورەکان ڕۆژانە ٨٠ میلی‌گرام خۆراکی ئەتوانی کە بڕی دەرمان تا ڕۆژانە ١٢٠ میلی‌گرام زیاد بکەیت.

## فیوسیدیك ئەسید: FUSIDIC ACID TOP.

**ناوی بازرگانی:** Fucidin

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی کرێم و مەڵهەمی ٢٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنەکان و ئیلتیهابی پێستی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار بەکاردێت.



## فیوسیدیك ئەسید: FUSIDIC ACID OPH.

**ناوی بازرگانی:** fucithalmic

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی قەترەی چاو ١٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ جار بەکاردێت.

## فیوسیدیك ئەسید: FUSIDIC ACID SYS.

**ناوی بازرگانی:** Fucidin

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی سەسپێنشن و شروب و حەبی ٢٥٠ میلیگرامی و دەرزی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی و هەوکردنی ئێسك و جومگە و پێست و شانە نەرمەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری گەدە و سك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ هەوکردنی ئێسك و جومگە و پێست و شانە نەرمەکان، حەب ٥٠٠ میلیگرام (٢ حەب) ڕۆژانە ٣ جار. بۆ سەسپێنشن بۆ هەوکردنی ئێسك و جومگە و پێست و شانە نەرمەکان، گەورەکان ١٥ میلیلیتر ڕۆژانە ٣ جار، منداڵ تا تەمەنی ١ ساڵ ١ میلی لیتر/کیلۆگرام ڕۆژانە دابەشکراو لە ٣ بڕی یەکساندا، تەمەنی ١ تا ٥ ساڵ ٥ میلیلیتر ڕۆژانە ٣ جار، تەمەنی ٦ تا ١٢ ساڵ ١٠ میلیلیتر ڕۆژانە ٣ جار. دەرزی هەوکردنی ئێسك و جومگە و پێست و شانە نەرمەکان، گەورەکان ٥٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار، منداڵی تەمەنی ١ تا ١٢ ساڵ ٢٠ میلی گرە/کیلۆگرام ڕۆژانە دابەشکراو لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا ئینفیوشن دەکرێت بەلانی کەم زیاتر لە ٢ سەعات.

***



## گابا پێنتین: GABAPENTIN

**ناوی بازرگانی:** Neurontin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠٠و ٣٠٠ و ٤٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticonvulsant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەرکەمی جوزئی یان تەشەنوجی عمومی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕشانەوە، هێڵنجدان، گێژی، ئازاری ماسولکە، تێکچوونی چاو، کۆکە، خەواڵویی، خەمۆکی، هیلاکبوون، زیادبوونی کێش، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، وشکبوونەوەی دەم، سەرئێشە، قەبزی، هەوکردنی لوت.

**بڕی دەرمان:** ١,٥ حەب کاتی خەوتن ، و بەتەدریجی ٣٠٠ میلی گرام ٢ جار لە ڕۆژێکدا و ٣٠٠ میلی گرام ٣ جار لەڕۆژێکدا، لەڕۆژی سێیەمدا ڕێی پێدەدرێت. بەڵام بڕی مامناوەند ٣ تا ٤ حەب لە ماوەی ڕۆژێکدا سودی لێوەردەگیرێت.

## گادۆدیامید: GADODIAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Omniscan

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٨٧ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** ionic contrast media ،Radiological non

**بەکارهێنان:** پێش لە (MRI) بە دەرزی دەدرێت بۆ یارمەتی تەشخیصی کێشەکان لە مێشك، دڕك، سنگ، ناوچەی کلۆت، و بەشەکانی تری لەش بەکاردێت.

کاریگەری لاوەکی یەکان: تەشەنوج، خرۆشان، بێخەوی، لەرزین. سەرگێژبوون، سوربونەوە، خوران، ئارەقکردنەوە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، ئازاری قەفەسەی سنگ، تێکچوونی بینین، سوتانەوە، کۆکە، خەمۆکی، گێژی، هیلاکی، سەرئێشە، ئازاری ماسولکە، فێ، پەڵە، خیزەخیز، بێهێزی، زیادبوونی کێش.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٢ میلی لیتر/کیلۆگرام دەماری، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢٠ میلی لیترە.



## گادۆ پێنتیتەیت: GADOPENTETATE DIMEGLUMINE

**ناوی بازرگانی:** Magnevist

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٤٦٩ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Radiological non، ionic contrast media

**بەکارهێنان:** بۆ وێنەگرتن لە مێشك و مۆخ لە (MRI) دا. بۆ وێنەگرتن لە هەموو لەشدا و بۆ وێنەگرتنی GIبەکاردێت.

کاریگەری لاوەکی یەکان: سەرئێشە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرگێژبوون، تەشەنوج، هێڵنجدان، ڕشانەوە، حەساسیەت، خەواڵویی، نەمانی ئارەزوی خواردن، وشکبوونەوەی دەم.

**بڕی دەرمان:** بۆ وێنەگرتن لە مێشك و مۆخ لە (MRI) دا. گەورەکان و منالآن ٠,٢ میلی لیتر/کیلۆگرام دەماری. بۆ وێنەگرتن لە هەموو لەشدا گەورەکان و منالآنی گەورەتر لە ٢ ساڵ ٠,٤ میلی لیتر/کیلۆگرام دەماری. بۆ وێنەگرتنی GI ١٠٠ میلی‌لیتر لە گیراوەی ٩/٣٨ میلی‌گرام/میلی‌لیتر کە بە ٩٠٠ میلی‌لیتر ئاو توابێتەوە، پاشان ١٠٠ تا ١٠٠٠ میلی‌لیتر لە گیراوەی تواوە بەشێوەی خۆراکی یان لە ڕێگەی کۆم بە نەخۆش بدرێت.

## گالانتامین: GALANTAMINE HBR

**ناوی بازرگانی:** Reminyl

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی خۆراکی ٢٠ میلی‌گرام/٥میلی‌لیتر و حەبی ٤ میلی‌گرام و ٨ میلی‌گرام و ١٢ میلی‌گرام.

**گروپی دەرمان:** Acetylcholinesterase inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێتی سوك تا مامناوەند لە جۆری نەخۆشی ئەلزایمەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هیلاکبوون، ڕشانەوە، کەمخوێنی، سەرئێشە، هێڵنجدان، سکچوون، خەمۆکی، بێخەوی، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ ئازاری سك، کەمبوونەوەی کێشی لەش، گێژی، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار، زیاد دەکرێت بۆ ٨ میلی‌گرام ڕۆژانە ٢ جار پاش لە ٤ هەفتە، لەوانەیە زیاد بکرێت بۆ ١٢ میلی‌گرام ڕۆژانە ٢ جار لە ٤ هەفتەدا.



## گالامین: GALLAMINE

**ناوی بازرگانی:** Flaxedil

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٤٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Muscle relaxant

**بەکارهێنان:** بۆ خاوکردنەوەی پەیکەرەماسولکە و لەکاتی بەنجدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ پەڵەی پێست، کرژبوونی بۆری هەوا، سوربونەوەی پێست.

**بری دەرمان:** گەورەکان و منالآن ١ میلی گرام/کیلۆگرام.

## گالیۆم: GALLIUM

**ناوی بازرگانی:** Ganite

**شێوەی دەرمان:** دەرزی: گالیۆم (٦٧ga) سیرەیت: ١٠m Ci، دەرزی: گالیۆم (٦٧ga) سیرەیت: ٥m Ci.

**گروپی دەرمان:** Antihypercalcemia

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیادبوونی کالسیۆم لە خوێندا بەهۆی شێرپەنجەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی لێدانی دڵ نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی بینین، زرنگانەوەی گوێ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ورێنە، سکچوون، قەبزی، بەگرانی هەناسەدان، زیاد میزکردن لە شەودا، وشکبوونی دەم، کەمبوونی خرۆکەی سپی، کرژبوونی ماسولکە، کەمخوێنی، کەمبوونی کالسیۆم، کەمبوونی فۆسفات.

**بری دەرمان:** گەورەکان ١٠٠ تا ٢٠٠ میلی گرام/مەترسێجا ڕۆژانە تا ٥ ڕۆژ لە ناو دەماردا و یان بەنینفیوشن لەماوەی ٢٤ سەعاتدا.

## گالسەلفەیس: GALSULFASE

**ناوی بازرگانی:** Naglazyme

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Metabolic agent ،Endocrine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەندێ لە نیشانەکانی نەخۆشی بۆماوەیی پێی دەوترێت (میوکۆپۆلیسەکەرایدۆسیس (MPS، VI) بەهۆی کەمبوونی هەندێ ئەنزیم کەپێی دەوترێت (N، ٤ acetylgalactosamine، sulfatase) لە لەشدا، کە پێویستە لە لەشدا بۆ تێکشکاندنی هەندێ شەکر و پرۆتین لە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری گەدە، سکچوون، هەوکردنی گەدە، ئازاری سنگ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی، هەناسەوەستان، گیرانی لوت، خاوی، چاوئێشە، ئازاری گوێ، هەوکردنی گەروو، سەرئێشە، ئازاری جومگە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سوربونەوەی چاو، فتقی ناوکی، ڕەقبوون، تاری کۆرنیەیی، ئۆدیمای ڕواڵەتی.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی IV ئینفیوشن گەورەکان و منداڵانی سەرووی ٥ ساڵ ١ میلیگرام/کیلۆگرام هەفتانە ١ جار.

## گانسیکلۆڤیر: GANCICLOVIR

**ناوی بازرگانی:** Cymevene,Virgin,Vitrasert,Cytovene

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی و ئیمپلانتی چاو ٤,٥ میلیگرام.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی چاو بە هۆی سایتۆمێگالۆڤایرۆس لەو نەخۆشانەی کۆئەندامی بەرگریان لاوازە و بەتایبەتی لەئایدزدا و بۆ بەرگری لە هەوکردنی سایتۆمێگالۆڤایرۆس لەهەندێ نەخۆشی چاندنی ئەندامدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، شڵەژان، خوران، پەڵە، سەرئێشە، سەرگێژبوون، کەمبوونی خڕۆکەی سپی، تەشەنوج، بێهۆشی، ئازاری سك، وشکبوونەوەی دەم، کەمخوێنی، تا، هەوکردنی سی یەکان، دڵەڕاوکێ، کەمبوونی خڕۆکەی سپی دەنکۆڵەدار.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ٥ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا بەشێوەی دەماری IV هەموو ١٢ سەعاتێك بۆ ماوەی ٢ تا ٣ هەفتە. ١ ئیمپلانتی چاو هەموو ٥ تا ٨ مانگێك. گەورەکان ١ گرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ جار.

## گانسیکلۆڤیر: GANCICLOVIR OPH.

**ناوی بازرگانی:** Zirgan

**شێوەی دەرمان:** جێل.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی ڤایرۆسی کۆرنیەی چاو (ئاوسانی بەشی پێشەوەی چاو) بەهۆی ڤایرۆسی تامێسکی سادەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بینین، برین وسوربونەوەی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی تەمەن ٢ ساڵ و گەورەتر ١ قەترە بکرێتە ئەو چاوەی توشبووە ٥ جار لە ڕۆژێکدا، هەموو ٣ سەعاتێك هەتا چاکبوونەوەی نیشانەکان. پاشان ١ قەترە ٣ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ.



## گانیریلیکس: GANIRELIX ACETATE

**ناوی بازرگانی:** Antagon

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠ مایکرۆگرام/٠,٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:**، Metabolic agent Endocrine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ڕێگری لە گۆنادۆترۆفین (هۆرمۆنێکە لەو هۆرمۆنانەی لە لایەن ژێر مێشکە ڕژێنەوە دروست دەکرێن کە کاردەکەنە سەر هێلکەدان و گون بۆ زیاد دروستکردنی هۆرمۆنی سێکسی) و بۆ بەرگری لە خرۆشانەکانی هۆرمۆنی (LH) لەماوەی کۆنترۆلکردنی هاندانی زیاد لەحەدی هێلکەدان و بۆ چارەسەری نەزۆکی لەژناندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، زیادبوونی کێش، ئازاری توندی حەوز، ئازاری سك، هێڵنجدان، ئازاری گەدە، سکچوون، ڕشانەوە، خوێنبەربوونی زایەندی ژنان، ئازار و سووربوونەوە و ڕوشانی شوێنی دەرزی، ئاوسان، کەمبوونەوەی میز.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ مایکرۆگرام ژێرپێستی ١ جار لە ڕۆژێکدا.

## جیفیتینیب: GEFITINIB

**ناوی بازرگانی:** Iressa

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی تەشەنەکردوو و پێشکەوتووی سی جۆری (NSCLC) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سنگ، نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، وشکبوونەوەی دەم، تا، میزی خوێناوی، وشکبوونەوەی چاو، پەڵە، زیپکە، خوران، چاوئێشە، هەوکردنی پەنکریاس و جگەر، ئازار و ڕوشانی چاو، بەگرانی هەناسەدان، داخستنی قوڕگ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار.

## جەلاتین: GELATIN

**ناوی بازرگانی:** Gelofusion

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی دەرزی و ئینفیوشن.

**گروپی دەرمان:** Plasma substitutes



**بەکارهێنان:** بۆ زیادکردنی قەبارەی پلازما و بۆ چارەسەری کەمی قەبارەی خوێن و (شۆکی هایپۆڤۆلیمیا(کەمبوونی قەبارەی خوێن ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی IV ئینفیوشن سەرەتا ٥٠٠ تا ١٠٠٠ میلیلیتر لە گیراوەی ٣,٥ تا ٤ ٪.

## جیمسیتابین: GEMCITABINE

**ناوی بازرگانی:** Gemzar

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠٠ میلیگرامی و ١ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هێلکەدان و پەنکریاس و سی و مەمك و گەدە و مێشك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، نارێکی لێدانی دڵ، خەوالّویی، پەڵە، خوران، هەڵوەرینی موو، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، میزی خوێناوی، کەمخوێنی، کەمی خڕۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، تەنگەنەفەسی، کرژبوونی بۆری هەوا، ئۆدیمایی سی، تا.

**بڕی دەرمان:** ١٠٠٠ تا ١٢٥٠ میلیگرام/مەتردوجا زیاتر لە ٣٠ خولەك تا ١ سەعات بە IV ئینفیوشن لە هەفتەیەکدا × ٣ تا ٤ هەفتە یان ٦ تا ٨ هەفتە.

## جیمیپرۆست: GEMEPROST

**ناوی بازرگانی:** Gemeprost

**شێوەی دەرمان:** پێساری زایەندی ژنان ١میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Prostaglandin

**بەکارهێنان:** بۆ کۆتایی پێهاتنی سکپڕی و بۆ کرژبوون و هاتنەوەیەکی منداڵدان لەهەر قۆناغێکی سکپڕیدا و لەکاتی نەشتەرگەری منداڵبوون و لەبارچووندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان، گێژی، ڕشانەوە، سکچوون، لاوازی ماسولکەیی، سوربونەوە، لەرز، لاوازی ماسولکەیی، ئازاری پشت، ئازاری سنگ، دڵەکوتێ، سوکەتا، خوێنبەربوونی زایەندی ژنان، تەنگەنەفەسی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، جەڵدە، ئازاری منداڵدان.

**بڕی دەرمان:** لە ڕێگەی زایەندی ژنانەوە ١ میلیگرام ئەخرێتە ناو بەشی پشتەوەی گومەزی زایەندی ژنان ٣ سەعات پێش نەشتەرگەری.

## جیمفیبرۆزیل: GEMFIBROZIL

**ناوی بازرگانی:** Lopid

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٣٠٠ میلیگرام و حەبی ٤٥٠ و ٦٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antilipemic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیادبوونی چەوری خوێن، کۆلیسترۆڵی خوێن و (هایپەر ترایگلیسراید) و پێشگری لە نەخۆشی سیسبوونی دڵ (ئیسکیمیا) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سک، سکچوون، سەرئێشە، تەشەنوج، خوران، هەڵوەرینی موو، ئاوسانی قورگ، ئازاری ماسولکە، وشکبوونەوەی دەم، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، هەوکردنی پێست، سەرگێژبوون، کەمخوێنی، پەڵە، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** ١٢٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، (نیوسەعات پێش لە نانی بەیانی و ئێوارە بەکاردەهێنرێت).

## جیمیفلۆکساسین: GEMIFLOXACIN

**ناوی بازرگانی:** Factive

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی توندی بەکتریایی مزمینی بۆریچکەکان و هەوکردنی سوك و مامناوەندی سی یەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، زیاد لێدانی دڵ سیسبوونی دڵ پەڵە، سوربونەوە، زەردی، خوێنبەربوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، پەککەوتنی گورچیلە، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٢٠ میلیگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ.

## جیمتیوزیوماب: GEMTUZUMAB

**ناوی بازرگانی:** Mylotarg

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥ میلیگرام/٢٠ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Monoclonal Antibody

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن لیوکیمیای تیژی پەیوەست بە مۆخی ئێسکەوە (AML) بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت، لەرز، تا، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، سەرئێشە، گێژی، قەلەقی، بێخەوی، نارێکی لێدانی دڵ، بوونی خوێن لە میزدا، ئازاری سنگ، زیادبوونی کێش، نەمانی ئارەزوی خواردن، زەردی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۹ میلیگرام/مەتردوجا بە IV ئینفیوشن نەدرێت لە ماوەی ۲ سەعاتدا ۱ جار.

## جێنتامایسین: GENTAMICIN SYS.

**ناوی بازرگانی:** Genticin,Cidomycin,Gentak,Garamycin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ۲۰ و ٤۰ و ۸۰ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردن بەکاردێت بەهۆی ڕێژەیەکی زۆری بەکتریاوە، بۆ چارەسەری هەوکردنی پێست و هەوکردنە توندەکان و سوتان و سوتانەوەکان و هەوکردنی توندی پەردەکانی مێشك و بەکتریاویبوونی خوێن و بۆ پێشگری لە هەوکردنی پەردەکان دڵ، بۆ چارەسەری هەوکردنی ناوەوەی سك و هەوکردنی ئێسك و مۆخ هەوکردنی سی و حەوز و پرۆستات و گورچیلە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەوکردنی گەدە، تێکچوونی گوێ، تێکچوونی گورچیلە، خوران، برینی دەم، پەڵە، سەرئێشە، هەستیاربوون بەڕوناکی، سکچوون، حەساسیەت، بێهێزی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ۳ تا ٥ میلیگرام/کیلۆگرام کێشی لەش.

## جێنتامایسین: GENTAMICIN OPH.

**ناوی بازرگانی:** Genoptic,Garamycin

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم و قەترەی چاوی ۰,۱٪ و ۰.۳٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، سوربونەوە، ئاوسان، ڕوشان.

**بڕی دەرمان:** مەڵهەم گەورەکان و منالان بۆ هەوکردنی چاو ڕۆژانە ۲ تا ۳ جار. قەترەی چاو بۆ هەوکردنی سوك و مامناوەندی چاو ۱ تا ۲ قەترە هەموو ۲ تا ٤ سەعاتێك. تا ۲ قەترە لە سەعاتێکدا بۆ هەوکردنی توندی چاو.



## جینتامایسین: GENTAMICIN OTIC

**ناوی بازرگانی:** Genticin, Garamycin

**شێوەی دەرمان:** قەترەی گوێ.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی گوێی دەرەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، سووربونەوە، ئاوسان، ڕوشان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ تا ٣ قەترە ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار بەکاردێت.

## جینتامایسین: GENTAMICIN TOPICAL

**ناوی بازرگانی:** Garamycin

**شێوەی دەرمان:** کرێم و مەڵهەمی ٠,١٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی پێست بەکاردێت، بەهۆی وردە زیندەوەری هەستیارەوە.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشان، سووربونەوە، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١ ساڵ ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار بەکاردێت.

## جیستۆنۆرۆن: GESTONORONE

**ناوی بازرگانی:** Gestronol,Depostat,Primostat

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ میلیگرام/میلیلیتر (٢میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antineoplasm

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی ناوپۆشی منداڵدان و گەورەبوونی باشی پرۆستات (BPH) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەواڵویی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، خەمۆکی، خوران، سکچوون، زیپکە، پەڵە، نەکەوتنە عوزر، شەقیقە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ تا ٤٠٠ میلیگرام ماسولکەیی IM هەر ٥ تا ٧ ڕۆژ ١ جار.

ت: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێک نەخۆشی

## گلاتیرامێر ئەسیتەیت: GLATERAMER ACETATE

**ناوی بازرگانی:** Copaxone

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Immunosuppressive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی فرەڕەقبوون (Multiple sclerosis) و بۆ بەرگری لە گەڕانەوەی نەخۆشی فرەڕەقبوون بەکاردێت، کە نەخۆشی یەکی موزمینی کۆئەندامی دەمارە توشی تەمەنی لاوان و ناوەڕاستی تەمەنی گەورەکان دەبێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سووربونەوە، ئازاری سنگ، دڵەکوتێ، زیاد لێدانی دڵ، تەنگەنەفەسی، هێڵنجدان، قەبزی، تێکچوونی گەدە، خەمۆکی، لەرزین، قەلەقی، ئۆدیما، ئارەقکردنەوە، گێژی، تەشەنوج، ئازاری پشت، پەڵە، سەرئێشە، ئازاری جومگە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بە دەرزی ژێرپێستی (SC) ٢٠ میلیگرام ١ جار لە ڕۆژێکدا.

## گلیبینکلامایدە: GLIBENCLAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Diabeta,Euglucon,Glyburide,Daonil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ و ٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Hypoglycemic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ و بۆ دابەزاندنی ڕێژەی شەکر لە خوێندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، خەمۆکی، دڵەڕاوکێ، خەواڵویی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، خوێنبەربوون، زیادلێدانی دڵ ئارەقکردن، خوران، پەڵە، بیرۆ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ڕۆژانە ٢,٥ تا ٥ میلیگرام خۆراکی دەستبەجێ لەگەڵ یان پاش لە نانی بەیانی.لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٥ میلیگرامە.

## گلیکلازاید: GLICLAZIDE

**ناوی بازرگانی:** Diamicron

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٨٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Hypoglycemic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، بێهێزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمخوێنی – کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن، کەمبوونەوەی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ڕۆژانە ٤٠ تا ٨٠ میلیگرام خۆراکی پێش لە نانی بەیانیان،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣٢٠ میلیگرامە.

## گلایمیپیرید: GLIMEPIRIDE

**ناوی بازرگانی:** Amaryl

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ و ٢ و ٤ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Hypoglycemic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونی شەکری خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، تەشەنوج، وڕێنە، سەرئێشە، گێژی، سکچوون، ئازاری گەدە، خوران، پەڵە، زەردی، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** ١,٤ میلیگرام لە ڕۆژێکدا، لایەنی زۆر ٨ میلیگرامە.

## گلیپیزاید: GLIPIZIDE

**ناوی بازرگانی:** Glucotrol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ و حەبی ٢,٥ و ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Hypoglycemic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نەمانی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، پەڵە، شەرا، هەستیاربوون بە ڕوناکی، گێژی، خەواڵویی، کەمبوونی شەکری خوێن، کەمی خڕۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، کەمخوێنی، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٥ میلیگرام خۆراکی لە ڕۆژێکدا نیوسەعات پێش نانی بەیانی زیاد دەکرێت بۆ ٢,٥ تا ٥ میلیگرام لە ڕۆژێکدا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٤٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا.



## گلوکاگۆن: GLUCAGON

**ناوی بازرگانی:** Glucagen

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antihypoglycaemia

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمی شەکر لە خوێندا و دەرمانی تەشخیصی بۆ تیرۆوانینی ڕادیۆلۆجی (تیشکزانی) گەدە و دوانزەگرێ و ڕیخۆڵە باریکە و بۆ چارەسەری بێهۆشی بەهۆی شۆکی بەکارهێنانی ئەنسۆلینەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی پێست، کرژبوونی بۆری هەوا، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** دەرمانی تەشخیصی بۆ تێڕوانینی ڕادیۆلۆجی (تیشکزانی) گەدە و دوانزەگرێ و ڕیخۆڵە باریکە گەورەکان ٠,٥ تا ١ میلی‌گرام بەشێوەی ماسولکەیی یان دەماری پێش لە دەستپێکردنی کرداری ڕادیۆلۆجی. بۆ چارەسەری بێهۆشی بەهۆی شۆکی بەکارهێنانی ئەنسۆلینەوە گەورەکان ٠,٥ تا ١ میلی‌گرام، بەشێوەی ماسولکەیی یان دەماری یان ژێرپێستی ١ سەعات پاش لە بێهۆشی و ئەگەر پێویست بکات،١٥ خولەك دواتر، ئەتوانی کە ئەم بڕی دەرمانە دووبارەبکەیتەوە.

## گلوتارالدیهاید: GLUTARALDEHYDE

**ناوی بازرگانی:** Glutarol

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ١٠٪.

**گرووپی دەرمان:** Anti، Warts

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بالووکە بەتایبەتی بالووکەی بنی پێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** پەڵە، ڕوشانی پێست، قاوەیی بوونی پێست.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ جار بەکاردێت.

## گلیبیوراید: GLYBURIDE

**ناوی بازرگانی:** Diabeta

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١,٢٥ و ٢,٥ و ٥ و حەبی (microionized) ١,٥ و ٣ و ٦ میلی‌گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Hypoglycemic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هیلاکی، خاوی، زەردی، کەمی خرۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، کەمخوێنی، هێڵنجدان، دڵەکزە، سووربونەوە، خوران، ئەکزیما، هەستیاربوون بە ڕوناکی، گێژی، تێکچوونی هاوسەنگی.

**بڕی دەرمان:** ١,٢٥ تا ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار، لایەنی زۆر ٢٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. حەبی (microionized) ٠,٧٥ تا ٦ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار. لایەنی زۆر ١٢ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا.

## گلیسرین: GLYCERIN

**ناوی بازرگانی:** Glyrol,Fleet babylax

**شێوەی دەرمان:** شاف (کۆم) ١ گرامی و ٢ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Laxative

**بەکارهێنان:** ڕەوانکەرە و بۆ چارەسەری قەبزی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، نارێکی لێدانی دڵ زیادبوونی شەکری خوێن، ئازاری چاو، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، تینوێتی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ٦ ساڵ ٣ گرام بە شێوەی شاف، منداڵانی بچوکتر لە ٦ ساڵ ١ تا ١,٥ گرام بەشێوەی شاف.

## گۆلیمیوماب: GOLIMUMAB

**ناوی بازرگانی:** Simponi

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Immune modulator

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ڕۆماتیزم و ئیلتیهابی فەقەرەکان و هەوکردنی جومگەی سۆریاسی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونی کێش، ئارەقکردنەوە بەشەودا، ئازاری گەدە، خێرا لێدانی دڵ خوران، زەردی، ئازاری سنگ، کۆکە، ئازاری جومگە، پژمین، برینی قوڕگ، تەشەنوج، ئازاری سك، سەرگێژبوون، هەوکردنی پێست، سکچوون، تا، پەڵە، ڕشانەوە، هێڵنجدان، کەمخوێنی، قەبزی، تەنگەنەفەسی، زیادبوونی پەستانی خوێن، سووربونەوە، پەککەوتنی دڵ تێکچوونی بینین، زیادبوونی شەکری خوێن، هەوکردنی گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ میلیگرام ژێرپێستی ١ جار لە مانگێکدا.

## گۆنادۆرلین: GONADORELIN

**ناوی بازرگانی:** Factrel,Lutrepulse

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠مایکرۆگرامی و ٠,٨ میلی‌گرامی و ٣,٢ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Gonadotrophin، releasing hormone

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەزۆکی و کەمی کاری هیپۆفیز و نەکەوتنە بیّ نوێژی و تەشخیصی کەمی کاری رژێنی جنسی و کەمی گۆنادۆترۆفین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، پەڵە، هێڵنجدان، خوران، سوربونەوە، رشانەوە، ئازاری دڵ، حەساسیەت، سکچری.

**بڕی دەرمان:** ٥ مایکرۆگرام بۆ زیاتر لە ١ خولەك بەدەمارIV هەموو ٩٠ خولەکێك بۆ ماوەی ٢١ رۆژ.

## گۆسیریلین: GOSERELIN

**ناوی بازرگانی:** Zoladex

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٣,٦ و ١٠,٨ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پرۆستات و ئیلتیهابی پەردەی ناوەوەی منداڵدان و شێرپەنجەی مەمك و خوێنبەربوونی منداڵدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گەورەبوونی مەمك، وشکی پێست، وشکی دەم، ئازاری سنگ، هێڵنجدان، ئارەقکردنەوە، سەرئێشە، گێژی، تێکچوونی بینین، بێهێزی، زیاد بوونی شەکری خوێن، خەواڵویی، زیادبوونی میزکردن، کەمبوونی کێش، کەمبوونی ئارەزوی خواردن، بوونی خوێن لە میزدا، ئازار و کزانەوە لە کاتی میزکردن.

**بڕی دەرمان:** ٣,٦ میلی‌گرام ژێر پێستی هەموو ٢٨ رۆژێك یان ١٠,٨ میلی‌گرام هەموو ٣ مانگێك، عادەتەن لەبەشی سەرەوەی دیواری سك.

## گرامیسیدین: GRAMICIDIN

**ناوی بازرگانی:** Gramicidin

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی مەزوعی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic



**بەکارهێنان:** لەگەڵ دژەزیندەگی یەکان و ستێرۆیدەکان بەکاردێت بۆ چارەسەری هەوکردنی مەوزوعی پێست برینی پێست وبرینی زەرد و هەوکردنی گوێ و چاو.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٣ جار ڕووی ئەو شوێنەی پێدەماڵرێت.

## گرانیسیترۆن: GRANISETRON

**ناوی بازرگانی:** Kytril

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ میلیگرامی و دەرزی ٠,١ و ١ میلیگرام/میلیلیتر و دەرزی ٣میلیگرام/٣ میلیلیتر و گیراوەی ٢ میلیگرام/١٠ میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiemetic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و پێشگری لە هێڵنجدان و ڕشانەوە بەهۆی چارەسەری کیمیایی و تیشك و هێڵنجدان و ڕشانەوەی پاش نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێهێزی، بێخەوی، ناجێگیری، گێژی، تا، خەواڵویی، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری سك، قەبزی، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، سکچوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەوکردنی میزەڕۆ، کەمخوێنی. کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، کۆکە، هەڵوەرینی موو، هەوکردنی پێست، پەڵە، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآن بۆ چارەسەری کیمیایی ١٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا، بە دەمار ٣٠ خولەك پێش لە چارەسەری کیمیایی. گەورەکان دەرزی ٠,١، ١ میلیگرام/میلیلیتر، بۆ چارەسەری کیمیایی ٢ میلیگرام خۆراکی هەموو ڕۆژێك ١ سەعات پێش لە چارەسەری کیمیایی، پاشان ١٢ سەعات دواتر. هێڵنجدان و ڕشانەوەی پاش نەشتەرگەری ١ میلیگرام بە دەمار بۆ زیاتر لە ٣٠ چرکە پێش لە کۆتایی هاتنی حاڵەتەکە.

## گریزیۆفولڤین: GRISEOFULVIN

**ناوی بازرگانی:** Grifulvin,Grisovin,Fulvin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٢٥ و ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی پێست و نینۆك و کەچەڵی ڕیش و پێ و موو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، سەرئێشە، بێخەوی، پەڵە، ئازاری سك، غازات، هیلاکی، سەرگێژبوون، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.



**بڕی دەرمان:** بۆ هەوکردنی کەڕوویی پێست و نینۆك و موو گەورەکان ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی بە یەك بڕ یان بەشێوەی دابەشکراو. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١ گرامە. بۆ کەچەڵی ڕیش و پێ ٠,٧٥ تا ١ گرام خۆراکی ڕۆژانە. منالآنی زیاتر لە کێشی ٢٣ کیلۆگرام ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی بە یەك بڕ یان بەشێوەی دابەشکراو. منالآن بەکێشی ١٤ تا ٢٣ کیلۆگرام ١٢٥ تا ٢٥٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە، بەیەك بڕ یان بەشێوەی دابەشکراو.

## گوایافینزین: GUAIFENESIN

**ناوی بازرگانی:** Amonidrin,robitussin

**شێوەی دەرمان:** شروبی ١٠٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و حەبی ١٠٠ و ٢٠٠ و ٦٠٠ و ١٢٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ٢٠٠ و ٣٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Expectorant

**بەکارهێنان:** بەڵغەمدەرکەرە و دژی کۆکەی وشك بەکاردێت، هەروەها دەرمانی یارمەتیدەرە بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی بۆرینچکەکان و جیوب و گەروو.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، گێژی، تێکچوونی هەرس، پەڵە، خەواڵویی، سەرئێشە، نارەحەتی گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ٢٠٠ تا ٤٠٠ میلیگرام (١٠ تا ٢٠ میلی لیتر)، خۆراکی هەر ٤ سەعاتێك. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە، ٢,٤ گرامە. منالی ٦ تا ١١ ساڵ ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام (٥ تا ١٠ میلی لیتر) هەر ٤ سەعاتێك، لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ١,٢ گرامە. منالی ٢ تا ٥ ساڵ ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام (٢,٥ تا ٥ میلی لیتر) هەر ٤ سەعاتێك، لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٦٠٠ میلیگرامە.

## گوایافینزین & کۆداین: GUAIFENESIN & CODEINE

**ناوی بازرگانی:** Brontex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلیگرام کۆداین/٣٠٠ میلیگرام گوایافینزین.شروبی ٢,٥ میلیگرام کۆداین/٧٥ میلیگرام گوایافینزین/٥ میلیلیتر و ئەوانی تر ١٠ میلیگرام کۆداین/١٠٠ میلیگرام گوایافینزین/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antitussive,analgesic,expectorant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کۆکەی وشك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، قەبزی.



**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ تا ١٠ میلی‌لیتر یان ١ حەب خۆراکی هەموو ٦ تا ٨ سەعاتێك (لایەنی زۆر ٦٠ میلی لیتره لە ٢٤ سەعاتدا) منالّی ٢ تا ٦ ساڵ ١ تا ١,٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام کۆدایین لە ڕۆژێکدا لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك (لایەنی زۆر ٣٠ میلی‌گرامە لە ٢٤ سەعاتدا). منالّی ٦ تا ١٢ ساڵ ٥ میلی‌لیتر هەموو ٤ سەعاتێك (لایەنی زۆر ٣٠ میلی لیترە لە ٢٤ سەعاتدا).

## گوایافینزین &دیکسترۆمیپورفان: GUAIFENESIN &DEXTRO.

**ناوی بازرگانی:** Guaifen DM

**شێوەی دەرمان:** شێوەی OTC زۆری هەیە.

**گروپی دەرمان:** Antitussive, expectorant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کۆکە بەهۆی ڕوشانی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالّویی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالّانی سەروی ١٢ ساڵ ١٠ میلی‌لیتر خۆراکی هەموو ٦ تا ٨ سەعاتێك (لایەنی زۆر ٤٠ میلی لیترە لە ٢٤ سەعاتدا) منالّی ٢ تا ٦ ساڵ دێکسترۆمیپورفان ١ تا ٢ میلی‌گرام/کیلۆگرام لە ٢٤ سەعاتدا لە ڕۆژێکدا لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا (لایەنی زۆر ١٠ میلی لیترە لە ڕۆژێکدا). منالّی ٦ تا ١٢ ساڵ ٥ میلی‌لیتر هەموو ٦ تا ٨ سەعاتێك (لایەنی زۆر ٢٠ میلی لیترە لە ڕۆژێکدا).

## گوانیثیدین: GUANETHIDINE

**ناوی بازرگانی:** Ismelin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلی‌گرامی و دەرزی ١٠ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Adrenergic Blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێنی سەرەتایی و پەستانی خوێنی مامناوەند و توند و پەستانی خوێن بەهۆی نەخۆشی گورچیلە و بچوکبوونەوەی خوێنبەری گورچیلەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، دابەزینی پەستانی خوێن، بێهۆشی، گێژبوون، زیادبوونی کێش، تێکچوونی پێست، کۆبوونەوەی شلە لەلەشدا، گیرانی لوت، سەرئێشە، خەوالّویی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا، بەدەرزی IM ١٠ تا ٢٠ میلی‌گرام، دووبارەکردنەوەی پاش لە ٣ سەعات ئەگەر پێویست بێت.

***



## هالۆپریدۆل: HALOPERIDOL

**ناوی بازرگانی:** Peridol,Haldol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ٢ و ٠,٥ و١ و ١٠ و٢٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ٢ میلیگرامی و دەرزی ٥ و ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری تێکچوونی دەروونی و قەلەقی و خرۆشان و شیزۆفرینیا و دڵەڕاوکێ و چالاکی زیاد لە ڕادە لە منالآندا و لاوازی ماسولکەیی بەهۆی کرژبوون و چوونەوەیەکی ماسوکەوە و بۆ هێڵنجدان و ڕشانەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** قەبزی، وشکبوونی دەم، کەمبوونەوەی میز، تێکچوونی بینین، تەشەنوج، سەرگێژبوون، سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ناڕێکی لێدانی دڵ، زیادبوونی IOP، هەستیاربوون بەڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٥ تا ٢ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار، ١ تا ٥ میلیگرام ماسولکەیی هەموو ٤ سەعاتێك. لایەنی زۆر ڕۆژانە ١٠٠میلیگرام ، منالآن ٦ تا ١٢ ساڵ ٠,٥ تا ١,٥ میلیگرام خۆراکی لەڕۆژێکدا. منالآنی ٣ تا ٦ ساڵ ٠,٠١ تا ٠,٠٣ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ڕۆژانە.

## هالۆثان: HALOTHAN

**ناوی بازرگانی:** Fluothane

**شێوەی دەرمان:** بتڵی ٢٥٠ ملی لیتری ئیستینشاقی (هەڵمژین).

**گروپی دەرمان:** General anaethetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی عمومی ئیستینشاقی (هەڵمژین) و دروستکردن و پاراستنی بەنج بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** لەرزین، تێکچوونی دەماری دڵ هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادلێدانی دڵ خەواڵویی، تەشەنوج، ـتەواوی گورچیلە، ئۆدیمای سی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ دروستکردن خەستییەکانی ١٪ تا ٤٪ بە پێی کەسەکە. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو خەستییەکانی ٠,٥ تا ١,٥ بە پێی کەسەکە، ئیستینشاقی. منداڵان خەستییەکانی ١,٥ تا ٢ بەپێی کەسەکە، ئیستینشاقی.

## هماتینیک: HEMATINIC

**ناوی بازرگانی:** Autrin

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی کەپسولی ڤیتامین ١٥ مایکرۆگرام + فیرەس فیومارەیت ٣٥٠ میلیگرام + ڤیتامین C ١٥٠میلیگرام + فۆلیك ئەسید ١میلیگرام.

**گروپی دەرمان:** خوێنساز.

**بەکارهێنان:** بۆپێشگری و چارەسەری کەمخوێنی بەهۆی کەمی ئاسن و بەدخۆراکی لە سکپڕی دا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری دڵ هێڵنجدان، ڕشانەوە، سوتانەوەی گەدە.

**بڕی دەرمان:** ١ کەپسول لە ڕۆژێکدا لەگەڵ خواردن سودی لێوەردەگیرێت.

## هیپارین: HEPARIN

**ناوی بازرگانی:** Liquaemin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠٠ و ١٠٠٠٠ یەکە/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەکارهێنان:** دژی مەیینی خوێن و کلۆبوونی خوێن بەکار دێت و نایەڵێت خوێن لەناو لولەکانی خوێندا بمەیێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، ئازاری سوك، تا، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠٠٠تا ٢٠٠٠٠ یەکە و پاشان هەر ٨ سەعاتێك ٨٠٠٠ یەکە ڕێی پێ دەدرێت، منداڵان سەرەتا ٥٠ تا ١٠٠ یەکە/کیلۆگرام و پاشان بە پێی بنچینەی فەحصی خوێن مەیین ١٠٠ یەکە/کیلۆگرام ڕێی پێ دەدرێت.



## هیتاستارچ: HETASTARCH

**ناوی بازرگانی:** Hespan,hextend

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٦ گرام/١٠٠ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Plasma Volume Expander

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوون لە قەبارەی خوێن (Hypovolemia) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، ئازاری سنگ، پەلە، نارێکی لێدانی دڵ سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری ماسولکە، خوران، بلۆقکردنی پێست، تێکچوونی بینین، لەرزین.

**بڕی دەرمان:** بڕی دەرمان بە پێی پێویست بەکاردێت، لایەنی زۆر ١٥٠٠ میلیلیتر لە ڕۆژێکدا.

## هیکسامەثیل ئەمین: HEXAMETHYLMELAMINE

**ناوی بازرگانی:** Hexalen,Hexastar

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplasm

**بەکارهێنان:** بۆ دەرمانی هێورکەرەوەی شێرپەنجەی هێلکەدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، هەڵوەرینی موو، هیلاکبوون، تەشەنوج، کەمخوێنی، خەواڵویی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، بیرۆ، خەمۆکی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥٠ تا ٢٦٠ میلیگرام/مەتردوجا ڕۆژانە خۆراکی دابەشکراودا هەر ٦ سەعاتێك دوای خواردن و پێش خەوتن بۆ ماوەی ٢ تا ٣ هەفتە، لە ١ خولی ٢٨ ڕۆژەدا ڕێی پێدەدرێت.

## هیکسیتیدین: HEXETIDINE

**ناوی بازرگانی:** Oraldene

**شێوەی دەرمان:** دەمشۆر ٠,١٪.

**گروپی دەرمان:** پاککەرەوە.

**بەکارهێنان:** بۆ پاراستنی تەندروستی دەم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی شوێنەکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالانی سەرووی ٦ ساڵ، ١٥ میلی لیتری ڕوون نەکراوە بەکاردێین ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار.



## هیستریلین: HISTRELIN

**ناوی بازرگانی:** Vantas

**شێوەی دەرمان:** ئیمپلانت (چاندن) ٥٠ میلی‌گرام.

**گروپی دەرمان:** Gonadorelin analogues

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتووی پرۆستات بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گەورەبوونی مەمك، تێکچوونی جگەر، لاوازی سێکسی، وشکبوونەوەی زایەندی ژنان، زیادبوونی کالسیۆم، لەرزین، کەمخوێنی، پەککەوتنی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی چاندنی ژێرپێستی لەناو سەروی بازودا، ١ ئیمپلانت (٥٠ میلی‌گرام) هەموو ١٢ مانگێك، لابردنی پاش لە ١٢ مانگ چارەسەر.

## هۆماتروپین: HOMATROPINE HBR

**ناوی بازرگانی:** Homat,Isopto homatropine

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٢٪.

**گروپی دەرمان:** Anticholinergic

**بەکارهێنان:** بۆگەورەکردنی بیلبیلەی چاو و شەللی تەنی برژانگ بۆ هەڵەکانی شکانەوە و ئیلتیهابی چاو (Uveitis) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادلێدانی دڵ خەواڵویی، حەساسیەت، وشکبوونەوەی پێست، پەڵە، تێکچوونی بینین، بێهۆشی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ١ یان ٢ قەترە بکرێتە چاوەوە، دووبارەکردنەوەی لە ٥ تا ١٠ خولەکدا، پاشان بە پێی پێویست. بۆ ئیلتیهابی چاو گەورەکان ١ تا ٢ قەترە بکرێتە چاوەوە هەر ٣ تا ٤ سەعاتێك، منداڵانیش ١ قەترە ٢ تا ٣جار لەرۆژێکدا.

## هایدرالازین: HYDRALAZINE

**ناوی بازرگانی:** Apresoline

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ میلی‌گرامی و دەرزی ٢٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێنی مام ناوەند و توند و پەککەوتنی دڵی خوێنتێژراو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، زۆرلێدانی دڵ سکچوون، ئازاری سنگ، نەمانی ئارەزوی خواردن، قەبزی، سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەمۆکی، پەڵە، خوران، سوربونەوەی لوت، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا خۆراکی ١٠ میلیگرام ٣ تا ٤ جار لەڕۆژێکدا زیاد دەکرێت بۆ ٢٥ میلیگرام ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا،لایەنی زۆر ٣٠٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. یان ١٠ تا ٥٠ میلیگرام بە IM و ١٠ تا ٢٠ میلیگرام بە IV، منالآن ٠,٧٥ تا ٣ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی دابەشکراو لە هەموو ٦ تا ١٢ سەعاتێك یان ٠,٤ تا ١/٢ میلیگرام/کیلۆگرام بە IMوIV یان ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام/مەتردوجا بە IMوIV.

## هایدرۆکلۆرۆثایەزاید: HYDROCHLOROTHIAZIDE

**ناوی بازرگانی:** Esidrex ,Ezide,Oretic Microzide

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ میلیگرامی و کەپسولی ١٢,٥ میلیگرامی و گیراوەی ٥٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Diuretic

**بەکارهێنان:** میزهێنەرەو بۆ چارەسەری نۆدیما (کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا) و پەستانی بەرزی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمخوێنی، گێژی، کەمبوونەوەی خرۆکی سپی یەکانی خوێن، زیادبوونی شەکری خوێن، لەدەست چوونی ئاو ئەلیکترۆلیتەکان، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، هەڵوەرینی موو، پەککەوتنی گورچیلە، هێڵنجدان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥ تا ١٠٠ میلیگرام خۆراکی لە ڕۆژێکدا بە یەك بڕ یان لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢٠٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. منالآنی بچوکتر لە ٦ مانگ ٢ تا ٣ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. منالآنی گەورەتر لە ٦ مانگ ٢ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## هایدرۆکورتیزۆن: HYDROCORTISONE

**ناوی بازرگانی:** Lifocort , cortef

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٥٠ میلیگرامی و ئینیما ١٠٠میلیگرام/٦٠میلیلیتر و دەرزی ١٠٠ میلیگرام (سۆدیۆم فۆسفەیت) ١٠٠میلیگرام (سۆدیۆم سەکسینەیت) و ٥٠ میلیگرام/میلیلیتر (٢ میلی لیتر) (سۆدیۆم سەکسینەیت) و ٥٠میلیگرام/میلی لیتر(٢میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Steroid

**بەکارهێنان:** دژی حەساسیەت و ئیلتیهاب و ڕۆماتیزم و نەخۆشی ئەدیسۆن و ڕەبۆ و پەککەوتنی ئەدرینالّ و ئیلتیهابی کۆلۆن و هەوکردنی کۆم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** برینی گەدە و ڕیخۆڵە، بێخەوی، تەشەنوج، سەرئێشە، خرۆشان، نارێکی لێدانی دڵ، بەرزبوونەوەی پەستان، ئۆدیما، پەڵە، زیپکە، زیادبوونی کێشی لەش، تێکچوونی ماسولکە و ئێسك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ تا ٣٠ میلی‌گرام خۆراکی خۆراکی ٢ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا (لەحاڵەتە تیژەکان ئەبێت تا ٨٠ میلی‌گرام خۆراکی ٤ جار لە ڕۆژێکدا دوبارە ڕێی پێ دەدرێت. منالآن ٢ تا ٨ میلی‌گرام/کیلۆگرام یان ١٦ تا ٢٤٠ میلی‌گرام/ مەتردوجا خۆراکی ڕۆژانە دابەشکراو لە ٣ یان ٤ بڕی دەرماندا. ١٠٠ تا ٥٠٠ میلی‌گرام هەر ١٢سەعاتێك ماسولکەیی یان بەدەمار لە ئیلتیهابی توندا. گەورەکان ئینیما هەر شەوێك ١٠٠ میلی‌گرام بۆ ماوەی ٢١ ڕۆژ.

## هایدرۆکورتیزۆن: HYDROCORTISONE

**ناوی بازرگانی:** Corticaine,Lanacort,

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم و کرێمی ١٪.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** دژی حەساسیەت و ئیلتیهابی مەوزوعی و ئیلتیهاب و حەساسیەتی پێست و ئەکزیما و سۆریاسس و هەوکردنی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** لەرزین، سوتانەوە، زیادبوونی کێش، زیپکە، ڕوشان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ١ تا ٤ جار، منالآن ڕۆژانە ١ تا ٢ جار.

## هایدرۆکورتیزۆن: HYDROCORTISONE ACETATE

**ناوی بازرگانی:** Hydrocortisone

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ١٪ و مەڵهەمی چاو ١٪ و٠,٥٪.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سووربونەوەی چاو، برینی کۆرنیە، گلوکۆما، کاتاراکت.

**بڕی دەرمان:** قەترەی چاو هەموو ٣٠ تا ٦٠ خولەکێك هەتا کۆنترۆڵ دەکرێت پاشان یەکسەر کەمدەکرێتەوە بۆ هەموو ٤ سەعاتێك. مەڵهەم شەوانە بەکاردێت.



## هایدرۆجین پیرۆکساید: HYDROGEN PEROXIDE

**ناوی بازرگانی:** Lensept, oxysept

**شێوەی دەرمان:** گیراوە و کرێم و دەمشۆر.

**گروپی دەرمان:** Disinfectant

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی برینەکان و هەوکردنی بەکتریایی پێست و بۆ پاکردنەوەی دەم و پاراستنی تەندروستی دەم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێست.

**بڕی دەرمان:** کرێم ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار تا ٣ هەفتە، بۆ پاکردنەوەی پێست و برینەکان سود لە گیراوە وەردەگرین.

## هایدرۆمۆرفۆن: HYDROMORPHONE

**ناوی بازرگانی:** Dilaudid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ و ٤ میلیگرامی و ٨ میلیگرامی و دەرزی ١٠ میلیگرام/میلیلیتر و سەسپێنشنی ٣ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Narcotic analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری مامناوەند و توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، گێژی، هێوربوونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٤ میلیگرام خۆراکی یان ماسولکەیی یان دەماری یان بە بڕی پێویست هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك، بە بڕی پێویست، کەمدەکرێتەوە لەگەڵ لاوازبوونی جگەردا.

## هایدرۆکیونۆن: HYDROQUINONE

**ناوی بازرگانی:** Eldoqin,Eldopaque

**شێوەی دەرمان:** کرێمی مەوزوعی و پاودەر.

**گروپی دەرمان:** دژی پەڵەی پێست.

**بەکارهێنان:** بێ ڕەنگکەری پێست، دژی پەڵە و لەکەکانی دەم و چاو و ڕوومەت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، حەساسیەتی مەوزوعی.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ جار، بەیانیان و شەوان.



## هایدرۆکسۆکۆبالامین: HYDROXOCOBALAMIN

**ناوی بازرگانی:** Cyanokit

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی ڤیاڵ

**گروپی دەرمان:** Antidote

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ژەهراویبوون بە سیانید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، پەڵە، شەرا، ئۆدیما. هێڵنجدان.

**بڕی دەرمان:** ٥ میلیگرام بە دەمار بۆ زیاتر لە ١٥ خولەك دوبارەکردنەوەی بە بڕی پێویست ٥ گرام بە دەمار بۆ زیاتر لە ١٥ خولەك تا ٢ سەعات، سەرجەمی بڕی دەرمان ١٠ گرامە.

## هایدرۆکسی کلۆرۆکوین سەلفەیت: HYDROXYCHLOROQUIN SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Plaquenil,Ercoquin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antimalaria

**بەکارهێنان:** لە چارەسەر و پێشگری جۆرەکانی مەلاریا و رۆماتیزمی جومگە، بۆ چارەسەری نەخۆشی ئیلتیهابی موزمینی شانەی پەیوەندی و کاردەکاتە سەر پێست و ئەندامە جیاوازەکانی ناوەوە (L.E) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێهێزی، تەشەنوج، تێکچوونی ماسولکە، ناجێگیری، کەمخوێنی، هەڵوەرینی موو، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، کەمبوونەوەی کێش، خوران، بلۆقکردنی پێست، هێڵنجدان، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** بۆ پێشگری ٤٠٠ میلیگرام ١جار لەڕۆژێکدا بۆ ماوەی ١ هەفتە و بۆ چارەسەر ٤ حەب ١جار لەڕۆژێکدا و دوای ٦ سەعات ٢ حەب و لە ڕۆژی دووەم و سێیەم ٢ حەب ١جار لەڕۆژێکدا رێی پێدەدرێت.لە ڕۆماتیزم ٢ تا ٣ حەب لەگەڵ ئاو یان خواردندا.

## هایدرۆکسی پرۆجیسترۆن کاپرۆیت: HYDROXYPROGESTERON CAPROATE

**ناوی بازرگانی:** Prodrox,Hylutin,Hyprogest

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antineoplasm



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خوێنبەربوونی منداڵدان و بێ عوززی مانگانە و شێرپەنجەی ناوپۆشی منداڵدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری بێ نوێژی مانگانە، بێ عوززی، ئازار لەشوێنی دەرزی لێدان، ئۆدیما، زیپکە، خوران، قەبزی، سکچوون، خەمۆکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٧٥ میلی‌گرام تا ١ گرام بە ماسولکەیی.

## هایدرۆکسی یوریا: HYDROXYUREA

**ناوی بازرگانی:** Hydrea,Droxia

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٠٠ و ٣٠٠ و ٤٠٠ و ٥٠٠ میلی‌گرامی و حەبی ١ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن (CML)ی مقاوم و بۆ چارەسەری ئاوسانی توێکڵی قوڵی پێست بەرەنگی ڕەش (melanoma) و هێلکەدان و سەر و گەردن و شێرپەنجەی خوێن (ALL) و زۆربوونی خرۆکە سپی یەکانی خوێن و کەمخوێنی (SCA) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تەشەنوج، قەبزی، خوران، پەڵە، سکچوون، ڕشانەوە، هێڵنجدان، سەرگێژبوون، خەواڵویی، هەڵوەرینی موو، نەمانی ئارەزوی خواردن، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ تا ٧٥ میلی‌گرام/کیلۆگرم بۆ خرۆکەی سپی زیاتر لە ١٠٠٠٠٠ خانە/میلی‌لیتر. ٦٠ تا ٨٠ میلی‌گرام/کیلۆگرم هەر ٣ ڕۆژ ١جار یان ٢٠ تا ٣٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام خۆراکی. لایەنی زۆر بۆماوەی ٦ هەفتە ڕێی پێ دەدرێت.

## هایدرۆکسیزین: HYDROXYZINE

**ناوی بازرگانی:** Atarax,Hyzine,Anxanil,Vistaril

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٥ و ٥٠ میلی‌گرامی و کەپسولی ٢٥ و ٥٠ میلی‌گرامی و شروبی ١٠ میلی‌گرام/٥میلی‌لیتر و سەسپێنشنی ٢٥ میلی‌گرام/٥ میلی‌لیتر و دەرزی ٢٥ و ٥٠ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** هێورکەرەوە و خەولێخەرە و دژی خوران و حەساسیەت و دژی هێڵنجدان و ڕشانەوە و بۆ چارەسەری قەلەقی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تەشەنوج، سەرگێژبوون، وشك بوونەوەی دەم، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، خوران و سووربونەوە، قەبزی، خەواڵویی، هێڵنجدان، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** بۆ قەڵەقی و هێورکردنەوە گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ میلی‌گرام خۆراکی یان ماسولکەیی یان بەبڕی پێویست ( لایەنی زۆر ٦٠٠ میلی‌گرامە لە ڕۆژێکدا. بۆ خوران ٢٥ تا ٥٠ میلی‌گرام خۆراکی یان ماسولکەیی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار، منداڵان ٠,٥ تا ١ میلی‌گرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا خۆراکی یان ماسولکەیی هەموو ٦ سەعاتێك، کەمدەکرێتەوە لەگەڵ لاوازبوونی جگەردا.

## هایۆسین: HYOSCINE

**ناوی بازرگانی:** Buscopan

**شێوەی دەرمان:** حەب ١٠ میلی‌گرامی و شاف ٧,٥ و ١٠ میلی‌گرامی و دەرزی ٢٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antispasmodic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کرژبوونی کۆئەندامی هەرس و ئازاری بێ نوێژی مانگانە، بۆ چارەسەری ئازاری سك و سکچوون و دەرمانی یارمەتیدەر بۆ چارەسەری برینی گەدە و ڕیخۆڵە گەورە، دژی هێلنجدان و ڕشانەوە و بۆ چارەسەری نەخۆشی سەفەر و بۆ کشانی منداڵدان لەکاتی منداڵبووندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، گیرانی میز، تێکچوونی بینین، زیاد لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان خۆراکی ٢٠ میلی‌گرام ٤ جار لەڕۆژێکدا، منداڵان ١٠ میلی‌گرام ٣ جار لەڕۆژێکدا.

## هایۆسیامین: HYOSCYAMINE

**ناوی بازرگانی:** Anaspaz,levsin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی (SR) ٠,٣٧٥ میلی‌گرامی و گیراوەی ٠,١٢٥ میلی‌گرام/٥ میلی‌لیتر و دەرزی ٠,٥ میلی‌گرام/میلی‌لیتر و حەبی (SL) ٠,١٢٥ میلی‌گرامی و ٠,١٥ میلی‌گرامی و ٠,٣٧٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antispasmodic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی ئازار و کرژبوونی میزەڵدان و کۆئەندامی هەرس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی دەم، کەمی ئارەقکردن، لاوازی سێکسی. هێڵنجدان، ڕشانەوە، دڵەکزە، قەبزی، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، بێخەوی، ئازاری چاو، پەڵە، سوربونەوە، کەمبوونی هەموو دەردراوەکان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,١٢٥ تا ٠,٢٥ میلی‌گرام (١ تا ٢ حەب) حەبی ٠,١٢٥ میلی‌گرامی (SL) خۆراکی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار، پێش لە خواردن و لە کاتی خەودا. ١ کەپسولی (SR) هەموو ١٢ سەعاتێك.

***

# I

## ئیباندرۆنەیت: IBANDRONATE

**ناوی بازرگانی:** Boniva

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ و ١٥٠ میلیگرامی و دەرزی ٣ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Bisphosphonate

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و بەرگری لە پوکانەوەی ئێسك پاش لە لەحەیزچونەوەی ژنان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، ئازاری جومگە و ماسولکە و ئێسك، سەرئێشە، ئاوسان و سوربونەوەی چاو، سکچوون، هێڵنجدان، تێکچوونی گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢,٥ میلیگرام ڕۆژانە خۆراکی یان ١٥٠ میلیگرام ١ جار لە مانگێکدا لەهەمان ڕۆژدا. ٣ میلیگرام بە دەمار بۆ زیاتر لە ١٥ تا ٣٠ چرکە هەموو ٣ مانگێك.

## ئیبوپروفین: IBUPROFEN

**ناوی بازرگانی:** Motrin,Boniva,brufen,nuprin

**شێوەی دەرمان:** جێڵی ٢٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ١٠٠ میلیگرام/ ٥ میلیلیتر و حەبی ٢٠٠ و ٤٠٠ و ١٠٠ و ٦٠٠ و ٨٠٠ میلیگرامی و حەبی کرماندن ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ٢٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشی ١٠٠ میلیگرام/٢,٥ میلیلیتر و ٤٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و تا و ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهابی جومگە و ڕۆماتیزم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، قەبزی، سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەواڵویی، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا، زیاد لێدانی دڵ نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی بینین، پەڵە، کرژبوونی بۆری هەوا، برینی گەدە و ڕیخۆڵە.



**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ تا ٨٠٠ میلی گرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢.٤ گرامە لە ڕۆژێکدا. منالآن ٣٠ تا ٤٠ میلی گرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٤٠ میلی گرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا لەگەڵ خواردندا.

## ئیبیوتیلاید: IBUTILIDE

**ناوی بازرگانی:** Corvert

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,١ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiarrhythmic

**بەکارهێنان:** دژی نارێکی لێدانی دڵە و بۆ چارەسەری لەرزین و لەرینەوەی گوێچکەلەی دڵ و بۆ کۆنترۆڵکردنی لێدانی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، سەرئێشە، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦٠ کیلۆگرام و زیاتر ١ میلی گرام بەدەمار بەهێواشی بۆ زیاتر لە ١٠ خولەك ئەدرێت. کەمتر لە ٦٠ کیلۆگرام ٠,٠١ میلی گرام/کیلۆگرام بەدەمار بە هێواشی بۆ زیاتر لە ١٠ خولەك ئەدرێت.

## ئیکثامۆل: ICHTHAMMOL

**ناوی بازرگانی:** Adnexol,bithyol

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم و کرێم.

**گروپی دەرمان:** Antieczema

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی ئیلتیهابی پێستی ئەکزیمای موزمین و شوێنی گەستنی مێرووەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێست.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١ تا ٣ جار بەکاردێت.

## ئیداروبیسین: IDARUBICIN HCL

**ناوی بازرگانی:** Idamycin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥ و ١٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن مایلۆید لیوکیمیای تیژ (AML) و (ALL,CML) و شێرپەنجەی پێشکەوتووی مەمك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، تا، ڕشانەوە، کەمخوێنی، زیادلێدانی دڵ سەرئێشە، تەشەنوج، ئازاری قەفەسەی سنگ، خوێنبەربوون، هەڵوەرینی موو، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** لەگەڵ (سیتارابین) گەورەکان ڕۆژانە ١٢ میلی گرام/مەتردووجا بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ.

بۆ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی

**ئایدوکسوریدین:** IDOXURIDINE OPH.

**ناوی بازرگانی:** Antizona,Herplex

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاوی ٠,١٪ و مەڵهەم.

**گرووپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی چاو و هەوکردنی کۆرنیەی چاو و ڤایرۆسی تامێسك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئیلتیهابی چاو، خوران، ئیلتیهابی مەوزوعی، تێکچوونی بینین، ڕوشان، سوتانەوەی چاو، ئازار، حەساسیەت، زیادبوونی فرمێسك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالان ١ قەترە هەر ١ سەعاتێك لە ڕۆژدا و هەر ٢ سەعاتێك لەشەودا تا چاکبوونەوەی تەواوی برینەکانی کۆرنیە، بەکارهێنانی دەرمان نابێت زیاتر لە ٢١ ڕۆژ بەردەوام بێت. مەڵهەم گەورەکان و منالان ٥ جار لە ڕۆژێکدا.

**ئیفۆسفامید:** IFOSFAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Mitoxana,Holoxan,Ifex

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ١ و ٣ گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی هێلکەگون و سی و پەنکریاس و هێلکەدان و مەمك و گەدەو شێرپەنجەی خوێن هوچکین و ناهوچکین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، ڕشانەوە، بێهۆشی، تەشەنوج، گێژی، هەڵوەرینی موو، زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١,٢ گرام/مەتردوجا بە دەمار IV بۆماوەی ٥ ڕۆژی یەك لەدوای یەك.

**ئیلۆپرۆست:** ILOPROST

**ناوی بازرگانی:** Ventavis

**شێوەی دەرمان:** ئیستینشاقی ١٠مایکرۆگرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Prostaglandin analogue

**بەکارهێنان:** بە شێوەی ئیستینشاقی بۆ چارەسەری بەرزبوونەوەی پەستانی سی یە خوێنبەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، هێڵنجدان، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، وشکبوونەوەی دەم، کۆکە، ڕوشانی قوڕگ.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ٢,٥ مایکرۆگرام، ئەگەر تەحەمولی کرد زیاد دەکرێت بۆ ٥ مایکرۆگرام ئیستینشاقی ٦ تا ٩ جار لە ڕۆژێکدا لانی کەم ٢ سەعات هەربەشێك لە کاتی بێداری.

## ئیماتینیب: IMATINIB

**ناوی بازرگانی:** Gleevec

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن (CML) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تەشەنوج، سەرئێشە، وشکبوونەوەی دەم، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ڕەشبوونی پیسایی، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا، پەڵە، تەنگەنەفەسی، کەمبوونی نیوترۆفیل، تێکچوونی گەدە، ئازاری جومگە و ماسولکە، کەمبوونی پەڕەی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٠ تا ٦٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە لەگەڵ خواردندا.

## ئیمیداپریل: IMIDAPRIL

**ناوی بازرگانی:** Tanatril

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و پەککەوتنی دڵ و لاوازی فرمانی سکۆڵەی چەپی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کۆکەی وشك، پەڵە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، ئازاری سك، جیوب، وشکبوونی دەم، تەنگەنەفەسی، بێحەوی، خەمۆکی، تێکچوونی بینین، هەوکردنی بۆڕیچکەکان، لاوازی سێکسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ڕۆژانە ٥ میلیگرام پێش لە خواردن. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٠ میلیگرامە.



**ئیمیپینیم:** IMIPENEM

**ناوی بازرگانی:** Primaxin,tienam

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی دەرزی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی بەشی خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسە و ڕێڕەوی میز و ئێسك و جومگە و پێست و هەوکردن لە ژنان و هەوکردنی ناوەوەی سك و توشبوون بەمیکرۆبی گورچیلە و پەردەکانی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، تەشەنوج، کەمبوونەوەی بیستن، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، خوران، ئازاری سك، زیادلێدانی دڵ تا، خەواڵویی، سەرگێژبوون، حەساسیەت، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** بۆ دەرزی لێدانی ماسولکەیی لایەنی زۆر ١٥٠٠ میلیگرام لە ٢٤ سەعات و بە دەمار نابێت زیاد لە ٥٠ میلیگرام/کیلۆگرام بێت.

**ئیمیپرامین:** IMIPRAMINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Typramine,Impril,Tofranil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٥ و ٥٠ میلیگرامی و دەرزی ١٢,٥ میلیگرام/میلیلیتر (٢میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی خەمۆکی و ئازارە موزمینەکان و میزکردنی شەوانەی منداڵان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** قەبزی، تێکچوونی بینین، ڕشانەوە، نەکردنی میز، زیادبوونیکێش، خەواڵویی، بێهێزی، سەرئێشە، تەشەنوج، وشکبوونەوەی دەم، سکچوون، زیادلێدانی دڵ نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، حەساسیەت، هەستیاربوون بە ڕوناکی، زیادبوونی IOP.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٧٥ تا ١٠٠ میلیگرامی خۆراکی یان ماسولکەیی لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، بۆ میزکردنی شەوانە منالآن ٢٥ تا ٧٥ میلیگرام/ کیلۆگرام و پێش لەخەوتن،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣٠٠ میلیگرامە.

**ئینداکاتیرۆڵ:** INDACATEROL

**ناوی بازرگانی:** Onbrez Breezhaler

**شێوەی دەرمان:** پاودەری ئیستینشاقی ١٥٠ و ٣٠٠ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Beta٢ agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی موزمینی داخرانی سی یەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئۆدیمای ڕووی دەرەوە، ئازاری سنگ، کۆکە، جیوب، لەرینەوەی گوێچکەڵە، گەورەبوونی لوت.

**بڕی دەرمان:** بە پاوەدەری ئیستنشاقی گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ١٥٠ مایکرۆ گرام ڕۆژانە ١ جار، زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆری ٣٠٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە ١ جار.

## ئینداپامايد: INDAPAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Lozol,Natrilix

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١,٢٥ و ١,٥ و ٢,٥ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Diuretic

**بەکارهێنان:** میزپێکەرە و بۆ چارەسەری ئۆدیما بەهۆی پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو و بۆ پەستانی بەرزی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، خرۆشان، دڵەڕاوکێ، خەمۆکی، هیلاکبوون، گێژی، خەواڵوویی، ناجێگیری، خوران، پەڵە، سەرگێژبوون، نارێکی لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سکچوون، ئازاری سك، نەمانی ئارەزوی خواردن، قەبزی، هێڵنجدان، کرژبوونی ماسولکە، ڕشانەوە، لاوازی سێکسی، کەمبوونەوەی کێش، کەمبوونەوەی ناو ئەلیکترۆلیتەکان.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢,٥ میلی گرام لە بەیانیاندا، یان ڕۆژانە ١ حەبی ١,٥ میلی گرامی. یان ١,٢٥ تا ٥ میلی گرام خۆراکی لە ڕۆژێکدا.

## ئیندیناڤیر: INDINAVIR

**ناوی بازرگانی:** Crixivan

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠٠ و ٢٠٠ و ٣٣٣ و ٤٠٠ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ئازاری گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، زەردی، کۆکە، تا و لەرز، سەرئێشە، برینی گەروو، پەڵە و بلۆقکردنی پێست، ڕشانەوە، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٨٠٠ میلی گرام خۆراکی هەموو ٨ سەعاتێك یان ئیندیناڤیر ٨٠٠ میلی گرام لەگەڵ ڕیتۆناڤیر ١٠٠ میلی گرام بۆ ٢٠٠ میلی گرام خۆراکی هەموو ١٢ سەعاتێك.



## ئیندۆمیثاسین: INDOMETHACIN

**ناوی بازرگانی:** Indomond,indocid,Indometh,Indocin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٧٥ و ٥٠ میلیگرامی و کەپسولی ٢٥ میلیگرامی و دەرزی ١ میلیگرامی و سەسپێنشنی ٢٥ میلیگرام/٥ میلیلیتر و شاف ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار وئا و ئیلتیهاب و ڕۆماتیزم، دژی ئازاری سوك و مامناوەند و هەوکردنی جومگەکان و داء الملوك و ئیلتیهابی فەقەرەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوێنبەربوونی گەدە، تێکچوونی بینین، ناتەواوی توندی گورچیلە، سەرگێژبوون، تەشەنوج، تێکچوونی دەروونی، پەڵە، کەمخوێنی، حەساسیەت، ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢٠٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا. منالان ٠.٢ تا ٠,٢٥ میلیگرام/ کیلۆگرام لە بڕێکی دەرماندا بەدەمار، لەوانەیە دوبارە بکرێتەوە لەهەموو ١٢ تا ٢٤ سەعاتدا تا ٣ بڕی دەرمان لەگەڵ خواردندا.

## ئیندۆرامین: INDORAMIN

**ناوی بازرگانی:** Doralese,baratol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ و ٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Alpha blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و گەورەبوونی باشی پرۆستات (BPH) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، خەمۆکی، وشکبوونەوەی دە، ئۆدیما، تێکچوونی هەرس، تێکچوونی بینین، زوو میزکردن و میزڕانەگرتن، هیلاکی، زیادبوونی کێش، خەواڵویی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، گێژی، پەڵە، خوران.

**بڕی دەرمان:** ٢٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرامە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ پەستانی بەرزی خوێن ٢٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٠٠ میلیگرامە لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.





## ئینفلیکسیماب: INFLIXIMAB

**ناوی بازرگانی:** Remicade

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Monoclonal Antibody

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری نەخۆشی کرۆنی ماماوەند و توند بۆ ئیلتیهابی کۆلۆن بەکاردێت، لەگەڵ میپوتریکسەیت دەدرێت بۆ چارەسەری سۆریاسس و ئیلتیهابی فەقەرەکان و رۆماتیزمی مامناوەند و توند.

**کاریگەری لاوەکی:** خەمۆکی، تا، سەرئێشە، بێخەوی، ئازاری سنگ. سوربونەوە. نۆدیما، کەمبوون و زیادبوونی پەستانی خوێن، زیادکردنی لێدانی دڵ، هەوکردنی لوت و جیوب و چاو و گەروو، ئازاری سك، قەبزی، سکچوون، هێڵنجدان، رشانەوە، ئازاری دەم، برینی دەم، کەمخوێنی. کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، زیپکە، هەڵوەرینی موو، هەوکردنی کەرویی کاندیدیاز، بیرۆ، وشکبوونەوەی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣ تا ١٠ میلی گرام/کیلۆگرام بە IV ئینفیوشن.

## ئەنسۆلین: INSULIN

**ناوی بازرگانی:** Iletine

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی دەرزی ئەنسۆلین.

**گروپی دەرمان:** Antidiabetic

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵکردنی زیادبوونی شەکر لە نەخۆشی شەکرەدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی شەکری خوێن، پەڵە، ئازار لە شوێنی دەرزی لێدان، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم، خوران، ئاوسان، شۆك، حەساسیەتی توند، سووربونەوە.

**بڕی دەرمان:** ٠,٥ تا ١ یەکە/کیلۆگرام لەرۆژێکدا.

## ئینتەرفیرۆنەکان: INTERFERONES

**ناوی بازرگانی:** Intron A

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٣ ملیۆن یەکە/میلی‌لیتر، ٤,٥ ملیۆن یەکە/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic,Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەکانی خوێن لیوکیمیا و هیپاتیتی موزمین (ئیلتیهابی جگەر) و سارکۆم کاپۆسی و فرەرەقبوون بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** بێهۆشی، گێژی، ناجێگیری، کۆکە، خەمۆکی، هەڵوەرینی موو، سەرگێژبوون، هێڵنجدان، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، ڕشانەوە، ئازاری سك، کەمخوێنی، زیادلێدانی دڵ تێکچوونی بینین، پەڵە، کەمبوونەوەی توانای بیستن، کەمبوون و زیادبوونی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** جۆری جیاوازی هەیە جۆری ئەلفا و بێتا بەپێی جۆرە جیاوازەکانی ئەلفا ئەی١ و بێتا بی٢ و بێتا بی١ و ئەلفا ئەی٢...هەیەلە ئەخۆشیە جیاوازەکان و تەمەنەجیاوازەکان جیاوازی هەیە.

## ئایۆدوکیونۆل: IODOQUINOL

**ناوی بازرگانی:** Moebiquin,Didoquin,Yodoxin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Amebicidal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی ڕیخۆڵە بەهۆی ئەمیباوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، هیلاکبوون، بێهێزی، فەرامۆشی، قەبزی، ئازاری سك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، گۆڕینی ڕەنگی نینۆك و موو، گەورەبوونی پایرۆید، سەرگێژبوون، هەڵوەرینی موو، خورانی کۆم، تا و لەرز، ئازاری ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦٣٠ تا ٦٥٠ میلیگرام ڕۆژی ٣ جار بۆماوەی ٢٠ ڕۆژ، منالان ٤٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژی ٣ جار بۆماوەی ٢٠ ڕۆژ.

## ئایۆدین & ئایۆداید: IODINE & IODIDE

**ناوی بازرگانی:** Iodine

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی خۆراکی ٥٪ و ١٠٪.

**گروپی دەرمان:** Antithyroid drugs

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیادبوونی بڕی هۆرمۆنی پایرۆید لە مولولەکانی خوێندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری لیکەڕژێنەکان، پەڵە، بێخەوی، لاوازی سێکسی، هەوکردنی بۆرێچکەکان، سەرئێشە، چاوئێشە، خەمۆکی، گواتر.

**بڕی دەرمان:** ٠,١ تا ٠,٣ میلیلیتر ڕۆژانە ٣ جار بەباشی ڕووندەکرێتەوە و تێکەڵ دەکرێت لەگەڵ شیر و ئاو.

## ئیپیکاك: IPECAC

**ناوی بازرگانی:** Ipeca,Oprec

**شێوەی دەرمان:** شروبی ١٥ و ٣٠ میلی لیتری.

**گروپی دەرمان:** Antidote

**بەکارهێنان:** وەك ڕشێنەرەوە و هێلنج هێنەر لەکاتی ژەهراویبوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، خەمۆکی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سکچوون، خەواڵویی، بێهۆشی. ڕشانەوەی خوێناوی، هەوکردنی سی، ناڕێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی زیاتر لە ١٢ ساڵ ١٥ تا ٣٠ میلی لیتر خۆراکی،پاشان ٢٠٠ تا ٣٠٠ میلی‌لیتر ئاو. منداڵانی ١ تا ١١ ساڵ ١٥ میلی لیتر خۆراکی، پاشان لەسنوری ٢٠٠ میلی‌لیتر ئاو. منداڵی بچوکتر لە١ ساڵ ٥ میلی‌لیتر خۆراکی، پاشان لە سنوری ١٠٠ تا ٢٠٠ میلی‌لیتر ئاو (ئەبێت بڕی دەرمان بۆ ١ جاری تر، ٣٠ خولەك دواتر بە پێی پێویست دوبارە بکرێتەوە.

## ئیپراتۆریۆم: IPRATROPIUM BROMIDE

**ناوی بازرگانی:** Itrop,Respontin,Atrovent

**شێوەی دەرمان:** ئیستینشاقی ٢٠ و ٤٠ مایکرۆگرام/بڕی دەرمان، پرژاندن ٢٥٠ مایکرۆگرام/میلی‌لیتر (١میلی‌لیتر، ٢ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Bronchodilator

**بەکارهێنان:** بۆ فراوانکردنی بۆری هەواو بۆ چارەسەری کرژبوونی بۆری هەواو بۆریچکەکان و هەوکردنی لوت و ئاو هاتنەخوارەوە بەلوتدا (ڕینۆریا) پەیوەست بە حەساسیەت و ڕینۆریا بێ حەساسیەت و ڕینۆریا پەیوەست بە حەساسیەتی وەرزی و ڕینۆریا بەهۆی سەرمابوون و بۆ چارەسەری ڕەبۆ و هەوکردنی موزمینی بۆریچکەکان و تەنگەنەفەسی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، وشکبوونەوەی دەم، کۆکە، جیوب، هەوکردنی لوت، سەرئێشە، سەرگێژبوون، هەوکردنی گەروو، پەڵە، تەنگەنەفەسی، ئازاری کەمەر، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ ئیستینشاق ڕۆژانە ٤ جار. (لایەنی زۆر ١٢ ئیستینشاق لە ٢٤ سەعاتدا). گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ٥ ساڵ ٢ سپرای بۆ هەر کونە لوتێك ڕۆژانە ٤ جار. گەورەکان ٢ سپرای بۆ هەر کونەلوتێك ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار.

...ێ: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێک نەخۆشی

## ئیربیسارتان: IRBESARTAN

**ناوی بازرگانی:** Avapro

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٧٥ و ١٥٠ و ٣٠٠ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antihyperensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و نەخۆشی گورچیلەیی بەهۆی شەکرەی جۆری ٢ و پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن. هیلاکی، خەوالّویی، نەمانی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادبوونی کێش، سکچوون، دڵەکزە، تێکچوونی گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥٠ تا ٣٠٠ میلی گرام ١ جار لە ڕۆژێکدا.

## ئیرینۆتیکان: IRINOTECAN HCL

**ناوی بازرگانی:** Campto,Camptosar

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠ میلی گرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بەتەنها یان لەگەڵ فلۆرۆیۆراسیل و لیوکۆفۆرین بۆ چارەسەری شێرپەنجەی کۆم و کۆڵۆن و شێرپەنجەی سی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، ئازاری سك، هەڵوەرینی موو، زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر، سکچوون، غازات، کەمبوونەوەی کێش، ئۆدیما، پەڵە، سەرئێشە، سەرگێژبوون، هەوکردن، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٢٥ تا ٣٥٠ میلی گرام/مەتر دوجا،لەسەرەتادا بەشێوەی دەمار لەماوەی ٩٠ خولەکدا هەموو ١ تا ٣ هەفتەیەك.

## ئایرۆن: IRON

**ناوی بازرگانی:** Venofer,Feronim,Imferon,Jectofer,Cosmofer

**شێوەی دەرمان:** شروبی ٤٠ میلی گرام/٥میلی‌لیتر و قەترەی خۆراکی ٢٥ میلی گرام/میلی‌لیتر و دەرزی ٢٠ میلی گرام/میلی‌لیتر (٥ میلی لیتر).

**گرووپی دەرمان:** Antianemia

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمخوێنی بە تایبەت بەهۆی کەمی ئاسنەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازار لە شوێنی دەرزی لێدان، زیادلێدانی دڵ، حەساسیەت، سەرگێژبوون، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری سك.

**بڕی دەرمان:** بڕی دەرمان بەپێی ڕێژەی هیمۆگلۆبین و کێشی لەشی ئەو کەسەیە. منداڵی تازەبوو کەمتر لە ٤,٥ کیلۆگرام ٢٥ میلیگرام لەڕۆژێکدا، منداڵی کەمتر لە ٩ کیلۆگرام ٥٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا، نەخۆشەکانی تر ١٠٠ میلیگرام لەڕۆژێکدا.

## ئایزۆکاربۆکسازید: ISOCARBOXAZID

**ناوی بازرگانی:** Marplan,isocarboxazid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی خەمۆکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بێخەوی، خەواڵویی، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، بێهێزی، زەردی، نەمانی ئارەزوی خواردن، هیلاکی، سکچوون، هێڵنجدان، زیادلێدانی دڵ، ئازاری سك، گۆڕانی ڕەنگی میز، ئۆدیما، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستان، تێکچوونی بینین، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلیگرام خۆراکی، هەر ٨ سەعاتێك (لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٦٠ میلیگرامە) بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە ١٠ تا ٢٠ میلیگرامە. لەپیرەکاندا ڕۆژانە ٥ تا ١٠ میلیگرامە.

## ئایزۆفلوران: ISOFLURANE

**ناوی بازرگانی:** Florane

**شێوەی دەرمان:** ئیستینشاقی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** General Anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی عمومی ئیستینشاقی و دروستکردن و پارێزگاری لەبەنج بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری ماسولکە، سکچوون، لەرزین، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** بەخەستی ٠,٥٪ لە ئۆکسجین یان $N_2O$.

...نی: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## ئایزونیازید: ISONIAZID

**ناوی بازرگانی:** Laniazid,Isotamine,Nydrazid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٣٠٠ ملیگرامی و دەرزی ١٠٠ ملیگرام/ملیلیتر و شرووبی ٥٠ ملیگرام/٥ ملی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antituberculosis

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و پێشگری لە نەخۆشی سیل بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تەشەنوج، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، زیادبوونی شەکری خوێن، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هەوکردنی جگەر، تا، حەساسیەت، گەورەبوونی مەمك لەپیاواندا، تێکچوونی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٣٠٠ ملیگرام خۆراکی یان ماسولکەیی IM، منداڵان ڕۆژانە ١٠ تا ١٥ ملیگرام/کیلۆگرام خۆراکی یان ماسولکەیی IM. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٣٠٠ ملیگرامە لە ڕۆژێکدا.

## ئایزوپروپیل ئەلکهول: ISOPROPYL ALCOHOL

**ناوی بازرگانی:** Alcojel

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی پاودەری بلوری.

**گرووپی دەرمان:** Antiseptic

**بەکارهێنان:** بۆ دژەهەوکردنی پێست پێش لە نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەوکردنی گەدە.

**بڕی دەرمان:** بەبڕو ئەندازەی پێویست ڕووی ئەو شوێنەی پێ بماڵرێت.

## ئایزۆپرۆتێرینۆل: ISOPROTERENOL HCL

**ناوی بازرگانی:** Norisodrine,Serventrine,Isuprel

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,٢ و ١ ملیگرام/ملیلیتر (٢ملیلیتر).

**گرووپی دەرمان:** Bronchodilator

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شۆك و وەستانی دڵ و فراوانکردنی بۆری و بۆریچکەکان و هانی دڵ دەدات لە ناڕێکی لێدانی دڵ و لە کرژبوونی بۆری هەوا لەکاتی بێهۆشی دا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** دڵەڕاوکێ، بێخەوی، سەرئێشە، سەرگێژبوون، هێڵنجدان، زیادبوونی لێدانی دڵ ڕەقبوونەوەی دەم، ئازاری سنگ، زیادبوونی شەکری خوێن، ڕشانەوە، سوربونەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٠١ تا ٠,٠٢ میلیگرام بەدەمار و بە عینوانی هاندانی دڵ ٠,٢ میلیگرام ماسولکەیی بۆ نەناوی دڵ دەدرێت، منداڵان ٠,١ تا ١,٥ مایکرۆ گرام/کیلۆگرام لە خولەکێکدا تا کاردانەوەی شیاو.

## ئایزۆسۆربید دایناترەیت: ISOSORBIDE DINITRATE

**ناوی بازرگانی:** Angitac,cedocard,isocard,isoket,isordil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ و ٢٠ و ٣٠ میلیگرامی و حەبی SR ٤٠ میلیگرامی و حەبی SL ٢,٥ و ٥ میلیگرامی و کەپسولیSR ٤٠ میلیگرامی و حەبی ژێر زمانی ٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antianginal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری سنگ و پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سەرگێژبوون، سوربونەوە، سەرئێشە، پەڵە، زیادبوونی لێدانی دڵ نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ڕشانەوە، هەوکردنی پێست، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢,٥ تا ١٠ میلیگرام، هەر ٣ تا ٤ سەعاتێك، یان ٥ تا ٤٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٤ جار.

## ئایزۆسۆربید مۆنۆنایترەیت: ISOSORBIDE MONONITRATE

**ناوی بازرگانی:** Imdur,monoket,elantan,isodur,isotard

**شێوەی دەرمان:** حەبیXR ٥٠ و ٦٠ و ٣٠ و ١٢٠ میلیگرامی و حەبی ١٠ و ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antianginal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری سنگ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادلێدانی دڵ هەوکردنی سی، پەڵە، سوربونەوە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، سەرگێژبوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ حەب لە ڕۆژێکدا،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢٤٠ میلیگرامە لەڕۆژێکدا.

## ئایزۆتریتینۆین: ISOTRETINOIN

**ناوی بازرگانی:** Sotret,Claravis,Accutane

**شێوەی دەرمان:** جێڵی ٠,٠٥٪ و کەپسولی ٢٠ و ١٠ و ٣٠ و ٤٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiacne agent

بۆ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیپکەی توندی سەرکەش (بەناسانی دەرمان کاری تێ ناکات) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی پێست، خوران، ئازاری ماسولکە، وشکبوونەوەی چاو، تێکچوونی خوێن، زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر، بێهێزی، وشکبوونەوەی پێست، سەرئێشە، وشکبوونەوەی لوت، تێکچوونی بینین، هەستیاربوون بەڕووناکی، کەمخوێنی، ئازاری سك، زیادبوونی شەکری خوێن، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** ٠,٥ تا ٢ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا خۆراکی دابەشکراو لە ڕۆژانە ٢ جاردا، کەمدەکرێتەوە لە نەخۆشی جگەردا، لەگەڵ خواردندا وەردەگیرێت.

## ئایزوکسوپرین: ISOXSUPRINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Vasoprine,Rolisox,Vasodilan

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Beta، Adrinergic Agonist

**بەکارهێنان:** بۆ فراوانکردنی مولولەکانی خوێن و پەککەوتنی مولولەکانی مێشکی و نەخۆشی یەکانی مولولەی موحیگی (ڕووی دەرەوە) و پەککەوتنی مولولەی موحیگی وەك (نەخۆشی ڕایناد) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك. زیادبوونی لێدانی دڵ نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری قەفەسەی سنگ، پەڵە، گێژی، بێهێزی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ تا ٢٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ یان ٤ جار.

## ئیسرادیپین: ISRADIPINE

**ناوی بازرگانی:** Dynacirc

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢,٥ و ٥ میلیگرامی و حەبی ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و بۆ پێشگری لە ئازاری سنگ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی لێدانی دڵ سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە تەنگەنەفەسی، نەمانی ئارەزوی خواردن، خەواڵویی، کۆکە، قەلەقی، خەمۆکی، پەڵە، خوران، سکچوون، تێکچوونی گەدە، گێژی، ئازاری سنگ، نارێکی لێدانی دڵ سووربونەوە، دڵەکوتێ، ئۆدیما، هیلاکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢,٥ تا ٥ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار.

## ئیتراکۆنازۆل: ITRACONAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Sporanox,trisporal

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠٠میلیگرامی و گیراوەی ١٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی لە سی و دەم و قورگ و نینۆکی پەنجەی دەست و قاچ وەك هیستۆپلازمۆزیس و بلاستۆمایکۆسس و ئەسپێرجیلۆسس و کاندیدیاسس) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، هەڵوەرینی موو، تا، ئازاری ماسولکە، ئازاری سنگ، تێکچوونی بینین، سەرئێشە، زیادبوونی پەستانی خوێن، گەورەبوونی مەمك، سەرگێژبوون، بێخەوی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، سکچوون، پەڵە، تێکچوونی جگەر، هیلاکبوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار.

## ئیڤابریدین: IVABRADINE

**ناوی بازرگانی:** Procoralan

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ٧,٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antianginal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری سنگ لەو نەخۆشانەی بۆشایی ڕیتمی ئاسایی یان هەیە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، سەرئێشە، گێژی، ئازاری ماسولکە، سکچوون، قەبزی، هێڵنجدان، دڵەکوتێ، تێکچوونی هاوسەنگی، تەنگەنەفەسی، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت پاش لە ٣ تا ٤ هەفتە بۆ ٧,٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار (ئەگەر تەحەمولی نەکرد بڕەکەی کەمدەکرێتەوە بۆ ٢,٥ تا ٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار) پیرەکان سەرەتا ٢,٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار.

## ئیکسابیپیلۆن: IXABEPILONE

**ناوی بازرگانی:** Ixempra

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٥ و ٤٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتووی مەمك بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونی نیوترۆفیل، کەمبوونی خڕۆکەی سپی، کەمخوێنی، کەمی پەڕەی خوێن، هیلاکی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری ماسولکە و جومگە، هەڵوەرینی موو، سکچوون، هەوکردنی گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری گەدە، قەبزی، ئازار و کزانەوە لەکاتی میزکردن، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، ناڕێکی لێدانی دڵ، تا، لەرز.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠ میلیگرام/مەتردوجا بەدەمار بۆ زیاتر لە ٣ سەعات هەموو ٣ هەفتەیەك.

***



## كائۆلین لایت: KAOLIN LIGHT

**ناوی بازرگانی:** Kaolin mixture

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی سەسپێنشنی خۆراکی.

**گروپی دەرمان:** Antidiarrheal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سکچوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** قەبزی.

**بڕی دەرمان:** ١٠ تا ٢٠ میلی‌لیتر هەموو ٤ سەعاتێك.

## کیتامین: KETAMINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Ketalar

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ و ٥٠ و ١٠٠ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** General anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ دروستکردن و پارێزگاری بەنجی عمومی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەناسەبڕکێ، گێژی، تێکچوونی دەروونی، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، بێخەوی، قەلەقی. پەڵە، زیادبوون و کەمبوونی لێدانی دڵ، سەرئێشە، دووبینی، زیادبوونی لیك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالان ١ تا ٤,٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە دەمار.



## KETOCONAZOLE SYS. :کیتۆکۆنازۆل

**ناوی بازرگانی:** Nizoral,fungoral

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی کەڕوویی و کەڕووی ناوەوە (هەوکردنی کەڕوویی دەم و قورگ و سورێنچك و سی و میزەڵدان و پێست و نینۆك بەهۆی (کاندیدا و بلاستۆمایکۆسس و هیستۆپلاسمۆسس...هتد) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، غازات، ڕشانەوە، سکچوون، خوران، ئازاری سك، قەبزی، زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر، سەرگێژبوون، گەورەبوونی مەمك، سوتانەوە، هەڵوەرینی موو، سەرئێشە، پەڵە، زیادبوونی کێش، هیلاکبوون، لاوازی سێکسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٢٠٠ میلی گرام. بڕی دەرمان زیاد دەکرێت بۆ ٤٠٠ میلی گرام لەڕۆژێکدا.

## KETOCONAZOLE TOP. :کیتۆکۆنازۆل

**ناوی بازرگانی:** Nizoral,Xolegel,extina

**شێوەی دەرمان:** کرێمی ٢٪ و کەف٢٪ و جێڵی٢٪.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی دەرەوە و چەوری زیادەی سەر و کەچەڵی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، ڕوشان، سوتانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ڕۆژانە ٢ جار بۆ ماوەی ٢ هەفتە.

## KETOCONAZOLE SHAMPOO :کیتۆکۆنازۆل

**ناوی بازرگانی:** Nizoral,fungoral

**شێوەی دەرمان:** شامپۆی ١٪ و ٢٪.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی کەڕوویی دەرەوە و بۆ چارەسەری کرێشی سەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وەرینی موو، وشکبوونەوە یان چەوربوونی موو، ڕوشان، خوران.

**بڕی دەرمان:** هەر ٤ ڕۆژ ١ جار بۆ ماوەی ٤ هەفتە.



## کیتۆپرۆفین: KETOPROFEN

**ناوی بازرگانی:** Orudis

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥٠ و ٧٥ میلیگرامی و کەپسولی SR ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهابی رۆماتیزم و هەوکردنی جومگە و نەخۆشی پاشاکان و ئازاری بێ نوێژی ئافرەتان و ئازاری پاش نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە، برینی گەدە و رێخۆڵە، گێژی، سکچوون – هێڵنجدان، خوێنبەربوونی گەدە و رێخۆڵە، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥ تا ٧٥ میلیگرام خۆراکی رۆژانە ٣ تا ٤ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٣٠٠ میلیگرامە لە رۆژێکدا. حەبی SR ٢٠٠ میلیگرام لە رۆژێکدا، لەگەڵ خواردندا. بڕەکەی کەمدەکرێتەوە لەگەڵ لاوازبوونی جگەر و گورچیلە و لە پیرەکاندا.

## کیتۆرۆلاک: KETOROLAC

**ناوی بازرگانی:** Toradol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلیگرامی و دەرزی ١٥ میلیگرام/میلیلیتر و ٣٠ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهاب بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، برینی گەدە و رێخۆڵە، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، ئۆدیما، گێژی، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥ تا ٣٠ میلیگرام ماسولکەیی یان بەدەمار هەموو ٦ سەعاتێك، ١٠ میلیگرام خۆراکی رۆژانە ٤ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ماسولکەیی یان بە دەمار ١٢٠ میلیگرام لە رۆژێکدا. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی خۆراکی ٤٠ میلیگرامە لە رۆژێکدا. منداڵانی ٢ تا ١٢ساڵ ٠,٥ میلیگرام/ کیلۆگرام بەدەمار IV. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٥ میلیگرامە لە رۆژێکدا. ١ میلیگرام/ کیلۆگرام بە ماسولکەیی IM. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٣٠ میلیگرامە لە رۆژێکدا.

## کیتۆرۆلاک: .KETOROLAC OPH

**ناوی بازرگانی:** Acular

**شێوەی دەرمان:** قەترەی ٠,٥٪.

**گروپی دەرمان:** NSAID



**بەکارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری خورانی چاو لەگەڵ حەساسیەتی وەرزی و ئازاری مامناوەند و توندی پاش نەشتەرگەری و ئیلتیهابی چاو لەپاش نەشتەرگەری کاتاراکت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوربونەوە، خوران، سوتانەوە، ئاوسان، ڕوشانی چاو، فرمێسکڕشتن.

**بڕی دەرمان:** ١ قەترە ڕۆژانە ٤ جار.

## کیتۆتیفین: KETOTIFEN

**ناوی بازرگانی:** Zaditen

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١میلیگرامی و شروبی ١میلیگرام/٥میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** دژی حەساسیەت و بۆ پێشگری لە نەخۆشی ڕەبۆ و حەساسیەتی وەرزی و حەساسیەت و هەوکردنی لوت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تا، سکچوون، لەرزین، ئازاری جومگە، ڕشانەوە، تەشەنوج، زۆر لێدانی دڵ، سەرئێشە، خەواڵویی، تێکچوونی پێست، وشکبوونەوەی دەم، پەڵە، ئازاری گەروو، هیلاکبون، هەوکردنی میزەڵدان، بێهێزی، کرژبوونی سی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار (١ حەب ڕۆژانە ٢ جار) لەگەڵ خواردندا و ئەگەر پێویست بکات بڕی دەرمان زیاد دەکرێت بۆ ٢ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار،لەو نەخۆشانەی کە بەئاسانی گێژ دەبن ٠,٥ تا ١ میلیگرام لە شەودا. منالّی گەورەتر لە ٣ ساڵ ٥ میلیلیتر شروب ٢ جار لەڕۆژێکدا لەگەڵ خواردندا، منالانی ٦ مانگ تا ٣ ساڵ ٢,٥ میلیلیتر شروب ٢ جار لەڕۆژێکدا لەگەڵ خواردندا.

## کیتۆتیفین: KETOTIFEN OPH.

**ناوی بازرگانی:** Zaditen

**شێوەی دەرمان:** ،قەترەی چاو ٢٥٠ مایکرۆگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری حەساسیەت و ئیلتیهابی وەرزی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گەورەبوونی بیلبیلەی چاو. هەوکردنی لوت، ئیلتیهابی کۆرنیەی چاو، وشکبوونی دەم، سەرئێشە، خەواڵویی، سوتانەوە، هەستیاربوون بە ڕوناکی، وشکبوونی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالانی سەروی ٣ ساڵ ١ قەترە بۆ هەرچاوێك هەموو ٨ تا ١٢ سەعاتێك ١ جار.



## کونیکاتیکینس: KUNECATECHINS

**ناوی بازرگانی:** Veregen

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی ١٥٪.

**گروپی دەرمان:** Anti Warts

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بالوکەی دەرەوەی لەش و زایەندی و کۆم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سووربوونەوە، خوران، سوتانەوە، ئاوسان، بلۆقکردنی پێست، خوێنبەربوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٣ جار بۆ هەموو جۆرەکانی بالوک.

***



## لابیتالۆل: LABETALOL

**ناوی بازرگانی:** Trandate

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ١٠٠ و ٢٠٠ و ٣٠٠ و ٤٠٠ میلی‌گرامی و دەرزی ٥ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری سنگ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ناڕێکی لێدانی دڵ، ئازاری گەدە، ئاوسان، زیادبوونی کێش، هێڵنجدان، تێکچوونی گەدە، خوران، نەمانی ئارەزوی خواردن، لیڵبوونی میز، گێژی، هیلاکی، تێکچوونی جگەر، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کرژبوونی ماسولکە، پەڵە، هەڵوەرینی موو، لاوازی سێکسی، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠ میلی‌گرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا. بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو ٢٠٠ تا ٤٠٠ میلی‌گرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢,٤ گرامە. بە دەمار ٥٠ میلی‌گرام بەلانی کەم بۆ زیاتر لە ١ خولەك، دوبارەکردنەوەی پاش ٥ خولەك ئەگەر پێویست بێت، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٠٠ میلی‌گرامە.

## لاسیدیپین: LACIDIPINE

**ناوی بازرگانی:** Motens

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ و ٤ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Calcium channel blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوربونەوە، دڵەکوتێ، ئۆدیما، سەرئێشە، گێژی، تێکچوونی هەرس، توندبوونی ئازاری سنگ، گەورەبوونی پوکی ددان، کرژبوونی ماسولکە، پەڵە، خوران، زۆرمیزکردن.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ڕۆژانە ٢ میلی‌گرام بەیەك بڕی دەرمان، گونجاوترە لە بەیانیدا، زیاد دەکرێت پاش ٣ تا ٤ هەفتە بۆ ڕۆژانە ٤ میلی‌گرام، پاشان ئەگەر پێویست بێت بۆ ڕۆژانە ٦ میلی‌گرام.



## لاکۆسامید: LACOSAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Vimpat

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ١٠٠ و ١٥٠ و ٢٠٠ میلیگرامی و شرووبی ١٥ میلیگرام/میلیلیتر و دەرزی IV ئینفیوشنی ١٠ میلیگرام/میلیلیتر.

**گرووپی دەرمان:** Anti epileptic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری فێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، دووبینی، ئازاری گەدە، زیادبوونی کێش، ڕشانەوە، قەبزی، غازات، گێژی، سەرئێشە، پەڵە، خەواڵویی، لەرزین، خەمۆکی، تێکچوونی بینین، کەمبوونی لێدانی دڵ وشکی دەم، کرژبوونی ماسولکە، تێکچوونی گەدە، خوران.

**بڕی دەرمان:** بە IV ئینفیوشن زیاتر لە ١٥ تا ٦٠ خولەك (بۆ ماوەی زیاتر لە ٥ ڕۆژ) یان بە خۆراکی گەورەکان و مناڵانی گەورەتر لە ١٦ ساڵ، سەرەتا ٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار (ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرام)، هەفتانە زیاد دەکرێت بەبڕی ٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢٠٠ میلیگرامە ڕۆژانە ٢ جار.

## لاکتۆباسیلەس: LACTOBACILLUS

**ناوی بازرگانی:** Lactinex g

**شێوەی دەرمان:** حەب و کەپسول و گرانیوڵ

**گرووپی دەرمان:** Antidiarrheal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و کۆنترۆڵکردنی سکچوون بەکاردێت پاش چارەسەرکردن بە دژەزیندەگی یەکان.

**کاریگەری لاوەکی:** غازات، بەگرانی هەناسەدان، خوران، پەڵە، ئاوسان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و مناڵانی زیاتر لە ٣ ساڵ ١ پاکەت گرانیوڵ، یان ١ تا ٢ کەپسول یان ٤ حەب هەموو ڕۆژێك، ڕۆژانە ٤ جار.

## لاکتولۆز: LACTULOSE

**ناوی بازرگانی:** Lactugal cholac,cephulac

**شێوەی دەرمان:** پاودەری گیراوە ١٠ گرام/١٥میلیلیتر و شرووبی ١٠ گرام/١٥ میلیلیتر.

**گرووپی دەرمان:** Laxative

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەر و لابردن و نەهێشتنی قەبزی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، ئازاری سك، هێڵنجدان، غازات، ڕشانەوە، تێکچوونی ئەلیکترۆلیتی.

**بڕی دەرمان:** ٣٠ تا ٥٠ سیسی ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا.

## لامیڤودین: LAMIVUDINE

**ناوی بازرگانی:** Zeffix, ٣TC,Epivir

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلیگرامی و ١٥٠ و ٣٠٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ٥ و ١٠ میلیگرام/میلیلیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی جگەر هیپاتیتی موزمینی Bو هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، هیلاکبوون، کۆکە، تا، لەرز، نەمانی ئارەزوی خواردن، پەڵەی پێستی، ئازاری ماسولکە و جومگە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، خراپی هەرس، خەمۆکی، بێهێزی، هەوکردنی پەنکریاس، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** کەسانێك کێشی زیاتر لە ٥٠ کیلۆگرام ١٥٠میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار یان ڕۆژانە ٣٠٠ میلیگرام. کێشی کەمتر لە ٥٠ کیلۆگرام ٢ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار و منداڵانی ٣ مانگ تا ١٢ ساڵ ٤ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار و لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٥٠ میلیگرامە ٢ جار لە ڕۆژێکدا.

## لامۆتریجین: LAMOTRIGINE

**ناوی بازرگانی:** Lamictal

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ و ١٥٠ و ٢٠٠ میلیگرامی و حەبی ٢ و ٥ و ٢٥ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ١٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Anticonvulsant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری فێ و تێکچوونی دووجەمسەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، زیادبوونی لێدانی دڵ پەڵە، سەرگێژبوون، تێکچوونی بینین، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خەمۆکی، خوێنبەربوون، ئازاری ماسولکە، تێکچوونی خەو، سکچوون، وشکبوونی دەم، قەبزی، ئازاری سك، زیپکە، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستان، هەڵوەرینی موو، کۆکە، تەنگەنەفەسی، هەوکردنی لوت، تێکچوونی گورچیلە، هەستیاربوون بەڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٥٠ میلیگرام خۆراکی، بۆ ماوەی ٢ هەفتە، دواتر ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرام خۆراکی، لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا بۆ ماوەی ٢ هەفتە، بڕی جێگیر و پارێزراوی دەرمان ٣٠٠ تا ٥٠٠ میلیگرامە لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. منداڵان ٠,٦ میلیگرام/کیلۆگرام لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا بۆ ماوەی ٢ هەفتە، پاشان ١,٢ میلیگرام/کیلۆگرام بۆ ماوەی ٣ تا ٤ هەفتە، بڕی جێگیر و پارێزراوی دەرمان ٥ تا ١٥ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٤٠٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا.



## لانریۆتید: LANREOTIDE

**ناوی بازرگانی:** Somatuline

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٦٠ و ٩٠ و ١٢٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Somatostatin analogue

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی ئەکرۆمیگالی (زیادبوونی ناسروشتی قەبارەی ئێسکەکان وەك دەست و قاچ و .بەهۆی زۆر دروست بوونی هۆرمۆنی گەشەوە سۆماتۆترۆفین زۆرتر لەوانەدا ڕوودەدات کەلەگەشە وەستاون).

**کاریگەری لاوەکی:** نەمانی ئارەزوی خواردن، نارێکی لێدانی دڵ، هیلاکبوون، خەواڵویی، وشکبوونەوەی پێست، سەرێشە، ئارەقکردنەوە، لەرزین، زۆر میزکردن، غازات، سکچوون، قەبزی، زیادبوون و کەمبوونی شەکری خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوران، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی دەرزی ژێرپێستی قوڵ ٩٠ میلی‌گرام هەموو ٤ هەفتەیەك بۆ ماوەی ٣ مانگ.

## لانسۆپرازۆل: LANSOPRAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Prevacid

**شێوەی دەرمان:** حەب و کەپسولی ١٥ و ٣٠ میلی‌گرامی و سەسپێنشنی ١٥ و ٣٠ میلی‌گرامی و دەرزی IV ٣٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Proton pump inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و پێشگری لە برینی گەدەو ڕیخۆڵە و تێکچوونی سورێنچك و دڵەکزە و برینی دوانزەگرێ و زۆربوونی ترشەڵۆکی گەدە و هەوکردنی بەکتریایی (H، pylori) گەڕانەوەی ترشی گەدە بەرەو سورێنچك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، هیلاکبوون، ئازاری سك، نەمانی ئارەزوی خواردن، لاوازی سێکسی، هەوکردنی پەنکریاس، لەرزین، قێ، قەبزی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٦٠ میلی‌گرامە لە ڕۆژێکدا.

## لارۆنیدەیز: LARONIDASE

**ناوی بازرگانی:** Aldurazyme

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ یەکە/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Metabolic agent ،Endocrine



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەندێ لە نیشانەکانی نەخۆشی بۆماوەیی کە پێی دەوترێت (میوکۆپۆلیسەکەرایدۆسیس) (MPS I) بەهۆی کەمبوونی هەندێ ئەنزیم کەپێی دەوترێت (A، L، iduronidase) لە لەشدا، کە پێویستە لە لەشدا بۆ تێکشکاندنی هەندێ شەکر و پرۆتین لە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، سکچوون، سەرئێشە، سووربونەوە، زیاد لێدانی دڵ، تەنگەنەفەسی، ئازاری سنگ، گۆڕانی پەستانی خوێن، پەڵە، خوران، هەڵوەرینی موو، کۆکە، گێژی، هیلاکی، خوێنبەربوون، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەرووی ١ ساڵ ١٠٠ یەکە/کیلۆگرام کێشی لەش هەفتانە ١ جار.

## لانثانیوم کاربۆنەیت: LANTHANUM CARBONATE

**ناوی بازرگانی:** Fosrenol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ و ٥٠٠ و ٧٥٠ و ١٠٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Phosphate binder

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیادبوونی فۆسفات لە نەخۆشی گورچیلەدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی هەرس، کەمبوونی کالسیۆم، تێکچوونی تام، وشکی دەم، ئازاری سنگ، سەرئێشە، گێژی، ئازاری ماسولکە و جومگە، هەڵوەرینی موو، خوران، پەڵە، زیادبوونی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٧٥٠ تا ١٥٠٠ میلی گرام خۆراکی ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لەگەڵ یان دەستبەجێ پاش خواردن. بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بە پێی ڕێژەی فۆسفات لە لەلەشدا. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ١٥٠٠ تا ٣٠٠٠ میلی گرام ڕۆژانە لەگەڵ خواردندا لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## لاپاتینیب: LAPATINIB

**ناوی بازرگانی:** Tykerb

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Tyrosine kinase inhibitor

**بەکارهێنان:** لەگەڵ دەرمانەکانی تردا بۆ چارەسەری شێرپەنجەی تەشەنەکردوو و پێشکەوتووی مەمك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، پەڵە، تێکچوونی نینۆك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەوکردنی دەم، پەککەوتنی دڵ تێکچوونی گەدە، تەنگەنەفەسی. هیلاکی، بێخەوی، وشکبوونی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەرووی ١٨ ساڵ لەگەڵ کاپیسیتابین، ١٢٥٠ میلی گرام ڕۆژانە ١ جار. گەورەکانی سەرووی ١٨ ساڵ لەگەڵ دەرمانێك لە گروپی ڕێگرەکانی ئەنزیمی ئەرۆماتەیز ١٥٠٠ میلی گرام ڕۆژانە ١ جار.



## لاتانۆپرۆست: LATANOPROST

**ناوی بازرگانی:** Xalatan

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاوی ٥٠ مایکرۆگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Prostaglandin analogue

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری پەستانی بەرزی ناوەوەی چاو و گلوکۆما (ناوی ڕەشی چاو)ی گۆشەی کراوە و پەستانی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بینین، خوران، وشکبوونەوەی چاو، سووربوونەوە، هەوکردنی چاو، سەرئێشە، پەڵە، فرمێسك ڕشتن، ئازار و ڕوشانی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ١ قەترە.

## لیفلونۆماید: LEFLUNOMIDE

**ناوی بازرگانی:** Arava

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠و٢٠ و١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Immunomodulator

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ڕۆماتیزم و هەوکردنی جومگەی سۆریاسیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، بێخەوی، خەمۆکی، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری قەفەسەی سنگ، ئۆدیما، هەوکردنی گەروو، هەوکردنی کەڕوویی دەم، وشکی دەم، تێکچوونی بینین، هێڵنجدان، نەمانی ئارەزوی خواردن، ڕشانەوە، قەبزی، سکچوون، هەڵوەرینی موو، غازات، ژەهراویبوونی جگەر، کەمخوێنی، پەڵە، خوران، زیپکە، هەوکردنی گەروو و لوت و بۆریچکەکان و کۆکە و هەوکردنی سی و جیوب و هەناسە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ، بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراوی دەرمان ڕۆژانە ١٠ تا ٢٠ میلیگرامە.

## لینالیدۆماید: LENALIDOMIDE

**ناوی بازرگانی:** Revlimid

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥ و ١٠ و ١٥ و ٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Immunomodulator

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمخوێنی و شێرپەنجەی خوێن مالتیپل مایلۆما بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، جەڵدە، مەینی خوێنی دەماری قوڵ هەوکردنی سی، تەنگەنەفەسی، لەرزین، هیلاکی، کەمی نیوترۆفیل، کەمی پەرەی خوێن و خڕۆکەی سپی، پەڵە، ئازاری ماسولکە، وشکبوونەوە و خورانی پێست، سەرئێشە، هێڵنجدان، سکچوون، قەبزی، ئازاری جومگە، ناڕێکی لێدانی دڵ سوربونەوە، ئازاری سنگ، تا، لەرز، بوونی خوێن لەمیزدا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ کەمخوێنی ڕۆژانە ١٠ میلیگرام لەگەڵ ئاودا. بۆ شێرپەنجەی خوێن مالتیپل مایلۆما ٢٥ میلیگرام ڕۆژانە لە ماوەی ٢١ ڕۆژی یەك لەدوای یەکدا لەخولێکی ٢٨ ڕۆژیدا لەگەڵ دێکسامیپازۆندا.

## لینۆگراستیم: LENOGRASTIM

**ناوی بازرگانی:** Granocyte

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٥ و ٢٦٣ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Hematopoietic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمی خڕۆکەی سپی لە جۆری هاوتاکان (نیوترۆپینیا) بەهۆی شێرپەنجە و چارەسەری کیمیایی و چاندنی مۆخی ئێسکەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تا، قەبزی، هەڵوەرینی موو، ئازاری ئێسك، گەورەبوونی سپڵ ئازاری گەدە، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی دەرزی ژێرپێستی و دەمار IV ئینفیوشن ڕۆژانە ١٩,٢ ملیۆن یەکە/کیلۆگرام لایەنی زۆر بۆ ماوەی ٢٨ ڕۆژ.

## لیپیرودین: LEPIRUDIN

**ناوی بازرگانی:** Refludan

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و بەرگری لە مەیین و کلۆبوونی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تێکچوونی بینین، بێهێزی، خوێنبەربوون، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٤ میلیگرام/کیلۆگرام لایەنی زۆر ٤٤ میلیگرام.



## لێرکارنیدیپین: LERCARNIDIPINE

**ناوی بازرگانی:** Zanidip

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Calcium channel blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێنی سوك و مامناوەند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، سەرئێشە، گێژی، ئازاری ماسولکە، پەڵە، خەواڵویی، ئازاری سنگ، دڵەکوتێ، زیادبوونی لێدانی دڵ، ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، ئەگەر پێویست بێت لانی کەم پاش ٢ هەفتە زیاد دەکرێت بۆ ڕۆژانە ٢٠ میلیگرام.

## لێترۆزۆل: LETROZOLE

**ناوی بازرگانی:** Femara

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی تەشەنەکردووی مەمك لە ژنانی لەحەیزچووەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، هیلاکبوون، پەڵە، سووربوونەوە، خوران، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، خراپی هەرس، کۆکە، تەنگەنەفەسی، کەمبوونی کێش، ئۆدیما، ئازاری ماسولکە و جومگە، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٢,٥ میلیگرام خۆراکی.

## لیوکۆڤۆرین: LEUCOVORINE

**ناوی بازرگانی:** Wellcovorin,folinic acid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٥ و ٢٥ میلیگرام و دەرزی ٣ میلیگرام/میلیلیتر و ١٠میلیگرام/میلیلیتر (٣میلی لیتر) و ١٢٥ میلیگرام/میلیلیتر (٥میلی لیتر) و ڤیالی ٣٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Folic acid derivative

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونی فۆلیك ئەسید و دەرمانی یارمەتیدەر لە شێرپەنجە ( کە بە میپوتریکسەیت چارەسەر ئەکرێت)، و بۆ چارسەری کەمخوێنی و بەکارهێنانی زیادی ڕیگرەکانی فۆلیك ئەسید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، هیلاکی، سکچوون، خوران، پەڵە، تەنگەنەفەسی، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** لە کەمخوێنی یەکاندا ١ میلیگرام خۆراکی یان ماسولکەیی ڕۆژانە ڕێی پێ دەدرێت.



## لیۆپرۆریلین: LEUPRORELIN

**ناوی بازرگانی:** Prostap

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٣.٧٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** GnRh analogue

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتووی پرۆستات و چارەسەری هەوکردنی پەردەی ناوپۆشی منداڵدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ناڕێکی لێدانی دڵ، سەرئێشە، بێخەوی، سەرگێژبوون، هەوکردنی ڕێڕەوی میز، خەمۆکی، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، ئۆدیما، گەورەبوونی مەمك، تەنگەنەفەسی، هەوکردنی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ هەوکردنی پەردەی ناوپۆشی منداڵدان ٣,٧٥ میلیگرام IM، مانگانە ١ جار بۆ ماوەی ٦ مانگ. بۆ شێرپەنجەی پێشکەوتووی پرۆستات ٧.٥ میلیگرام مانگانە ١ جار ڕۆژانە ١ میلیگرام بە SC، یان ٢٢/٥ میلیگرام IM هەر ٣ مانگ ١ جار. منداڵان ٥٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا ژێرپێستی.

## لیڤالبیوتیرۆل: LEVALBUTEROL

**ناوی بازرگانی:** Xopenex

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی ئیستینشاقی و پرژاندن.

**گروپی دەرمان:** Bronchodialator

**بەکارهێنان:** بۆ فراوانکردنی بۆری و بۆرێچکەکانی هەوا و بۆ چارەسەری ڕەبۆ و داخرانی موزمینی سی و کرژبوونی بۆریی هەوا و داخرانی بۆری هەوا و هەوکردنی بۆرێچکەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ناڕێکی لێدانی دڵ ئازاری سنگ، گێژی، لەرزین، سەرئێشە، خەمۆکی، بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان، کۆکە، تێکچوونی گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٦٣ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار، هەموو ٦ تا ٨ سەعاتێك. یان ١ تا ٢ ئیستینشاقی (٤٥ تا ٩٠ مایکرۆگرام) هەموو ٦ تا ٨ سەعاتێك.

## لیڤامیزۆل: LEVAMIZOLE

**ناوی بازرگانی:** Vermizol,Ketrax,Ergamisol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ میلیگرامی و شروبی ٤٠ میلیگرام/٥میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic



**بەکارهێنان:** دژی کرمی ڕیخۆڵەیی نیماتۆد (کرمی دەزولەیی) و بۆ چارەسەری شێرپەنجەی کۆڵۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سەرگێژبوون، ڕشانەوە، ئازاری سك، سکچوون، سەرئێشە، بێهێزی، تا، گێژی، ئازاری جومگە، پەڵە، دابەزینی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥٠ میلیگرام بەیەك بڕ، منالآن ٦ میلیگرام/کیلۆگرام بۆ ماوەی ١ یان ٢ ڕۆژ. بۆ شێرپەنجەی کۆڵۆن ٥٠ میلیگرام ڕۆژانە لەسێ ژەمدا بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ.

## لیڤاتیراسیتام: LEVETIRACETAM

**ناوی بازرگانی:** Keppra

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٢٥٠ و ٥٠٠ و ٧٥٠ و ١٠٠٠میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ١٠٠ میلیگرامی و دەرزی ١٠٠ میلیگرام.

**گروپی دەرمان:** Anticovulsant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری فێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نەمانی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کۆکە، سەرئێشە، خەمۆکی، بێخەوی، تێکچوونی بینین، هەڵوەرینی موو، پەڵە، ئازاری ماسولکە، کەمبوونەوەی کێش. لێڵبوونی میز، ئازاری گەدە، گێژی، هەوکردنی گەروو، تا، خەواڵویی، وڕێنەکردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی سەروی ١٦ ساڵ ٥٠٠ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی یان دەمار ٢ جار لە ڕۆژێکدا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٣ گرامە. منالآن ١٠ تا ٢٠ میلیگرام/ کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٦٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا.

## لیڤۆبیونۆلۆل: LEVOBUNOLOL

**ناوی بازرگانی:** Betagan

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,٥ و ٠,٢٥ ٪.

**گروپی دەرمان:** Beta، blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری گلوکۆما(ئاوی ڕەشی چاو)ی گوشەی کراوە و پەستانی بەرزی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری ناوەوەی چاو، تێکچوونی بینین، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ قەترە ڕۆژانە ٢ جار.

**لیڤۆکارنیتین:** LIVOCARNITINE

**ناوی بازرگانی:** Carnitor

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ میلی‌گرامی و گیراوەی خۆراکی ١ گرام/١٠ میلی‌لیتر و شروبی ٢٥٠ میلی‌گرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** دژی کەمبوونی کارنیتین.

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری و چارەسەری کەمبوونی سەرەتایی کارنیتین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادلێدانی دڵ بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەمۆکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام خۆراکی لە ٢ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا یان ١٠٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام ڕۆژانە بە دەمار لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. منالآن ٥٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام ڕۆژانە بەشێوەی دابەشکراو بەکاردەهێنرێت.

**لیڤۆسیتیریزین:** LEVOCETIRIZINE

**ناوی بازرگانی:** Xyzal

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ میلی‌گرامی و گیراوەی خۆراکی ٢,٥ میلی‌گرام/٥ میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری حەساسیەت و حەساسیەتی وەرزی و هەمیشەیی لوت و شەرا و پوشەتا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوونی لوت، زەردی، نەمانی ئارەزوی خواردن، خەمۆکی، خرۆشان، تا، ئازاری گەدە، خەوالّویی، ڕشانەوە، قەبزی، سکچوون، وشکبوونەوەی دەم، بێهێزی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی زیاتر لە ١٢ ساڵ ٥ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار لە ئێوارەدا. منالآنی ٦ تا ١١ ساڵ ٢,٥ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار لە ئێوارەدا.منالآنی ٢ تا ٥ ساڵ ١,٢٥ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار لە ئێوارەدا.

**لیڤۆدوپا:** LEVODOPA

**ناوی بازرگانی:** Larodopa,Dopar

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiparkinson

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری نەخۆشی پارکینسۆن (لەرزینی خۆنەویستی ئەندامەکان) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، وشکبوونەوەی دەم، هەڵوەرینی موو، ڕشانەوە، زیادبوونی پەستانی خوێن، سوتانەوەی زمان، هیلاکبوون، دڵەڕاوکێ، سکچوون، پەڵە، قەبزی، غازات، کەمخوێنی، زیادبوونی کاتی بیلیرۆبین، تێکچوونی بینین، خوێنبەربوونی پاش لە لەحەیزچونەوە، تێکچوونی دەروونی، بێهێزی، خەمۆکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان لەسەرەتادا ٠,٥ تا ١ گرام خۆراکی، ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا لەگەڵ خواردندا. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٨ گرامە.

## لیڤۆدوپا، بی: LEVODOPA B

**ناوی بازرگانی:** Modopar

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٢٥ و ٢٥٠ میلیگرامی لیڤۆدۆپا و بینزاسیرازاید.

**گروپی دەرمان:** Antiparkinson

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری نەخۆشی پارکینسۆن (لەرزینی خۆنەویستی ئەندامەکان) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکبوونەوەی دەم، سکچوون، قەبزی، غازات، وشکبوونەوەی دەم، زیادبوونی پەستانی خوێن، زیادبوونی کاتی بیلیرۆبین، سوتانەوەی زمان. کەمبوونی پەستانی خوێن، کەمخوێنی، پەڵە، هەڵوەرینی موو، تێکچوونی بینین، هیلاکبوون، دڵەڕاوکێ، تێکچوونی دەروونی، بێهێزی، خوێنبەربوونی پاش لە لەحەیزچونەوە، خەمۆکی.

**بڕی دەرمان:** بڕی ١٢٥ میلیگرام ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## لیڤۆدوپا سی: LEVODOPA C

**ناوی بازرگانی:** Sinemet

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠/١١٠ میلیگرام (لیڤۆدۆپا ١٠٠ میلیگرام + کاربیدۆپا ١٠میلیگرام ) و حەبی ١١٠ /٢٥میلیگرام (لیڤۆدۆپا ١٠٠ میلیگرام + کاربیدۆپا ٢٥ میلیگرام ) حەبی ٢٥/٢٥٠ میلیگرام (لیڤۆدۆپا ٢٥٠ میلیگرام + کاربیدۆپا مۆنۆهایدرەیت ٢٥ میلیگرام ).

**گروپی دەرمان:** Antiparkinson

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری نەخۆشی پارکینسۆن (لەرزینی خۆنەویستی ئەندامەکان) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، وشکبوونەوەی دەم، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، غازات، کەمخوێنی، دڵەڕاوکێ، بێهێزی، تێکچوونی بینین، تێکچوونی دەروونی، هیلاکبوون، خەمۆکی.



**بڕی دەرمان:** حەبی ١١٠ میلیگرام ٣ تا ٤ جار لەڕۆژێکدا.

## لیڤۆفلۆکساسین: LEVOFLOXACIN

**ناوی بازرگانی:** Levaquin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ و ٥٠٠ و ٧٥٠ میلیگرامی و دەرزی ٢٥٠ و ٥٠٠ و ٧٥٠ میلیگرامی دەرزی ٢٥ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی جیاواز وەك هەوکردنی سی یەکان و پرۆستات و جیوب و ڕێرەوی میز و پێست و.. بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، گێژی، تێکچوونی گەدە، پەڵە، هەستیاربوون بە ڕوناکی، زیادبوونی لێدانی دڵ، سەرئێشە، بێخەوی، خوران، دووبینی، ئازاری چاو، سکچوون، ئازاری سك، هەوکردنی زایەندی ژنان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ میلیگرام هەموو ٢٤ سەعاتێك. منالان ٨ میلیگرام / کیلۆگرام.

## لیڤۆفلۆکساسین: LEVOFLOXACIN OPH.

**ناوی بازرگانی:** Quixin

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,٥ و ١,٥٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازار و کزانەوەی چاو، وشکبوونەوەی چاو، کەمبوونەوەی بینین، تا، هەوکردنی گەدە، سەرئێشە، هەستیاربوون بە ڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالان ١ تا ٢ قەترە ٤ تا ٨ جار لە ڕۆژێکدا.

## لیڤۆمینثول: LEVOMENTHOL

**ناوی بازرگانی:** Levomenthol

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی کرێمی ٠,٥ ٪ و ١٪ و ٢٪.

**گروپی دەرمان:** Antipruritic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خوران و ئازاری مەوزوعی پێست بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١ تا ٢ جار بەکاردێت.



## لیڤۆنۆرجیستریل: LEVONORGESTREL

**ناوی بازرگانی:** Norplant

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ژێرپێستی.

**گروپی دەرمان:** Progestogen

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری لە سکپڕی (ماوەدرێژ تا ٥ ساڵ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** دڵەڕاوکێ، زەردی، سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەمۆکی، بێهێزی، پەڵە، زیپکە، نەکەوتنە سوڕی مانگانە، زیادبوونی شەکری خوێن، ئۆدیما، خوێنبەربوون، ئازاری ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** ٦ دانە کەپسول کە بۆ ماوەی هەر ٥ ساڵێك ژێرپێستی لە ناوەڕاستی بازوودا دادەنرێت.

## لیڤۆنۆرجیستریل: LEVONORGESTREL

**ناوی بازرگانی:** Microval,ovrette

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠ و ٧٥٠ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Progestogen

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری لە سکپڕی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرگێژبوون، هەڵوەرینی موو، سەرئێشە، دڵەڕاوکێ، گەورەبوونی مەمك، بوونی خوێن لەمیزدا، خەمۆکی، بێهێزی، پەڵە، زیپکە، نەکەوتنە سوڕی مانگانە، زیادبوونی شەکری خوێن، ئۆدیما، خوێنبەربوون، ئازاری ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١حەب خۆراکی.

## لیڤۆرفانۆڵ: LEVORPHANOL

**ناوی بازرگانی:** Dromoran ،Levo

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Narcotic analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری مامناوەند و توند و ئازاری موزمین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، بێهێزی، قەبزی، نەمانی ئارەزوی خواردن، وشکبوونەوەی دەم، ئارەقکردنەوە، خوران، کەمبوونی میز، زیادبوونی لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، خەواڵوبی، تێکچوونی گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان٢ تا ٤ میلیگرام بەبڕی پێویست هەموو ٦ تا٨ سەعاتێك.



## لیڤۆثایرۆکسین: LEVOTHYROXINE

**ناوی بازرگانی:** Levothroid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ مایکرۆگرامی و حەبی ١٠٠ و ٥٠ و٧٥ مایکرۆگرامی و گیراوەی خۆراکی ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ مایکرۆگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** هۆرمۆنی پایرۆید.

**بەکارهێنان:** بۆ جێگرتنەوەی هۆرمۆنی پایرۆید و دژی هایپۆپایرۆدیسم (کەمبوونەوەی هۆرمۆنی پایرۆید) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ئازاری دڵ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری ماسولکە، تێکچوونی پێست، توڕەبوون، لەرزینی دەست و قاچ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری سنگ، سکچوون، نەمانی تەحەمولی گەرما، نارێکی عادەتی مانگانە، ئارەقکردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٥٠ مایکرۆگرام لەرۆژێکدا، گەورەتر لە ١٢ ساڵ ٢ تا ٣ مایکرۆگرام/کیلۆگرام، منالی ٦ تا ١٢ مانگ ٦ تا ٨ مایکرۆگرام/ کیلۆگرام و منالی ١ تا ٥ ساڵ ٥ تا ٦ مایکرۆگرام/کیلۆگرام و منالی ٦ تا ١٢ ساڵ ٤ تا ٥ مایکرۆگرام/کیلۆگرام و منالی کەمتر لە ١مانگ ٨ تا ١٠ مایکرۆ گرام/کیلۆگرام.

## لیدۆکاین: LIDOCAINE

**ناوی بازرگانی:** Xylocaine

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی ٥٪ و سپرای ١٠میلی گرام/ بڕی دەرمان (٥٠میلی گرام ) و گیراوەی ٤٪ و جێل ٢٪ و دەرزی ١٪ و٢٪.

**گروپی دەرمان:** Anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی مەوزوعی وپێستی و ددان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ نەمانی ئارەزوی خواردن، تەشەنوج، خرۆشان، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئۆدیما، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان کێشی نزیکەی ٧٥ کیلۆگرام ٢٠٠ میلی گرام و منالان ٣ میلی گرام/کیلۆگرام.

## لیدوکاین و ئیپی نیفرین: LIDOCAINE&EPINEPHRINE

**ناوی بازرگانی:** Xybcaine + epinephrine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی لیدۆکاین ١ ٪ (١٠ میلی گرام/میلی لیتر) + ئیپینیفرین (بیتارترەیت) ٥ مایکرۆگرام/میلی لیتر و لیدۆکاین ٢ ٪ (٢٠ میلی گرام/میلی لیتر ) + ئیپینیفرین (بیتارترەیت) ١٢,٥ مایکرۆگرام/میلی لیتر.



**گروپی دەرمان:** Local anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی مەوزوعی پزیشکی ددان بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠ تا ١٠٠ میلی گرام، منالأن ٢٠ تا ٣٠ میلی گرام.

**لیدۆکاین:** LIDOCAINE ،H

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی لیدۆکاین ٥٪+ هایدرۆکۆرتیزۆن ئەسیتەیت ٠.٥٪.

**گروپی دەرمان:** Local anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی مەوزوعی و ئیلتیهاب و ئازاری سوکی پێستی بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار بە شێوەی مەوزوعی ڕێی پێدەدرێت.

**لیدۆکائین–پی:** LIDOCAINE -P

**ناوی بازرگانی:** Emla

**شێوەی دەرمان:** کریمی لیدۆکاین ٢,٥ ٪ و پریلۆکاین ٢,٥ ٪.

**گروپی دەرمان:** Local anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بێ هۆشکەری مەوزوعی ، بێ هۆشکردن لە پزیشکی ددان بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** بە چینێکی تەنك ڕووی پێست بەکریمەکە بماڵن و بیپێچن.

**لیدوکاین:** LIDOCAINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Xylocaine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی IV ١٪ و ٢٪ (٥ میلی‌لیتر )و دەرزی ٢٠٪ دەرزی IV ١٪ و ٢٪ و ٤ ٪ (٥٠ میلی‌لیتر ) سپرای ١میلی گرامی و ٦,٥میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Local anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی مەوزوعی و دژی نارێکی لێدانی دڵ بەکاردێت، لەگەڵ ئەدرینالین دا ئەدرێت بۆ زیادکردنی کاتی بەنجکردن.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، نەمانی ئارەزوی خواردن، تەشەنوج، خرۆشان، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئۆدیما، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان لایەنی زۆر ٣٠٠ میلی گرام.



## لیندان: LINDANE

**ناوی بازرگانی:** Kwell,Scabene,Jacutin,kwildane

**شێوەی دەرمان:** لۆشن و شامپۆ ١ و ٢ ٪.

**گروپی دەرمان:** دژی نەخۆشی گەڕی.

**بەکارهێنان:** دژی گەڕی و بۆکوشتنی ئەسپێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تەشەنوج، زیاد لێدانی دڵ ئازاری ماسولکە، سەرگێژبوون، ناجێگیری، تێکچوونی پێست.

**بڕی دەرمان:** بە بڕی پێویست لۆشن و شامپۆ بەکاردێت.

## لاینیزۆلید: LINEZOLID

**ناوی بازرگانی:** Zyvox

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠٠ و ٦٠٠ میلیگرامی و حەبی ٦٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ١٠٠ میلیگرام/٥میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری جۆرە جیاوازەکانی هەوکردنی بەکتریایی وەك هەوکردنی سی یەکان و پێست و هەوکردن بەهۆی بەکتریای گرامپۆزەتیڤەکانەوە و ئەو هەوکردنە بەکتریایانەی کە بەرگرییان هەیە بۆ دژە زیندەگی یەکانی تر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، زەردی پێست. خوێنبەربوون، تا، لەرز، سکچوون، ڕشانەوە، بێخەوی، تێکچوونی گەدە، سکچوون، وشکبوونەوەی دەم، ئازاری سك. بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی بینین، قەبزی، هەوکردنی پەنکریاس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٠ تا ٦٠٠ میلیگرام بە IV یان خۆراکی هەموو ١٢ سەعاتێك بۆ ماوەی ١٠ تا ١٤ ڕۆژ. لایەنی زۆری ماوەی چارەسەر ٢٨ ڕۆژە. منالان ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام.

## لایۆثایرۆنین: LIOTHYRONINE

**ناوی بازرگانی:** Cytomel

**شێوەی دەرمان:** حەب ٢٥ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** هۆرمۆنی پایرۆید.



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هایپۆپایرۆیدیسم (کەمبوونەوەی هۆرمۆنی پایرۆید ) و گواتری بیٚ ژەهر (گەورەبوونی ڕژێنی پایرۆید) و بێهۆشی کەمی پایرۆید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، زیاد لێدانی دڵ سەرئێشە، بێخەوی، تێکچوونی پێست، کەمبوونەوەی کێش، حەساسیەت، ڕشانەوە، ناڕێکی عادەتی مانگانە، ئارەقکردن، لەرزینی دەست و پیٚ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥ تا ٥٠ مایکرۆگرام لەڕۆژێکدا.

## لیکوید پارافین: LIQUID PARAFFIN

**ناوی بازرگانی:** liquid paraffin

**شێوەی دەرمان:** ئیمەڵشنی خۆراکی.

**گروپی دەرمان:** Laxative

**بەکارهێنان:** ڕەوانکەرە و بۆ چارەسەری قەبزی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٨ ساڵ ١٠ تا ٣٠ میلی‌لیتر لە شەودا کاتێك پێویست بێت.

## لیکوید پارافین: LIQUID PARAFFIN

**ناوی بازرگانی:** Lacri، lube

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی چاو.

**گروپی دەرمان:** Ocular lubricants

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری حاڵەتەکانی وشکی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشان.

**بڕی دەرمان:** بە بڕی پێویست بەکاردێت.

## لیراگلوتید: LIRAGLUTIDE

**ناوی بازرگانی:** Victoza

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٦ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antidiabetic drug

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕێژەی شەکری خوێن و بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ بەکاردێت.

ێ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، تێکچوونی گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، سکچوون، پەڵە، سوربونەوە، هەوکردنی پەنکریاس. زیاد لێدانی دڵ ئازاری سك، غازات، هەوکردنی گەدە، هیلاکی، تا، هەوکردنی بۆڕیچکەکان، کەمبوونی شەکری خوێن، گواتر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٠,٦٥ میلیگرام ژێر پێستی ڕۆژانە ١ جار لانی کەم بۆ ماوەی ١ هەفتە. لانی کەم پاش ١ هەفتە زیاد دەکرێت بۆ ١,٢ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١,٨ میلیگرامە.

## لیزنۆپریل: LISINOPRIL

**ناوی بازرگانی:** Prinivil, Zestril

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ و ٥ و ١٠ و ٢٠ و ٣٠ و ٤٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Angitensin II antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێنی سوك تا توند و بۆ فراوانکردنی مولولەکانی خوێن و بۆ جەڵدەی دڵ و پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت، دابەزینی توندی پەستانی خوێن، تێکچوونی گورچیلە، هەستیاربوون بەڕوناکی، کۆکە، تێکچوونی پێست، بێهێزی گشتی، ئازاری دڵ سەرئێشە، سەرگێژبوون، هێڵنجدان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ تا ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار.لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٤٠ میلیگرامە.

## لیثیوم کاربوونەیت: LITHIUM CARBONATE

**ناوی بازرگانی:** Eskalith,lithonate,lithobid,carbolith

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی و حەبی ٤٥٠ میلیگرامی و کەپسولی ١٥٠ و ٣٠٠ و ٦٠٠ میلیگرامی و شروب و گیراوەی ٣٠٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی یەکانی دەروونی مانیا (شێتی) و خەمۆکی توند و تێکچوونی دووجەمسەری و شیزۆفرینیا و بۆئەوانەی کەخویان بەئەلکهولەوە گرتووە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، وشکبوونەوەی دەم، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ تێکچوونی بینین، کەمبوونەوەی کێش، سەرئێشە، کەمبوونەوەی فرمێسك، سەرگێژبوون، ناجێگیری، گۆڕانی ECG – تەشەنوج، تێکچوونی گورچیلە، خوران، خەواڵویی، ئاوی سپی پیری، کەمبوونی پایرۆید.



**بڕی دەرمان:** بۆ بەرگری یان کۆنترۆڵکردنی مانیا گەورەکان لەحەملەی تێدا ٣٠٠ میلیگرام خۆراکی،لایەنی زۆر ڕۆژانە ٤ جار. بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو ٣٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٤ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانەی گەورەکان ٢,٤ گرامە. بۆ خەمۆکی توند و نەخۆشی شیزۆفرینیا و ئەوانەی کەخویان بەئەلکهولەوە گرتووە گەورەکان ٣٠٠ میلیگرام خۆراکی ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا.

## لۆدۆکسامید: LODOXAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Alomide

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,١٪.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری چاوئێشە و حەساسیەت و ئیلتیهابی چاو و هەورکرنی کۆرنیەی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوەی چاو، تێکچوونی بینین، خوران، وشکبوونی لوت، سەرئێشە. خەواڵویی، هەوکردنی کۆرنیەی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی سەروی ٢ ساڵ ١ تا ٢ قەترە ٤ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٣ مانگ.

## لۆفیپرامین: LOFEPRAMINE

**ناوی بازرگانی:** Gamanil,feprapax,lomot

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٧٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی خۆراکی ٧٠ میلیگرام ٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiddepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی خەمۆکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئۆدیما، وشکبوونەوەی دەم، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، خەواڵویی، قەبزی، تێکچوونی بینین، گیرانی میز، لاوازی سێکسی، گەورەبوونی مەمك، زیادبوونی کێش.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٤٠ تا ٢١٠ میلیگرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## لۆفیکسیدین: LOFEXIDINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Britlofex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Alpha adrenergic agonist

**بەکارهێنان:** بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی نیشانەکانی وازهێنان لە ئەفیونەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی لینجە پەردە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونی لێدانی دڵ، گێژی، خەواڵوویی.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ٨٠٠ مایکرۆ گرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، زیاد دەکرێت لەکاتێکدا پێویستە لە هەنگاوەکاندا لە ٤٠٠ تا ٨٠٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە بۆ لایەنی زۆر ڕۆژانە ٢,٤ میلیگرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لایەنی زۆری ١ بڕی دەرمانی ٨٠٠ مایکرۆگرام، ماوەی پێشنیارکراوی چارەسەر ٧ تا ١٠ ڕۆژە ئەگەر ئەفیونی بەکارنەهێنا ( بەڵام لەوانەیە ماوەیەکی درێژتری پێویست بێت).

## لۆمیفلۆکساسین: LOMEFLOXACIN

**ناوی بازرگانی:** Maxaquin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی جیاواز بەکاردێت وەك هەوکردنی بۆرێچکەکانی هەواو هەوکردنی میزەڕۆ و هەوکردنی میزەڵدان و هەوکردنی پرۆستات و هەوکردنی برینی پرۆستات لە کونی میزەوە و سالمۆنێلا و شیجیلا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری جومگە و ماسولکە. سکچوون، تێکچوونی جگەر، فێ، هەستیاربوون بەڕووناکی خۆر، ئازاری سك، گێژی، زرنگانەوەی گوێ، بەگراتی هەناسەدان، ئاوسان، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوێنبەربوون، هیلاکبوون، سەرئێشە، خەواڵوویی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٠ میلیگرام ١ جار لە ڕۆژێکدا. لایەنی زۆر بۆ ماوەی مانگێك.

## لۆمیوستین: LOMUSTIN

**ناوی بازرگانی:** Ceenu

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٤٠ میلیگرام.

**گروپی دەرمان:** Alkylating agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن هوجکین لیمفۆما و شێرپەنجەی کۆلۆن و مێشك و گورچیلە و سی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، هەڵوەرینی موو. ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، هەوکردنی جومگە، تێکچوونی گورچیلە، کەمخوێنی، برینی دەم، خوران، ئاجێگیری، کەمبوونی خڕۆکەی سپی.

**بڕی دەرمان:** ١٢٠ تا ١٣٠میلیگرام/مەتردوجا ڕووی لەش بەشێوەی یەك بڕی دەرمان هەموو ٦ تا ٨ هەفتەیەك.

## لۆپرامایدە: LOPRAMIDE HCL

**ناوی بازرگانی:** Imodium,Diamode,Endiaron

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ میلیگرامی و کەپسولی ٢ میلیگرامی و گیراوەی ١میلیگرام /٥میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antidiarrheal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سکچوونی سەفەر و سکچوونی تیژ و سکچوونی درێژخایەن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، گەورەبوونی سك، ئازاری سك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، بێهێزی، سەرگێژبوون، خەواڵویی، پەڵە، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٤ میلیگرام خۆراکی،پاشان ٢ میلیگرام پاش لە هەر شلبوونەوەیەکی پیسایی، تا ١٦ میلیگرام لە ڕۆژێکدا. منالانی ٢ تا ٥ ساڵ، ١٣ تا ٢٠ کیلۆگرام ١ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ جار،منالّی ٦ تا ٨ ساڵ، ٢٠ تا ٣٠ کیلۆگرام ٢ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار، منالّی ٨ تا ١٢ ساڵ، زیاتر لە ٣٠ کیلۆگرام ٢ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ جار.

## لۆپیناڤیر و ریتۆناڤیر: LOPINAVIR&RITONAVIR

**ناوی بازرگانی:** Kaletra

**شێوەی دەرمان:** حەبی (لۆپیناڤیر / ریتۆناڤیر، ١٠٠/٢٥میلیگرام، ٢٠٠/٥٠ میلیگرام )، گیراوەی خۆراکی ٤٠٠ ١٠٠میلیگرام/٥میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** لەگەڵ دەرمانە دژە ڤایرۆسەکانی تردا دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تا، گێژی، بێخەوی، خەمۆکی، ناجێگیری، ئازار، خەواڵویی، ئازاری قەفەسەی سنگ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، ئۆدیما، تێکچوونی چاو، هەوکردنی گوێی ناوەڕاست، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، جیوب، ئازاری سك، سکچوون، لەرز، کەمبوونەوەی ئارەزوی سێکسی، هێڵنجدان، گەورەبوونی مەمك، ڕشانەوە، قەبزی، کەمخوێنی، غازات، ئیلتیهابی لیکەڕژێنەکان، میزی خوێناوی، هەڵوەرینی موو، تەنگەنەفەسی، کۆکە، ئارەقکردنەوە، برینی گەدە.

**بڕی دەرمان:** گیراوەی خۆراکی (٤٠٠/١٠٠میلیگرام/٥میلی لیتر) گەورەکان ٥ میلیلیتر ڕۆژانە ٢ جار لەگەڵ خواردندا، منالّان ٢ تا ١٢ ساڵ ٢,٩ میلی لیتر/مەتر دوجا ڕۆژانە ٢ جار لەگەڵ خواردندا، لایەنی زۆر ٥ میلیلیتر ڕۆژانە ٢ جار. حەبی (٢٠٠/٥٠ میلیگرام) گەورەکان و منالان لەگەڵ ڕوبەری ڕووی لەشی زیاتر لە ١.٤ مەتردوجا یان کێشی لەشی ٤٠ کیلۆگرام و زیاتر ٢ حەب ڕۆژانە ٢ جار. حەبی (١٠٠/٢٥میلیگرام) منالّانی سەرووی ٢ ساڵ لەگەڵ کێشی لەشی خوار ٤٠ کیلۆگرام و ڕوبەری ڕووی لەشی ٠,٥ تا ٠,٩ مەتر دوجا، ٢ حەب ڕۆژانە ٢ جار، ڕوبەری ڕووی لەشی ٠,٩ تا ١,٤ مەتردوجا ٣ حەب ڕۆژانە ٢ جار.



## لۆپرازۆلام: LOPRAZOLAM

**ناوی بازرگانی:** Loprazolam

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Benzodiazepines

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بێخەوی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالّویی، شڵەژان، موعتادبوون، لەنجە، فەرامۆشی – پەڵە، گێژی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ میلیگرام لە کاتی خەودا، زیاد دەکرێت بۆ ١,٥ تا ٢ میلیگرام ئەگەر پێویست بوو، پیرەکان (یان بێ تواناکان) ٠,٥ تا ١ میلیگرام.

## لۆراتادین: LORATADINE

**ناوی بازرگانی:** Claritin,Alavert

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلیگرامی و شروبی ٥ میلیگرام/٥میلیلیتر و حەبی کرماندنی ٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری حەساسیەت و حەساسیەتی لوت و حەساسیەتی وەرزی و پوشەتا وحەساسیەتی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە و شەرا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خاوبوونەوەی لێدانی دڵ وشکبوونی دەم، زەردبوونی پێست و چاو، ئازاری گەدە، بێهێزی، بێخەوی، سەرئێشە، سەرگێژبوون، هیلاکبوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ٦ ساڵ ڕۆژانە ١٠ میلیگرام خۆراکی،منداڵانی ٢ تا ٥ ساڵ ڕۆژانە ٥ میلیگرام خۆراکی.

## لۆرازیپام: LORAZEPAM

**ناوی بازرگانی:** Ativan,temesta,loraz

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٥ و ١ و ٢ میلیگرامی و دەرزی ٢ و ٤ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Benzodiazepines

**بەکارهێنان:** ئارام بەخش و خەولێخەرە و بۆ چارەسەی قەلەقی مامناوەند و توند و بێخەوی وخەمۆکی و تەشەنوج و هێڵنجدان و ڕشانەوە بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، وشکبوونەوەی دەم، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ سەرئێشە، حەساسیەت، قەبزی، بەنە. بێهێزی، هیلاکی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبوون و زیادبوونی پەستانی خوێن، ئازاری سك، کەمبوونەوەی بیستن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٦ میلیگرام ڕۆژانە بەکاردەهێنرێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ١٠ میلیگرامە. منداڵان ٠,٠٠٥ تا ٠,١ میلیگرام/کیلۆگرام بە دەماری لەسەرخۆ.

## لۆرمیتازیپام: LORMETAZEPAM

**ناوی بازرگانی:** Lormetazepam

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٥ و ١ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Benzodiazepines

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بێخەوی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، شڵەژان، موعتادبوون، لەنجە، فەرامۆشی، پەڵە، گێژی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٥ تا ١ میلیگرام لەکاتی خەودا، پیرەکان (یان بێ تواناکان) ٠,٥ میلیگرام.

## لۆسارتان: LOSARTAN

**ناوی بازرگانی:** Cozar,losar

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Angitensin II antagonist

**بەکارهێنان:** دژی پەستانی بەرزی خوێن و بۆ کەمکردنەوەی زیانی جەڵدەی دڵ و شەکرەی نەخۆشی گورچیلەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، سەرگێژبوون، کۆکە، جیوب، ئازاری ماسولکە، خراپی هەرس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام،بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٢٥ تا١٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ تا ٢ جار.

## لۆتیپریدنۆل: LOTEPREDNOL

**ناوی بازرگانی:** Lotemax

**شێوەی دەرمان:** قەترەی ٠,٥٪.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ ئیلتیهابی پاش نەشتەرگەری و ئیلتیهابی چاو و چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی چاو و حەساسیەتی وەرزی چاو و تامێسکی پشتێنەیی کۆرنیە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بینین، سوتانەوەی چاو، وشکبوونەوەی چاو، خوران، کاتاراکت، گلوکۆما، سوربونەوەی چاو.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٤ جار بەکاردێت، ٢٤ سەعات پاش نەشتەرگەری دەست پێدەکات، لایەنی زۆری ماوەی چارەسەر ١٤ ڕۆژە.

## لۆڤاستاتین: LOVASTATIN

**ناوی بازرگانی:** Mevacor, Altoprev,mevinolin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ و ١٠ و ٤٠ میلیگرامی و حەبی ER ٢٠ و ٤٠ و ٦٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihyperlipidaemia

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندنی چەوری خوێن و کۆلیسترۆڵ و بۆ کەمکردنەوەی زیانی جەڵدەی دڵ و بۆ ئازاری سنگ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، پەڵە، سکچوون، ئازاری ماسولکە، سوربونەوەی پێست، دڵەکزە، هەوکردنی جگەر، تێکچوونی بینین، قەبزی، غازات، خرابی هەرس، سەرئێشە، سەرگێژبوون.

**بڕی دەرمان:** ١ تا ٢ حەبی ٢٠ میلیگرامی ڕۆژانە لەگەڵ شێودا، تا ٨٠ میلیگرام ڕۆژانە ئەتوانی بەکاربهێنی.

## لیوبیپرۆستۆن: LUBIPROSTONE

**ناوی بازرگانی:** Amitiza

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی جێلی ٨ و ٢٤ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Laxative

**بەکارهێنان:** ڕەوانکەرەو بۆ چارەسەری قەبزی موزمین و بۆ چارەسەری نەخۆشی ڕیخۆڵە بزوێنەر پەسەند (IBS) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، کۆکە، برینی گەروو، ئازاری گەدە، غازات، سەرئێشە، گێژی، ئاوسان، خەمۆکی، ئازاری جومگە و ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ قەبزی ٢٤ مایکرۆگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا لەگەڵ خواردن و ئاودا. بۆ چارەسەری ڕیخۆڵە بزوێنەر پەسەند (IBS) لەگەڵ قەبزی لە ژناندا ٨ مایکرۆگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا لەگەڵ خواردن و ئاودا.



## لیوترۆپین: LUTROPIN ALFA

**ناوی بازرگانی:** Luveris

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٧٥ یەکەیی.

**گروپی دەرمان:** Gonadotrophins

**بەکارهێنان:** لەگەڵ فۆلیترۆپین ئەلفا بۆ هاندانی هێلکە بۆ پێگەیشتن و گەشەکردنی و کاتێك بەکاردێت کە ژنان ئارەزوی سکپڕی دەکەن و هێلکەدان توانایی دروستکردنی هێلکەی هەیە و بەڵام هۆرمۆنی هاندەری تەواوی یە بۆ پێگەیشتنی هێلکە یان بۆ چارەسەری نەزۆکی بەهۆی کەمبوونی زەردەتەنەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك و حەوز، سەرئێشە، خەواڵویی، پەڵە، ئازاری مەمك، ئازار و ئاوسانی شوێنی دەرزی، هەڵوەرینی موو، گەورەبوونی هێلکەدان، وشکبوونەوەی پێست، سکچوون، گێژی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٧٥ یەکە ژێرپێستی لایەنی زۆر بۆماوەی ١٤ ڕۆژ.

## لایمیسایکلین: LYMECYCLINE

**ناوی بازرگانی:** Tetralysal

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٤٠٨ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی گشتی و هەوکردن بەهۆی ڕێژەیەکی زۆری بەکتریاوە و هەوکردنی ڕێڕەوی هەناسەدان و میز و نەخۆشی سیفلیس (نەخۆشیەکی موزمینی سێکسی گواستراوەیە بەهۆی بەکتریای (ترپیۆنیماپالیدوم) و دژی هەوکردنی بەکتریایی تر و بۆ چارەسەری زیپکە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، پەڵە، ڕشانەوە، سکچوون، تێکچوونی خوێن، هەوکردنی پەنکریاس، هەستیاربوون بە ڕوناکی، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، شەرا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٨ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك، زیاد دەکرێت بۆ ١,٢٢٤ تا ١,٦٣٢ گرام ڕۆژانە لە هەوکردنی توندەکاندا. بۆ زیپکە ٤٠٨ میلیگرام ڕۆژانە بە لانی کەم بۆ ماوەی ٨ هەفتە.

**لاینیسترینۆل:** LYNESTRENOL

**ناوی بازرگانی:** Minilyn,Exluton,Miniluyn

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٥ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Progestin hormone

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری لە حاملەیی و سکپڕی و بۆ چارەسەری تێکچوونی عادەتی مانگانە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوونی نارێکی منداڵدان، حەساسیەتی مەمك، خەمۆکی، زیپکە، خوێنبەربوونی پوکی ددان، هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادبوون یان کەمبوونی کێشی لەش.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٥ تا ١٠ میلی گرەم بۆ ماوەی ١٠ تا ١٤ ڕۆژ لە هەر سوڕێکی بێ نوێژی ٢٨ ڕۆژی مانگانەدا. بۆ بەرگری لە سکپڕی ڕۆژانە ١ حەب.

***



## ماڤینابد ئەسیتەیت: MAFENIDE ACETATE

**ناوی بازرگانی:** Sulfamylon

**شێوەی دەرمان:** کرێمی مەوزوعی ٨٥ میلیگرام/گرام و ١١٢میلیگرام/ گرام.

**گروپی دەرمان:** Antifungal، antimicrobe

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی برینەکان و سوتانی پلە یەك و دوو بۆ پێشگرتن و چارەسەری هەوکردن بەهۆی سیدۆمۆناس ئەیروجینۆسا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوەی شوێنی **بەکارهێنان**، سوربونەوەی پێست، لەرزین، ئازار.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآن ڕۆژانە ١ تا ٢ جار.

## ماگالدرەیت: MAGALDRATE

**ناوی بازرگانی:** Riopan، plus

**شێوەی دەرمان:** سەسپێنشنی (ماگالدرەیت و سایمیتیکۆن) ٢٠/٢٤٠ میلیگرام و ٤٠/١٠٨٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antacid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیادبوونی ترشی گەدە و دڵەکزە و هەرسنەکردن و تێکچوونی گەدە و هەوکردنی گەدە و برینی گەدە و دوانزەگرێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری ڕیخۆڵە، نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، قەبزی، پەڵە، خوران، ئاوسان، لاوازی ماسولکەیی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، بەگرانی هەناسەدان، زیادبوونی مەگنسیۆم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ کەوچکی چایی پاش ژەمی خواردن و لە کاتی خەودا.



## مەگنیسیۆم ئەلجینەیت: MAGNESIUM ALGINATE

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی خۆراکی.

**گروپی دەرمان:** خوێی مەگنسیۆم.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری گەڕانەوەی ترشی گەدە بەرەو سورێنچك بەکاردێت.

## مەگنیسیۆم کاربۆنەیت: MAGNESIUM CARBONATE

**شێوەی دەرمان:** سەسپێنشنی خۆراکی.

**گروپی دەرمان:** Antacid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری تێکچوونی گەدە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون.

**بڕی دەرمان:** ١٠ میلیلیتر ڕۆژانە ٣ جار لە ئاودا.

## مەگنیسیۆم کلۆراید: MAGNESIUM CHLORIDE

**ناوی بازرگانی:** Mag ٦٤

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەب و دەرزی.

**گروپی دەرمان:** ئەلیکترۆلایت.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمی مەگنسیۆم و خوێن لێبڕانی ماسولکەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کرژبوونی ماسولکە، سکچوون، ڕوشان، هێڵنجدان، ئازاری گەدە، تێکچوونی گەدە.

**بڕی دەرمان:** بڕی دەرمان بەپێی پێویست بەکاردێت.

## مەگنیسیۆم گلوکۆنەیت: MAGNESIUM GLUCONATE

**ناوی بازرگانی:** Mag G

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی خۆراکی.

**گروپی دەرمان:** خوێی مەگنسیۆم.

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری لە کەمبوونەوەی مەگنسیۆم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، نارێکی لێدانی دڵ بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان، سوربونەوە، سکچوون، غازات، تێکچوونی گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ تا ١٠٠٠ میلیگرام ١ تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا. منالآن ١٠ تا ٢٠ میلیگرام/کیلۆگرام ٤ جار لە ڕۆژێکدا.



## مەگنیسیۆم لاکتەیت: MAGNESIUM LACTATE

**ناوی بازرگانی:** Mag tabSR

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەبی کەپسول شێوە(کاپلێت).

**گروپی دەرمان:** خوێی مەگنسیۆم.

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری لە کەمبوونەوەی مەگنسیۆم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە، بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان، غازات، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ کاپلێت هەموو ١٢ سەعاتێك لەگەڵ خواردندا.

## مەگنیسیۆم سیترەیت: MAGNESIUM CITRATE

**ناوی بازرگانی:** Citromag

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ٢٩٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر (٣٠٠ میلی لیتر) و حەبی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Laxative

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری قەبزی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری گەدە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، غازات، بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان، سکچوون، تێکچوونی گەدە، گێژی، ئارەقکردنەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٤٠ میلیلیتر بە شێوەی خۆراکی ١ جار. منداڵان بچوکتر لە ٦ ساڵ ٠,٥ میلی لیتر/کیلۆگرام خۆراکی بۆ زیاترو بەلایەنی زۆری لە ٢٠٠ میلی لیتر. دووبارەکرێتەوە هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك تا پیسایی شل دەبێتەوە. منالّی ٦ تا ١٢ ساڵ ١٠٠ تا ١٥٠ میلیلیتر خۆراکی ١ جار.

## مەگنیسیۆم هایدرۆکساید: MAGNESIUM HYDROXIDE

**ناوی بازرگانی:** Milk of magnesia, laxmel

**شێوەی دەرمان:** شەربەتی ٨٪ (١٢٠ ,١٤٠ میلی لیتر) و حەبی ٣١١ و ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antacid/laxative

**بەکارهێنان:** دژی ترشەڵۆکی گەدەیەو ڕەوانکەرە و بۆ چارەسەری قەبزی، بۆ خاڵی کردنەوەی ڕیخۆڵە پێش لە جەراحی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، تێکچوونی ماسولکە، تێکچوونی بینین، زیادبوونی مەگنسیۆم، نزمبوونەوەی پەستان.



**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ تا ١٥ میلی لیتر خۆراکی ٤ جار لە ڕۆژێکدا، منالآن ٢,٥ تا ٥ میلی لیتر خۆراکی ڕۆژی ٤ جار. بۆ چارەسەری قەبزی و وەك ڕەوانکەر گەورەکان ڕۆژانە ٣٠ تا ٦٠ میلی‌لیتر بەشێوەی ١ بڕ یان زیاتر لەگەڵ شلەمەنی یەکاندا. منالآنی ٢ تا ١٢ ساڵ ٥ تا ٣٠ میلی‌گرام ڕۆژانە، بەشێوەی ١ بڕ یان زیاتر لەگەڵ شلەمەنیەکاندا. منالآنی بچوکتر لە ٢ ساڵ ٠,٥ میلی لیتر/کیلۆگرام ڕۆژانە. بۆ خاڵی کردنەوەی ڕیخۆڵە پێش لە جەراحی گەورەکان و منالآنی گەورەتر لە ٦ ساڵ ١٥ تا ٦٠ میلی‌لیتر خۆراکی ڕێی پێ دەدرێت.

## مەگنیسیۆم ئۆکساید: MAGNESIUM OXIDE

**ناوی بازرگانی:** Maox

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەبی ٤٠٠ میلی‌گرامی و کەپسولی ١٤٠ و ٢٥٠ و ٥٠٠ و ٦٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antacid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری برینی گەدە ودوانزەگرێ و تێکچوونی گەدە و گەڕانەوەی ترشەڵۆکی گەدە بەرەو سورێنچك و قەبزی و کەمبوونەوەی مەگنسیۆم و دژی ترشەڵۆکی گەدە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، تێکچوونی ماسولکە، تێکچوونی بینین، هێڵنجدان، ڕشانەوە، گێژبوون، بێهێزی، سوربونەوە، دابەزینی پەستان.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١ تا ٢ حەب، خۆراکی ڕێی پێدەدرێت.

## مەگنیسیۆم سەلفەیت: MAGNESIUM SALFATE

**ناوی بازرگانی:** Sulmags

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٪و ٢٠٪ و ٥٠٪ (١٠ میلی‌لیتر، ٥٠میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Laxative

**بەکارهێنان:** ڕەوانکەرە و بۆ چارەسەری قەبزی و دڵەکزە و کەمبوونی مەگنیسیۆم و بۆ پێشگری لە فێ و نارێکی لێدانی دڵی سکۆڵەیی و بۆ چارەسەری ژەهراویبوون لەکاتی سکپڕیدا و وەستانی دڵ و بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، نزمبوونەوەی پەستان، کەمبوونەوەی لێداتی دڵ، سکچوون، ئارەق کردن، خەواڵویی، کەمبوونەوەی صۆدیۆم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٤٠ گرامە. منالآن ٢٠ تا ٤٠ میلی‌گرام/ کیلۆگرام بەشێوەی گیراوەی ٢٠٪ بە ڕێگەی ماسولکەیی IM ڕێی پێ دەدرێت.

## مەگنیسیۆم سالیسیلەیت: MAGNESIUM SALICYLATE

**ناوی بازرگانی:** Magan

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی خۆراکی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** بۆ لابردنی ئازار و تا و ئیلتیهاب و ئازار و ئیلتیهابی جومگەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، تێکچوونی بینین، میزی خوێناوی، ئاوسان، خوێنبەربوون، ئازاری گەدە، زەردی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی گەدە، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٤ جار بەکاردێت.

## مەگنیسیۆم ترایسیلیکەیت: MAGNESIUM TRISILICATE

**ناوی بازرگانی:** Magnesium trisilicate

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی حەب وسەسپێنشنی خۆراکی.

**گروپی دەرمان:** Antacid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری تێکچوونی گەدە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ حەب بجوێت لە دەمدا هەرکاتێك پێویست بێت. گەورەکان ١٠ تا ٢٠ میلیلیتر لە ئاودا ڕۆژانە ٣ جار یان هەر کاتێك پێویست بێت. مناڵی ٥ تا ١٢ ساڵ ٥ تا ١٠ میلیلیتر لە ئاودا ڕۆژانە ٣ جار یان هەر کاتێك پێویست بێت.

## مالاثایۆن: MALATHION

**ناوی بازرگانی:** Ovide

**شێوەی دەرمان:** لۆشنی ٠,٥ ٪.

**گروپی دەرمان:** Pediculicide

**بەکارهێنان:** بۆ کوشتنی ئەسپێی سەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێست و پێستی سەر، ئیلتیهابی چاو.

**بڕی دەرمان:** بەپێی پێویست سەری پێ بشۆرێت.

تێ: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## مانیتۆل: MANNITOL

**ناوی بازرگانی:** Aridol, Osmitrol,austra

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٪ و ٢٠٪.

**گرووپی دەرمان:** Diuretic

**بەکارهێنان:** میزهێنەرەو، بۆ چارەسەری کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا (ئۆدیما) و گلوکۆما (ئاوی رەشی چاو) و پەستانی ناوەوەی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، لەرز، ئازاری قەفەسەی سنگ، تا، تێکچوونی بینین، سەرئێشە، تەشەنوج، سکچوون، سەرگێژبوون، زیاد و کەمی پەستان، زیادلێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** وەك میزهێنەر گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ گرام بەشێوەی گیراوەی ٥٪، ٢٥٪ بە دەمار IV ئینفیوشن، منداڵان ٢ گرام/کیلۆگرام بەشێوەی گیراوەی ١٥٪، ٢٠٪ بە دەمار IV ئینفیوشن لە ماوەی ٢ تا ٦ سەعات. بۆ گلوکۆما گەورەکان ١ تا ٢ گرام/ کیلۆگرام بەشێوەی گیراوەی ١٥٪، ٢٥٪ بەڕێگەی IV ئینفیوشن لە ماوەی ٣٠ تا ٦٠ خولەکدا. منداڵان ١ تا ٢ گرام کیلۆگرام بەشێوەی گیراوەی ١٥٪، ٢٥٪ بەڕێگەی IV ئینفیوشن لەماوەی ٣٠ تا ٦٠ خولەکدا.

## ماپرۆتیلین: MAPROTILINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Ludiomil,remeron

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ٢٥ و٧٥ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** دژی خەمۆکی Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خەمۆکی و دڵەڕاوکێ و قەلەقی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبوونەوەی پەستان، زۆر لێدانی دڵ، وڕێنە، شێتی، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، پەڵە، هەستیاربوون بەڕووناکی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی بینین، سەرگێژبوون، تەشەنوج.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان لە سەرەتادا ٢٥ میلیگرام شەوانە یان ڕۆژانە،٣ جار ڕێی پێدەدرێت و پاش لە ٢ هەفتە، بەتەدریجی ڕۆژانە بە ١٥٠ میلیگرام دەگات. لایەنی زۆری بڕی دەرمان لەبەتەمەنەکاندا ٥٠ تا ٧٥ میلیگرامە.



## مارافیرۆك: MARAVIROC

**ناوی بازرگانی:** Selzentry,Celsentri

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥٠ و ٣٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، تێکچوونی گەدە، سکچوون، کۆکە، تا، گێژی، قەبزی، تێکچوونی خەو، سەرئێشە، هەوکردنی ڕێڕەوی میز، کەمبوونی کێش. پەڵە، خوران، ئازاری پشت، کرژبوونی ماسولکە، تێکچوونی تامی دەم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەرووی تەمەنی ١٨ ساڵ ٣٠٠ میلی گرام ڕۆژانە ٢ جار.

## میبێندازول: MEBENDAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Vermox,ovex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** دژە کرم Anthelminitic

**بەکارهێنان:** دژی کرمی ئەسکاریس و قولابدار و قامچیدار و کرمی پان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تا، ئازاری سك، سکچوون، سەرئێشە، پەڵە، هەڵوەرینی موو، دابەزینی پەستان، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرگێژبوون، کەمبوونی نیوترۆفیل، غازات، هەوکردنی جگەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ٢ ساڵ ١٠٠ میلی گرام خۆراکی، ڕۆژانە ٢ جار، بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ و ٢ تا ٣ هەفتە دواتر دوبارە دەکرێتەوە.

## میبیڤیرین: MEBEVERINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Duspatalin,colofac,fygogel

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٣٥ میلی گرامی و کەپسولی ٢٠٠ میلی گرامی و گیراوەی خۆراکی ٥٠ میلی گرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antispasmodic

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری کرژبوون و ئازاری سك و کۆلۆن و (IBS) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، پەڵە –شەرا، کەمبوونی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٣٥ تا ١٥٠ میلی گرام ڕۆژانە ٣ جار پێش لە خواردن ڕێی پێدەدرێت.



## میکاسێرمین: MECASERMIN

**ناوی بازرگانی:** Increlex

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Somatomedins

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەککەوتنی گەشە لە منالان و لاواندا بەهۆی کەمبوونی سەرەتایی توندی ( IGF، ١ ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی بینین، زیاد لێدانی دڵ، زیادبوونی شەکری خوێن، گەورەبوونی مەمك، ئازاری جومگە و ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی دەرزی ژێر پێستی لاوان و منالانی گەورەتر لە ٢ ساڵ، سەرەتا ٤٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٢ جار بۆ ماوەی ١ هەفتە، ئەگەر تەحەمولی کرد بڕی دەرمان زیاد دەکرێت لە هەنگاوەکان لە ٤٠ مایکرۆگرام/ کیلۆگرام بۆ لایەنی زۆری ١٢٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٢ جار، بەردەوام نابێت ئەگەر کاردانەوەی نەبوو لە ١ ساڵدا.

## میسیستین: MECYSTEINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Visclair

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Mucolytics

**بەکارهێنان:** بۆ کەمکردنەوەی لینجی بەڵغەم بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ میلی گرام ڕۆژانە ٤ جار بۆ ماوەی ٢ ڕۆژ، پاشان ٢٠٠ میلی گرام ڕۆژانە ٣ جار بۆ ماوەی ٦ هەفتە، پاشان ٢٠٠ میلی گرام ڕۆژانە ٢ جار، منالان ٥ تا ١٢ ساڵ ١٠٠ میلی گرام ڕۆژانە ٣ جار.

## میکلۆریثامین: MECHLORETHAMINE

**ناوی بازرگانی:** Mustargen

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلی گرامی و گیراوە و لۆشن و مەڵهەمی مەوزوعی.

**گروپی دەرمان:** Alkylating agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن لیوکیمیا (CML و CLL) و نەخۆشی هوچکین و شێرپەنجەی سی و شێرپەنجەی خراپ و نەخۆشی سۆریاسس و زۆربوونی خرۆکە سپی یەکان بەکاردێت.




**کاریگەری لاوەکی:** میزی خوێناوی، بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان، تا، لەرز. ئازاری جومگە، زۆربوونی یوریك ئەسید. زەردی، خوێنبەربوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە. برینی دەم، گێژی، سکچوون، هەڵوەرینی موو، پەڵە، کەمبوونەوەی توانای بیستن، بێهێزی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٤ میلیگرام/کیلۆگرام بە یەك بڕ یان ٠,١ میلیگرام/کیلۆگرام بۆ ماوەی ٤ ڕۆژ. دووبارە دەکرێتەوە هەموو ٤ تا ٦ هەفتەیەك.

## میکلیزین: MECLIZINE

**ناوی بازرگانی:** Antivert

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٢,٥ و ٢٥ و ٥٠ و حەبی جوین ٢٥ میلیگرامی و کەپسولی ٢٥ و ٣٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antivertigo

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری لە هێڵنجدان و ڕشانەوە و ڕشانەوەی سەفەر و بۆ تێکچوونی هاوسەنگی و گێژی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی دەم، هیلاکبوون، خەواڵوویی، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ١٢,٥ تا ٢٥ میلی ١ سەعات پێش لە سەفەرکردن، دووبارەکردنەوەی بە بڕی پێویست هەموو ١٢ تا ٢٤ سەعاتێك. بۆ تێکچوونی هاوسەنگی ٢٥ تا ١٠٠ میلیگرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## میدروکسیپروجیسترۆن: MEDROXYPROGESTRONE ACETATE

**ناوی بازرگانی:** Provera, Provera ،Depo

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ و ٥ و ١٠ و ٢٥٠ میلیگرامی و دەرزی ١٥٠ میلیگرام/میلیلیتر و ١٠٠ میلیگرام/میلیلیتر و ١٠٤ میلیگرام/ ١٠,٦٥ میلیلیتر حەبی ١٠٠ و ٢٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری لە سکپڕی و بۆ پێشگری لە گەورەبوونی منداڵدان و بۆ چارەسەری شێرپەنجەی مەمك، بۆ چارەسەری خوێنبەربوونی منداڵدان و بێ عوزری دووەمی و شێرپەنجەی منداڵدان و شێرپەنجەی خانەی گورچیلەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بێخەوی، زەردی، زیادبوونی کێش، خوێنبەربوونی پوکی ددان، سکچوون، کەمبوونەوەی کێش، زیپکە، ئازاری سك، خەمۆکی، خوێنبەربوونی نارێکی منداڵدان، حەساسیەتی مەمك.

...ێن: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی

**بڕی دەرمان:** بۆ بەرگری لەسکپڕی ١٥٠ میلی‌گرام هەر ٣ مانگ ١ جار بە ماسولکەیی IM یان ١٠٤ میلی‌گرام ژێرپێستی هەموو ٣ مانگێك ١ جار، بۆ شێرپەنجەی منالّدان ٤٠٠ تا ١٠٠٠ میلی‌گرام ماسولکەیی IM بەماوەیەکی ١ هەفتەیی پێی دەدرێت، بۆ خوێنبەربوونی منالّدان ٥ تا ١٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە بۆماوەی ٥ تا ١٠ ڕۆژ، دەستپێکردنی لە ڕۆژی ١٦ تا ٢١ سوڕی بێ نوێژی مانگانە. بۆ گەورەبوونی مندالّدان ٥ تا ١٠ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا بۆ ١٢ تا ١٤ ڕۆژ لە ڕۆژی ١ یان ١٦ ی سوڕەکە، بۆ بێ عوزری دووەمی ٥ تا ١٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە بۆ ماوەی ٥ تا ١٠ ڕۆژ. بۆ شێرپەنجەی مندالّدان و شێرپەنجەی خانەی گورچیلەیی ڕۆژانە ٢٠٠ تا ٤٠٠ میلی‌گرام، بۆ شێرپەنجەی مەمك ڕۆژانە ٤٠٠ تا ٨٠٠ میلی‌گرام.

## میفینامیك ئەسید: MEFENAMIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Ponstel,ponstan,dysman

**شێوەی دەرمان:** کەپسول و حەبی ٢٥٠ میلی‌گرام و حەبی ٥٠٠ میلی‌گرامی و سەسپێنشنی ٥٠ میلی‌گرام/٥ میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و تا و ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهابی ڕۆماتیزم و ئیلتیهابی جومگەکان و ئازاری سوك و مامناوەند و ئازاری پاش نەشتەرگەری و ئازاری بێ نوێژی و ئازاری سەری مانگ لە بێ نوێژی دا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، کەمخوێنی، تێکچوونی ئە نزیمەکانی جگەر، سوربونەوە، خەوالّویی، هێلّنجدان، ڕشانەوە، هەوکردنی جگەر، کەمبوونی کێش، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، پەلّە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، دلّەکوتێ، هەوکردنی دەم، هیلاکی، سکچوون، کەمی پەرەی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٣ جار، پاشان ٢٥٠ میلی‌گرام هەر ٦ سەعاتێك، بەپێی پێویست ڕێی پێ دەدرێت. ئاسایی نابێت دەرمان زیاترلە ٧ ڕۆژ بەردەوام بێت.

## میفلۆکوین: MEFLOQUINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Lariam,mephaquin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antimalaria

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی مەلاریای سوك تا مامناوەند و مەلاریایی ڤالسی پاروم و ڤیواکس بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی گەدە، تێکچوونی خەو، هیلاکی، کەمبوونی لێدانی دڵ، سکچوون، ئازاری سك، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، تا، ورێنە، ئازاری سنگ، تێکچوونی بینین، خوران، هەڵوەرینی موو، لەرزین، گێژی، تێکچوونی هەرس، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ حەب بەشێوەی ١ بڕی دەرمان لانی کەم لەگەڵ ٢٤٠ میلی‌لیتر ئاو. بۆ مەلاریایی ڤلسی پاروم و ڤیواکس ٢٥٠ میلی‌گرام خۆراکی ١جار لە هەفتەیەکدا، بۆماوەی ٤ هەفتە و پاشان ٢٥٠ میلی‌گرام خۆراکی ١ هەفتە بە ماماوەندی یان بەلانی کەم ٢٤٠ میلی‌لیتر ئاو، منالّی ١٥ تا ١٩ کیلۆگرام ٠.٢٥ی حەبێك و ٢٠ تا ٣٠ کیلۆگرام نیوەی حەبێك و ٣١ تا ٤٥ کیلۆ ٠.٧٥ی حەبێك و زیاتر لە ٤٥ کیلۆ ١ حەبی خۆراکی.

## میجیسترۆل: MEGESTROL ACETATE

**ناوی بازرگانی:** Megace,apomegestro

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠ میلی‌گرامی و گیراوەی ٤٠ میلی‌گرامی و حەبی ١٦٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی مندالّدان و مەمك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئۆدیما، ئازاری قەفەسەی سنگ، پەڵە، خوران، کۆکە، تەنگەنەفەسی، زیادبوونی کێش، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، هەوکردنی گەروو، زیادبوونی شەکری خوێن، هەوکردنی سی یەکان.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی مەمك ٤٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ٤ جار و شێرپەنجەی ناوپۆشی مندالّدان ٤٠ تا ٣٢٠ میلی‌گرام ڕۆژانە لەبڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ شێرپەنجەی مەمك حەبی ١٦٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار.

## میگلومین ئەنتی مونەیت: MEGLUMINE ANTIMONATE

**ناوی بازرگانی:** Glucantim

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٣٠٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (٥ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** دژی لیشمانیا.

**بەکارهێنان:** دژی لیشمانیاسس (نەخۆشی پێستی و ناوەکی و هەناوی ) بەهۆی لیشمانیاوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبونەوەی پەستانی خوێن، سووربونەوە، بەگرانی هەناسەدان، ئازاری ماسولکە، خوران، کەمخوێنی، ئازاری جومگە، ئازاری قەفەسەی سنگ، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالّان ٥٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ماسولکەیی IM ماوەی ١٠ تا ٥٠ ڕۆژ.



## مكلومین كامپوند: MEGLUMINE COMPOUND

**ناوی بازرگانی:** Gastrografin,urografin

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ٧٦٪ دەرزی ٧٦٪ (٢٠میلی‌لیتر، ١٠٠میلی لیتر) و دەرزی ٦٠٪ (٢٠ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Diagnostic agent

**بەكار هێنان:** بۆ ڕادیۆگرافی دەستگای هەرس بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** كۆكە، ئازار لەشوێنی دەرزی لێدان، فراوانبوونی مولولەكانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ٣٠ تا ٩٠ میلی لیتر لە گیراوەی ٧٦٪ یان ٢٤٠ میلی‌لیتر لەرێی كۆمەوە منالانی ٥ تا ١٠ ساڵ ٦٠ میلی لیتر خۆراكی و منالی بچوكتر لە ٥ ساڵ ٣٠ میلی‌لیتر خۆراكی.

## میلاتۆنین: MELATONIN

**ناوی بازرگانی:** Circadin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Anxiolytic & Hypnotic

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری بێخەوی كورتخایەن بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری سنگ، ئازاری سك، تێكچوونی گەدە، وشكبونەوەی دەم، برینی دەم، خاوی، گێژی، پەڵە، خوران، قەلەقی، غازات، ڕشانەوە، هەوكردنی گەدە، دڵەكوتێ، سەرئێشە، میزی خوێناوی، هەوكردنی گەدە، هەوكردنی پرۆستات، تێكچوونی بینین، كەمی پەرەی خوێن و خرۆكەی سپی.

**بڕی دەرمان:** گەورەكانی سەروی ٥٥ ساڵ، ٢ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار ١ تا ٢ سەعات پێش لە كاتی خەوتن ماوەی تا ١٣ هەفتە، منالانی ١ مانگ تا ١٨ ساڵ سەرەتا ٢ تا ٣ میلی‌گرام، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەكرێت پاش لە ١ تا ٢ هەفتە بۆ ٤ تا ٦ میلی‌گرام لایەنی زۆر ڕۆژانە ١٠ میلی‌گرام.

## میلۆكسیكام: MELOXICAM

**ناوی بازرگانی:** Mobic

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٧,٥ و ١٥ میلی‌گرامی و سەسپێنشنی ٧,٥میلی‌گرام/٥میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەكارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهابی ڕۆماتیزم و هەوكردنی جومگە و هەوكردنی فەقەرەكان بەكاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، سەرئێشە، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، ڤێ، خوران، سوربونەوە، قەبزی، ـزری سك، برینی گەدە، کەمخوێنی، ئازاری پشت، ڕەبۆ، تێکچوونی گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ڕۆژانە ٧,٥ میلیگرام خۆراکی، ئەتوانی بڕی دەرمان زیاد بکەیت بۆ لایەنی زۆر ١٥ میلیگرام.

## میلفالان: MELPHALAN

**ناوی بازرگانی:** Alkeran

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ میلیگرامی و دەرزی ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی هێلکەدان و مەمك و گون و شێرپەنجەی خوێن هوچکین و مالتیپل مایلۆما بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەڵوەرینی موو، خوران، پەڵە، سکچوون، ئیلتیهابی زمان، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** ١٥٠ تا ٢٠٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام خۆراکی بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ، هەموو ٦ هەفتەیەك دوبارەدەکرێتەوە.

## میمانتین: MEMANTINE

**ناوی بازرگانی:** Namenda,ebita

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ٢میلیگرام/میلیلیتر (١٠میلیگرام/٥میلی لیتر) و حەبی ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anti Alzheimer

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێتی توند و مامناوەند لە نەخۆشی ئەلزایمەر( بریتی یە لە نەخۆشی تێکچوونێك لە عەقڵدا و بەهۆی لەناوچونی تەدریجی خانەکانی مێشکەوە لەبەتەمەنەکاندا ڕوودەدات) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڤێ، ورێنە، کۆکە، ئازاری سنگ وجومگە، خاو لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٥ میلیگرام خۆراکی و لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢٠ میلیگرام.

بۆ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی

## مناديول سۆديۆم فۆسفەيت: MENADIOL SODIUM PHOSPHATE

**ناوی بازرگانی:** Menadiol phosphate

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Vitamin

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمی ڤیتامین K بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١٠ تا ٤٠ میلی‌گرام، بڕەکەی ڕێکدەخرێت هەرکاتێك پێویست بێت، منالی ١ تا ١٢ ساڵ ڕۆژانە ٥ تا ١٠ میلی‌گرام بڕەکەی ڕێکدەخرێت هەرکاتێك پێویست بێت، ١٢ تا ١٨ ساڵ ڕۆژانە ١٠ تا ٢٠ میلی‌گرام بڕەکەی ڕێکدەخرێت هەرکاتێك پێویست بێت.

## مینوترۆپین: MENOTROPINS HMG

**ناوی بازرگانی:** Repronex,Humegon,pergonal

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٧٥ یەکەیی (LH) و (FSH).

**گروپی دەرمان:** Hormone

**بەکارهێنان:** هاندەری ڕژێنی جنسی، دژی سکپڕنەبوون و هانی دروستبوونی هێلکە دەدات.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری جومگە، ئازاری ناوسك، زیادبوونی کێش، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا(ئۆدیما).

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ١ ئەمپوڵ، ماسولکەیی ڕۆژانە بۆماوەی ٩ ڕۆژ لایەنی زۆر ١٢ ڕۆژە. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٦ ئەمپوڵە.

## مینثول: MENTHOLE

**ناوی بازرگانی:** Stopain

**شێوەی دەرمان:** کرێم و لۆشن و سپرای.

**گروپی دەرمان:** Topical analgesic

**بەکارهێنان:** دژی ئازاری مەوزوعی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** پەڵە، خوران، سوربونەوە، بەگرانی هەناسەدان، ڕوشانی شوێنی بەکارهێنان.

**بڕی دەرمان:** بە پێی پێویست بە ڕووی ئەو شوێنەدا دەماڵرێت.

## میتنۆل سالیسیلەیت: MENTHOL SALICYLATE

**ناوی بازرگانی:** Vira,Myalgine,Ben gay

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی مەڵهەم.

**گرووپی دەرمان:** Topical analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ هێورکردنەوەی ئازاری ماسولکەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەسایەت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٤ جار.

## میپاکرین: MEPACRINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Mecaprine HCL

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antigiardial

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری جیاردیاسس (نەخۆشی توشبوون بەهۆی مشەخۆری جیاردیا لامبلیا لە ڕیخۆڵە باریکەدا) بەکاردێت

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان، کەمخوێنی، تێکچوونی هەرس. هەوکردنی جگەر، گێژی، ڕشانەوە، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** ١٠٠ میلیگرام هەموو ٨ سەعاتێك بۆ ماوەی ٥ تا ٧ ڕۆژ.

## میپریدین: MEPERIDINE

**ناوی بازرگانی:** Demerol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی و شرووبی ٥٠ میلیگرام/٥میلیلیتر و دەرزی ١٠ و ٢٥ و ٥٠ و ٧٥ و ١٠٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Narcotic analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری مامناوەند و توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ڕشانەوە، هێڵنجدان، پەڵە، تەنگەنەفەسی، قەبزی، گێژی، ڤێ، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، شڵەژان، نەمانی ئارەزووی خواردن، سەرئێشە. وشکبوونەوەی دەم، ئارەقکردنەوە، خوران، لاوازی سێکسی، کەمی میزکردن.



**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ ملیگرام خۆراکی هەموو ٤ سەعاتێك لە کاتێکدا پێویست بێت. یان ٢٥ تا ١٠٠ ملیگرام ژێرپێستی و دەمار و ماسولکەیی هەموو ٤ سەعاتێك لە کاتێکدا پێویست بێت.بە ڕێگەی IV بەردەوام ١٥ تا ٣٥ ملیگرام/سەعاتێکدا.گەورەکان پێش بەنجکردن ٥٠ تا ١٠٠ ملیگرام ماسولکەیی یان ژێرپێستی ٣٠ تا ٩٠ خولەك پێش لە بەنجکردن.بۆ پیرەکان خۆراکی ٥٠ ملیگرام هەموو ٤ سەعاتێك لە کاتێکدا پێویست بێت.٢٥ ملیگرام ماسولکەیی هەموو ٤ سەعاتێك لە کاتێکدا پێویست بێت.

## میفینتێرامین: MEPHENTERMINE SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Wyamine sulfate

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٥ ملیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Vasopressor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شۆك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕشانەوە، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن. دڵەڕاوکێ، ناڕێکی لێدانی دڵ، تەشەنوج، خەواڵوویی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٥ ملیگرام/کیلۆگرام.

## میپیڤاکاین: MEPIVACAINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Carbocaine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٪ (٢٠ملی لیتر) و دەرزی ٣٪ (١,٧ملی لیتر).

**گروپی دەرمان:** local Anesthatic

**بەکارهێنان:** بۆ بێ هۆشکەری مەوزوعی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بینین، نارەقکردنەوە، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ دڵەڕاوکێ، خەمۆکی، ناجێگیری، بێخەوی، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ تا ٤٠ ملیلیتر، لە گیراوەی ١٪ یان ٢ تا ٢٠ ملیلیتر، لە گیراوەی ٢٪ ڕێی پێ دەدرێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٤٠٠ ملیگرامە. منداڵان ٥ تا ٦ ملیگرام/کیلۆگرام.

## میپرۆبامەیت: MEPROBAMATE

**ناوی بازرگانی:** Miletown

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠٠ ملیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anxiolytic



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ماوەکورتی قەلەقی و دڵەڕاوکێ و ناجێگیری و کرژبوونی ماسولکە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی بینین، خەوالّویی، کەمخوێنی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تەشەنوج، تاولەرز.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٠ میلیگرام خۆراکی رۆژانە ٣ تا ٤ جار، لایەنی زۆر ٢٤٠٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. منالانی ٦ تا ١٢ ساڵ ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار لە.

## میپتازینۆڵ: MEPTAZINOL

**ناوی بازرگانی:** Meptid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلیگرامی و دەرزی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Opoid analgesic

**بەکارهێنان:** دژی ئازاری مامناوەند و توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە، ئازاری سك، سکچوون، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکی دەم، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، نارێکی لێدانی دڵ دڵەکوتێ، وڕێنە، گێژی، گیرانی میز.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی خۆراکی ٢٠٠ میلیگرام هەموو ٣ تا ٦ سەعاتێك لە کاتێکدا پێویست بێت. بە دەرزی ماسولکەیی ٧٥ تا ١٠٠ میلیگرام هەموو ٢ تا ٤ سەعاتێك بۆ هێورکەرەوەی ئازار لەکاتی مامانیکردن ١٠٠ تا ١٥٠ میلیگرام بە پێی کێشی لەشی نەخۆشەکە (٢ میلیگرام/کیلۆگرام). بە دەرزی دەماری هێواش ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام هەموو ٢ تا ٤ سەعاتێك ئەگەر پێویست بێت.

## میکیونۆڵ تی: MEQUINOL T

**ناوی بازرگانی:** Solage

**شێوەی دەرمان:** لۆشنی میکیونۆڵ ١٠٪ + تریتینۆین ٠.٠١٪.

**گروپی دەرمان:** Anti solar lentigines

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ڕەشبوونەوەی پێست بەهۆی ڕوناکی خۆرەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، وشکبونەوەی پێست، خوران، سووربونەوە، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٢ جار، بەڕووی ئەو شوێنەدا بماڵرێت.



## میربرۆمین: MERBROMIN

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ٢٪.

**گروپی دەرمان:** Anti infective

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی پێست و برینەکان.

**بڕی دەرمان:** دەست و برین بە دەرمان دژە هەوکردن بکەن.

## مێرکاپتۆپیورین: (٦-PM) MERCARTOPURINE

**ناوی بازرگانی:** Purinethol,puri nethol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antimetabolite

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی خوێن لیوکیمیا (زیادبوونی خڕۆکەی سپی خوێن) لە جۆری لیمفۆبلاستیك و مایلۆبلاستیك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، کەمبوونەوەی خڕۆکەی سپی، کەمخوێنی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی ئارەزووی خواردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢,٥ میلیگرام/کیلۆگرام یان ٨٠ تا ١٠٠ میلیگرام/ مەتردوجا. لایەنی زۆر ڕۆژانە ٥ میلیگرام/ کیلۆگرامە، بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو ڕۆژانە ٢ میلیگرام/کیلۆگرامە. منداڵانی گەورەتر لە ٥ ساڵ ١,٥ میلیگرام/کیلۆگرامە.

## مێرۆپینیم: MEROPENEM

**ناوی بازرگانی:** Merrem IV,Merronem

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠ میلیگرامی و ١ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ناوەوەی سك و هەوکردنی بەکتریایی پەردەکانی مێشك و هەوکردنی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، پەڵە، شۆك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ هەوکردنی ناوەوەی سك ١ تا ٢ گرام بە دەمار هەموو ٨ سەعاتێك،بۆ هەوکردنی پێست ٥٠ میلیگرام بە دەمار هەموو ٨ سەعاتێك، بۆ هەوکردنی بەکتریایی پەردەکانی مێشك ٢ گرام بە دەمار



هەموو ٨ سەعاتێك، منالآنی ٣ مانگ و گەورەتر یان کێشی لە ٥٠ کیلۆگرام کەمتر هەوکردنی ناوەوەی سك ٢٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە دەمار هەموو ٨ سەعاتێك، بۆ هەوکردنی پێست ٢٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە دەمار هەموو ٨ سەعاتێك، بۆ هەوکردنی بەکتریایی پەردەکانی مێشك ٤٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە دەمار هەموو ٨ سەعاتێك، منالآنی زیاتر لە ٥٠ کیلۆگرام بڕی دەرمانی وەکو گەورەکانی بۆ بەکاردێنن، لایەنی زۆر ٢ گرام بە دەمار هەموو ٨ سەعاتێك.

## میسالازین: MESALAZINE

**ناوی بازرگانی:** Asacol,pentasa,mesasal,apresol

**شێوەی دەرمان:** گرانیولّی ١ گرامی و حەبی.E.C ٢٥٠ و ٤٠٠ و ٥٠٠ میلی‌گرامی و حەبی.E.R ٢٥٠ و ٥٠٠ میلی‌گرامی و ئینیمای ٤ گرام/١٠٠میلی‌لیتر و شاف ٥٠٠ میلی‌گرامی و شافی ١٠٠٠ میلی‌گرامی و(delayed release) ٢٥٠ و ٤٠٠ و ٥٠٠ و٨٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Anti inflammatory

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهاباتە و بۆ چارەسەری ئیلتیهابی کۆڵۆنی خۆرەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرگێژبوون، بێهێزی، ئازاری سك، غازات، سکچوون، ئازاری قەفەسەی سنگ، سەرئێشە، ئازاری گوێ و چاو، خەمۆکی، قەبزی، کەمخوێنی، تێکچوونی بینین، لەرز، ئازاری پشت، گێژی، کەمبوونەوەی خرۆکەی سپی، برینی گەدە و دوانزەگرێ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٨٠٠ میلی‌گرام خۆراکی،ڕۆژانە ٣ جار بۆ ماوەی ٦ هەفتە. یان ١ شافی کۆم، ڕۆژانە ٢ جار بۆ ماوەی ٣ تا ٦ هەفتە. بڕی دەرمانی ئینیما، ٤ گرام ڕۆژانە ١ جارە.

## مێسنا: MESNA

**ناوی بازرگانی:** Mesnex,uromitexan

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (٤میلی لیتر) و حەبی ٤٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidote

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری لە خوێنبەربوونی میزەڵدان لەکاتی چارەسەری کیمیایی بە ئایفۆسفامید و سایکلۆفۆسفامید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، کۆکە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری جومگە، خەمۆکی، سکچوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآن کاتێ کە سایلکو فۆسفامايد بەشێوەی دەرزی لێدانی حەملەیی دەماری ئەنجام دەدرێت. لە ٢٠٪ بڕی سایلکوفۆسفامید، لە مێسنا لە ماوەی ١٥ تا ٣٠ خولەك بەدەمار دەرزی لێ دەدرێت و لەهەر جارێك بەکارهێنانی سایلکوفۆسفامید نەبێت ئەم بڕەی مێسنا دوبارەبکرێتەوە.

## میستیرۆلۆن: MESTEROLONE

**ناوی بازرگانی:** Pro Viron

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Male sex hormones and antagonists

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمی ئەندرۆجین و نەزۆکی پیاوان پەیوەست بە هایپۆگنادیسم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** شێرپەنجەی پرۆستات، سەرئێشە، خەمۆکی، خوێنبەربوونی گەدە و ریخۆڵە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، گەورەبوونی مەمك، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری جومگە، زیادبوونی کالسیۆم، کرژبوونی ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** ٢٥ میلی گرام ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار بۆ چەند مانگێك، کەمدەکرێتەوە بۆ ٥٠ تا ٧٥ میلی گرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا بۆ بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو.

## میتاپرۆتیرینۆل: METAPROTERENOL

**ناوی بازرگانی:** Alupent,metaprel

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٠ میلی گرامی و دەرزی ٠.٥ میلی گرام/میلی لیتر و شرووبی ١٠ میلی گرام/٥ میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Bronchodialator

**بەکارهێنان:** بۆ فراوانکردنی بۆرێچکەکانی هەوا و بۆ چارەسەری نەخۆشی ڕەبۆ و تەنگەنەفەسی و نەخۆشی داخستنی موزمینی سی و کرژبوونی بۆری هەوا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، نارێکی لێدانی دڵ وشکبوونەوەی دەم، ئارەق کردنەوە، هێڵنجدان، حەساسیەت، زیادبوونی لێدانی دڵ سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێهێزی، خەواڵویی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی کێشی زیاتر لە ٢٧ کیلۆگرام خۆراکی ٢٠ میلی گرام ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار یان ٠,٥ میلی گرام ماسولکەیی IM ڕێی پێ دەدرێت ئەگەر پێویست بێت، ٣٠ خولەك پاش لە ئەم بڕی دەرمانە ئەتوانرێ کە دووبارەبکرێتەوە. منداڵان کێشی کەمتر لە ٢٧ کیلۆگرام خۆراکی ١٠ میلی گرام ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. منداڵانی بچوکتر لە ٦ ساڵ ٠,٢٥ میلی گرام بە ماسولکەیی ڕێی پێدەدرێت.

## میتارامینۆل: METARAMINOL

**ناوی بازرگانی:** Aramine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Vasocostrictor



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نزمبونەوەی تیژی پەستانی خوێن بەکاردێت

**کاریگەری لاوەکی:** زیاد لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** بە IV ئینفیوشن ١٥ تا ١٠٠ میلیگرام، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بە پێی کاردانەوەکەی. لە حاڵەتی فریاکەوتن بە دەرزی IV ٠,٥ تا ٥ میلیگرام پاشان بە IV ئینفیوشن، ١٥ تا ١٠٠ میلیگرام، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بە پێی کاردانەوەکەی.

## مێتاکسالۆن: METAXALONE

**ناوی بازرگانی:** Skelaxin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٨٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کرژبوونی توندی پەیکەرە ماسولکە وەك (ئازار و برین) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ئازاری گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، تا، لێڵبوونی میز، زەردی، گێژی، خەواڵویی، سەرئێشە، ڕشانەوە، تێکچوونی گەدە، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی ١٢ساڵ و گەورەتر ٨٠٠ میلیگرام خۆراکی ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا.

## مێتفۆرمین: METFORMIN HCL

**ناوی بازرگانی:** Glucophage, Glumetza,orabet

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ و ٨٥٠ و ٧٥٠ و ١٠٠٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ١٠٠ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Hypoglycemic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرە بەکاردێت و ئەبێتەهۆی کەمکردنەوەی ڕێژەی شەکری خوێن و بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ (شەکرەی ناپەیوەست بە ئەنسولین) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، غازات، بێهێزی، ئازاری ماسولکە، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار پاش لە خواردن. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢ گرامە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## میثادۆن: METHADONE HCL

**ناوی بازرگانی:** Dolophine,Methadose,physeptone

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ و ٢٠ و ٤٠ میلیگرامی و دەرزی ٥ و ١٠ میلیگرام/میلیلیتر و پاودەری ١ گرامی و گیراوەی خۆراكی ٢٥ میلیگرام/٥ میلیلیتر و ٥ و ١٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Apotent narcotic analgesic

**بەكارهێنان:** دژی ئازاری توند و سڕكەر و بۆ چارەسەری كۆكە و بۆ چارەسەری ئەوانەی بە هیرۆینەوە موعتادبوون بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** قەبزی، وشكبوونەوەی دەم، پەڵە، لەرزین. كەمبوونەوەی كێش، ئارەقكردنەوە، كەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، خوران، بێخەوی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، كۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا، ئازارلەشوێنی دەرزی لێدانیدا.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ٢,٥ تا ١٠ میلیگرام دەمار یان ماسولكەیی یان ژێرپێستی هەر ٨ تا ١٢ سەعاتێك. یان ٥ تا ١٥ میلیگرام خۆراكی هەموو ٨ سەعاتێك منالآن ٠.١ میلیگرام/كیلۆگرام هەموو ٤ تا ١٢ سەعاتێك ١جار. بۆ منالآن ئەبێت بە وریاییەوە پێی بدرێت. بۆ چارەسەری ئەوانەی بە هیرۆینەوە موعتادبوون گەورەكان بڕی دەرمان بەپێی كەسەكە دەگۆڕێت ١٥ تا ٤٠ میلیگرام ڕۆژانە، خۆراكی ڕێی پێ دەدرێت. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە ٢٠ تا ١٢٠ میلیگرامە.

## میثینامین: METHENAMINE (HIPPURATE,MANDELATE)

**ناوی بازرگانی:** Hiprex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی و ١ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Urinary anti infective

**بەكارهێنان:** دژی هەوكردن بەهۆی ڕێژەیەكی زۆری بەكتریاوە و بۆ هەوكردن و ئیلتیهابی بەشی خوارەوەی ڕێڕەوی میز بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** تێكچوونی هەرس، پەڵە، ئەبێتە هۆی ڕوشانی میزەڵدان و گەدە.

**بڕی دەرمان:** هیپورەیت گەورەكان سەرەتا ١ گرام ٢ جار لەڕۆژێكدا، منالآن ٦ تا ١٢ ساڵ ٠,٥ تا ١ گرام خۆراكی ٢ جار لە ڕۆژێكدا.ماندیلەیت گەورەكان سەرەتا ١ گرام ٢ جار لەڕۆژێكدا، پاش لە خواردن یان لە كاتی خەودا، بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو منالی گەورەتر لە ٢ ساڵ ٥٠ تا ٧٥ میلیگرام/كیلۆگرام لە ڕۆژێكدا خۆراكی ڕۆژانە ٤ جار.

## میثیمازول: METHIMAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Tapazole,favistan,strumazol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ و ٢٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihyperthyroid Agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زۆربوونی پایرۆید و ئاوسانی مل بەهۆی زۆربوونی پایرۆیدەوە (گواتری ژەهری) و ئامادەکاری بۆ نەشتەرگەری لابردنی پایرۆید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هەڵوەرینی موو، ئاوسانی جومگە، خەمۆکی، خوران، خەواڵویی، هێڵنجدان، سکچوون، ڕشانەوە، پەڵە، هەوکردنی پێست، تێکچوونی هەرس، گۆڕانی ڕەنگی پێست، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا.

**بڕی دەرمان:** بڕی دەرمانی سەرەتا ئیعتیماد دەکاتە سەر توندی ١٥ تا ٦٠ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا خۆراکی هەموو ٨ سەعاتێك.بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو ڕۆژانە ٥ تا ١٥ میلی‌گرامە. منداڵان سەرەتا ٠,٤ تا ٠,٧ میلی‌گرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکداخۆراکی هەموو ٨ سەعاتێك. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٥٠ میلی‌گرامە.

## میثوکاربامۆڵ: METHOCARBAMOLE

**ناوی بازرگانی:** Robaxin,skelex,robamol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ و ٧٥٠ میلی‌گرامی و دەرزی ١٠٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (١٠میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** دەبێتەهۆی خاوبوونەوەی پەیکەرە ماسولکە و بۆ چارەسەری گرژبوون و ئازارەکانی پەیکەرەماسولکە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبونەوەی پەستانی خوێن، ڤێ، خوران، تا، سووربونەوە، ڕشانەوە، هێڵنجدان، تەشەنوج، سەرئێشە، سەرگێژبوون، کەمبوونەوەی ئارەزووی خواردن، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٥ گرام ڕۆژانە، ٤ جار بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ. بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو ٤ تا ٤,٥ گرام خۆراکی لەبڕی دەرمانی دابەشکراودا دەبێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی دەرزی، ڕۆژانە ٣ گرامە.

## میثوتریكسەیت: METHOTREXATE

**ناوی بازرگانی:** Rheumatrex,maxtrex ,abitrexate

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ و ٥ و ٧,٥ و ١٠ و ١٥ میلیگرام و دەرزی ٥ و ٢٥ و ٢٠ میلیگرامی و ٥٠ میلیگرامی و ١ گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Anti metabolite

**بەكارهێنان:** دژی شێرپەنجەی خوێن لیوكیمیا، شێرپەنجەی مەمك و سەرو گەردن و سی و دژی سۆریاسی توند و دژی رۆماتیزمی توند و دژی شێرپەنجەی ئێسك بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** هێڵنجدان، رشانەوە، كزكە، تا، هەڵوەرینی موو، برینی ناودەم، ناجێگیری، گێژی، هێڵنجدان، سكچوون، پەڵە، هەوكردنی گەروو، تێكچوونی بینین، هەستیاربوون بە رووناكی، پەككەوتنی گورچیلە، هەوكردنی سی، نەمانی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان بۆ رۆماتیزم ٧,٥ میلیگرام خۆراكی لە هەفتەیەكدا، ١/هەفتە ١ یان ٢,٥ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك بۆ ٣ بڕی دەرمان لە هەفتەیەكدا. سۆریاسس ٢,٥ تا ٥ میلیگرام خۆراكی هەموو ١٢ سەعاتێك لە ماوەی ٣ رۆژ لە هەفتەیەكدا یان ١٠ تا ٢٥ میلیگرام خۆراكی یان ماسولكەیی هەموو هەفتەیەك، موزمین: ١٥ تا ٢٥ میلیگرام ماسولكەیی یان خۆراكی هەموو هەفتەیەك پاشان ١٥ میلیگرام لە هەفتەیەكدا. منالآن ١٠ میلیگرام/مەتر دوجا خۆراكی یان ماسولكەیی هەموو هەفتەیەك، پاشان ٥ تا ١٤ میلیگرام/مەتر دوجا بە یەك بڕ یان دابەشكراو لە ٣ بڕی دەرماندا هەربەشێكی لە ١٢ سەعاتدا كەمدەكرێتەوە لە پیرەكان و لاوازی جگەرو گورچیلەدا.

## میثوكسالین: METHOXSALEN SYSTEMIC

**ناوی بازرگانی:** Uvadex,oxsoralen,meladinine,Utra Mop

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Anti psoriasis،

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری ڤیتیلیگۆ و سۆریاسس (صەدەف یان دروستبوونی پولەكە لەسەر پێست) بەكاردێ ت.

**كاریگەری لاوەكی:** هێڵنجدان، رشانەوە، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، خوران، سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەمۆكی، ئاوی سپی.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان خۆراكی ١٠ تا ٧٠ میلیگرام ٢ تا ٣ جار لە هەفتەیەكدا، ڤیتیلیگۆ ٢٠ تا ٣٠ میلیگرام ٢ تا ٣ جار لە هەفتەیەكدا. ماوەی نێوان ٢ ژەمی حەب نەبێت ٤٨ سەعات بێت.

## میثۆکسالین: METHOXSALEN TOPICAL

**ناوی بازرگانی:** Oxsoralen Lotion

**شێوەی دەرمان:** لۆشن.

**گروپی دەرمان:** Anti vitiligo

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ڤیتیلیگۆ (پەڵەی سپی یان زەردباو کەلەسەر پێست دەردەکەوێت) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبونەوە و سوربونەوەی پێست، خوران، بلۆقکردنی پێست.

**بڕی دەرمان:** بڕێکی کەم لە لۆشن بەڕووی ئەو شوێنەدا بھاڵرێت.

## مەثیل سیلیلۆز: METHYL CELLULOSE

**ناوی بازرگانی:** Cellothyl,celevac

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گرانیولْ

**گروپی دەرمان:** Laxative

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری قەبزی موزمن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، داخستنی ڕیخۆڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ کەوچکی سوپخۆری، لە ٢٤٠ میلی‌لیتر ئاودا و لایەنی زۆر ڕۆژانە ٣ جار.منالآن نیو کەوچکی سوپخۆری، لە ١٢٠ میلی‌لیتر ئاودا ولایەنی زۆر ڕۆژانە١ تا ٣ جار.

## مەثیل دۆپا: METHYLDOPA

**ناوی بازرگانی:** Aldomet,dopamet,novomedopa

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٢٥ و ٢٥٠ و ٥٠٠ میلی‌گرامی و دەرزی ٢٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەوکردنی دەم، سکچوون، گیرانی لوت، نەمانی ئارەزوی سێکس، سەرئێشە، بێهێزی، خەمۆکی، سەرگێژبوون، کەمبوونەوەی لیدانی دڵ ئۆدیما، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، کەمخوێنی، پەڵە، وشکی دەم، ئازاری ماسولکە و جومگە، ئازاری دڵ گەورەبوونی مەمك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٢٥٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار بە تەدریجی زیاد دەکرێت لانی کەم لە ماوەی ٢ ڕۆژدا، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣ گرامە.پیرەکان سەرەتا ١٢٥ میلی‌گرام ڕۆژانە ٢ جار، بە تەدریجی زیاد دەکرێت، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢ گرامە. منالآن ١٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام لە ٢ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا ڕێی پێ دەدرێت.لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٦٥ میلی‌گرام/کیلۆگرامە.



## مەثیلین بلو: METHYLENE BLUE

**ناوی بازرگانی:** Urolene blue

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (١٠میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antidote

**بەکارهێنان:** دژی ژەهراویبوون بە سیانید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری سك، سەرئێشە، سەرگێژبوون، گۆڕانی ڕەنگی میز، هەستیاری بەڕوناکی، ئارەق کردنەوە، زۆر لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآن ١ تا ٢ میلی‌گرام/کیلۆگرام بەدەماری لە ماوەی ٥ خولەك ڕێی پێ دەدرێت، ئەگەر پێویست بێت ئەتوانی ١ سەعات دواتر، کە ئەم بڕی دەرمانە دیسان دوبارە بکرێتەوە. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٧ میلی‌گرام/کیلۆگرامە.

## مەثیلیرگۆنۆڤین: METHYLERGONOVINE MALEATE

**ناوی بازرگانی:** Methergine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,١٢٥ میلی‌گرام و دەرزی ٠,٢ میلی‌گرام/میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** Ergot alkaloid

**بەکارهێنان:** هاندەری منداڵدانە و بۆ کۆنترۆڵی خوێنبەربوونی پاش لە زایەندی و لەبارچوونی کۆرپەلە بۆ پێشگری و چارەسەری خوێنبەربوونی پاش لە زایەندی بەهۆی بێهێزی منداڵدانەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، گێژی، ئازاری قەفەسەی سنگ، ئازاری سك، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، لاوازی قاچەکان، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوران، ئارەقکردنەوە، زیادبوونی حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان خۆراکی ٠,٢ میلی‌گرام ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار لایەنی زۆر تا ١ هەفتە ڕێی پێ دەدرێت. ٠,٢ میلی‌گرام ماسولکەیی یان دەمار هەر ٢ تا ٤ سەعات، لایەنی زۆر تا ٥ ڕۆژ ڕێی پێ دەدرێت.

## مەیثل فینیدەیت: METHYLPHENIDATE HCL

**ناوی بازرگانی:** Ritalin,Equasym,stimulate,rubifen

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلی‌گرامی و حەبی ٢٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** CNS stimulant



**بەکارهێنان:** هاندەری ئاوەندە کۆئەندامی دەمارە و بۆ چارەسەری خەواڵویی توند (نارکۆلیپسی) و کەمی ئاگاداری و هۆشیاری و فرەبزێوی منداڵان (ADHD) ڕوودەدات.

**کاریگەری لاوەکی:** زۆر لێدانی دڵ، گێژی، تەشەنوج، بێخەوی، ئازاری سنگ، نارێکی لێدانی دڵ، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکان، هێڵنجدان، ئازاری سك، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** منالانی زیاتر لە ٦ ساڵ ڕۆژانە ٥ تا ١٠ ملیگرام ڕێی پێ دەدرێت.بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٢ میلی گرام/کیلۆگرامە یان ڕۆژانە ١٠ تا ٢٠ ملیگرام. بڕی دەرمانی ڕۆژانە نابێت زیاتر لە ٦٠ ملیگرام بێت.

## مەثیل پردنیزولون: METHYLPREDNISOLONE

**ناوی بازرگانی:** Medrol,DepoMedrol,Depoject,Ldepopred

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠ ملیگرامی و گیراوەی خۆراکی ٤ ملیگرام/ملیلیتر، ١٥ ملی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهاباتی توند و ئازار و ڕۆماتیزم و تای ڕۆماتیزمی و حەساسیەتی توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادبوونی شەکری خوێن، زیپکە، پەڵە، ئاوی سپی، هەوکردنی جومگە، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، برینی هەرس، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، بێخەوی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ تا ٨٠ ملیگرام ڕۆژانە ماسولکەیی IM، منالان ڕۆژانە ٠,١١٧ ملیگرام/کیلۆگرام ماسولکەیی IM هەر ٣ ڕۆژ ١ جار.

## مەثیلسالیسیلەیت: METHYL SALICYLATE

**ناوی بازرگانی:** Rub ،Argesic,Rheumax,therm

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی مەوزوعی ٣٠٪.

**گروپی دەرمان:** Analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهاب و ئازاری مەوزوعی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، پەڵە، سوتانەوە.

**بڕی دەرمان:** بەبڕی تەواو بەڕووی ئەو شوێنەدا بماڵرێت ٢ تا ٣ جار لەڕۆژێکدا.



## میثیسیرجید: METHYSERGIDE

**ناوی بازرگانی:** Snsert,deseril

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی حەب.

**گروپی دەرمان:** Anti migraine

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری لە سەرئێشەی مایگرەین(شەقیقە) و کلاستەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، گێژی، خەواڵویی، بێخەوی، پەڵە – سکچوون، قەبزی، دڵەکزە، ئازاری سک، زیادبوونی کێش، ئازاری جومگە و ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٤ تا ٨ میلی‌گرام خۆراکی لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا لەگەڵ خواردندا.

## مەثیل تێستۆستیرۆن: METHYL TESTOSTERONE

**ناوی بازرگانی:** Android,virilon,testred

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Androgen

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی مەمك لە ژنان و ئازارو پڕخوێنی پاش لە زایەندی و بێ توانایی کاری جنسی و بۆ ئەو منداڵە کوڕانەی باڵغبوونیان دواکەوتووە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری گەدە و ئێسك، زیادبوونی کێش، سکچوون، ڕشانەوە، قەبزی، زیادبوونی کالسیۆم، گەورەبوونی مەمك، ئۆدیما، سەرئێشە، خەمۆکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥ میلی‌گرام ٤ جار لە ڕۆژێکدا بۆماوەی ٥ ڕۆژ. بۆ ئەو منالە کوڕانەی باڵغبوونیان دواکەوتووە ٥ تا ٢٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام بۆ ماوەی ٤ تا ٦ مانگ.

## میتیپرانۆلۆل: METIPRANOLOL

**ناوی بازرگانی:** Optipranolol,minims metipranolol

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاوی ٠,١٪ و ٠.٣٪.

**گروپی دەرمان:** Beta-blocker

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندنی پەستانی ناوەوەی چاو بەهۆی ئاوی ڕەشی (گلوکۆما) چاوی گۆشەی کراوە یان بەهۆی بەرزبوونەوەی پەستانی چاوەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بینین، سوتانەوە، وشکبوونەوە و خورانی چاو، ئازاری سنگ، ناڕێکی لێدانی دڵ، سوربونەوە، پەڵە، ئارەقکردنەوە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ جار بەکاردێت.

## مێتوکلۆپرامید: METOCLOPRAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Reglan,plasil,Clopra,gastromax,maxolon

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلیگرامی و دەرزی ٥ میلیگرام/میلیلیتر (٢ میلی لیتر) و قەترەی خۆراکی ٤ میلیگرام/میلیلیتر (١٥میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antiemetic

**بەکارهێنان:** دژی هێڵنجدان و ڕشانەوە، بۆ پێشگری ڕشانەوە بەهۆی چارەسەری کیمیایی و گەڕانەوەی ترشەڵۆکی گەدە بەرەو سورێنچك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، سەرئێشە، سکچوون، زیاد لێدانی دڵ دڵەڕاوکێ، ناجێگیری، بێهێزی، پەڵە، تا، گرژبوونی ماسولکە، خەواڵویی، خەمۆکی، خوران، ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** بۆ گەڕانەوەی ترشەڵۆکی گەدە بەرەو سورێنچك گەورەکان ١٠ تا ١٥ میلیگرام خۆراکی، ڕۆژانە ٤ جار ٣٠ خولەك پێش لەهەر ژەمێکی خواردن. بۆ ڕشانەوە گەورەکان ١٠ میلیگرام خۆراکی، منداڵان ٠,٠٣ تا ٠,١ میلیگرام/ کیلۆگرام، هەر ٨ سەعاتێك لایەنی زۆری بڕی دەرمان لە منداڵاندا ٠,٥ میلیگرام/کیلۆگرامە.

## میتریزامایدە: METRIZAMIDE

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٣,٧٥ میلیگرام

**گروپی دەرمان:** Diagnostic agent

**بەکارهێنان:** مادەی تەشخیصی بۆ ڕادیۆگرافی لە مۆخ و دەماری ناوەندی و کەمەر.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، سوربونەوە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ تا ١٥ میلیگرام، منداڵان ٢ تا ١٠ میلیگرام.

## میتۆلازۆن: METOLAZONE

**ناوی بازرگانی:** Zaroxolyn

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ و ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبوونەوەی پەستانی خوێنی سوك و مامناوەند و ئۆدیما بەکاردیت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکبوونەوەی دەم، نارێکی لێدانی دڵ، ئازار و لاوازی ماسولکە، ئازاری سنگ، کەمبوونی میزکردن، سەرئێشە، گێژی، ئازاری جومگە، سووربوونەوە و بلۆقکردن و پەڵەی پێست، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** بۆ پەستانی بەرزی خوێن سەرەتا ڕۆژانە ٥ میلیگرام لە بەیانیاندا. بۆ ئۆدیما(کۆبوونەوەی ئاو لە لەشدا) ڕۆژانە ٥ تا ١٠ میلیگرام لە بەیانیاندا و زیاد دەکرێت بۆ ٢٠ میلیگرام و لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٨٠ میلیگرامە.

## مێتۆپرۆلۆل سەکسینەیت: METOPROLOL SUCCINATE

**ناوی بازرگانی:** Betaloc,topral XL,lopressor,metoral

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ و ٢٠٠ میلیگرامی و دەرزی ١ میلیگرام/میلیلیتر (٥ میلی لیتر).

**گرووپی دەرمان:** Beta-blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری سنگ و بۆ پێشگری لە شەقیقە و خوێنلێبڕانی تیژی ماسولکەیی دڵ و نارێکی لێدانی دڵ و زیادبوونی هۆرمۆنی پایرۆید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێخەوی، گێژی، هیلاکبوون، نارێکی لێدانی دڵ خەمۆکی، خەواڵویی، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، غازات، کرژبوونی بۆری هەوا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام ڕۆژانە بەیەك بڕ یان لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٤٠٠ میلیگرامە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## میترۆنیدازۆل: METRONIDAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Flagyl,metrozol,satric,femazole,mertyl

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی وحەبی ژنانە ٥٠٠ میلیگرام جێڵی مەوزوعی و ژنانە ٠,٧٥٪ و شەربەتی خۆراکی ١٢٥ میلیگرام/٥میلی لیتری و شافی ژنانە ٥٠٠ میلیگرامی و گیراوەی ئینفیوشنی ٥ میلیگرام/میلیلیتر (١٠٠میلی لیتر).

**گرووپی دەرمان:** Anti-protozoa,bacteria

**بەکارهێنان:** دژی بەکتریا و کرم و ئەمیبا، بۆ پێشگری لە هەوکردنی نە شتەرگەری و برینی گەدە و بۆ چارەسەری جیاردیاسس و تریکۆمۆنیاسس و ئەمیبیای ڕیخۆڵەیی و ئەمیبیای جگەری بەکاردێت. بۆ چارەسەری



هەوکردن و ئیلتیهاب و خراپبوونی ددانەکان و سکچوون و هەوکردنی پەردەی دڵ و مێشك و هەوکردنی جومگە و ئێسك و هەوکردنی زایەندی ژنان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، سەرگێژبوون، حەمۆکی، هیلاکبوون، بێهێزی، تەشەنوج، بێخەوی، خوران، قەبزی، سکچوون، وشکی دەم، گیرانی لوت، گەورەبوونی مەمك، ئۆدیما، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان خۆراکی ۲۵۰ تا ۷۵۰ میلیگرام ڕۆژانە ۳ جار بۆ ماوەی ٥ تا ۱۰ ڕۆژ. منالآن ٥ تا ٥٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ۳ جار بۆ ماوەی ٥ تا ۱۰ ڕۆژ.

## میتیراپۆن: METYRAPONE

**ناوی بازرگانی:** Metopirone

**شێوەی دەرمان:** کەپسول و حەبی ۲٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Diagnostic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی کوشینگ (Cushing) و تەشخیصی کەمی کاری هیپۆفیز و فەحصی تەشخیصی پەککەوتنی ڕژێنی ئەدرینالٓ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ناڕێکی لێدانی دڵ پەلە، ڕشانەوە، سەرئێشە، هێڵنجدان، سەرگێژبوون، حەساسیەت، ئازاری سك، زۆربوونی موو.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی کوشینگ گەورەکان ۲٥٠ میلیگرام تا ٦ گرام، هەر ٤ سەعاتێك لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، بۆ فەحصی تەشخیصی پەککەوتنی ڕژێنی ئەدرینالٓ گەورەکان ۱۰ تا ۱٥ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە دابەشکراو لە هەر ٤ سەعاتێکدا و بۆ ماوەی ٦ ڕۆژ. منالآن ۱٥ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە دابەشکراو لە هەر ٤ سەعاتێکدا.

## میکسیلیتین: MEXILETINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Mexitil

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ۱۰۰ و ۱٥٠ و ۲۰۰ و ۲٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anti-arrhythmic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ناڕێکی لێدانی سکۆڵەیی دڵ و زیاد لێدانی سکۆڵەیی و نەخۆشی شەکرەی گورچیلەیی بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، گێژی، دووبینی، هیلاکبوون، سەرئێشە، بێهێزی، خەمۆکی، ئازاری قەفەسەی سنگ، توڕەیی، سەرگێژبوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۲۰۰ میلیگرام هەر ۸ سەعات ڕێی پێ دەدرێت. بەپێی پێویست ئەتوانی هەر ۸ سەعاتێك، کە بڕی دەرمان ۵۰ تا ۱۰۰ میلیگرام زیادبکەیت. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ۱۲۰۰میلیگرامە.

## میانسیرین: MIANSERIN HCL

**ناوی بازرگانی:** Mianserin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ۱۰ و ۳۰ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی خەمۆکی بەتایبەتی کاتێك هێورکەرەوەی پێویستە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، زیاد لێدانی دڵ، ئازاری جومگە، تێکچوونی خەو، هەوکردنی جومگە، زەردی، ئۆدیما، گۆڕانی ECG، گێژی، خرۆشان، خەواڵویی، وڕێنە، قەڵەقی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ۱۸ ساڵ، سەرەتا ۳۰ تا ٤٠ میلیگرام (پیرەکان ۳۰ میلیگرام) ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا یان وەك یەك بڕی دەرمان لە کاتی خەودا، بە تەدریجی زیاد دەکرێت لە کاتێکدا پێویست بێت، ڕێژەی بڕی دەرمانی ئاسایی ۳۰ تا ۹۰ میلیگرامە.

## میکافه نجین: MICAFUNGIN

**ناوی بازرگانی:** Mycamine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی IV ئینفیوشنی ۵۰ و ۱۰۰ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی بەهۆی کاندیدا و هەوکردنی کاندیدای سورێنچکی و هەوکردنی کاندیدا لەچاندنی مۆخی ئێسکدا و بۆ پێشگری لە هەوکردنی کەڕوویی کاندیدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، سەرئێشە، تا، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم و کالسیۆم و مەگنسیۆم، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خڕۆکەی سپی و پەرەی خوێن، پەڵە، هەوکردنی خوێنهێنەر، تێکچوونی گەدە، قەبزی، گەورەبوونی جگەر، نەمانی ئارەزوی خواردن، نارێکی لێدانی دڵ، سووربوونەوە، تێکچوونی خەو، گێژی، لەرزین، نارەقکردنەوە، گۆڕانی پەستان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۱۰۰ تا ۲۰۰ میلیگرام ڕۆژانە ۱ جار.

**مایکۆنازول:** MICONAZOLE TOPICAL

**ناوی بازرگانی:** dactarin,micatin ،Dactarin,gyno

**شێوەی دەرمان:** کرێمی مەوزوعی ٢٪.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی کەرووی مەوزوعی و کاندیدیازی پێستی و کەچەڵی سەر و لاشە و قاچ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سووربونەوە، هیلاکی، پەڵە. خوران، هەوکردنی پێستی، سوتانەوە.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٢ جار بۆماوەی ٢ تا ٤ هەفتە.

**مایکۆنازول:** MICONAZOLE VAGINAL

**ناوی بازرگانی:** Micatin

**شێوەی دەرمان:** کرێمی ژنانە ٢٪.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی کەرووی کاندیدیازی زایەندی ژنان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەوکردنی پێست، سووربونەوە، سوتانەوە، خوران، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** ١ ئەپلیکاتور، ڕۆژانە ١ جار کاتی خەوتن ڕێی پێ دەدرێت. ماوەی چارەسەر ٧ ڕۆژە.

**میدازۆلام:** MIDAZOLAM HCL

**ناوی بازرگانی:** Durmicum,versed,hypnovel

**شێوەی دەرمان:** شروبی ٢ میلیگرامی و دەرزی ٥ میلیگرام/میلیلیتر، ١ میلیگرام (هایدرۆکلۆریك) و دەرزی ٥ میلیگرام/میلیلیتر، ٢ میلیلیتر (هایدرۆ کلۆریك) و دەرزی ٥ میلیگرام/میلیلیتر، ٣ میلیلیتر (هایدرۆکلۆریك) و دەرزی ١ میلیگرام/ میلیلیتر،٥ میلیلیتر (هایدرۆکلۆریك).

**گروپی دەرمان:** Benzodiazepine , sedative

**بەکارهێنان:** هێورکەرەوە و خەوهێنەرە و دەرمانی یارمەتیدەرە لە بێهۆشی دا و بۆ پێشگرتن لە دڵەڕاوکێی پێش لەنەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی بینین، ق، سەرئێشە، گێژبوون، بەگرانی هەناسەدان، زیادبوونی لێدانی دڵ، دابەزینی زەخت، خوران، پەڵە، کرژبوونی بۆری هەوا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٠٤ تا ٠,٠٣٥ سەعاتێك پێش لە نەشتەرگەری، بە ماسولکەییIM ڕێی پێ دەدرێت.



## میدۆدرین: MIDODRINE

**ناوی بازرگانی:** Proamatine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ و ٥ و ١٠ میلی‌گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Vasopressor

**بەکارهێنان:** ئەبێتە هۆی بچوکبوونەوەی مولولەکانی خوێن و بۆ چارەسەری نزمبوونەوەی پەستانی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ئازار، لەرز، گێژی، خەوالّویی، خوران، پەلّە، بەرزبوونەوەی پەستان، هێلّنجدان، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، تێکچوونی بینین، وشکبوونەوەی دەم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلی‌گرام خۆراکی ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## میفیپریستۆن: MIFEPRISTONE

**ناوی بازرگانی:** Mifeprex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلی‌گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Anti، progestin

**بەکارهێنان:** لەگەلّ میزۆپرۆستۆلّ یان پرۆستاگلاندینەکانی تر بەکاردێت کە هانی لەبارچوون دەدات ئەگەر لە یەکەم ٧ هەفتەی سکپڕیدا وەربگیرێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کرژبوونی گەدە و ڕیخۆلّە، خوێنبەربوونی زایەندی ژنان، پەلّە، هێلّنجدان، شەرا، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، تا، گێژی، لەرز، ڕشانەوە، سکچوون، هیلاکی، ئازاری پشت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژی یەکەم ٦٠٠ مایکرۆگرام خۆراکی بەیەك بڕ ڕۆژی ١ جار. ڕۆژی سێ یەم ٤٠٠ مایکرۆگرام خۆراکی.

## میگلیتۆلّ: MIGLITOL

**ناوی بازرگانی:** Glyset

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ میلی‌گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Hypoglycemic

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆلّکردنی شەکری خوێن و بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك، غازات، سکچوون، بەگرانی هەناسەدان – پەلّە، ئاوسان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٢٥ میلی‌گرام خۆراکی ٣ جار لە ڕۆژێکدا، بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٥٠ تا ١٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٣ جار.



## میگلوستات: MIGLUSTAT

**ناوی بازرگانی:** Zavesca

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** AntiGaucher

**بەکارهێنان:** بۆ کەمکردنەوەی دروستبوونی پرۆتینی گلوکۆسیلسیرامید لەلەشدا و بۆ چارەسەری نەخۆشی بۆماوەیی سوك و مامناوەندی (١ Gaucher) بریتی یە لە نەمانی ئەنزیم بۆ تێکشکاندنی گلوکۆسیلسیرامید لەلەشدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، کەمبوونی کێش. نەمانی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، غازات، گێژی، قەبزی، ئازاری سك، ئازاری ماسولکە، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠ میلیگرام خۆراکی ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## میلرینۆن: MILRINONE

**ناوی بازرگانی:** Primacor

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١ میلیگرام/میلیلیتر (١٠میلی لیتر) و گیراوەی دەرزی ١ میلیگرام/میلیلیتر (٢٠میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Inotropic , Vasodilator

**بەکارهێنان:** موولولەکانی خوێن فراوان دەکات و بۆ چارەسەری ماوەکۆتای لە پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو بەکاردێت. ئەبێتەهۆی کرژبوونی دڵە ماسولکە و دوو جۆرە (positive inotropic) هانی کرژبوونی دڵە ماسولکە دەدات و ئەبێتەهۆی زیادبوونی لێدانی دڵ و (negative inotropic) کرژبوونی دڵەماسولکە کەمدەکاتەوە و ئەبێتە هۆی کەمبوونەوەی لێدانی دڵ.

**کاریگەری لاوەکی:** ناڕێکی لێدانی دڵ، زیادکردنی لێدانی دڵ، سنگەکوژێ، دابەزینی پەستانی خوێن، ئازاری قەفەسەی سنگ، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام بەدەمار، لە ماوەی ١٠ خولەکدا ڕێی پێ دەدرێت. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٠,٣٧٥ تا ٠,٧٥ میلیگرام/کیلۆگرام لە خولەکێکدا، بە IV ئینفیوشن بەردەوام دەبێت. لایەنی زۆر بڕی دەرمان ١,١٣ میلیگرام/کیلۆگرامە.



## مینەراڵ ئۆیل: MINERAL OIL

**شێوەی دەرمان:** Emulsion ٪٥٠

**گرووپی دەرمان:** Laxative

**بەکارهێنان:** ڕەوانکەرەو بۆ لابردنی قەبزی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، وشکبوونەوەی دەم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بەڕێگەی خۆراکی ١٥ تا ٤٥ میلیگرام لە ڕۆژێکدا لە کاتی خەوتن. منداڵان خۆراکی ١٠ تا ١٥ میلیگرام لە ڕۆژێکدا.

## مینۆسایکین: MINOCYCLINE

**ناوی بازرگانی:** Dynacin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ٧٥ و ١٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ٥٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردن بەهۆیی گرامپۆزەتیف و نێگەتیڤکانەوە بەکاردێت وەك هەوکردنی ڕێڕەوی هەناسەدان و میزەڕۆ و زیپکە و هەوکردنی پێست و گرانەتاو نەخۆشی ئەمیی ڕیخۆڵەکان.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، گێژی، تێکچوونی هاوسەنگی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك.

## مینۆکسیدیل: MINOXIDIL

**ناوی بازرگانی:** Loniten,Regaine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Vasodilator, Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێنی توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، گەورەبوونی مەمك، تەنگەنەفەسی، گۆڕانی ECG، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا، پەڵە، زیادبوونی کێش، ڕشانەوە، زیاد لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٥ میلیگرام، خۆراکی بە شێوەی یەك بڕی دەرمان. بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو ڕۆژانە ١٠ تا ٤٠ میلیگرامە. منداڵانی بچوکتر لە ١٢ساڵ ٠,٢ میلیگرام/کیلۆگرام (لایەنی زۆر ٥ میلیگرامە) ڕۆژانە بەیەك بڕ، لایەنی زۆر بڕی دەرمانی ڕۆژانە لەمنداڵاندا، ٥٠ میلیگرامە.



## مینۆكسیدیل: MINOXIDIL TOPICAL

**ناوی بازرگانی:** Apo، gain,rogaine

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی مەوزوعی ٢٪ و ٣٪ و ٤٪ و ٥٪.

**گروپی دەرمان:** Hair growth stimulant

**بەكارهێنان:** دژی هەڵوەرینی مووی سەرە، هانی گەشەی مووی سەر دەدات و بۆ چارەسەری هەڵوەرینی مووی سەری ئەندرۆجینی بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** سەرئێشە، هیلاكبوون، خەمۆكی، دڵەڕاوكێ، كۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا، ئازاری قەفەسەی سنگ، نارێكی لێدانی دڵ هەوكردنی پێست، خوران، وشكبوونەوەی پێست، زیادبوونی حەساسیەت، سكچوون، هەوكردنی ڕێڕەوی میز، هەوكردنی بۆڕیچكەكان، نەتوانینی كاری جنسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ١ میلیلیتر ڕۆژانە ٢ جار، ڕووی ئەو شوێنەی پێ بماڵرێت.

## میرتازاپین: MIRTAZAPINE

**ناوی بازرگانی:** Remeron

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥ و ٣٠ و ٤٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری خەمۆكی بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** وشكبوونەوەی دەم، خەواڵویی، قەبزی، زیادبوونی كێش، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ١٥ میلیگرام خۆراكی ١ جار لە ڕۆژێكدا لەكاتی خەودا. لایەنی زۆری ٤٥ میلیگرامە لە ڕۆژێكدا لەكاتی خەودا.

## میزۆپرۆستۆڵ: MISOPROSTOL

**ناوی بازرگانی:** Cytotic,napratec

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٢٠٠ مایكرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Prostaglandin analogue

**بەكارهێنان:** بۆ بەرگری لە برینی گەدە بەكاردێت، كە بەهۆی (NSAID)ەكانەوە دروست دەبێت بۆ چارەسەری برینی دوانزەگرێ و گەدە بەكاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، سەرئێشە، قەبزی، ئازاری بێ نوێژی، خوێنبەربوون پاش لە لەحەیزچونەوە، تێکچوونی بێ نوێژی، غازات.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ مایکرۆگرام خۆراکی هەر ٦ سەعاتێك لەگەڵ خواردن و بەکاتی خەودا لە نەخۆشانێك کەتوانای تەحەمولی ئەم بڕی دەرمانەیان نی یە ئەتوانی کە بڕی دەرمان بۆ ١٠٠ مایکرۆگرام ٤ جار لە ڕۆژێکدا کەمبکەیتەوە، بۆ برینی گەدە و دوانزەگری گەورەکان ١٠٠ تا ٢٠٠ مایکرۆگرام لە ڕێگەی خۆراکی هەر ٦ سەعاتێك لەگەڵ خواردندا، بۆ ماوەی ٤ تا ٨ هەفتە.

## میثرامایسین: MITHRAMYCIN

**ناوی بازرگانی:** Mithracin,mitramyc II

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢,٥ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic, anticancer

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی هێلکەی گون و بۆ چارەسەری زیادبوونی کالسیۆمی خوێن و زیادبوونی توندی کالسیۆمی میز و لابردنی کالسیۆمی میز بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، تێکچوونی گورچیلە، تێکچوونی ئەلیکترۆلیتی لەش، سکچوون، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** ١٥ تا ٢٥ مایکرۆگرام/ کیلۆگرام کێشی لەش.

## میتۆمایسین: MITOMYCIN

**ناوی بازرگانی:** Mutamycin

**شێوەی دەرمان:** پاودەری دەرزی ٢ و ٥ و ١٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** ڕێ لەگەشەی خانە شێرپەنجەیی یەکان دەگرێت و دژی شێرپەنجەی گەدە و مەمك و پەنکریاس و کۆلۆن و سی و جگەر و سەر و گەردن و شێرپەنجەی میزەڵدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی ئیشی گورچیلە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکان، هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەڵوەرینی موو، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالان ١٠ تا ٢٠ میلی گرام/مەتردوجا ١ جار لە ڕێگەی دەمارەوە و هەر ٦ تا ٨ هەفتە ١ جار دوبارە دەکرێتەوە.



## میتۆتان: MITOTANE

**ناوی بازرگانی:** Lysodren

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلی‌گرامی

**گرووپی دەرمان:** .Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەکانی ڕژێنی سەر گورچیلە (adrenal cortex) کە شایانی نەشتەرگەری نی یە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمخوێنی، هەوکردنی پێست، پەڵە، ئازاری جومگە، زیادبوونی لیك، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، دابەزینی پەستان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٢ تا ٦ گرام، لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا ٣ تا ٤ جار لەڕۆژێکدا.

## میتۆکسانترۆن: MITOXANTRONE

**ناوی بازرگانی:** Novantrone,onkotrone

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢ میلی‌گرام/میلی لیتر(١٠ میلی لیتر).

**گرووپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەندێ جۆری شێرپەنجەی وەك شێرپەنجەی مەمك و شێرپەنجەی خوێن لیوکیمیا و شێرپەنجەی ناهوجکین لیمفۆما و بۆ چارەسەری فرەڕەقبوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، تا، هەڵوەرینی موو، خوێنبەربوونی گەدە، ڕشانەوە، نارێکی لێدانی دڵ، تەنگەنەفەسی، سکچوون، ئازاری سك، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٤ میلی‌گرام/مەتردوجا بە دەمار IV، بە شێوەی یەك بڕی دەرمان. ئەم دەرمانە هەر ٢١ ڕۆژێك دووبارەدەکرێتەوە، بۆ فرەڕەقبوون ١٢ میلی‌گرام/مەتردوجا هەر ٣ مانگ ١ جار.

## میڤاکیوریۆم کلۆراید: MIVACURIUM CHLORIDE

**ناوی بازرگانی:** Mivacron

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** خاوکەرەوەی پەیکەرەماسولکەیەو وەك یارمەتیدەر لە بەنجی عمومی و بۆ ئاسان تێخستنی لوولە بۆ ناوەوەی قورقوڕاگە و فەراهەمکردنی کشانی پەیکەرەماسولکە لە کاتی نەشتەرگەری یان هەواگۆڕکێی میکانیکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نارێکی لێدانی دڵ، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، سوربونەوە، زیادبوونی لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، پەڵە، کرژبوونی بۆری هەوا، ناتەواوی هەناسە، وەستانی هەناسە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ئاسایی ٠,١٥ میلی گرام/کیلۆگرام بەدەمار IV لە ماوەی ٥ تا ١٥ چرکەدا،منالآن ٠,٢ میلی گرام/کیلۆگرام بەدەمار IV لە ماوەی ٥ تا ١٥ چرکەدا.

## میزۆلاستین: MIZOLASTINE

**ناوی بازرگانی:** Mizollen

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** دژی حەساسیەتەو بۆ چارەسەری نیشانەکانی حەساسیەت وەك پوشەتا و شەرا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** قەلەقی، خەوالّویی، سەرئێشە، گیرانی میز، وشکی دەم، تێکچوونی بینین، ئازاری جومگە و ماسولکە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، دڵەکوتێ، گێژی، خەمۆکی، تێکچوونی خەو، تێکچوونی هەرس، لەرزین، پەڵە، کرژبوونی بۆری هەوا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی سەروی ١٢ ساڵ ١٠ میلی گرام ڕۆژانە ١ جار.

## مۆکلۆبیمایدە: MOCLOBEMIDE

**ناوی بازرگانی:** Maclamine,aurorix,manerix

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥٠ و ٣٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خەمۆکی و نەمانی ئارەزوی خواردن و پرخۆری عصبی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، سەرئێشە، خرۆشان، بێخەوی، ناجێگیری، پەڵە، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا (ئۆدیما)، وشکبوونەوەی دەم، سکچوون، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، لە پیرەکاندا کەمبوونەوەی صۆدیۆم.

**بڕی دەرمان:** بۆ خەمۆکی گەورەکان ٣٠٠ تا ٤٥٠ میلی گرام ڕۆژانە دابەشکراو لە هەر ٨ سەعاتێکدا. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ئاسایی ڕۆژانە، ١٥٠ میلی گرامە. بۆ نەمانی ئارەزووی خواردن و پرخۆری عصبی ٣٠٠ تا ٦٠٠ میلی گرام ڕۆژانە، دابەشکراو لە هەر ٨ سەعاتێکدا.



## مۆدافینیل: MODAFINIL

**ناوی بازرگانی:** Provigil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٢٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Analeptic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خەواڵویی توندی و تێکچوونی شیفتی کارکردن و خەو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی هەرس، هێڵنجدان، سکچوون، قەبزی، ئازاری سك، زیادبوونی لێدانی دڵ، سەرئێشە، ئازاری سنگ، دڵەکوتێ، گێژی، خەمۆکی، پەڵە، تۆدیما، هەوکردنی لوت، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٢٠٠ میلی‌گرام خۆراکی لە بەیانیاندا یان لە سەرەتای کارکردندا.

## مۆیکسیپریل: MOEXIPRIL

**ناوی بازرگانی:** Univasc

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٧,٥ و ١٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو و نەخۆشی شەکرەی گورچیلەیی و کەمی کاری سکۆڵە و خوێنلێبڕانی ماسولکەیی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تۆدیما، گێژی، کۆکە، تا، لەرز، وشکبوونەوەی دەم، ئازاری سنگ، ئاوسان، زەردی، سەرئێشە، خەواڵویی، بێخەوی، برینی گەروو، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، خوران، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ڕۆژانە ٧,٥ میلی‌گرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا ١ سەعات پێش لە ژەمی خواردن. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣٠ میلی‌گرامە لە ڕۆژێکدا.

## مۆلگرامۆستیم: MOLGRAMOSTIM

**ناوی بازرگانی:** Leucogen,leucomax

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,١٥ و ٠,٤ میلی‌گرام.

**گروپی دەرمان:** Anti، neutropenia

**بەکارهێنان:** دژی کەمبوونی نیوترۆفیل (خڕۆکەی سپی هاوتا) و لە چاندنی مۆخی ئێسك و کەمی نیوترۆفیل بەهۆی **بەکارهێنانی** گانسیکلۆڤیرەوە بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، تەشەنوج، گێژی، ئازاری قەفەسەی سنگ، پەککەوتنی دڵ، نەمانی ئارەزوی خواردن، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، ئازاری ماسولکە، پەڵە، خوران، تەنگەنەفەسی – ئازاری ماسولکە، ناڕێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** لە چاندنی مۆخی ئێسك گەورەکان ١٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە، بە IV ئینفیوشن لە ماوەی ٤ تا ٦ سەعات بۆ ماوەی ٣٠ ڕۆژ. کەمی نیوترۆفیل بەهۆی **بەکارهێنانی** گانسیکلۆڤیر گەورەکان ٥ مایکرۆگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە بە ژێرپێستی.

## مۆلیندۆن: MOLINDONE

**ناوی بازرگانی:** Moban

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ و ٢٥ و ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی دەروونی شیزۆفرینیا (دووبیری) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی لێدانی دڵ خەمۆکی، وشکبوونی دەم، کەمی خڕۆکەی سپی، تێکچوونی بینین، زۆربوونی لیك، خەواڵویی، پارکینسۆن، ڤێ، دیسکینسیا، پەڵە، قەبزی، هێڵنجدان، بێ عوزری، گەورەبوونی مەمك، گیرانی میز.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و مناڵانی سەروی ١٢ ساڵ ٥٠ تا ٧٥ میلیگرام لەرۆژێکدا، بڕی دەرمان زیاد دەکرێت بۆ ١٠٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢٢٥ میلیگرام لە ڕۆژێکدا هەموو ٣ تا ٤ ڕۆژێك. منالانی ٣ بۆ ٥ ساڵ ١ تا ٢,٥ میلیگرام لە ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. منالی ٥ تا ١٢ ساڵ ٠,٥ تا ١ میلیگرام/ کیلۆگرام لە ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## مۆمیتازۆن فیرۆوەیت: MOMETASONE FUROATE

**ناوی بازرگانی:** Elocon

**شێوەی دەرمان:** کرێم و مەڵهەمی ٠,١٪ و لۆشنی پێستی سەر ٠,١٪.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی ئیلتیهاباتی توندی پێست وەك ئەکزیما کاتێك کاردانەوەیان نی یە بۆ کۆرتیکۆستیرۆیدە کەمتر بەهێزەکان و سۆریاسس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیپکە، ئیلتیهابی پێست، زیادبوونی موو.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە بەچینێکی تەنك ١ جار بەکاردێت ( بۆ پێستی سەر لە حاڵەتی بەکارهێنانی لۆشن)

## مۆمیتازۆن فیرۆوەیت: MOMETASONE FUROATE

**ناوی بازرگانی:** Nasonex

**شێوەی دەرمان:** سپرای لوت ٥٠ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری و چارەسەری هەوکردن و حەساسیەتی لوت و گۆشتی زیادەی لوت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوە و ڕوشانی لوت و قوڕگ، خوێنبەربوونی لوت، برینی لوت، تێکچوونی تام و بۆن، سەرئێشە، گلوکۆما، کرژبوونی بۆری هەوا، زیادبوونی IOP.

**بڕی دەرمان:** بۆ پێشگری و چارەسەری هەوکردن و حەساسیەتی لوت گەورەکان و مناڵانی سەرووی ١٢ ساڵ ١٠٠ مایکرۆگرام (٢ سپرای) بۆ هەر کونەلوتێك ڕۆژانە ١ جار، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆر ٢٠٠ مایکرۆگرام (٤ سپرای) بۆ هەر کونەلوتێك ڕۆژانە ١ جار، کاتێك کە کۆنترۆڵکردنی بەدەستهات کەمدەکرێتەوە بۆ ٥٠ مایکرۆگرام (١ سپرای) بۆ هەر کونەلوتێك ڕۆژانە ١ جار، منالانی ٦ تا ١١ ساڵ ٥٠ مایکرۆگرام (١ سپرای) بۆ هەر کونەلوتێك ڕۆژانە ١ جار، بۆ گۆشتی زیادەی ناولوت گەورەکانی سەرووی ١٨ ساڵ ١٠٠ مایکرۆگرام (٢ سپرای) بۆ هەر کونەلوتێك ڕۆژانە ١ جار، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت پاش ٥ تا ٦ هەفتە بۆ ١٠٠ مایکرۆگرام (٢ سپرای) بۆ هەر کونەلوتێك ڕۆژانە ٢ جار ( باوەڕ وایە ئەگەر چارەسەری بەتەوە چاکی نەکردەوە پاش زیاتر لە ٥ تا ٦ هەفتە) کەمدەکرێتەوە بۆ کەمترین بڕی دەرمانی کاریگەر کاتێك کۆنترۆڵکردنی بەدەستهات.

## مۆمیتازۆن فیرۆوەیت: MOMETASONE FUROATE

**ناوی بازرگانی:** Asmanex,twisthaler

**شێوەی دەرمان:** پاودەری ئیستینشاقی ٢٠٠ و ٤٠٠ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری و چارەسەری ڕەبۆ و ڕەبۆی موزمین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هیلاکبوون، سەرئێشە، بێخەوی، هەوکردن و حەساسیەتی لوت، وشکبوونەوەی گەروو، ئازاری گوێ، خوێنبەربوونی لوت، هەوکردنی گەرو، جیوب، ئازاری سك، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری جومگە و ماسولکە، هەوکردنی بەشی سەرەوەی کۆئەندامی هەناسە، دڵەکوتێ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بە ڕێگەی پاودەری ئیستینشاقی ٢٠٠ تا ٤٠٠ مایکرۆگرام بە یەك بڕی دەرمان لە ئێوارەدا یان لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، بڕی دەرمان زیاد دەکرێت بۆ ٤٠٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە ٢ جار ئەگەر پێویست بێت.



## مۆنۆبینزۆن: MONOBENZONE

**ناوی بازرگانی:** Aloquin,benoquin

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی مەوزوعی ٢٠٪.

**گروپی دەرمان:** Antivitiligo

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ڤیتیلیگۆی توند (پەڵەی سپی یان زەردباو کەلەسەر پێست) دەردەکەوێت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، خوران، وشکبوونەوەی پێست، ئەکزیما (بیرۆ)، ڕوشانی پێست، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ تا ٣ جار ڕۆژانە ڕووی ئەو شوێنەی پێ بماڵرێت، ماوەی چارەسەر ١ تا ٤ مانگە.

## مۆنۆ- دای- ترای- کلۆرونەسیتیك ئەسید: MONO-DI-TRI-CHLORO ACETIC ACID

**شێوەی دەرمان:** پاودەری بلوری.

**گروپی دەرمان:** Organochlorine compound

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بالوك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوەی پێست، ئیلتیهاباتی پێست.

**بڕی دەرمان:** بەپێی پێویست بەکاردێت بۆ لابردنی بالوك.

## مۆنتیلۆکاست: MONTELUKAST

**ناوی بازرگانی:** Singulair

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلیگرامی و گرانیول ٤ میلی گرمی و حەبی جوین ٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Leukotriene receptor antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگرتن و چارەسەری ڕەبۆ و هەوکردن و حەساسیەتی وەرزی لوت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، وشکی دەم، دڵەکوتێ، تێکچوونی جگەر، ئۆدیما، خوێنبەربوون، قەلەقی، تێکچوونی هەرس، ئازاری ددان، سەرگێژبوون، هیلاکبوون، ئازاری سك، پەڵە، کۆکە، تا، خرۆشان، فێ، خەمۆکی، تێکچوونی خەو -- ئازاری جومگە و ماسولکە، ورێنە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، لە کاتی خەودا. منداڵان ٦ تا ١٤ساڵ ٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، لە کاتی خەودا.منداڵی ٦ مانگ تا ٦ ساڵ ٤ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار لە ئێواراندا. گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٥ ساڵ بۆ هەوکردن و حەساسیەتی وەرزی لوت ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، لە کاتی خەودا.



## مۆرفین: MORPHINE

**ناوی بازرگانی:** Avinza,morcap,statex

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ۱۰ میلیگرام/میلیلیتر و حەبی ۱۰ میلیگرامی و شاف ۱۰ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Narcotic analgesic

**بەکارهێنان:** دژی ئازاری توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، گیرانی میز، زیادبوونی لێدانی دڵ قە بزی، ڕەبۆ، لەرزین، خوران، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، تەشەنوج، وشکی دەم، ڕشانەوە، ڕەبۆ، خەواڵویی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۱۰ میلیگرام هەر ٤ سەعاتێك ۱جار. یان ٤ تا ۱٥ میلیگرام SC یان IM، منالأن ۰٫۱ تا ۰٫۲ میلیگرام/کیلۆگرام بە SC لایەنی زۆری بڕی دەرمان ۱٥ میلیگرامە.

## مۆکسیفلۆکساسین: MOXIFLOXACIN

**ناوی بازرگانی:** Avelox

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤۰۰ میلیگرامی و دەرزی ٤۰۰ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنە بەکتریایی یە جیاوازەکانی وەك هەوکردنی سی یەکان و سیل و هەوکردنی بۆرێچکەکانی هەوا و ناوەوەی سك و جیوب وپێست و شانەنەرمەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نارێکی لێدانی دڵ، زەردی، فێ، تا، گێژی، ئاوسان، بەگرانی هەناسەدان، ئازاری کتوپڕ، سکچوون، خوێنبەربوون، پەڵە، برینی گەروو، هێڵنجدان، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، خەمۆکی، خرۆشان، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤۰۰ میلیگرام خۆراکی یان بە دەمارIV ڕۆژانە ۱ جار.

## مۆکسیفلۆکساسین: MOXIFLOXACIN OPH.

**ناوی بازرگانی:** Vigamox

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ۰٫٥٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی چاو بەکاردێت.

ج: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان لە کۆمەڵێك نەخۆشی



**کاریگەری لاوەکی:** فرمێسك ڕشتن، وشکبوونەوەی چاو، ئازاری چاو، خوران، سوتانەوە، سوربونەوەی چاو، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** ١ قەترە ڕۆژانە ٣ جار بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ.

## مۆکسیسیلایت: MOXISYLYTE

**ناوی بازرگانی:** Opilon

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Vasodialator

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سەرەتایی ماوەکورتی نەخۆشی ڕایناد (نەخۆشی یەکە کە خوێنبەرەکانی پەنجەکان کرژدەبن و کارلێکی بێجێ تیایاندا ڕوودەدات (ڕەگ و مولولەی خوێن کرژدەبن ) و دەستەکان سارد نەبن) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، هەوکردنی جگەر، سوربونەوە، گێژی، سەرئێشە، زەردی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٤٠ میلیگرام ڕۆژانە ٤ جار، زیاد دەکرێت بۆ ٨٠ میلیگرام ڕۆژانە ٤ جار ئەگەر کاردانەوەی بڕی دەرمانی سەرەتا کەمبوو، پاش ٢ هەفتە بڕی دەرمان بەردەوام نابێت ئەگەر کاردانەوەی نەبوو.

## مۆکسۆنیدین: MOXONIDINE

**ناوی بازرگانی:** Physiotens

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ و ٣٠٠ و ٤٠٠ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبوونەوەی پەستانی خوێنی سەرەکی سوك و مامناوەند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی دەم، سکچوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، بێخەوی – تێکچوونی گەدە، خەواڵویی، پەڵە، ئازاری پشت، خوران، کەمبوونی لێدانی دڵ ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە ١ جار لە بەیانیاندا، ئەگەر پێویست بێت پاش ٣ هەفتە زیاد دەکرێت بۆ ٤٠٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٦٠٠ مایکرۆگرامە لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا (لایەنی زۆری یەك بڕی دەرمان ٤٠٠ مایکرۆگرامە).

## مەلتیڤیتامین: MULTIVITAMIN

**شێوەی دەرمان:** کەپسول و حەب و شەربەت و قەترە.

**گروپی دەرمان:** Vitamin

**بەکارهێنان:** قەرەبووی کەمبوونی ڤیتامینەکان و خوێیەکانی لەش دەکاتەوە.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، لەرزین، وشکبوونەوەی پێست، ئازاری سك.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ١ حەب یان ١ کەپسول یان ٥ میلی لیتر شەربەت یان ٠,٦ میلی لیتر لە قەترە.

## مەلتیڤیتامین + ئایرۆن: MULTIVITAMIN PLUS IRON

**ناوی بازرگانی:** Fero، folic ٥٠٠

**شێوەی دەرمان:** حەب و قەترە و شەربەت.

**گروپی دەرمان:** Vitamin

**بەکارهێنان:** قەرەبووی کەمبوونی ڤیتامین و ئاسن لە لەشدا دەکاتەوە.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، تێکچوونی گەدە، ئازاری سك، قەبزی، دڵەکزە، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١ حەب یان ٥ تا ١٥ میلیلیتر شەربەت یان ٠,٥ تا ١ میلیلیتر قەترە.

## مەلتیڤیتامین + مینراڵ: MULTIVITAMIN PLUS MINERAL

**شێوەی دەرمان:** کەپسول

**گروپی دەرمان:** Vitamin

**بەکارهێنان:** قەرەبووی کەمبوونی ڤیتامینەکان و خوێیەکانی لەش دەکاتەوە.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، پەڵە، بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ١ کەپسول یان بەپێی دەستوری پزیشك.

## مەلتیڤیتامین ثیراپیوتیك: MULTIVITAMIN THERAPEUTIC

**شێوەی دەرمان:** حەب و کەپسول

**گروپی دەرمان:** Vitamin

**بەکارهێنان:** قەرەبووی ڤیتامین و خوێیەکانی لەش دەکاتەوە.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ١ حەب یان ١ کەپسول یان بە پێی دەستوری پزیشك.



## مەڵتیڤیتامین: MULTIVITAMIN

**شێوەی دەرمان:** حەب و کەپسول و شەربەت.

**گروپی دەرمان:** Vitamin

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونەوەی ڤیتامینەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری دڵ

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١ حەب یان ١ کەپسوڵ یان ٥ سیسی شەربەت یان بە پێی دەستوری پزیشك.

## میوپیرۆسین: MUPIROCIN NASAL

**ناوی بازرگانی:** Bactroban

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی لوت ٢٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ ناوەوەی لوت بەکاردێت بۆ کوشتن و بنبڕکردنی هەندێ بەکتریا وەك (ستافیلۆکۆکەس ئەوریەس)، کەمقاوەمەی هەیە بۆ دژەزیندەگی مێسیلین.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هەوکردنی گەروو، خوران، سوتانەوە، پەڵە، کۆکە، ئازاری گوێ، گیرانی سنگ، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان نیوەی مەڵهەمەکە ٢ جار لە ڕۆژێکدا، بە ڕووی ناوەوەی هەر کونێکی لوتدا بماڵرێت، درێژی ماوەی چارەسەر ٥ ڕۆژە.

## میوپیرۆسین: MUPIROCIN (TOPICAL)

**ناوی بازرگانی:** Bactroban

**شێوەی دەرمان:** کرێم و مەڵهەمی ٢٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی و بۆ چارەسەری ئاگرە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، سەرئێشە، خوران، کۆکە، ئیلتیهاب.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەرووی ١ مانگ ڕۆژانە ٣ جار بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ.

## مایکۆفینۆلەیت مۆفیتیل: MYCOPHENOLATE MOFETIL

**ناوی بازرگانی:** Cellcept

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ٢٥٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ١ گرام/٥ میلیلیتر و دەرزی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Immunosuppressant

**بەکارهێنان:** بۆپێشگرتن لە ڕەفزکردنی ئەندامێك پاش چاندنی جگەر و گورچیلە و دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ڕشانەوە، سکچوون، سەرگێژبوون، هەوکردنی ڕێرەوی میز، هێڵنجدان، قەبزی، ئازاری سك، تێکچوونی هەرس، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، زیپکە، هەوکردنی سی یەکان، کۆکە، تەنگەنەفەسی، ئازاری پشت، بەرزبوونەوەی پەستان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ گرام، ڕۆژانە ٢ جار.

***

# N

## نابیلۆن: NABILONE

**ناوی بازرگانی:** Cesamet

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antiemetic

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری لە هێڵنجدان و ڕشانەوە بەکاردێت بەهۆی چارەسەری کیمیایی شێرپەنجەوە لەوانەی بەدەرمانەکانی تر کۆنترۆڵ ناکرێن.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، خەمۆکی، بێخەوی، شلەژان، قەلەقی، بێهێزی، گێژی، هێڵنجدان، تێکچوونی بینین، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، خەوالویی، تێکچوونی هاوسەنگی، وشکبوونەوەی دەم، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار ١ تا ٣ سەعات پێش چارەسەری کیمیایی. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٦ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا.

## نابیومیتۆن: NABUMETONE

**ناوی بازرگانی:** Relafen

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ و ٧٥٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ٥٠٠ میلیگرام/ ٥ میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و تا و ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری ئیلتیهابی جومگەکان و ڕۆماتیزم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، گێژی، پەڵە، تێکچوونی هەرس، ئۆدیما، برینی گەدە و دوانزەگرێ، تێکچوونی بینین، هێڵنجدان، سکچوون، خوران، غازات، سەرئێشە، قەبزی، دڵەکزە، تا، برینی گەروو، کۆکە، نەمانی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ١٠٠٠ میلیگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا لە کاتی خەودا. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ١٥٠٠ تا ٢٠٠٠ میلیگرام خۆراکی لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٢٠٠٠ میلیگرامە.

## نادۆلۆل: NADOLOL

**ناوی بازرگانی:** Corgard

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ و ٤٠ و ٨٠ و ١٢٠ و ١٦٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** blocker Beta -

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری سنگ و پێشگری شەقیقە و نارێکی لێدانی دڵ و زیادبوونی هۆرمۆنی پایرۆید لە مولولەی خوێندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، پەککەوتنی دڵ، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ سەرئێشە، هیلاکبوون، تێکچوونی هاوسەنگی، هەڵوەرینی موو، کەمی پەرەی خوێن، هیلاکبوون، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** بۆ پەستانی بەرزی خوێن گەورەکان ٨٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، بۆ ئازاری سنگ ٤٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، بۆ پێشگری لە شەقیقە ٤٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، بۆ نارێکی لێدانی دڵ ٤٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، بۆ زیادبوونی هۆرمۆنی پایرۆید لە مولولەی خوێندا ٨٠ تا ١٦٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٤٠ میلیگرامە.

## نافارێلین: NAFARELIN

**ناوی بازرگانی:** Synarel

**شێوەی دەرمان:** سپرای لوت.

**گروپی دەرمان:** Gonadorelin analogue

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی پەردەی ناوەوەی منداڵدان و گەورەبوونی پێش وەختی باڵغبوونی ناوەندی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیپکە، سەرئێشە، بێخەوی، خەمۆکی، چەوری زیادەی سەر، ڕوشانی لوت، وشکی زایەندی ژنان.

**بڕی دەرمان:** ئیلتیهابی پەردەی ناوەوەی منداڵدان ١ سپرای بۆ هەر کونەلوتێك لەبەیانی و ١سپرای لەئیوارەدا. گەورەبوونی پێش وەختی باڵغبوونی ناوەندی ٢ سپرای بۆ هەر کونەلوتێك لەبەیانی و ٢ سپرای لەئیوارەدا.



## نافی سیلین: NAFICILIN SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Nafcil,nallpen

**شێوەی دەرمان:** پاودەری دەرزی ٥٠٠ میلی‌گرامی و ١ گرام/ڤیاڵ

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی بەهۆی ستریپتۆکۆکەس و ستافیلۆکۆکەس ئەوریەسی هەستیار بە میتیسیلین و هەوکردنی ئێسك و سی و پەردەی ناوەوەی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوربونەوەی پێست، سکچوون، ڕشانەوە، هێڵنجدان، لرخەلرخ، تا، پەڵە، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ میلی‌گرام ماسولکەیی IM هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٢ گرامە. یان ٠,٥ تا ١,٥ گرام بەدەمار هەر ٤ سەعاتێك، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٠ گرامە. منداڵان ٢٥ میلی‌گرام/ کیلۆگرام هەر ١٢ سەعاتێك بە ماسولکەیی IM. یان ١٠ تا ٢٠ میلی‌گرام/ کیلۆگرام بە دەمار هەر ٤ سەعاتێك، یان ٢٠ تا ٤٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام بەدەمار، هەر ٨ سەعاتێك. ساواکان ١٠ تا ٢٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە ماسولکەیی، هەر ١٢ سەعاتێك. یان ١٠ تا ٢٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام بەدەمار IV، هەر ٤ سەعاتێك. یان ٢٠ تا ٤٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام بەدەمار IV، هەر ٨ سەعاتێك.

## نافتیدرۆفیوریل: NAFTIDROFURYL OXALATE

**ناوی بازرگانی:** Praxilene

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Vasodialator

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی دەفری خوێنی موحیگی و دەفری خوێنی مێشکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، پەککەوتنی جگەر، هەوکردنی جگەر، پەڵە، ئازاری بەشی سەرەوەی گەدە.

**بڕی دەرمان:** نەخۆشی دەفری خوێنی موحیگی ١٠٠ تا ٢٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٣ جار. نەخۆشی دەفری خوێنی مێشکی ١٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٣ جار.

## نافتیفین: NAFTIFINE

**ناوی بازرگانی:** Naftin

**شێوەی دەرمان:** کرێم و جێلی ١٪.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی نێوان پەنجەکانی پێ و کەچەڵی و خوران بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشان، سوتانەوە، وشکبوونەوەی پێست، خوران.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ۲ جار.

## نالبیوفین: NALBUPHINE

**ناوی بازرگانی:** Nubain

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ۱۰ و ۲۰ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Narcotic analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازارم مامناوەند و توند و ئازاری منداڵبوون و پاش نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سوربونەوە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن – نارێکی لێدانی دڵ خەواڵویی، بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان، گێژی، بێهێزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کرژبوونی گەدە، وشکبوونەوەی دەم، تامی ناخۆشی دەم، ئارەقکردنەوە، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان کێشی ۷۰ کیلۆگرام ۱۰ میلی‌گرام بە دەمار یان ماسولکەیی یان ژێرپێستی هەموو ۳ تا ٦ سەعاتێك. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ۱٦۰ میلی‌گرامە لە ڕۆژێکدا. منداڵان ۰,۲ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە ماسولکەیی یان دەمار. لایەنی زۆر ۲۰ میلی‌گرامە.

## نالیدیکسیك اسید: NALIDIXIC ACID

**ناوی بازرگانی:** NegGram,Uriben

**شێوەی دەرمان:** حەبی ۵۰۰ میلی‌گرامی و شەربەتی خۆراکی ٦۰ میلی‌گرامی و دەرزی ٦۰ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Aquinolone antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی تیژ و موزمینی بەهۆی وردە زیندەوەرە هەستیارەکانی گرامنێگەتیڤەکانەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، دابەزینی کێش، بێهێزی، سەرگێژبوون، سەرئێشە، تەشەنوج، خوران، پەڵە، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکان، سکچوون، لەرز، تا، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۱ گرام خۆراکی، ڕۆژانە ٤ جار بۆ ماوەی ۷ تا ۱٤ ڕۆژ، ۲ گرام خۆراکی ڕۆژانە بۆ چارەسەری ماوەدرێژ و لە هەوکردنی توندی ڕێڕەوی میزدا تا ٦ گرام ڕۆژانە ڕێی پێ دەدرێت. منداڵانی گەورەتر لە ۳ مانگ ڕۆژانە ۵۵ میلی‌گرام/ کیلۆگرام خۆراکی، لە ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، بۆ ماوەی ۷ تا ۱٤ ڕۆژ، ۳۳ میلی‌گرام/کیلۆگرام خۆراکی ڕۆژانە دابەشکراو بە ٤ بڕی دەرمانەوە لە چارەسەری ماوە درێژدا.



## نالۆکسۆن: NALOXONE HCL

**ناوی بازرگانی:** Narcan

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,٤ میلی‌گرام/میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** Opioid، receptor antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ تەشخیص و چارەسەری ژەهراویبوون بە مادە بێهۆشکەرەکان و بۆ چارەسەری ئالودەبوون بە ئەفیونەکانەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادبوونی پەستانی خوێن، زیادبوونی لێدانی دڵ، کۆبوونەوەی ئاو لە سی یەکاندا، تەشەنوج، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، وەستانی دڵ، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٤ تا ٢ میلی‌گرامە بە ماسولکەیی IM و دەماری IV و ژێرپێستی SCهەموو ٢ تا ٣ خولەکێك. سەرجەمی بڕی دەرمان، لایەنی زۆر ١٠ میلی‌گرامە. منالآن ٠,١ تا ٠,٠١ میلی‌گرام/کیلۆگرام لە بڕێکی دەرماندا بە ماسولکەیی IM و دەماری IV و ژێرپێستی SC دووبارەکردنەوەی IV هەموو ٣ خولەکێك بۆ ٣ بڕی دەرمان بە بڕی پێویست.

## نالتریکسۆن: NALTREXONE HCL

**ناوی بازرگانی:** Depad,nalorex,revia

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥ و ٥٠ میلی‌گرامی و حەبی ٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Opioid، receptor antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ژەهراویبوون بە بێ هۆشکەرەکانی وەك هیرۆین و ئەفیونە بێهۆشکەرەکان و بۆ چارەسەری ئالودەبوون بە ئەفیونەکان و ئەلکهول بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك. گێژبوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، دڵەڕاوکێ، خەمۆکی، قەبزی، کەمبوونەوەی ئارەزوی جنسی، پەڵە، نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، لەرز، گیرانی میز، ئازاری سنگ، سەرئێشە، تێکچوونی خەو، وڕێنە، ئازاری جومگە و ماسولکە، لەرزین.

**بڕی دەرمان:** بەبێ نەرێبوونی فەحصی نالۆکسان نابێت دەرمان دەست پێبکات. گەورەکان ڕۆژانە خۆراکی ٢٥ تا ٥٠ میلی‌گرامە. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٥٠ میلی‌گرامە.



## ناندرۆلۆن: NANDROLON

**ناوی بازرگانی:** Kabolin,Durabolin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥ میلیگرام/میلیلیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمخوێنی بەهۆی نەخۆشی یەکانی گورچیلە و دژی شێرپەنجەی تەشەنەکردووی مەمك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، زیپکە، زۆربوونی کالیسۆم، خوێنبەربوونی گەدە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، زیادبوونی کێش، هەڵوەرینی موو، کۆبونەوەی ئاو لە لەشدا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان هەفتەیی ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام ماسولکەیی IM (لە پیاوان) و هەفتەیی ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام ماسولکەیی (لەژنان) لە ناندرۆلۆن دیکونەیت بەکاردەهێنرێت. منالآنی ٢ تا ١٣ساڵ ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام، ماسولکەیی هەر ٣ تا ٤ هەفتە ١ جار، لە ناندرۆلۆن دیکونەیت بەکاردەهێنرێت. بۆ شێرپەنجەی تەشەنەکردووی مەمك ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام ماسولکەیی هەر هەفتەیەك لە ناندرۆلۆن فینپروپیونەیت بەکاردەهێنرێت.

## نافازولین: NAPHAZOLINE HCL OR NITRAT

**ناوی بازرگانی:** CON,Allerest,Vasocon ،AK

**شێوەی دەرمان:** قەترەی لوت ٠,٠٥ ٪ و قەترەی چاو ٠,١٪ و سپرای ٠,٠٥٪.

**گرووپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری گیران و خورانی چاو و ڕوشانی چاو و گیرانی لوت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سەرگێژبوون، وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی بینین، سەرئێشە، ڕوشانی چاو، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، سووربونەوە، کزانەوە، بێهۆشی، ئارەقکردن، بێهێزی، زیادبوونی پەستانی ناوەوەی چاو.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری گیران و خورانی چاو و ڕوشانی چاو گەورەکان ١ تا ٣ قەترە هەر ٣ تا ٤ سەعاتێك، نە هەر چاوێك یان ١ تا ٢ قەترە لە هەر چاوێك ڕۆژانە ٤ جار بۆ ماوەی ٣ تا ٤ ڕۆژ. بۆ گیرانی لوت گەورەکان و منالآنی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ١ تا ٢ قەترە لە هەر کونێکی لوت لانی کەمی ماوەی نێوان بەکارهێنان هەر ٣ سەعاتێکە، بەپێی پێویست ئەتوانی کە بڕی دەرمان هەر ٦ سەعاتێك دووبارەبکەیتەوە. دەرمان نابێت زیاتر لە ٣ تا ٥ ڕۆژ بەردەوام بێت.



## ناڤازۆلین ئەنتازۆلین: NAPHAZOLINE ANTAZOLINE

**ناوی بازرگانی:** Albalon

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو (ناڤازۆڵین هایدرۆکلۆراید ٠,٠٥٪ و ئەنتازۆڵین فۆسفەیت ٠,٥٪).

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری گیرانی چاو و خوران و حەساسیەتی چاو و سووربونەوەی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوەی چاو، حەساسیەتی مەوزوعی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ قەترە هەر ٨ سەعات جارێ بکرێتە چاوەوە.

## ناپرۆکسین: NAPROXEN

**ناوی بازرگانی:** Naxen, nycopren

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ میلیگرامی و حەبی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری سوك و مامناوەند و ئیلتیهابات و تا بەکاردێت، بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهابی رۆماتیزم و هەوکردنی جومگەکان و هەوکردنی فەقەرەکان و نەخۆشی داءالملوك و ئازاری بێ نوێژی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** برین و خوێنبەربوونی گەدە، قەبزی، هێڵنجدان، تێکچوونی گەدە، ڕشانەوە، سەرگێژبوون، سەرئێشە، پەڵە، کەمخوێنی، ژەهراویبوونی گورچیلە، ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لەڕۆژێکدا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١,٢٥ گرامە. بۆ ڕۆماتیزمی لاوان ڕۆژانە ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام، لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## ناراتریپتان: NARATRIPTAN

**ناوی بازرگانی:** Amerge

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ و ٢,٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** ٥HT١ agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شەقیقەی تیژ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، نارێکی لێدانی دڵ، گۆڕانی ECG، گێژی، هێڵنجدان، ئارەقکردنەوە، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، خەواڵویی، ئازاری سك، خرۆشان، ڕشانەوە، سکچوون، پەڵە، خوران، سووربونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢,٥ میلیگرام ڕۆژی ١ جار لەگەڵ شلەدا و دووبارەکردنەوەی بە بڕی پێویست هەموو ٤ سەعاتێك. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٥ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا.

## ناتالیززوماب: NATALIZUMAB

**ناوی بازرگانی:** Tysabri

**شێوەی دەرمان:** ڤیالی ٣٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Monoclonal antibody

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی مامناوەند و توندی کرۆن و نەخۆشی فرەڕەقبوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هیلاکی، ئازاری جومگە و ماسولکە، سکچوون، خەمۆکی، پژمین، برینی گەروو، کەمبوونەوەی بینین، پەڵە، خوران، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری گەدە، زەردی، ئازار و کزانەوە لەکاتی میزکردن، کۆکە، ئاوسان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠٠ میلی‌گرام بە دەمار هەموو ٤ هەفتەیەك.

## ناتامایسین: NATAMYCIN

**ناوی بازرگانی:** Natacyn

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاوی ٥٪.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی کەڕوو بۆ چارەسەری هەوکردنی چاو و هەوکردنی کۆرنیەی چاو و هەوکردنی پێڵوی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بینین، ئازاری چاو، ڕوشانی چاو، سەرگێژبوون، سەرئێشە، هێڵنجدان، قەبزی، پەڵە، کەمخوێنی، ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ١ قەترە هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك.

## ناتیگلینایدە: NATEGLINIDE

**ناوی بازرگانی:** Starlix

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦٠ و ١٢٠ و ١٨٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Hypoglycemic

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵکردنی شەکری خوێن و بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ بەتەنها یان لەگەڵ میتفۆرمین بەکاردێت.

بۆ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی شەکری خوێن، خوران، پەڵە، شەرا، بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان، ڤێ، زەردی، پژمین، ئازاری جومگە، گێژی، ئازاری پشت، هێڵنجدان، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ۱۸ ساڵ سەرەتا ٦۰ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ۳ جار لە ۳۰ خولەکدا پێش لە ژەمی سەرەکی خواردن، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بە پێی کاردانەوەکەی تا لایەنی زۆر ۱۸۰ میلیگرام ڕۆژانە ۳ جار.

## نیبیڤۆلۆل: NEBIVOLOL

**ناوی بازرگانی:** Bystolic

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ۱۰ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Beta، blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و پەککەوتنی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هیلاکی، هێڵنجدان، ئازاری گەدە، سکچوون، تێکچوونی خەو، نارێکی لێدانی دڵ ئاوسان، گێژی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ میلیگرام ۱ جار لەڕۆژێکدا.پیرەکان سەرەتا ڕۆژانە ۲,٥ میلیگرام، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ ڕۆژانە ٥ میلیگرام. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٤۰ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. بۆ پەککەوتنی دڵ ۱,۲٥ میلیگرام ڕۆژانە ۱ جار، لایەنی زۆر ۱۰ میلیگرام ڕۆژانە ۱ جار.

## نیدۆکرۆمیل: NEDOCROMIL SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Tilade

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی ئیستینشاقی ۲ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anti، Asthma

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری ڕەبۆ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی گەدە، ئازاری گەدە، هەوکردنی گەروو، تێکچوونی تام، سەرئێشە، کۆکە، ڕوشانی گەروو، کرژبوونی بۆری هەوا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ٦ ساڵ ۲ پاف ڕۆژانە ٤ جار،کاتێك کۆنترۆڵکرا گونجاو دەبێت بۆ کەمکردنەوەی بۆ ڕۆژانە ۲ جار.

ئاگادار بن: دەرمان شوێنەواری خراپ و کاریگەری یەکتربڕ دەبەخشێت، ئەگەر بەگونجاوی بەکارنەهێنرێت

## نیدۆکرۆمیل: NEDOCROMIL SODIUM OPH.

**ناوی بازرگانی:** Rapitil

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٢٪.

**گروپی دەرمان:** Anti-inflammatory

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهاب و حەساسیەتی وەرزی و هەمیشەیی چاو و حەساسیەتی وەرزی کۆرنیەی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کزانەوەی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەرووی ٦ ساڵ ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار.

## نیفازۆدۆن: NEFAZODONE

**ناوی بازرگانی:** Serzone

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ١٠٠ و ١٥٠ و ٢٠٠ و ٢٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خەمۆکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ئازاری گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، لێڵبوونی میز، زەردی، ڤێ، تا، لەرز، سکچوون، قەبزی، گێژی، خەواڵویی، بێهێزی - بێخەوی، برینی گەروو، وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی بینین، سەرئێشە، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، تێکچوونی جگەر.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ١٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار. بڕی دەرمانی ئاسایی ٣٠٠ تا ٦٠٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## نیفۆپام: NEFOPAM HCL

**ناوی بازرگانی:** Acupan

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری مامناوەند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، وشکبوونەوەی دەم، گیرانی میز، تورەیی، ڕشانەوە، تێکچوونی بینین، خەواڵویی، ئارەقکردنەوە، بێخەوی، زیاد لێدانی دڵ، سەرئێشە، وڕێنە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٦٠ میلیگرام خۆراکی (پیرەکان ٣٠ میلیگرام ) ڕۆژانە ٣ جار، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بە پێی کاردانەوەکەی، بڕی دەرمانی ئاسایی ٣٠ تا ٩٠ میلیگرامە ڕۆژانە ٣ جار.



## نیلارابین: NELARABINE

**ناوی بازرگانی:** Arranon

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ٢٥٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antimetabolite

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن خانەی T لیمفۆبلاستیك لیوکیمیا و لیمفۆبلاستیك لیمفۆما بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، کۆکە، ئازاری گەدە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، سووربوونەوە، ئاوسان، ئازار، خوێنبەربوون، برینی دەم و گەروو، تا، لەرز، نەمانی ئارەزوی خواردن، بوونی خوێن لەپیسایدا، ڤێ، تێکچوونی بینین، بێهێزی، بێهۆشی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥٠٠ میلی گرام/مەتردوجا بە دەمار بۆ زیاتر لە ٢ سەعات، لە ڕۆژەکانی ١ و ٣ و ٥ لە خولی ٢١ ڕۆژی. منالآن ٦٥٠ میلی گرام/ مەتردوجا بەدەمار بۆ زیاتر لە ١ سەعات، لە ڕۆژانی ١ و ٥ لە خولی ٢١ ڕۆژی.

## نێلفیناڤیر: NELFINAVIR

**ناوی بازرگانی:** Viracept

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ و ٦٢٥ میلی گرامی پاودەری خۆراکی ٥٠ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی جۆری HIV بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، دڵەڕاوکێ، بێخەوی، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، غازات، پەڵە، هەوکردنی پێست، ئارەقکردنەوە، خوران، بەردی گورچیلە، تێکچوونی ڕێژەی میز، هەوکردنی گەروو، کەمخوێنی، هەوکردنی جگەر، هەوکردنی جومگە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٧٥٠ میلی گرام، ڕۆژانە ٣ جار یان ١/٢٥٠ گرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار لەگەڵ خواردندا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٧٥٠ میلی گرامە ٣ جار لە ڕۆژێکدا. منالآن ٢ تا ١٣ ساڵ ٢٠ تا ٣٠ میلی گرام/کیلۆگرام، ڕۆژانە ٣ جار لەگەڵ خواردندا.



## ئیۆمایسین: NEOMYCIN SULFATE

**ناوی بازرگانی:** fradin,mycifradin ،NEO

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی گیراوەی خۆراکی ١٢٥ میلیگرام/ ٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ تەعقیمکردنی ڕیخۆڵە و کپکردنەوەی بەکتریایی ڕیخۆڵە پێش لە نەشتەرگەری و دەرمانی یارمەتیدەر لە بیهۆشی هەوکردنی جگەردا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان، سکچوون، پەڵە، ژەهراویبوونی گورچیلە، ڕشانەوە، زیادبوونی لیك، هەوکردنی دەم، کەمبوونی بیستن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ گرام خۆراکی هەر ١ سەعاتێك، تا ٤ بڕی دەرمان، پاشان ١ گرام خۆراکی هەر ٤ سەعاتێك، تا کۆی هەمووی ٢٤ سەعات. منداڵان ڕۆژانە ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام/کیلۆگرام دابەشکراو لە هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك. بۆ دەرمانی یارمەتیدەر لە بیهۆشی هەوکردنی جگەردا گەورەکان ١ تا ٣ گرام خۆراکی ٤ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٥ تا ٦ ڕۆژ. منداڵان ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ڕۆژانە، دابەشکراو لە چەندین بڕی دەرماندا بۆ ماوەی ٥ تا ٦ ڕۆژ.

## نیۆستیگمین: NEOSTIGMINE

**ناوی بازرگانی:** Prostigmin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥ میلیگرامی و دەرزی ٢,٥ میلیگرام/میلیلیتر (١میلیلیتر،٥ میلی لیتر) و ٠,٥ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Anticholinesterase

**بەکارهێنان:** دژی بێ هێزی و لاوازی ماسولکەیی و نەبوونی توانای بە ڕێدا ڕۆیشتن ( myasthenia gravis)، بۆ چارەسەری ژەهراویبوون بە تیوبۆکورارین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئارەقکردنەوە، زۆربوونی لیك، سەرئێشە، سەرگێژبوون، بیهێزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، پەڵە، کرژبوونی ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٥ میلیگرام و دووبارەکردنەوەی هەر ٣ سەعاتێك. منداڵان ٠,٠٤ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ٣ سەعاتێك. شیرخۆران ٠,٠١ تا ٠,٠٥ میلیگرام/کیلۆگرام.



## نیپافیناك: NEPAFENAC

**ناوی بازرگانی:** Nevanac

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,١٪.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهابی پاش نەشتەرگەری کاتاراکت (ئاوی سپی چاو) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، زیادبوونی IOP، سووربوونەوەی چاو، وشکبوونەوەی چاو، خورانی چاو، هێڵنجدان، ڕشانەوە، جیوب، تێکچوونی بینین، وشکبوونەوەی دەم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ قەترە بۆ هەر چاوێك یان هەردووکیان ڕۆژانە ٣ جار، ١ ڕۆژ پێش نەشتەرگەری کاتاراکت و بەردەوام دەبێت بۆ ماوەی ٢ هەفتە پاش نەشتەرگەری.

## نیسیریتاید: NESIRITIDE

**ناوی بازرگانی:** Natrecor

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ١,٥ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Vasodilator

**بەکارهێنان:** دەبێتەهۆی کشان و فراوانبوونی مولولەکانی خوێن و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن بۆ چاکردنی هەناسەدان لەوانەی پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراویان (CHF) هەیە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی هەرس، ئازاری سنگ، گێژی، نارێکی لێدانی دڵ، هیلاکبوون، کۆکە، تا، خوران، ئاوسان، خەواڵوویی، لەرزین، ئارەقکردنەوە، پەڵە، کرژبوونی قاچ، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ مایکرۆگرام/کیلۆگرام بە ڕێگەی IV ئینفیوش، پاشان ٠,٠١ مایکرۆگرام/کیلۆگرام/خولەك بە ڕێگەی IV ئینفیوش.

## نیڤیراپین: NIVIRAPINE

**ناوی بازرگانی:** Viramune

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلی گرامی و شەربەتی ٥٠ میلی گرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تا، پەڵە، ئازاری سك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، برینی دەم، هەوکردنی جگەر، ئۆدیما.



**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ۲۰۰ میلیگرام خۆراکی بۆ ١٤ ڕۆژی یەکەم، پاشان ۲۰۰ میلیگرام خۆراکی ۲ جار لە ڕۆژێکدا. لایەنی زۆر ڕۆژانە ٤٠٠ میلیگرامە. منداڵانی ۲ مانگ تا ۸ ساڵ ٤ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ١٤ ڕۆژ، پاشان ۷ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ۲ جار، منداڵی گەورەتر لە ۸ ساڵ ٤ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ١٤ ڕۆژ، پاشان ٤ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ۲ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ۲۰۰ میلیگرامە.

## نیاسین (نیکو تینیك ئەسید): NIACIN

**ناوی بازرگانی:** Niac, nicobid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ۲٥ و ۱۰۰ و ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antilipidimic

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندندنی چەوری خوێن و نەخۆشی پلاگر (نەخۆشی پێستی) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادلێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، فراوانکردنی دەمارەکان، سەرئێشە، سەرگێژبوون، سوتانەوە، سوربونەوە، پەڵە، هێڵنجدان، سکچوون، غازاتی سك، برینی گەدە، تێکچوونی بینین، زیادبوونی شەکری خوێن. زیادبوونی یوریك ئەسید.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ میلیگرام ۳ تا ۱۰ جار لە ڕۆژێکدا،منداڵان ۲۰۰ تا ٥٠٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا.

## نیاسین ئەما ید: NIACINAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Nicobion

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Vitamin B۳

**بەکارهێنان:** ڤیتامین و تەواوکەری خۆراکی یە و بۆ چارەسەری زیادبوونی چەوری خوێن و نەخۆشی پلاگر (نەخۆشی پێستی) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، هێڵنجدان، ئازاری گەروو، وشکبوونەوەی موو، سەرئێشە، برینی گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ میلیگرام ۳ تا ۱۰ جار لە ڕۆژێکدا. منداڵان ۱۰۰ تا ۳۰۰ میلیگرام لە ڕۆژێکدا دابەش لە ۳ جاردا.

## نیکاردیپین: NICARDIPINE

**ناوی بازرگانی:** Cardene

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ۲۰ و ۳۰ میلیگرامی و کەپسولی SR ۳۰ و ٤٥ و ٦۰ میلیگرامی و دەرزی ۲,٥ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Calcium channel blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری موزمینی سنگ و پەستانی بەرزی خوێن و بۆ پێشگری لە شەقیقە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، گێژی، سوربونەوە، دڵەکوتێ، نارێکی لێدانی دڵ زەردی، ئاوسان، پەڵە، هێڵنجدان، قەبزی. هیلاکبوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۲۰ تا ٤۰ میلیگرام ڕۆژانە ۳ جار. کەپسولی SR ۳۰ تا ٦۰ میلیگرام ڕۆژانە ۲ جار. بە دەرزی دەمار ٥ میلیگرام لە سەعاتێکدا بە دەمار و ئینفیوشن بەردەوام دەبێت بە زیادکردنی ۲,٥ میلیگرام لە سەعاتێکدا هەموو ۱٥ خولەکێك بۆلایەنی زۆر ۱٥ میلیگرام لە سەعاتێکدا.

## نیکلوزامید: NICLOSAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Niclocide,telmex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥۰۰ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anthelmintic

**بەکارهێنان:** دژی کرمی شریتی و کرمی پان و کرمی سەگ و پشیلە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، خوران، سەرگێژبوون، پەڵە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، هەڵوەرینی موو، ئازاری کەمەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان پاش نانخواردنێکی سوکی بەیانی ۲ گرام بە شێوەی ۱ بڕی دەرمان، ۲ سەعات دواتر بە بەکارهێنانی ڕەوانکەرێك کرمەکە دەچێتە دەرەوە. منالآنی ۲ تا ٦ ساڵ نیوەی بڕی دەرمانی گەورەکان. منالآنی بچوکتر لە ۲ ساڵ ۰,۲٥ ی بڕی دەرمانی گەورەکان.

## نیفید پین: NIFIDIPINE

**ناوی بازرگانی:** Adalat

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ۱۰ و ۳۰ میلیگرامی وحەبی ۱۰ و ۳۰میلیگرامی وکەپسولی۲۰ میلیگرامی و حەبی ۲۰ و ٦۰ و ۹۰ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Calicium antagonist



**بەکارهێنان:** دژی پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری سنگ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، زۆرلێدانی دڵ سوربونەوە، ئازاری سك، گێژی، تێکچوونی هەرس، نەخۆشیەکانی پرۆستات، سەرئێشە، بێخەوی، تورەبوون، سەرگێژبوون، رشانەوە، سکچوون، پەڵە، خوران، سوتانەوە، ئازاری پشت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلیگرام رۆژانە ٣ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان رۆژانە ١٢٠ میلیگرامە. منالان ٠,٢٥ تا ٠,٩ میلیگرام/کیلۆگرام رۆژانە ٣ تا ٤ جار.

## نیلۆتینیب: NILOTINIB

**ناوی بازرگانی:** Tasigna

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری جۆرێك لە شێرپەنجەی خوێن، کە پێی دەوترێت کرۆمۆسۆمی فیلادیلفیای پۆزەتیڤ لە جۆری مایلۆید لیوکیمیایی موزمین (CML) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ناڕێکی لێدانی دڵ تا، ڤێ، کەمخوێنی، هێڵنجدان، رشانەوە، سکچوون، پەڵە، خوێنبەربوون، لەرز، برینی دەم و گەروو، ئاوسان، نەمانی ئارەزوی خواردن، زەردی، ئازاری گەدە. کۆکە، قەبزی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٠ میلیگرام خۆراکی هەموو ١٢ سەعاتێك، ١ تا ٢ سەعات پاش لە خواردن.

## نیلوتامید: NILUTAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Nilandron

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiandrogen

**بەکارهێنان:** لەگەڵ نەشتەرگەری خەساندندا بۆ چارەسەری شێرپەنجەی تەشەنەکردوی پرۆستات قۆناغی (D٢) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەگرانی هەناسەدان، خوران، ئاوسان، کۆکە، تا، ئازاری سنگ، تێکچوونی جگەر، زەردی، لێڵبوونی میز، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری گەدە، پەڵە، لاوازی سێکسی، گێژی، هێڵنجدان، رشانەوە، قەبزی، کەمبوونەوەی چەوری، گەورەبوونی مەمك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠٠ میلیگرام ١جار لەرۆژێکدا، بۆ ماوەی ١ مانگ، پاشان ١٥٠ میلیگرام ١ جار لە رۆژێکدا.



## نمۆدیپین: NIMODIPINE

**ناوی بازرگانی:** Nimotop

**شێوەی دەرمان:** حەب و کەپسولی ٣٠ میلی‌گرامی و دەرزی ٠,٢ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Calcium channel blocker

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری لەتێکچوونی مێشك بەهۆی کەمی ڕۆیشتنی خوێن بۆ مێشك بۆ ئەنیۆریزم (مولولەیەکی خوێنە لە مێشکدا) خوێنبەربوونی ژێرجالاڵۆکەیی و شەقیقە و سەکتە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نارێکی لێدانی دڵ، گێژی، هیلاکبوون، خوێنبەربوون، ئاوسان، سوربونەوە، سەرئێشە، هێڵنجدان، قەبزی، نارەقکردنەوە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦٠ میلی‌گرام خۆراکی هەموو ٤ سەعاتێك، بۆ ماوەی ٢١ ڕۆژ. بۆ شەقیقە ٣٠ میلی‌گرام خۆراکی هەموو ٦ سەعاتێك. بۆ سەکتە ٦٠ میلی‌گرام هەموو ٤ سەعاتێك، پاش ١ سەعات لە ڕوداوەکە بۆ ماوەی ٢٨ ڕۆژ.

## نیسۆلدیپین: NISOLDIPINE

**ناوی بازرگانی:** Sular

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٨,٥ و ١٧ و ٢٥,٥ و ٣٤ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Calcium channel blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری سنگ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئاوسان، ئازاری سنگ، نارێکی لێدانی دڵ، گێژی، سەرئێشە، هێڵنجدان، سوربونەوە، پەڵە، برینی گەروو، ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٨,٥ تا ٣٤ میلی‌گرام بەشێوەی خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا، بەگەدەی خاڵی.

## نیتازۆکسانید: NITAZOXANIDE

**ناوی بازرگانی:** Alinia

**شێوەی دەرمان:** سەسپێنشنی ١٠٠ میلی‌گرام/ ٥ میلی‌لیتر و حەبی ٥٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiprotozoal agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر سکچوون بەهۆی (کریپتۆسپۆریدیۆم پارڤیۆم و جیاردیا لامبلیا) وە بەکاردێت

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، سەرئێشە، بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان.



**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار ، بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ. منالّی ١ تا ٣ سالّ ١٠٠ میلیگرام (٥میلی لیتر) ڕۆژانە ٢ جار ، بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ. منالّی ٤ تا ١١ سالّ ٢٠٠ میلیگرام (١٠میلی لیتر) ڕۆژانە ٢ جار ، بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ. گەورەتر لە ١٢ سالّ ٥٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار ، بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ لەگەلّ خواردندا وەردەگیرێت.

## نیتیسینۆن: NITISINONE

**ناوی بازرگانی:** Orfadin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢ و ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anti، tyrosinaemia

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی بۆماوەیی تایرۆسینیمیا جۆری١ ( نەخۆشی یەکی زیندەچالاکی یە ڕوودەدات کاتێك کە لەش ناتوانێت ئەنزیمی تەواو دروست بکات بۆ تێکشکاندنی پرۆتین و هەندێ خۆراك ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمی پەڕەی خوێن و خڕۆکەی سپی، ئیلتیهابی چاو، ئازاری چاو، هەوکردنی کۆڕنیەی چاو، خوران، پەلّە، سوربونەوەی چاو، زەردی، سکچوون، هێلّنجدان، قەبزی، ئازاری ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالّان سەرەتا ٥٠٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٢ جار، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بە پێی کاردانەوەکەی، لایەنی زۆر ڕۆژانە ٢ میلیگرام/ کیلۆگرامە.

## نایترازیپام: NITRAZEPAM

**ناوی بازرگانی:** Mogadon

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticovulsant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری **بەکارهێنان**ی ماوەکۆتای بێخەوی و کۆنترۆلّی تەشەنوج بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** پەلّە، گێژی، خەوالّویی، موعتادبوون، فەرامۆشی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٥ تا ١٠ میلیگرام کاتی خەوتن. بەساڵاچوان ٢,٥ تا ٥ میلیگرام پێش لە خەوتن. بۆ کۆنترۆلّی تەشەنوج گەورەکان ٥ تا ١٠ میلیگرام ڕێی پێ دەدرێت.

بۆ: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کەمکردنەوەی نەخۆشی



## نایترۆفیورانتۆین: NITROFURANTION

**ناوی بازرگانی:** Macrobid,Furadantin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلیگرامی و شەربەتی ٢٥ میلیگرام/٥ میلیلیتر و کەپسولی ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibacterial

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی ڕێڕەوی میز بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، تا، ڕشانەوە، تێکچوونی هەرس، پەڵە، خەواڵوویی، گێژی، موعتادبوون، فەرامۆشی، ئازاری سنگ، کۆکە، گۆڕانی ڕەنگی میز، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام خۆراکی، لەڕۆژێکدا لەگەڵ خواردندا، بۆ چارەسەر ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٤ جار بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ، منالآن بۆ پێشگری ١ تا ٢ میلیگرام/کیلۆگرام لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا،لایەنی زۆر ١٠٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. بۆ چارەسەر ٥ تا ٧ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا لە ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## نایترۆفیورازۆن: NITROFURAZONE

**ناوی بازرگانی:** Furacin

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی ٠,٢٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سوتان و دژی هەوکردنی ڕووکاری پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەوکردنی پێستی، ئاوسانی مەوزوعی، خوران.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٢ جار ڕووی ئەو شوێنەی پێ بماڵرێت.

## نایترۆگلیسرین: NITROGLYCERIN

**ناوی بازرگانی:** Nitrostat

**شێوەی دەرمان:** حەب و کەپسولی ٠,١٥ و ٠,٤ و ٢,٦ و ٢,٥ و ٦,٤ و ٦,٥ میلیگرامی و مەڵهەمی ٢٪ پلاستەری ٥ و ١٠ میلیگرام/٢٤سەعات گیراوە/سپرای ٤٠٠ مایکرۆگرام/دۆز و دەرزی ١ میلیگرام/میلیلیتر (٢ و ٥ و ١٠ میلی لیتر)، ٥ میلیگرام/میلیلیتر (١ و ٢ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antianginal/Vasodialator



**بەکارهێنان:** دژی ئازاری سنگ و بۆ کۆنترۆڵی پەستانی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرگێژبوون، کەمبوونەوەی کێش، ئازاری سك، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، ناجێگیری، بێهێزی، سوربونەوە، وشکی دەم، زیاد لێدانی دڵ حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ حەبی ژێر زمانی هەر ٥ دەقیقە ١ جار، بۆ پێشگری لە حەملەکانی ئازاری سنگ ١ کەپسول SR هەر ٨ تا ١٢ سەعاتێك، بۆ پەستانی خوێن ٥ تا ١٠٠ مایکرۆگرام لە خولەکێکدا بە دەمار. پاشان مەڵهەم ٢ تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا بەرووی سنگدا بماڵرێت.

## نایترۆپرۆساید: NITROPRUSSIDE

**ناوی بازرگانی:** Nitropress,nipride

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلیگرام/ڤیاڵ و ٢٥ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندنی پەستانی خوێن و دژی پەستانی بەرزی خوێن و بۆ فراوانکردنی مولولەکانی خوێن و نۆدیمای سی و پەککەوتنی دڵی خوێنتێژراو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** فێ، سوربونەوە، پەڵە، ئارەقکردنەوە، سەرئێشە، سەرگێژبوون، ناجێگیری، کەمبوونەوەی هۆشیاری، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ئازاری سنگ، ڕشانەوە، ئازاری سك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و مناڵان ٠,٥ تا ١٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام لە خولەکێکدا بە IV ئینفیوشن.

## نایترەس ئۆکساید: NITROUS OXIDE

**ناوی بازرگانی:** Entonex

**شێوەی دەرمان:** پاودەری بلوری.

**گروپی دەرمان:** Anesthatic

**بەکارهێنان:** بێ هۆشکەری ئیستنشاقی (هەڵمژین) و وەك دەرمانی یارمەتیدەر بۆ دروستبوونی بەنج و بۆ پاریزگاری لەبەنجی عمومی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، بێهەستبوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٪ تا ٥٠٪ لەگەڵ ئۆکسجیندا.



## نیزاتیدین: NIZATIDINE

**ناوی بازرگانی:** Axid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٧٥ میلیگرامی و کەپسولی ١٥٠ و ٣٠٠ میلیگرامی و گیراوەی ١٥ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** receptor antagonist H٢

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری برینی گەدەو دوانزەگرێ و دڵەکزە و ئیلتیهابی سورێنچك و گەڕانەوەی ترشی گەدە لە گەدەوە بەرەو سورێنچك و تێکچوونی گەدە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرێشە، گێژی، تا، پەڵە، سکچوون، کۆکە، ئاوسان، برینی گەروو، زەردی، قەبزی، شڵەژان، بێهێزی، خوێنبەربوون، نارێکی لێدانی دڵ، بەگرانی هەناسەدان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٧٥ تا ٣٠٠ میلیگرام ١ تا ٢ جار لە رۆژێکدا. منالاّن ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا بۆ ماوەی ٨ هەفتە.

## نۆنۆکسینول: NONOXYNOL-٩

**ناوی بازرگانی:** Delfen

**شێوەی دەرمان:** کرێمی ژنانە ٥٪.

**گروپی دەرمان:** Contraceptive

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری لە سکپڕی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی زایەندی ژنان، زیادبوونی هەوکردنی زایەندی ژنان، سوتانەوەی زایەندی ژنان.

**بڕی دەرمان:** کەمتر لە ١ سەعات پێش لە پەیوەندی جنسی سودی لێوەردەگیرێت و بەکاردێت.

## نۆرئیپی نفرین: NOREPINPHRINE

**ناوی بازرگانی:** Levophed

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,١٪ و ١ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Adrenergic agonist

**بەکارهێنان:** بچوککەرەوەی مولولەکانی خوێنە و بۆ پارێزگاری کردن لە پەستانی خوێن و لە نزمبوونەوەی پەستانی توند و بۆ چارەسەری وەستانی دڵ بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێخەوی، دڵەڕاوکێ، دڵە ڕاوکێ، بێهێزی، سەرگێژبوون، ئازاری قەفەسەی سنگ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تەشەنوج، ڕەبۆ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٨ تا ٣٠ مایکرۆگرام/خولەکێکدا بە IV، منالآن ٠,٠٥ تا ٠,١ مایکرۆگرام/کیلۆگرام/خولەك بە IV.

## نۆریثیستیرۆن: NORETHISTERONE

**ناوی بازرگانی:** Utovlan,primolut N

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Progestogen

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی ناوەوەی منداڵدان و بۆ بەرگری لە سکپڕی و بۆ لەحەیزچوونەوە و خوێنبەربوونی زایەندی ژنان و تێکچوونی بێ نوێژی و خوێنبەربوونی منداڵدان و شێرپەنجەی مەمك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بێ نوێژی، کۆبونەوەی ئاو لەلەشدا، گۆڕانی لەش، هێڵنجدان، سەرئێشە، گێژی، بێخەوی، خەمۆکی، خەوالوویی، پەڵە، خوران، شەرا – زیپکە، هەڵوەرینی موو، زەردی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار بڕەکەی بە پێی جۆری نەخۆشی یەکە دەگۆڕێت تا ڕۆژانە ٢٥ میلیگرام. بۆ شێرپەنجەی مەمك ڕۆژانە ٤٠ میلیگرام زیاد دەکرێت بۆ ڕۆژانە ٦٠ میلیگرام ئەگەر پێویست بوو.

## نۆرفلۆکساسین: NORFLOXACIN

**ناوی بازرگانی:** Utinor,noroxin

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەبی ٤٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی بەشی خوارەوەی ڕێڕەوی میز و هەوکردنی موزمینی پرۆستات و سوزەنەك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نارێکی لێدانی دڵ، لەرزین، گێژی، فێ. سکچوون، هێڵنجدان، سەرئێشە، وڕێنە، ئازاری گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، پەڵە، دڵەکزە، ئارەقکردنەوە، ئازاری کۆم و پشت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار لایەنی زۆر بۆ ماوەی ١٢ هەفتە.



## نۆرفلۆکساسین: NORFLOXACIN

**ناوی بازرگانی:** Noroxin

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی قەترەی چاو.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کزانەوەی چاو، هەستیاربوون بەڕوناکی، سوربونەوەی چاو، تامی تاڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی تەمەن ١ ساڵ و گەورەتر ١ قەترە بۆ هەر چاوێك ٤ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ.

## نۆرجیستریل: NORGESTREL

**ناوی بازرگانی:** Ovrette

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٠٧٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Contraceptive

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری لە سکپڕی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك، تەشەنوج، زیپکە، هەڵوەرینی موو، کەمبوون و زیادبوونی ئارەزوی خواردن، ئۆدیما، شەرا، گەورەبوونی مەمك، گێژی، هیلاکبوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، پەڵە، جەڵدە، سەرئێشە، سیمبوونی ماسولکەیی دڵ ئازار و کرژبوونی قاچ.

**بڕی دەرمان:** ٠.٠٧٥ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا، سەرەتای ڕۆژی یەکەمی بێ نوێژی مانگانە.

## نۆرتریپتیلین: NORTRIPTYLINE

**ناوی بازرگانی:** Pamelor,Aventyl,allegron

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٥ میلی‌گرامی و کەپسولی ١٠ و ٢٥ و ٥٠ و ٧٥ میلی‌گرامی و گیراوەی ١٠ میلی‌گرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Atricyclic antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خەمۆکی و نەخۆشی ترس و دڵەڕوکێ بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، سەرئێشە، تەشەنوج، دڵەڕاوکێ، بێهێزی، گێژی، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، وشکبوونی دەم، گیرانی میز، تێکچوونی بینین، قەبزی، هێڵنجدان، حەساسیەت، هەستیاربوون بە ڕوناکی، ڕشانەوە، سکچوون، پەڵە، ئۆدیما، زیادبوونی پەستانی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان لەسەرەتادا ٢٥ میلی‌گرام خۆراکی ٣ تا ٤ جار لەڕۆژێکدا،پاشان بەتەدریجی ئەتوانی کە بڕی دەرمان زیادبکەیت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٥٠ میلی‌گرامە. پیرەکان ٣٠ تا ٥٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە یان لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. مناڵی ٦ تا ٧ ساڵ ١٠ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا. منالی ٨ تا ١١ ساڵ ١٠ تا ٢٠ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا. منالی گەورەتر لە ١١ ساڵ ٢٥ تا ٣٥ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا.

## نیستاتین: NYSTATIN SYSTEMIC

**ناوی بازرگانی:** Nystop,Mycostatin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠٠٠٠ یەکەیی و سەسپێنشنی ١٠٠٠٠٠ یەکەیی و حەبی زایەندی ١٠٠٠٠٠ یەکەیی و مەڵهەمی ١٠٠٠٠٠ یەکەی/گرام.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری مەوزوعی کەڕووی دەم بەهۆی کاندیداوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٠ تا ٦٠٠ هەزار یەکە لە سەسپێنشنی خۆراکی، ڕۆژانە ٤ جار یان ٥٠٠٠٠٠ تا ١٠٠٠٠٠٠ یەکە حەب ڕۆژانە ٣ جار. منالانی گەورەتر لە ٣ مانگ ٢٥٠٠٠٠ تا ٥٠٠٠٠٠ یەکە سەسپێنشنی خۆراکی، ڕۆژانە ٤ جار. منالانی ساوا و شیرخۆری تازەبوو ١٠٠٠٠٠ یەکە سەسپێنشنی خۆراکی، ڕۆژانە ٤ جار. بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی کاندیدازی پێستی و لینجە پەردەی موزمین، ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار بە دەرمانی ڕووی پێست دەماڵرێت.

## نیستاتین: NYSTATIN TOPICAL

**ناوی بازرگانی:** Nystop,Mycostatin

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم و کریم و پاودەر.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی کەڕوویی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێست.

**بڕی دەرمان:** ٢ تا ٣ جار لەڕۆژێکدا ئەو شوێنەی پێ دەماڵرێت.



## نیستاتین: NISTATIN VAGINAL

**ناوی بازرگانی:** Nystop,nadostine

**شێوەی دەرمان:** حەب و کرێمی زایەندی ژنان.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی کەڕوویی زایەندی ژنان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوەی زایەندی ژنان، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠٠٠٠ یەکە لە کرێم ١ تا ٢ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٢ هەفتە. ١حەب لە کاتی خەودا شەوانە لە زایەندی ژنان دادەنرێت بۆ ماوەی ٢ هەفتە.

***

# O

## ئۆبیدۆکسیم کلۆراید: OBIDOXIME CHLORIDE

**ناوی بازرگانی:** Taxogonin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠ میلیگرام/میلیلیتر و ٢٧٥ میلیگرام/میلیلیتر (٠,٨ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antidote

**بەکارهێنان:** دژە ژەهری تایبەتی ژەهراویبوونە بەهۆی ئۆرگانۆفۆسفەیتەکان لەگەڵ ئەترۆپین دا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی دەم، زۆرلێدانی دڵ، دابەزینی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ میلیگرام بەدەمار، ٥ خولەك پاش لە یەکەمین بڕی دەرمانی ئەترۆپین سەلفەیت و لە کاتی نەبوونی کاردانەوە، دوبارەکردنەوەی ١ تا ٢ جار هەر ٢ سەعاتێك. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣ تا ٥ میلیگرام/ کیلۆگرامە. منالآن ٤ تا ٨ میلیگرام/کیلۆگرام بەدەمار (بەیەك بڕی دەرمان).

## ئۆکتریۆتاید: OCTREOTIDE

**ناوی بازرگانی:** Sandostatin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ و ١٠٠ و ٢٠٠ مایکرۆگرام/میلیلیتر و پاودەری دەرزی ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Somatostatin analogue

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نیشانەی سکچوونی توند و سووربونەوە بەهۆی هەندێ جۆری شێرپەنجەوە و نەخۆشی نەکرۆمیگالی (زیادبوونی ناسروشتی قەبارەی ئێسکەکەکان وەك دەست و قاچ و..بەهۆی زۆر دروست بوونی هۆرمۆنی گەشەوە سۆماتۆترۆفین زۆرتر لەوانەدا ڕوودەدات کەلەگەشە وەستاون) و بۆ چارەسەری نیشانەی سکچوونی ئاوی لەگەڵ لوی دەردراوی (VIP)، هۆرمۆنێکی پیتایدە دروست دەکرێت لەلایەن خانەکانی پەنکریاسەوە و بڕێکی زۆری ئەم هۆرمۆنە ئەبێتەهۆی سکچوونێکی توند. بۆ چارەسەرەی نیشانەی نەخۆشی دامپینگ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، هێڵنجدان، نارێکی لێدانی دڵ، هیلاکبوون، سەرگێژبوون، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا، هەڵوەرینی موو، سکچوون، غازات، قەبزی، ڕشانەوە، زیادبوون و کەمبوونی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەرەی نیشانەی نەخۆشی دامپینگ گەورەکان ٥٠ تا ١٥٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە ژێرپێستی، ئەکرۆمیگالی ٥٠ مایکرۆگرام ژێرپێستی SC ڕۆژانە ٣ جار، بڕە دەرمانەکانی تر بەپێی کاردانەوەی چارەسەر دیاری دەکرێت. بۆ چارەسەری نیشانەی سکچوونی ئاوی لەگەڵ لوی دەردراوی (VIP) گەورەکان ٢٠٠ تا ٣٠٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە ژێرپێستی لە ٢ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا بۆ ماوەی ٢ هەفتە. بڕە دەرمانەکانی تر بەپێی کاردانەوەی چارەسەر دیاری دەکرێت، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٤٥٠ مایکرۆگرامە. بۆ چارەسەری نیشانەی سکچوونی توند و سوربونەوە بەهۆی هەندێ جۆری شێرپەنجەوە گەورەکان ١٠٠ تا ٦٠٠ مایکرۆگرام ژێرپێستی لە ٢ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا بۆ ماوەی ٢ هەفتە (بڕی دەرمانی ئاسایی ڕۆژانە ٣٠٠ مایکرۆگرامە) بڕە دەرمانەکانی تر بەپێی کاردانەوەی چارەسەر دیاری دەکرێت.

## ئۆفلۆکساسین: OFLOXACIN

**ناوی بازرگانی:** Floxin,tarvid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ و ٣٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی و دەرزی ٢ میلیگرام/ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سکچوونی هەوکردوو و هەوکردنی ئێسك و جومگە و هەوکردنی توندی ڕێڕەوی میز و هەوکردنی سوك و مامناوەندی میزەڕۆ و بەشی خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسە و پێست و هەوکردنی پرۆستات و هەوکردنی زایەندی کلامیدیاڵ و سوزەنەکی سادە و هەوکردنی بەکتریایی خوێن و هەوکردنی شانە نەرمەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، پەڵە، سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێهێزی، هیلاکبوون، تەشەنوج، وشکی دەم، ئازاری جومگە، تەنگەنەفەسی، خوران، ئازاری سنگ، هەستیاربوون بەڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ تا ٤٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ تا ٢ جار. بۆ سکچوونی هەوکردوو و هەوکردنی ئێسك و جومگە و هەوکردنی توندی ڕێڕەوی میز گەورەکان ٤٠٠ تا ٨٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار، بۆ هەوکردنی سوك و مامناوەندی میزەڕۆ ٢٠٠ تا ٤٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار.



## ئۆفلۆکساسین: OFLOXACIN OPH.

**ناوی بازرگانی:** Ocuflox,exocin

**شێوەی دەرمان:** قەترەی ٣,٠٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی چاو و برینی کۆرنیەی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بینین، سوتانەوە، سوربونەوە، خوران، وشکبوونەوە و ئازاری چاو،هەستیاربوون بەتیشکی خۆر، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و مناڵانی زیاتر لە ١ ساڵ ١ تا ٢ قەترە بۆ چاوێك یان بۆ هەردوو چاوەکە هەموو ٢ تا ٤ سەعاتێك بۆ ماوەی ٢ ڕۆژ،پاشان ڕۆژانە ٤ جار. لایەنی زۆری ماوەی چارەسەر ١٠ ڕۆژە.

## ئۆفلۆکساسین: OFLOXACIN OTC.

**ناوی بازرگانی:** Generic

**شێوەی دەرمان:** قەترەی گوێ ٣,٠٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی گوێی ناوەڕاست و دەرەوە و هەوکردنی موزمینی گوێی ناوەڕاست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی مەوزوعی، خوران، ئازاری گوێ، گێژی، سەرئێشە، تێکچوونی هاوسەنگی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالانی گەورەتر لە ١٣ ساڵ بۆ هەوکردنی گوێی دەرەوە ١٠ قەترە بۆ گوێ یەك یان بۆ هەردووکیان بۆ ماوەی ٧ تا ١٤ ڕۆژ. منالانی ١ تا ١٢ ساڵ بۆ هەوکردنی گوێی ناوەڕاست ٥ قەترە بۆ گوێ یەك یان بۆ هەردووکیان ڕۆژانە ٢ جار بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ.

## ئۆلانزاپین: OLANZAPINE

**ناوی بازرگانی:** Zyprexa

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ٢,٥ و ٧,٥ و ١٠ و ١٥ و ٢٠ میلیگرامی و دەرزی ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری تێکچوونی دەروونی و شێتی دووجەمسەری و شیزۆفرینیا و خرۆشان بەکاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** تورەبوون، قەبزی، سەرئێشە، دڵەڕاوكێ، زیادلێدانی دڵ، سەرگێژبوون، ئازاری قەفەسەی سنگ، كۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا، زیادبوونی لیك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، كۆكە، پەڵە، تەنگە نەفەسی، هەوكردنی گەروو، هەستیاربوون بەڕووناكی.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ٥ تا ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار. ئەتوانی بە پێی پێویست هەر هەفتەی بڕی ٥ میلیگرام زیادبكەیت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٠ میلیگرامە. لە نەخۆشە پیر و بێ تواناكان بڕی دەرمان ڕۆژانە ٥ میلیگرامە.

## ئۆلمیسارتان میدۆكسۆمیل: OLMESARTAN MEDOXOMIL

**ناوی بازرگانی:** Olmetec

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٠ و ٤٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Angitensin II antagonist

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سكچوون، سەرگێژبوون، كۆكە، جیوب، ئازاری ماسولكە، تێكچوونی هەرس، پەڵە، ئازاری سنگ، میزی خویناوی، هەوكردنی جومگە، سەرئێشە، خوران، هەوكردنی لوت و گەروو.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان سەرەتا ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەكرێت بۆ ٢٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٤٠ میلیگرامە.

## ئۆلۆپاتادین: OPH. OLOPATADINE

**ناوی بازرگانی:** Olopat

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی قەترەی چاوی ٠,١٪.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەر و پێشگری لە خورانی چاو بەهۆی حەساسیەتی وەرزی و چاوئێشە و ئیلتیهابەوە بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** سەرئێشە، وشكبوونەوەی چاو، ئیلتیهابی كۆرنیەی چاو، خوران و سووربوونەوە، سوتانەوە، برینی گەروو، گۆڕینی تام، لەرزین، ڕوشان، كۆكە، كەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، ئازاری ماسولكە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێكچوونی خەو، لاوازی، هیلاكبوون، ئارەقكردنەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان و منداڵانی زیاتر لە ٣ ساڵ ١ تا ٢ قەترە ڕۆژانە ٢ جار. ماوەی بەكارهێنانی دەرمان ٤ مانگە.

## ئۆلۆپاتادین: NASAL OLOPATADINE

**ناوی بازرگانی:** Patanase

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی سپرای.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خوران و حەساسیەت و هەوکردنی وەرزی لوت وپژمین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوونی لوت، سوتانەوە و ئازار لەکاتی میزکردن، بێخەوی، سەرئێشە، تامی تاڵی دەم، وشکبوونەوەی چاو، ئازاری گەروو، کۆکە، پژمین، هێڵنجدان، سکچوون، ئازاری گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ ساڵ ٢ سپرای بۆ هەرکونێکی لوت ڕۆژانە ٢ جار.

## ئۆلۆپاتادین: HCL OLOPATADINE

**ناوی بازرگانی:** Patanol

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاوی ٠,١ ٪ و ٠,٢ ٪ و سپرای لوت ٠,٦٪.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خوران بەهۆی حەساسیەت و چاوئێشە و ئیلتیهابی چاو و حەساسیەت و ئیلتیهابی وەرزی لوت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سەرئێشە، هیلاکبوون، خەواڵویی، خەمۆکی، تامی تاڵی ناودەم، تێکچوونی بینین، سوتانەوە، وشکبوونەوەی چاو، ئیلتیهابی کۆرنیەی چاو، خوێنتیازان، ئاوبەندی پێڵوی چاو، خوران و سووربونەوە، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، کۆکە، وشکبوونەوەی دەم، ڕوشان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ١ تا ٢ قەترەی ٠,١٪ ڕۆژانە ٢ جار، ١ قەترەی ٠,٢٪ ڕۆژانە ١ جار. گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ ساڵ ٢ سپرای بۆ هەر کونێکی لوت ڕۆژانە ٢ جار، منداڵانی ٦ تا ١١ ساڵ ١ سپرای بۆ هەر کونێکی لوت ڕۆژانە ٢ جار.

## ئۆلسالازین: OLSALAZINE

**ناوی بازرگانی:** Dipentum

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥٠ میلیگرامی و حەبی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiinflammatory

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی کۆڵۆنی خۆرەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری گەدە، تا، سکچوون، ئازاری سنگ، هەناسە برکێ، نەمانی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، خواردن، زەردی، دڵەکزە، پەڵە، سەرئێشە، ئازاری جومگە و ماسولکە، زۆرمیزکردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ ساڵ لە حەملەی تیژدا، ڕۆژانە ١ گرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا پاش لە ژەمەکانی خواردن، بۆ زیاتر لە هەفتەیەك ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆر ڕۆژانە ٣ گرام (لایەنی زۆری یەك بڕی دەرمان ١ گرامە). بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٥٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار پاش ژەمەکانی خواردن،منداڵانی ٢ تا ١٨ ساڵ بۆ چارەسەری حەملەی تیژی ئیلتیهابی سوکی کۆڵۆن ٥٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار پاش خواردن بۆ زیاتر لەهەفتەیەك ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆر ١ گرام ڕۆژانە ٣ جار،بۆ پاراستن و چاکبونەوەی ئیلتیهابی سوکی کۆڵۆن منداڵانی ٢ تا ١٨ ساڵ ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار پاش خواردن.

## ئۆمالیزوماب: OMALIZUMAB

**ناوی بازرگانی:** Xolair

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ١٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiasthma

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری و چارەسەری نەخۆشی ڕەبۆی مامناند و توند بەهۆی حەساسیەتەوە لە گەورەکان و منداڵان کە بەلانی کەمەوە ١٢ ساڵن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، هێڵنجدان، سکچوون، کرژبوونی بۆری هەوا، خیزەخیز، پەڵەی پێست، ئاوسان، هیلاکی، سەرئێشە، ئازاری ماسولکە و جومگە، گێژی، جیوب، هەڵوەرینی موو، خوران، سوربونەوە، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی گەدە، هەستیاربوون بە ڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥٠ تا ٣٧٥ میلیگرام ژێرپێستی هەموو ٢ تا ٤ هەفتەیەك.

## ئۆمیگا -٣- ئەسید: OMEGA-٣-ACID ETHYLE ESTERS

**ناوی بازرگانی:** Omacor

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Lipid regulating drugs

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیادبوونی چەوری لە جۆری (ترایگلیــراید ) و بەرگری دووەمی پاش جەڵدەی دڵ بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، تێکچوونی تام، گێژی، تێکچوونی جگەر، سەرئێشە، حەساسیەت، زیادبوونی شەکری خوێن، زیپکە، پەڵە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، وشکی لوت، شەرا، زیادبوونی ژمارەی خانە سپییەکان.

**بڕی دەرمان:** بۆ زیادبوونی چەوری لە جۆری (هایپەرترایگلیسرایدیمیا) سەرەتا ٢ کەپسول ڕۆژانە لەگەڵ خواردندا، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ ڕۆژانە ٤ کەپسول. بۆ بەرگری دووەمی پاش جەڵدەی دڵ ١ کەپسول ڕۆژانە لەگەڵ خواردندا.

## ئۆمیگا -٣- مارین: OMEGA-٣-MARINE TRIGLYCERIDES

**ناوی بازرگانی:** Maxepa

**شێوەی دەرمان:** بە شلی و کەپسولی ١ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Lipid regulating drugs

**بەکارهێنان:** وەك یارمەتیدەر لە کەمکردنەوەی چەوری ترایگلیسرایدی پلازما لە زیادبوونی توندی ترایگلیسرایددا (هایپەرترایگلیسرایدیمیا) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** جار جار هێڵنجدان و قرقێنە.

**بڕی دەرمان:** ٥ کەپسول ڕۆژانە ٢ جار لەگەڵ خواردندا. ٥ میلیلیتر ڕۆژانە ٢ جار لەگەڵ خواردندا.

## ئۆمیپرازۆڵ: OMEPRAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Losec

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٠ و ٤٠ میلیگرامی و حەبی ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Proton pump inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری برینی گەدە و دوانزەگرێ و دڵەکزە و گەڕانەوەی ترشی گەدە بەرەو سورێنچك و برینی گەدە بەهۆی بەکتریای H-pyloriی یەوە و بۆ زیاد دەردانی ئاوگی گەدەیی ZES بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەمۆکی، دڵەڕاوکێ، تورەبوون، ئازاری قەفەسەی سنگ، ئۆدیمای موحیگی، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، سکچوون، ڕشانەوە، قەبزی، هێڵنجدان، ئازاری سك، زۆرمیزکردن، ئازاری گون، تێکچوونی بینین، میزی خویناوی، پەڵە، لەرزین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ برینی دوانزەگرێ ٢٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، ماوەی چارەسەر ٤ تا ٨ هەفتە. بۆ برینی گەدە ٤٠ میلیگرام خۆراکی بۆ ماوەی ٤ تا ٨ هەفتە. بۆ چارەسەری گەڕانەوەی ترشی گەدە بەرەو سورێنچك ڕۆژانە ٢٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار، بۆ ماوەی ٤ تا ٨ هەفتە. برینی گەدە بەهۆی بەکتریای H-pyloriی یەوە ڕۆژانە ٤٠ میلیگرام خۆراکی لە ٢ ژەمدا. بۆ ZES سەرەتا ٦٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، ڕێژەی بڕی دەرمانی ئاسایی ٢٠ تا ١٢٠ میلیگرامە (زیاتر لە ٨٠ میلیگرام لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا).

## ئۆندانسیترۆن: ONDANSETRON HCL

**ناوی بازرگانی:** Zofran

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی خۆراکی ٤ میلیگرام/٥ میلیلیتر و حەبی ٤ و ٨ و ٢٤ میلیگرامی و دەرزی ٢ میلیگرام/میلیلیتر (٢ میلی لیتر، ٤ میلی لیتر).

**گرووپی دەرمان:** Antiemetic

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری لە هێڵنجدان و ڕشانەوە بەهۆی چارەسەری کیمیایی یەوە و بۆ پێشگری لە هێڵنجدان و ڕشانەوە پاش لە نەشتەرگەری و بۆ پێشگری هێڵنجدان و ڕشانەوە بەهۆی چارەسەری تیشکی یەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون. بێهێزی، ئازاری سنگ،پەڵە، ئازاری ماسولکە و ئێسك، هیلاکی، تا، قەبزی، ئازاری سك، سکچوون، گیرانی میز.

**بڕی دەرمان:** بۆ پێشگری لە هێڵنجدان و ڕشانەوە بەهۆی چارەسەری کیمیایی یەوە گەورەکان و منالآنی سەروی ٤ سالّ ٣٠ خولەك پێش چارەسەری کیمیایی ٠,١٥ میلیگرام/کیلۆگرام بە دەمار لە ماوەی ١٥ خولەکدا بەIV ئینفیوشن دەکرێت و پاشان ٠,١٥ میلیگرام/کیلۆگرام ٤ تا ٨ سەعات پاش بڕی دەرمانی یەکەمی پێی دەدرێت. گەورەکان و منالآنی سەروی ١٢ سالّ ٨ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار، ٣٠ خولەك پێش لە چارەسەری کیمیایی ڕێی پێدەدرێت و پاش ٨ سەعات پاش لە بڕی دەرمانی یەکەمی دیسان دوبارە دەکرێتەوە و پاشان ٨ میلیگرام هەر ١٢ سەعاتێك تا ٢ ڕۆژ پاش لە کۆتایی چارەسەری کیمیایی ڕێی پێدەدرێت. منالآنی ٤ تا ١٢ سالّ ٤ میلیگرام خۆراکی، ڕۆژانە ٣ جار. بۆ پێشگرتن لە هێڵنجدان و ڕشانەوەی پاش لە نەشتەرگەری گەورەکان ١٦میلیگرام خۆراکی ١ سەعات پێش لە بێهۆشی یان ٤ میلیگرام بە دەمار بێ ماوە دەستبەجێ پێش لە بێهۆشی یان بۆ ماوەی کۆتایی پاش لە نەشتەرگەری ڕێی پێ دەدرێت. بۆ پێشگری هێڵنجدان و ڕشانەوە بەهۆی چارەسەری تیشکی یەوە گەورەکان ٨ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ جار، یەکەمین بڕ ئەبێت ١ تا ٢ سەعات پێش لە چارەسەری تیشکی ڕێی پێ بدرێت. لە نەخۆشەکانی توشبوو بە پەککەوتنی توندی جگەری بڕی دەرمانی تەواو نابێت زیاتر لە ٨ میلیگرام بێت.

## گیراوەی شۆردنی چاو: OPTHALMIC BATH SOLUTION

**ناوی بازرگانی:** Eye Bath

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی تەعقیمی چاوی بۆریك ئەسید ١٠٠/١٩٦١٠ میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** شۆردنی چاو.

ئاگادار بن، دەرمان شوێنەواری خراپ و کاریگەری نەگەتیڤ بەجێدەهێڵێت [illegible]



**بەکارهێنان:** بۆ شۆردنی چاو و هێورکردنەوەی ڕوشانی چاو و پاککردنەوەی چاو لە مەوادی دەرەکی و هێورکردنەوەی چاو پاش لە جێ بەجێکردنی تەشخیصی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** بە پێی پێویست و پێوانە گیراوە بەکاردێت.

## ئۆپریلڤیکین: OPRELVEKIN

**ناوی بازرگانی:** Neumega

**شێوەی دەرمان:** پاودەر بۆ دەرزی ٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Hematopoietic

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری لە کەمبوونەوەی پەڕەکانی خوێن بەهۆی چارەسەری کیمیاییەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیاد لێدانی دڵ، فراوانبوونی مولولەکانی خوێن، تا، دڵەکوتێ، سەرئێشە، گێژی، بێخەوی، پەڵە، هەوکردنی لوت و گەروو، تێکچوونی بینین، کەمبوونی کالسیۆم، هەوکردنی پێست، تەنگەنەفەسی، ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام ژێرپێستی بۆ ماوەی ١٠ تا ٢١ ڕۆژ. منداڵانی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ٧٥ تا ١٠٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام ژێرپێستی بۆ ماوەی ١٠ تا ٢١ ڕۆژ. منداڵانی بچوکتر لە ١٢ ساڵ ٢٥ مایکرۆگرام/کیلۆگرام ژێرپێستی.

## ئۆرلیستات: ORLISTAT

**ناوی بازرگانی:** Xenical, alli

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٦٠ میلیگرامی (alli) و کەپسولی ١٢٠ میلیگرامی (xenical).

**گروپی دەرمان:** Anti-Obesity ,lapase inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵکردنی قەڵەوی و زیادبوونی کێش بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ڕشانەوە، ئازاری سك، بێخەوی، دڵەڕاوکێ، گێژبوون، هیلاکبوون، هێڵنجدان، ئازاری کۆم، چەوربوونی پیسایی، وشکی پێست، پەڵە، ئازاری پشت، هەوکردنی جومگە، ئەنفلۆنزا، کەمبوونەوەی کێش و ڤیتامینەکان، تێکچوونی ددان، هەوکردنی زایەندی ژنان، ئازاری ماسولکەیی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦٠ میلیگرامی (alli) یان ١٢٠ میلیگرامی (xenical) خۆراکی ٣ جار لە ڕۆژێکدا لەگەڵ هەر ژەمێکی ئەصلی خواردندا لایەنی زۆر ٣٦٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا ئەتوانی لەم دەرمانەبەکاربهێنیت.

## ئۆرفینادرین: ORPHENADRINE

**ناوی بازرگانی:** Norflex,biorphen,disipal

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ٥٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و شلی ٢٥ میلیگرام/٥ میلیلیتر و حەبی ١٠٠ میلیگرامی و دەرزی ٣٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی دەروونی و مێشکی (پارکینسۆن و دیسکینسیا) و لەگەڵ چارەسەری فیزیایی بۆ چارەسەری نەخۆشی پەیکەرە ماسولکە وەك کرژبوون و ئازار و برین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نارێکی لێدانی دڵ، خەمۆکی، خرۆشان، لەرزین، ڤێ، کەمی میزکردن، وشکبوونەوەی دەم و قورگ، ئاوسان، بەگرانی هەناسەدان، تێکچوونی بینین، سەرئێشە، گێژی، خەواڵویی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، بێهێزی، قەبزی، زیاد لێدانی دڵ، ورێنە، پەڵە، گیرانی میز، بێخەوی.

**بڕی دەرمان:** بۆ نەخۆشی دەروونی و مێشکی (پارکینسۆن و دیسکینسیا) گەورەکان سەرەتا ١٥٠ میلیگرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، بە تەدریجی زیاد دەکرێت لە هەنگاوەکانی ٥٠ میلیگرامی هەموو ٢ تا ٣ ڕۆژێك بە پێی کاردانەوەکەی ڕێژەی بڕی دەرمانی ئاسایی ١٥٠ تا ٣٠٠ میلیگرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٤٠٠ میلیگرامە. بۆ کرژبوونی ماسولکە ١٠٠ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا (بەیانیان و ئێواران ) یان ٦٠ میلیگرام بە دەرزی ماسولکەیی یان دەمار، دوبارە دەکرێتەوە هەموو ١٢ سەعاتێك.

## ئۆ- ئار- ئێس: (O.R.S ( Oral rehydration salt

**ناوی بازرگانی:** Oralit

**شێوەی دەرمان:** پاودەری کلۆریدی صۆدیۆم ٣,٥ گرام + ترایصۆدیۆم سیترەیت ٢,٩ گرام + کلۆریدی پۆتاسیۆم ١,٥ گرام + دێکستڕۆز ئەنهایدرەس ٢٠ گرام.

**گرووپی دەرمان:** Oral rehydration therapy

**بەکارهێنان:** قەرەبووکەرەوەی ئاو وخوێ لەدەست چووەکان لە سکچوونی تونددا.

**کاریگەری لاوەکی:** لەمناڵی بچوکتر لە ١ ساڵ بەکارهێنانی زیاد لە ڕادە ئەبێتەهۆی تەشەنوج، لە پەککەوتنی گورچیلەدا بەکارهێنانی زیاد لە ڕادە ئەبێتەهۆی زیادبوونی صۆدیۆم، زیادبوونی پۆتاسیۆم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ تا ٤٠٠ میلیلیتر لە گیراوەی O.R.S بۆ هەر جارێکی پیسایی شل. منالان ٢٠٠ میلیلیتر لە گیراوەی O.R.S بۆ هەر جارێکی پیسایی شل. شیرخۆرکان ١ تا ١,٥ بەئاستی قەبارەی خواردنی ئاسایی شیرخۆر (لە نێو جارەکانی بەکارهێنانی O.R.S دا، دایك ئەبێت شیر بە منالە شیرخۆرەکەی بدات.



## ئۆسیلتامیڤیر: OSELTAMAVIR

**ناوی بازرگانی:** Tamiflu

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٧٥ و ٣٠ و ٤٥ میلیگرامی و سەسپێنشنی ١٢ میلیگرام/میلی لیتر..

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و پێشگری نەخۆشی ئەنفلۆنزای جۆری A و B بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، بلۆقکردن و پەڵەی پێست، بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان، سکچوون، سەرئێشە، گێژی، خوێنبەربوونی لوت، بێخەوی، سوربونەوەی چاو، کۆکە، ئازاری سك، ئیلتیهابی چاو.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەر گەورەکان ٧٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ. بۆ پێشگری ٧٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ. بۆ چارەسەر منالآن کێشی کەمتر لە ١٥ کیلۆگرام ٣٠ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا. منالآنی ١٥ تا ٢٣ کیلۆگرام ٤٥ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا. منالآنی ٢٣ تا ٤٠ کیلۆگرام ٦٠ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا. منالآنی زیاتر لە ٤٠ کیلۆگرام وەکو گەورەکان ٧٥ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا. یان ١٣ ساڵ و گەورەتر ٧٥ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا.

## ئۆکساسیلین: OXACILLIN

**ناوی بازرگانی:** Prostaphlin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠ میلیگرامی و ١و ٢ و ١٠ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردن بەهۆی ستافیلۆکۆکەسەوە وەك هەوکردنی پێست و سی و سێپتیسیمیا (هەوکردنی خوێن) و جیوب و پەردەکانی مێشك و پەردەی ناوەوەی دڵ و جومگە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، تا، برینی گەروو، بلۆقکردن و پەڵەی پێست، ڤێ، سەرئێشە، خوێنبەربوون، سکچوون، ئازاری سك، ئاوسان، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلیگرام (٢ گرام لە حاڵەتی توندا) بە ماسولکەیی یان دەمار هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك. منالآن ١٥٠ تا ٢٠٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا بە دەمار دابەشکراو لەهەموو ٤ تا ٦ سەعاتێکدا.



## ئۆکسالیپلاتین: OXALIPLATIN

**ناوی بازرگانی:** Eloxatin

**شێوەی دەرمان:** پاودەری دەرزی ٥٠ میلیگرامی و ١٠٠ میلیگرامی و دەرزی ٥ میلیگرام/میلیلیتر (١٠ میلیگرام، ٢٠ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Alkelating agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی هێلکەدان و کۆلۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تەشەنوج، کەمبوونی پۆتاسیۆم و کالسیۆم و صۆدیۆم و فۆسفات، کەمبوونەوەی بیستن، تێکچوونی گوێ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٨٥ میلیگرام مەتردوجا بە IV ئینفیوشن لە ماوەی ٢ تا ٦ سەعاتدا (هەر ٢ هەفتە ١ جار).

## ئۆکساندرۆلۆن: OXANDROLONE

**ناوی بازرگانی:** Oxandrin, Ionavar

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Steroid Anabolic

**بەکارهێنان:** وەك هاندەری گەشە لە دواکەوتنی گەشەو دواکەوتنی باڵغبوونی سروشتی و دەرمانی یارمەتیدەر بۆ زیادکردنی کێش بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێخەوی، تێکچوونی بێ نوێژی، خەمۆکی، گەورەبوونی مەمك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نازاری سك، زیادبوونی کۆلیسترۆڵ زیپکە. ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** وەك دەرمانی یارمەتیدەر بۆ زیادکردنی کێش گەورەکان ٢,٥ تا ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار، ڕێکخستنی بڕی دەرمان بە پێی کاردانەوەی بالینی یە. خولی چارەسەر ٢ تا ٤ هەفتە دەبێت،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٠ میلیگرامە. هاندەری گەشە لە دواکەوتنی گەشەو دواکەوتنی باڵغبوونی سروشتی کوڕان ڕۆژانە ٠,١ میلیگرام/کیلۆگرام.

## ئۆکساپرۆزین: OXAPROZIN

**ناوی بازرگانی:** Daypro

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID



**بەکارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهابی جومگەکان و ڕۆماتیزم و پوکانەوەی ئێسك و ڕۆماتیزمی لاوان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، تێکچوونی بینین، کۆکە، هێڵنجدان، ئازاری سك. تا، نەمانی ئارەزوی خواردن، برینی گەروو، سەرئێشە، دڵەکزە، سکچوون، خوران، پەڵە، وشکبوونەوەی دەم. ئارەقکردنەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦٠٠ تا ١٢٠٠ میلیگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا، یان لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، منالان ٦ سالان و گەورەتر ١٠ تا ٢٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## ئۆکسازیپام: OXAZEPAM

**ناوی بازرگانی:** Serax,serepax

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ١٥ میلیگرامی و کەپسولی ١٠ و ١٥ و ٣٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anxiolytic

**بەکارهێنان:** خەوهێنەر و ئارامکەرەوەیە و بۆ چارەسەری قەلەقی و ترس و بێخەوی و دڵەڕاوکێی سوك و مامناوەند و توند و کرژی و هەروەها بۆ تەرك کردنی ئەلکحول بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەمۆکی. کەمبوونی لێدانی دڵ. دابەزینی پەستان، تێکچوونی بینین، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، وشکی دەم، پەڵە، تێکچوونی جگەر. کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** بۆ دڵەڕاوکێی توند و تەرك کردنی ئەلکحول گەورەکان ١٥ تا ٣٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. بۆ دڵەڕاوکێی سوك تا مامناوەند و کرژی گەورەکان ١٠ تا ١٥ میلیگرام ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. بەساڵاچووان ١٠ میلیگرام خۆراکی، ٣ جار لە ڕۆژێکدا، پاشان زیادکردنی بە ١٥ میلیگرام، ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا بە پێی پێویست.

## ئۆکسکاربازیپین: OXCARBAZEPINE

**ناوی بازرگانی:** Trileptal

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥٠ و ٣٠٠ و ٦٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ٣٠٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Anticonvulsant

**بەکارهێنان:** دژی فێ و تێکچوونی دووجەمسەری و تەشەنوج و بۆ چارەسەر و کۆنترۆڵی تەشەنوج بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، سکچوون. هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، تێکچوونی هەرس، جیوب، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٦٠٠ میلیگرام لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٤٠٠ میلیگرامە. منالانی ٤ تا ١٤ سالّ ڕۆژانە ٨ تا ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.



## ئۆکسیکۆنازۆڵ: OXICONAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Oxistat

**شێوەی دەرمان:** کرێم و لۆشنی ١٪.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی پەنجەکانی پێ و کەچەڵی لەش بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی مەوزوعی، خوران، سوتانەوە.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ جار بەکاردێت.

## ئۆکسپرینۆلۆل: OXPRENOLOL HCL

**ناوی بازرگانی:** Trasicor

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ و ٤٠ و ٨٠ و ١٦٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Beta-blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری سنگ و نارێکی لێدانی دڵ و نیشانەکانی خەمۆکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ پەککەوتنی دڵ نزمبونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، تەنگەنەفەسی، کرژبوونی بۆری هەوا، هیلاکی، تێکچوونی خەو، گێژی، تێکچوونی هاوسەنگی، لاوازی سێکسی، کەمی پەڕەی خوێن، تێکچوونی بینین، سۆریاسس، هەڵوەرینی موو، پەڵە، وشکبونەوەی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ پەستانی بەرزی خوێن، ٨٠ تا ١٦٠ میلیگرام ڕۆژانە لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، زیاد دەکرێت لەکاتێکدا پێویست بێت، لایەنی زۆر ڕۆژانە ٣٢٠ میلیگرامە. بۆ ئازاری سنگ ٨٠ تا ١٦٠ میلیگرام ڕۆژانە لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لایەنی زۆر ڕۆژانە ٣٢٠ میلیگرامە. بۆ نارێکی لێدانی دڵ ٤٠ تا ٢٤٠ میلیگرام ڕۆژانە لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لایەنی زۆر ڕۆژانە ٢٤٠ میلیگرامە. بۆ نیشانەکانی قەلەقی (بەکارهێنانی ماوە کورت) ٤٠ تا ٨٠ میلیگرام ڕۆژانە لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. حەبی ١٦٠ میلیگرامی بۆ پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری سنگ سەرەتا ١٦٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆر ڕۆژانە ٣٢٠ میلیگرام.

## ئۆکسیبیوپرۆکاین: OXYBUPROCAINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Minims Oxybuprocaine HCL

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,٤٪.

**گروپی دەرمان:** Local anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی مەوزوعی چاو بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** بەپێی پێویست بەکاردێت.

## ئۆکسیبیوتینین: OXYBUTININ

**ناوی بازرگانی:** Gelnique,Ditropan

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ و ١٥ میلیگرامی و شروبی ٥ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Anticholinergic

**بەکارهێنان:** دژی کرژبوون و هاتنەوەیەکی میزەڵدان و ڕیژەوی میز و میز ڕانەگرتن و ئازاری میزەڵدان و میز کردنی شەوانە و چالاکی زیاد لەڕادەی میزەڵدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، وشکی دەم،پەڵە، تا، قەبزی، زیاد لێدانی دڵ سوربونەوە، سەرگێژبوون، بێخەوی، تێکچوونی بینین، گەورەبوونی بیلبیلەی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار.لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٥ میلیگرامە ڕۆژانە ٤ جار. منالانی سەروی ٥ساڵ ٥ میلیگرام خۆراکی، ڕۆژانە ٢ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٥ میلیگرامە ڕۆژانە ٣ جار. منالی ١ تا ٥ ساڵ ٠,٢ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار. چالاکی زیاد لەڕادەی میزەڵدان ٥ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە، زیادکردن بەبڕی ٥ میلیگرام بە ماوەی ١ هەفتە بەپێی پێویست تا لایەنی زۆر ڕۆژانە ٣٠ میلیگرام.

## ئۆکسیکۆدۆن: OXYCODONE

**ناوی بازرگانی:** Oxycontin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥ میلیگرامی و حەبی ١٠ و ١٥ و ٢٠ و ٣٠ و ٤٠ و ٦٠ و٨٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ٥ میلیگرام/٥ میلیلیتر و گیراوەی ٢٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Narcotic analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری مامناوەند و توند بەکاردێت.

...بۆ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێک نەخۆشی



**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، گێژی، نارێکی لێدانی دڵ، خوران، شەرا، قەبزی، ئارەقکردنەوە، ئازاری سك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ساڵ ٢,٥ تا ٥ ملیگرام خۆراکی هەموو ٦ سەعاتێك. بۆ ئازاری مزمینی ماماوەند و توند ١٠ تا ١٦٠ ملیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار. منداڵانی ٦ تا ١٢ ساڵ ١,٢٥ ملیگرام خۆراکی هەموو ٦ سەعاتێك. منداڵانی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ٢,٥ ملیگرام هەموو ٦ سەعاتێك.

## ئۆکسجین: OXYGEN

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گازهەیە.

**گروپی دەرمان:** گازەکان.

**بەکارهێنان:** وەك گازێکی دەرمانی بۆ چارەسەری کەمبوونی ئۆکسجین لەوانەی نەخۆشی سیان هەیە و بۆ تەنگەنەفەسیش بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** بەخەستی ٣٠٪ تا ١٠٠٪ سودی لێوەردەگیرێت.

## ئۆکسیمیثۆلۆن: OXYMETHOLONE

**ناوی بازرگانی:** Anadrol-٥٠

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ ملیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antianemia

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمخوێنی یەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادبوونی کالسیۆم، سکچوون، زیپکە، خوێنبەربوون، خەمۆکی،سەرئێشە، قەبزی، زیپکە، ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ڕۆژانە ١ تا ٥ ملیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ڕێی پێدەدرێت، خولی چارەسەر ٣ تا ٦ مانگە، بۆ ساوا و شیرخۆران ١٧٥ مایکرۆگرام/ کیلۆگرام ڕۆژانە بە ١ بڕی دەرمان ڕێی پێدەدرێت.

## ئۆکسیمۆرفۆن: OXYMORPHONE

**ناوی بازرگانی:** Opana

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ٧,٥ و ١٥ و ١٠ و ٢٠ و ٤٠ ملیگرامی و دەرزی ١ ملیگرام/ملی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Narcotic analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری ماماوەند و توند و بۆ هێورکردنەوە بەکاردێت



**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، گێژبوون. تێکچوونی گەدە. قەبزی، سووربوونەوە، خوران، نەرمکردنەوە، تێکچوونی بینین، هێڵنجدان، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ تا ٢٠ میلی‌گرام خۆراکی هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك، دەرزی ١ تا ١,٥ میلی‌گرام ژێرپێستی و ماسولکەیی و ٠,٥ میلی‌گرام بەدەمار هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك.

## ئۆکسی تێتراسایکلین: OXYTETRACYCLINE

**ناوی بازرگانی:** Terramycin,oxymycin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڕێژەیەکی زۆری بەکتریای جیاواز و بۆ چارەسەری زیپکە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلی‌گرام خۆراکی هەر ٦ سەعاتێك.

## ئۆکسی تۆسین: OXYTOCIN

**ناوی بازرگانی:** Pitocin,cyntocinon

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥ و ١٠ یەکە/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Hormone

**بەکارهێنان:** دەبێتەهۆی کرژبوونی منداڵدان لەکاتی منداڵبوون و هانی منداڵدان و زوو منداڵبوون دەدات، هانی ڕۆیشتنی شیر بۆ مەمك دەدات و هانی کۆنترۆڵکردنی خوێنبەربوونی پاش لە منداڵبوون دەدات.

**کاریگەری لاوەکی:** بەگرانی هەناسەدان، ڤێ، بەگرانی میزکردن، ئازاری سنگ. خوێنبەربوونی دەزگای زایەندی ژنان، هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادبوونی حەساسیەت، دابەزینی پەستان، زیادبوونی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** ١٠ تا ٢٠ یەکە/خولەك بەڕێگەی IV ئینفیوشن.

***

# P

## پاکلیتاکسیل: PACLITAXEL

**ناوی بازرگانی:** Taxol

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٦ میلیگرام/میلی لیتر(٥ و ١٦،٧ و ٢٥ و ٥٠ میلی لیتری).

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی هێلکەدان و مەمك و کاپۆسی سارکۆما (لوویەکی پیسە دروست دەبێت لە مولولەکانی خوێن لە پێستدا و بەشێوەی گرێ یان پەڕەیەکی بچوك بەڕەنگی مۆر بۆ قاوەیی یەکی تاریك دەردەکەوێت ) و شێرپەنجەی سی (NSCLC) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپییەکانی خوێن، خوێنبەربوون، کەمبوونی لێدانی دڵ نزمبونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** کاپۆسی سارکۆما گەورەکان ١٣٥ میلیگرام/مەتردوجا دەماری لە ماوەی ٣ سەعاتدا، هەر ٣ هەفتە ١ جار. بۆ شێرپەنجەی مەمك گەورەکان ١٧٥ میلیگرام/مەتردوجا بە دەمار لەماوەی ٣ سەعاتدا هەر ٣ هەفتە ١ جار. بۆ شێرپەنجەی مەمك ٢٥٠ میلیگرام/مەتردوجا دەماری لە ماوەی ٢٤ سەعاتدا، هەر ٣ هەفتە ١ جار.

## پالیفێرمین: PALIFERMIN

**ناوی بازرگانی:** Kepivance

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٦،٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Human keratinocyte growth factor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی لینجە پەردەی ناو دەم (mucositis) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** پەڵە، تا، سووربونەوە، خوران، ئۆدیما، ئازاری جومگە، تێکچوونی تام.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام بە دەمار IV ڕۆژانە بۆ ٣ بڕی دەرمان.

## پالیپێریدۆن: PALIPERIDONE

**ناوی بازرگانی:** Invega

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣ و ٦ و ٩ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** دژی نەخۆشی دەروونی و بۆ چارەسەری نەخۆشی شیزۆفرینیا (دووبیری) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** دڵەکوتێ، گەورەبوونی مەمك، ڕشانەوە، خرۆشان، هێڵنجدان، نارێکی لێدانی دڵ، لەرزین، تا، ئاوسان، لەرز، خەواڵویی، تێکچوونی بینین، سەرئێشە، گێژی، تێکچوونی گەدە، وشکبوونەوەی دەم، لاوازی سێکسی، زیادبوونی شیر، زیادبوونی لیك، ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار لەبەیانیاندا. ڕێژەی بڕی دەرمانی ئاسایی ڕۆژانە ٣ تا ١٢ میلی‌گرامە.

## پالیڤیزیوماب: PALIVIZUMAB

**ناوی بازرگانی:** Synagis

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ٥٠ و ١٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Monoclonal antibody

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی بەشی خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسە لەمناڵاندا بەهۆی هەوکردنی ڤایرۆسی (RSV)ی یەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، تا، سکچوون، ڕشانەوە، قەبزی، کۆکە، هەوکردنی لوت، خیزەخیز، خەواڵویی، ئازار، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن، پەڵە، تەشەنوج، کەمبوونەوەی پەڕەکانی خوێن، ئاوسان، سوربونەوە، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** مناڵان ١٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە ماسولکەیی مانگانە.

## پالۆنۆسیترۆن: PALONOSETRON

**ناوی بازرگانی:** Aloxi

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ مایکرۆگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiemetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری لە هێڵنجدان و ڕشانەوە بەهۆی چارەسەری کیمیایی شێرپەنجەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سکچوون، قەبزی، گێژی، تێکچوونی گەدە، ئازاری سك، وشکبوونەوەی دەم، غازات، نارێکی لێدانی دڵ، خەواڵویی، پەڵە، خوران، بێخەوی، خەمۆکی، زۆربوونی شەکری خوێن، ئازاری جومگە، گیرانی میز.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان تەمەنی سەروی ١٨ ساڵ ٢٥٠ مایکرۆگرام بەیەك بڕ بە IV ٣٠ خولەك پێش لە چارەسەرکردن.

## پامیدرۆنەیت: PAMIDRONATE

**ناوی بازرگانی:** Aredia

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٥ میلیگرام/میلیلیتر، ٢ میلیلیتر و ١٥ میلیگرام/ میلیلیتر و ٤ میلیلیتر و ١٥ میلیگرام/میلیلیتر و ٦ میلیلیتر و ٣ میلیگرام/ میلیلیتر و ١٠ میلیلیتر و پاودەری دەرزی ٣٠ میلیگرامی، ٩٠ میلیگرامی و گیراوەی دەرزی ٩ میلیگرام/میلیلیتر، ١٠ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Bisphosphonate

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەندێ نەخۆشی ئێسك بەکاردێت وەك نەخۆشی باجەت و نەخۆشی رزینی ئێسك لە مالتیپل مایلۆما و زیادبوونی کالسیۆم (هایپەرکالسیمیا) ماماوەند تا توندی پیسەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك، سەرئێشە، هێڵنجدان، رشانەوە، قەبزی، کەمبوونی خرۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، کەمخوێنی، تا، زیاد لێدانی دڵ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی کالسیۆم وپۆتاسیۆم و فۆسفات و مەگنسیۆم، لەرزین و لەرینەوەی گوێچکەڵە.

**بڕی دەرمان:** بۆ نەخۆشی باجەت گەورەکان ٣٠ میلیگرام رۆژانە بە دەمار لە ماوەی ٢٤ سەعاتدا، بۆ ماوەی ٣ رۆژ. نەخۆشی رزینی ئێسك لە مالتیپل مایلۆما گەورەکان ٩٠ میلیگرام رۆژانە بە دەمار لە ماوەی ٤ سەعاتدا، مانگانە ١جار. بۆ زیادبوونی کالسیۆم (هایپەرکالسیمیا) ماماوەند تا توندی پیس گەورەکان بڕی دەرمان بە توندی زیادبوونی کالسیۆمەوە پەیوەستە.

## پانکریتین: PANCREATIN

**ناوی بازرگانی:** Dizymes,cotazym

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦٥٠٠ یەکە ئەمایلەیز + ٤٥٠ یەکە پرۆتیەیز + ٨٠٠٠ یەکەلایپەیز.

**گروپی دەرمان:** Pancreatic enzyme



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمی ئەنزیمی پانکریتین و شێرپەنجەی پەنکریاس و بۆ یارمەتی هەرسکردنی خۆراك لە نەخۆشی زکماکی کە کاردەکاتە سەر خانەی ڕژێنە دەردراوەکان (CF) و پاش لە نەشتەرگەری بڕینی پەنکریاس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان،ئازاری سك،شەرا، زیادبوونی یوریك ئەسید، میزی خوێناوی، سکچوون، پەڵە، سەرئێشە، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ڕۆژانە ١ تا ٣ حەب لەگەڵ خواردندا.

## پانکیورونیوم: PANCURONIUM

**ناوی بازرگانی:** Pavulon

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٤ میلیگرام/میلیگرام(٢میلی لیتر) و ١ و ٢ میلیگرامی میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** وەك یارمەتیدەر لە بێهۆشی یان شلکردنەوەی پەیکەرە ماسولکە و بۆ ئاسانکردنی لوولە تێخستن و هەواگۆڕکێی میکانیکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیاد لێدانی دڵ بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، ئارەقکردنەوە، پەڵە، بێهێزی ماسولکەیی، تەنگەنەفەسی، حەساسیەت، سووربونەوە.

**بڕی دەرمان:** بڕی دەرمان بە پێی پێویستی هەر کەسێك، کاردانەوەی دەرمان و بەکارهێنانی بۆ بێهۆشی دیاری دەکرێت. گەورەکان و منداڵی زیاتر لە ١ مانگ لەسەرەتا٠,١ تا ٠,٠٤ میلیگرام/کیلۆگرام بەدەمار،پاشان بەپێی پێویست هەر ٣٠ تا ٦٠ خولەك ٠,٠١ میلیگرام/کیلۆگرام بەدەمار، ڕێی پێ دەدرێت.

## پانیتیوموماب: PANITUMUMAB

**ناوی بازرگانی:** Vectibix

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Monoclonal antibody

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی تەشەنەکردووی کۆڵۆن و کۆم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی گەدە، بەرزبونەوە و نزمبونەوەی پەستانی خوێن، زیاد لێدانی دڵ سکچوون، قەبزی، ئازاری سك، وشکی دەم، کۆکە، هیلاکی، سەرئێشە، گێژی، کەمبوونی کاسیۆم و پۆتاسیۆم و مەگنسیۆم، تێکچوونی بینین، وشکی چاو، خوران، سووربونەوە، وشکی پێست، زیپکە، خەواڵویی، ئازاری سنگ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦ میلیگرام/کیلۆگرام بە IV ئینفیوشن ئەدرێت بۆ زیاتر لە ٦٠ خولەك هەموو ١٤ ڕۆژێك.



## پانتۆپرازۆل: PANTOPRAZOLE SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Protium Pantozol ,

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠ و ٢٠ و ٤٠ میلیگرامی و دەرزی ٤٠ میلی گەمی و پاودەری ٤٠ میلیگرامی و حەبی ٢٠ و ٤٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Proton pump inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری برینی گەدە و دوانزەگرێ و دڵەکزە و چارەسەری ماوەکۆتای گەڕانەوەی ترشی گەدە بەرەو سورێنچك و زیادبوونی ترشەڵۆکی گەدە و برینی گەدە بەهۆی بەکتریای H-pyloriی یەوە و بۆ چارەسەری ماوە درێژی زیاد دەردانی ئاوگی گەدەیی ZES بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** دڵەڕاوکێ، سەرئێشە، بێخەوی، شەقیقە، ئازاری سنگ، هەوکردنی قوڕگ و لوت، جیوب، ئازاری سك، قەبزی، پەڵە، هەوکردنی ڕێڕەوی میز، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، غازات، وشکی دەم، خوران، ئازاری ماسولکە، گێژی، زەردی، هەوکردنی جگەر، گەوربوونی مەمك، هەڵوەرینی موو، تێکچوونی بینین، تا، خەمۆکی، ورێنە، ئارەقکردنەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٤٠ میلیگرام ١ تا ٢ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢٤٠ میلیگرامە.

## پاپاڤیرین: PAPAVERINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Pavarin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٤٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Opium alkaloid

**بەکارهێنان:** بۆ چاکترکردنی سیسبوونی مێشکی و موحیگی بەهۆی کرژبوونی خوێنبەر و سیسبوونی ماسولکەیی دڵ و، بۆ چارەسەری داخستنی مولولەی تەپلەیی و حاڵەتە تایبەتەکانی کرژبوونی مولولەی مێشکی و بۆ چارەسەری لە پیاوەتی کەوتنی پیاوان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێهێزی، هەوکردنی جگەر، ئازاری سك، سکچوون، زیادبوونی لێدانی دڵ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، خەوالّویی، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠ تا ١٢٠ میلیگرام ماسولکەیی IM یان بە دەمار IV هەر ٣ سەعات ١ جار، منالان ٦ میلیگرام/کیلۆگرام ماسولکەیی IM یان بە دەمار IV ڕۆژانە ٤ جار. بۆ چارەسەری لە پیاوەتی کەوتنی پیاوان ٢,٥ تا ٣٧,٥ میلیگرام بە دەرزی لە ناوەوەی لەشی ئەشکەوت دەدرێت ئەتوانی کە تا ٣٠ بۆ ٦٠ میلیگرام بڕی دەرمان زیادبکەیت.

## پارالدیهاید: PARALDEHYDE

**ناوی بازرگانی:** Paraldehyde

**شێوەی دەرمان:** ئینیمای ٨-٥٠٪.

**گروپی دەرمان:** Anticonvulsant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری حاڵەتی فێداری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** پەڵە.

**بڕی دەرمان:** لە ڕێگەی کۆمەوە گەورەکان ٢٠ میلیلیتر وەك یەك بڕی دەرمان. ساواکان ٠,٤ میلی لیتر کیلۆگرام، منداڵانی ١ مانگ تا ١٨ ساڵ ٠,٤ میلی لیتر/کیلۆگرام (لایەنی زۆر ١٠ میلی لیتر) وەك یەك بڕی دەرمان.

## پاراپورمون: PARATHORMON

**ناوی بازرگانی:** Parather

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠USP/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Parathyroid hormone

**بەکارهێنان:** وەك دەرمانی یارمەتیدەر بۆ تەشخیصی کەمی کاری هۆرمۆنی پاراپایرۆیدی خۆیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، زیادبوونی کالسیۆم، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ یەکە/کیلۆگرام تا لایەنی زۆر ٢٠٠ یەکە بە دەمار لە ماوەی ١٠ خولەکدا. منداڵانی گەورەتر لە ٣ ساڵ ٣ یەکە/کیلۆگرام تا لایەنی زۆر ٢٠٠ یەکە بە دەمار لەماوەی ١٠ خولەکدا.

## پارا ئەمینوبێنزۆیك ئەسید: PARA AMINOBENZOIC ACID

**شێوەی دەرمان:** لوشنی ٥٪.

**بەکارهێنان:** بۆ پاراستنی پێست لەبەرامبەری تیشکی خۆر بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٤ جار بەڕووی پێستیدا بماڵن.

## پارافورمالدیهاید: PARAFORMALDEHYDE

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەب هەیە.

**گروپی دەرمان:** Disinfectant

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ناو ژوورەکان،پێشگری لە حەساسیەتی ددان.

بۆ: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی

ئینسایکلۆپیدیای دەرمان

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** بۆ دژە هەوکردنی ژوورەکان و تەعقیم کردنیان ئەبێت بەشێوەی هەڵم بێت، بۆحەساسیەتی ددان ئەبێت بمژیرێت.

## پاریکۆکسیب: PARECOXIB

**ناوی بازرگانی:** Dynastat

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٤٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** بۆ ڕێکخستنی ماوەکۆتای نازاری تیژی پاش نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون. برین و خوێنبەربوونی گەدە و ڕیخۆڵە، تێکچوونی گەدە، غازات، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، نەمانی ئارەزوی خواردن. ئارەقکردنەوە، خاوی، زیادبوونی شەکری خوێن، ئازاری جومگە، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم.

**بڕی دەرمان:** بە دەرزی ماسولکەیی قوڵ یان بە دەمار گەورەکانی سەروی ١٨ساڵ سەرەتا ٤٠ میلی گرام، پاشان ٢٠ تا ٤٠ میلی گرام هەموو ٦ تا ١٢ سەعات کاتێك پێویستبوو تا ماوەی ٣ ڕۆژ. لایەنی زۆری ڕۆژانە ٨٠ میلی گرام. پیرەکان کێشی کەمتر لە ٥٠ کیلۆگرام، سەرەتا ٢٠ میلی گرام، پاشان لایەنی زۆر ڕۆژانە ٤٠ میلی گرام.

## پارۆمومایسین: PAROMOMYCIN SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Humantin Gabroral,

**شێوەی دەرمان:** شروبی ١٢٥ میلی گرام/٥ میلی لیتر و کەپسولی ٢٥٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بێهۆشی جگەری و ئەمیبیایی ڕیخۆڵەیی و کرمی شریتی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، ئازاری سك، قەبزی، سکچوون، خوران، پەڵە، سەرگێژبوون، زیادبوونی کۆلیسترۆڵی خوێن، میزی خویناوی.

**بڕی دەرمان:** بێهۆشی جگەری گەورەکان ٤ گرام ڕۆژانە لە ٢ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا بۆ ماوەی ٥ تا ٦ ڕۆژ. ئەمیبیایی ڕیخۆڵەیی گەورەکان و منداڵان ٢٥ تا ٣٥ میلی گرام/کیلۆگرام ڕۆژانە خۆراکی لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا بۆ ماوەی ٥ تا ١٠ ڕۆژ. کرمی شریتی گەورەکان ١ گرام هەر ١٥ خولەکێك تا ٤ بڕی دەرمان. منداڵان ١١ میلی گرام/کیلۆگرام هەر ١٥ خولەك تا ٤ بڕی دەرمان.



## پارۆمۆمایسین-یو: PAROMOMYCIN-U

**شێوەی دەرمان:** کرێمی مەوزوعی پارۆمۆمایسین ١٥ گرام/ ١٠٠گرام + یوریا ١٠ گرام / ١٠٠ گرام.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی ڕوکاری پێست بەکاردێت.

بڕی دەمان: گەورەکان ١ تا ٢ جار ڕووی ئەو شوێنەی پێ بماڵن.

## پاریگۆریك: PAREGORIC

**ناوی بازرگانی:** Paregoric

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی شل (Liquid)

**گروپی دەرمان:** Narcotic Antidiarrheal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سکچوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** قەبزی، کرژبوونی گەدە، نارێکی لێدانی دڵ، هێڵنجدان، گێژی، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئارەقکردنەوە، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ تا ١٠ میلی لیتر ڕۆژانە ٤ جار، منالآن ٠,٢٥ تا ٠,٥ میلی لیتر/کیلۆگرام ڕۆژانە ٤ جار.

## پاریکالسیتۆل: PARICALCITOL

**ناوی بازرگانی:** Zemplar

**شێوەی دەرمان:** کپسولی ١ و ٢ و ٤ مایکرۆگرامی و دەرزی ٥ مایکرۆگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Vitamin-D

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری و چارەسەری هایپەرپاراپایرۆیدیسمی دووەمی (چالاکی زیاد لە ڕادەی ڕژێنی پاراپایرۆید) لەو کەسانەی پەککەوتنی موزمینی گورچیلەیان هەیە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، نەمانی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی کێش، سەرئێشە، تێکچوونی هاوسەنگی، تێکچوونی گەدە، تێکچوونی تام، زیپکە، پەڵە، خوران.

**بڕی دەرمان:** بە پێی قۆناغەکان و ئاستی هۆرمۆنی پاراپایرۆید بڕی دەرمان دەگۆڕێت.



## پارۆکسیتین: PAROXETINE

**ناوی بازرگانی:** Paxil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٠ و ٣٠ و ٤٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی خۆراکی ١٠میلیگرام/ ٥ میلیلیتر و هەروەها حەبی (C.R.T) ١٢,٥ و٢٥ و ٣٧.٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی گەورەی خەمۆکی و تێکچوونی وەسواسی نیجباری (OCD) و نەخۆشی ترس و دڵەڕاوکێی لەناکاو و نەخۆشی قەلەقی کۆمەڵایەتی و نەخۆشی فشاری دوای برینداری و نەخۆشی قەلەقی گشتی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێخەوی، دڵەڕاوکێ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، وشکی دەم، نەمانی ئارەزوی خواردن، قەبزی، تێکچوونی هەرس. هەوکردنی ڕێڕەوی میز، ئارەقکردنەوە، پەڵە، ئازاری سك، تا، هەوکردنی قوڕگ ولوت، کۆکە، ئازاری جومگە و ماسولکە، وڕێنە، گێژی، خەواڵویی، لاوازی سێکسی، گیرانی میز، تورەیی، زیادبوونی کۆلیسترۆڵ هەوکردنی جگەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ تا ٢٠ میلیگرام هەر بەیانی یەك، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٦٠ میلیگرامە. حەبی (C.R.T) لایەنی زۆر ٧٥ میلیگرامە.

## پاتێنت بلو ڤی: PATENT BLUE V

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢,٥٪ (٢میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Diagnostic agent

**بەکارهێنان:** دەرمانی یارمەتیدەر بۆ توێژینەوە لە مولولەی لیمفاوی و خوێنبەرەکان.

**کاریگەری لاوەکی:** ئۆدیما، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، کرژبوونی قوڕگ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ١٠ میلیگرام لەڕێگەی ناوەوەی دەمار یان SC دەرزی لێ دەدرێت.

## پازۆپانیب: PAZOPANIB

**ناوی بازرگانی:** Votrient

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتووی خانەکانی گورچیلە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك، تێکچوونی گەدە، سکچوون، کەمبوونی کێش، نەمانی ئارەزوی خواردن، تێکچوونی تام، غازات، کەمی کاری جگەر، زیادبوونی بیلیرۆبین، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، سوربونەوە، ئازاری سنگ، ئۆدیما، خوێنبەربوونی لوت، گۆڕانی دەنگ، سەرئێشە، گێژی، خاوی، هایپەرپایرۆیدیسم، ئازار و کرژبونی ماسولکە، ئارەقکردنەوە، خوێنبەربوون، هەوکردنی پەنکریاس، پەککەوتنی جگەر، نیلتیهابی صفاق، جەڵدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ٨٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت لە هەنگاوەکانی ٢٠٠ میلیگرامی بە پێی توانای بەرگەگرتن (لایەنی زۆر ڕۆژانە ٨٠٠ میلیگرامە).

## پیدیاتریك کەف: PEDIATRIC COUGH

**شێوەی دەرمان:** شەربەتی ٦٠ میلی لیتری.

**گروپی دەرمان:** Antitussive

**بەکارهێنان:** دژی کۆکە و بەڵغەم دەرکەرە و بۆ حەساسیەتی ڕێڕەوی هەناسەی منداڵان و سەرمابوونی منداڵان بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٤ جار هەر جارەی ٠,٥ تا ١ کەوچکی مرەباخۆری.

## پیدیا تریك گریپ: PEDIATRIC GRIPE

**ناوی بازرگانی:** Histopharmin

**شێوەی دەرمان:** شروبی کلۆرفینرامین مالیت ٠,٦٧ میلیگرام/ ٥ میلیلیتر + سیدۆنیفیدرین هایدرۆکلۆراید ١٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر..

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سەرمابوونی منداڵان بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** منداڵی ٦ تا ١٢ مانگ ٢ میلیلیتر، ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. منداڵانی ١ تا ٦ ساڵ ٤ میلیلیتر، ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. منداڵانی ٦ تا ١٢ ساڵ ٨ میلیلیتر، ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار.

## پیگاسپارگەیس: PEGASPARGASE

**ناوی بازرگانی:** Oncaspar

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٧٥٠ یەکە/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن لیمفۆپلاستیك لیوکیمیای تیژ (ALL) بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری گەدە، خێرا لێدانی دڵ، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، نەمانی ئارەزوی خواردن، تا، لەرز، زەردی، خەواڵویی، خەمۆکی، هەڵوەرینی موو، کەمی خرۆکەی سپی و پەرەی خوێن، پەککەوتنی جگەر، هەوکردنی پەنکریاس. کرژبوونی توندی بۆری هەوا، بێهۆشی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآن ۲۵۰۰ یەکە/مەتردوجا بەشێوەی دەمار یان ماسولکەیی هەموو ۱٤ رۆژێك.

## پیگاپتانیب: PEGAPTANIB SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Macugen

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ۰,۳ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Opthalmologic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی تێکچوونی ماسولکەیی پەیوەست بەتەمەن (AMD) نەخۆشی یەکێ شەبەکەی چاوە کە ئەبێتە هۆی لێڵبوون و تێکچوونی بینایی یان کوێری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** دڵەکوتێ، زیادبوونی IOP، ئازاری پشت، پەڵە، خوران، گیرانی میز، خەمۆکی، تێکچوونی گەدە، ئارەقکردنەوە، تێکچوونی بینین. هێڵنجدان، وشکی چاو، سکچوون، ئازاری سنگ، هەوکردنی بۆریچکەکان، هەوکردنی پێڵوی چاو، گێژی، کاتاراکت، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی هاوسەنگی، ئاوهاتنەخوارەوە بەلوتدا، سەرئێشە، ئازاری چاو، ڕوشانی چاو، هەوکردنی کۆرنیە،گەورەبوونی بیلبیلەی چاو، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** بەدەرزی لە ناوەوەی بەشی شوشەیی پەیوەست بە شلاوی شوشەیی چاو کە ئەکەوێتە ژووری پشتەوەی چاو، گەورەکان ۰,۳ میلی گرام هەموو ٦ هەفتەیەك ۱ جار بۆ ناو چاو بۆ چارەسەرکردنی.

## پیگفیلگراستیم: PEGFILGRASTIM

**ناوی بازرگانی:** Neulasta

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٦ میلی گرام/۰,٦ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Colony stimulating factor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونی نیوترۆفیل (نیوترۆپنیا) کە جۆرێکە لە خرۆکەی سپی بەهۆی وەرگرتنی چارەسەری کیمیای یەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ئازاری سك، تا، لاوازی، بێخەوی، گێژی، هیلاکبوون، ئۆدیما، هەوکردنی گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، تێکچوونی گەدە، ئازاری ماسولکە و جومگە، ئازاری ئێسك، قەبزی، هەڵوەرینی موو، پەڵە، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی دەرزی ژێرپێستی گەورەکانی سەروی ۱۸ ساڵ ٦ میلی گرام (۰,٦ میلی لیتر) بۆ هەر خولێکی چارەسەری کیمیایی، ۲٤ سەعات پاش لە چارەسەری کیمیایی دەست پێ دەکات.



## پیگئینتەرفیرۆن: PEGINTERFERON ALFA-٢B

**ناوی بازرگانی:** PEG –intron

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی دەرزی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی ڤایرۆسی جگەر لە جۆری هیپاتیتی C موزمین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، تا، هیلاکبوون، بێخەوی، ئازاری سك، نەمانی ئارەزووی خواردن، ڕشانەوە، هێڵنجدان، سکچوون، خەمۆکی، کەمی پەڕەی خوێن، هەڵوەرینی موو، خوران. کەمبوونەوەی نیوترۆفیل، هەوکردنی گەروو، جیوب، گەورەبوونی جگەر، کۆکە، وشکی پێست، کەمبوونی کێش.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان هەفتانە ١ مایکرۆگرام/کیلۆگرام بەشێوەی ژێر پێستی.

## پیگڤیسۆمانت: PEGVISOMANT

**ناوی بازرگانی:** Somavert

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ و ١٥ و ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Growth hormone receptor antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی ئەکرۆمیگالی (زیادبوونی ناسروشتی قەبارەی ئێسکەکەکان وەك دەست و قاچ و..بەهۆی زۆر دروست بوونی هۆرمۆنی گەشەوە سۆماتۆترۆفین زۆرتر لەوانەدا ڕوودەدات کەلەگەشە وەستاون) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، قەبزی، ڕشانەوە، غازات، تێکچوونی گەدە، سەرئێشە، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، گێژی، خەواڵویی، لەرزین، تێکچوونی خەو، زیادبوونی کێش، زیادبوون و کەمبوونی شەکری خوێن، ئازاری ماسولکە و جومگە، ئارەقکردنەوە، خوران، پەڵە، هیلاکی، زیادبوونی کۆلیسترۆل، کەمی پەڕەی خوێن و خڕۆکەی سپی.

**بڕی دەرمان:** بەدەرزی ژێرپێستی سەرەتا ٨٠ میلیگرام، پاشان ١٠ میلیگرام ڕۆژانە لە هەنگاوەکانی ٥ میلیگرامی ڕۆژانە زیاد دەکرێت بە پێی کاردانەوەکەی، لایەنی زۆر ڕۆژانە ٣٠ میلیگرامە.

## پیمیترێکسید: PEMETREXED

**ناوی بازرگانی:** Alimta

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی سی (mesothelioma) و (NSCLC) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، تا، لەرز، ئاوسان، زیادبوونی کێش، بڕینی دەم، خوێنبەربوون، پەڵە، خەمۆکی، بڕینی گەروو، ئازاری ماسولکە، هیلاکبوون. هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، هەرسنەکردن، نەمانی ئارەزوی خواردن، هەوکردنی دەم، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ میلیگرام/مەتردوجا بەدەمار IV، بۆ زیاتر لە ١٠ خولەك هەموو ٣ هەفتەیەك.

## پیمیرۆلاست: PEMIROLAST

**ناوی بازرگانی:** Almamast

**شێوەی دەرمان:** قەترەی ٠,١٪.

**گروپی دەرمان:** Opthalmologic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خوران و سوربونەوە و حەساسیەت و نیلتیهابی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی چاو، سەرئێشە، پژمین، حەساسیەت، پەڵە، تا، خوران، ڕوشان، هەوکردنی لوت، ئاوسان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ قەترە بۆ هەر چاوێك ڕۆژانە ٤ جار.

## پینبیتۆلۆل: PENBUTOLOL

**ناوی بازرگانی:** Levatol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Beta blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێنی سوك و مامناوەند و ئازاری سنگ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ ئۆدیما، ئازاری سنگ، گێژی، هیلاکبوون، سەرئێشە. بێخەوی، خەمۆکی، ئارەقکردنەوە، وشکبوونەوەی چاو، تێکچوونی بینین، سکچوون، هێڵنجدان، تێکچوونی گەدە، لاوازی سێکسی، کۆکە، تەنگەنەفەسی، کەمبوونی پەڕەی خوێن، زیادبوون و کەمبوونی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠ میلیگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا. بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو ٢٠ تا ٤٠ میلیگرامە خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا.

**ئاگادار بن:** دەرمان شوێنەواری خراپ و کاریگەری نێگەتیف بەجێدەهێڵێت، ئەگەر بەگونجاوی بەکارنەهێنرێت

## پینسیکلۆڤیر: PENCICLOVIR

**ناوی بازرگانی:** Denavir

**شێوەی دەرمان:** کرێمی ١٪.

**گرووپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی ڤایرۆسی تامێسکی لێوی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ئازاری سوك، سوتانەوە، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان هەموو ٢ سەعاتێك، لەکاتی بێداری بۆ ماوەی ٤ ڕۆژ.

## پینسیلامین: PENICILLAMINE

**ناوی بازرگانی:** Pendramine,cuprimine

**شێوەی دەرمان:** کەپسول وحەبی ٢٥٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Chelating agent

**بەکارهێنان:** دژی ژەهراویبوون بە کانزاقورسەکان و بۆ چارەسەری ڕۆماتیزم و ( Feltys syndrome) و نەخۆشی ویلسۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سووربونەوەی پێست، ئیلتیهابی پێست، شەرا، نەمانی ئارەزووی خواردن، تێکچوونی گەدە، هەوکردنی سی، کەمبوونی تام، خوران، پەڵە، برینی دەم، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمخوێنی، حەساسیەتی پێست.

**بڕی دەرمان:** بۆ ڕۆماتیزم و ( Feltys syndrome) گەورەکان ڕۆژانە ١٢٥ تا ٢٥٠ میلیگرام و ئەگەر پێویست بێت بۆ ماوەی ١ تا ٣ مانگ بڕی دەرمان زیاد دەکرێت، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١ گرامە. بۆ ژەهراویبوون بە کانزا قورسەکان گەورەکان ٥٠٠ تا ١٥٠٠ میلیگرام ڕۆژانە بۆ ماوەی ١ تا ٢ مانگ ڕێی پێدەدرێت. منداڵان ٣٠ تا ٤٠ میلیگرام/کیلۆگرام بۆ ماوەی ١ تا ٦ مانگ ڕێی پێدەدرێت. نەخۆشی ویلسون گەورەکان ٢٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ٤ جار (٣٠ خولەك پێش لە خواردن و ٢ سەعات پاش لە نانی ئێوارە). منداڵان ٢٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە لە ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا (٣٠ خولەك پێش لە خواردن و ٢ سەعات پاش لە نانی ئێوارە).

نۆت: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوور کەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## پەنسیلین: ٦-٢-٣ PENICILLIN G

**ناوی بازرگانی:** Penilente

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنەکانی بەکتریایی سترێپتۆکەس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوربونەوەی پێست، پەڵە، هەڵئاوسانی قوڕگ، تا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان بەکێشی زیاتر لە ٢٧ کیلۆگرام ٢,٤ ملیۆن یەکە ماسولکەیی، بەیەك بڕی دەرمان. منداڵانی ٤ تا ٢٧ کیلۆگرام ٩٠٠ هەزار تا ١ ملیۆن یەکە ماسولکەیی، بەیەك بڕی دەرمان. منداڵان بەکێشی کەمتر لە ١٤ کیلۆگرام ٦٠٠ هەزار یەکە ماسولکەیی، بەیەك بڕی دەرمان.

## پەنسیلین جی: PENICILLIN G (Pot. & sod.)

**ناوی بازرگانی:** Pfizerpen

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی ١ و ٥ ملیۆن یەکە/ڤیاڵ

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنە توندەکان بەهۆی وردەزیندەوەرە هەستیارەکانەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوربونەوەی پێست، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، تەشەنوج، حەساسیەت، ژەهراویبوون بەپۆتاسیۆم، نەخۆشی گورچیلەیی، پەککەوتنی دڵی خوێنتێژراو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان لە ١ تا ٥ ملیۆن یەکە ماسولکەیی یان بەدەمار هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك. ساواکان ٣٠٠٠٠ یەکە/کیلۆگرام ماسولکەیی یا بە دەمار هەر ١٢ سەعاتێك، منداڵان ١٦٦٦٧ تا ٤١٦٧ یەکە/کیلۆگرام ماسولکەیی یا بە دەمار هەر ٤ سەعاتێك.

## پەنسیلین: PENICILLIN BENZATHINE G

**ناوی بازرگانی:** Bicillin LA

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٦٠٠٠٠٠ و ١٢٠٠٠٠٠ یەکە/ڤیاڵ

**گروپی دەرمان:** Antibiotic



**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوكردنی بەشی سەرەوەی كۆئەندامی هەناسە بەهۆی بەكتریای ستریپتۆكۆكەسی گروپی A و بۆ پێشگرتن لە تای رۆماتیزمی بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** هێڵنجدان، رشانەوە، سكچوون، تەشەنوج، كەمخوێنی، نەخۆشی گورچیلەیی، كەمبوونەوەی خرۆكەی سپی و پەرەی خوێن، حەساسیەت، هەوكردنی پێست، پەككەوتنی دڵی خوێنتێزراو.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ١٢٠٠٠٠٠ یەكە ماسولكەیی بە یەك بڕی دەرمان، بۆ منداڵان بەكێشی زیاتر لە ٢٧ كیلۆگرام ٩٠٠٠٠٠ یەكە ماسولكەیی بە یەك بڕی دەرمان، منداڵان بەكێشی كەمتر لە٢٧ كیلۆگرام ٣ تا ٦ سەد هەزار یەكە/كیلۆگرام ماسولكەیی بە یەك بڕی دەرمان. بۆ پێشگرتن لە تای رۆماتیزمی گەورەكان و منداڵان ١٢٠٠٠٠٠ یەكە ماسولكەیی مانگانە یان ٦٠٠٠٠٠ یەكە مانگانە ٢ جار.

## پەنسیلین جی: PENICILLIN G (procaine & pot.)

**ناوی بازرگانی:** Crysticillin A.S

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٤٠٠٠٠٠ و ٨٠٠٠٠٠ یەكە/ڤیاڵ

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوكردنە سوك و مامناوەندەكان بەهۆی وردەزیندەوەرە هەستیارەكان و بۆ پێشگری نەهەوكردن لە نەشتەرگەری بەكانی دەم و ددان و ڕێڕەوی هەناسە و پێست و شانە نەرمەكان بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** سووربوونەوەی پێست، هێڵنجدان، رشانەوە، سكچوون، تەشەنوج، كەمخوێنی، كەمبوونەوەی خرۆكەی سپی و پەرەی خوێن، حەساسیەت، هەوكردنی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان و منداڵانی زیاد لە ٢٧ كیلۆ گرام ٤٠٠٠٠٠ یەكە هەر ١٢ تا ٢٤ سەعات بە ماسولكەییIM ، بۆ پێشگرتن لە هەوكردن گەورەكان ٨٠٠٠٠٠ یەكە هەر ١٢ سەعاتێك. منداڵان ١٠٠٠٠ یەكە/كیلۆگرام هەر ١٢ سەعاتێك.

## پەنسیلین ڤی: PENICILLIN -V

**ناوی بازرگانی:** Betpen-VK

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی خۆراكی ١٢٥ میلیگرامی و ٢٥٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و سەسپێنشنی خۆراكی ٢٠٠٠٠٠ یەكە/٥ میلیلیتر و ٤٠٠٠٠٠ یەكە/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان::** Antibiotic



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنە سوك و مامناوەندەکان بەهۆی وردەزیندەوەرە هەستیارەکان و بۆ پێشگرتن لە هەوکردنی پەردەکانی دڵ پێش لە نەشتەرگەری پزیشکی ددان و هەوکردنی ڕێڕەوی میز و هەوکردنی گوێی ناوەڕاست و پێست و شانە نەرمەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، نەخۆشی گورچیلەیی، ڕشانەوە، سکچوون، تەشەنوج، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خڕۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، حەساسیەت، هەوکردنی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی هەر ٦ سەعاتێك. منداڵان ١٥ تا ٥٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە خۆراکی، لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك. بۆ پێشگرتن لە هەوکردنی پەردەکانی دڵ پێش لە نەشتەرگەری پزیشکی ددان گەورەکان ٢ گرام خۆراکی ٣٠ تا ٦٠ خولەك پێش لە نەشتەرگەری، پاشان ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی هەر ٦ سەعاتێك بۆ ٨ بڕی دەرمان. منداڵان بە کێشی کەمتر لە ٣٠ کیلۆگرام نیوەی بڕی دەرمانی گەورەکان.

## پێنتا گاسترین: PENTAGASTRIN

**ناوی بازرگانی:** Peptavlon

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,٢٥ میلیگرام/میلیلیتر (٢ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Gastrin analogue

**بەکارهێنان:** بۆ لێکۆڵینەوەی حاڵەتی دەردانی ترشەڵۆکی گەدە لەو نەخۆشانەی گومانیان بە کەمخوێنی خەتەرناك لێ دەکرێت، شێرپەنجەی گەدە و هەوکردن و پوکانەوەی گەدە و ZESبەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هیلاکی، تێکچوونی بینینی کاتی، سەرئێشە، نارەقکردنەوە، لەرز، ڕشانەوە،حەساسیەت، زیاد لێدانی دڵ هێڵنجدان، سەرگێژبوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦ مایکرۆگرام کیلۆگرام ژێر پێستیSC دەرزی لێ دەدرێت.

## پێنتامیدین ئایزۆثایونەیت: PENTAMIDINE ISOETHIONATE

**ناوی بازرگانی:** Pentacarinat

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٣٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiprotozoa

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی سی (پنیۆمۆسایتس کارینی) و لیشمانیاسس (هەوکردن بەهۆی مشەخۆری نەمیای لیشمانیاوە) کە بەهۆی هەندێ جۆری مێرووی وڕەوە (Sand fly) دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ و بۆ



چەرەسەری تریپانۆسۆمیاسس (هەوکردن بەهۆی مشەخۆری تریپانۆسۆما) ئەمەش بەهۆی ئەو مێرووانەی دەگەزن دەگوێزرێنەوە بۆ مرۆڤ، بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هیلاکی، سەرئێشە، پەڵە، ئازاری سك. سەرگێژبوون، ڕشانەوە، گێژی، هێڵنجدان، سکچوون، کەمبوونەوەی ئارەزووی خواردن، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، زیاد لێدانی دڵی سکۆڵەیی، ئازاری قەفەسەی سنگ، کۆکە، کەمبوونەوە و زیادبوونی شەکری خوێن، کەمبوونەوەی خڕۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، هەوکردنی پەنکریاس، تەسکبونەوەی بۆری هەوا، هەستکردن بە تامی کانزایی لە دەمدا.

**بڕی دەرمان:** هەوکردنی سی (پنیۆمۆسایتس کارینی) گەورەکان و منالان ٤ میلیگرام/کیلۆگرام دەماری یان ماسولکەیی ڕۆژانە ١ جار بۆ ماوەی ١٤ تا ٢١ ڕۆژ. لیشمانیاسس (هەوکردن بەهۆی مشەخۆری لەمیبای لیشمانیاوە) گەورەکان ٢ تا ٤ میلیگرام/کیلۆگرام دەماری یان ماسولکەیی هەر ڕۆژێك یان لە نێو ١ ڕۆژدا بە سەرجەمی ١٥ بڕی دەرمان (لایەنی زۆر). تریپانۆسۆمیاسس (هەوکردن بەهۆی مشەخۆری تریپانۆسۆما) گەورەکان ڕۆژانە ٤ میلیگرام/کیلۆگرام ماسولکەیی یان بە ئینفیوشنی دەماری ڕۆژانە ١ جار بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ.

## پینتازۆسین: PENTOZOCINE

**ناوی بازرگانی:** Talwin,fortral

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥٠ میلیگرامی و دەرزی ٣٠ میلیگرام/میلیلیتر و حەبی ٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Narcotic Analgesic

**بەکارهێنان:** دژی ئازاری مامناوەند و توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، بێهۆش، شۆك، سەرئێشە. سەرگێژبوون. بێخەوی، تەشەنوج، هەوکردنی پێست، خوران، وشکی دەم، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، گیرانی میز، ئازاری سك، لەرزین، ئازاری ماسولکە، زیادبوونی گەرمی لەش، لەرز.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان خۆراکی ٥٠ میلیگرام هەموو ٣ تا ٤ سەعاتێك، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٦٠٠ میلیگرامە. منالانی ٦ تا ١٢ ساڵ ٢٥ میلیگرام. بە دەرزی ژێرپێستی، ماسولکەیی یان دەمار بۆ ئازاری مامناوەند گەورەکان ٣٠ میلیگرام پینتازۆسین، بۆ ئازاری توند ٤٥ تا ٦٠ هەموو ٣ تا ٤ سەعاتێك لە کاتێکدا پێویست بێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣٦٠ میلیگرامە. منالی سەروی ١ ساڵ، بە دەرزی ماسولکەیی یان ژێرپێستی تا ١ میلیگرام/کیلۆگرام، بە دەرزی دەمار تا ٥٠٠ مایکرۆگرام/ کیلۆگرام.



## پێنتۆباربیتاڵ: PENTOBARBITAL

**ناوی بازرگانی:** Nembutal

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی و ئەلکزیر ١٨,٢ میلیگرام/٥ میلیلیتر و شافی ٣٠ و ٦٠ و ١٢٠ و ٢٠٠ میلیگرامی و دەرزی ٥٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Anticonvulsant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بێخەوی و بۆ چارەسەری فەوری فێ و وەك هێورکەرەو و بۆ بێهۆشی و پێش بەنجکردن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نارێکی لێدانی دڵ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، شڵەژان، خەمۆکی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، خەواڵویی، پەڵە، کابوسی شەوانە.

**بڕی دەرمان:** بۆ بێخەوی گەورەکان کەپسولی خۆراکی یان ئەلکزیر: ١٠٠ میلیگرام خۆراکی لە کاتی خەودا. بۆ شافی کۆم ١٢٠ تا ٢٠٠ میلیگرام لە ڕێگەی کۆمەوە، دەرزی ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام ماسولکەیی یان دەمار. بۆ هێوربوونەوە گەورەکان کەپسولی خۆراکی یان ئەلکزیر: ١٠٠ میلیگرام خۆراکی لە کاتی خەودا. شافی کۆم ١٢٠ تا ٢٠٠ میلیگرام لە ڕێگەی کۆمەوە، دەرزی ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام ماسولکەیی یان دەمار.بۆ منداڵان شافی کۆم بۆ هێوربوونەوە و خەوهێنەر منداڵانی ٢ مانگ و گەورەتر تا ١ ساڵ ٣٠ میلیگرام لەڕێگەی کۆمەوە. منداڵانی ١ ساڵ و گەورەتر تا ٥ ساڵ ٣٠ تا ٦٠ میلیگرام لەڕێگەی کۆمەوە. منداڵانی ٥ ساڵ و گەورەتر تا ١٢ ساڵ ٦٠ میلیگرام لەڕێگەی کۆمەوە. منداڵانی ١٢ ساڵ و گەورەتر تا ١٥ ساڵ ٦٠ تا ١٢٠میلیگرام لەڕێگەی کۆمەوە. گەورەتر لە ١٤ ساڵ ١٢٠ تا ٢٠٠ میلیگرام لەڕێگەی کۆمەوە. گیراوەی خۆراکی، ئەلکزیر یان دەرزی منداڵانی گەورەتر لە ١ ساڵ بۆ هێوربوونەوە ٢ تا ٦ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا خۆراکی دابەشکراو لە ٣ بڕی دەرماندا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٠٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. بڕی دەرمانی ئازاری پێش نەشتەرگەری ٢ تا ٦ میلیگرام/ کیلۆگرام ماسولکەیی. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٠٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا.

## پێنتۆسان: PENTOSAN

**ناوی بازرگانی:** Elmiron

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Urinary analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و لابردنی ئازاری میزەڵدان بەهۆی ئیلتیهابی میزەڵدانەوە بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** بوونی میز لە خوێن و پیسایدا، خوێنبەربوونی کۆم، کۆکە، خوێنبەربوونی لوت، خوێنبەربوونی پوکی ددان، هەڵوەرینی موو، هێڵنجدان، سکچوون، ئازاری گەدە، سەرئێشە، گێژی، خوران، خەمۆکی، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۱۰۰ میلی‌گرام ۳ جار لە ڕۆژێکدا، لەگەڵ ئاودا وەردەگیرێت لانی کەم ۱ سەعات پێش یان ۲ سەعات پاش لە ژەمەکانی خواردن.

## پێنتۆستاتین: PENTOSTATIN

**ناوی بازرگانی:** Nipent

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی ۱۰ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن (لیوکیمیای خانەی مودار) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان، حەساسیەت، بوونی کێشە لە کۆئەندامی دەمار، پەڵەی پێست، گێژی، خەواڵویی، تا، لەرز، خوێنبەربوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، خوران، ئازاری جومگە و ماسولکە، برینی دەم، نەمانی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤ میلی‌گرام/مەتردوجا هەموو هەفتەیەك.

## پێنتۆکسیفیلین: PENTOXIFYLLINE

**ناوی بازرگانی:** Trental

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiplatlet,vasodialator

**بەکارهێنان:** دژی پەرەکانی خوێن و مەیینی خوێنە و نەیێتە هۆی فراوانبوونی مولولەکانی خوێن و بۆ چارەسەری نەخۆشی مولولەکانی خوێن و کرژبوونی قاچ و بۆ چارەسەری نەخۆشی مولولەی موحیگی و شەلی پچڕ پچڕ (Intermittant clavdication) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، گێژی، خرۆشان، تێکچوونی خەو، زیاد لێدانی دڵ نزمبونەوەی پەستانی خوێن، سوربونەوە،ك کەمی پەرەی خوێن، پەڵە، خوران، کرژبوونی بۆری هەوا، ڕشانەوە، غازات، لەرزین، سەرئێشە، ئازاری قەفەسەی سنگ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ۳ جار لەگەڵ خواردن بەکاردێت.



## پیپەرمینت ئۆیل: PEPPERMINT OIL

**ناوی بازرگانی:** Colpermin,mintic

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی پیپەرمینت ئۆیل ۰,۲ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antispasmodic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ژانی سك یان گەورەبوونی سك، بەتایبەتی لە نەخۆشی گرژبوونی کۆلۆن(IBS) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** دڵەکزە، ڕوشانی دەوری کۆم، پەڵە، سەرئێشە، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ لەرزینی ماسولکە، پێکەوە ئیش نەکردنی ماسولکەکان.

**بڕی دەرمان:** کەپسولی (Colpermin) گەورەکان ومناڵانی سەرووی ۱۵ ساڵ، ۱ تا ۲ کەپسول، قوت دەدرێت لەگەڵ ئاوی تەواودا، ڕۆژانە ۳ جار تا ماوەی ۳ مانگ ئەگەر پێویست بوو. کەپسولی (Mintic) گەورەکانی سەرووی ۱۸ ساڵ، ۱ تا ۲ کەپسول، قوت دەدرێت لەگەڵ ئاوی تەواودا، ڕۆژانە ۳ جار پێش ژەمەکانی خواردن بۆ ماوەی ۲ تا ۳ مانگ ئەگەر پێویست بوو.

## پێرگۆلاید: PERGOLIDE

**ناوی بازرگانی:** Celance,permax

**شێوەی دەرمان:** حەبی ۵۰ مایکرۆگرامی و ۲۵۰ مایکرۆگرامی و ۱ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Dopamine receptor agonists

**بەکارهێنان:** بە تەنها یان لەگەڵ دەرمانەکانی تردا بۆ چارەسەری نەخۆشی پارکینسۆن (لەرزینی خۆنەویستی ئەندامەکان) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکی دەم، خەواڵویی، خرۆشان، قەلەقی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی گەدە، وڕێنە، هەوکردنی لوت، دووبینی، قەبزی، سکچوون، نزگەرە، زیاد لێدانی دڵ نزمبونەوەی پەستانی خوێن، دڵەکوتێ، بێخەوی، گێژی، تا، پەڵە، شڵەژان، نەمانی ئارەزوی خواردن، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۰,۰۵ میلیگرام ڕۆژانە ۱ جار، بۆ ماوەی ۲ ڕۆژ. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ۳ میلیگرامە.



## پێریسیازین: PERICYAZINE

**ناوی بازرگانی:** Pericyazine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ و ١٠ میلیگرامی و شروبی ١٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شیزۆفرینیا و نەخۆشی یە دەروونی یەکانی تر و دەرمانی یارمەتیدەری ماوەکۆتا بۆ ڕێکخستنی قەلەقی توند، خرۆشان بەهۆی جوڵەکانی ماسولکەیی لەکاریگەری چالاکی فکری و هەڵسوکەوتی هەڵەشەیی و سەرەڕۆیی توند و ترسناك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێوربوونەوەی زیاد لە ڕادە، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، خەواڵویی، بێخەوی، سەرئێشە،گێژی، تێکچوونی هەرس، گیرانی لوت، وشکی دەم، بەگرانی میزکردن، گەورەبوونی مەمك، لاوازی سێکسی، زەردی، پەڵە، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** بۆ شیزۆفرینیا و نەخۆشی یە دەروونی یەکانی تر، سەرەتا ٧٥ میلیگرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا لە ماوەی هەفتانە زیاد دەکرێت لە هەنگاوەکانی ٢٥ میلیگرامی بە پێی کاردانەوە، ئاسایی لایەنی زۆر ڕۆژانە ٣٠٠ میلیگرامە (پیرەکان سەرەتا ڕۆژانە ١٥ تا ٣٠ میلیگرامە)، منداڵان و کۆرپەی سەرووی ١ ساڵ (تەنها شیزۆفرینیا یان تێکچوونی ڕەفتار و هەڵسوکەوت) سەرەتا ٥٠٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە بۆ منداڵی ١٠ کیلۆگرامی، زیاد دەکرێت بە ١ میلیگرام بۆ هەر زیاد کردنێکی ٥ کیلۆگرامی کێشی لەش بۆ لایەنی زۆری سەرجەمی بڕی دەرمانی ڕۆژانە ١٠ میلیگرامە. بڕی دەرمان ئەبێت بە تەدریجی زیادبکرێت بە پێی کاردانەوەبەڵام بڕی دەرمانی پارێزراو نابێت زیاتر بێت لە ٢ جاری بڕی دەرمانی سەرەتا. دەرمانی یارمەتیدەری ماوەکۆتا بۆ ڕێکخستنی قەلەقی توند، خرۆشان بەهۆی جوڵەکانی ماسولکەیی لەکاریگەری چالاکی فکری و هەڵسوکەوتی هەڵەشەیی و سەرەڕۆیی توند و ترسناك ١٥ تا ٣٠ میلیگرام (پیرەکان ٥ تا ١٠ میلیگرام) ڕۆژانە دابەش دەکرێت لە ٢ بڕی دەرماندا بڕی دەرمانی زیاتر لە کاتی خەودا دەدرێت. بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بە پێی کاردانەوەکەی. بۆ منداڵان پێشنیار نەکراوە.

## پێریندۆپریل: PERINDOPRIL ERBUMIME

**ناوی بازرگانی:** Aceon

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ و ٤ و ٨ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو و کەمی کاری سکۆڵەی چەپی دڵ و جەڵدەی دڵ و نەخۆشی تەپلەیی خوێنبەر و شەکرەی نەخۆشی گورچیلەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەوکردنی پەنکریاس، سۆریاسس، هەوکردنی پێست، وەستانی دڵ، تێکچوونی گورچیلە، هەوکردنی گورچیلە، کەمخوێنی، کەمی خرۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، زەردی، پەککەوتنی جگەر، کۆکە، هەوکردنی سی یەکان، ئازاری پشت، کەمی صۆدیۆم، ئازاری جومگە و ماسولکە، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤ تا ٨ میلیگرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٦ میلیگرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## پێرمیثرین: PERMETHRIN TOPICAL

**ناوی بازرگانی:** Nix

**شێوەی دەرمان:** کریمی ١٪ و ٥٪ و شامپۆی ١٪.

**گروپی دەرمان::** Antiscabies

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئەسپێی سەر و گەڕی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، ڕوشانی مەوزوعی، پەڵە، خورانی توند.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ڕووی سەر و مووەکانی پێ بماڵن و پاش ١٠ خولەك بە ئاو بیشۆن.

## پێرفینازین: PERPHENAZINE

**ناوی بازرگانی:** fentazin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ و ٤ و ٨ میلیگرامی و دەرزی ٥ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** دژی نەخۆشی دەروونی یە و بۆ چارەسەری شیزۆفرینیا (دووبیری) و شێتی و قەلەقی وتوندی و کرژی و وروژان وخرۆشان و دژی هێڵنجدان و ڕشانەوەی توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵوبی، هێرشکردن، گۆڕانی دەروونی، هەوکردنی گورچیلە، زەردی، تێکچوونی بینین، سەرئێشە، کەمبوونی کێش، نەمانی ئارەزوی خواردن، پەڵە، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکەی سپی.

**بڕی دەرمان:** بۆ نەخۆشی دەروونی گەورەکان ٥ تا ١٦ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار، ئەتوانی تا ٦٤ میلیگرام ڕۆژانە بەکاربهێنیت. منداڵانی گەورەتر لە ١٢ساڵ ٦ تا ١٢ میلیگرام ڕۆژانە بەشێوەی خۆراکی لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا بەکاردەهێنرێت. بۆ هێڵنجدان و ڕشانەوەی توند گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ٥ تا ١٠ میلیگرام لە ڕێگەی ماسولکەیی. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٥ تا ٣٠ میلیگرامە.

## پیثیدین: PETHIDINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Demerol,pethidine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر و حەبی ٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Opioid analgesic

**بەکارهێنان:** دژی ئازاری مامناوەند و توند و بۆ هێورکردنەوەی ئازاری منداڵبوون و هێورکردنەوەی ئازاری نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی بینین، خوران، قەبزی، مەیینی خوێن، نەمانی ئارەزوی خواردن، وشکی دەم، قەبزی، بەرزبوونەوە و نزمبونەوەی پەستانی خوێن، کابوسی شەوانە، گیرانی میز، کەمبوونەوە و زیادبوونی لێدانی دڵ، دڵەکوتێ، ئۆدیما، ورێنە، تێکچوونی هاوسەنگی، تەشەنوج، گێژی، خەواڵویی، لاوازی سێکسی، تێکچوونی خەو، بەگرانی میزکردن، پەڵە، شەرا، سوربونەوە، ئارەقکردنەوە، گۆڕانی مەزاج، شڵەژان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ ئازاری تیژ بە ڕێگەی خۆراکی ٥٠ تا ١٥٠ میلی‌گرام هەموو ٤ سەعاتێك، منداڵان ٠,٥ تا ٢ میلی‌گرام/کیلۆگرام. بە دەرزی ژێرپێستی یان ماسولکەیی، ٢٥ تا ١٠٠ میلی‌گرام (پیرەکان یان لاوازەکان، سەرەتا ٢٥ میلی‌گرام) دوبارە دەکرێتەوە پاش ٤ سەعات، منداڵان بەرێگەی دەرزی ماسولکەیی ٠,٥ تا ٢ میلی‌گرام/کیلۆگرام. بە ڕێگەی دەرزی دەماری لەسەرخۆ و هێواش ٢٥ تا ٥٠ میلی‌گرام (پیرەکان یان لاوازەکان، سەرەتا ٢٥ میلی‌گرام) دوبارە دەکرێتەوە پاش ٤ سەعات، بۆ هێورکردنەوەی ئازاری منداڵبوون بە دەرزی ژێرپێستی یان ماسولکەیی، ٥٠ تا ١٠٠ میلی‌گرام، دوبارەدەکرێتەوە ١ تا ٣ سەعات دواتر ئەگەر پێویست بوو، لایەنی زۆری ٤٠٠ میلی‌گرامە لە ٢٤ سەعاتدا. چارەی سەرەتایی بە دەرزی ماسولکەیی، ٢٥ تا ١٠٠ میلی‌گرام، ١ سەعات پێش دەستپێکردنی ئیشەکە (پیرەکان یان لاوازەکان، سەرەتا ٢٥ میلی‌گرام)، هەموو ٢ تا ٣ سەعات ئەگەر پێویست بوو، منداڵان بەرێگەی دەرزی ماسولکەیی ٠,٥ تا ٢ میلی‌گرام/کیلۆگرام. بۆ ئازاری پاش نەشتەرگەری بە دەرزی ژێرپێستی یان ماسولکەیی، ٢٥ تا ١٠٠ میلی‌گرام، (پیرەکان یان لاوازەکان، سەرەتا ٢٥ میلی‌گرام)، هەموو ٢ تا ٣ سەعات ئەگەر پێویست بوو، منداڵان بەرێگەی دەرزی ماسولکەیی ٠,٥ تا ٢ میلی‌گرام/کیلۆگرام.

## فینازۆپایریدین: PHENAZOPYRIDINE

**ناوی بازرگانی:** Phenazodine,urodine, pyridiate

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Urinary analgesic

چ: هێورکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ گرەنتیکی بەخوێنی



**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازار و ڕوشانی ڕێڕەوی میز بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** تێكچوونی هەرس، گێژی،پەككەوتنی تیژی گورچیلە، سەرئێشە، پەڵە، هێڵنجدان، كەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار پاش لە خواردن. منداڵان ٤ میلیگرام/كیلۆگرام ڕۆژانە ٣ جار.

## فینیلیزین: PHENELZINE

**ناوی بازرگانی:** Nardil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری خەمۆكی و چڵێسی و ئالودەبوون بە كۆكایینەوە بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** سەرئێشە، گێژی، تێكچوونی خەو، لەرزین، بێهۆشی، پەڵە، ئارەقكردنەوە، هەستیاربوون بەڕوناكی، گلوكۆما، تێكچوونی بینین، هێڵنجدان، قەبزی، تێكچوونی گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، لاوازی سێكسی، گیرانی میز، كەمخوێنی، كەمبوونەوەی خڕۆكەی سپی و پەڕەی خوێن، هەوكردنی جگەر، زۆربوونی كێش، زۆربوونی صۆدیۆم.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ١٥ میلیگرام ٣ جار لە ڕۆژێكدا، بڕەكەی زیاد دەكرێت بۆ ٦٠ تا ٩٠ میلیگرام لە ڕۆژێكدا لە بڕی دەرمانی دابەشكراودا. پیرەكان ١٥ تا ٦٠ میلیگرام لە ڕۆژێكدا لە بڕی دەرمانی دابەشكراودا.

## فینیندیۆن: PHENINDIONE

**ناوی بازرگانی:** Phenindione

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٥ و ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەكارهێنان:** بۆ پێشگری لە مەیینی خوێن و كەمبوونەوە یان ڕێنەدان بە ڕۆیشتنی خوێن لە نەخۆشی ڕۆماتیزمی دڵ یان لەرینەوەی گوێچكەڵەیی، بۆ پێشگرتن پاش لە ناشتنی دەستكردی زمانەی دڵ، بۆ پێشگرتن و چارەسەر لە مەیین و كڵۆبوونی خوێنی دەمار (خوێنهێنەر) و داخستن و مەیینی خوێنی دەماری سی بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** خوێنبەربوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سكچوون، زەردی، خراپی فرمانی جگەر، هەوكردنی پەنكریاس، تا، هەڵوەرینی موو، پەڵە، لیر، لوی زەرد، كەمبوونەوەی خڕۆكەی سپی خوێن، هەوكردنی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ٢٠٠ میلیگرام لە ڕۆژی ١، ١٠٠ میلیگرام لە ڕۆژی ٢، پاشان بڕی دەرمان ڕێكدەخرێت بەپێی كاردانەوەكەی، بڕی دەرمانی پارێزراو ئاسایی ڕۆژانە ٥٠ تا ١٥٠ میلیگرامە.

## فینوباربیتال: PHENOBARBITAL

**ناوی بازرگانی:** Barbito,luminal,luminalette

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥ و ٣٠ و ٦٠ و ١٠٠ میلیگرام دەرزی ١٠٠ و ٢٠٠ میلیگرام/میلیلیتر (صۆدیۆم) و ئەلکزیر ١٥ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Anticovulsant,hypnotic

**بەکارهێنان:** دژی فێ، هێورکەرەوە و خەوهێنەرە بۆ چارەسەری جۆرەکانی تەشەنوج بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژبوون، نزمبونەوەی پەستانی خوێن،خەوالوێی، پەڵە، هەوکردنی پێست، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، خەوی ناخۆشی شەوانە، ئازاری سەردڵ، کرژبوونی بۆری هەوا.

**بڕی دەرمان:** بۆ هێورکردنەوە گەورەکان ٣ تا ١٢٠ میلیگرام خۆراکی لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. منالآن ٦ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە، خۆراکی لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ هێورکردنەوەی پێش لە نەشتەرگەری گەورەکان ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام ماسولکەیی ٦٠ تا ٩٠ خولەك پێش لە نەشتەرگەری. منالآن ١٦ تا ١٠٠ میلیگرام ماسولکەیی ٦٠ تا ٩٠ خولەك پێش لە نەشتەرگەری. بۆ بێخەوی ١٠٠ تا ٣٢٠ میلیگرام خۆرکی یان ماسولکەیی. منالآن ٣ تا ٦ میلیگرام/کیلۆگرام. بۆ جۆرەکانی تەشەنوج گەورەکان ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام ڕۆژانە لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا یان بە یەك بڕی دەرمان پێش لە خەوتن. منالآن ڕۆژانە ٤ تا ٦ میلیگرام/کیلۆگرام دابەشکراو لە هەر ١٢ سەعاتێك ئەتوانی بەیەك بڕ بەکاربێنیت.

## فینۆل گلیسرین: PHENOL GLYCERIN

**ناوی بازرگانی:** Cepastat

**شێوەی دەرمان:** قەترەگوێ (فینۆل ٦,٤ گرام + گلیسرین qs ١٠٠ گرام).

**گروپی دەرمان:** Antiseptic

**بەکارهێنان:** پاککەرەوە و دژە هەوکەرە.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سەرگێژبوون، ڕشانەوە، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** بەپێی پێویست بەکاردێت.

## فینۆل سەلفۆنەفیالین: P.S.P

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٦ میلیگرام/ میلیلیتر.

**گرووپی دەرمان:** Diagnostic agent

**بەکارهێنان:** بۆ لێکۆڵینەوەی کار و چالاکی گورچیلە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، پەڵەی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ٦ میلیگرام دەماری یان ماسولکەیی.

## فینۆکسیبێنزامین: PHENOXYBENZAMINE

**ناوی بازرگانی:** Dibenyline

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Alpha blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن بەهۆی توشبوونی شێرپەنجەی بچوکی دەفری خوێن لەناوچەی ناوەوەی رژێنی ئەدرینالٌ فیۆکرۆمۆسیتۆما (phaeochromocytoma) و گەورەبوونی باشی پرۆستات (BPH) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، بێهێزی، وشکبوونی لوت و دەم، نزمبونەوەی پەستانی خوێنی توند، زیاد لێدانی دڵ ئازاری سنگ، کەمبوونی وزەی لەش، بچوکبونەوەی بیلبیلەی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلیگرام رۆژانە ٢ جار، ئەگەر پێویست بێت ئەتوانی کە بڕی دەرمان یەك رۆژ لە نێوانیان زیاد بکەیت، بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٢٠ تا ٣٠ میلیگرامە رۆژانە ٢ تا ٣ جار. منداڵان ٠,٢ میلیگرام/ کیلۆگرام لایەنی زۆر رۆژانە ١٠ میلیگرام، بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٠,٤ تا ١,٢ میلیگرام/کیلۆگرامە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## فینتۆلامین: PHENTOLAMINE MESYLATE

**ناوی بازرگانی:** Rogitine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلیگرام/ میلیلیتر.

**گرووپی دەرمان:** Alpha blocker



**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری و کۆنترۆڵی پەستانی بەرزی خوێن بەهۆی توشبوونی شێرپەنجەی بچوکی دەفری خوێن نەناوچەی ناوەوەی رژێنی ئەدرینال فیۆکرۆمۆسیتۆما (pheochromocytoma) و دەرمانی یارمەتیدەر بۆ تەشخیصی فیۆکرۆمۆسیتۆما و دەرمانی یارمەتیدەر لە (CHF) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گیرانی لوت، هێڵنجدان، رشانەوە، سکچوون، سەرگێژبوون. ئازاری سك، شۆك، ئازاری سنگ، کەمبوونەوەی شەکری خوێن، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** بۆ پێشگری و کۆنترۆڵی پەستانی بەرزی خوێن لە فیۆکرۆمۆسیتۆما (pheochromocytoma) گەورەکان ٥ میلیگرام دەماری یان ماسولکەیی، ١ تا ٢ سەعات پێش نەشتەرگەری ئەگەر پێویست بێت، دوبارەکردنەوەی بڕی دەرمان رێگەپێدراوە. ئەتوانی ٥ میلیگرام دەماری، لە کاتی نەشتەرگەری بەکاربهێنیت. منالآن ١ میلیگرام، ١ تا ٢ سەعات پێش لەنەشتەرگەری، ئەگەر پێویست بێت ئەتوانی کە بڕی دەرمان دووبارە بکەیتەوە. ئەتوانی کەهەمان بڕی دەرمان کاتی نەشتەرگەری بەکاربهێنیت. دەرمانی یارمەتیدەر بۆ تەشخیصی فیۆکرۆمۆسیتۆما گەورەکان ٥ میلیگرام دەماری یان ماسولکەیی. منالآن ١ میلیگراد دەماری یان ٣ میلیگرام ماسولکەیی. دەرمانی یارمەتیدەر لە (CHF) گەورەکان ٤٠ تا ١٧٠ مایکرۆگراد لە خولەکێکدا بە ئینفیوشنی دەماری رێی پێ دەدرێت.

## فینیلیفرین لوت: PHENYLEPHRINE HCL nasal

**ناوی بازرگانی:** Sinex,Alkonefrin

**شێوەی دەرمان:** قەترەی لوت ٠,٢٥٪ و ٠,٥٪.

**گروپی دەرمان:** Nasal Decongestant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری گیرانی لوت و ئاوکردنی لوت و بۆ کەمکردنەوەی گیرانی لولەی ئۆستاکی (Eustachian tube) لولەیەکە گوێی ناوەڕاست و گەروو بە یەك دەگەیەنێ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، لەرزین، سەرگێژبوون، تەشەنوج، دڵەڕاوکێ، لەرز، ئازاری قەفەسەی سنگ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، گلوکۆما، تێکچوونی بینین، وشکبوونەوەی لینجە پەردەی لوت، سنگەکوژێ، نارێکی لێدانی دڵ، روشانی لوت، پژمین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ٢ تا ٣ قەترە لە هەر کونەلوتێك. منالآنی ٦ تا ١٢ ساڵ ٢ قەترە لە هەر کونەلوتێك. منالآنی بچوکتر لە ٦ ساڵ ١ تا ٢ قەترە لە هەر کونەلوتێك.



## فنیلنیفرین چاوی: PHENYLEPHRINE HCL

**ناوی بازرگانی:** AK-Dilate

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاوی ٥٪.

**گروپی دەرمان:** Vasoconstrictor

**بەکارهێنان:** بۆ گەورەکردنی بیلبیلەی چاو و پێش پشکنینی چاو و پێش یان پاش نەشتەرگەری چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کزانەوەی چاو، سەرئێشە، ئاوکردنی چاو، هەستیاربوونی چاو بە ڕوناکی، گێژی، ڕوشانی چاو، زیادبوونی پەستانی خوێن، نارێکی لێدانی دڵ، ئارەقکردنەوە.

**بڕی دەرمان:** بۆ گەورەکردنی بیلبیلەی چاو گەورەکان ١ تا ٢ قەترە لە گیراوەی ٥٪ لە هەر چاوێك بچکێنرێت. لەکاتی پێویست ئەتوانی ١٠ تا ٦٠ خولەك دواتر، کە ئەم بڕە دەرمانە دوبارە بکەیتەوە. بۆ زیادکردنی گەورەبوونی چاو پێش لە نەشتەرگەری چاو گەورەکان و منالان ١ قەترە، ٠,٥ تا ١ سەعات پێش لە نەشتەرگەری لە چاو بچکێنرێت. بۆ پشکنینی چاو بە ئامێری ئۆفپالمۆسکۆپ گەورەکان و منالان ١ قەترە، ١٥ تا ٣٠ خولەك پێش لە پشکنین لە چاو بچکێنرێت. گەورەبوونی بیلبیلەی چاوی دروستبوو، ١ تا ٣ سەعات دەمێنێتەوە. بۆ تەشخیصی (Horner or rieder sydrome) گەورەکان ١ تا ٢ قەترە لە گیراوەی ٥٪ لە هەر چاوێك بچکێنرێت.

## فینیل نیفرین: PHENYLEPHRINE SYSTEMIC

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Vasoconstrictor

**بەکارهێنان:** مولولەکانی خوێن تەسك دەکاتەوە بۆ بەرزکردنەوەی پەستانی خوێن و بۆ کەمکردنەوەی لێدانەکانی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، دڵەڕاوکێ، ڕەبۆ، تەشەنوج، کەمبوونی لێدانی دڵ بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ناجێگری، نارێکی لێدانی دڵ جەڵدە.

**بڕی دەرمان:** بۆ زیادبوونی لێدانی دڵ (تاکیکاردی) حەملەکانی سەرو سکۆڵەیی گەورەکان ٠,٥ میلیگرام دەماری، بە خێرایی بەکاردەهێنرێت، لەکاتی پێویستدا ئەتوانی لە بڕە دەرمانەکانی دواتر کە بڕی دەرمان ٠,١ تا ٠,٢ میلیگرام زیاد بکەیت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١ میلیگرام دەبێت. بۆ پێشگری لە نزمبونەوەی پەستانی خوێن لە ماوەی بەنجی بڕبڕەیی (Spinal) گەورەکان ٢ تا ٣ میلیگرام ژێرپێستی یان ماسولکەیی، ٣ تا ٤ خولەك پێش لە بێهۆشی. بۆ فەوری نزمبونەوەی پەستانی خوێن لە بەنجی بڕبڕەیی گەورەکان ٠,١ تا ٠,٢

میلیگرام دەماری و لە کاتی پێویست بڕە دەرمانەکانی دواتر بە ئەندازەیەکی کەمتر دوبارە دەکرێتەوە. بۆ درێژکردنەوەی بێهۆشی بڕبڕەیی گەورەکان ٢ تا ٥ میلیگرام بۆ گیراوەی بێهۆشی زیاد دەکرێت. دەرمانی چارەسەری نزمبونەوەی پەستانی خوێن لە شۆکدا گەورەکان ٠,١ تا ٠,١٨ مایکرۆگرام لە ڕێی ئینفیوشنی دەماری ڕێی پێ دەدرێت. پاش لە ڕێکخستنی پەستانی خوێن، ٠,٠٤ تا ٠,٠٦ بە ئینفیوشن دەبێت. بۆ زیادبوونی کرژبوونی مولولەیی لە بەنجی مەوزوعی گەورەکان ١ میلیگرام لەم دەرمانە بۆ ٢٠ میلیلیتر لە گیراوەی بێهۆشی زیاد دەکرێت.

## فینیل ئیفرین: PHENYLEPHRINE OPH.

**ناوی بازرگانی:** Zincfrin

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاوی (فینیل ئیفرین هایدرۆکلۆریك ٠,١٢٪ w/v + زینك سەلفەیت ٠,٢٥٪ w/v ).

**گروپی دەرمان:** Vasoconstrictor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی سوك و حەساسیەتی چاو و سوربونەوە و ڕوشان و کزانەوە و وشکبونەوەی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، نارێکی لێدانی دڵ، سەرئێشە، هێڵنجدان، ئارەقکردنەوە، فرمێسك ڕشتن، تێکچوونی بینین، سوربونەوەی چاو، سەرگێژبوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ١ تا ٢ قەترە، ڕۆژانە ٣ جار بکرێتە چاوەوە.

## فینیل ئیفرین: PHENYLEPHRINE ORAL

**ناوی بازرگانی:** Sudafed PE, lusonal

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ میلیگرامی و حەبی کرماندن ١٠ میلیگرامی و (Strip)ی ١٠ میلیگرامی و قەترەی ٢,٥ میلیگرام/میلیلیتر و گیراوەی ٧,٥ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Decongestant,Vasopressor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری گیرانی لوت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نارێکی لێدانی دڵ، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، قەلەقی، لەرزین، دڵەکوتێ، خرۆشان، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، سەرئێشە، گێژی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ تا ٢٠ میلیگرام خۆراکی هەموو ٤ سەعاتێك بە بڕی پێویست، لایەنی زۆر ٦٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. منداڵان ٥ میلیگرام خۆراکی هەموو ٤ سەعاتێك بە بڕی پێویست، لایەنی زۆر ٦٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا.



## فینیتۆین: PHENYTOIN

**ناوی بازرگانی:** Dilantin,Epanutin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ و ٣٠٠ میلیگرامی و حەبی ١٠٠ میلیگرامی و دەرزی ٥٠ میلیگرام/میلیلیتر (٥ میلی لیتر) و سەسپێنشنی ٣٠ میلیگرام/ ٥ میلیلیتر و حەبی کرماندن ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticonvulsant

**بەکارهێنان:** دژی تەشەنوج و بۆ چارەسەری حاڵەتی فێداری و نەخۆشی تەشەنوجی (تۆنیك - کلۆنیکی گشتی) و تەشەنوجی ڕەگ (نیورۆلیپتیك) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، تووڕەیی، گێژبوون، بێخەوی، زیادبوونی شەکری خوێن، لەرینەوەی سکۆڵەیی، حەساسیەت، پەڵە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، هەوکردنی جگەر، نەمانی ئارەزوی خواردن، قەبزی، خەواڵویی، لەرزین، زۆربوونی موو، زیپکە، دووبینی.

**بڕی دەرمان:** بۆ حاڵەتی فێداری و نەخۆشی تەشەنوجی (تۆنیك - کلۆنیکی گشتی) و تەشەنوجی ڕەگ (نیورۆلیپتیك) گەورەکان ١٠ تا ١٥ میلیگرام/کیلۆگرام دەماری بە لەسەرخۆیی ڕێی پێ دەدرێت. لایەنی زۆری خێرایی ئینفیوشن ٥٠ میلیگرام/خولەکێکدایە. بڕی دەرمانی خۆراکی لە سەرەتادا ڕۆژانە لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا بە ماوەی ٢ سەعاتی دەبێت. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٣٠٠ میلیگرام خۆراکی بە شێوەی یەك بڕی دەرمان یان لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. منداڵان بڕی دەرمانی سەرەتایی ١٥ میلیگرام/کیلۆگرام دەماری بە لەسەرخۆیی ڕێی پێ دەدرێت. لایەنی زۆری خێرایی ئینفیوشن ٥٠ میلیگرام/خولەکێکدایە. ئەتوانی کە هەمان بڕی دەرمانی خۆراکی دابەشکراو، هەر ٨ تا ١٢ سەعاتێك بەکاربێنیت. بڕی دەرمانی پارێزراو ڕۆژانە ٤ تا ٨ میلیگرام/کیلۆگرام دابەشکراوی هەر ١٢ سەعاتێکە. بۆ ئازاری نیورۆتیك (تێکچوونی دەماری) گەورەکان ٢٠٠ تا ٦٠٠ میلیگرام خۆراکی، لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## فینیتۆین کەمپاوند: PHENYTOIN COMPOUND

**ناوی بازرگانی:** Garoin

**شێوەی دەرمان:** حەبی (فینیتۆین صۆدیوم ١٠٠ میلیگرام + فینۆباربیتاڵ ٥٠ میلیگرام ).

**گروپی دەرمان:** Anticonvulsant

**بەکارهێنان:** دژی تەشەنوج بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەمان کاریگەری (فینیتۆین صۆدیوم و فینۆباربیتاڵ)ی هەیە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ١تا٣ حەب.





## فینیتوین صۆدیوم: PHENYTOIN SODIUM TOP.

**شێوەی دەرمان:** کرێمی مەوزوعی ١٪.

**گروپی دەرمان:** رێگری کلاجینەیز.

**بەکارهێنان:** بۆ چاکردنەوەی برینی پێستی بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ جار رۆژانە بەمەوزوعی بەڕووی پێستدا بیماڵن.

## فۆلکۆدین: PHOLCODINE

**ناوی بازرگانی:** Pavacol-d, Galenphol

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی خۆراکی ٥ میلیگرام/٥ میلیلیتر و ١٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و ٢ میلیگرام/٥ میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Couph suppressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کۆکەی وشك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، رشانەوە، قەبزی، کۆبونەوەی بەڵغەم، خەواڵویی، گێژی، شڵەژان، پەڵە، ورووژان.

**بڕی دەرمان:** (گیراوەی ١٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر ) گەورەکان و منالانی سەرووی ١٢ ساڵ، ٥ میلیلیتر رۆژانە ٣ تا ٤ جار. (گیراوەی خۆراکی ٥ میلیگرام/٥ میلیلیتر ) گەورەکان ٥ تا ١٠ میلیلیتر رۆژانە ٣ تا ٤ جار، منالی ٦ تا ١٢ ساڵ ٢,٥ تا ٥ میلی لیتر. (گیراوەی ٢ میلیگرام/٥ میلی لیتر) منالی ٦ تا ١٢ ساڵ ١٠ میلیلیتر رۆژانە ٣ جار.

## فوسفەیت: PHOSPHATE

**ناوی بازرگانی:** Neutra-phos, K-Phos

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ( ٢٢٥ میلیگرام/میلیلیتر $KH_2PO_4$ + ٢٣٦ میلیگرام/ میلیلیتر $K_2HPO_4$) حەبی فوارە ($NaH_2PO_4$: ١٩٣٦ میلیگرام + $NaHCO_3$: ٣٥٠ میلیگرام + $KHCO_3$: ٣١٥ میلیگرام + سیتریك ئەسید ٨٠٠ میلیگرام) حەبی ٥٠٠ میلیگرام (فۆسفات، پۆتاسیۆم مۆنۆبەیسیك) و بە شێوەی (BULK ( $KH_2PO_4$، $NaH_2PO_4$، $Na_2HPO_4$).

**گروپی دەرمان:** ترشکەری میز.

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری لە بەردی کالسیۆمی، ترشکردنی میز، کەمبوونی فۆسفاتی توند بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێهێزی، سەرگێژبوون، ئازاری سك، سکچوون، ڕشانەوە، نارێکی لێدانی دڵ، زیادبوونی کێش، کرژبوونی ماسولکە، گێژی.

بڕی دەر مان: بۆ بەرگری لە بەردی کالسیۆمی، ترشکردنی میز، گەورەکان ۲۵۰ میلیگرام فۆسفۆر خۆراکی ڕۆژانە ٤ جار، ئەگەر پێویست بکات ئەتوانی ۲۵۰ میلیگرام هەر ۲ سەعاتێك بەکاربێنیت، بۆ کەمبوونی فۆسفاتی توند گەورەکان ڕۆژانە ۳۰۰ میلیگرام فۆسفات بە دەمار ڕێی پێ دەدرێت. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە ۳ تا ٤ گرام خۆراکی بە شێوەی دابەشکراو، منالان ٤٦,٥ تا ٦٢ میلیگرام فۆسفات بە دەمار ڕێی پێ دەدرێت. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە ۸۰۰ میلیگرام فۆسفاتە کە لە ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا ڕێی پێ دەدرێت.

## فیسۆستیگمین: PHYSOSTIGMINE

**ناوی بازرگانی:** Antilirium

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ۱ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antidote

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ژەهراویبوون بە ئەنتی کۆلینێرجیکەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، تەشەنوج، ئارەقکردنەوە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادبوونی لیك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۰,٥ تا ۲ میلیگرام ماسولکەیی یان دەمار هەموو ۲۰ خولەکێك. منالان ۰,۰۱ تا ۰,۰۳ میلیگرام/کیلۆگرام لە بڕێکی دەرماندا هەموو ٥ تا ۱۰ خولەکێك.

## فیسۆستیگمین: .PHYSOSTIGMINE OPH

**ناوی بازرگانی:** Eserine

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم و قەترەی چاو.

**گروپی دەرمان:** Antiglaucoma

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەندێ جۆری گلوکۆما(ئاوی ڕەشی چاو) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کرژبوونی گەدە، ئازار، خیزەخیز، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ نارێکی لێدانی دڵ، هیلاکبوون، ئارەقکردنەوە، زیادبونی لیك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالان مەڵهەم بۆ هەر چاوێك ۱ تا ۳ جار لە ڕۆژێکدا، قەترە بۆ هەر چاوێك ۱ قەترە بۆ زیاتر لە ٤ جار لە ڕۆژێکدا.



## پیلۆکارپین: PILOCARPINE

**ناوی بازرگانی:** Carpine,Salagen

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ١٪ و ٢٪ و ٤٪.

**گروپی دەرمان:** Antiglaucoma

**بەکارهێنان:** بۆ بچوککردنەوەی بیلبیلەی چاو و بۆ ڕێکخستنی پەستانی ناوەوەی چاو لە نەخۆشی گلوکۆما (ئاوی ڕەشی چاو)، بۆ گلوکۆمای گۆشەی کراوەی موزمین و پێش لە نەشتەرگەری فەوری گلوکۆمای تیژی گۆشەی داخراو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بینین، سەرئێشە، سوتانەوەی چاو، فرمێسك ڕشتن، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، کرژبوونی بۆری هەوا، لەرزین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالان ١ تا ٢ قەترە، ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار بکرێتە چاوەوە.

## پیلۆکارپین: PILOCARPINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Salagen

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Cholinergic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری وشکبوونەوەی دەم (Xerostomia) لەو کەسانەی لیکەڕژێنەکانیان بەخراپی کاردەکەن بەهۆی چارەسەری تیشکی بۆ شێرپەنجەی سەر و مل، بۆ چاکردنەوەی وشکبوونەوەی چاو و دەم لە (Sjogren syndrome) حاڵەتێکی بەرگری خۆییە کاردەکاتە سەر لیکەڕژێنەکان و فرمێسکەڕژێنەکان نەبێتەهۆی وشکبوونەوەی چاو و دەم، بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە، سکچوون، ئازاری سك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، سوربونەوە، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، دڵەکوتێ، سەرئێشە، گێژی، ئارەقکردنەوە، زوو میزکردن، غازات، چاوئێشە، پەڵە، خوران، تێکچوونی بینین، فرمێسکڕشتن، هەوکردنی لوت، ئازاری چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ چارەسەری وشکبوونەوەی دەم (Xerostomia) بەهۆی چارەسەری تیشکی بۆ شێرپەنجەی سەر و مل، ٥ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار لەگەڵ یان دەستبەجێ پاش ژەمەکانی خواردن (بڕی دەرمانی کۆتایی هەمیشە لەگەڵ ژەمی ئێوارەدا دەبێت) ئەگەر تەحەمولی کرد بەڵام کاردانەوەی کەمبوو پاش لە ٤ هەفتە ئەبێت بڕی دەرمان زیاد بکرێت بۆ لایەنی زۆر ڕۆژانە ٣٠ میلیگرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لایەنی زۆری کاریگەری چارەسەری ئاسایی لە ماوەی ٤ تا ٨ هەفتەدا، بەردەوام نابێت ئەگەر چاك نەبوویەوە و پاش لە ٢ تا ٣



مانگ. گەورەکان بۆ چاکردنەوەی وشکبوونەوەی چاو و دەم لە (Sjogren syndrome) ٥ میلیگرام ڕۆژانە ٤ جار (لەگەڵ ژەمەکانی خواردن یان لەکاتی خەودا)، ئەگەر تەحەمولی کرد بەلام کاردانەوەی کەمبوو پاش لە ٤ هەفتە ئەبێت بڕی دەرمان زیاد بکرێت بۆ لایەنی زۆر ڕۆژانە ٣٠ میلیگرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، بەردەوام نابێت ئەگەر چاك نەبوویەوە و پاش لە ٢ تا ٣ مانگ.

## پیمیکرۆلیمەس: PIMECROLIMUS

**ناوی بازرگانی:** Elidel

**شێوەی دەرمان:** کرێمی ١٪ و مەڵهەم.

**گرووپی دەرمان:** Immunomodulator

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی سوك و مامناوەندی پێست نەکزیما (بیرۆ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ڕوشان، خوران، هەوکردنی پێست، ئاگرە، زیپکە، سووربونەوە، شەرا، ئۆدیما، هەوکردنی گەروو، هەوکردنی لەوزەتێن، هەوکردنی لوت و چاو و گوێ، سکچوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، ئازاری سك، ئازاری جوگە و پشت، سوتانەوە، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالانی زیاتر لە ٢ ساڵ ڕۆژانە ٢ جار لانی کەم بۆ ماوەی ١ هەفتە.

## پیمۆزاید: PIMOZIDE

**ناوی بازرگانی:** Orap

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antipsycotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شیزۆفرینیا و (Tourette s syndrome) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بێخەوی، سەرئێشە، زیادبوونی لێدانی دڵ، پەڵەی پێست، وشکبوونەوەی دەم، میزکردنی زۆر، خەواڵویی، تێکچوونی هەڵسوکەوت، کەمبوونەوەی صۆدیۆم، گۆڕانی EKG.

**بڕی دەرمان:** بۆ (Tourette s syndrome) گەورەکان و منالانی زیاتر لە ١٢ ساڵ سەرەتا ڕۆژانە ١ تا ٢ میلیگرام، لایەنی زۆر بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٢٠ میلیگرامە. منالانی بچوکتر لە ١٢ ساڵ ٠,٠٥ میلیگرام بە کاتی خەوتن ڕێی پێ دەدرێت، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٠ میلیگرامە. بۆ چارەسەری شیزۆفرینیا (دووبیری) گەورەکان و منالانی زیاتر لە ١٢ ساڵ سەرەتا ڕۆژانە ٢ میلیگرام، ڕێژەی بڕی دەرمانی ئاسایی ڕۆژانە ٢ تا ٢٠ میلیگرام. پیرەکان نیوەی بڕی دەرمانی سەرەتا ڕێی پێ دەدرێت.



## پیندۆلۆل: PINDOLOL

**ناوی بازرگانی:** Visken

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Beta blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری سنگ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نارێکی لێدانی دڵ، ئاوسان، هێڵنجدان، ئازاری گەدە، خەمۆکی، تا، گێژی، هیلاکبوون، ئۆدیما، نەمانی ئارەزوی خواردن، تەنگەنەفەسی، زەردی، تێکچوونی هەرس، بێخەوی، قەلەقی.

**بڕی دەرمان:** پەستانی بەرزی خوێن، گەورەکان سەرەتا ٥ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ تا ٣ یان ١٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار. لە ماوەی هەفتانەدا هەر کاتێك پێویستبوو زیاد دەکرێت، بڕی دەرمانی ئاسایی و پارێزراو ڕۆژانە ١٥ تا ٣٠ میلیگرامە. لایەنی زۆر ڕۆژانە ٤٥ میلیگرامە. بۆ ئازاری سنگ ٢,٥ تا ٥ میلیگرام تا ڕۆژانە ٣ جار.

## پایۆگلیتازۆن: PIOGLITAZONE

**ناوی بازرگانی:** Actos

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥ و ٣٠ و ٤٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidiabetic

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕێژەی شەکری خوێن و نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا، جیوب، پەککەوتنی دڵ، هەوکردنی گەروو، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی و پەڕەی خوێن، پەڵە، خوران، شەرا، تەنگەنەفەسی، میزی خوێناوی، کەمبوونەوەی شەکری خوێن، تێکچوونی بینین، ئازاری جومگە، بێخەوی، تێکچوونی هاوسەنگی، تێکچوونی گەدە، ئارەقکردنەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ساڵ سەرەتا ١٥ تا ٣٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار زیاد دەکرێت بۆ ٤٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار بە پێی کاردانەوەکەی لە ڕۆژێکدا لەو نەخۆشانەی بە بڕی سەرەتایی دەرمان چارەسەر ناکرێن یان کاریگەری لەسەریان نی یە بڕی دەرمان لایەنی زۆری تا ٤٥ میلیگرام ڕۆژانە زیاد دەکرێت.



## پیپیکیورۆنیۆم برۆماید: PIPECURONIUM BROMIDE

**ناوی بازرگانی:** Arduan

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٤ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** شل کەرەوەی پەیکەرەماسوکەیە و وەك دەرمانی یارمەتیدەر لە بەنجی عمومی دا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، مەیینی خوێن، تەنگەنەفەسی، وەستانی هەناسە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآن لە کەسی لاواز و لەگەڵ چالاکی ئاسایی گورچیلە ٧٠ تا ٨٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە دەمار ڕێی پێ دەدرێت، (کاریگەری دەرمان ١ تا ٢ سەعات دەمێنێتەوە) بڕی دەرمان بە پێی هەلومەرجی هەر کەسێك دیاری دەکرێت.

## پیپراسیلین: PIPERACILLIN SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Pipracil

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١ و ٢ گرام/ڤیاڵ (پاودەر).

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردن بەهۆی زیندەوەرە هەستیارەکانەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی و پەڕەی خوێن، سکچوون، کەمبوونەوەی نیوترۆفیل، سەرئێشە، هەوکردنی خوێنهێنەر، سەرگێژبوون، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ١٠٠ تا ٣٠٠ میلی‌گرام/ کیلۆگرام ڕۆژانە دەماری یان ماسولکەیی دابەشکراو لە هەر ٤ تا ٦ سەعاتێکدا، لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٢٤ گرامە.

## پیپراسیلین تی: PIPERACILLIN T

**ناوی بازرگانی:** Zosyn, Tazocin

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی (٢ گرام ٢٥٠ میلی‌گرام پیپراسیلین (صۆدیۆم) ٢ گرام + تازۆباکتام (صۆدیۆم) ٢٥٠ میلی‌گرام)، دەرزی ٤ گرام/٥٠٠ میلی‌گرام پیپراسیلین (صۆدیۆم) ٤ گرام + تازۆباکتام (صۆدیۆم) ٥٠٠ میلی‌گرام) و دەرزی ٣ گرام/٣٧٥ میلی‌گرام پیپراسیلین (صۆدیۆم) ٣ گرام + تازۆباکتام (صۆدیۆم) ٣٧٥ میلی‌گرام).



**گرووپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنە هەستیارەکان بە پیپراسیلین - تازۆباکتام بۆ نمونە هەوکردنی سی و پێست و هەوکردنی پیریتۆنیۆم (پەردەی نەرمی بۆشایی سك) و هەوکردنی ڕیخۆڵەکوێرە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ئازاری سنگ، هەوکردنی لوت، سەرگێژبوون، بێخەوی، پەڵە، کەمبوونەوەی خڕۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، خوران، هێڵنجدان، ڕشانەوە. قەبزی، سکچوون، کەمخوێنی، تەنگەنەفەسی، شەرا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣/٣٧٥ لە ڕێی ئینفیوشنی دەماری لە ماوەی ٣٠ خولەکدا، هەر ٦ سەعاتێك ڕێی پێ دەدرێت.

## پیپرازین: PIPERAZINE

**ناوی بازرگانی:** Anterpar,verimex,wormex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرام و شروبی ٧٥٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Anthelmintic

**بەکارهێنان:** دژی کرمە خڕ و دەزولەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، هێڵنجدان. ڕشانەوە. سەرئێشە، سەرگێژبوون، پەڵە، تەشەنوج، تێکچوونی بینین، کۆکە، ئازاری سك، ئاوی سپی (کاتاراکت)، شەرا. کرژبوونی بۆری هەوا، بێهێزی، لەرزین، ئاو هاتنە خوارەوە بەلوتدا، کەمبوونەوەی بینین.

**بڕی دەرمان:** بۆ هەوکردنی کرمی دەزولەیی گەورەکان و منالآن ٦٥ میلیگرام/ کیلۆگرام ڕۆژانە ٤ جار، بۆ ماوەی ٧ تا ٨ ڕۆژ. بۆ هەوکردنی کرمی خڕ گەورەکان ٣,٥ گرام ڕۆژانە بە١ بڕی دەرمان و ٢ ڕۆژ بە دوای ئەودا ڕێی پێ دەدرێت. منالآن ٧٥ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە بە١ بڕی دەرمان و ٢ ڕۆژ بە دوای ئەودا ڕێی پێ دەدرێت.

## پیپۆتیازین: PIPOTIAZINE PALMITATE

**ناوی بازرگانی:** Piportil Depot

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ پاراستن لە نەخۆشی شیزۆفرینیا و نەخۆشی یە دەروونی یەکانی تر بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** نەخۆشی پارکینسۆن و دیسکینسیا، زیادبوون و کەمبوونی گەرمی، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، خەواڵویی، خرۆشان، گێژی، گیرانی لوت، سەرئێشە، تێکچوونی گەدە، وشکی دەم، قەبزی، بەگرانی میزکردن، تێکچوونی بینین، زیاد لێدانی دڵ گەورەبوونی مەمك، لاوازی سێکسی، زیادبوونی کێش.

**بڕی دەرمان:** بە دەرزی ماسولکەیی قوڵ بۆ ناو ماسولکەیی سمت، بڕی دەرمانی تێستی ٢٥ میلیگرام، پاشان ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام زیاتر پاش لە ٤ تا ٧ ڕۆژ، پاشان بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بەپێی کاردانەوەکەی لە ماوەی ٤ هەفتەدا. بڕی ڕێژەی دەرمانی ئاسایی و پارێزراو ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام (لایەنی زۆر ٢٠٠ میلیگرام) هەموو ٤ هەفتەیەك. پیرەکان سەرەتا ٥ تا ١٠ میلیگرام.

## پیربیوتیرۆل: PIRBUTEROL

**ناوی بازرگانی:** Maxair

**شێوەی دەرمان:** ئایرۆسۆلی ٠,٢ میلیگرام.

**گروپی دەرمان:** Bronchodialator

**بەکارهێنان:** بۆ فراوانکردنی بۆری هەواو بۆ چارەسەر و بەرگری لە کرژبوونی بۆری هەوا و ڕەبۆ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی لێدانی دڵ گۆڕانی تام، لەرزین، گێژی، توڕەیی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ ئیستینشاق هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك، لایەنی زۆر ١٢ ئیستینشاق لە ڕۆژێکدا.

## پیراسیتام: PIRACETAM

**ناوی بازرگانی:** Nootropil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٨٠٠ میلیگرامی و گیراوەی ٣٣٣,٣٪.

**گروپی دەرمان:** هاندەری مێشك.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی ئەلزایمەر و کرژبوونی ماسولکەی توێکڵ و بۆ صەدمەکانی مێشك و تێکچوونی هۆشیاری و بیر و یادەوەری کەسە بەتەمەنەکان و ڕێگرتن لە کۆبونەوەی پەڕەکانی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، ناجێگیری، تەشەنوج، زۆربوونی کێش، خەمۆکی، سەرئێشە، سکچوون، نەمانی ئارەزووی خواردن، قەبزی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٤٠٠ میلیگرام ڕۆژانە لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا پێش لە خواردن ڕێی پێ دەدرێت.



## پیرۆکسیکام: PIROXICAM

**ناوی بازرگانی:** Feldene,brexidol,novopirocam

**شێوەی دەرمان:** کەپسول ١٠ و ٢٠ میلیگرامی و حەبی ١٠ و ٢٠ میلیگرامی و دەرزی ٢٠ میلیگرامی و جێڵی ٠,٥ و شافی ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری رۆماتیزم و هەوکردنی کۆنی جومگەکان و نەخۆشی پاشایان و ئازاری جومگە و ئێسك و هەوکردنی فەقەرەکان و ئازاری مەوزوعی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هیلاکبون، سەرگێژبوون، هەستیاربوون بەڕوناکی، پەڵە، خوران، شەرا، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، ئۆدیمای موحیگی، کەمخوێنی، تێکچوونی گەدە، سکچوون، خوێنبەربوون و برینی گەدە و ڕیخۆڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار. بۆ ئازاری تیژی ماسولکەیی ڕۆژانە ٤٠ میلیگرام ماسولکەیی یان خۆراکی. پاش ئەوەی ئازار کەمبویەوە و بڕی دەرمان کەمبکرێتەوە و بە ٢٠ میلیگرام بگات. بۆ هەوکردنی جومگەکان و ڕۆماتیزم گەورەکان ٢٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار. لە کەسانی بەتەمەندا، بڕی دەرمان لەسەرەتا ڕۆژانە ١٠ میلیگرام بە شێوەی خۆراکی ڕێی پێ دەدرێت. بۆ ئازاری مەوزوعی گەورەکان ١ گرام لە جێڵ ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار بە ڕووی ئەو شوێنەدا دەماڵرێت.

## پیڤمیسیلینام: PIVMECILLINAM HCL

**ناوی بازرگانی:** Selexid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibacterial

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی تیژی سادەی میزەڵدان و نەخۆشی موزمین یان گەڕاوەی بەکتریایی میز (باکتریوریا) و هەوکردنی ڕیڕەوی میز بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی گەدە، کەمبوونەوەی ئاوگی لەش و کارنیتینی تەواوی لەش.

**بڕی دەرمان:** بۆ هەوکردنی تیژی سادەی میزەڵدان گەورەکان و منداڵانی سەروی ٤٠ کیلۆگرام، سەرەتا ٤٠٠ میلیگرام پاشان ٢٠٠ میلیگرام هەموو ٨ سەعاتێك بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ. بۆ نەخۆشی موزمین یان گەڕاوەی بوونی بەکتریا لە میزدا (باکتریوریا) گەورەکان و منداڵانی سەروی ٤٠ کیلۆگرام، ٤٠٠ میلیگرام هەموو ٦ تا ٨ سەعاتێك. بۆ هەوکردنی ڕیڕەوی میز منداڵانی خوار ٤٠ کیلۆگرام، ٢٠ تا ٤٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.



## پیزۆتیفین: PIZOTIFEN

**ناوی بازرگانی:** Sanomigran

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ مایکرۆگرام و ١,٥ میلی‌گرام و ئەلکزیر ٢٥٠ مایکرۆگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Anti-migraine

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگرتن لە سەرئێشەی دەماری شەقیقە و کلاستەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، گێژی، خەواڵویی، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، وشکی دەم، زیادبوونی کێش، قەبزی، بێخەوی، توڕەیی و هێرشکردن، قەلەقی، ورێنە، فێ، خەمۆکی، ئازاری ماسولکە و جومگە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ مایکرۆگرام لە شەودا بە تەدریجی زیاد دەکرێت بۆ بڕی دەرمانی لە ١,٥ میلی‌گرام لە شەودا یان لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لەوانەیە زیاتر زیاد بکرێت تا لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٤,٥ میلی‌گرام (بەڵام بەدەگمەن پێویست نەبێت) لایەنی زۆری یەك بڕی دەرمان ٣ میلی‌گرامە. منداڵی سەروی ٥ ساڵ، تا ڕۆژانە ١,٥ میلی‌گرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لایەنی زۆری یەك بڕی دەرمان لە شەودا ١ میلی‌گرامە.

## پلێریکسافۆر: PLERIXAFOR

Mozobil

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Hematopoietic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن ناهوجکین لیمفۆما و مەلتیپل مایلۆما پێکەوە لەگەڵ فیلگراستیم و پێگفیلگراستیم بۆ هاندانی چالاکانە دابەشبوونی خانە کە سەرچاوەیەکە بۆ دروستبوونی خانەکانی خوێن (HSC) بۆ وەرگرتن و چاندن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە، وشکی دەم، گێژی، سەرئێشە، بێخەوی، هیلاکی، ئازاری پەیکەرەماسولکە، ئازاری جومگە، سووربونەوە، سکچوون، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، غازات، ئارەقکردنەوە.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی دەرزی ژێرپێستی، گەورەکان سەروی ١٨ ساڵ، ٠,٢٤ میلی‌گرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٦ تا ١١ سەعات پێش لە دەست پێکردنی (ئەفێریسس)، ماوەی چارەسەری ئاسایی ٢ تا ٤ ڕۆژە (لایەنی زۆر ٧ ڕۆژ).



## پلیکامایسین: PLICAMYCIN

**ناوی بازرگانی:** Mithracin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢,٥ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی هێلکەگون و زیادبوونی کالسیۆمی خوێن و میز بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، خەمۆکی، پەڵە، خەوالّویی، سوربونەوەی پێست. تەمەڵی، هێڵنجدان، تا، ڕشانەوە، سکچورن، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئاوسان، میزی خویناوی، لەرز، برینی گەروو، بەگرانی هەناسەدان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥ تا ٣٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام بۆماوەی ٨ تا ١٠ ڕۆژ مانگی ١جار ئەبێت دەرمان دوبارەبکەیتەوە.

## پۆدۆفیلین: PODOPHYLLIN

**ناوی بازرگانی:** Podocon٢٥

**شێوەی دەرمان:** پاودەر بلوری.

**گروپی دەرمان:** Antimitotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری دروستبوونی بالوك لە ناوچەی ملی منداڵدان (کوندیلۆما ئەکیومینتام) بەهۆی هەوکردنی ڤایرۆسی (HPV) و بالوکی کۆم و بالوکی پێست لە نێوان کۆم و دەزگای زایەندی و بالوك لە دەرەوەی دەزگای زایەندی ژنان و پیاوان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** قەبزی، کەمخوێنی، کرژبوونی گەدە، سوتانەوە، سوربونەوە. خوران، ئاوسان، ئازار.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان هەفتەی ١ جار لەگیراوەی ١٠٪ تا ٢٥٪ بەڕووی ئەو شوێنەدا دەماڵرێت. گیراوە ئەبێت بۆ ماوەی ١ تا ٦ سەعات بەڕووی مەوزوعی بمێنێتەوە و پاشان بە ئاو و سابوون بشۆردرێت. ئەبێت ماوەی نێوان چارەسەرەکان ٧ ڕۆژ بێت. چارەسەر ئەبێت بۆ ماوەی ٦ هەفتە بەردەوام بێت (هەفتەی ١ جار).

## پۆلی ئەثیلین گلایکۆل: POLYETHYLENE GLYCOL

**ناوی بازرگانی:** Vasocon

**شێوەی دەرمان:** پاودەر.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کاتی قەبزی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، غازات، کرژبوون، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١٧ گرام لەم دەرمانە لەگەڵ ٢٤٠ سیسی ئاو تێکەڵ بکرێت و بەکاربهێنرێت. کاریگەری چارەسەری ئاسایی ٢ تا ٣ ڕۆژ دواتر دەردەکەوێت. لەم مادەیە بۆ چارەسەری قەبزی زیاتر لە ٢ هەفتە بەکارنەهێنرێت.



## پۆلی میکسین: .POLYMYXIN OPH

**ناوی بازرگانی:** Polyfax

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی چاو (پۆلی میکسین بی سەلفەیت ١٠٠٠٠ یەکە، باسیتراسین زینك ٥٠٠ یەکە/گرام).

**گروپی دەرمان:** Antibacterial

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی مەوزوعی. ئیلتیهابی پێست.

**بڕی دەرمان:** ئەگەر مەڵهەمی چاو بەتەنهابوو ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار بەکاردێت. ئەگەر قەترەی چاو لە ڕۆژدا بەکارهات، ئەوا تەنها شەوانە مەڵهەم بەکاردێت.

## پۆلی میکسین بی چاو: .POLYMYXIN B OPH

**ناوی بازرگانی:** Aerosporin

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٥٠٠٠٠٠ یەکە/ڤیاڵ

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری هەوکردنی چاو بەهۆی بەکتریای سیدۆمۆناس ئیرۆجینۆسا بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** ١ جار ٣ قەترە لە گیراوەی ١٠٠٠٠ تا ٢٥٠٠٠ یەکە/میلی لیتری تێدایە هەر سەعاتێك تا کاتی کاردانەوەی داواکراو بکرێتە ناو چاوەوە. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٥٠٠٠ یەکە/ کیلۆگرامە. لایەنی زۆری ماوەی چارەسەر ١ هەفتە دەبێت.

## پۆلیمیکسین بی: POLYMYXIN B SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Aerosporin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠٠٠٠ یەکە/ڤیاڵ

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی ڕێڕەوی میز و بەکتریا (بەکتریاوی بوونی خوێن) و سێپتیسیمیا (هەوکردنی خوێن) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، حەساسیەت، سەرئێشە، تەشەنوج، ئازار لەشوێنی دەرزی لێدان، بێهێزی ماسولکەیی، خەواڵویی، بێهۆشی، میزی خوێناوی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ١٥٠٠٠ تا ٢٥٠٠٠ یەکە/کیلۆگرام بە ئینفیوشنی دەماری هەر ١٢ سەعاتێك.



## پۆلیمکسین نێن نێچ: POLYMIXIN N H

**ناوی بازرگانی:** Bacticort suspension

**شێوەی دەرمان:** قەترەی گوێ ( پۆلیمیکسین بی سەلفەیت ۱۰۰۰۰ یەکە میلیلیتر + نیۆمایسین سەلفەیت ٥ میلی گرام/میلیلیتر + هایدرۆکۆرتیزۆن ۱۰ میلیگرام/میلی لیتر) و قەترە و سەسپێنشنی گوێ (پۆلیمیکسین بی سەلفەیت ۱۰۰۰۰ یەکە + نیۆمایسین سەلفەیت ٥ میلیگرام + هایدرۆکۆرتیزۆن ۱۰ میلیگرام/ ۱ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی ڕێڕەوی گوێی دەرەوە و هەوکردن بەهۆی ماستۆئیدیکتومی (برینی ئێسکی پشت گوێ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کاریگەری لەسەر گورچیلە و گوێ هەیە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤ قەترە، هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك بكرێتە ڕێڕەوی گوێی دەرەوە، منداڵان ۳ قەترە، هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك بكرێتە ڕێڕەوی گوێی دەرەوە.

## پۆلی میکسین: POLYMYXIN TOPICAL

**ناوی بازرگانی:** Polyfax

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی پێست (پۆلی میکسین بی سەلفەیت ۱۰۰۰۰ یەکە، باسیتراسین زینك ٥٠٠ یەکە/گرام).

**گروپی دەرمان:** Antibacterial

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەستیاری.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ۲ جار بەکاردێت یان زوو زوو ئەگەر پێویست بوو.

## پۆلیستیرین: POLYSTYRENE SULPHONATE RESINS

**شێوەی دەرمان:** پاودەر.

**گروپی دەرمان:** Antihyperkalaemia

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیادبوونی پۆتاسیۆم لەخوێندا (هایپەرکالیمیا) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم. سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی مەگنسیۆم، زیادبوونی کالسیۆم، ڕوشانی گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ۱٥ تا ٦٠ گرام. منداڵان ڕۆژانە ۱ گرام/ کیلۆگرام.



## پۆلی ڤینایلْ ئەلكهول: POLYVINYL ALCOHOL

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ١٤ میلی گرام/میلی لیتر (١٠ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Tear deficiency,lubricants,astringent

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری وشكبوونەوەی چاو و پەككەوتنی دەردانی فرمێسك بەكاردێت.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان و منالان ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار ١ قەترە لە گیراوەكە بكرێتە ناو چاوەوە.

## پۆراكتانت ئەلفا: PORACTANT ALFA

**ناوی بازرگانی:** Curosurf

**شێوەی دەرمان:** سەسپێنشن بۆ ناوەوەی قوڕقوڕاگە ٨٠ میلی گرام فۆسفۆلیپید / میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Lung Surfactant

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەر و پێشگری لە نەخۆشی سەختی ڕێڕەوی هەناسە(RDS) یان نەخۆشی پەردەی شوشەیی لە منداڵە تازەبووەكاندا بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** كەمبوونەوەی لێدانی دڵ، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، بوونی خوێن لە میزدا، كەمبوونەوەی میز، خوێنبەربوونی ناوەوەی قوڕقوڕاگە.

**بڕی دەرمان:** بڕی دەرمانی سەرەتایی بە ڕێگەی ناوەوەی قوڕقوڕاگەیی ٢,٥ میلی لیتر/كیلۆگرام كێشی منداڵی تازەبوو بڕە دووبارەكان: تا ٢ بڕی دەرمانی دووبارە لە ١,٢٥ میلی لیتر/كیلۆگرام كێشی منداڵی تازەبوو ئەبێت هەموو ١٢ سەعاتێك دەرمانی پێ بدرێت بۆ سەرجەمی ٣ بڕی دەرمان. لایەنی زۆری بڕی دەرمان (سەرەتا و تا ٢ بڕی دەرمانی دووبارە): ٥ میلی لیتر/كیلۆگرام.

## پۆرفیمێر سۆدیۆم: PORFIMER SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Photofrin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٥ میلی گرامی و ٧٥ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic agent

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی سی (NSCLC) و سورێنچك بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** ئازاری سنگ، ڕشانەوەی خوێناوی، هێڵنجدان، قەبزی، بەرزبونەوە و نزمبونەوەی پەستانی خوێن، كەمبوونەوەی لێدانی دڵ، پەككەوتنی دڵ، لەرینەوەی گوێچكەڵە، بێخەوی، قەلەقی، سەرئێشە، هیلاكی، خەمۆكی، شڵەژان، پەڵە، خوران، هەستیاربوون بەڕوناكی، سوتانەوە بە تیشكی خۆر، جیوب، هەوكردنی

بۆرێچکەکان، سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی کێش، هەوکردنی سی، تەنگەنەفەسی، کۆکە، کەمخوێنی، ئازاری جومگە، هەوکردنی گەروو، هەوکردنی میزەڕۆ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ میلیگرام/کیلۆگرام وەك ١ بڕی دەرمان بە دەرزی دەمار بە هێواشی بۆ زیاتر لە ٣ تا ٥ خولەك.

## پۆساکۆنازۆڵ: POSACONAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Noxafil

**شێوەی دەرمان:** سەسپێنشنی ٢٠٠ میلیگرام/٥میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری و چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی لەوانەی کۆئەندامی بەرگرییان لاوازە بەهۆی چارەسەری کیمیایی و چاندنی قەدەخانەی مۆخی ئێسکەوە و بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی کاندیدا و ئەسپەرجیلۆس و هەوکردنی کەڕوویی دەم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ئازاری گەدە، خوران، نەمانی ئارەزوی خواردن، کۆکە، زەردی، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، ئاوسان، ئازاری سنگ، خەمۆکی، ڤێ، تا، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، نارێکی لێدانی دڵ، زۆر میزکردن، خوێنبەربوون، لەرز.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار لەگەڵ خواردندا یان ئەگەر تەحەمولی خواردنی نەکرد، ٢٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٤ جار.

## پۆتاسیۆم بیکاربۆنەیت: POTASSIUM BICARBONATE

**ناوی بازرگانی:** K-vescent

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی حەبی فوارە.

**گروپی دەرمان:** Antihypokalemia

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری و چارەسەری کەمی پۆتاسیۆم (هایپۆکالیمیا) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، سکچوون، غازات، قەلەقی، پەڵە، ئازاری توندی گەدە، تێکچوونی گەدە.

**بڕی دەرمان:** بە پێی ئاستی کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم بەکاردێت.



## پۆتاسیۆم کلۆراید: POTASSIUM CHLORIDE

**ناوی بازرگانی:** Klorvess

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ و ٦٠٠ میلیگرامی و پاودەری خۆراکی ٢٠ میلی هاوهێزی و دەرزی بۆ ئینفیوشن ٢ میلی هاوهێزی/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Potassium supplement

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم و ئیفلیجی ڕیخۆڵەیی خێزانی و سکچوونی توند و ژەهراوییوون بەدیجۆکسین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، غازات، سەرئێشە، بێهێزی، دابەزینی پەستان، ئازاری سك، برینی دەزگای هەرس، زیادبوونی پۆتاسیۆم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦,٧ تا ٢٠ میلی هاوهێزی لە کلۆریدی پۆتاسیۆم (حەب) ، ڕۆژانە ٣ جار یان ٢٠ میلی هاوهێزی پۆتاسیۆم لە پاودەری کلۆریدی پۆتاسیۆم لە نیو پەرداخ ئاودا، ٢ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٠٠ میلی هاوهێزی یە لە ڕۆژێکدا. ئەگەر ئاوگی پۆتاسیۆم زیاتر لە (٢,٥ میلی هاوهێزی/لیتر) بێت تا ٢٠٠ میلی هاوهێزی ڕۆژانە بەخێرایی کەمتر لە ٤٠ میلی هاوهێزی لە سەعاتێکدا بە ئینفیوشنی دەماری دەکرێت. ئەگەر ئاوگی پۆتاسیۆم کەمتر لە (٢ میلی هاوهێزی/لیتر) بێت تا ٤٠٠ میلی هاوهێزی ڕۆژانە، لایەنی زۆر بەخێرایی ٤٠ میلی هاوهێزی لە سەعاتێکدا بە ئینفیوشنی دەماری دەکرێت. خێرایی ئینفیوشنی دواتر ئەبێت کە بەلێکۆڵینەوەی EKG نەخۆش و پێوانەکردنی ئاوگی پۆتاسیۆم دیاری بکرێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی گەورەکان ٤٠٠ میلی هاوهێزی یە لە ڕۆژێکدا.

## پوتاسیوم سیترەیت: POTASSIUM CITRATE

**ناوی بازرگانی:** Urocit

**شێوەی دەرمان:** پاودەری خۆراکی.

**گروپی دەرمان:** Urenary Alkaliizer

**بەکارهێنان:** دژی بەردەکانی میزەڕۆ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ١٠ گرام ڕۆژانە لە بڕە دەرمانە دابەشکراوەکاندا.



## پۆتاسیۆم ئایۆداید: POTASSIUM IODIDE

**ناوی بازرگانی:** Thyrojod

**شێوەی دەرمان:** پاودەر بلوری

**گروپی دەرمان:** Iodine supplement

**بەکارهێنان:** بەڵغەم دەرکەرە و بۆ چارەسەری کۆکە و بۆ پاراستنی ڕژێنی پایرۆید لە بەرامبەری تیشك و دژی کەڕوو و بۆ چارەسەری هایپەرپایرۆیدیسم و پێش لە برینی ڕژێنی پایرۆید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، زیپکە، ئیلتیهابی لیکەڕژێنەکان. حەساسیەت، تامی کانزایی لەدەمدا.

**بڕی دەرمان:** وەك بەڵغەم دەرکەر گەورەکان ٣٠٠ تا ٦٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار. بۆ چارەسەری پایرۆتۆکسیك کریزس گەورەکان ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی، هەر ٤ سەعاتێك. هەوکردنی کەڕوویی پێستی (سپۆرۆتریکۆسس) گەورەکان ٦٥ تا ٣٢٥ میلیگرام خۆراکی، ڕۆژانە ٣ جار. پێش لە برینی ڕژێنی پایرۆید گەورەکان ٥٠ تا ٢٥٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ جار. یان ٠,١ تا ٠.٣ میلیلیتر لە گیراوەی پۆتاسیۆم ئایۆداید ڕۆژانە ٣ جار، دەبێت کە ئەم دەرمانە ١٠ تا ١٤ ڕۆژ پێش لە نەشتەرگەری بەکاربهێنرێت.

## پۆتاسیوم پێرمەنگەنەیت: POTASSIUM PERMANGANATE

**ناوی بازرگانی:** Permantasico,permitabs

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ٠,١ و حەبی گیراوە ٤٠٠ میلیگرامی و پاودەر.

**بەکارهێنان:** بۆ پاکردنەوەی برینەکان و نەشتەرگەری پێستی بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** لەگیراوەی ٠,٠١٪سودوەردەگیرێت.

## پوڤیدون: POVIDONE

**ناوی بازرگانی:** Oculotect

**شێوەی دەرمان:** قەترەی ٥٪.

**گروپی دەرمان:** Tear deficiency,lubricants,astringent

**بەکارهێنان:** بۆ نەخۆشی وشکبوونەوەی چاو بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٤ جار بەکاردێت یان هەر کاتێك پێویست بوو.



## پوڤیدون ئایودین: POVIDONE IODINE

**ناوی بازرگانی:** Betadine

**شێوەی دەرمان:** مەلهەمی مەوزوعی ١٠٪ و پاککەرەوەی نەشتەرگەری ٧,٥٪ و گیراوەی مەوزوعی ٢,٥٪ و ١٠٪ و ٧,٥٪ و جێلی زایەندی ژنان ١٠٪ و شامپۆی ١٠٪ و دوشی زایەندی ژنان ١٠٪.

**گروپی دەرمان:** Antiseptic

**بەکارهێنان:** دژەهەوکەری مەوزوعی یەو بۆ شۆردنی پێست پێش لە نەشتەرگەری و ئیلتیهابی زایەندی ژنان بەهۆی کاندیدا و تریکۆمۆناس و چەوری زیادەی سەر و وەرینی پێست و سوربوونەوەی پێستی سەر و بۆ چارەسەر و پێشگرتن لە هەوکردنی سوتانەکان و ڕوشانە پێستی یەکان و نەخۆشی هەوکردنی دەم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێست، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** بەبڕی پێویست ڕووی شوێنی مەبەستی پێ ئەماڵن.

## پرالیدۆکسیم: PRALIDOXIME CHLORIDE

**ناوی بازرگانی:** Protopam chloride

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١ گرامی (پاودەر).

**گروپی دەرمان:** Antidote

**بەکارهێنان:** لەگەڵ ئەترۆپین بۆ چارەسەری ژەهراویبوون بە ئۆرگانۆفۆسفەیتەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، تێکچوونی بینین، هێڵنجدان، خەواڵویی، دووبینی، لاوازی ماسولکەیی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ گرام لە ١٠٠ میلیلیتر نۆرماڵ سەلاین دا بتوێتەوە و لە ماوەی ١٥ تا ٣٠ خولەکدا بە IV ئینفیوشن بکرێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٢ گرامە. منداڵان ٢٠ تا ٤٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ١٠٠ میلیلیتر نۆرماڵ سەلاین دا بتوێتەوە و لە ماوەی ١٥ تا ٣٠ خولەکدا بە IV ئینفیوشن بکرێت.

## پرامیپێکسۆڵ: PRAMIPEXOLE HCL

**ناوی بازرگانی:** Mirapex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٠٨٨ و ٠,١٨ و٠,٣٥ و ٠,٧ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Dopamine agonist



**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی پاركینسۆن (لەرزینی خۆنەویستی ئەندامەكان) بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** گێژی، بێهێزی، تا، ئازاری سنگ،ئزمبونەوەی پەستانی خوێن، ئۆدیمای محیگی، نەمانی ئارەزوی خواردن، وشكی دەم، هێڵنجدان، نەمانی ئارەزوی سێكسی، هەوكردنی ڕێڕەوی میز، تێكچوونەكانی پێست، هەوكردنی سی یەكان، دووبینی، هەوكردنی جومگە، خەوالّویی، تێكچوونی خەو، ئۆدیمای گشتی، هەوكردنی لوت، بێخەوی.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان چارەسەری سەرەتایی ۰,۳۷٥ میلی‌گرام ڕۆژانە لەڕێی خۆراكی یەوە كە لە ۳ بڕی دەرمانی دابەشكراودا پێی دەدرێت پێش لە ماوەیەكی كاتی هەر ٥ تا ۷ ڕۆژێك نابێت كە بڕی دەرمان زیادبكرێت. بەشێوەی هەفتانە ئەتوانی ۰,۷٥ میلی‌گرام بڕی دەرمان زیادبكەیت تا دوای ۷ هەفتە لایەنی زۆری بڕی دەرمان بە ۱.٥ میلی‌گرام ۳ جار لە ڕۆژێكدا بگات. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە ۱.٥ تا ٤,٥ میلی‌گرامە لە ۳ بڕی دەرمانی دابەشكراودا.

## پرامۆكسین: PRAMOXINE

**ناوی بازرگانی:** Proctofoam

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم و كرێم و لۆشنی ۱٪.

**گروپی دەرمان:** Topical anesthetic

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازار و خورانی مایەسیری و سوتانەوە و ئیلتیهابی پێست بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** هەوكردنی پێست.

**بڕی دەرمان:** بۆ كرێم بەكاردێت هەموو ۳ سەعاتێك.

## پراسوگریل: PRASUGREL

**ناوی بازرگانی:** Efient

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ۱۰ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiplatelet

**بەكارهێنان:** لەگەڵ ئەسپرین دا دژی كەڵەبوونی پەڕەكانی خوێن و كلۆبوونی خوێن و بۆ ڕوونكردنەوەی خوێن بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** پەڵە، كەمخوێنی، میزی خوێناوی، خوێنبەربوون، كەڵەكەبوونی خوێن لە شانەكان.

**بڕی دەرمان:** لەگەڵ ئەسپریندا گەورەكان سەروی ۱۸ ساڵ سەرەتا ٦۰ میلی‌گرام بە ۱ بڕی دەرمان پاشان كێشی لەشی سەروی ٦۰ كیلۆگرام، ۱۰ میلی‌گرام ڕۆژانە ۱ جار یان كێشی لەشی خوار ٦۰ كیلۆگرام یان پیرەكان سەروی ۷٥ ساڵ، ٥ میلی‌گرام ڕۆژانە ۱ جار.



## پراڤاستاتین: PRAVASTATIN

**ناوی بازرگانی:** Pravachol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٠ و ٤٠ و ٨٠ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antilipemic

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندنی چەوری خوێن (کۆلیسترۆڵ و ترای گلیسراید) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، ئاوسان، تا، بێهێزی، هێڵنجدان، ئازاری گەدە، خوران، نەمانی ئارەزوی خواردن، گێژی، زەردی، سەرئێشە، ئازاری ماسولکە، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ تا ٨٠ میلی گرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار.

## پرازیکوانتیل: PRAZIQUANTEL

**ناوی بازرگانی:** Biltricide,Cysticide

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦٠٠ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Anthelmintic

**بەکارهێنان:** دژی کرمەپانەکان و شیستۆسۆمیاسس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ڕشانەوە، تەشەنوج، سەرگێژبوون، خوران، بێهێزی، هێڵنجدان، سکچوون، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، ئارەقکردنەوە، ئازاری ماسولکە و جومگەکان، خەواڵویی، شەرا، خوران، زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر، بێحاڵی، نەمانی هاوسەنگی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی زیاتر لە ٤ ساڵ ٢٠ میلی گرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٣ جار بۆ ماوەی ١ ڕۆژ ڕێی پێدەدرێت. ماوەی نێوان بڕی دەرمانەکان نابێت کەمتر لە ٤ سەعات و زیاتر لە ٦ سەعاتێك بێت.

## پرازۆسین: PRAZOSIN HCL

**ناوی بازرگانی:** Minipress,hypovase

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١ و ٢ و ٥ میلی گرامی و حەبی ٠,٥ و ١ و ٢,٥ و ٥ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Alpha Blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو و گەورەبوونی باشی پڕۆستات (BPH) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبونەوەی پەستانی خوێن، سەرگێژبوون، بێهێزی، خەمۆکی. سەرئێشە، زیادبوونی لێدانی دڵ، پەڵە، قەبزی، سکچوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کرژبوونی سك، وشکبوونەوەی دەم، هەڵوەرینی موو، خوێنبەربوونی لوت، ئازاری جومگە، دڵەکوتێ، هیلاکبوون، خوران، گیرانی لوت، گەورەبونی مەمك، گیرانی میز، هەوکردنی پەنکریاس، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن گەورەکان ٠,٥ تا ١ میلیگرام خۆراکی، ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢٠ میلیگرامە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٤ تا ٢٠ میلیگرامە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ گەورەبوونی باشی پرۆستات (BPH) ١ تا ٢ میلیگرام خۆراکی، ڕۆژانە ٢ جار.

## پریدنیموستین: PREDNIMUSTINE

**ناوی بازرگانی:** Mostarina,sterecyt

**شێوەی دەرمان:** کەپسول ١٠و ٥٠ میلیگرامی و حەبی ١٠و ٢٠ و ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی خوێن (لیمفۆید لیوکیمیای موزمین و لیمفۆ سارکۆما) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی و پەڕەی خوێن، حەساسیەتی پێستی، شەرا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە، بۆ ماوەی ٥ ڕۆژی یەك لە دوای یەك. لانی کەم بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ دەرمان دوبارە دەکرێتەوە.

## پردنیزۆلۆن: PREDNISOLONE

**ناوی بازرگانی:** Prelone,cortalone

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ و ٢,٥ و ٥ و ٢٥ و ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری ڕۆماتیزم و حەساسیەت و هەندێ شێرپەنجەی وەك لیمفۆما و لیوکیمیا و نەخۆشی کرۆن و ئیلتیهابی کۆڵۆنی خۆرەیی و ڕەبۆ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێخەوی، زیپکە، پەڵە، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، برینی دەزگای هەرس، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، ئاوی سپی(کاتاراکت)، ئاوی ڕەش(گلوکۆما)، زیادبوونی شەکری خوێن، پوکانەوەی ئێسك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢,٥ تا ١٥ میلیگرام، ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٥٠ میلیگرامە. منالآن ڕۆژانە ٠,٥ تا ٢ میلیگرام/کیلۆگرام لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا ڕێی پێ دەدرێت.

## پردنیزۆلۆن ئەسیەتەیت: PREDNISOLONE ACEATATE OPH.

**ناوی بازرگانی:** AK-Pred,AK-Tate

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ١٪.

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهابی چاو و بۆ چارەسەری ئیلتیهابی پێڵوی چاو و ئیلتیهابی کۆرنیەی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بینین، کزانەوەی چاو، خوران، ئازاری چاو، ڕوشان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالان ١ تا ٢ قەترە بکرێتە هەر چاوێکەوە.

## پردنیزۆلۆن- فورت: PREDNISOLONE –FORTE

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ میلی گرامی

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهابی توندە و کپکەرەوەی سیستمی بەرگری لەشە.

**بڕی دەرمان:** ٥ تا ٦٠ میلی گرام لەڕۆژێکدا یان دابەشکراو لە ٣ جاردا.

## پردنیزۆلۆن: PREDNISOLONE SODIUM PHOSPHATE

**ناوی بازرگانی:** Predsol

**شێوەی دەرمان:** قەترەی گوێ ٠,٥٪.

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی نەکزیمایی (بیرۆیی) لە هەوکردنی گوێی دەرەوەدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی مەوزوعی.

**بڕی دەرمان:** ٢ تا ٣ قەترە هەموو ٢ تا ٣ سەعاتێك.

## پریدنیزون: PREDNISONE

**ناوی بازرگانی:** Lodotra

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ و ٢ و ٥ میلی گرام.

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ڕۆماتیزمی مامناوەند و توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، فێ، سەرئێشە، بەرزبوونەوەی زەختی چاو، بێخەوی، زیپکە، پەڵە، برینی دەزگای هەرس، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، کۆبوونەوەی صۆدیۆم و ئاو لەلەشدا، تێکچوونی گەدە، زیادبوونی کێش، زیادبوونی چەوری خوێن، ئارەقکردنەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ سەرەتا ١٠ تا ٢٠ میلیگرام لە کاتی خەودا، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بەپێی کاردانەوەکەی.

## پریگابالین: PREGABALIN

**ناوی بازرگانی:** Lyrica

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥ و ٥٠ و ٧٥ و ١٠٠ و ١٥٠ و ٢٠٠ و ٢٢٥ و ٣٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiseizure

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵکردنی فێ و ئازاری ڕیشاڵی ماسولکەیی و نەخۆشی شەکرەی گورچیلەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری ماسولکە، بێهێزی، خوێنبەربوون، ئاوسان، گێژی، بێخەوی، خەمۆکی، وشکبوونەوەی دەم، پەڵە، خوران، قەبزی، ئازاری گەدە، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، ئازاری جومگە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار، لانی زۆر ٦٠٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا.

## پری لۆکائین- ئێف: PRILOCAINE – F

**ناوی بازرگانی:** Citanest

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی کارپوڵ

**گروپی دەرمان:** Local Anesthatic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی مەوزوعی و بلۆککردنی دەمار لەپزیشکی ددانda بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بڕی دەرمانی ٣٠ تا ٦٠ میلیگرام تا لایەنی زۆر ٣٠٠ تا ٦٠٠ میلیگرامە و منداڵانی خوار ١٠ ساڵ ٣٠ تا ٦٠ میلیگرام و تا لایەنی زۆر ٥ میلیگرام/کیلۆگرام لە منداڵانی سەروی ٦ مانگ ئەتوانرێ بەکاربێت.

## پریماکوین: PRIMAQUINE

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٧,٥ و ١٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antimalaria

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری حەملەی تیژی مەلاریای ڤیڤاکس و لابردن و بەرگری لە گەڕانەوەی مەلاریا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، فێ، سەرئێشە، هێڵنجدان، ئازاری سك، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، کەمخوێنی، نەمانی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی خڕۆکەی سپی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥ میلیگرام ڕۆژانە بۆ ماوەی ١٤ ڕۆژ، منالآن ٠,٣ میلیگرام/ کیلۆگرام بۆ ماوەی ١٤ ڕۆژ.

## پریمیدۆن: PRIMIDONE

**ناوی بازرگانی:** Mysoline,sertan

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی خۆراکی ٢٥٠ میلیگرام/ میلیلیتر و ١٢٥ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Anticonvulsant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری تەشەنوج و لەرزینی بێوەیی خێزانی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هیلاکی، خەوالوویی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپیەکانی خوێن، هەڵوەرینی موو، ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی لەرزینی بێوەیی خێزانی گەورەکان ٧٥٠ میلیگرام ڕۆژانە خۆراکی، لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ تەشەنوج گەورەکان و منالآنی گەورەتر لە ٨ سالّ ٢٥٠ میلیگرام ڕۆژانە خۆراکی پاش هەر هەفتەیەك نەتوانی کە بڕی دەرمان بەتەدریجی زیاد بکەیت و بە بڕی ٢ گرام ڕۆژانە دابەشکراو لە ٤ بڕی دەرماندا بگات. منالآنی بچوکتر لە ٨ سالّ ١٢٥ میلیگرام ڕۆژانە خۆراکی ڕێی پێ دەدرێت، پاش هەر هەفتەیەك ئەتوانی کە بڕی دەرمان بەتەدریجی زیاد بکەیت تا بە ١ گرام ڕۆژانە دابەشکراو لە ٤ بڕی دەرماندا بگات.

## پرۆبینسید: PROBENECID

**ناوی بازرگانی:** Benemid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antigout

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری لە نەخۆشی پاشاکان و زۆربوونی یوریك ئەسید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** میزی خوێناوی، ئاوسان، تا، ئازاری پشت، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، گێژی، برینی پوکی ددان، خوران، پەڵەی پێست، هەڵوەرینی موو، سوربونەوەی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی هەموو ١٢ سەعاتێك بۆ ١ هەفتە.



## پرۆکایین: PROCAINE HCL

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ۲ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Local Anesthatic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی مەوزوعی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** بەپێی پێویست بەکاردێت.

## پرۆکاینئەماید: PROCAINAMIDE HCL

**ناوی بازرگانی:** Procan-SR,Rhythmin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥٠٠ میلیگرامی و دەرزی ١٠٠ میلیگرام/میلیلیتر، ١٠ میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiarrhythmic

**بەکارهێنان:** دژی نارێکی لێدانی دڵ و نارێکی لێدانی دڵی سکۆڵەیی و زیاد لێدانی دڵ و نارێکی لێدانی دڵی سەرو سکۆڵەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تەشەنوج، بێهۆشی، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونی لێدانی دڵ نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، تا، کەمخوێنی، پەڵە، ئازاری ماسولکە، خەمۆکی، کەمی پەڕەی خوێن، کەمبوونەوەی نیوترۆفیل.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان خۆراکی ٥٠٠ تا ١٠٠٠ میلیگرام هەر ٦ سەعاتێك، منالآن ٢٠ تا ٣٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە دابەشکراو لە ٤ جاردا.

## پروکاربازین: PROCARBAZINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Matulane

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن (هوچکین لیمفۆما) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، خوێنبەربوونی کۆم، بێخەوی، هەڵوەرینی موو، هەڵمەت، وشکی دەم، کەمخوێنی، قەبزی، خوران، هەستیاربوون بەڕوناکی، کەمبوونەوەی خڕۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، زۆر میزکردن، میزکردنی شەوانە، نەزۆکی، دووبینی، شەرا، توڕەیی.



**بڕی دەرمان:** گەورەكان ٢ تا ٤ میلیگرام/كیلۆگرام ڕۆژانە خۆراكی بە یەك بڕی دەرمان یان لە بڕی دەرمانی دابەشكراودا لە هەفتەی یەكەم ڕێی پێ دەدرێت، پاشان ٢ تا ٦ میلیگرام/كیلۆگرام ڕۆژانە لە ڕێگەی خۆراكی تا دروستبوونی كاریگەری لاوەكی یان تێبینی كراوی كاردانەوەی داواكراوی دەرمانی، ڕێی پێ دەدرێت. بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو ڕۆژانە ١ تا ٢ میلیگرام/كیلۆگرامە. منداڵان ڕۆژانە ٥٠ میلیگرام لە ڕێگەی خۆراكی لە هەفتەی یەكەم ڕێی پێ دەدرێت. پاشان ڕۆژانە ١٠٠ میلیگرام/مەتردوجا لە ڕێگەی خۆراكی تا دروستبوونی كاریگەری لاوەكی یان تێبینی كراوی كاردانەوەی داواكراوی دەرمانی، ڕێی پێ دەدرێت. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە ٥٠ میلیگرامە.

## پرۆكلۆرپیرازین: PROCHLORPERAZINE

**ناوی بازرگانی:** Compazine,stemetil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ و٢٥ میلیگرامی و كەپسولی ١٠ و ١٥ میلیگرامی و شروبی ٥ میلیگرام/٥ میلیلیتر و شافی ٢,٥ و ٥ و ٢٥ میلیگرامی و دەرزی ٥ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری تێكچوونی دەروونی و شیزۆفرینیا و قەلەقی و بۆ كۆنترۆڵكردنی هێڵنجدان و ڕشانەوە و تێكچوونی هاوسەنگی بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** هێڵنجدان، پەڵەی پێست، تا، خوران، شەوكوێری، ئازاری گەدە، زەردی، خوێنبەربوون، برینی گەروو، ئازاری جومگە، ڕشانەوە، گێژی، خەواڵویی، وشكبوونەوەی دەم، بێخەوی، تێكچوونی بینین، قەبزی، ئاوسان، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ٥ تا ٢٥ میلیگرام ٢ تا ٤ جار لە ڕۆژێكدا.

## پرۆجسترۆن: PROGESTRONE

**ناوی بازرگانی:** Endometrin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥ و ٥٠ میلیگرام/میلیلیتر و شافی ژنانە ٢٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Progestogen

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری لەحەیزچونەوە و خراپی كاركردن و خوێنبەربوونی منداڵدان و نیشانەی نەخۆشی پێش لە بێ نوێژی ژنان و بۆ ئامادەكردنی پەردەی ناوەوەی منداڵدان بۆ سكپڕبوون بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** سەرگێژبوون، سەرئێشە، هیلاكی، خەمۆكی، پەڵە، زیپكە، هەڵوەرینی موو، لەحەیزچونەوە، پەڵەی نائاسایی، ئازاری بێ نوێژی، زیادبوونی شەكری خوێن.

**بڕی دەرمان:** بۆ لەحەیزچونەوە گەورەکان ٥ تا ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ماسولکەیی بۆ ماوەی ٦ تا ٨ ڕۆژ ڕێی پێدەدرێت. خراپی کارکردن و خوێنبەربوونی منداڵدان گەورەکان ٥ تا ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ماسولکەیی بۆ ماوەی ٦ ڕۆژ ڕێی پێدەدرێت. یان ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام ماسولکەیی، بە ١ بڕی دەرمان ڕێی پێ دەدرێت. نیشانەی نەخۆشی پێش لە بێ نوێژی ژنان گەورەکان ١ شافی ژنانە لە ڕۆژێکدا ڕێی پێ دەدرێت.

## پرۆگوانیل: PROGUANIL HCL

**ناوی بازرگانی:** Paludrine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antimalaria

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری و چارەسەری نەخۆشی مەلاریا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، قەبزی، برینی دەم، هەوکردنی دەم، هەڵوەرینی موو، نەمانی تەحەمولی سوکی گەدەیی، هەوکردنی دەفری خوێن، پەکککەوتنی بڕی ناسایی زەرداو بۆ گەیشتن بە ڕیخۆڵە، حەساسیەتی پێستی.

**بڕی دەرمان:** بۆ پێشگری لە مەلاریا، بەشێوەیەکی گونجاو دەست پێدەکات ١ هەفتە پێش لە چونانەوەی بۆ ئەو ناوچەی تیایدا نیشتەجێ یە و بەردەوام دەبێت بۆ ماوەی ٤ هەفتە پاش لە بەجێهێشتنی گەورەکان ٢٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، ساوایان تا ١٢ هەفتە کێشی لەشی خوار ٦ کیلۆگرام، ٢٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، ١٢ هەفتە تا ١ ساڵ کێشی لەشی ٦ تا ١٠ کیلۆگرام، ٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، منداڵانی ١ تا ٤ ساڵ کێشی لەشی ١٠ تا ١٦ کیلۆگرام، ٧٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، ٤ تا ٨ ساڵ کێشی لەشی ١٦ تا ٢٥ کیلۆگرام، ١٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، ٨ تا ١٣ ساڵ کێشی لەشی ٢٥ تا ٤٥ کیلۆگرام، ١٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، سەروی ١٣ ساڵ کێشی لەشی سەروی ٤٥ کیلۆگرام وەك بڕی دەرمانی گەورەکان.

## پرۆمازین: PROMAZINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Promazine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ میلیگرامی و گیراوەی خوراکی ٢٥ و ٥٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** دژی نەخۆشی دەروونی و وەك دەرمانی یارمەتیدەری ماوەکۆتا لە ڕێکخستنی خرۆشانی چالاکی ماسولکەیی و مێشکی و بۆ چارەسەری ناجێگیری و خرۆشان بەکاردێت.

ێ: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوور کەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



**کاریگەری لاوەکی:** کەمخوێنی، پارکینسۆن، دیسکینسیا، زیاد لێدانی دڵ، لەرزینی ماسولکەیی، گیرانی میز، ئارەقکردنەوە، سەرئێشە، بێخەوی، گێژی، خەواڵویی، تێکچوونی هەرس، گیرانی لوت، وشکی دەم، بەگرانی میزکردن، قەبزی، تێکچوونی بینین، پەڵە، زەردی، زیادبوونی کێش.

**بڕی دەرمان:** وەك دەرمانی یارمەتیدەری ماوەکۆتا لە ڕێکخستنی خرۆشانی چالاکی ماسولکەیی و مێشکی گەورەکان ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٤ جار. بۆ ناجێگیری و خرۆشان لە پیرەکاندا، ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ٤ جار.

## پرۆمیثازین: PROMETHAZINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Phenergan,avomine,anergan,mallergan

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥ میلیگرام/میلیلیتر (٢میلی لیتر) حەبی ٢٥ میلیگرامی و شروبی ٥ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiemetic

**بەکارهێنان:** هێورکەرەوەیە و دژی هێڵنجدان و هێڵنجدان و ڕشانەوەی سەفەر و حەساسیەت و خورانی پێست و شەرا و بێخەوی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێوربوونەوەی زیاد لەڕادە، لەرزین،سەرگێژبوون، ناجێگیری، وشکی دەم، ڕشانەوە، هێڵنجدان، زیادبوونی لێدانی دڵ، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی و پەڕەی خوێن، هەستیاربوون بەڕوناکی، گیرانی لوت، گیرانی میز، زەردی، نەمانی ئارەزوی خواردن، قەبزی، خەواڵویی، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی پێست.

**بڕی دەرمان:** بۆ هێڵنجدان گەورەکان ١٢,٥ تا ٢٥ میلیگرام بە پێی پێویست هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك ڕێی پێدەدرێت. مناڵان ٠,٢٥ تا ٠,٢٥ میلیگرام ماسولکەیی هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك ڕێی پێدەدرێت. بۆ هێورکردنەوە گەورەکان ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام ماسولکەیی لەکاتی خەو یان بەپێی پێویست ڕێی پێدەدرێت. منداڵان ١٢,٥ تا ٢٥ لەکاتی خەودا ڕێی پێدەدرێت. بۆ هێڵنجدان و ڕشانەوەی سەفەر گەورەکان ٢٥ میلیگرام خۆراکی، ڕۆژانە ٢ جار ڕێی پێدەدرێت. منداڵان ١٢,٥ تا ٢٥ میلیگرام خۆراکی یان ماسولکەیی، ڕۆژانە ٢ جار ڕێی پێدەدرێت.

## پروپافینۆن: PROPAFENONE HCL

**ناوی بازرگانی:** Rythmol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥٠ و ٣٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiarrhythmic



**بەکارهێنان:** دژی نارێکی لێدانی دڵ و بۆ چارەسەری نارێکی لێدانی دڵی سکۆڵەی کوشندە و بۆ کۆنترۆڵی بەرزبوونەوەی لێدانەکانی دڵ و لەرزین و لەرینەوەی گوێچکەڵەی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، تێکچوونی بینین، وشکبوونەوەی دەم، گێژی، سەرئێشە، قەبزی، کەمبوونی لێدانەکانی دڵ ئازاری سنگ، پەڵە، زەردی، هەوکردنی جگەر، نەمانی ئارەزووی خواردن، فێ، تێکچوونی خەو، هیلاکی، لاوازی سێکسی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥٠ میلیگرام هەر ٨ سەعاتێك ڕێی پێدەدرێت، ئەتوانی کە بڕی دەرمان بەتەدریجی زیادبکەیت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٩٠٠ میلیگرامە.

## پرۆثامیدین: PROPAMIDINE ISETHIONATE

**ناوی بازرگانی:** Brolene

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٪٠,١ و مەڵهەمی چاو ٪٠,١٥.

**گروپی دەرمان:** Antibacterial

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی چاو و ئیلتیهابی پێڵوی چاو و بۆ چارەسەری هەوکردنی مەوزوعی چاو بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ قەترە، ڕۆژانە ٤ جار و مەڵهەم ڕۆژانە ١ تا ٢ جار بەکاردێت.

## پرۆپانیدید: PROPANIDID

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anesthetic

**بەکارهێنان:** بێهۆشکەری عمومی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ تا ٧ میلیگرام/کیلۆگرام بەدەمار، منداڵان ٧ تا ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام بە دەمار.

## پرۆپانثیلین: PROPANTHELINE BROMIDE

**ناوی بازرگانی:** Pro-banthine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antispasmodic,Antimuscarinic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کرژبوونی گەدە و ڕیخۆڵە و زوو زوو میزکردن و میز ڕانەگرتن و دەرمانی یارمەتیدەر لە چارەسەری برینی گەدە و دوانزەگرێ و IBS بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** وشکی دەم، تێکچوونی هەرس، قەبزی، غازات، تێکچوونی تام، تێکچوونی بینین، وشکی چاو، خەواڵویی، گێژی، هیلاکی، بەگرانی میزکردن، دڵەکوتێ، وشکی پێست، پەڵە، هەستیاربوون بەڕوناکی، سەرئێشە، سکچوون، نارێکی لێدانی دڵ زیادبوونی لێدانی دڵ ورێنە، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥ میلیگرام، ڕۆژانە ٣ جار لانی کەم ١ سەعات پێش لە خواردن و ٣٠ میلیگرام لە شەودا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٢٠ میلیگرامە.

## پروپاراکایین: PROPARACAINE

**ناوی بازرگانی:** Ophthetic

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو.

**گروپی دەرمان:** Local anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی مەوزوعی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بینین، ئازار و سوربونەوەی چاو، سوتانەوەی چاو، فرمێسک ڕشتن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ١ قەترە هەر ١٥ خولەکێك ١ تا ٥ جار.

## پرۆپیڤیرین: PROPIVERINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Detrunorm

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥ میلیگرامی و کەپسولی ٣٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Urinary incontinence

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری میزڕانەگرتن و زوو زوو میزکردن و میزکردنی فەوری و کەمی کاری میزەڵدان بەهۆی برینی کۆئەندامی دەمارەوە (neurogenic bladder)ی ناجێگیر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکی دەم، تێکچوونی هەرس، قەبزی، غازات، تێکچوونی تام، تێکچوونی بینین، وشکی چاو، خەواڵویی، گێژی، هیلاکی، بەگرانی میزکردن، دڵەکوتێ، وشکی پێست، پەڵە، هەستیاربوون بەڕوناکی، سەرئێشە، سکچوون، نارێکی لێدانی دڵ زیادبوونی لێدانی دڵ ورێنە.

**بڕی دەرمان:** حەبی ١٥ میلیگرامی گەورەکانی سەرووی ١٨ساڵ ١٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ تا ٣ جار، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆر ١٥ میلیگرام ڕۆژانە ٤ جار. کەپسولی ٣٠ میلیگرامی گەورەکانی سەرووی ١٨ ساڵ بۆ میز ڕانەگرتن و زوو زوو میزکردن و میزکردنی فەوری ٣٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار.



## پرۆپۆفۆل: PROPOFOL

**ناوی بازرگانی:** Diprivan

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلیگرام/میلیلیتر (١٠٠میلی لیتر) و ١٠ میلیگرام/میلیلیتر (٢٠میلی لیتر) و ١٠میلیگرام/میلیلیتر (٥٠میلی لیتر) و ٢٠ میلیگرام/میلیلیتر (٥٠میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Anesthetic

**بەکارهێنان:** خەولێخەر و هێورکەرەوەیە و بۆ دروستکردن و پاراستنی بێ ئازاری لە ماوەی هەواگۆڕینی میکانیکی لە ICU دا و بۆ دروستکردن پاراستنی بەنج بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تەشەنوج، گۆڕانی ڕەنگی میز، کۆکە، هێڵنجدان، تزگەرە، ڕشانەوە، شەرا، زیادبوونی چەوری، وەستانی هەناسە، کرژبوونی سلك، وەستانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** بۆ دروستکردن و پاراستنی بێ ئازاری لە ماوەی هەواگۆڕینی میکانیکی لە ICU دا گەورەکان ٥ مایکرۆگرام/کیلۆگرام لەخولەکێکدا دەماری بۆ ماوەی ٥ خولەك، ڕێی پێدەدرێت. ئەگەر پێویست بێت ئەتوانی کە دەرمان بە بڕی ٥ تا ١٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام لە خولەکێکدا لە ماوەی ٥ تا ١٠ خولەکدا تا دروستبوونی بێ ئازاری داواکراو بەردەوام دەبێت. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٥ تا ٥٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرامە لە خولەکێکدا.

## پرۆپرانۆلۆل: PROPRANOLOL

**ناوی بازرگانی:** Inderal

**شێوەی دەرمان:** حەبی(F.C) ١٠ و ٢٠ میلیگرامی و حەبی(S.F.C) ٤٠ میلیگرامی وحەبی(S.R) ٨٠ و ١٦٠ میلیگرامی و دەرزی ١ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Beta-adrenergic blocker

**بەکارهێنان:** دژی پەستانی بەرزی خوێن و بۆ چارەسەری ترس و دڵەڕاوکێ و قەلەقی و ئازاری سنگ و بۆ پێشگری لەشەقیقە و نارێکی لێدانی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، لاوازبوونی سێکسی، سکچوون، پەڵە، هێڵنجدان، بچوکبوونەوەی بۆری هەوا، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ نزمبونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** بۆ پەستانی بەرزی خوێن گەورەکان ٨٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە لە ٢ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، ئەتوانی بەتەدریجی کە بڕی دەرمان زیاد بکەیت. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە ١٦٠ تا ٤٨٠ میلیگرامە. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٦٤٠ میلیگرامە. وەك دەرمانی یارمەتیدەر لە چارەسەری



دڵەڕاوکێ گەورەکان ۱۰ تا ۸۰ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ۳ تا ٤ جار. وەك دەرمانی یارمەتیدەر لە پایرۆتۆکسیکۆسس گەورەکان ۱۰ تا ٤۰ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ۳ تا ٤ جار. بۆ ئازاری سنگ گەورەکان ۱۰ تا ۲۰ میلیگرام خۆراکی، ڕۆژانە ۳ تا ٤ جار، بڕی دەرمانی ئاسایی ڕۆژانە ۱٦۰ تا ۲٤۰ میلیگرامە. بۆ پێشگری لە شەقیقە گەورەکان ڕۆژانە ۸۰ میلیگرام خۆراکی، لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ۱٦۰ تا ۲٤۰ میلیگرامە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا ڕێی پێ دەدرێت.

## پرۆپیلین گلایکۆل: PROPYLENE GLYCOL

**ناوی بازرگانی:** Seboval

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی (bulk).

**بەکارهێنان:** شلەیەکی لینجی بێ ڕەنگە و بە عینوانی توێنەر لە ئامادەکردنی هەندێ دەرمان و هەروەها ڕێ لەگەشەی کەڕوو و وردە زیندەوەرەکان دەگرێت، گیراوەی ٤۰٪ تا ٦۰٪ ئاوی ئەم مادە لە چارەسەری کیتۆسس (زیادبوونی ئاستی کیتۆنی لەش لەشانەکانی لەشدا) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێستی، لاکتیك ئەسیدۆزس لە پەککەوتنی گورچیلەدا.

## پرۆپیل ثایۆیوراسیل: PROPYLTHIOURACIL

**ناوی بازرگانی:** Prothiucil,tiotil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥۰ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antithyroid drug

**بەکارهێنان:** دژی چالاکی زیاد لە ڕادەی ڕژێنی پایرۆید (هایپەرپایرۆیدیسم) و گواتری ژەهری و زیادبوونی هۆرمۆنی پایرۆید (پایرۆتۆکسیکۆزیس) لە مولولەکانی خوێندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، پەڵە، سەرئێشە، سکچوون، ڕشانەوە، کەمی پەڕەی خوێن و خڕۆکەی سپی خوێن، هێڵنجدان، خوران، هەڵوەرینی موو، تێکچوونی بینین، ئۆدیما، گەورەبوونی لیکەڕژێنەکان، شەرا، ئیلتیهابی پێست، زەردی، ئازاری جومگە، خەمۆکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۱۰۰ میلیگرام ڕۆژانە ۳ جار، بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ۱۰۰ میلیگرامە ڕۆژانە ۱ تا ۳ جار. منداڵانی ٦ تا ۱۰ ساڵ ٥۰ تا ۱٥۰ میلیگرام ڕۆژانە هەر ۸ سەعاتێك، لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. منداڵانی گەورەتر لە ۱۰ ساڵ ۱۰۰ میلیگرام ڕۆژانە ۳ جار.



## پرۆتامین سەلفەیت: PROTAMINE SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Protamine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلیگرام (٥ میلی لیتر، ٢٥میلی لیتر) و ١٠٠٠ یەکە/ ٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Heparin antagonist

**بەکارهێنان:** دژی هیپارینە و بۆ چارەسەری بەکارهێنانی زیاد لە ڕادەی هیپارین و ژەهراویبوون بە هیپارین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبونەوەی پەستانی خوێن، ئۆدیمای تیژی سی، خاو لێدانی دڵ ڕشانەوە، هێڵنجدان، تەنگەنەفەسی، زیادبوونی حەساسیەت، سووربونەوە، خوێنبەربوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و مناڵان ١ میلیگرام بەدەمار و ئەبێت بەهێواشی و لەسەرخۆ لەماوەی ٢ خولەکدا ئەنجام بدرێت، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٥٠ میلیگرامە لە هەر دەورەیەکی ١٠ خولەکیدا.

## پرۆتامین زینك ئەنسولین: PROTAMINE ZINC INSULIN

**ناوی بازرگانی:** Hypurin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ یەکە/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antidiabetic

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندی ڕێژەی شەکر لە خوێندا و بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی شەکری خوێن، پەڵە، شەرا، ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی دەرزی ژێرپێستی، بەپێی پێویستی بەکاردێت.

## پرۆتین سی: PROTEIN C CONCENTRATE

**گروپی دەرمان:** Blood product

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونی پرۆتینی سی زکماکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تا، خوێنبەربوون، گێژی، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** بەپێی پێویست بەکاردێت.



## پرۆتیونامید: PROTIONAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Trevintix

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٢٥ و ٢٥٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antituberculosis,antileprosy

**بەکارهێنان:** وەك دەرمانی یارمەتیدەر بۆ چارەسەری نەخۆشی سیل و گولی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، خەمۆکی، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، هەڵوەرینی موو، هێڵنجدان، زیپکە، ڕشانەوە، سکچوون، هەستیاربوون بەڕوناکی، گەورەبوونی مەمك، تێکچوونی بێ نوێژی.

**بڕی دەرمان:** وەك دەرمانی یارمەتیدەر لە نەخۆشی سیل و گولی گەورەکان ڕۆژانە ٥٠٠ تا ١٠٠٠ میلی گرام بە شێوەی ١ بڕی دەرمان یان دابەشکراو لەگەڵ خواردندا ڕێی پێدەدرێت. مناڵانی بچوکتر لە ١٠ ساڵ ڕۆژانە ١٠ میلی گرام/ کیلۆگرام، لەماوەی ١٥ ڕۆژدا بڕی دەرمان ڕۆژانە بە ٢٠ میلی گرام/کیلۆگرام بگات.

## پرۆتیریلین: PROTIRELIN

**ناوی بازرگانی:** Thyrel Trh,relefact Trh

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,٢ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Diagnostic agent

**بەکارهێنان:** بۆ لێکۆڵینەوەی چالاکی میحوەری هایپۆتالاموس و هیپۆفیز و پایرۆید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێخەوی، دڵەڕاوکێ، تەشەنوج، ئارەقکردنەوە، وشکی دەم، هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادبوونی شیر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ تا ٥٠٠ مایکرۆگرام بەدەمار لە ماوەی ١٥ تا ٣٠ چرکەدا ڕێی پێ دەدرێت، مناڵان ١ تا ٧ مایکروگرام/ کیلۆگرام بەدەمار لە ماوەی ١٥ تا ٣٠ چرکەدا ڕێی پێ دەدرێت.

## پرۆکسیمیتاکاین: PROXYMETACAINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Minims Proxymetacaine

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,٥٪.

**گروپی دەرمان:** Local anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی مەوزوعی چاو بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** بە پێی پێویست بەکاردێت.



## پرۆکالۆپرید: PRUCALOPRIDE

**ناوی بازرگانی:** Resolor

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ و ٢ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** ٥HT٤-Receptor agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری قەبزی موزمین بەکاردێت، لە ژناندا کاتێك ڕەوانکەرەکانی تر کاردانەوەی تەواویان نی یە.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، تێکچوونی گەدە، غازات، سکچوون، خوێنبەربوونی کۆم، سەرئێشە، گێژی، هیلاکی، زیادمیزکردن،نەمانی ئارەزوی خواردن، دڵەکوتێ، لەرزین، تا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەرەتای ١٨ ساڵ، ٢ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار، پیرەکان سەروی ٦٥ ساڵ سەرەتا ١ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ ٢ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار.

## سیدۆئیفیدرین: PSEUDOEPHEDRINE

**ناوی بازرگانی:** Sudafed,nevafed,afrinol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠ میلی‌گرامی و شروبی ٣٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** Decongestant

**بەکارهێنان:** دژی گیرانی لوت و خوێنتیازانی لوت یان گیرانی ئەو لولانەی کە شلەیان پێدا دەڕوات بۆ گوێی ناوەڕاست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی دەم، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تەشەنوج، بێخەوی، تەمەڵی، خەواڵویی، لەرزین، ترس، نارێکی لێدانی دڵ، گێژی، قەلەقی، نەمانی ئارەزوی خواردن، پەڵە، خوران، سەرئێشە، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی بینین، ئازاری سنگ، کزانەوە لەکاتی میزکردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١٢ساڵ ٦٠ میلی‌گرام هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٤٠ میلی‌گرامە. منداڵان ٦ تا ١٢ ساڵ ٣٠ میلی‌گرام هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٢٠ میلی‌گرامە. منداڵانی ٢ تا ٦ ساڵ ١٥ میلی‌گرام هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك،لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٦٠ میلی‌گرامە.



## پایرانتیل: PYRANTEL PAMOATE

**ناوی بازرگانی:** Antiminith

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٢٥ میلیگرامی و سەسپێنشنی ٢٥٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Anthelmintic

**بەکارهێنان:** دژی کرم و کرمی وردی دەزولەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، گێژی، کرژبوونی سک، نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، ئازاری سک، زەحیری.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ٢ ساڵ ١١ میلیگرام/کیلۆگرام بە یەك بڕی دەرمان ڕێی پێ دەدرێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١ گرامە، بۆ چارەسەری کرمی وردی کلك باریك (oxyuris)، بڕی دەرمان نەبێت ٢ هەفتە دواتر دوبارە بکرێتەوە.

## پایرازینەماید: PYRAZINAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Tebrazid,Zinamide

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antituberculosis

**بەکارهێنان:** وەك دەرمانی یارمەتیدەر بۆ چارەسەری نەخۆشی سیل بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، تا، ئازاری ماسولکە و جومگە، تێکچوونی گەدە، پەڵە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، بێهێزی، کەمخوێنی، کەمی پەرەی خوێن، گەورەبوونی جگەر و سی، زەردی، سووربونەوە، پەککەوتنی جگەر، زیادبوونی یوریك ئەسید، بەگرانی میزکردن، هەستیاربوون بەڕوناکی، نەخۆشی پاشاکان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠ تا ٣٥ میلیگرام/کیلۆگرام لە یەك یان چەند بڕێکی دەرماندا ڕێی پێ دەدرێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣ گرامە.

## پایریدۆستیگمین: PYRIDOSTIGMINE BROMIDE

**ناوی بازرگانی:** Mestinon,Regonol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٦٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticholinesterase

**بەکارهێنان:** دژی لاوازی و بێ هێزی ماسولکەیی و نەبوونی توانای ڕۆیشتن (myasthenia gravis) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تەشەنوج، کەمبوونی لێدانی دڵ، سکچوون، پەڵە، گرژبوونی سك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، گرژبوونی بۆری هەوا، گرژبوونی ماسولکە، بچوکبونەوەی بیلبیلەی چاو، زیادبوونی لیك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦٠ تا ١٨٠ میلیگرام، ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٥٠٠ میلیگرامە. منداڵان ١ تا ٢ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ٣ تا ٤ سەعاتێك کاتی بێداری ڕێی پێ دەدرێت.

## پایریلامین: PYRILAMINE MALEATE

**ناوی بازرگانی:** Nisaval

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** دژی حەساسیەت و هێورکەرەوەیە و بۆ چارەسەری نیشانەکانی شەرا و حەساسیەت و هەوکردنی لوت و چاوئێشە و ئیلتیهابی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، وشکبوونەوەی دەم، سەرئێشە، گێژی، قەبزی، بێ هێزی، تێکچوونی بینین، خەواڵویی، گیرانی میز، بێحاڵی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام، ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار، منداڵان ١٢,٥ تا ٢٥ میلیگرام، ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار.

## پایریمیثامین: PYRIMETHAMINE

**ناوی بازرگانی:** Daraprim

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antimalaria

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری مەلاریا و پێشگری لە گواستنەوە مەلاریا و چارەسەری حەملەی تیژی مەلاریا و بۆ توکسۆپلاسموٚسس (نەخۆشیەکە توشی شیردەرەکان و باڵندەکان دەبێت بە هۆی پرۆتۆزوای تۆکسۆپلازما گوندی یەوە و دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکی دەم، بێخەوی، تەشەنوج، خەمۆکی، گرژبونی سك، پەڵە، ناجێگیری، ڕشانەوە، سکچوون، کەمخوێنی، نارێکی لێدانی دڵ، میزی خوێناوی، لەنجە.

**بڕی دەرمان:** بۆ پێشگری مەلاریا و پێشگری لە گواستنەوە مەلاریا گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١٠ ساڵ ٢٥ میلی‌گرام، هەفتەی ١ جار، منداڵانی ٤ تا ١٠ ساڵ ١٢,٥ میلی‌گرام،هەفتەی ١جار،منداڵانی بچوکتر لە ٤ ساڵ ٦,٢٥ میلی‌گرام، هەفتەی ١جار، بۆ چارەسەری حەملەی تیژی مەلاریا نەبێت هاوکات لەگەڵ دەرمانە دژەمەلاریاکانی تر بەکاربهێنرێت، گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١٥ ساڵ ڕۆژانە ٢٥ میلی‌گرام، بۆ ماوەی ٢ ڕۆژ. منداڵانی بچوکتر لە ١٥ ساڵ ١٢,٥ میلی‌گرام، بۆ ماوەی ٢ ڕۆژ. بۆ چارەسەری تۆکسۆپلازمۆسس گەورەکان ڕۆژانە ٥٠ تا ٧٥ میلی‌گرام لەگەڵ ١ گرام سەلفادیازین هەر ٦ سەعاتێك ڕێی پێ دەدرێت. پاش لە ١ تا ٣ هەفتە بڕی دەرمان ئەکرێ بەنیوە و ٤ تا ٥ هەفتەی تریش بەکاردەهێنرێت. منداڵان ١ میلی‌گرام/ کیلۆگرام ڕۆژانە لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا ڕێی پێ دەدرێت. پاش لە ٢ تا ٤ هەفتە بڕی دەرمان ئەکرێ بە نیوەو بۆ ماوەی ١ مانگ بەردەوام بێت و لەگەڵ سەلفادیازین ١٠٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام ڕۆژانە، لە ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا ڕێی پێ دەدرێت.

## پایریثیون زنیك: PYRITHIONE ZINC

**ناوی بازرگانی:** Dermazinc

**شێوەی دەرمان:** کرێمی ٢٪ و شامپۆ.

**گروپی دەرمان:** Antidandruff

**بەکارهێنان:** دژی کرێش و پێست هەڵدانی سەر و چەوری زیادەی سەر و خوران بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێست.

**بڕی دەرمان:** لە هەر هەفتەیەکدا ٢ جار لە ڕووی پێستی سەری بدەن.

## پایرڤینیۆم پامۆیت: PYRVINIUM PAMOATE

**ناوی بازرگانی:** Vanquin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ میلی‌گرامی و سەسپێنشنی خۆراکی ٥٠ میلی‌گرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Anthelmintic

**بەکارهێنان:** دژی کرمی دەزولەیی و کلك باریك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** پەڵەی پێست. کرژبوونی سك، هەستیاربوون بەڕوناکی، سکچوون، ڕشانەوە، هێڵنجدان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام بەیەك بڕی دەرمان ڕێی پێ دەدرێت، بڕی دەرمان ئەبێت پاش لە ٢ تا ٣ هەفتە دوبارە بکرێتەوە.

***



## کویتیاپین: QUETIAPINE

**ناوی بازرگانی:** Seroquel, Seroquel XR

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ و ٢٠٠ و ٣٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شیزۆفرینیا (دووبیری) و نەخۆشی خەمۆکی (MDD) و تێکچوونی دووجەمسەری و شێتی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نارێکی لێدانی دڵ لەرزین، تا، تێکچوونی بینین، ئازاری چاو، زۆرمیزکردن، لەرز، گێژی، خەوالّویی، وشکبوونەوەی دەم، هێڵنجدان، ڕشانەوە، برینی گەروو، ئازاری گەدە، قەبزی، تێکچوونی گەدە، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، زیادبوونی کێش، ئارەقکردنەوە، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، کاتاراکت، شڵەژان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥٠ تا ٧٥٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا،سەرەتا لە ٢٥ تا ١٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار، بە هێواشی بڕی دەرمان زیاد دەکرێت، حەبی XR ٤٠٠ تا ٨٠٠ میلیگرام خۆراکی هەموو ئێوارەیەك، بە ٣٠٠ میلیگرام لە لە ڕۆژێکدا دەست پێدەکات، ٣٠٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا زیاد دەکرێت، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٨٠٠ میلیگرامە. بڕی دەرمان کەمدەکرێتەوە لە نەخۆشی جگەری و گەدەیی دا.

## کویناگۆلاید: QUINAGOLIDE

**ناوی بازرگانی:** Norprolac

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٧٥ و ١٥٠ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Dopaminergic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیادبوونی بڕی پرۆلاکتین (هایپەرپرۆلاکتینیمیا) بەهۆی لویەکی بێوەی لە کوێرە ڕژێنی نوخامیدا بەکاردێت.

بۆ بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، نەمانی ئارەزووی خواردن، قەبزی، سکچوون، بێهۆش، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، سوربونەوە، گیرانی لوت، تۆدیما، سەرئێشە، گێژی، هیلاکی، بێخەوی، نەخۆشی دەروونی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥ مایکرۆگرام لە کاتی خەودا بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ، زیاد دەکرێت لە ماوەی ٣ ڕۆژدا لە هەنگاوەکانی ٢٥ مایکرۆگرامی بۆ بڕی دەرمانی پارێزراو ئاسایی ٧٥ تا ١٥٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە، بۆ بڕی دەرمانی زیاتر لە ٣٠٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە زیاد دەکرێت لە هەنگاوەکانی ٧٥ تا ١٥٠ مایکرۆگرام لەماوەیەك کەمتر نەبێت لە ٤ هەفتە. بۆ منداڵان پێشنیارنەکراوە.

## کوینابریل: QUINAPRIL

**ناوی بازرگانی:** Accupril

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ و ٢٠ و ٤٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و و پەککەوتنی دڵی خوێنتێژراو و کەمی کاری سکۆڵەی دڵ و شەکرەی نەخۆشی گورچیلە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، گێژی، کۆکە، تا، لەرز، خوران، خوێنبەربوون، بلۆقکردن و پەڵەی پێست، زەردی، ئازاری سنگ، ئاوسان، ئازاری ماسولکە، سەرئێشە، خەواڵویی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، غازات، توڕەیی، لاوازی سێکسی، تێکچوونی بینین، بێخەوی، خەمۆکی، ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ١٠ تا ٨٠ میلیگرام. بڕەکەی کەمدەکرێتەوە لە پیرەکان و لاوازی گورچیلەیی دا.

## کوینیدین: QUINIDINE SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Apo-quinidine,Quinidex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ میلیگرامی و ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiarrhythmic

**بەکارهێنان:** دژی ناڕێکی لێدانەکانی دڵ و بۆ کۆنترۆڵی بەرزبوونەوەی لێدانەکانی دڵی سکۆڵەیی و لەرینەوە و هەزەی گوێچکەڵە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، وشکبوونەوەی دەم، سەرئێشە، ئازاری سك، بێهۆش، کەمخوێنی، کەمی پەڕەی خوێن، پەڵە، خوران، ناجێگیری، فەرامۆشی، نزمبونەوەی پەستانی خوێنی توند، تا، تێکچوونی بینین، لەرینەوەی سکۆڵەیی، زیاد لێدانی دڵی سکۆڵەیی، گۆڕانی EKG.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ تا ٣٠٠ میلیگرام ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا، منالآن ٦ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ٥ جار. بۆ زیاد لێدانی دڵی سکۆڵەیی حەملەکانی (PVT) گەورەکان ٤٠٠ تا ٦٠٠ میلیگرام خۆراکی هەر ٢ تا ٣ سەعاتێك تا کۆتایی حەملە، پاشان ٢٠٠ تا ٣٠٠ میلیگرام ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا.



## کوینین: QUININE

**ناوی بازرگانی:** Qualaquin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠و ٢٥٠ میلیگرامی (وەك هایدرۆکلۆراید) و حەبی ٢٠٠ میلیگرامی (وەك سەلفەیت) و دەرزی ٢٥٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antimalaria

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری مەلاریای مقاوم بە کلۆرۆکوین و بۆ بەرگری لە مەلاریا و کرژبوون و ئازاری ماسولکەیی قاچ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تەشەنوج، گێژی، ئازاری سنگ، تا، دابەزینی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، پەڵە، ڕەبۆ، تێکچوونی بینین، دووبینی، کەمبوونەوەی بیستن، تێکچوونی هاوسەنگی، تەنگەنەفەسی، زیادبوونی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** بۆ مەلاریای مقاوم بە کلۆرۆکوین گەورەکان خۆراکی ٦٥٠ میلیگرام هەر ٨ سەعاتێك بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ، منالآن ٢٥ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ. بۆ بەرگری لە مەلاریا ٣٢٥ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا، بەردەوام دەبێت بۆ ماوەی ٦ هەفتە پاش لێکەوتن. بۆ کرژبوون و ئازاری ماسولکەیی قاچ ٢٠٠ تا ٣٠٠ میلی گرەم خۆراکی شەوانە پێش لە خەوتن.

***

# R

## ڕابیپرازۆڵ: RABEPRAZOL

**ناوی بازرگانی:** Aciphex,pariet

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Proton pump inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری برینی گەدە و دوانزەگرێ و دڵەکزە و گەڕانەوەی ترشی گەدە بەرەو سورێنچك و برینی گەدە بەهۆی بەکتریای H-PYLORIی یەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، هیلاکی، پەڵە، سەرئێشە، سوربونەوە، فێ، بێخەوی، خوران، تێکچوونی گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا، زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆر ٦٠ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا، بۆ بەکتریای H-PYLORIی ٢٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار. بۆ برینی بێوەی گەدە ڕۆژانە ٢٠ میلی‌گرام لە بەیانیاندا بۆ ماوەی ٦ هەفتە.

## ڕابیس ڤاکسین: RABIES VACCINE

**ناوی بازرگانی:** Imovax

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢,٥ یەکەیی.

**گروپی دەرمان:** دژی هاری.

**بەکارهێنان:** دژی نەخۆشی هاری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری دڵ سەرگێژبوون. ئازار و سوربونەوە لە شوێنی دەرزی لێدان.

**بڕی دەرمان:** بەپێی هەل و مەرج و بارودۆخی هەرکەسێك بڕی دەرمان جیاوازی هەیە.



## ڕابیس ئیمونین گلۆبیولین: RABIES (RIG)

**ناوی بازرگانی:** Imogan

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٥٠ یەکە/میلیلیتر (٢، ١٠میلی لیتر/ڤیاڵ

**گروپی دەرمان:** دژی هاری.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی هاری پاش لە توشبوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازار لە شوێنی دەرزی لێدان، شوك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ٢٠ یەکە/کیلۆگرام لە کاتی بڕی دەرمانی یەکەمی ڤاکسینی هاری، بڵاوبونەوەی نیوەی بڕی دەرمان لە شوێنی برین دا و بەشە ماوەکەی بە شێوەی ماسولکەیی (واباشترە ناوچەی سمت بێت) ڕێی پێ دەدرێت.

## ڕالۆکسیفین: RALOXIFENE HCL

**ناوی بازرگانی:** Evista

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Estrogen receptor modulator

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگرتن و چارەسەری پوکانەوەی ئێسك لە ژناندا پاش تەمەنی لەحەیزچوونەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** شەقیقە، سەرئێشە، تا، ئازاری سنگ، هەوکردنی گەروو. جیوب، سکچوون، ئازاری سك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەوکردنی ڕێڕەوی میز، تێکچوونی گەدە، نارەقکردنەوە،پەڵە، هەوکردنی جومگە، خەمۆکی، تۆڕیمای موحیگی، غازاتی سك، هەوکردنی گەدە، هەوکردنی میزەڵدان، تێکچوونەکانی پەردەی ناوەوەی منداڵدان، خوێنبەربوون و هەوکردنی زایەندی ژنان، زیادبوونی کۆکە و هەوکردنی سی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦٠ میلیگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا.

## ڕالتیگراڤیر: RALTEGRAVIR

**ناوی بازرگانی:** Isentress

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** لەگەڵ دەرمانە دژە ڤایرۆسەکانی تردا دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت.

پێ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، گێژی، سەرئێشە، ناتەواوی گورچیلە، بێخەوی، هیلاکی، تا، لەرز، پەڵە، بلۆقکردنی پێست، سوربونەوە، ئازاری گەدە، ئازاری ماسولکە، سکچوون، خەواڵویی، غازات، زیادبوونی ترایگلیسراید، هەوکردنی گەدە و پەنکریاس و جگەر، وشکی دەم، قەبزی، خوێنبەربوونی کۆم، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، دڵەکوتێ، گیرانی لوت، کەمی پەڕەی خوێن، تێکچوونی بینین، خوران، ئازاری جومگە، هەڵوەرینی موو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٦ ساڵ ٤٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار.

## ڕالتیتریکسید: RALTITREXED

**ناوی بازرگانی:** Tomudex

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتووی کۆڵۆن و کۆم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری گەدە، کەمبوونی کێش، نەمانی ئارەزوی خواردن، قەبزی، سەرئێشە، ئازاری ماسولکە و جومگە، ئارەقکردنەوە، هەڵوەرینی موو، ئازاری سنگ، تا، لەرز، کۆکە، گێژی، ناڕێکی لێدانی دڵ خیزەخیز، زیادبوونی کێش، هیلاکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣ میلیگرام/مەتردوجا ڕوبەری ڕووی لەش لە ماوەی زیاتر لە ١٥ خولەکدا دەدرێت، ئەو بڕە نەبێت هەموو ٣ هەفتەیەك دوبارە بکرێتەوە.

## ڕامیلتیۆن: RAMELTEON

**ناوی بازرگانی:** Rozerem

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٨ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Hypnotic

**بەکارهێنان:** خەولێخەرەو بۆ چارەسەری ماوەکورتای بێخەوی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان. گێژی، خەواڵویی، لاوازی سێکسی، شێتی، هیلاکی، خەمۆکی، ئازاری ماسولکە و جومگە، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و بە ساڵاچووان ٨ میلیگرام ١ جار لە ڕۆژێکدا، نیوسەعات پێش لە کاتی خەوتن لەکاتێکدا پێویست بێت بۆ بێخەوی.



## راميپريل: RAMIPRIL

**ناوی بازرگانی:** Altace,Tritace

**شێوەی دەرمان:** حەب و کەپسولی ١,٢٥ و ٢,٥ و ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو و خوێن لێبڕانی ماسولکەیی دڵ (MI) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هیلاکی، سەرئێشە، تێکچوونی هاوسەنگی، ناتەواوی کاری گورچیلە، گێژی، کۆکە، ئازاری سنگ، زیادبوونی پۆتاسیۆم، کەمبوونەوەی نیوترۆفیل.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢,٥ تا ٢٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. کەمدەکرێتەوە لە پەککەوتنی گورچیلەدا.

## رانیبیزیوماب: RANIBIZUMAB

**ناوی بازرگانی:** Lucentis

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Opthalmologic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی تێکچوونی ماسولکەیی پەیوەست بەتەمەن (AMD) نەخۆشی یەکی شەبەکەی چاوە کە ئەبێتە هۆی لێڵبوون و تێکچوونی بینایی یان کوێری و بۆ ئاوبەندی ماسولکەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، جیوب، کۆکە، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، هەوکردنی بۆرێچکەکان، ئازاری جومگە، هێڵنجدان، هەوکردنی ڤایرۆسی گەدە، تەنگەنەفەسی، نەخۆشی موزمینی داخرانی سی، هەڵامەت، قەلەقی، بێخەوی، کەمخوێنی، زیادبوونی کۆلیسترۆڵ زیادبوونی IOP، تێکچوونی بینین، وشکی چاو، هەوکردنی پێڵوی چاو، ئازاری چاو، ڕوشانی چاو، هەوکردنی کۆرنیە، لەرینەوەی گوێنچکەڵەیی.

**بڕی دەرمان:** بەدەرزی لە ناوەوەی بەشی شوشەیی پەیوەست بە شلاوی شوشەیی چاو کە ئەکەوێتە ژووری پشتەوەی چاو، گەورەکان ٠,٥ میلیگرام ١ جار لە مانگێکدا.



## ڕانیتیدین: RANITIDINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Zantac

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥٠ میلیگرامی و شروبی ٧٥ میلیگرام/٥ میلیلیتر و دەرزی ٥٠ میلیگرام/٢میلیلیتر و ٢٥ میلیگرام/میلیلیتر (٢ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** H٢ -Receptor antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری برینی گەدە، کۆنترۆڵی زیاد لەرادەی ترشەڵۆکی گەدە، بۆ پێشگری لە هەڵدانەوەی برینی گەدە و دوانزەگرێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بێهێزی،خرۆشان، بێخەوی، سەرگێژبوون، ئازاری سك، کەمی خرۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، هێڵنجدان، قەبزی، خورانی شوێنی دەرزی، پەڵە، تێکچوونی گەدە، گێژی.

**بڕی دەرمان:** بۆ برینی دوانزەگرێ و گەدە (چارەسەری ماوەکۆتا) گەورەکان ١٥٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار یان ٣٠٠ میلیگرام پێش لە خەوتن ڕێی پێ دەدرێت. منداڵانی ١ مانگ تا ١٦ ساڵ ٢ تا ٤ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا (لایەنی زۆر ڕۆژانە ٣٠٠ میلیگرام). دەرمان پاراستن لە برینی دوانزەگرێ ١٥٠ میلیگرام خۆراکی،پێش لە خەوتن. منداڵانی ١ مانگ تا ١٦ ساڵ ٢ تا ٤ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا. (لایەنی زۆر ڕۆژانە ٣٠٠ میلیگرام). نەخۆشی گەڕانەوەی مەوادەکانی گەدە بۆ سورێنچك (GERD) گەورەکان ١٥٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار. منداڵانی ١ مانگ تا ١٦ ساڵ ٥ تا ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ نەخۆشی زیاد لە ڕادە دەردانی ترشەڵۆکی گەدە وەك (ZES) ١٥٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار ڕێی پێ دەدرێت. ئەتوانی کە بڕی دەرمان بە ڕۆژانە ٦ گرام بگەیەنیت. بۆ دەرمانی خۆیی لە کزانەوەی جاری جاری سەردڵ، خراپی هەرس و برینی گەدە گەورەکان و نەوجەوانانی زیاتر لە ١٢ ساڵ ٧٥ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ١ یان ٢ جار (لایەنی زۆر ١٥٠ میلیگرام لە ٢٤ سەعاتدا). بۆ پێشگری برینی ترس و فشار گەورەکان ١٥٠ میلیگرام بە ئینفیوشنی دەماری بەردەوام لە ٢٥٠ میلیلیتر گیراوەی سازگار بە خێرایی ٦,٢٥ میلیگرام لە سەعاتێکدا بە پەمپی ئینفیوشن.

## ڕانۆلازین: RANOLAZINE

**ناوی بازرگانی:** Ranexa

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antianginal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری موزمینی سنگ بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** ناڕێکی لێدانی دڵ، قەبزی، گێژی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، دڵەکوتێ، کەمبوونەوەی خڕۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، سەرئێشە، ئازاری سك، تێکچوونی هاوسەنگی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ تا ١٠٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٢ جار.

## راساجیلین: RASAGILINE

**ناوی بازرگانی:** Azilect

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٥ و ١ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** MAO inhibitor

**بەکارهێنان:** لەگەڵ لیڤۆدۆپا بۆ چارەسەری نەخۆشی پارکینسۆن (لەرزینی خۆنەویستی ئەندامەکان) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تێکچوونی بینین، خەمۆکی، ئازاری سنگ. ڤێ،خرۆشان، هێڵنجدان، ڕشانەوە، لەرزین، ئازاری جومگە، قەبزی، هەڵوەرینی موو، وشکبوونەوەی دەم، نەمانی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی کێش، تێکچوونی گەدە، لاوازی سێکسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار، لەگەڵ ٠,٥ تا ١ میلی‌گرام لیڤۆدۆپا خۆراکی ڕۆژانە ١ جار.

## راسبیوریکەیز: RASBURICASE

**ناوی بازرگانی:** Elitex

**شێوەی دەرمان:** دەرزی IV ١,٥ و ٧,٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antimetabolite

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی پاشایان بەهۆی ڕێکخستنی یوریك ئەسید و بۆ چارەسەر و پێشگری لە زیادبوونی تیژی یوریك ئەسید و بۆ شێرپەنجەی جۆری لیوکیمیا و لیمفۆما و هەندێ شێرپەنجەی تریش بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، ڤێ، تا، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری گەدە، سکچوون، قەبزی، خەمۆکی، برینی گەروو، پەڵە، ئاوسان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ٠,٢ میلی‌گرام/کیلۆگرام لە ٣٠ خولەکدا بە ڕێگەی IV ئینفیوشن ڕۆژانە بۆ زیاتر لە ٥ ڕۆژ.



## ریبۆکسیتین: REBOXETINE

**ناوی بازرگانی:** Edronax

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی خەمۆکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، وشکی دەم، قەبزی، نەمانی ئارەزووی خواردن، زیاد لێدانی دڵ، دڵەکوتێ، سەرئێشە، بێخەوی، گێژی، فراوانبوونی مولولەکانی خوێن، لەرز، لاوازی سێکسی، گیرانی میز، ئارەقکردنەوە، کەمبوونەوەی صۆدیۆم، قەلەقی، وڕێنە، ڕشانەوە، نزمبونەوەی پەستانی خوێنی وەزعی، خورشان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەرووی ١٨ ساڵ ٤ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت پاش لە ٣ تا ٤ هەفتە بۆ ڕۆژانە ١٠ میلیگرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٢ میلیگرامە. بۆ منالآنی خوار ١٨ ساڵ یان پیرەکان پێشنیارنەکراوە.

## ریگادینۆسۆن: REGADENOSON

**ناوی بازرگانی:** Lexiscan

**شێوەی دەرمان:** دەرزی IV ٠,٠٨ میلیگرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Diagnostic agent

**بەکارهێنان:** بۆ لێکۆڵینەوەی تیشکی ڕۆیشتنی خوێنی ماسولکەیی دڵ و تەشخیصی ڕۆیشتنی خوێن لە دڵ بۆ نەخۆشی تەپلەیی خوێنبەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، هێڵنجدان، ئارەقکردنەوە، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، فێ، خیزەخیز، خەمۆکی، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٤ میلیگرام بە دەرزی IV.

## ریمیفینتانیل: REMIFENTANIL HCL

**ناوی بازرگانی:** Ultiva

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١ و٢ و ٥ میلیگرامی (پاودەر).

**گرووپی دەرمان:** Opioid analgesic

**بەکارهێنان:** دژی ئازارە و بۆ دروستکردنی بێهۆشی و پاراستنی بێهۆشی بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، خرۆشان، خوران و ئازار لە شوێنی لێدانی دەرزی، کەمبوونی لێدانی دڵ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی بینین، هەناسە وەستان، کپبونەوەی هەناسە.

**بڕی دەرمان:** بۆ دروستکردنی بێهۆشی گەورەکان ٠,٥ تا ١ مایکرۆگرام/کیلۆگرام لە خولەکێکدا لەڕێی دەمارەوە IVڕێی پێ دەدرێت. بۆپاراستنی بێهۆشی ٠,٢٥ تا ٠,٤ مایکرۆگرام/ کیلۆگرام لە خولەکێکدا لەڕێی خوێنهێنەر (دەمار) ڕێی پێ دەدرێت.

## ڕیپاگلینایدە: REPAGLINIDE

**ناوی بازرگانی:** Prandin,gluconorm,novonorm

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٥ و١ و ٢ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Oral hypoglycaemic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ئازاری سنگ، هەوکردنی لوت، هێڵنجدان، جیوب، قەبزی، سکچوون، ڕشانەوە، تێکچوونی گەدە، نەخۆشی یەکانی ددان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٥ تا ٤ میلیگرام خۆراکی پێش لە خواردن، بە ١ تا ٢ میلیگرام خۆراکی دەست پێ دەکات، زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆر ١٦میلیگرام لە ڕۆژێکدا.

## ڕیزێرپاین: RESERPINE

**ناوی بازرگانی:** Zepine,sondril,serpalan,serpasil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,١ میلیگرام.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive,antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و نەخۆشی دەروونی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، دڵەڕوکێ، تورەیی، هێوربونەوەی زیاد لە ڕادە، خەمۆکی، پەڵە، خوران، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبونەوەی لێدانی دڵ، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی، زیادبوونی کێش، گیرانی لوت، گلوکۆما.

**بڕی دەرمان:** بەرزبونەوەی پەستانی خوێنی سەرەتایی گەورەکان ٠,٥ میلیگرام بە یەك بڕی دەرمان یان لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا ڕێی پێدەدرێت. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە ٠,٢٥ میلیگرامە. بەتەمەنەکان لەسەرەتادا ڕۆژانە ٠,٠٥ میلیگرام خۆراکی، زیادکردن بەبڕی ٠,٠٥ میلیگرام هەر هەفتەیەك. بۆ چارەسەری نەخۆشی دەروونی ڕۆژانە ٠,١ تا ١ میلیگرام.

ی: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## ریزۆرسینول: RESORCINOL

**ناوی بازرگانی:** Castel,resinol

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم و بە شێوەی (BULK).

**گروپی دەرمان:** Antiacne

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیبکە و ئەکزیما و سۆریاسس و مێخەکە و بزمارە و بالوك و سیبۆریا (چەوری دەردانی سەر) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری گەدە، گێژی، خەواڵویی، سووربونەوەی پێست، ڕوشانی پێست، خاو لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی ٢ ساڵ و گەورەتر لە مەڵهەمی ٢٪ ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار بە ڕووی شوێنی مەبەستدا بماڵرێت. بۆ (BULK) ڕۆژانە ١ جار بە مەوزوعی بەکاردەهێنرێت.

## ریتاپامیولین: RETAPAMULIN

**ناوی بازرگانی:** Altabax,Altargo

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی مەوزوعی ١٪.

**گروپی دەرمان:** Antibacterial

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی و بۆ چارەسەری نەخۆشی ئاگرە بەهۆی بەکتریای ستافیلۆکۆکەس ئەوریەس و ستافیلۆکۆکەس پایۆجین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بیرۆ، هێڵنجدان، سکچوون، ڕوشان، خوران، هەوکردن و گەورەیی لوت، سووربونەوەی پێست، ئازار.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ جار بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ.

## ریتیپلەیز: RETEPLASE

**ناوی بازرگانی:** Retavase,rapilysin

**شێوەی دەرمان:** دەرزیIV ١٠.٤ یەکەیی.

**گروپی دەرمان:** Thrombolytic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خوێن لێبرانی تیژی ماسولکەیی دڵ (AMI) بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، حەساسیەت، میزی خوێناوی، نارێکی لێدانی دڵ، کەمخوێنی، خوێنبەربوونی شوێنی دەرزی لێدان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ یەکە بۆ ماوەی زیاتر لە ٢ خولەك بە دەمارIV. بڕی دەرمانی دووەم لە ماوەی ٣٠ خولەکدا.

## ریباڤیرین: RIBAVIRIN

**ناوی بازرگانی:** Virazole,copegus,rebetol

**شێوەی دەرمان:** ئایرۆسۆلی ٦ گرامی حەبی ٢٠٠ و ٤٠٠ و ٦٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ٢٠٠ میلیگرامی و گیراوەی ٤٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی هیپاتیتی C (هەوکردنی جگەر بەهۆی ڤایرۆسەوە) و هەوکردنی بۆریچکەکانی هەوا لە منداڵاندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمخوێنی، هیلاکی، کرژبوونی بۆری هەوا، ئازاری ماسولکە، تێکچوونی هەرس، هەڵوەرینی موو، سەرگێژبوون، وەستانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** بۆ RSV ٦ گرام لە ٣٠٠ میلیلیتر ئاوی تەعقیمکراو بەهەڵژین زیاتر لە ١٢ تا ١٨ سەعات. بۆ هیپاتیت C ٦٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار لەگەڵ ئینتەرفیرۆن.

## ریفابیوتین: RIFABUTIN

**ناوی بازرگانی:** Mycobutin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antituberculosis

**بەکارهێنان:** دژی نەخۆشی سیلە و بۆ بەرگری سەرەتایی لەنەخۆشی گواستراوەی مایکۆبەکتریەم ئەڤیۆم ئاڵۆز (MAC) لە نەخۆشەکانی توشبوو بە هەوکردنی پێشکەوتووی ئایدز بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تا، سەرئێشە، بێخەوی، ئازاری سك، سکچوون، ڕشانەوە، هێڵنجدان، گۆڕانی ڕەنگی میز، پەڵە، نەمانی ئارەزوی خواردن، کەمبوونی ژمارەی خڕۆکەسپی یەکان، کەمبوونی پەرەی خوێن، خراپی هەرس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە بەشێوەی ١ بڕی دەرمان یان دابەشکراو بە ٢ بڕی دەرمان لەگەڵ خواردندا.

نوێ: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی

**ریفامپسین: RIFAMPICIN**

**ناوی بازرگانی:** Rifadin,Rimactane

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٥٠ و ٣٠٠ میلیگرامی و قەترەی خۆراکی ١٥٣ میلیگرام/میلیلیتر و دەرزی ٦٠٠ میلیگرام.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی نەخۆشی سیلی سی و هەوکردنە جیاوازەکان و حەمەی مالتا و نەخۆشی گەڕی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئیشنەکردنی ماسولکەکان پێکەوە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، هیلاکی، خەوالوویی، سکچوون، غازات، کەمی خرۆکەی سپی و پەرەی خوێن، ژەهراویبوونی جگەر، زیادبوونی یوریك ئەسید، ئازاری سك، نەمانی ئارەزوی خواردن، سەرگێژبوون، پەڵە، تێکچوونی بینین، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری سەرەتایی سیلی سی گەورەکان ٦٠٠ میلیگرام ڕۆژانە خۆراکی یان دەماری بەیەك بڕی دەرمان. منداڵان ١٠ تا ٢٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە خۆراکی یان دەماری بەیەك بڕی دەرمان (لایەنی زۆر ڕۆژانە ٦٠٠ میلیگرامە). بڕی دەرمان خۆراکی گشتی ١ سەعات پێش یان ٢ سەعات پاش لە خواردن ڕێی پێ دەدرێت. بۆ هەڵگرەکان بەبێ نیشانەی هەوکردنی پەردەی مێشکی مێنینگۆکۆکی گەورەکان ٦٠٠ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لەڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٢ ڕۆژ. شیرخۆران و منداڵانی زیاتر لە ١ مانگ ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ٢ جار لەڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٢ ڕۆژ. بۆ هیمۆفیلۆس ئەنفلۆنزای جۆری B گەورەکان و منداڵان ٢٠ میلیگرام/کیلۆگرام (تا ٦٠٠ میلیگرام) ١ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٤ ڕۆژی یەك لە دوای یەك. بۆ نەخۆشی گولی گەورەکان ٦٠٠ میلیگرام ١ جار لە مانگێکدا، ئاسایی لەگەڵ دەرمانەکانی تردا. بۆ حەمەی مالتا و هەوکردنی پەردەکانی دڵ و هەوکردن بەهۆی بەکتریایی ستافیلۆکۆکی و هەوکردنی تیژی بەکتریایی سی بەهۆی بەکتریای لیجیۆنیلا پنیومۆفیلا (لیجیۆناریس) لەگەڵ دەرمانەکانی تر بە شێوەی خۆراکی یان ئینفیوشنی دەماری ٠,٦ تا ١,٢ گرام ڕۆژانە (لە ٢ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا).

**ریفاپێنتین: RIFAPENTINE**

**ناوی بازرگانی:** Priftin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antitubercular

**بەکارهێنان:** لەگەڵ دژەزیندەگی یەکانی تردا بۆ چارەسەری نەخۆشی سیل بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، پەڵە، خوران، ئازاری گەدە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، تا، لەرز، زەردی، میزی خویناوی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦٠٠ میلیگرام ٢ جار لە هەفتەیەکدا بەلانی کەمەوە ٧٢ سەعات لە نێوان ٢ بڕی دەرمان بۆ ماوەی ٢ مانگ.

## ریفاکسیمین: RIFAXIMIN

**ناوی بازرگانی:** Xifaxan

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ و ٥٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سکچوونی سەفەر بەهۆی بەکتریای (E coli)ی یەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری گەدە، غازات، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، سەرئێشە، گێژی، ئاوسان، هیلاکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ میلیگرام خۆراکی ٣ جار لە ڕۆژێکدا، بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ.

## ریلپیڤیرین: RILPIVIRINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Edurant

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، قەلەقی، خەمۆکی، تا، لەرز، کۆکە، پژمین، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نارەقکردنەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری گەدە، سکچوون، سەرئێشە، گێژی، بێخەوی، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار لەگەڵ ژەمی خواردندا.

## ریلیوزۆل: RILUZOLE

**ناوی بازرگانی:** Rilutek

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Glutamate inhibitor

ن: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێک نەخۆشی



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شانەی هەستەدەماری جوڵەیی (MND) و نەخۆشی یەکی کۆئەندامی جوڵەیە لەناوەڕاستی تەمەندا و ڕەقبوون و بێهێزی و لاوازی و پوکانەوەی ماسولکەیی و شانەکان پاش ئیلتیهابکردنیان یان بەهۆی پیریەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، خەمۆکی، سەرگێژبوون، سەرئێشە، بێخەوی، خەواڵویی، بەرزبونەوە و نزمبونەوەی پەستانی خوێن، لێدانی دڵ نۆدیای موحیگی، وشکی دەم، غازات، هەوکردنی خوێنهێنەر، کاندیدیازی دەم، میزکردنی بەئازار، هەوکردنی میزەڕۆ، سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، تێکچوونی هەرس، دابەزینی کێش، زیادبوونی کۆکە، خوران، ئەکزیما، تێکچوونی ددان، هەڵوەرینی موو، زیادبوونی لێدانی دڵ ئازاری پشت و جومگە، هەوکردنی لوت و جیوب.

**بڕی دەرمان:** بۆ ڕەقبوون و پوکانەوەی ماسولکەیی لاوەکی (ALS) گەورەکان ٥٠ میلیگرام خۆراکی هەر ١٢ سەعاتێك یان بە گەدەی خاڵی.

## ریمانتادین: RIMANTADINE

**ناوی بازرگانی:** Flumadine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلیگرامی و شروبی ٥٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری و چارەسەری ئەنفلۆنزای جۆری A و پێشگری لە ئەنفلۆنزا و هەوکردنی ڤایرۆسی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، ئازاری گەدە، بێخەوی، گێژی، ئۆدیما، تێکچوونی هەرس، سەرئێشە، خەمۆکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٠ ساڵ ١٠٠ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ. منالآن ١تا ٩ ساڵ ٥ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا.

## ریمیکسۆلۆن: RIMEXOLONE

**ناوی بازرگانی:** Vexol

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ١٪.

**گروپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی چاو و ئیلتیهاباتی پاش نەشتەرگەری چاو بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، ڕوشان، سوربونەوەی چاو، ئازاری چاو، خوران، هەوکردنی گەروو، هەوکردنی لوت، هەوکردنی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی سەروی ۲ ساڵ ۱ تا ۲ قەترە ڕۆژانە ٤ جار.

## ڕینگەر لاکتەیت: RINGER LACTATE

**شێوەی دەرمان:** ئینفیوشنی ٥٠٠ و ١٠٠٠ میلی لیتری. ئایۆنی صۆدیۆم ١٣٠ میلی هاوهێزی/لیتر.

**بەکارهێنان:** جێگرەوەی شلەمەنی و ئەلیکترۆلیتی لەشە.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی سۆدیۆم و پۆتاسیۆم وکالسیۆم وکلۆر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآن بەپێی حاڵەتی نەخۆشەکە دەگۆڕێت.

## ڕینگەر: RINGERS

**شێوەی دەرمان:** ئینفیوشنی ٥٠٠ و ١٠٠٠ میلی لیتری. ئایۆنی صۆدیۆم ١٤٧ میلی هاوهێزی/لیتر و ئایۆنی کالسیۆم ٤,٥ میلی هاوهێزی/لیتر. ئایۆنی پۆتاسیۆم میلی هاوهێزی/لیتر. ئایۆنی کلۆر ١٥٦ میلی هاوهێزی/لیتر.

**بەکارهێنان:** جێگرەوەی شلەمەنی و ئەلیکترۆلیتی لەشە.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی سۆدیۆم و پۆتاسیۆم وکالسیۆم وکلۆر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ومنالآن بەپێی حاڵەتی نەخۆشەکە دەگۆڕێت.

## ریسیدرۆنەیت: RISEDRONATE

**ناوی بازرگانی:** Actonel

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ٣٠ و ٣٥ و ٧٥ و ١٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Biphosphonate

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پوکانەوەی ئێسک و نەخۆشی باجەت و پوکانەوەی ئێسک پاش لە لەعوزرچونەوەی ژنان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ناڕێکی لێدانی دڵ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، خەمۆکی، گێژی، بێخەوی، پەڵە، کاتاراکت، هەوکردنی گەروو، سکچوون، ئازاری سك، هەوکردنی گەدە، تێکچوونی گەدە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەوکردنی دوانزەگرێ، حەساسیەت، هەوکردنی میزەڕۆ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ پوکانەوەی ئێسك لە پیاوان ٥ میلی‌گرام ڕۆژانە یان ٣٥ میلی‌گرام هەموو هەفتەیەك. بۆ نەخۆشی باجەت ٣٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار بۆ ٢ مانگ. بۆ پوکانەوەی ئێسك پاش لە لەعوزرچونەوەی ژنان ٣٥ میلی‌گرام ١ جار لە هەفتەیەکدا.

بۆ: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## ریسپیریدۆن: RISPERIDONE

**ناوی بازرگانی:** Resperdal

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ و ٢ و ٣ و ٤ میلی‌گرامی و گیراوەی خۆراکی ١ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antipsycotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شیزۆفرینیا وشێتی و تێکچوونی دوو جەمسەری و نەخۆشی یە دەروونیەکانی تر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خرۆشان، ئازاری جومگە، قەبزی، هێڵنجدان، دڵەڕاوکێ، سەرئێشە، بێخەوی، زیادلێدانی دڵ، ئازاری سنگ، تێکچوونی هەرس، پەڵە، تا. کۆکە، جیوب.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار هەر ٢ تا ٣ ڕۆژ ١ میلی‌گرام بۆ ئەو بڕە زیاددەکەین تا بە ٣ میلی‌گرام ڕۆژانە ٢ جار بگات.

## ریسپیریدۆن: RISPERIDONE

**ناوی بازرگانی:** Risperdal Consta

**شێوەی دەرمان:** دەرزی(ڤیاڵی) ٢٥ و ٣٧ و ٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antipsycotic

بەکارهێنا: بۆ چارەسەری نەخۆشی شیزۆفرینیا و شێتی و تێکچوونی دووجەمسەری و نەخۆشی یە دەروونیەکانی تر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** دڵەڕاوکێ، سەرئێشە، بێخەوی، زیاد لێدانی دڵ تێکچوونی بینین، چاوئێشە، هەوکردنی گەروو، خەواڵویی، ئازاری سنگ، تێکچوونی هەرس، پەڵە، تا، کۆکە، جیوب.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥ میلی‌گرام ماسولکەیی هەموو ٢ هەفتەیەك، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٥٠ میلی‌گرام هەموو ٢ هەفتەیەك.

## ریتۆدرین: RITODRINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Yutopar

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلی‌گرامی و دەرزی ١٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر ( ٥ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Beta agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زوو منداڵبوون و بەرگریکردن لە لە دایکبوونی پێش وەخت بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** تورەیی، بێهێزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، زۆر لێدانی دڵ، ئۆدیمای سی، پەڵە، زیادبوونی شەکری خوێن، شۆك.

**بڕی دەرمان:** ٥٠ مایکرۆگرام/خولەك ئینفیوشنی دەماری دەکرێت، پاش هەر ١٠ خولەك ئەتوانی هەرجارەی ٥٠ مایکرۆگرام/خولەك بۆ بڕی دەرمان زیاد بکەیت تا ئەنجامی داواکراوی چارەسەر بەدەست دەهێنرێت. ئاسایی بڕی دەرمانی کاریگەر ١٥٠ تا ٣٥٠ مایکرۆگرام/خولەك دەبێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی خۆراکی ڕۆژانە ١٢٠ میلیگرام دەبێت.

## ریتۆنافیر: RITONAVIR

**ناوی بازرگانی:** Norvir

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠٠ میلیگرامی و گیراوەی ٨٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت.

کاریگەری لاوەکی یەکان: هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، ئازاری گەدە، سەرئێشە، خەمۆکی، تا، زەردی، کۆکە، نارێکی لێدانی دڵ، خوێنبەربوونی لوت و پوکی ددان، زۆر میزکردن، بلۆقکردن و پەڵەی پێست، وشکبوونەوەی دەم، ڤێ، ناتەواوی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٣٠٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٦٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار، منداڵانی زیاتر لە ٢ ساڵ سەرەتا ٢٥٠ میلیگرام/مەتردوجا هەموو ١٢ سەعاتێك. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٦٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار.

## ریتیوکسیماب: RITUXIMAB

**ناوی بازرگانی:** Rituxan

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلیگرام/میلیلیتر (١٠ میلیلیتر، ٥٠ میلی لیتر).

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن ناهوچکین لیمفۆما و لیوکیمیا و لەگەڵ میوتریکسەیت بۆ چارەسەری ڕۆماتیزم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، حەساسیەت، پەڵە، تا، لەرز، نارێکی لێدانی دڵ، کەم لێدانی دڵ، تەنگەنەفەسی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی و پەرەی خوێن، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، خوران، کرژبوونی بۆری هەوا.

**بڕی دەرمان:** بڕی دەرمانی سەرەتایی ٣٧٥ میلیگرام/مەتردوجا بە IVئینفیوشن هەر هەفتەیەك بۆ ٤ تا ٨ ڕۆژ (خێرایی ئینفیوشن سەرەتا ٥٠ میلیگرام/ سەعات).

## ریڤارۆکسابان: RIVAROXABAN

**ناوی بازرگانی:** Xarelto

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەکارهێنان:** دژی مەیینی خوێنە و بۆ پێشگری و بەرگرتن بە خوێنی مەیووی دەمار لە نەشتەرگەری گۆڕینی ئەژنۆ و کلۆت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، خوێنبەربوون، قەبزی، سکچوون، تێکچوونی گەدە، وشکبوونەوەی دەم، ڕشانەوە، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئۆدیما، زیاد لێدانی دڵ، کەمبوونەوەی پەڕەکانی خوێن، گێژی، سەرئێشە، خوران، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** بۆ پێشگری و بەرگرتن بە خوێنی مەیووی دەمار لە نەشتەرگەری گۆڕینی ئەژنۆ، گەورەکان تەمەنی سەروی ١٨ ساڵ ١٠ میلی گرام ڕۆژانە ١ جار بۆ ٢ هەفتە ٦ تا ١٠ سەعات پاش دەستپێکردنی نەشتەرگەری. بۆ پێشگری و بەرگرتن بە خوێنی مەیووی دەمار لە نەشتەرگەری گۆڕینی کلۆت، گەورەکان تەمەنی سەروی ١٨ ساڵ ١٠ میلی گرام ڕۆژانە ١ جار بۆ ٥ هەفتە ٦ تا ١٠ سەعات پاش دەستپێکردنی نەشتەرگەری.

## ریڤاستیگمین: RIVASTIGMINE

**ناوی بازرگانی:** Exelon

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١,٥ و ٣ و ٤,٥ و ٦ میلی گرامی و گیراوەی ٢ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Acetylcholinestrase inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نیشانەی نەخۆشی توشبوو بە ئەلزایمەری سوك و مامناوەند (بریتی یە لە تێکچوونێك لە عەقڵدا و بەهۆی لەناوچونی تەدریجی خانەکانی مێشکەوە لەبەتەمەنەکاندا ڕوودەدات) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، دڵەڕاوکێ، تێکچوونی هەرس، ڕشانەوە، هێڵنجدان، غازات، کەمبوونەوەی ئارەزووی خواردن، هەوکردنی ڕێڕەوی میز.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١,٥ میلی گرام ڕۆژانە ٢ جار لەگەڵ خواردندا، ئەگەر پێویست بێت ئەتوانی پاش لە ٢ هەفتە بڕی دەرمان بە ٣ میلی گرام ڕۆژانە ٢ جار بگەیەنی.لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٦ میلی گرام ڕۆژانە ٢ جار.



## ریزاتریپتان: RIZATRIPTAN

**ناوی بازرگانی:** Maxalt

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** ٥HT١ agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شەقیقە(مایگرەین) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، تەشەنوج، دڵەڕاوکێ، تێکچوونی بینین، خەواڵویی، پەڵە، کرژبوونی ماسولکە، نارێکی لێدانی دڵ هێڵنجدان، ڕشانەوە، دڵەکوتێ، ئازاری سنگ، هیلاکی، بێخەوی، لەرزین، خوران، زیاد لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٥ تا ١٠ میلی‌گرام ڕێی پێ دەدرێت.ئەگەر سەرئێشە سەری هەڵدایەوە،ئەتوانی کە بڕی دەرمانی دووەم لانی کەم ٢ سەعات پاش لە بری دەرمانی یەکەم بەبڕی ١٠ میلی‌گرام بەیەك بڕ بەکاربێنیت،لایەنی زۆر بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٣٠ میلی‌گرامە.

## رۆکیورۆنیۆم: ROCURONIUM

**ناوی بازرگانی:** Zemuron

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** بۆ خاوکردنەوەی ماسولکەکان پێش لە بەنجی عمومی لەکاتی ئامادەکردنی نەخۆش بۆ نەشتەرگەری و بۆ بە ئاسانی تێخستنی لولە و هەواگۆڕکێی میکانیکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئاوسان، خوران، پەڵە، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٦ تا ١,٢ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە دەمار.

## رۆفلیومیلاست: ROFLUMILAST

**ناوی بازرگانی:** Daliresp,Daxas

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiinflammatory

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی داخرانی موزمینی سی یەکان (COPD) و هەوکردنی موزمینی بۆرێچکەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، ئازاری گەدە، گێژی، ئازاری پشت، ئازار و کزانەوە لە کاتی میزکردن، لەرزین، کەمبوونی کێش.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ مایکرۆگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا، لەگەڵ یان بەبێ خواردن.



## رۆمیدیپسین: ROMIDEPSIN

**ناوی بازرگانی:** Istodax

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی.

**گروپی دەرمان:** Histone diacetylase inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خانەی T لیمفۆمای پێستی (CTCL) جۆرێکە لە شێرپەنجەی خرۆکە سپی یەکان، بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سنگ، ناڕێکی لێدانی دڵ، تا، لەرز، برینی دەم و قوڕگ، خوێنبەربوون، ئازار و کزانەوە لە کاتی میزکردن، سکچوون، قەبزی، خوران، نەمانی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٤ میلی‌گرام مەتردوجا بە IV بۆ زیاتر لە ٤ سەعات لە ماوەی ڕۆژەکانی ١ و ٨ و ١٥ و لە خولی ٢٨ ڕۆژێکدا.

## رۆمیپلۆستیم: ROMIPLOSTIM

**ناوی بازرگانی:** Nplate

**شێوەی دەرمان:** ڤیالی ٢٥٠ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Thrombopoietin receptor agonist

**بەکارهێنان:** دژی خوێنبەربوونە و بۆ چارەسەری کەمبوونەوەی پەرەکانی خوێن لە نەخۆشی (ITP) و پاش نەشتەرگەری لابردنی سپڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، ئازاری جومگە و ماسولکە، بێخەوی، ئازاری گەدە، هیلاکی، هەڵامەت، پەڵە، سوربونەوە، شەقیقە، ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان تەمەنی سەروی ١٨ ساڵ ١ مایکرۆگرام/کیلۆگرام ژێرپێستی هەفتانە ١ جار.

## رۆپینیرۆڵ: ROPINIROL HCL

**ناوی بازرگانی:** Requip

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٢٥ و ١ و ٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Dopamine receptor agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نیشانەی خوێی نەخۆشی پارکینسۆن بەتەنها یان لەگەڵ لیڤۆدۆپا بەکاردێت.





**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سەرگێژبوون، سەرئێشە، بێخەوی، دابەزینی زەخت، تێکچوونی هەرس، وشکی دەم، تێکچوونی بینین، هەوکردنی ڕێڕەوی هەناسەدان، ئازاری سك، خراپی هەرس، غازات، تێکچوونی بینین، تەنگەنەفەسی، ئازار.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٢٥ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار ڕێی پێ دەدرێت، بڕی دەرمانی بە پێی کاردانەوەی دەرمانی، دیاری دەکرێت. ئەبێت بڕی دەرمان بە تەدریجی زیاد بکرێت (لایەنی زۆر ڕۆژانە ٢٤ میلیگرامە).

## ڕۆپیڤاکائین: ROPIVACAINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Naropin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢ و ٥ و ١٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Local Anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی مەوزوعی لە نەشتەرگەری و ئازاری پاش نەشتەرگەری و ئازاری منداڵبوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تا، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری پشت، خوران، ناڕێکی لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، لێ، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** بڕەکەی بەپێی جۆری نەشتەرگەری یەکە دەگۆڕێت.

## ڕۆسیگلیتازۆن: ROSIGLITAZONE

**ناوی بازرگانی:** Avandia

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ و ٤ و ٨ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidiabetic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سکچوون، زۆربوونی کێش، ئازاری پشت، تێکچوونی بینین، هێڵنجدان، ئازاری گەدە، زەردی، ئازاری سنگ، تا، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئۆدیما.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤ تا ٨ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## ڕۆسیوڤاستاتین: ROSUVASTATIN

**ناوی بازرگانی:** Crestor

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ و ٢٠ و ٤٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihyperlipidemic

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندنی چەوری خوێن و کۆلیسترۆڵی خوێن و بڕی نائاسایی چەوری و چەوری یە پرۆتین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ئازاری سك، ئازاری جومگە و ماسولکە، سەرئێشە، هەوکردنی میزەڕۆ، گێژی، تێکچوونی جگەر، هەوکردنی جگەر، پەڵە. خوران، میزی پرۆتینی، میزی خوێناوی، زەردی، هەوکردنی جگەر، گێژی، هەڵوەرینی موو، خەمۆکی، شەرا، قەبزی، هەوکردنی پەنکریاس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٤٠ میلیگرامە.

## ڕۆتیگۆتین: ROTIGOTINE

**ناوی بازرگانی:** Neupro

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی موشەما(Patch).

**گرووپی دەرمان:** Dopamine agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی پارکینسۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکبوونەوەی دەم، قەبزی، تێکچوونی گەدە، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، دڵەکوتێ، ئۆدیما، گێژی. خەواڵویی. نارەقکردنەوە، پەڵە، خوران، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن،لاوازی سێکسی، زیادلێدانی دڵ، تەشەنوج.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ تا ٤ میلیگرام موشەما بە شێوەی مەوزوعی بەکاردێت هەموو ٢٤ سەعاتێك، لایەنی زۆر ٦ میلیگرام لە ٢٤ سەعاتێك.

## ڕوبیلا ڤایرەس ڤاکسین لیڤ: RUBELLA VIRUS VACCINE LIVE

**ناوی بازرگانی:** Meruvax

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,٨ میلیلیتر (١٠٠٠یەکە) / ڤیاڵ

**گرووپی دەرمان:** Vaccine

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگیری کردن لە سورێژە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** پەڵە، سەرئێشە، ئازاری جومگە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و مناڵانی زیاد لە ١ ساڵ ١ ڤیاڵ بە شێوەی ژێر پێستی.



## RUFINAMIDE :ڕوفیناماید

**ناوی بازرگانی:** Banzel

**شێوەی دەرمان:** سەسپێنشنی خۆراکی ٤٠ میلیگرام/میلیلیتر و حەبی ٢٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiepileptics

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی (Lennox-Gastaut Syndrome) جۆرە فێ یەکی توندە لەمنداڵاندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تێکچوونی بینین، برینی گەروو، گێژی، خەواڵویی، هیلاکبوون، کەمبوون و زیادبوونی ئارەزوی خواردن، میزی خوێناوی، تا، پەڵە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، سکچوون، بێخەوی، خەمۆکی، کەمبوونی کێش، ئازاری سك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٠ تا ٨٠٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراوی یەکساندا. منداڵان ٤ ساڵ و گەورەتر ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراوی یەکساندا.

## RUPATADINE :ڕیوپاتادین

**ناوی بازرگانی:** Rupafin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چاکردنەوەی نیشانەکانی حەساسیەت و هەوکردنی لوت و شەرای مزمینی خۆیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، وشکی دەم، گیرانی میز، تێکچوونی بینین، تێکچوونی هەرس، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، نارێکی لێدانی دڵ دڵەکوتێ، تێکچوونی خەو، پەڵە، کرژبوونی بۆری هەوا، تا، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، ئازاری ماسولکە و جومگە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ ساڵ ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار.

## RUXOLITINIB PHOSPHATE :ڕیوکسۆلیتینیب

**ناوی بازرگانی:** Jakafi

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ و ١٥ و ٢٠ و ٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Tyrosine kinase inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بە ڕیشاڵبوونی مامناوەند و زۆر زیانبەخشی مۆخ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمخوێنی، سەرئێشە، کەمبوونەوەی نیوترۆفیل شڵەژان، کەمی پەڕەی خوێن، گێژی.

**بڕی دەرمان:** بەپێ ژمارەی پەڕەکانی خوێن بڕی دەرمان بەکاردێت.

# S

## **ساکارین:** SACCAHRIN

**ناوی بازرگانی:** Sucaryl

**شێوەی دەرمان:** دەنکی بچوك (pellet) ١٣ تا ١٦ میلی‌گرام.

**گروپی دەرمان:** Sweetening agent

**بەکارهێنان:** جێگرەوەی شەکر لەو نەخۆشانەی شەکرەیان هەیە، دژی قەڵەوی.

**بڕی دەرمان:** لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١ گرامە.

## **ساکرۆسیدەیز:** SACROSIDASE

**ناوی بازرگانی:** Sucraid

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی خۆراکی ٨٥٠٠ یەکە/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Gastrointestinal agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمبوونەوەی سوکەرەیز کە ڕوودەدات لەو کەسانەی کەتوشی نەخۆشی کەمبوونەوەی زگماکی سوکەرەیز، ئایزۆماڵتەیز بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك، قەبزی، سکچوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، بێخەوی، وشکبوونەوەی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان نەخۆشی کەمبوونەوەی زگماکی سوکەرەیز، ئایزۆماڵتەیز زیاتر لە ١٥ کیلۆگرام کێشی لەش ١٧٠٠٠ یەکەی نێودەوڵەتی (١ میلی لیتر،٢٢ قەترە) یان ٢ کەوچکی پێوانەیی پڕ خۆراکی لەگەڵ هەر ژەمێکدا یان نان خواردنی سەرپێی دا، نیوەی ١ بڕی دەرمان وەردەگیرێت لە دەستپێکی ژەمی خورادن دا و نیوەی دووەم لە کۆتایی ژەمی خواردندا. مناڵی کەمتر لە ١٥ کیلۆگرام کێشی لەش ٨٥٠٠ یەکەی نێودەوڵەتی (١ میلی لیتر، ٢٢ قەترە) یان ١ کەوچکی پێوانەیی پڕ خۆراکی لەگەڵ هەر ژەمێکدا یان نان خواردنی سەرپێی دا، نیوەی ١ بڕی دەرمان وەردەگیرێت لە دەستپێکی ژەمی خورادن دا و نیوەی دووەم لە کۆتایی ژەمی خواردندا. منالی زیاتر لە ١٥ کیلۆگرام کێشی لەش ١٧٠٠٠ یەکەی نێودەوڵەتی (١ میلی لیتر،٢٢ قەترە) یان ٢ کەوچکی پێوانەیی پڕ خۆراکی لەگەڵ هەر ژەمێکدا یان نان خواردنی سەرپێی دا، نیوەی ١ بڕی دەرمان وەردەگیرێت لە دەستپێکی ژەمی خورادن دا و نیوەی دووەم لە کۆتایی ژەمی خواردندا.



## سەلبیوتامۆل: SALBUTAMOL

**ناوی بازرگانی:** Proventil,ventolin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ۲ میلیگرامی و شروبی ۲ میلیگرام/٥ میلیلیتر و ئایرۆسۆڵ ۱۰۰مایکرۆگرم و گیراوە بۆ هەڵمژین ٥ میلیگرام/میلیلیتر و دەرزی ٠,٥ میلیگرامی/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Bronchodilator

**بەکارهێنان:** بۆ فراوانکردنی بۆری هەواو فراوانکردنی سی و بۆریچکەکان و کردنەوەی بۆری هەوا، بۆ چارەسەری هەوکردنی بۆری هەواو ڕەبۆ و کرژبوونی بۆری هەوا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** توڕەیی، ترس، ناجێگیری، گێژی، لەرزین، زیاد لێدانی دڵ، سەرگێژبوون، بێخەوی، دڵەڕاوکێ، لێدانی دڵ کێشە لە میزکردندا، سەرئێشە، ئازاری سنگ، وشکبوونەوەی دەم، دڵەکزە، تێکچوونی بینین، کرژبوونی ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** بۆ کرژبونی بۆریچکەکانی هەوا گەورەکان ۲۰۰ مایکرۆگرام هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك. یان ۲ تا ٦ میلیگرام، ڕۆژانە ۳ تا ٤ جار و پاشان بە لایەنی زۆر تا ۸ میلیگرام، ڕۆژانە ٤ جار دەگات. منالآنی ٦ تا ١٤ساڵ ۲ میلیگرام ڕۆژانە ۳ تا ٤ جار پاشان بە ٢٤ میلیگرام ڕۆژانە بەشێوەی دابەشکراو دەگات منالآنی ۲ تا ٦ ساڵ ۰,۱ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ۳ جار تا لایەنی زۆر ۰,۲ میلیگرام/ کیلۆگرام، ڕۆژانە ۳ جار بەکاردەهێنرێت. بۆ پێشگرتن لە ڕەبۆی وەرزشی ۲۰۰ مایکرۆگرام، ١٥ خولەك پێش لە چالاکی لاشەیی ڕێی پێ دەدرێت.

## سالیسیلیك ئەسید: SALICYLIC ACID COMPOUND

**ناوی بازرگانی:** Wart-off, viranol

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی مەوزوعی (سالیسیلیك ئەسید ١٦,٧ گرام + لاکتیك ئەسید ١٦,٧ گرام + کۆلۆدیۆن QS بۆ ۱۰۰ گرام).

**گروپی دەرمان:** Keratolytic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بالووك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی مەوزوعی.

**بڕی دەرمان:** بۆ کراتۆلیتیك گەورەکان و منالآن ڕۆژانە ۱ تا ۲ جار، بەمەوزوعی ڕووی ئەو شوێنەی پێدەمالڕێت. بۆ بالووکی ئاسایی یان بالووکی بنی پێ گەورەکان و منالآن لەسەرەتادا بالووك ٥ خولەك لە ناوی ئاوی گەرمدا دادەنرێت. پاش ئەوەی ئەو شوێنە وشکبوویەوە، ئەم دەرمانە بەمەوزوعی پێیدا دەمالرێت. پاش لە بەکارهێنانی ئەم گیراوە، دەوروبەری ئەو شوێنە ڤازەلینی لێ دەدرێت. بڕی بەکارهێنان ۱ تا ۲ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ۱ هەفتە.



## سالمیتیرۆڵ: SALMETEROL

**ناوی بازرگانی:** Serevent

**شێوەی دەرمان:** ئایرۆسۆڵی ئیستینشاقی ٢٥، ٥٠ مایکرۆگرام/دۆز.

**گروپی دەرمان:** Bronchodilator

**بەکارهێنان:** بۆ فراوانکردنی بۆری هەوا و بۆ چارەسەری ڕەبۆ و بۆ کردنەوەی بۆری هەوا و سی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی لێدانی دڵ سەرئێشە، لەرزین، توڕەیی، لێدانی دڵ نارێکی لێدانی دڵی سکۆڵەیی، کۆکە، سکچوون، زیادبوونی حەساسیەت، کرژبوونی بۆری هەوا.

**بڕی دەرمان:** دەرمانی پاراستن لە ڕەبۆ گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ڕۆژانە ٢ جار هەڵدەمژرێت. بۆ پێشگرتن لە ڕەبۆ بەهۆی وەرزش گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ٢ ئیستینشاقی لانی کەم ٣٠ تا ٦٠ خولەك پێش لە وەرزش.

## سالسالەیت: SALSALATE

**ناوی بازرگانی:** Amigesic, salflex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ و ٧٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهابی جومگەکان و ڕۆماتیزم و هەوکردنی جوگە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، تێکچوونی هاوسەنگی، خوێنلێبڕانی ماسولکەیی دڵ تێکچوونی بیستن، بیرۆ، برینی گەدە و ڕیخۆڵە، کەمخوێنی، پەککەوتنی جگەر، پەڵە، خوێنبەربوونی هەرس، ناتەواوی گورچیلە، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## سەڵت سەبستیتیوت: SALT SUBSTITUTE

**شێوەی دەرمان:** پاودەر ١٢٠٠ میلیگرامی.

**بەکارهێنان:** جێگرەوەی خوێی چێشت.

**بڕی دەرمان:** بڕی ١٠تا١٥ میلیگرام هەر ٨ سەعاتێك.



## ساپرۆپتێرین: SAPROPTERIN ٢HCL

**ناوی بازرگانی:** Kuvan

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Phenylketonuric

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری فینایلکیتۆنیوریا و کەمبوونی تێتراهایدرۆپرۆتین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گیرانی لوت، ئازاری سك، ئازاری لوت و گەروو، سەکتە، خرۆشان، تەشەنوج، گێژی، ئاوکردنی لوت، خوێنبەربوونی گەدە و ڕیخۆڵە، سکچوون، ڕشانەوە، زۆری میز، کۆکە، پەککەوتنی هەناسەدان، ئازاری جومگە، تۆدیمای موحیگی، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسەدان.

**بڕی دەرمان:** فینایلکیتۆنیوریا گەورەکان و منالآنی سەروی ٤ ساڵ بەڕێگەی خۆراکی سەرەتا ١٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ١ جار، لە بەیانیاندا گونجاوترە. بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بەپێی کاردانەوەکەی، بڕی دەرمانی ئاسایی ڕۆژانە ٥ تا ٢٠ میلی‌گرام/کیلۆگرامە. کەمبوونی تێتراهایدرۆپرۆتین گەورەکان و منالآنی بەڕێگەی خۆراکی سەرەتا ٢ تا ٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام ڕۆژانە ١ جار، لە بەیانیاندا گونجاوترە. لایەنی زۆر ڕۆژانە ٢٠ میلی‌گرام/کیلۆگرامە. سەرجەمی بڕی دەرمانی ڕۆژانە نەبێت بەنۆرە بدرێت لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## ساکویناڤیر: SAQUINAVIR

**ناوی بازرگانی:** Fortovase

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٠٠ میلی‌گرامی و حەبی ٥٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** لەگەڵ دەرمانە دژە ڤایرۆسەکانی تردا بۆ چارەسەری هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری گەدە، هەوکردنی پێست، تا، لەرز، برینی دەم و گەروو، کۆکە، زەردی یان سەوزبوونی بەڵغەم، پژمین، ئازاری سنگ، وشکبوونەوەی دەم، هەڵوەرینی موو، تەنگەنەفەسی، زیادبوونی ئارەزووی خواردن، شەکرە، لاوازی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان تەمەنی سەروی ١٦ ساڵ ١ گرام ساکویناڤیر لەگەڵ ١٠٠ میلی‌گرام ڕیتۆناڤیر بەشێوەی خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار. ١ گرام ساکویناڤیر لەگەڵ لۆپیناڤیر ٤٠٠ میلی‌گرام و ١٠٠ میلی‌گرام ڕیتۆناڤیر بەشێوەی خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار.

جێ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## سارگرامۆستیم: SARGRAMOSTIM

**ناوی بازرگانی:** Leukine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ۲٥٠ و ٥٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Hematopoietic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمخوێنی و زیادکردنی خرۆکە سپی یەکان و یارمەتیدەر بۆ پێشگری لەهەوکردنی توند لە لەنەخۆشی وەك لیوکیمیا و چاندنی مۆخی ئێسك و پێش لە وەرگرتنی چارەسەری کیمیایی خانەکانی خوێن نیوترۆپنیا (کەمبوونەوەی نیوترۆفیل لە خوێندا )بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری ئێسك، تا، زیادبوونی لێدانی دڵ، ئازاری ماسولکە، تێکچوونی هەرس، سوربونەوە، ناتەواوی گورچیلە، هەوکردنی گەروو، ئازاری جوگە، ئازاری سك، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی کێش، خوران، پەڵە، ئازاری سنگ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۲٥٠ مایکرۆگرام/مەتردوجا لە ڕۆژێکدا بەIV بۆ ماوەی ۲۱ ڕۆژ.

## ساکساگلیپتین: SAXAGLIPTIN HCL

**ناوی بازرگانی:** Onglyza

**شێوەی دەرمان:** حەبی ۲,٥ و ٥ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidiabetic

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕێژەی شەکر لە خوێندا و شەکرەی جۆری ۲ و لەگەڵ دەرمانەکانی تری شەکرەدا بۆ چارەسەری شەکرەی جۆری ۱ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، برینی گەروو، کۆکە، ئازاری گەدە، ئاوسان، خوێنبەربوون، کەمبوونەوەی شەکری خوێن، هەوکردنی ڕێڕەوی میز، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، سیل، ئۆدیما، ئازارو کزانەوە کاتی میزکردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۲,٥ تا ٥ میلی گرام بەشێوەی خۆراکی ڕۆژانە ۱ جار لەگەڵ یان بەبێ خواردن.

## سکۆپۆلامین: SCOPOLAMINE

**ناوی بازرگانی:** Transderm scop

**شێوەی دەرمان:** موشەمای ۱ میلی گرام/۷۲ سەعات.

**گروپی دەرمان:** Anticholinergic

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگرتن لە هێڵنجدان و ڕشانەوە لەسەفەردا و هێڵنجدان و ڕشانەوەی پاش نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ناجێگیری، سەرگێژبوون، وشکبونەوە، پەڵە، گێژی، سەرئێشە. تێکچوونی بینین، زیادلێدانی دڵ تا. گیرانی میز، لێدانی دڵ قەبزی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ موشەما لە ڕێگەی پێست، ٤ سەعات پێش کەوتنەڕێ لەژێری گوێ دەچەسپێنرێت.

## سیکۆباربیتال: SECOBARBITAL

**ناوی بازرگانی:** Seconal Sodium

**شێوەی دەرمان:** کەپسول ١٠٠ میلی‌گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Sedative and hypnotic

**بەکارهێنان:** خەوهێنەر و ئارامکەرەوەیە و بۆ چارەسەری ماوەکۆتای بێخەوی و بۆ هێورکردنەوەی پێش نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵوویی، کەمخوێنی، تێکچوونی جگەر، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، خرۆشان، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ سەرئێشە، خەمۆکی، فێ، سەرگێژبوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، گێژی، تێکچوونی گەدە.

**بڕی دەرمان:** بۆ بێخەوی گەورەکان ١٠٠ میلی‌گرام خۆراکی لەکاتی خەودا، بۆ هێورکردنەوەی پێش نەشتەرگەری ٢٠٠ تا ٣٠٠ میلی‌گرام خۆراکی ١ تا ٢ سەعات پێش لە نەشتەرگەری. بۆ هێورکردنەوەی پێش نەشتەرگەری منالآن ٢ تا ٦ میلی‌گرام/کیلۆگرام. لایەنی زۆر ١٠٠ میلی‌گرامە.

## سیکریتین: SECRITIN

**ناوی بازرگانی:** SecreFlo

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ یەکە/١٠ میلی‌لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Diagnostic agent

**بەکارهێنان:** بۆ تەشخیصی تێکچوونی چالاکی پەنکریاس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** دابەزینی زەخت، خاو لێدانی دڵ هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری گەدە، سووربوونەوەی پێست، سکچوون، ئازاری سك.

**بڕی دەرمان:** ١ یەکە/کیلۆگرام بەشێوەی دەماری و بەلەسەرخۆیی ڕێی پێ دەدرێت.



## سیلیجیلین: SELEGILINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Eldepryl ,Zelapar

**شێوەی دەرمان:** کەپسول و حەبی ٥ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** MAO inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری نەخۆشی پارکینسۆن ( لەرزینی خۆنەویستی ئەندامەکان ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بێهێزی، هیلاکی، وشکی گەردن، ناجێگیری، گۆڕانی هەڵسوکەوت، بێخەوی، دڵەڕاوکێ، سکچوون، ئازاری سك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، وشکی دەم، قەبزی، نارێکی لێدانی دڵ، بەرزبونەوە و نزمبونەوەی پەستانی خوێن، پەڵەی پێست. بێهۆشی، ئۆدیمای موحیگی، گەورەبوونی پرۆستات، گیرانی میز، کرژبوونی پێڵوی چاو.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری پارکینسۆن لەگەڵ لیڤۆدۆپا گەورەکان ١٠ میلیگرام ڕۆژانە بەیانیان یان دابەشکراو لە ٢ بڕی دەرمانی ٥ میلیگرامی دا لە کاتی ژەمی بەیانیان و نیوەڕۆ ڕێی پێ دەدرێت.

## سیلینیوم سەلفاید: SELENIUM SULFIDE

**ناوی بازرگانی:** Selseb, LENIUM, Selson

**شێوەی دەرمان:** لۆشن و شامپۆ ١ ٪و ٢،٥ ٪.

**گروپی دەرمان:** Antiseborrheic

**بەکارهێنان:** دژی کرێش و سیبۆریای سەر (چەوری زیادی سەر) و خورانی پێستی سەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێست، وەرینی موو.

**بڕی دەرمان:** هەر ١ تا ٤ هەفتەیەك ١ جار یان لە هەفتەیەکدا ٢ جار سودی لێ وەردەگیرێت.

## سێرمۆریلین: SERMORELIN ACETATE

**ناوی بازرگانی:** Geref

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزیIV.

**گروپی دەرمان:** GHRH analog

**بەکارهێنان:** بۆ تەشخیص و چارەسەری کەمی هۆرمۆنی گەشە لە منداڵاندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بەگرانی هەناسەدان، ئازار، سوربونەوە، هێڵنجدان، ئاوسان، پەڵە، خوران.

**بڕی دەرمان:** بۆ تەشخیصی کەمی هۆرمۆنی گەشە ١ مایکرۆگرام/کیلۆگرام و بۆ چارەسەری کەمی هۆرمۆنی گەشە ٣٠ مایکرۆگرام/کیلۆگرام.

## سێرتاکۆنازۆڵ: SERTACONAZOLE NITRATE

**ناوی بازرگانی:** Ertaczo

**شێوەی دەرمان:** کرێمی مەوزوعی ٪٢ و حەبی دەزگای زایەندی ژنان ٥٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی کەڕووی مەوزوعی پێست و نێوان پەنجەکان و پێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوەی پێست، وشکبوونەوەی پێست، هەوکردنی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی ١٢ ساڵە و گەورەتر ڕۆژانە ٢ جار بۆ ماوەی ٤ هەفتە.

## سێرترالین: SERTRALINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Zoloft,lustral

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خەمۆکی و وەسواسی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، گێژی، ڕشانەوە، سەرئێشە، تووڕەیی، خەواڵوویی، سەرگێژبوون، بێخەوی، وشکی دەم، غازات، تێکچوونی چالاکی سێکسی لە پیاوان، قەبزی، خوران، پەڵە، ئازاری سك، ئازاری سنگ، سکچوون، زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ میلی گرام ڕۆژانە ڕێی پێ دەدرێت، بڕی دەرمان بەپێی پێویستی نەخۆش دەگۆڕێت. منداڵانی ٦ تا ١٢ ساڵ ڕۆژانە ٢٥ میلی گرام. تەمەنی ١٣ تا ١٧ ساڵ ڕۆژانە ٥٠ میلی گرام. لە تێکچوونی جگەر و گورچیلەدا ئەبێت بڕی دەرمان کەمبکرێتەوە.

## سیڤیلامێر: SEVELAMER

**ناوی بازرگانی:** Renagel

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠٠ و ٨٠٠ میلی گرامی و کەپسولی ٤٠٣ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Phosphate binder

**بەکارهێنان:** بۆ کەمکردنەوەی فۆسفات لە خوێندا و بۆ چارەسەری هایپەرفۆسفاتیمیا (زیادبوونی فۆسفات) لەو کەسانەی نەخۆشی مزمینی گورچیلەیان هەیە بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبونەوە و نزمبونەوەی پەستانی خوێن، ئازار، هەوکردن، دابەزینی زەخت، سکچوون، خرابی هەرس، هێڵنجدان، ڕشانەوە، غازات، هەرسنەکردن، سەرئێشە، زیادبوونی کۆکە، قەبزی، کلۆبوونی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و بەساڵاچوان ٨٠٠ تا ١٦٠٠میلیگرام خۆراکی ٣ جار لەڕۆژێکدا، لەگەڵ هەر ژەمێکی خۆراکدا پەیوەستە بەتوندی زیادبوونی فۆسفات.

## سیڤۆفلۆران: SEVOFLURANE

**ناوی بازرگانی:** Ultane

**شێوەی دەرمان:** ئیستینشاقی (هەڵمژین) ٢٥٠ میلی گرام (٢٥٠میلیگرام/بتڵ).

**گروپی دەرمان:** General anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی عمومی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، خرۆشان، ڕشانەوە، سەرگێژبوون، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ٠.٥٪ تا ٣٪ یان بەبێ نایترەس ئۆکساید و بەپێی کاردانەوەی ئەو کەسە، ڕێی پێ دەدرێت.

## سیبوترامین: SIBUTRAMINE

**ناوی بازرگانی:** Meridian

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥ و ١٠ و ١٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** CNS stimulant

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵ و چارەسەری قەڵەوی و بۆ کەمکردنەوەی کێش و پارێزگاری کێش و کەمکردنەوەی بەرهەم لەگەڵ کەمکردنەوەی بڕی کالۆری ڕژێمی خۆراکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** دڵەڕاوکێ، خەمۆکی، گێژی، سەرئێشە، بێخەوی، شەقیقە، ئازاری سنگ، بەرزبوونەوەی زەخت، زیاد لێدانی دڵ ئازاری گوێ، هەوکردنی گوێ، ئازاری سك، نەمانی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کۆکە، پەڵە، ئازاری مل وپشت، زیپکە، حەساسیەت، هەوکردنی میزەڕۆ، تامێسك، هەوکردنی گەدە، ئازاری جومگە، ئارەقکردنەوە، هەوکردنی کاندیدیازی زایەندی ژنان، هەوکردنی گەروو و لوت و جیوب، توڕەیی، خەواڵویی، ئۆدیمای گشتی، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، وشکی دەم، تێکچوونی کۆم، تامی کانزایی ناودەم، ئەنفلۆنزا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلیگرام خۆراکی ١ جار لەڕۆژێکدا لەگەڵ خواردن یان بەبێ خواردن، ئەبێت پاش لە ٤ هەفتە ئەگەر کەمبوونەوەی کێش بەس نەبوو بڕی دەرمان بۆ ١٥ میلیگرام زیاد دەکەین. ئەو نەخۆشانەی کە توانای تەحەمولی بڕی ١٠ میلیگرامی نی یە لە ژێر چارەسەری ٥ میلیگرام دادەنرێن، بڕی دەرمانی زیاتر لە ١٠ میلیگرام ڕۆژانە پێشنیارنەکراوە.

## سیلدینافیل: SILDENAFIL

**ناوی بازرگانی:** Viagra ,lemonica

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Vasodilator,PDE٥ inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری لەپیاوەتی کەوتن و لاوازی کاری جنسی و تێکچوونی جنسی و بەرزبوونەوەی پەستانی سی یە خوێنبەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ناڕێکی لێدانی دڵی سکۆڵەیی، مردنی کتوپڕ، سەکتە، سەرئێشە، سەرگێژبوون، خوێنبەربوونی مێشك، گیرانی لوت، تێکچوونی بینین، ترس لە ڕوناکی، زرنگانەوەی گوێ، ئازاری جومگە، نارەقکردنەوە، پەڵە، خوران، سکچوون، هەوکردنی ڕێڕەوی میز، تەنگەنەفەسی، زیادبوونی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** بۆ لە پیاوەتی کەوتن ٥٠ میلیگرام بەیەك بڕی دەرمان ١ سەعات پێش لەکاری جنسی بەکاردەهێنرێت. بە پێی پێویستی و کاردانەوەی نەخۆش بۆ دەرمان، بڕی دەرمان لە نێوان ٢٥ تا ١٠٠ میلیگرام دەگۆڕێت. لە کەسانی بەتەمەن و تێکچوونی جگەری و گورچیلەیی و بەکارهێنانی ڕێگرەکانی ئەنزیمی سایتۆکرۆم P٤٥٠، بڕی دەرمانی سەرەتایی ڕۆژانە ٢٥ میلیگرامە. بۆ بەرزبوونەوەی پەستانی سی یە خوێنبەر ٢٠ میلیگرام ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## سیلۆدۆسین: SILODOSIN

**ناوی بازرگانی:** Rapaflo

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٤ و ٨ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Alpha١ Adrenergic blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی گەورەبوونی بێوەی پرۆستات (BPH) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژبوون، گیرانی لوت، برینی گەروو، خەواڵویی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٨ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار لەگەڵ خواردندا.

## سیلڤەر نایترەیت: SILVER NITRATE

**شێوەی دەرمان:** پاودەری بلوری.

**گروپی دەرمان:** Astringent,disinfectant

**بەکارهێنان:** بۆ سوتاوی و دژی هەوکردن و، دژی زەردە برین و خوران و مێخەکەی پێ و بالۆك بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** ٢ یان ٣ جار لە هەفتەیەکدا بەماوەی ٢ تا ٣ هەفتە بەپێی پێویست بەڕووی ئەو شوێنەدا بماڵرێت.

چەند: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## سیلڤەر سەلفادیازین: SILVER SULFADIAZINE

**ناوی بازرگانی:** Flamuazine

**شێوەی دەرمان:** کریمی ١٠ میلی‌گرام/گرام و کریمی ١٪.

**گروپی دەرمان:** Antibacterial

بەکارهێنان: دەرمانی یارمەتیدەر بۆ پێشگرتن و چارەسەری هەوکردنی برین لە سوتاویەکان و دژی سوتان و هەوکردنی مەوزوعی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمخوێنی، پەڵە، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ڕۆژانە ١ تا ٢ جار بەپێوانەی ١,٥ میلی مەتر ڕووی برینی پێ دەماڵرێت.

## سیم فایبرەیت: SIMFEBRATE

**شێوەی دەرمان:** کەپسول ٢٥٠ میلی‌گرام.

**گروپی دەرمان:** Antilipedmic

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندانی چەوری خوێن و دژی قەڵەوی بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** ٠,٧٥ تا ١,٥ گرام لەڕۆژێکدا و دابەشکراو لە ٣ جاردا پاش خواردن.

## سیمپڵ ئای ئۆینتمێنت: SIMPLE EYE OINTMENT

**ناوی بازرگانی:** Lacrilube

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی چاو.

**بەکارهێنان:** نەرمکەرەوەی چاو.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** ١ یان چەند جارێك لەڕۆژێکدا، چینێکی باریك لە مەڵهەم ڕووی چاو و پێڵوی خوارەوەی پێ دەماڵرێت.

## سایمیتیکۆن: SIMETHICONE

**ناوی بازرگانی:** Anti Gas

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٨٠ و ١٢٥ میلی‌گرامی و کەپسولی ١٢٥ و ١٦٦ و ١٨٠میلی‌گرامی و سەسپێنشنی ٤٠ میلی گرم/٠,٦ میلی‌لیتر و ٢٠ میلی‌گرام/ ٠,٣ میلی‌لیتر و گیراوەی ٢٠ میلی‌گرام/٠,٣ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiflatulent

**بەکارهێنان:** دژی غازاتە و بۆ چارەسەر و لابردنی ئازار و زەخت بەهۆی غازی زیادە لە ناو گەدە و ڕیخۆڵە دا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، پەڵە، خوران، لیر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەرووی ١٢ساڵ ٤٠ تا ١٢٥ میلیگرام پاش لە خواردن و لەکاتی خەودا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٥٠٠ میلیگرام. منداڵی بچوکتر لە ٢ ساڵ ٢٠ میلیگرام ٤ جار لە ڕۆژێکدا. منداڵی ٢ تا ١٢ ساڵ ٤٠ میلیگرام ٤ جار لە ڕۆژێکدا.

## سیمڤاستاتین: SIMVASTATIN

**ناوی بازرگانی:** Zocor

**شێوەی دەرمان:** حەبی٥و ١٠ و ٢٠ و ٤٠ و ٨٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihyperlipedmic

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندنی ڕێژەی کۆلیسترۆڵ و چەوری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێخەوی، ئازاری سک، هێڵنجدان، سکچوون، قەبزی، هەوکردنی ڕێڕەوی میز، ڕشانەوە، زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری بەرزبونەوەی کۆلیسترۆڵی خوێن گەورکان ڕۆژانە ٥ تا ١٠ میلیگرام کاتی شەو ڕێی پێ دەدرێت. بەپێی کاردانەوە و تەحەمولی نەخۆش، ڕێکخستنی دۆزی ئەم دەرمانە هەر ٤ هەفتە ١جار ڕوخسەتی پێدەدرێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٨٠ میلیگرامە.

## سینکالاید: SINCALIDE

**ناوی بازرگانی:** Kinevac

**شێوەی دەرمان:** دەرزی IV ٥ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Diagnostic agent

**بەکارهێنان:** بۆ وێنەگرتنی ڕیخۆڵە و تەشخیصی تێکچوونی تورەکەی زراو و پەنکریاس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سک، هێڵنجدان، گێژی، سەرئێشە، پەڵە، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، کرژبوون، ڕشانەوە، پژمین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٠٢ تا ٠,٠٤ مایکرۆگرام/کیلۆگرام.

...: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێک نەخۆشی

## سیرۆلیمەس: SIROLIMUS

**ناوی بازرگانی:** Rapamycin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ و ٢ و ٠,٥ میلی‌گرامی و گیراوەی خۆراکی ١ میلی‌گرام/ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Immunosuppressant

**بەکارهێنان:** کپکەرەوەی سیستمی بەرگری لەشە و لەگەڵ سایکلۆسپۆرین و کۆرتیکۆستیرۆیدەکان دا بۆ بەرگری ڕەفزکردنی ئەندام پاش لە چاندنی گورچیلە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێخەوی، لەرزین، خەمۆکی، هێڵنجدان، تا، دڵەڕاوکێ، ئازاری سنگ، کۆبوونەوەی ناو لەلەشدا، بەرزبوونەوەی زەخت، قەبزی، ڕشانەوە، سکچوون، هەوکردنی گەروو، قەبزی، هەوکردنی ڕێڕەوی میز، کەمخوێنی، کەمی پەڕەی خوێن و خڕۆکەی سپی، زیادبوونی کۆلیسترۆڵ و چەوری خوێن، کەمبوونی پۆتاسیۆم، ئۆدیمایی موحیگی، زیادبوونی کێش، تەنگەنەفەسی، کۆکە، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، پەڵە، زیپکە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی ١٣ ساڵ و زیاتر لە کێشی ٤٠ کیلۆگرام زیاتر بڕی دەرمانی سەرتایی بە ٦ میلی‌گرام خۆراکی هەرچی زووتر پاش لەچاندن، پاشان بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو ڕۆژانە خۆراکی ٢ میلی‌گرامە. منداڵانی ١٣ ساڵ و زیاتر کەمترلەکێشی ٤٠ کیلۆگرام سەرەتا ٣ میلی‌گرام/مەتردوجا خۆراکی پاش لەچاندن، پاشان بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە خۆراکی ١ میلی‌گرام/ مەتردوجایە.

## سیتاگلیپتین: SITAGLIPTIN

**ناوی بازرگانی:** Januvia

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidiabetic drug

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ لەگەڵ میتفۆرمین یان سەلفۆنیلیوریا یان پایۆگلیتازۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، ئۆدیمایی موحیگی، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، وشکی دەم، نەمانی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، خەواڵویی، گێژی، کەمبوونی شەکری خوێن، هەوکردنی جومگە، هەوکردنی پەنکریاس، پەڵە، ئازار، گەورەبوونی لوت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ١٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار.



## سیتاکسینتان صۆدیۆم: SITAXENTAN SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Thelin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Vasodiator antihypertensive drug

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبونەوەی پەستانی سی یەخوێنبەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، ئۆدیمایی موحیگی، سوربونەوە، سەرئێشە، بێخەوی، هیلاکی، گێژی، کەمبوونی هیمۆگلۆبین، گیرانی لوت، ئازاری ماسولکە، خوێنبەربوونی لوت. زیادبوونی کاتی پرۆپرۆمبین، زیادبوونی INR.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ١٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار.

## سۆدیۆم ئەماینۆ سالیسیلەیت: SODIUM AMINOSALICYLATE

**ناوی بازرگانی:** PAS

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Ant tuberculosis

**بەکارهێنان:** دژی نەخۆشی سیل بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کرژبوونی سك، نەمانی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٢ تا ١٥ گرام ڕۆژانە خۆراکی لە ٢ تا ٤ بڕی دابەشکراودا لایەنی زۆر ٢٨ گرام ڕۆژانە. منداڵان ٢٤٠ تا ٣٦٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام ڕۆژانە خۆراکی لە ٢ تا ٤ بڕی دابەشکراودا لایەنی زۆر ١٦/٨ گرام ڕۆژانە.

## سۆدیۆم بێنزۆویت: SODIUM BENZOATE

**شێوەی دەرمان:** پاودەری بلوری.

**گروپی دەرمان:** Preservative

**بەکارهێنان:** مادەی تەشخیصی بۆ لێکۆڵینەوەی چالاکی جگەر.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، دابەزینی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** ٦ گرام لە ٢٠٠ میلی لیتر ئاو.



## سۆدیۆم بای کاربۆنەیت: SODIUM BICARBONAT

**ناوی بازرگانی:** (Acidosan)-(Colovage)-(Colyte)

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥٠٠ میلیگرامی، حەبی ٦٠٠ میلیگرامی دەرزی بۆ (infusion) ٤.٢٪ و ٨.٤٪.

**گروپی دەرمان:** Antacid

**بەکارهێنان:** دژی ترشێتی خوێن بۆ ئەوانەی گورچیلەیان نەخۆشە، بۆ چارەسەری تێکچوونەکانی هەرس و گەدە و سکچوون و وەستانی دڵ و ژەهراویبون بە دەرمان بەکاردێت.

کاریگەری یە لاوەکیەکان: ئازاری سك،دروستبونی برین، غازات، بەردی گورچیلە، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** خۆراکی ٢ گرام لەیەك پەرداخ ئاو هەر ٤ سەعات جارێ لە وەستاندنی دڵی ١ میلی هاوهێزی/کیلۆگرام بەرێگەی دەمار.

## سۆدیۆم سیلیلۆز فۆسفەیت: SODIUM CELLULOSE PHOSPHATE

**ناوی بازرگانی:** Calcibind

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی پاودەرە.

**گروپی دەرمان:** دژی بەردی ڕێڕەوی میز.

**بەکارهێنان:** دژی دروست بوونی بەردی کالسیۆمی ڕێڕەوی میز.

کاریگەری یە لاوەکیەکان: خراپی هەرس، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، ڕشانەوە، هێڵنجدان، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالانی زیاتر لە ١٦ساڵ لە نەخۆشی توش بوو بە زۆری کلس لەسەرەتادا ٥ گرام رۆژانە ٣ جار بەکاردێت. ئەگەر کالسیۆمی میز٢٤ سەعات کەمتر لە ٢٠٠ میلیگرام بوو،بەبڕی دەرمانی ١٠ گرام رۆژانە ڕێی پێ دەدرێت.

## سۆدیۆم کلۆراید: SODIUM CHLORIDE

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی٪٠,٩.

**گروپی دەرمان:** Antiseptic

**بەکارهێنان:** بۆ شتن و شۆردنەوەی برینەکان و ڕێڕەوی میز و ئامێرەکانی نەشتەرگەری بەکاردێت.

کاریگەری یە لاوەکیەکان: توندبونی هەناسە. ئازاریگەدە، ڕشانەوە، هێڵنجدان.

**بڕی دەرمان:** بە بڕ و ئەندازەی پێویست بۆ شتنی برین و شتومەکەکان بەکاردێت.

## سۆدیۆم کلۆراید: SODIUM CHLORIDE (NASAL)

**ناوی بازرگانی:** Paetz ,salinex,Ayrasaline

**شێوەی دەرمان:** قەترەی لوت ٠,٦٥.

**گروپی دەرمان:** Antiseptic

**بەکارهێنان:** بۆ شۆردنەوەی لوت بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ٢ تا ٣ قەترە هەر ٢ تا ٣ سەعات بەپێی پێویست بەکاردێت.

## سۆدیۆم کلۆرایدی چاوی: SODIUM CHLORIDE (OPH)

**ناوی بازرگانی:** AK-Nacl

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم و قەترەی چاوی ٢٪ و ٥٪.

**گروپی دەرمان:** Antiseptic

**بەکارهێنان:** دابەزێنەری ئۆدیمای کۆرنیە، دەرمانی یارمەتیدەر بۆ ئاسانکردنی لێکۆڵینەوە و تیڕوانینی چاو.

کاریگەری یە لاوەکیەکان: ڕوشانی چاو، سوتانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ قەترە لە گیراوەکە هەر ٣ تا ٤ سەعات بکرێتە ناو چاوەوە. یان ٠,٢٥ ئینجێك لە مەڵهەم هەر ٣ تا ٤ سەعات لە ناو چاو دابنرێت.

## سۆدیۆم کلۆراید: SODIUM CHLORIDE (SYSTEMIC )

**ناوی بازرگانی:** Slo-salt

**شێوەی دەرمان:** ئینفیوشن ٠,٤٥٪ (٥٠٠ میلیلیتر و ١٠٠٠ میلی لیتر) (نیو سەلاین) و ئینفیوشن ٠,٩٪ (٥٠٠ میلیلیتر و ١٠٠ میلیلیتر و ٥ میلی لیتر) و ئینفیوشن ٥٪ (٥٠٠ میلیلیتر و ٥٠ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antiseptic

**بەکارهێنان:** جێگرەوەی ئاو و ئەلیکترۆلیتەکانی لەش و قەرەبوکەرەوەی ئەلیکترۆلیتەکانی لەشە و زیادکردنی سۆدیۆمی خوێن و بۆ وشکبونەوە و ژەهراویبون بەکاردێت.

کاریگەری یە لاوەکیەکان: سەرئێشە، سەرگێژبوون، ئۆدیما، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، بەرزبوونەوەی سۆدیۆم.

**بڕی دەرمان:** لە هایپۆناتریمیای توند (کەمی سۆدیۆم) ٤٠٠ میلیلیتر لەگیراوەی ٥٪ بەکاردێت. لانی زۆری خێرایی ئینفیوشن ١٠٠ میلی لیترە لەسەعاتێکدا.



## سۆدیۆم سیتریەیت: SODIUM CITRATE

**ناوی بازرگانی:** (Alkemy)-(Akson)-(Alina)

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٤ میلیگرامی و شروبی ٤٥ و ٥٥ و ٥٨ و ٦٠ و ١٥٠ میلیگرامی/٥ میلی لیتر. پاودەری ٥٠ میلیگرامی و ٢,٩ گرامی. گیراوەی ١,٤ و ١,٤٥ گرامی/٥٠٠ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Alkalinizing Agent

**بەکارهێنان:** دژی بەردی میزەڕۆ.

کاریگەری یە لاوەکیەکان: سکچوون، تێکچوونی ڕیخۆڵە، سەرگێژبوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٣ گرام (١٠ تا ٣٠ ) میلی هاوهێزی سیتراتی سۆدیۆم لەگەڵ ١٣٠ تا ٤٠٠ میلیگرام سیتریك ئەسید ٤ جار لە ڕۆژدا پاش لە خواردن. منداڵان ٠,٥ تا ١,٥ گرام سیتراتی سۆدیۆم لەگەڵ ٧٠ تا ٢٠٠ میلیگرام سیتریك ئەسید ٤ جار لەڕۆژێکدا پاش لە خواردن و پێش لە خەوتن.

## سۆدیۆم فلوراید: SODIUM FLUORIDE

**ناوی بازرگانی:** (Ethedent),(Fluor-a-day)

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١,١ میلیگرامی و مەڵهەمی ١٪ و کریمی ٢٪، و جێڵ ٠,٤ ٪ و دەمشۆری ٠,٠٢٥ تا ٠,٠٥٪، و مەعجونی ٠,١ ٪.

**بەکارهێنان:** بۆ شێرپەنجەی لیمف و خرۆکەسپی یەکان و بەرگری لە خراپبوونی ددانەکان بەکاردێت.

کاریگەری یە لاوەکیەکان: زۆربوونی فلۆریدی ددان چونکە دەبێتە هۆی دروستبونی خاڵ لەسەر ددانەکان، دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی کالیسیۆم و صۆدیۆم، لاوازبونی دڵ.

**بڕی دەرمان:** منداڵی ٦ مانگ تا ٣ ساڵ ٢٥٠ مایکرۆگرام، ٣ تا ٦ ساڵ ٥٠٠ مایکرۆگرام، سەروی ٦ ساڵ ١ میلیگرام ڕۆژانە بەکاردێت.

## سۆدیۆم هاینەلۆرۆنەیت: SODIUM HYALURONATE

**ناوی بازرگانی:** Healon

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ میلیگرامی/میلی لیتر، قەترەی چاو ٢ میلیگرامی، ١,٨ میلیگرامی، جێڵی ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** چارەسەری یارمەتیدەر لە نەشتەرگەری چاودا.

کاریگەری یە لاوەکیەکان: هەوکردن، تێکچوونی بیلبیلەی چاو.

**بڕی دەرمان:** بڕی ١ تا ٦ میلیگرام لە ناوی ژووری پێشەوەی چاو بدرێت.

## سۆدیۆم هایپۆکلۆراید: SODIUM HYPOCHLORIDE

**ناوی بازرگانی:** Dakins

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ٠,٥٥.

**گروپی دەرمان:** Antiseptic

**بەکارهێنان:** ئەم دەرمانە پاککەرەوەیە و دژەهەوکردنە.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوەی پێست، ڕوشانی پێست.

**بڕی دەرمان:** بەبڕو ئەندازەی پێویست بەکاردێت.

## سۆدیۆم لاکتەیت: SODIUM LACTATE

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١,٦ مۆلار، ٣.١ گرام/لیتر، ٥.٩ گرام/لیتر، ٠.٣٢ گرام/لیتر، ٤.٨٨ گرام/لیتر.

**گروپی دەرمان:** تفتکەر.

**بەکارهێنان:** بۆ تێکچوونی گورچیلە و کەمی کالسیۆم بەکاردێت.

کاریگەری یە لاوەکیەکان: ناڕێکی توندی لێدانی دڵ تفتێتی خوێن.

**بڕی دەرمان:** لە گەورەکاندا ٣٠ میلی لیتر لەگیراوەی ١.٦ مۆلار/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا و لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## سۆدیۆم نایۆداید: SODIUM IODIDE

**ناوی بازرگانی:** (Novartis)

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠.٣ ٪ و ١.٢٪ w/v.

**گروپی دەرمان:** Antithyroide

**بەکارهێنان:** بۆ ئاوی سپی چاو (ئاوی مرواری) و غودەی دەرەقی و کورت بینی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، زیپکە، ڕژاندنی فرمێسك.

**بڕی دەرمان:** ٢ قەترە ٣ جار لەڕۆژێکدا.

## سۆدیۆم نایترایت: SODIUM NITRITE

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٣٠ میلیگرام/میلی لیتر(١٠ میلی لیتر).

**بەکارهێنان:** دژی ژەهراوی بوون بە سیانایدە.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ڕشانەوە، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلی لیتر لە گیراوەی منالآن ٠,٢ میلی لیتر/کیلۆگرام لە گیراوەی ٣٪ دەرمان بەخێرایی ٢,٥ تا ٥ میلی لیتر لە خولەکێکدا بەڕێگەی دەماری.

## سۆدیۆم ئۆکسیبەیت: SODIUM OXYBATE

**ناوی بازرگانی:** (Xyrem)

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی خۆراکی ٥٠٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (١٨٠ میلی لیتر)

**گروپی دەرمان:** (Inhibitory Neurotransmitter)

**بەکارهێنان**ی: بۆ هێورکردنەوەی سیستەمی ناوەندە کۆئەندامی دەمار و سڕکردن بەکاردەهێنرێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕێ، سەرسوڕان، تێکچوونی خەو، میزەچرکە.

**بڕی دەرمان:** بڕی ٢.٢٥ گرام گیراوەی خۆراکی وەردەگیرێت لەکاتی نوستندا وە ٢.٢٥ گرامی وەردەگیرێت هەموو ٢.٥ تا ٤ سەعاتێك.

## سۆدیۆم فۆسفەیت دایبەیسیك/مۆنۆبەیسیك: SODIUM PHOSPHATE DIBASIC/ MONOBASIC

**شێوەی دەرمان:** پاودەر ی بلوری.

**گروپی دەرمان:** Laxative

**بەکارهێنان:** بۆ نەهێشتن و لابردنی قەبزی و خاڵی کردنی ڕیخۆڵە و بۆ کەمی فۆسفات بەکاردێت.

کاریگەری یە لاوەکیەکان: ژەهراویبون بەفۆسفات، ئازاری سك، هێڵنجدان، ڕشانەوە،لاوازی گورچیلە، کەمبوونەوەی کالیسیۆم.

**بڕی دەرمان:** بۆ قەبزی ٢٠ تا ٤٥ میلی‌لیتر ٣٠ دەقیقە پێش خواردن وەردەگیرێت، کەمبوونەوەی فۆسفات ٠.٣٢ مۆڵ/کیلۆگرام بەڕێگەی IV وەردەگیرێت، مندالآن ١.٥ تا ٢ مۆڵ/کیلۆگرام بەڕێگەی IV.

## سۆدیۆم پۆلیسترین سەلفۆنەیت: SODIUM POLYSTYRENE SULFONATE

**ناوی بازرگانی:** (Resonium)-(Calcium Resonium)-(Kionex)

**شێوەی دەرمان:** سەسپێنشنی ٣٠٠، ٤٥٤ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Potassium Removing Resin

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندنی کالسیۆمی خوێن و میزەچرکە و تێکچوونی پاڵاوتنی میز بەکاردێت.



کاریگەری یە لاوەکیەکان: هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، فێ، گۆڕین( ئی سی جی)، کەمبوونەوەی ئارەزووی خواردن، هەوکردنی بۆری هەوا، ڕوشانی گەدە، قەبزی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥ تا ٣٠ گرام ٣ تا ٤ جار لەڕۆژێکدا، منداڵ ٠.٥ تا ١ گرام /کیلۆگرام.

## سۆدیۆم سالیسیلەت: SODIUM SALICYLATE

**ناوی بازرگانی:** Uracel

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Analgesic

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و تا و ئیلتیهاب و بۆ ئازار و ئیلتیهابی ڕۆماتیزم بەکاردێت.

کاریگەری یە لاوەکیەکان: سوربونەوە، حەساسیەت، زۆرلێدانی دڵ تێکچوونی هەناسە.

**بڕی دەرمان:** بۆ ئازار و تا گەورەکان و منالآنی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ٣٢٥ تا ٦٢٥ میلیگرام هەر ٤ سەعاتێك. منالآنی ٢ تا ١١ ساڵ ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام/ کیلۆگرام لە ٤ تا ٦ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## سۆدیۆم سەلفەیت: SODIUM SULFATE

**شێوەی دەرمان:** پاودەری بلوری.

**گروپی دەرمان:** ڕەوانکەرە.

**بەکارهێنان:** ڕەوانکەرە و دەرمانەکان بەخێرایی لا دەبات.

کاریگەری یە لاوەکیەکان: کرژبونی سك، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠ میلیگرام لە ٢٥٠ میلیگرام ئاودا.

## سۆدیۆم تێترادیسیل سەلفەیت: SODIUM TETRADECYL SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Trombovar

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٪ و ٣٪ (٢ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** دژی ڤاریس.

**بەکارهێنان:** دژی ڤاریس نەخۆشیەکی دەمارییە (بریتی یە لە فراوان بون و گوشادبوونی دەمارەکان سەرەوە بەینی پێست و ئێسك کەبەشێوەی پێچاوپێچ و ئیلتیهاب کردوو دەبینرێت)

کاریگەری یە لاوەکیەکان: هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، ڕەبۆ، تا، پوکانەوەی شانەکانی لەش.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠.٥ تا ٢ میلی لیتر (پەسەند ترین بڕ ١ میلی لیترە) بەدەمارIV. بۆ ڕەقبونی دەمارەکان گیراوەی ١٪ یان ٣٪ بەکاردەهێنرێت.

ن: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کەمێك نەخۆشی



## سۆدیۆم ثایۆسەلفەیت: SODIUM THIOSULFATE

**ناوی بازرگانی:** Hyposulfene

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠ میلیگرام/میلیلیتر (٥٠میلی لیتر).

**گرووپی دەرمان:** Antidote

**بەکارهێنان:** دژی ژەهراویبوون بە سیانید و ئارسنیك و دژی قارچکی مەوزوعی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خرۆشان، تێکچوونی بینین، ورێنە، ئازاری ماسولکە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، زرنگانەوەی گوێ، ئازاری جومگە.

**بڕی دەرمان:** بۆ ژەهراویبوون بە سیانید پاش لە بەکارهێنانی نایترێتی سۆدیۆم ١٢,٥ گرام بەدەمار بەکاردەهێنرێت. ئەگەر پێویست بکات ئەتوانی کە بەیەك بڕ ٦,٢٥ گرام دەرمان دوبارە بکەیتەوە. بۆ ژەهراویبوون بە ئارسنیك ٠,١ گرام لەسەرخۆ لەرێگەی دەماری ڕێی پێ دەدرێت، پاشان ٠,٢ و ٠,٣ و ٠,٤ گرام دەرزی لێ دەدرێت. پاشان بەپێی پێویست یان یەك ڕۆژ لە ناوەندا ٠,٥ گرام ڕێی پێ دەدرێت.

## سۆلیفیناسین: SOLIFENACIN SUCCINATE

**ناوی بازرگانی:** Vesicare

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antispasmodic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کرژبوونی ماسولکەی میزەڵدان و چالاکی زیاد لە ڕادەی میزەڵدان و نیشانەکانی لە میزکردنی دوبارە و بەپەلەمیزکردن و نەتوانینی کۆنترۆڵکردنی میزکردن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، گێژی، خەمۆکی، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، سەرئێشە، هەوکردنی گەروو، تێکچوونی بینین. هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، وشکبوونەوەی چاو، هەوکردنی ڕێڕەوی میز، خوران، پەڵە، شەرا، کۆکە، ئاوبەندی مولولەکان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەروی ١٨ ساڵ ڕۆژانە ٥ میلیگرام. ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار.

## سۆماتۆستاتین: SOMTOSTATIN

**ناوی بازرگانی:** Stilamin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٠,٢٥ میلیگرام (پاودەر).

**گرووپی دەرمان:** Growth hormone

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نیشانەی خوێنبەربوونی تیژی واریسی قوڕگ بەکاردێت. واریس نەخۆشیەکی دەمارییە (بریتی یە لە فراوانبوون و گوشادبوونی دەمارەکانی سەرەوە و بەینی پێست و ئێسك کە بەشێوەی پێچاوپێچ و ئیلتیهابکردوو دەبینرێت).

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ئازاری سك، تا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٢٥ میلیگرام لەسەرخۆ بە دەمار لە ماوەی ٣ تا ٥ خولەکدا ڕێی پێ دەدرێت. پاشان تا کاتی کۆنترۆڵی خوێنبەربوون، بە دۆزی ٠,٢٥ میلیگرام لەسەعاتێکدا بە ئینفیوشنی دەماری بکرێت.

## سۆماترۆپین: SOMATROPIN

**ناوی بازرگانی:** Nutropin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٤ و ١٢ یەکەیی و ٥ میلیگرام/١,٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Growth hormone

**بەکارهێنان:** هۆرمۆنی هاندەری گەشەی مرۆڤە و پەککەوتنی گەشە لەگەڵ پەککەوتنی موزمینی گورچیلە تا کاتی ئەنجامدانی چاندنی گورچیلە لە منداڵاندا و نەخۆشی کەمبوونی بۆماوەیی لە ژناندا لە جیاتی دوو کرۆمۆسۆمی X یەك دانەی هەیە (Turner syndrome) و پەککەوتنی گەشەی منداڵ بەهۆی ناتەواوی دەردانی GH بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی خڕۆکەی سپی خوێن، ئۆدیما، کەمبوونی پایرۆید، ئازاری ماسولکە، بێهێزی، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** بۆ پەککەوتنی گەشە لەگەڵ پەککەوتنی موزمینی گورچیلە تا کاتی ئەنجامدانی چاندنی گورچیلە لە منداڵاندا، منداڵان ٠,٣٣ میلی لیتر/کیلۆگرام لە هەفتەیەکدا ژێرپێستی ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا ڕێی پێ دەدرێت. بۆ ی نەخۆشی (Turner syndrome) هەر هەفتەیەك تا لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٠,٣٧٥ میلیگرام/کیلۆگرام ماسولکەیی یان ژێرپێستی لە بڕی دەرمانی یەکسان، ٣ تا ٧ جار لە هەفتەیەکدا ڕێی پێ دەدرێت.

## سۆرافینیب: SORAFENIB TOSYLATE

**ناوی بازرگانی:** Nexavar

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتووی گورچیلە و جگەر بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** ئەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، قەبزی، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، خوێنبەربوون، هیلاکی، خەمۆکی، لاوازی سێکسی. تا، ئازاری جومگە و ماسولکە، ناتەواوی گورچیلە، پەڵە، سوربونەوە، وشکبوونەوەی پێست، زیپکە، ناتەواوی دڵ کەمی کاری پایرۆید.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەروی ١٨ ساڵ ٤٠٠ میلیگرام رۆژانە ٢ جار.

## سۆربیتۆل: SORBITOL

**ناوی بازرگانی:** Sobax,glucitol

**شێوەی دەرمان:** پاودەری ٥ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Laxative

**بەکارهێنان:** رەوانکەرە و بۆ چارەسەری قەبزی و بۆ خاڵی کردنەوەی رێخۆڵە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، ئازاری سك، تێکچوونی هەرس، غازات، گەورەبوونی سك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ١٢٠ میلی لیتر لە گیراوەی ٪٢٥ تا ٪٣٠ لە رێگەی کۆمەوە بەکاردەهێنرێت. منداڵی ٢ تا ١١ ساڵە ٣٠ تا ٦٠ میلی لیتر لە گیراوەی ٪٢٥ تا ٪٣٠ لە رێگەی کۆمەوە بەکاردەهێنرێت.

## سۆتالۆڵ: SOTALOL HCL

**ناوی بازرگانی:** Betapace, sotacor

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠ و ٨٠ و ١٢٠ و ١٦٠ و ٢٤٠ میلیگرامی و دەرزی ١٥ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiarrhythmic

**بەکارهێنان:** دژی نارێکی لێدانی دڵ و لەرینەوەی گوێچکەڵەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێهێزی، گێژی، هیلاکی، نارێکی لێدانی دڵ لێدانی دڵ ئازاری سنگ، پەککەوتنی دڵ کرژبونی بۆری هەوا، خراپی هەرس، تەنگەنەفەسی، دابەزینی پەستانی خوێن، زیادبوونی شەکری خوێن، زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر.

**بڕی دەرمان:** نارێکی لێدانی دڵی سکوڵەیی ترسناك گەورەکان ٨٠ میلیگرام رۆژانە ٢ جار رێی پێ دەدرێت. ئەگەر پێویست بکات ئەتوانین هەر ٢ تا ٣ رۆژ ١ جار، بڕی دەرمان زیاد بکەین.



## سپارفلۆکساسین: SPARFLOXACIN

**ناوی بازرگانی:** Zagam

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی خۆراکی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری بۆرێچکەکان و سی یەکان و نەخۆشی گولی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سەرئێشە، گێژی، ئازاری سنگ، خەواڵویی، بەگرانی هەناسەدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، ڤێ، ئاوسان، ئازاری جومگە و ماسولکە، هەرسنەکردن، هەستیاربوون بە ڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی تەمەنی سەروی ١٨ ساڵ ٤٠٠ میلیگرام خۆراکی لە سەرەتادا و پاشان ٢٠٠ میلیگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ.

## سپیکتینۆمایسین: SPECTINOMYCIN HCL

**ناوی بازرگانی:** Trobicin,Kempi

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Atibiotic

**بەکارهێنان:** دژی سوزەنەك (نەخۆشی یەکی جنسیە) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری شوێنی دەرزی لێدان، هێڵنجدان، سەرگێژبوون، تا، پەڵە، هێڵنجدان، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** بۆ نەخۆشی سوزەنەك گەورەکان ٢ تا ٤ گرام ماسولکەیی بە ١ بڕی دەرمان. بۆ سوزەنەکی گواستراوە ٢ گرام ڕۆژانە ٢ جار بۆ ماوەی ٣ تا ٧ ڕۆژ. دەرزی لێدانی ماسولکەیی ئەبێت بەشێوەی قوڵ ئەنجام بدرێت.

## سپینۆساد: SPINOSAD

**ناوی بازرگانی:** Natroba

**شێوەی دەرمان:** سەسپێنشنی مەوزوعی ٠,٩٪.

**گروپی دەرمان:** Pediculicide

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری توشبوون بە نەخۆشی ئەسپێی سەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوربونەوەی شوێنی بەکارهێنان، سوربونەوەی چاو.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ١ جار بۆ ماوەی ١٠ خولەك کەمتر لە قژی وشك بدرێت و بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ پاش لە چارەسەری سەرەتایی.



## سپیرامایسین: SPIRAMYCIN

**ناوی بازرگانی:** Rovamycine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Atibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردن بەهۆی زیندەوەرە هەستیارەکانەوە و دژی هەوکردنی توکسوپلازما گۆندی لە ڕێگەی پشیلەوە دەگوازرێتەوە (تۆکسۆپلاسمۆسس) لە ژنانی سکپڕ بۆ بەرگری گواستنەوەی لە دایکەوە بۆ کۆرپەلە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری بەشی سەرەوەی گەدە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تا، بوونی خوێن لەپیسایی، ئازاری سنگ، ناڕێکی لێدانی دڵ، زەردبوونی چاو و پێست، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ تا ٣ گرام ڕۆژانە لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. و دابەش لە ٣ جاردا، منالآن بە کێشی سەروی ٢٠ کیلۆگرام ٥٠ میلیگرام/ کیلۆگرام ڕۆژانە لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## سپایرۆنۆلاکتۆن: SPIRONOLACTONE

**ناوی بازرگانی:** Aldactone

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ میلیگرامی و حەبی ١٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Potassium sparing diuretic

**بەکارهێنان:** میزپێکەرە و دژی پەستانی بەرزی خوێن و کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا (ئۆدیما) پەککەوتنی دڵ و تێکچوونی گورچیلە و جگەر، پۆتاسیۆمی لەش دەپارێزێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سکچوون، هێڵنجدان، کرژبوونی گەدە، فێ، تەمەڵی، سەرگێژبوون، گەورەبوونی مەمك لەپیاوان، پەڵە، شەرا، ڕشانەوە، خەواڵوویی، لاوازی سێکسی، برینی پێست، زیادبوونی پۆتاسیۆمی خوێن، خوێنبەربوونی گەدە، وشکبوونەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆپەستانی بەرزی خوێن ڕۆژانە ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا بەکاردەهێنرێت. گەورەکان بۆ کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا (ئۆدیما) ڕۆژانە ٢٥ تا ٢٠٠ میلیگرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا بەکاردەهێنرێت. منالآن ڕۆژانە ٣,٣ میلیگرام/کیلۆگرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا بەکاردەهێنرێت. بۆ چارەسەری کەمبوونەوەی پۆتاسیۆمی لەش بەهۆی دەرمانە میزپێکەرەکانەوە گەورەکان ڕۆژانە ٢٥ تا ١٠٠ میلیگرام لەڕێگەی خۆراکی بەکاردەهێنرێت.



## ستانۆزۆلۆل: STANOZOLOL

**ناوی بازرگانی:** Winstrol

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەب.

**گروپی دەرمان:** Anabolic steroid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئاوبەندی مولەلەی بۆماوەیی بەکاردێت.

کاریگەری لاوەکی یەکان: سەرئێشە، بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان، ئاوبەندی زیپکە، گۆڕانی دەنگ، خەمۆکی، خەوزڕان، خوێنبەربوون، هەڵوەرینی موو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ جار.

## ستاڤودین: STAVUDINE

**ناوی بازرگانی:** Zerit

**شێوەی دەرمان:** پاودەری خۆراکی (oral powder) ٥ و ١ میلیگرام/ ٥ میلیلیتر و کەپسولی ١٥ و ٢٠ و ٣٠ و ٤٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV بەکاردێت لەگەڵ دژەڤایرۆسەکانی تر.

**کاریگەری لاوەکی:** دابەزینی کێش، سکچوون، تا، سەرئێشە، بێخەوی، تورەبوون، نەخۆشی گورچیلەی موحیگی، نەمانی ئارەزوی خواردن، قەبزی، دڵەڕاوکێ، خەمۆکی، ئازاری سك، کەمخوێنی، پەڵە، هێڵنجدان، هەوکردنی پەنکریاس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی زیاتر لە ٦٠ کیلۆگرام ٤٠ میلیگرام خۆراکی هەر ١٢ سەعاتێك. گەورەکان و منالآنی نێوان ٣٠ تا ٦٠ کیلۆگرام ٣٠ میلیگرام خۆراکی هەر ١٢ سەعاتێك. ساوایان و منالآنی کەمتر لە ٣٠ کیلۆگرام ١ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی هەر ١٢ سەعاتێك. ساوایانی تا تەمەنی ١٣ ڕۆژ ٠,٥ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی هەر ١٢ سەعاتێك.

## ستیبۆگلوکونەیت: STIBOGLUCONATE SODIUM

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antileishmania

**بەکارهێنان:** دژی نەخۆشی مشەخۆری بەهۆی لیشمانیاوە (لیشمانیاسس) نەخۆشی ڕووی پێستی و لینجەپەردە و هەناوی ئەندامەکانی ناوەوەی لەش (جگەر، گورچیلە، سپڵ) بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** بێهێزی، پەڵە، سکچوون، ئازاری ماسولکە، تا، لەرز، ڕشانەوە، هێڵنجدان، خوێنبەربوونی لوت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦٠ میلی لیتر ڕۆژانە ماسولکەیی یان دەماری بۆ ماوەی ٧ تا ١٠ ڕۆژ. ئەگەر پێویست بکات خولی چارەسەر ٢ تا ٣ جاری تر بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ دوبارە دەبێتەوە. منالآن ٠,١ میلی لیتر/کیلۆگرام ڕۆژانە بە ماسولکەیی یان دەماری بۆ ماوەی ٢١ ڕۆژ یان ڕۆژانە ٠,٢٥ میلیگرام/کیلۆگرام بۆ ماوەی ١٤ ڕۆژ ڕێی پێ دەدرێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی منالآن ڕۆژانە ٦ میلی لیترە.

## ستریپتۆکینەیز: STREPTOKINASE

**ناوی بازرگانی:** Streptase

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠٠٠٠ و ٧٥٠٠٠٠ و ١,٥ ملیۆن یەکەیی (ڤیاڵ).

**گروپی دەرمان:** Thrombolytic Enzyme

**بەکارهێنان:** بۆ تواندنەوەی خوێنی کلۆی خوێنهێنەر و خوێنبەرەکان و کردنەوەی مولولەکانی خوێن و بۆ خوێنلێبڕانی تیژی ماسولکەیی دڵ و دژی مەیین و کلۆبوونی خوێنی سی و بۆ چارەسەری مەیینی تیژی خوێنی خوێنبەر و مەیینی خوێنی خوێنهێنەر و مەیینی خوێنی قوڵایی دەمار و مەیینی خوێنی خوێنبەری تەپلەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نارێکی لێدانی سکۆڵەیی دڵ گۆڕانی پەستانی خوێن، ئۆدیمای دەوری چاو، هێڵنجدان، شەرا، خوێنبەربوونی پوکی ددان، تەنگەنەفەسی. کرژبوونی بۆری هەوا، میزی خوێناوی، ڕشانەوە، خوێنبەربوون، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠٠٠٠ یەکەیی بەدەمار ماوەی ٣٠ خولەك پاشان ١٠٠ هەزار یەکە ١٢ تا ٧٢ سەعات. منالآن ٣٠٠٠ یەکە/کیلۆگرام ماوەی ٣٠ خولەك و پاشان ١٠٠٠ تا ٢٠٠٠ یەکە/کیلۆگرام تا ١٢٠ سەعات.

## ستر یپتۆمایسین: STREPTOMYCIN SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Streptocol

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ئینترۆکۆکی پەردەی دڵ و بۆ نەخۆشی حەمەیماڵتا و لەگەڵ دەرمانەکانی تردا دژی نەخۆشی سیل بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، پەڵە، شەرا، تا، هێڵنجدان، سووربونەوە، زیادبوونی حەساسیەت، سکچوون، ژەهراویبوونی گورچیلە و گوێ، بلۆکبوونی دەمار و ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** بۆ نەخۆشی سیل گەورەکان ڕۆژانە ١ گرام ماسولکەیی بۆ ماوەی ٢ تا ٣ مانگ. پاشان ١ گرام هەفتانە ٢ تا ٣ جار ماسولکەیی. منالآن ٢٠ میلیگرام/ کیلۆگرام ڕۆژانە ماسولکەیی لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا ڕێی پێ دەدرێت.



## STREPTOZOCIN :سترێپتۆزۆسین

**ناوی بازرگانی:** Zanosar

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی تەشەنەکردووی پەنکریاس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، سکچوون، ڕشانەوە، هێڵنجدان، گێژی، خەمۆکی، زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر.

**بڕی دەرمان:** ٥٠٠ میلیگرام/مەتردوجا بە دەمار بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ هەر ٦ هەفتە ١ جار تا دروستبوونی کاردانەوەی سودبەخشی داواکراو یان ڕوودانی ژەهراویبوونی دەرمانی.

## STRONTIUM RANELATE :سترونتیۆم ڕانیلەیت

**ناوی بازرگانی:** Protelos

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی گرانیول

**گروپی دەرمان:** Bisphosphonate

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پوکانەوەی ئێسك پاش لە لەحەیزچونەوەی ژنان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، مەیینی خوێنی دەمار، سەرئێشە، نەکزیما، هەوکردنی پێست، ڕشانەوە، ئازاری سك، هەوکردنی دەم، پەڵە، خوران، شەرا، زیادبوونی خرۆکەی سپی، تا.

**بڕی دەرمان:** ٢ گرام ڕۆژانە ١ جار لەئاودا، لەکاتی خەودا گونجاوترە.

## SUCCIMER :سەکسیمیر

**ناوی بازرگانی:** Chemet

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠٠ و ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Chelating agent

**بەکارهێنان:** دژی ژەهراویبوون بە قورقوشم و جیوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، پەڵە، گێژی، تێکچوونی هەرس، تا، مایەسیری.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ تا ٣٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ.

بۆ: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوور کەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان و کۆمەڵێك نەخۆشی



## سەکسینیل کولین کلۆراید: SUCCINYL CHOLINE CHLORIDE

**ناوی بازرگانی:** Anectine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ و ٥٠٠ و ١٠٠٠ میلی‌گرامی (پاودەر) و ١٠٠ میلی‌گرام/ میلی‌لیتر (١٠میلی لیتر)، ٢٠ میلی‌گرام/ میلی لیتر، ١٠٠ میلی‌گرام/ میلی‌لیتر (١٠ میلی‌لیتر، ٢ میلی لیتر).

**گرووپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** شلکەرەوەی پەیکەرە ماسولکەیە، بۆ کەمکردنەوەی کرژبوونی ماسولکە لە تەشەنوج، ئاسان تێخستنی لولە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونیIOP، کەمبوونی لێدانی دڵ، وەستانی هەناسە، نارێکی لێدانی دڵ، زیادبوونی پۆتاسیۆم، وەستانی دڵ، کرژبوونی بۆری هەوا، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** بڕی دەرمان بەپێی کاردانەوە و پێویستی نەخۆش جیاوازی هەیە. گەورەکان بۆ جێبەجێکردنی ماوەکۆتا ٠,٦ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە دەمار لە ماوەی ١٠ تا ٣٠ چرکەدا ڕێی پێ دەدرێت. بۆ جێبەجێکردنی ماوە درێژ ٢,٥ میلی‌لیتر / خولەك لە ڕێگەی ئینفیوشنی دەماری ڕێی پێ دەدرێت. ئەگەر دەرمان بەڕێگەی ماسولکەیی بەکارهات، بڕی دەرمان ٢,٥ تا ٤ میلی‌گرام/کیلۆگرام دەبێت و لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٥٠ میلی‌گرامە. منالآن ١ تا ٢ میلی‌گرام/کیلۆگرام بە دەمار یان ٢,٥ تا ٤ میلی‌گرام/کیلۆگرام ماسولکەیی ڕێی پێ دەدرێت.

## سەکرالفەیت: SUCRALFATE

**ناوی بازرگانی:** Carafate,antepsin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلی‌گرامی و ١ گرامی و پاودەری سەسپێنشن ١ گرام/٥ میلی‌لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antiulcer agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری برینی دوانزەگرێ و گەدە و ڕیخۆڵە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالّویی، قەبزی، خراپی هەرس، سەرگێژبوون، وشکی دەم، سکچوون، ئازاری سك، پەڵە، ئازاری پشت، سەرئێشە، هێڵنجدان، غازات، هەرسەکردن.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری ماوە کۆتای برینی دوانزەگرێ گەورەکان ١ گرام ڕۆژانە ٤ جار ١ سەعات پێش لە خواردن و کاتی خەو ڕێی پێ دەدرێت، منالآن ١ مانگ تا ١٥ ساڵ ٢٥٠ میلی‌گرام تا ١ گرام ڕۆژانە ٤ تا ٦ جار.



## سەفینتانیل: SUFENTANIL CITRATE

**ناوی بازرگانی:** Sufenta

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ مایکرۆگرام/ میلی لیتر/ ٢ میلی‌لیتر، ٥٠ مایکرۆ گرام/ میلی‌لیتر / ٥ میلی لیتر، ٥٠ مایکرۆگرام / میلی‌لیتر / ١٠ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Analgesic

**بەکارهێنان:** دژی ئازاری سڕکەر و دەرمانی یارمەتیدەر لە بەنجی عمومی و بۆ ئازاری کاتی منداڵبوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوون و زیادبوونی لێدانی دڵ بەرزبونەوە و نزمبونەوەی پەستان خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، لەرز، خوران، تەنگەنەفەسی، کرژبوونی بۆری هەوا، کپبوونەوەی ڕێرەوی هەناسە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٨ مایکرۆگرام/کیلۆگرام بە دەمار لەگەڵ ئۆکسجین یان نایترۆکساید، ڕێی پێ دەدرێت.

## سەلکۆنازۆل: SULCONAZOLE NITRATE

**ناوی بازرگانی:** Exelderm

**شێوەی دەرمان:** گیراوە و کرێمی ١٪.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی کاندیدیازی پێستی و کەچەڵی لەش و پێ و بنڕان و پەنجەکانی پێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، کزانەوە، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ١ تا ٢ جار بۆ ماوەی ٣ تا ٤ هەفتە.

## سەلفاسیتاماید: SULFACETAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Plexion,sulfex

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ١٠٪ و ٢٠٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی چاو و برینی کۆرنیە و تەراخوما و چاوئێشە و هەوکردنی ڕوکاری چاو بەهۆی زیندەوەرە هەستیارکانەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، کزانەوەی چاو، پڕخوێنی چاو،، تێکچوونی بینین. زیادبوونی حساسیەت.

**بڕی دەرمان:** ١ تا ٢ قەترە لەگیراوەی ١٠٪ هەر ٢ تا ٣ سەعاتێك لە ماوەی ڕۆژێکدا و بەکەمتر لە ماوەی شەودا لە هەر چاوێك بکرێت.



## سەلفادیازین: SULFADIAZINE

**ناوی بازرگانی:** Adiazine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلی گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی ڕێڕەوی میز و تای ڕۆماتیزمی و تۆکسۆپلاسمۆسس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سووربوونەوە، دروستبوونی کریستاڵ لەمیز، سەرئێشە، تەشەنوج، ڕشانەوە، هێڵنجدان، سکچوون، ئازاری سك، کەمخوێنی، هەوکردنی پێست، میزی خوێناوی، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** هەوکردنی ڕێڕەوی میز گەورەکان ٢ تا ٤ گرام لەسەرەتا، پاشان ٠,٥ تا ١ گرام هەر ٦ سەعاتێك ڕێی پێ دەدرێت. منداڵان ٧٥ میلی گرام/کیلۆگرام لە سەرەتا، پاشان ١٥٠ میلی گرام/کیلۆگرام لە ٤ تا ٦ بڕی دەرمانی دابەشکراودا ڕێی پێ دەدرێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٦ گرامە. تۆکسۆپلاسمۆسس گەورەکان ڕۆژانە ٤ گرام، هەر ٦ سەعاتێك لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، بۆ ماوەی ٣ تا ٤ هەفتە ڕێی پێ دەدرێت. پاش لە ١ هەفتە بەکارناهێنرێت. سەلفادیازین لەگەڵ ٢٥ میلی گرام پریمیامین ڕۆژانە بۆ ماوەی ٣ تا ٤ هەفتە ڕێی پێ دەدرێت. منداڵان ١٠٠ میلی گرام/ کیلۆگرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا و ٦ سەعات بۆ ماوەی ٣ تا ٤ هەفتە ڕێی پێ دەدرێت. سەلفادیازین لەگەڵ ٢ میلی گرام/ کیلۆگرام پریمیامین بۆ ماوەی ٣ تا ٤ هەفتە ڕێی پێ دەدرێت. بۆ پێشگرتن لە تای ڕۆماتیزمی منداڵانی سەرووی ٣٠ کیلۆگرام ڕۆژانە ١ گرام خۆراکی ڕێی پێ دەدرێت. منداڵانی بە کێشی کەمتر لە ٣٠ کیلۆگرام ڕۆژانە ٥٠٠ میلی گرام خۆراکی ڕێی پێ دەدرێت.

## سەلفادوکسین - پی: SULFADOXINE - P

**ناوی بازرگانی:** Fansidar

**شێوەی دەرمان:** حەبی (سەلفادوکسین ٥٠٠ میلی گرام و پریمیامین ٢٥ میلی گرامی).

**گرووپی دەرمان:** Antimalaria

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگرتن لە مەلاریای پلاسمۆدیۆم و ڤالسیپاروم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمخوێنی، کەمی خڕۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، بێخەوی، لەرزین، خەمۆکی، خوران، شەرا، نارێکی لێدانی دڵ، هەوکردنی جگەر، میزی خوێناوی، هەستیاربوون بە تیشکی خۆر، هێڵنجدان، تەشەنوج، دابەزینی پەستانی خوێن، سەرئێشە، سووربوونەوە، تا، نەخۆشیەکان گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥٠٠ میلی گرام سەلفادوکسین و ٧٥ میلی گرام پریمیامین، بەیەك بڕ بەکاردەهێنرێت (٣حەب) ئاسایی ٣ حەب بەیەك بڕ بە عینوانی چارەسەر و ١ حەب لە هەفتەیەکدا یان ٢ حەب لە ١٤ ڕۆژدا بەعینوانی پێشگرتن بەکاردەهێنرێت. منداڵانی زیاتر لە ٢ مانگ ١,٢٥ میلی گرام/کیلۆگرام پریمیامین لەگەڵ ٢٥ میلی گرام سەلفادوکسین بە ١ جار پێی بدرێت.



## سەلفاسالازین : SULFASALAZINE

**ناوی بازرگانی:** Azaline

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی و ئینیما (لەرێی کۆمەوە) ٣٠ میلیگرام میلیلیتر (١٠٠میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Sulphonamide

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کۆلۆنی خۆرەیی سوك و مامناوەند و رۆماتیزم و نەخۆشی کرۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمخوێنی، کەمی خرۆکەی سپی و پەرەی خوێن، تا، ئازار لەکاتی میزکردن، نەمانی ئارەزوی خواردن، خوران، نەخۆشی گورچیلە، سەرئێشە، گێژی، هەرسنەکردن، ئازاری سك، رشانەوە، هێڵنجدان، سکچوون، بوونی کێشە لەکاتی خەو، هەستیاربوون بە تیشکی خۆر، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣ تا ٤ گرام خۆراکی رۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا رێی پێ دەدرێت، بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ١,٥ تا ٢ گرام خۆراکی رۆژانەلە بڕی دەرمانی دابەشکراودا هەر ٦ سەعاتێك. منداڵانی گەورەتر لە ٢ ساڵ رۆژانە ٤٠ تا ٦٠ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی لە ٢ تا ٦ بڕی دەرمانی دابەشکراودا رێی پێ دەدرێت. پاشان رۆژانە ٣٠ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی لە ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا رێی پێ دەدرێت.

## سەلفیسۆکسازول: SULFISOXAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Truxazole

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرام.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی جیاواز بەهۆی بەکتریا و دژی مەلاریا و هەوکردنی پەردەکانی مێشك و میزەڵدان و گورچیلە و حەوز و گوێی ناوەراست و تەراخوما بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، رشانەوە، ئازاری گەدە، تا، سەرئێشە، خرۆشان، غازات، زرنگانەوەی گوێ، تەشەنوج، پەڵە، بلۆقکردنی پێست، میزی خوێناوی، نارێکی لێدانی دڵ ئازاری جومگە، کۆکە، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکاان ٢ تا ٤ گرام هەر ٤ سەعاتێك و دواتر ١ تا ٢ گرام هەر ٤ سەعاتێك. منداڵان گەورەتر لە ١مانگ ٧٥ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ٤ سەعاتێك.

## سەلفینپایرازۆن: SULFINPYRAZONE

**ناوی بازرگانی:** Anturane

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٢٠٠ میلیگرامی.

گروپی دە رمان: Antigout

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگرتن لە نەخۆشی پاشاکان و زیادبوونی یوریك ئەسید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، حەساسیەت، خوێنبەربوونی گەدە و ڕیخۆڵە، خوێنبەربوون، پەککەوتنی تیژی گورچیلە، زیادبونی ئەنزیمەکانی جگەر،

زەردی، هەوکردنی جگەر.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ١٠٠ تا ٢٠٠ میلیگرام ڕۆژانە لەگەڵ خواردن یان (شیر) زیاد دەکرێت بۆ ڕۆژانە ٦٠٠ میلیگرام زیاتر لە ٢ تا٣ هەفتە (بە دەگمەن ڕۆژانە ٨٠٠ میلیگرام) بەردەوا دەبێت تا خەستی ئاوگی یوریك ئەسید ئاسایی ئەبێتەوە پاشان کەمدەکرێتەوە بۆ بڕی دەرمانی پاراستن (بڕی دەرمانی پاراستن نەبێت کەمتر لە ڕۆژانە ٢٠٠ میلیگرام بێت)

## سەلفەر: SULFUR

**ناوی بازرگانی:** AidAcne

**شێوەی دەرمان:** پاودەری بلوری سابوونی ١٠٪ و لۆشنی ١٠٪.

گروپی دە رمان: Antiseptic

**بەکارهێنان:** دژی کەڕوو، زیپکە و چەوری دەردان (نەخۆشی پێستی) و گەڕی وگولی (نەخۆشی پێستی یە).

**بڕی دەرمان:** سابون بۆ زیپکە بەکار دێت. لۆشن بۆ گەڕوگوڵی و چەوری دەردان (کرێش و چەوری زیاد و لە ڕادە بەدەری پێست) بەخەستی ٥٪ تا ١٠٪ هەموو شەوێك تا یەك هەفتە، وە بەشێوەی پێویست دەورەی دەرمان پاش لە ٢ ڕۆژ دوبارە بێتەوە، بۆ نەهێشتن و لابردنی خوران و ئالۆش و چەوری دەردان لۆشنی ٢ تا ٥٪ کە بەڕووی سەردا بماڵن و چەوری بکەن و پاش لەشۆردنی سەر جارێکی تر ئەم کارە ئەنجام بدەن.

## سەلفەر- ئێس: SULFUR -S

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی (شامپۆ).

**گروپی دەرمان:** Antiseptic

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵی وەرینی مووی سەر و خوران و ئالۆش لەگەڵ کرێش و چەوری دەردانی پێستی بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** ١ یان ٢ جار لەهەفتەیەکدا سەری پێشۆن و ٥ خولەك بە سەرەوە بجێتەوە و ئەگەر پێویستبوو دوبارە بێتەوە.



## سولینداك: SULINDAC

**ناوی بازرگانی:** Clinoril

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ١٥٠ و ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهابی جومگەکان و فەقەرەکان و ڕۆماتیزم و نەخۆشی پاشایان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، ئازاری سك، گێژی، خوران. ئۆدیما، قەبزی، نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، کرژبوونی بۆری هەوا، فێ، پەککەوتنی جگەر و گورچیلە، هەوکردنی پەنکریاس، برین و خوێنبەربوونی گەدەو ڕیخۆڵە، پەڵە، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥٠ تا ٢٠٠میلیگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا. لایەنی زۆر ٤٠٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا. بۆ ماوەی ٧ تا ١٤ ڕۆژ.

## سەلپراید: SULPIRIDE

**ناوی بازرگانی:** Sulpor,dolmatil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ و ٤٠٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ٢٠٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی یەکانی تێکچوونی دەروونی و کەرتبوونی ژیری (شیزۆفرینیا) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** پارکینسۆن، دیسکینسیا، خرۆشان، خەواڵویی، بێخەوی، گێژی، تەشەنوج، سەرئێشە، شڵەژان، تێکچوونی هەرس، هەوکردنی جگەر، گیرانی لوت، وشکی دەم، قەبزی، بەگرانی میزکردن، تێکچوونی بینین، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی بێ نوێژی، گۆڕانی ECG، گەورەبوونی مەمك. لاوازی سێکسی، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠٠ تا ٤٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار.

## سوماتریپتان: SUMATRIPTAN

**ناوی بازرگانی:** Imigran

**شێوەی دەرمان:** حەبی٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی و دەرزی ١٢ میلیگرام/میلیلیتر (٠,٥میلی لیتر)و ٦ و ٨ میلیگرام/میلیلیتر و سپرای ٥ و ١٠ و ٢٠ میلیگرام.

**گروپی دەرمان:** ٥HT١ agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سەرئێشەی شەقیقە و کلاستەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، خەوالّویی، هیلاکی، سوربونەوە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کرژبوونی بۆری هەوا، تەنگەنەفەسی، سکچوون، ئارەقکردنەوە، ئازاری سنگ، بەرزبوونەوەی پەستان، تەشەنوج.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١سپرای بۆ هەر کونەلوتێك. ٥ تا ٢٠ میلیگرام، لانی زۆر ٤٠ میلیگرام لەڕۆژێکدا. دەرزی ٦ میلیگرام لەبڕێکدا و لایەنی زۆر ١٢ میلیگرام لە ڕۆژێکدا. حەب ٢٥ تا ١٠٠ میلیگرام خۆراکی و دووبارەکردنەوەی پاش ١ تا ٢ سەعات ئەگەر پێویست بێت.لایەنی زۆری ٣٠٠ میلیگرام لەڕۆژێکدا.

## سونیتینیب: SUNITINIB

**ناوی بازرگانی:** Sutent

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٢,٥ و ٢٥ و ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Protein kinase inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتووی خانەی گورچیلە و بۆ وەرەمی تەشەنەکردووی تان و پۆی گەدە و ڕیخۆڵە پاش لە پەککەوتنی ئیماتینیب بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، سکچوون، قەبزی، نەمانی ئارەزوی خواردن، تێکچوونی تام، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، وشکبوونەوە، ئۆدیما، تەنگەنەفەسی، کۆکە، هیلاکی، سەرئێشە، گێژی، نەخۆشی دەماری موحیگی، ئازاری ماسولکە و جومگە، خوێنبەربوونی لوت، پەڵە، وشکی پێست، تەشەنوج، پەککەوتنی جگەر، هەوکردنی پەنکریاس، بێخەوی، کەمی پایرۆید، میزی پرۆتیناوی، نارێکی لێدانی دڵ کەمبوونی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار بۆ ماوەی ٤ هەفتە.

***

# T

## تاکالسیتۆل: TACALCITOL

**ناوی بازرگانی:** Curatoderm

**شێوەی دەرمان:** لۆشنی ٤ مایکرۆگرام/گرام و مەڵهەمی٤ مایکرۆگرام/گرام.

**گروپی دەرمان:** Vitamin D analogue

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی پلاگ سۆریاسس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، سوربونەوە، هەوکردنی پێست، کزانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و مناڵانی سەروی ١٢ ساڵ، ڕۆژانە ١ جار بەکاردێت. لەکاتی خەودا گونجاوترە. لایەنی زۆر ١٠ گرام مەڵهەم یان ١٠ میلی‌لیتر لۆشن ڕۆژانە. تێبینی کاتێك مەڵهەم و لۆشن پێکەوە بەکاردێن لایەنی زۆری سەرجەمی تاکالسیتۆل ٢٨٠ مایکرۆگرام لە هەر هەفتەیەکدا (بۆ نمونە لۆشن ٣٠ میلی‌لیتر لەگەڵ مەڵهەم ٤٠ گرام).

## تاکرین: TACRINE

**ناوی بازرگانی:** Cognex

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠ و ٢٠ و ٣٠ و ٤٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Alzheimer agent Anti

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شێتی سوك و مامناوەند لە نەخۆشی ئەلزایمەردا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەرسنەکردن، ڕشانەوە، ڤێ، وەستانی دڵ، سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، گێژی، سوربونەوە، ئازاری ماسولکە، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، زیادبوونی ئەنزیمی جگەر، پەککەوتنی جگەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ تا ٤٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٤ جار زیاد دەکرێت بۆ ١٢٠تا ١٦٠ میلی‌گرام لەڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٦ هەفتە.

## تاکرۆلیمەس: TACROLIMUS

**ناوی بازرگانی:** Prograf,protopic

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٠,٥ و ١ و ٥ میلیگرامی و دەرزی ٥ میلیگرامی و مەڵهەمی مەوزوعی ٠,٠١ و ٠,٠٣.

**گروپی دەرمان:** Immunosuppressant

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری ڕەفزکردنی ئەندامێك پاش لە چاندن و بۆ چارەسەری نەخۆشی پێستی ئەکزیما (بیرۆ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، لەرزین، پەڵە، ئۆدیما، تەنگەنەفەسی، قەبزی، زیادبوونی شەکری خوێن، خوران، ڕشانەوە، کەمی پەڕەی خوێن، سکچوون، ئازاری سك، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,١ تا ٠,٠٥ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە بەڕێگەی IV ئینفیوشن لانی کەم ٦ سەعات دوای چاندن ڕێی پێ دەدرێت. ئەم دەرمانە بۆ ماوەی ٢ تا ٣ ڕۆژ بەردەوام دەدرێت، پاشان ڕۆژانە ٠,٣ تا ٠,١٥ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا ڕێی پێ دەدرێت، مەڵهەم بۆ ئەکزیما ڕۆژانە ٢ جار.

## تادالافیل: TADALAFIL

**ناوی بازرگانی:** Cialis

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ و ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anti impotence

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری لە پیاوەتی کەوتن و لاوازی کاری سێکسی و بەرزبوونەوەی پەستانی سی یە خوێنبەر و گەورەبوونی بێوەی پرۆستات (BPH) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تێکچوونی بیرو هۆش، سکچوون، تێکچوونی گەدە، ئازاری ماسولکە، ئازاری پشت، پژمین، برینی گەروو، سووربوونەوە، ڤ، نارێکی لێدانی دڵ، ئازاری سنگ، کەمبوونەوەی بینین و بیستن، شەرا، گیرانی لوت.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری لە پیاوەتی کەوتن گەورەکان ١٠ میلیگرام خۆراکی نیو سەعات پێش لە ئەنجامدانی کاری سێکسی ڕۆژانە ١ جار، بڕی (٥ تا ٢٠ میلیگرام). بۆ بەرزبوونەوەی پەستانی سی یە خوێنبەر ٤٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار. بۆ گەورەبوونی بێوەی پرۆستات (BPH) ٥ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار.

## تافلوپرۆست: TAFLUPROST

**ناوی بازرگانی:** Zioptan

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,٠٠١٥٪.

**گرووپی دەرمان:** Prostaglandin

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبوونەوەی پەستانی چاو و بەرزبوونەوەی پەستانی ناوەوەی چاو لە گلوکۆما(ئاوی ڕەشی چاو)ی گۆشەی کراوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، خورانی چاو، ڕوشانی چاو، زۆربوونی خوێن لە چاودا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ قەترە ڕۆژانە ١ جار لە ئێوارانda.

## تاموکسیفێن: TAMOXIFEN

**ناوی بازرگانی:** Nolvadex,Tamofen

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ١٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antioestrogen

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی مەمك و ئازاری مەمك (ماستاڵجیا) و دەرمانی یارمەتیدەر لە شێرپەنجەی مەمك و بۆ چارەسەری شێرپەنجەی مەمك پاش لە لەحەیزچوونەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، خەمۆکی، تێکچوونی بینین، کەمبوونی بینین، هێڵنجدان، خوێنبەربوونی زایەندی ژنان، زیادبوونی کالسیۆم، سووربونەوە، خوران، تێکچوونی هەرس، تێکچوونی شلەی لەش، سەرئێشە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** بۆ هاندانی دروستبوونی هێلکە گەورەکان ٥ تا ٤٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار خۆراکی بۆ ماوەی ٤ ڕۆژ. دەرمانی یارمەتیدەر لە شێرپەنجەی مەمك گەورەکان ١٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار لایەنی زۆر بۆ ماوەی ٢ ساڵ.

## تامسولوسین: TAMSULOSIN

**ناوی بازرگانی:** Flomax

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٠,٤ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Alpha blocker

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری گەورەبوونی بێوەی پرۆستات (BPH) بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێخەوی، ئازاری سنگ، بێهۆشی، هەوکردنی گەروو ولوت و جیوب، هێڵنجدان، ڕشانەوە، زیادبوونی کۆکە، پەڵە، حەساسیەت، شەرا، نەخۆشی دەم و ددان، کەمبوونی ئارەزوی سێکسی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان (پیاو) ٠,٤ میلیگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا، ٣٠ خولەك دوای هەر ژەمێکی خۆراکی تایبەت, ئەگەر کاردانەوەی نەبوو پاش لە ٢ تا ٤ هەفتە، دۆزەکەی زیاد دەکەین بۆ ٠,٨ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە.

## تازارۆتین: TAZAROTENE

**ناوی بازرگانی:** Tazorac

**شێوەی دەرمان:** جێڵ و کرێمی مەوزوعی ٠,٠٥ ٪ و ٠,١ ٪.

**گروپی دەرمان:** Keratolytic,retinoid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیپکە و پلاگ سۆریاسس تا ١٠٪ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** وشکبوونەوەی پێست، سوربونەوە، خوران، ڕوشانی پێست، ئاوبەندی، پەڵە، ئازار و ئیلتیهابی پێست، بیرۆ، خوێنبەربوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان جێڵ یان کرێم هەموو شەوێك بۆ ئەو شوێنەی مەبەستمانە بەکاری دێنین.

## تیگافور و یۆراسیل: TEGAFUR & URACIL

**ناوی بازرگانی:** Uftoral

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی (١٠٠ میلیگرام تیگافور و ٢٢٤ میلیگرام یۆراسیل).

**گروپی دەرمان:** Antimetabolite

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی تەشەنەکردووی کۆڵۆن و کۆم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، هەوکردنی ناودەم، هەڵوەرینی موو، زیادبوونی یوریك ئەسید، زیادبوونی پۆتاسیۆم و فۆسفات، کەمبوونی کالسیۆم، تێکچوونی گورچیلە، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان تیگافور ٣٠٠ میلیگرام/مەتردوجا لەگەڵ یۆراسیل ٦٧٢ میلیگرام/مەتردوجا ڕۆژانە لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا بۆ ماوەی ٢٨ ڕۆژ.

## تیگاسیرۆد: TEGASEROD

**ناوی بازرگانی:** Zelnorm

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ و ٦ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Gastrointestinal agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری (IBS) و قەبزی موزمین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، خەمۆکی، نارێکی لێدانی دڵ، ماندووبوون، ئازاری سنگ، دابەزینی پەستان، زیادلێدانی دڵ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، غازات، ئازاری سک، ڕەبۆ، ئازار، زیادبوونی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** ژنانی ٥٥ ساڵ یان کەمتر ٦ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا، پێش خواردن بۆ ماوەی ٤ تا ٦ هەفتە.

## تیلاپریڤیر: TELAPREVIR

**ناوی بازرگانی:** Incivek

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٧٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** لەگەڵ دەرمانی تردا بۆ چارەسەری هیپاتیتی C موزمین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، پەڵە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، مایەسیری، هیلاکبوون، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٧٥٠ میلیگرام ٣ جار لە ڕۆژێکدا. لەگەڵ خواردندا.

## تیلاڤانسین: TELAVANCIN

**ناوی بازرگانی:** Vibatin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥٠ میلیگرامی و ٧٥٠ میلیگرامی IV.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی توندی بەکتریایی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری گەدە، خوران، نەمانی ئارەزوی خواردن، لەرزین، سەرئێشە، بێخەوی، گێژی، سووربونەوە، تامی ناخۆشی ناودەم، ئاوسان، زیادبوونی کێش.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام بەدەمار IV بۆ زیاتر لە ٦٠ خولەك ١ جار هەموو ٢٤ سەعاتێك بۆ ماوەی ٧ تا ١٤ ڕۆژ.



## تێلبیڤیودین: TELBIVUDINE

**ناوی بازرگانی:** Tyzeka,sebivo

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هیپاتیق B موزمین (ئیلتیهابی جگەر) لەگەورەکاندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە، خەوزڕان، گێژی، هیلاکبوون، ئازاری سك، ئازاری ماسولکە، ئازاری جومگە و پشت، سەرئێشە، کۆکە، برینی گەروو، نەمانی ئارەزوی خواردن، سوتانەوە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی هەناسە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی سەروی ١٦ ساڵ ٦٠٠ میلی‌گرام ١ جار لە ڕۆژێکدا.

## تیلیثرۆمایسین: TELITHROMYCIN

**ناوی بازرگانی:** Ketek

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠٠ میلی‌گرامی و ٤٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی سی یەکان و گیرفانۆکەکان (جیوب) و هەوکردنی موزمینی بۆرێچکەکانی هەوا و هەوکردنی گەروو و لەوزەتێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوران، سەرئێشە، گێژی، ئازاری ماسولکە، بێهێزی، نارێکی لێدانی دڵ، سکچوون، ئاوسان، تێکچوونی جگەر، ئازاری گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، زەردی، وڕێنە، ئازاری جومگە، هەوکردنی پەنکریاس، دووبینی، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، هەوکردنی جگەر، پەڵە، شەرا، دڵەکوتێ، تورەیی، هەوکردنی دەم، قەبزی، زیادبوونی ئیزنۆفیل بێخەوی، خەواڵویی، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٨٠٠ میلی‌گرام ١ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ بۆ هەوکردنی بەکتریایی گیرفانۆکەکان (جیوب) هەوکردنی گەروو و لەوزەتێن و بۆرێچکەکان. بۆ هەوکردنی بەکتریایی سی یەکان بۆ ماوەی ٧ تا ١٠ ڕۆژ.

## تێلمیسارتان: TELMISARTAN

**ناوی بازرگانی:** Micardis

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ و ٤٠ و ٨٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Angiotensin II antagonist



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، سەرئێشە، ڕشانەوە، دڵەڕاوکێ، سکچوون، تێکچوونی هەرس، نەمانی ئارەزوی خواردن، کۆکە، ئازاری ماسولکە، هەوکردنی گەروو و جیوب، ئازاری جومگە، ئازاری پشت، کرژبوونی قاچ، وشکی دەم، بیرۆ، قەلەقی، ئارەقکردنەوە، تێکچوونی هاوسەنگی، ناڕێکی لێدانی دڵ، تەنگەنەفەسی، بێخەوی، خەمۆکی، تێکچوونی خوێن، زیادبوونی یوریك ئەسید، پەڵە، خوران، بێهۆشی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠ تا ٨٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار.

## تیمازیپام: TEMAZEPAM

**ناوی بازرگانی:** Restoril

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٧,٥ و ١٥ و٢٢,٥ و ٣٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Benzodiazepines

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری دڵەڕاوکێ و قەلەقی و ترس و بۆ چارەسەری ماوەکۆتای بێخەوی و بۆ چارەسەری سەرەتایی پێش لە نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێهێزی، گێژی، خەواڵویی، کەمی ئارەزوی خواردن، سکچوون، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٧,٥ تا ٣٠ میلیگرام پێش لە خەوتن بەکاردەهێنرێت. بۆ پیرەکان ٧,٥ میلیگرام پێش لە خەوتن ڕێی پێ دەدرێت.

## تیمۆسیلین: TEMOCILLIN

**ناوی بازرگانی:** Negaban

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ١ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibacterial

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سێپتیسیمیا (هەوکردنی خوێن) و هەوکردنی میزەڕۆ و بەشی خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسە بەهۆی بەکتریای گرامنێگەتیڤی ئامادەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** شەرا، تا، ئازاری جومگە، پەڵە، تەشەنوج، کەمخوێنی، کەمی خڕۆکەی سپی و پەرەی خوێن، سکچوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ، بەدەرزی ماسولکەیی یان دەمار زیاتر لە ٣ تا ٤ خولەك یان بە ئینفیوشنی دەماری ١ تا ٢ گرام هەموو ١٢ سەعاتێك.



## تیمۆزۆلۆماید: TEMOZOLOMIDE

**ناوی بازرگانی:** Temodar

**شێوەی دەرمان:** دەرزی IV ١٠٠ میلی‌گرامی و کەپسولی ٥ و ٢٠ و ١٠٠ و ١٤٠ و ١٨٠ و ٢٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Alkylating agent

**بەکارهێنان:** لەگەڵ چارەسەری تیشکیدا بۆ چارەسەری هەندێ جۆری شێرپەنجەی مێشکی بەکاردێت وەك (ئەستڕۆسایتۆما و گلایۆبلاستۆما ).

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، پەڵە، قژ، هیلاکی، سوربونەوە، خەوزڕان، سکچوون، قەبزی، هەڵوەرینی موو، تا، لەرز، کۆکەی وشك، کەمبوونی کێش، ئارەقکردنەوەی شەوانە، خوێنبەربوون، برینی گەروو، قوتدانی بە ئازار، کەمبوونی خڕۆکەی سپی و پەرەی خوێن، خوران، دووبینی، هەوکردنی میزەڕۆ، ئازاری سك، کەمخوێنی، خەمۆکی، دڵەڕاوکێ، گێژی، فەرامۆشی، تەشەنوج.

**بڕی دەرمان:** بۆ ئەستڕۆسایتۆما گەورەکان ڕێکخستنی بڕی دەرمانی خۆراکی بە پێی بنچینەی کەمبوونی کتوپڕی نیوترۆفیلەکان و ژمارەی پەرەکانی خوێن دەبێت و بە شێوەی ١٥٠ میلی‌گرام/مەتردوجا ڕۆژانەیە و کە لە ٥ ڕۆژدا دوبارە دەکرێتەوە، خولی چارەسەر ٢٨ ڕۆژی دەبێت. بۆ گلایۆبلاستۆما گەورەکان ٧٥ میلی‌گرام/مەتردوجا ڕۆژانە بەشێوەی خۆراکی لە ماوەی ٤٢ لەگەڵ چارەسەری تیشکی مەوزوعی پاش لە چارەسەری پاراستن دەست پێدەکات کە بە درێژایی ٦ خول ئەنجام دەدرێت.

## تێمسیرۆلیمەس: TEMSIROLIMUS

**ناوی بازرگانی:** Torisel

**شێوەی دەرمان:** دەرزی IV ٢٥ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی گورچیلە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، بێخەوی، پەڵە، خوێنبەربوون، تا، ئازاری توندی گەدە، بوونی خوێن لە پیسایدا، ئازاری سنگ، کۆکە، سوربونەوە، تێکچوونی گورچیلە، هەوکردنی سی یەکان، ئاوسان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥ میلی‌گرام بە IV ئینفیوشن زیاتر لە ٣٠ تا ٦٠ خولەکدا ١ جار لە ماوەی هەفتەیەکدا.

## تینیکتیپلەیس: TENECTEPLASE

**ناوی بازرگانی:** Tnkase

**شێوەی دەرمان:** دەرزی IV ٥٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Thrombolytic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خوێن لێبڕانی توندی ماسولکەیی دڵ (AMI) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوێنبەربوون، نارێکی لێدانی دڵ، ئۆدیمای سی، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، تا، نازاری پشت، تەشەنوج، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان کەمتر لە ٦٠ کیلۆگرام ٣٠ میلی گرام، کێشی ٦٠ تا ٦٩ کیلۆگرام ٣٥ میلی گرام، کێشی ٧٠ تا٧٩ کیلۆگرام ٤٠ میلی گرام، کێشی ٨٠ تا ٨٩ کیلۆگرام ٤٥ میلی گرام، کێشی ٩٠ کیلۆگرام و زیاتر ٥٠ میلی گرام پێی دەدرێت بە IVبۆلۆس بۆ زیاتر ٥ چرکە.

## تینیپۆساید: TENIPOSIDE

**ناوی بازرگانی:** Vumon

**شێوەی دەرمان:** دەرزی IV ١٠ میلی گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن (لیمفۆبلاستیك لیوکیمیا) و ناهوجکین و شێرپەنجەی سی بەکاردێت.

کاریگەری لاوەکی یەکان: هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن، کەمبوونەوەی پەڕەی خوێن، هەوکردن، هەڵوەرینی موو، تا، لەرز، خوێنبەربوون، بەگرانی هەناسەدان، ڕەشبوونی پیسایی، زیادبوونی یوریك ئەسید.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ ناهوجکین بەتەنها ٣٠ میلی گرام/مەتردوجا IV، ڕۆژانە بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ یان هەموو ٥ ڕۆژێك، یان ٥٠ تا ١٠٠ میلی گرام/مەتردوجا IV، هەفتانە ١ جار، لەگەڵ دەرمانە دژە شێرپەنجەکانی تردا ٦٠ تا ٧٠ میلی گرام/مەتردوجا IV، هەفتانە ١ جار، بۆ شێرپەنجەی سی بەتەنها ٦٠ میلی گرام/مەتردوجا IV، بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ هەموو ٣ هەفتەیەك بەکاردەهێنرێت. منالآن ١٦٥ میلی گرام/مەتردوجا IV، لەگەڵ سیتارابین ٣٠٠ میلی گرام/مەتردوجا IV،هەفتانە ٢ جار بۆ ٨ تا٩ بڕی دەرمان. یان ٢٥٠ میلی گرام/مەتردوجا IV،لەگەڵ ڤینکریستین ١,٥ میلی گرام/مەتردوجاIV ، هەفتانە بۆماوەی ٤ تا ٨ هەفتە، لەگەڵ پریدنیزۆن ٤٠ میلی گرام/مەتر دوجا بە شێوەی خۆراکی بۆ ماوەی ٤ هەفتە.

ن: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## تینۆفۆڤیر: TENOFOVIR

**ناوی بازرگانی:** Viread

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی HIV بەکاردێت لەگەڵ دەرمانە دژەڤایرۆسەکانی تر، بۆ هیپاتیتی موزمینی B بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ئازاری سک، هەوکردنی پەنکریاس، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، غازات، کەمبوونی نیوترۆفیل، زیادبوونی شەکری خوێن، پەککەوتنی گورچیلە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠٠ میلی گرام خۆراکی ١ جار لەڕۆژێکدا.

## تینۆکسیکام: TENOXICAM

**ناوی بازرگانی:** Mobiflex

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ میلی گرامی و ڤیالی ٢٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهاب و بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهاب لە نەخۆشی ڕۆماتیزم و نەخۆشی یەکانی تری پەیکەرەماسولکە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوێنبەربوون و برینی گەدە و ڕیخۆڵە، سکچوون، سەرئێشە، پەڵە، گێژی، کرژبوونی بۆری هەوا، تورەیی، بێخەوی، تێکچوونی هاوسەنگی، میزی خویناوی، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، خەمۆکی، خەواڵویی، پەککەوتنی دڵ هەستیاربوون بە ڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی خۆراکی، نەخۆشی ڕۆماتیزم، گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ، ڕۆژانە ٢٠ میلی گرام. بۆ نەخۆشی تیژی پەیکەرەماسولکە، گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ، ڕۆژانە ٢٠ میلی گرام بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ، لایەنی زۆری ماوەی چارەسەر ١٤ ڕۆژە، (چارەسەر بە دەرزی دەمار یان ماسولکە دەگرێتەوە). بە ڕێگەی دەرزی دەمار یان ماسولکە، گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ، چارەسەری سەرەتایی بۆ ماوەی ١ تا ٢ ڕۆژە ئەگەر دەرمان پێدان بەشێوەی خۆراکی نەگونجێت، ٢٠ ڕۆژانە ١ جار.



## تیرازۆسین: TERAZOSIN

**ناوی بازرگانی:** Hytrin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ و ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Alpha١ adrinergic blocker

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێنی سوك و مامناوەند و بۆ چارەسەری BPH بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** دابەزینی پەستانی خوێن، زیادلێدانی دڵ هێڵنجدان، ئازاری ماسولكە. تەنگەنەفەسی، لێدانی دڵ توڕەیی، تێكچوونی بینین، گیرانی لوت، كەمبوونی پەڕەی خوێن.

**بڕی دەرمان:** پەستانی بەرزی خوێنی سوك و مامناوەند گەورەكان لەسەرەتا ١ میلیگرام پێش خەوتن ڕێی پێ دەدرێت، بڕی دەرمانی ئاسایی ١ تا ٥ میلیگرام ڕۆژانە ١ تا ٢ جارە. بۆ گەورەبوونی بێوەی پرۆستات (BPH) ١ میلیگرام پێش خەوتن ڕێی پێ دەدرێت، بەپێی پێویست ئەتوانی كە بڕی دەرمان بۆ ٢ تا ١٠ میلیگرام ڕۆژانە زیاد بكەیت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢٠ تا ٤٠ میلیگرام لە ڕۆژێكدا.

## تیربینافین: TERBINAFINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Lamisil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ میلیگرامی و كرێمی مەوزوعی ١٪.

**گرووپی دەرمان:** Antifungal

**بەكارهێنان:** دژی هەوكردنی كەڕوویی و بۆ چارەسەری هەوكردنی كەڕوویی نینۆك و كەچەڵی لەش و بن ڕان و پێ و كەڕووی بەینی پەنجەكانی پێ بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** سەرئێشە، غازات، هێڵنجدان، سكچوون، ڕشانەوە، خوران، وشكی پێست، سوتانەوە، ڕوشانی پێست، خرابی هەرس، زیادبوونی ئەنزیمەكانی جگەر، تێكچوونی هەستی تامكردن.

**بڕی دەرمان:** هەوكردنی كەڕویی نینۆك گەورەكان و منداڵانی سەروی ١٢ ساڵ ڕۆژانە ٢٥٠ میلیگرام بۆ ماوەی ٦ هەفتە بۆ نینۆكی پەنجەكان و بۆ چارەسەری نینۆكی پەنجەگەورەی پێ ڕۆژانە ٢٥٠ میلیگرام بۆ ماوەی ١٢ هەفتە ڕێی پێ دەدرێت. هەوكردنی كەڕوویی ناولەپی پێ و پێی وەرزشكاران و هەوكردنی كەڕوویی نێوان پەنجەكان گەورەكان و منداڵانی سەروی ١٢ ساڵ لە هەوكردنی كەڕوویی نێوان پەنجەكان، ڕۆژانە ٢ جار كرێم لە ناوچەی توشبوو دەماڵرێت و تا كاتی چاكبوونەوەی نیشانەكانی بەردەوامی دەبێت. هەوكردنی كەڕوویی ناولەپی پێ بڕێك لە كرێم ڕۆژانە ١ تا ٢ جار ڕووی ناوچەی توشبووی پێ دەماڵرێت و تا كاتی چاكبوونەوەی نیشانەكانی بەردەوامی دەبێت. ئاسایی چاكبوونەوەی نیشانەكانی بە ماوەی ٧ ڕۆژ دەردەكەوێت. نابێت خولی چارەسەر زیاتر لە ٤ هەفتە درێژەبكێشێت.

ن: بەرز كردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێكی گرنگە بۆ دوور كەوتنەوە لە بەكارهێنانی دەرمان بۆ كۆمەڵێك نەخۆشی



## تێربیوتالین: TERBUTALINE

**ناوی بازرگانی:** Brethine,Bricanyl

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ میلیگرامی و دەرزی ٠,٥ میلیگرامی و گیراوەی پرژاندن.

**گرووپی دەرمان:** Broncodilator

**بەکارهێنان:** بۆ فراوانکردنی بۆری هەوا و بۆ چارەسەری ڕەبۆ و هەوکردنی بۆریچکەکانی هەوا و بۆ چارەسەری تەسکبوونەوەی بۆری و بۆریچکەکانی هەوا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تورەیی، سەرگێژبوون، خەواڵویی، بێخەوی، لەرزین، دڵەڕاوکێ، ڕشانەوە، هێڵنجدان، لێدانی دڵ گۆڕانی EKG، زرنگانەوەی گوێ، نارێکی لێدانی دڵ کرژبوونی بۆریچکەکان، زیادبوونی لێدانی دڵ خراپی هەرس، ئازاری سنگ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری کرژبوونی بۆری هەوا و ڕەبۆ گەورەکان خۆراکی ٢,٥ تا ٥ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ جار، بۆ ماوەی ٦ سەعات ڕێی پێدەدرێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ١٥ میلیگرامە. یان ٢ ئیستینشاقی هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك، ژێر پێستی ٠,٢٥ میلیگرام و دوبارەی ئەوبرە پاش لە ٣٠ خولەك و منداڵان خۆراکی ٠,٠٥ تا ٠,١٥ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ جار.لایەنی زۆر ٥ میلیگرامە لە ٢٤ سەعاتدا. بۆ منداڵبوونی پێشوەخت ٢,٥ تا ١٠ میلیگرام/خولەك بەدەمار. یان ٢,٥ تا ٥ میلیگرام خۆراکی هەموو ٤ تا ٦ سەعاتێك.

## تێرکۆنازۆل: TERCONAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Terazol

**شێوەی دەرمان:** کرێمی زایەندی ژنان ٠,٤ ٪ و ٠,٨ ٪ میلیگرامی و شافی ژنانە ٨٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antifunal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی کاندیدای زایەندی ژنان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، نارێکی بێ نوێژی، ئازاری سك، تا، لەرز، هەڵامەت، خوران و سوتانەوە و ڕوشانی زایەندی ژنان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ ئەپلیکاتوری پڕ لە کرێمی ٠,٤ ٪ لەکاتی خەودا بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ، ١ ئەپلیکاتوری پڕ لە کرێمی ٠,٨ ٪ لەکاتی خەودا بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ لەکاتی خەودا. ١ شاف لەکاتی خەودا لە ڕێگەی زایەندی ژنان بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ.

## تێرپاراتاید: TERPARATIDE

**ناوی بازرگانی:** Forteo

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ژێرپێستی ٢٥٠ مایکرۆگرام/میلیلیتر (٣میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antiosteoporosis

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پوکانەوەی ئێسك پاش لە لەحەیزچونەوەی ژنان و لە پیاواندا لەکاتی زیادبوونی مەترسی شکان و بۆ چارەسەری پوکانەوەی ئێسکی کۆرتیکۆستیرۆیدی بەکاردێت.

کاریگەری لاوەکی یەکان: سەرئێشە، گێژی، بێخەوی، ئازاری سنگ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، سکچوون، ڕشانەوە، هێڵنجدان، کۆکە، پەڵە، خەمۆکی، هەوکردنی جیوب و گەروو، تێکچوونی گەدە، بێهۆشی، سەرگێژبوون، زیادبوونی کالسیۆم، تەنگەنەفەسی، هەوکردنی سی، ئارەقکردنەوە، ئازاری پشت و مل، تێکچوونی ددان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠ مایکرۆگرام ژێرپێستی SC لە ڕان یان دیواری سك ١ جار لە ڕۆژێکدا.

## تیسامۆرێلین: TESAMORELIN

**ناوی بازرگانی:** Egrifta

**شێوەی دەرمان:** دەرزی SC ١ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** GHRH analogue

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری چەوری زیادەی دەوروبەری گەدە بەهۆی **بەکارهێنانی** هەندێ دەرمانی HIV یەوە لەگەڵ هەر نائاساییەك لە زیندەچالاکی یان نیشتنی چەوری دا (لیپۆدیسترۆفی) بەکاردێت.

کاریگەری لاوەکی یەکان: هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی گەدە، ئازار، سووربونەوە، خوران، ئارەقکردنەوە بەشەودا، ئاوسان، خوێنبەربوون، ئازاری ماسولکە، ڕوشان، پەڵە، خەوزڕان، بێخەوی، زۆربوونی شەکری خوێن، زیادبوونی میزکردن، تێکچوونی بینین، وشکبوونەوەی پێست، کەمبوونی کێش، زۆرمیزکردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ میلیگرام ژێرپێستی SC ١جار لەڕۆژێکدا.

## تێستۆلاکتۆن: TESTOLACTONE

**ناوی بازرگانی:** Teslac

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی خۆراکی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic agent



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەندێ جۆری شێرپەنجەی مەمك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری ئێسك، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئاوبەندی، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، سوربونەوەی پێست، خوێنبەربوونی زایەندی ژنان، بەگرانی هەناسەدان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی ڕۆژانە ٤ جار.

## تیستۆستیرۆن: TESTOSTERONE

**ناوی بازرگانی:** Andryl,Andriol

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠٠ و ٢٥٠ میلیگرامی وکەپسولی ٤٠ میلیگرامی و گیراوەی مەوزوعی ٣٠ میلیگرام/١,٥میلیلیتر و جێڵی مەوزوعی ١٪.

**گروپی دەرمان:** Androgen replacement

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمی ئارەزو و مەیلی جنسی پیاوان (هایپۆگنادیسم) و دواکەوتنی باڵغبوون و شێرپەنجەی مەمك و کەمی ئەندرۆجین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گەورەبوونی مەمك، ڕشانەوە، زیپکە، تێکچوونی هەرس، هێڵنجدان، سکچوون، قەبزی، زیادبوونی کێش، ئۆدیما، هەوکردنی زایەندی ژنان، هەوکردنی جگەر، دڵەڕاوکێ، ئارەقکردنەوە، زۆربوونی موو، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، گێژی، بێخەوی، خاوی، هەڵوەرینی موو، خوران، وشکی پێست.

**بڕی دەرمان:** بۆ هایپۆگنادیسم گەورەکان ماسولکەیی ٥٠ تا ٤٠٠ میلیگرام هەر ٢ تا ٤ هەفتەیەك ڕێی پێدەدرێت. بۆ دواکەوتنی باڵغبوون ٢٥ تا ٤٠٠ میلیگرام ماسولکەیی هەموو ٢ تا ٤ هەفتەیەك لایەنی زۆر بۆماوەی ٦ مانگ ڕێی پێ دەدرێت. لە شێرپەنجەی مەمك ژنان ٢٠٠ تا ٤٠٠ میلیگرام هەموو ٢ تا ٤ هەفتەیەك ١ جار، بۆ کەمی ئەندرۆجین ٥٠ تا ٤٠٠ میلیگرام ماسولکەیی هەر ٢ تا ٤ هەفتەیەك بۆ ماوەی ٤ تا ٦ مانگ.

## تێترابینازین: TETRABENAZINE

**ناوی بازرگانی:** Xenazine,nitoman

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٢,٥ و ٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Monoamine Depletor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی هونتینگتۆنی کۆریا (جوڵەی بێ کۆنترۆڵی ماسولکەیی ) و تێکچوونی جوڵە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی یەکان:** هێڵنجدان، هیلاکبون، بێخەوی، قوتدانی بە ئازار، پارکینسۆن، خەواڵویی، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێرەوی هەناسە، خەمۆکی، خەواڵویی، ئاوسان، پژمین، برینی گەروو، تا، ئارەقکردنەوە، گێژی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٢,٥ تا ٢٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ تا٣ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٢٠٠ میلیگرامە.



## تیتراکائین (چاوی): TETRACAINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Ametop

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,٥٪.

**گرووپی دەرمان:** Anesthatic

**بەکارهێنان:** بێهۆشکەری کاریگەرکۆتا بۆ لێکۆڵینەوەی پزیشکی چاو و بۆ کردنە دەرەوەی تەنی دەرەکی و هێنانەدەرەوەی تەقەڵی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئیلتیهابی کۆرنیەی چاو، لێڵبوونی کۆرنیە، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان هەرجارەو ١ تا ٢ قەترە دەکرێتە ناو چاوەوە.

## تیتراکائین: TETRACAINE HCL

**ناوی بازرگانی:** HClPantacaine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٪.

**گرووپی دەرمان:** Anesthatic

**بەکارهێنان:** بۆ بێهۆشکەری مەوزوعی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، توڕەیی، گێژی، تێکچوونی بینین، لەرزین، خەواڵویی، تەشەنوج، وەستانی دڵ و هەناسە، بچوکبونەوەی بیلبیلەی چاو، خەمۆکی، شەرا. ئۆدیما، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** بۆ بێهۆشی نوخاعی لە منداڵبوونی زایەندی گەورەکان ٢ تا ٥ میلیگرام (٠,٢ تا ٠,٥ میلی لیتر) لە گیراوەی ١٪، کە بە گیراوەی ١٠٪ DW دەتوێتەوە، دەرزی لێدەدرێت. بۆ بێهۆشی نوخاعی لایەنی بێهۆشی ناوچەی پرینیەم (بنی گون) و ئەندامی خوارەوە گەورەکان ٥ میلیگرام (٠,٥ میلی لیتر) بە مەبەستی بێهۆشی ناوچەی پرینیەم و ئەندامی خوارەوە کە بەپێی ڕەوشی CSF یان گیراوەی DW٪١٠ دەتوێتەوە، دەرزی لێ دەدرێت. بێهۆشی نوخاعی لایەنی بێهۆشی تا لێواری پەراسووەکان گەورەکان ١٥ تا ٢٠ (١,٥ تا ٢ میلیلیتر لەگیراوەی ١٪) لەگەڵ CSF تواوە دەرزی لێدەدرێت.

## تیتراکۆساکترین: TETRACOSACTRIN

**ناوی بازرگانی:** Synacthen

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١ میلیگرامی و ٢٥٠ مایکرۆگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Corticosteroid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ( هەوکردنی جومگە)،تەشخیصی ناڕێکی و ناتەواوی ڕژێنی سەر گورچیلە و نەخۆشی کرون و نیلتیهابی کۆڵۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زیپکە، توێکهەڵدانی پێست، ئازار.

**بڕی دەرمان:** تەشخیصی (تێستی ٣٠ خولەکی) ٠,٢٥ میلیگرام بە دەرزی ماسولکەیی یان دەمار وەك ١ بڕی دەرمان، تەشخیصی (تێستی ٥ سەعاتی) ١ میلیگرام بە دەرزی ماسولکەیی وەك ١ بڕی دەرمان.

## تێتراسایکلین چاوی: TETRACYCLINE OPH.

**ناوی بازرگانی:** Achromycin

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی چاوی ١٪.

**بەکارهێنان:** بۆ هەوکردنی ڕووکاری چاو بەهۆی وردەزیندەوەرە هەستیارەکانەوە بەکاردێت.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان یەك چینی ناسك لە مەڵهەم هەموو ٢ تا ٤ سەعاتێك ڕووی چاوی پێ دەماڵرێت.

## تێتراسایکلین مەوزوعی: TETRACYCLINE TOP.

**ناوی بازرگانی:** Topicycline

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم ٣٪

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری مەوزوعی هەوکردن و زیپکە و سوتان و هەوکردن بەهۆی وردە زیندەوەرە هەستیارەکانەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی پێستی.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ١ تا ٢ جار بەمەوزوعی پێدا دەماڵرێت.

## تێتراسایکلین: TETRACYCLINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Achromycin

**شێوەی دەرمان:** کەپسول ٢٥٠ میلیگرامی و دەرزی ٢٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ هەوکردنەکان بەهۆی زیندەوەرە هەستیارەکانەوە و دژی هەوکردنی گشتی سوك و مام ناوەند و توند و زیپکە و هەوکردنی بەهۆی ستریپتۆکۆکەس و سوزەنەکی سادە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون، هەستیاربوون بەڕووناکی، هەوکردنی توندی پێستی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری بەشی سەرەوەی گەدە، پوکانەوەی ئێسك، سەرئێشە، سکچوون، پەڵە، نەمانی ئارەزوی خواردن، هەوکردنی دووەمی، گێژی، ژەهراویبونی گوێ، هەوکردنی ڕیخۆڵە و کۆڵۆن، کەمخوێنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان خۆراکی ٢٥٠ تا ٥٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٤ جار. منداڵانی گەورەتر لە ٨ ساڵ ڕۆژانە ٢٥ تا ٥٠ میلیگرام/ کیلۆگرام ڕۆژانە (هەر ٦ سەعاتێك) دابەشکراو ڕێی پێ دەدرێت.

## تێتراهایدرۆزۆلین: TETRAHYDROZOLINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Vizine,tyzine

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاوی ٠,٠٥ ٪ و قەترەی لوت ٠,٠٥ ٪ و ٠,١٪ و سپرایی لوت ٠,١٪.

**گروپی دەرمان:** Imidazoline

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری چاو ئێشەو هەوکردن و گیرانی لوت بەکاردێت.

کاریگەری لاوەکی یەکان: سوتانەوە، وشکبوونەوەی لوت، پژمین، تێکچوونی بینین، ڕوشانی چاو، گەورەبوونی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا ٢ قەترە لەقەترەی چاوی ٠,٠٥ ٪ بکرێتە چاوەوە بۆ زیاتر لە ٤ جار ڕۆژانە، ٢ تا ٤ قەترە لە قەترەی لوت ٠,١٪ بۆ هەر کونەلوتێك هەموو ٣ تا٤ سەعاتێك، کاتێك پێویست بێت. منداڵانی سەروی ٦ ساڵ ١ تا ٢ قەترە لە قەترەی چاوی ٠,٠٥ ٪ بکرێتە چاوەوە بۆ زیاتر لە ٤ جار ڕۆژانە،منداڵی سەروی ٦ ساڵ ٢ تا٤ قەترە لە قەترەی لوت ٠,١٪ بۆ هەر کونەلوتێك هەموو ٣ تا٤ سەعاتێك، منداڵی ٢ تا ٦ ساڵ ٢ تا ٣ قەترە لە قەترەی لوت ٠,٠٥ ٪ بۆ هەر کونەلوتێك هەموو ٣ تا ٤ سەعاتێك.

## ثالیدۆماید: THALIDOMIDE

**ناوی بازرگانی:** Thalomid,celgene

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Immunomodular

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی مۆخی ئێسك (مالتیپل مایلۆما) بەکاردێت. لەو کەسانەی ٦٥ ساڵ و زیاترن.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، وشکی دەم، تێکچوونی گەدە، قەبزی، کەمبوونی لێدانی دڵ پەککەوتنی دڵ مەیینی خوێن لەقوڵایی دەماردا، تەنگەنەفەسی، ئۆدیمای موحیگی، شڵەژان، خەمۆکی، گێژی، خەواڵویی، بێهۆشی،



لەرزین، تا، هەوکردنی سی، کەمخوێنی، کەمبوونی خڕۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، لاوازی سێکسی، نەخۆشی دەماری موحیگی، داخرانی ڕیخۆڵە، داخرانی سی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ساڵ، ٢٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار لەکاتی خەودا بۆ ماوەی خولێکی ٦ هەفتەیی، لایەنی زۆر ١٢ خول. **تێبینی:** بەهەموو شێوەیەك بۆ سکپڕی قەدەغەیە و ئەبێتەهۆی کەمئەندامی کۆرپەلە.

## ثیوفیلین: THEOPHYLINE

**ناوی بازرگانی:** Bronchoyl

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلیگرامی و حەبی (S.R)ی ١٠٠و٢٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Bronchodilator

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگرتن لە ڕەبۆ و نەخۆشی ڕێڕەوی هەناسەدان و نەخۆشی موزمینی داخرانی سی و ئەبێتە هۆی فراوانکردنی ڕێڕەوی هەناسەو بۆ چارەسەری نیشانەکانی کرژبوونی بۆری هەوا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، زۆرلێدانی دڵی سکۆڵەیی، نەمانی ئارەزوی خواردن، ڕشانەوە، دابەزینی پەستانی خوێن، سەرئێشە، ناجێگیری، خەمۆکی، سەرگێژبوون، ڕوشان، سکچوون، نارێکی لێدانی دڵ لێدانی دڵ هەناسەبڕکێ، گیرانی میز.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری نیشانەکانی کرژبوونی بۆری هەوا بڕی دەرمانی سەرەتایی ٦ میلیگرام/کیلۆگرامە و پاشان: گەورەکان ئەوانە جگەرە ناکێشن ٣ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ٦ سەعات بۆ ٢ بڕی دەرمان و پاشان ٣ میلیگرام/ کیلۆگرام هەر ٨ سەعات. گەورەکان ئەوانەی جگەرەکێشی سالمن ٣ میلیگرام/ کیلۆگرام هەر ٤ سەعات بۆ ٣ بڕی دەرمان پاشان ٣ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ٦ سەعات. منالآنی ٩ تا ١٦ ساڵ ٣ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ٤ سەعات بۆ ٣ بڕی دەرمان پاشان ٣ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ٦ سەعات. منالآنی ٦ مانگ تا ٩ ساڵ ٤ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ٤ سەعات بۆ ٣ بڕی دەرمان پاشان ٤ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ٦ سەعات. شیرخۆرانی کەمتر لە ٤٠ هەفتە ١ میلیگرام/کیلۆگرام هەر ١٢ سەعاتێك ڕێی پێ دەدرێت.

## ثیو فیلین جی: THEOPHYLINE G

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی شروبی (ثیو فیلین ئەنهایدرەس ٥٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر + گوایفینسین ٣٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Bronchodialator

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵی نیشانەکانی کرژبوونی بۆری هەوا بەهۆی ڕەبۆ یان نەخۆشی موزمینی داخرانی سی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڤێ، سەرئێشە، ئازاری سك، شڵەژان، سکچوون، گێژی، نارێکی لێدانی دڵ توڕەیی.

**بڕی دەرمان:** بڕی دەرمان بەپێی پیو فیلین دیاری دەکرێت.

## ثیابێندازول: THIABENDAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Mintezol,triasox

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anthelmintic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی ناوەوە بەهۆی کرمی خڕ و بۆ کرمی دەزولەیی و کرمی ڕیخۆڵە و کرمی قامچیدار و کرمی دەزولەیی تریچینیلا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری گەدە، سەرگێژبوون، سەرئێشە، شۆك، دابەزینی پەستان، زەردبوونی چاو و پێست، خەواڵویی، تێکچوونی پێست، تێکچوونی بینین، میزی خوێناوی، زرنگانەوەی گوێ.

**بڕی دەرمان:** ٢٥ میلیگرام/کیلۆگرام لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا بۆ ماوەی ٢ ڕۆژ داوی ئەویش ڕێی پێ دەدرێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣ گرامە.

## ثایثیلپێرازین: THIETHYLPERAZINE

**ناوی بازرگانی:** Torecan

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦,٥ میلیگرامی و دەرزی ٦,٥ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiemetic

**بەکارهێنان:** دژی ڕشانەوە و هێڵنجدان و سەرگێژبوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** دابەزینی پەستانی خوێن، وشکی دەم، خەواڵویی، کەمخوێنی. تەشەنوج، سەرئێشە، زیاد لێدانی دڵ تێکچوونی بینین، زرنگانەوەی گوێ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ ساڵ ١٠ میلیگرام خۆراکی یان ماسولکەیی ڕۆژانە١ تا ٣ جار. سەلامەتی ئەم دەرمانە لەمنداڵاندا بە جێگیری نەگەیشتووە.

## ثایۆگوانین: THIOGUANINE

**ناوی بازرگانی:** Tabloid,Lanvis

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Purine antimetabolite

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن (لیوکیمیای لیمفۆبلاستیك و مایلۆجینیك و گرانیۆلۆسایتیکی موزمین) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سکچوون، ڕشانەوە، هێڵنجدان، وشکبوونی دەم، خەواڵویی، کەمخوێنی، نەمانی ئارەزوی خواردن، هەڵوەرینی موو، خوران، پەڵە، زەردی، ئازاری بەشی سەرەوەی گەدە، زەردی، کەمی خرۆکەی سپی و پەرەی خوێن، زیاد لێدانی دڵ تا، لەرز، زیادبوونی یوریك ئەسید.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ میلی‌گرام/کیلۆگرام خۆراکی ڕێی پێ دەدرێت. پاشان بەتەدریجی لە ماوەی ٣ تا ٤ هەفتە بڕی دەرمان ڕۆژانە بە ٣ میلی‌گرام/کیلۆگرام دەگەیەنرێت. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە ٢ تا ٣ میلی‌گرام/کیلۆگرامە.

## ثایۆپێنتال: THIOPENTAL

**ناوی بازرگانی:** Pentothal

**شێوەی دەرمان:** پاودەر بۆ دەرزی ٥٠٠ میلی‌گرام و ١ گرامی و دەرزی ٢٥ میلی‌گرام/ میلی‌لیتر، ٥٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (٢٠میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** General Anesthetic

**بەکارهێنان:** بۆ بەنجی عمومی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کۆکە، غازات، دڵەڕاوکێ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، زیادبوونی لێدانی دڵ بێخەوی، فەرامۆشی، ناجێگیری، تەشەنوج، هەناسە وەستان، کرژبوونی بۆری هەوا و گەروو، ڕوشانی کۆم، ئازاری سك.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ میلی‌گرام، منالآن تا ١٥ ساڵ ٣ تا ٥ میلی‌گرام/کیلۆگرام بەرێگەی دەمار. ٢ تا ٣ میلی‌لیتر لە گیراوەی ٢,٥٪ بە دەمار بۆ ماوەی ٢٠ تا ٤٠ چرکە ڕێی پێدەدرێت.

## ثایۆریدازین: THIORIDAZINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Millaril,Millazine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

ئا ئاگادار بن: دەرمان شوێنەواری خراپ و کاریگەری نێگەتیڤ بەجێدەهێڵێت، ئەگەر بەگرانی بەکاربهێنرێت

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی دەروونی و شیزۆفرینیا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەواڵویی، ئارامی زیاد لە ڕادە، تێکچوونی بینین، زیادبوونی IOP، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، سکچوون، وشکی دەم، زیادلێدانی دڵ گۆڕانی EKG، گەورەبوونی مەمك، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، دابەزینی پەستانی خوێن، گیرانی میز، زیادبوونی حەساسیەت، کرژبوونی گەروو، کۆکە، پژمین، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار. ئەتوانی کە بڕی دەرمان لەکاتی پێویست تا لانی زۆر ٨٠٠ میلیگرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا زیادبکرێت. منالآنی زیاتر لە ٢ ساڵ ١ میلیگرام/ کیلۆگرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا ڕێی پێ دەدرێت. تەمەنی زیاتر لە ٦٥ ساڵ لە سەرەتا ٢٥ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار ڕێی پێ دەدرێت.

## ثایوتیپا: THIOTEPA

**ناوی بازرگانی:** Thioplex

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٥ و ٣٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antineoplasm

**بەکارهێنان:** دژی شێرپەنجەی مەمك و هێلکەدان و میزەڵدان و شێرپەنجەی خوێن (هوجکین لیمفۆما) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، تێکچوونی جگەر، تا، بەگرانی میزکردن، کەمبوونەوەی کێش، هەڵوەرینی موو، لەرز، لاوازی سێکسی، سەرئێشە، گێژی، تێکچوونی بینین، کەمی کاری مۆخی ئێسك، سوربونەوە و ئیلتیهاباتی چاو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالّی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ٠,٦ تا ٠,٨ میلیگرام/ کیلۆگرام هەر ١ تا ٤ هەفتە ١ جار دەرزی لێ دەدرێت.

## ثایوپیکسین: THIOTHIXENE

**ناوی بازرگانی:** Navane

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antipsycotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی یە دەروونی یە سوك و ماملاوەندەکان بەکاردێت.

با بزانین: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوور کەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



**کاریگەری لاوەکی:** تا، ئارەقکردنەوەی ناو دەست، قەبزی، دروستبوونی کێشە لەکاتی خەو، وشکبوونەوەی دەم، لاوازبوونی ئارەزوی جنسی، زیادلێدانی دڵ زیادبوونیIOP، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار. ئەگەر پێویست بێت ئەتوانی بەتەدریجی کە بڕی دەرمان تا ١٥ میلیگرام ڕۆژانە زیادبکەیت.

## ثایروید: THYROID

**ناوی بازرگانی:** Westhroid

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی حەبی ٣٠ و ٦٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Hormone

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەمی کاری ڕژێنی (ثایروید) و گواتر و شێرپەنجەی ثایروید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** زۆرلێدانی دڵ سکچوون، بەگرانی هەناسەدان، هەڵوەرینی موو، ئاوسان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٦٠ تا ١٢٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا.

## ثایروتروپین: THYROTROPIN

**ناوی بازرگانی:** Thyrotropar

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ یەکەیی.

**گروپی دەرمان:** Thyroid stimulating hormone

**بەکارهێنان:** بۆ تەشخیصی هۆرمۆنی ثایرۆید بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، زیاد لێدانی دڵ هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئارەقکردنەوە.

**بڕی دەرمان:** بۆ تەشخیصی هۆرمۆنی ثایرۆید گەورەکان و منداڵان ڕۆژانە ١٠ یەکە، ماسولکەیی یان ژێرپێستی بۆ ماوەی ١ تا ٣ ڕۆژ. بۆ تەشخیصی مانەوەی شێرپەنجەی ثایرۆید پاش لە نەشتەرگەری ١٠ یەکە ڕۆژانە ماسولکەیی یان ژێرپێستی بۆ ماوەی ٣ تا ٧ ڕۆژ.

## تیاگاباین: TIAGABINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Gabitril

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ و ٤ و ١٢ و ١٦ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticovulsant

**بەکارهێنان:** وەك چارەسەری یارمەتیدەری فێی جوزئی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، فراوانبوونی مولولەکانی خوێن، دڵەکوتێ، زیادبوونی لێدانی دڵ، گێژی، خەواڵویی، لەرزین، خەمۆکی، بێخەوی، خەوزڕان، سەرئێشە، شەقیقە. خرۆشان، تێکچوونی تەوازن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی ١٢ساڵ و گەورەتر ٤ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٥٦ میلیگرام لە ڕۆژێکدا.

## تیا پرۆفینیك ئەسید: TIAPROFENIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Surgam

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهاب لە ڕۆماتیزم و نەخۆشی یەکانی تری پەیکەرەماسولکە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، خوێنبەربوونی گەدە و ڕیخۆڵە، سەرئێشە، گێژی، توڕەیی، خەمۆکی، خەواڵویی، بێخەوی، تێکچوونی هاوسەنگی، تێکچوونی بیستن، میزی خوێناوی، هەستیاربوون بەڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ٣٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار.

## تیبۆلۆن: TIBOLONE

**ناوی بازرگانی:** Livial

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Oestrogen and HRT

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ماوەکۆتای نیشانەکانی کەمبوونی ئیسترۆجین و لە ژناندا بۆ پێشگرتن لە پوکانەوەی ئێسك لەکاتی مەترسی شکاندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك، گۆڕانی کێش، خوێنبەربوونی زایەندی ژنان، تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، سەرئێشە، گێژی، خەمۆکی، شێرپەنجەی مەمك، ئازاری ماسولکە و جوگە، تێکچوونی بینین، چەوری زیادەی پێست، خوران.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢,٥ میلیگرام.

با بزانین: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## تیکارسیلین: TICARCILLIN

**ناوی بازرگانی:** Ticar

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زۆربەی هەوکردنە جیاوازەکان بەهۆی بەکتریاوە وەکو هەوکردنی ڕێڕەوی میز و ئێسك و جومگە و هەوکردنی توندی زایەندی ژنان و هەوکردنی گەدەو هەوکردنی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، سکچوونی سوك، غازات، ئازاری گەدە، پەڵە، خوران، ئازار، ئاوسان، سوتانەوە، لاوازی ماسولکە، تا، لەرز، وشکبوونەوەی دەم، زیاد میزکردن، زیاد لێدانی دڵ خوێنبەربوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣ گرام بە دەمار هەموو ٤ سەعاتێك.

## تیکلۆپیدین: TICLOPIDINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Ticlid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiplatlet

**بەکارهێنان:** دژی پەڕەکانی خوێن و خوێن مەیینە و بۆ کەمکردنەوەی مەترسی مەیین و کلۆبوونی خوێن و جەڵدە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نەخۆشی گورچیلەی موحیگی، سەرگێژبوون، خوران، پەڵە، لیر، میزی خوێناوی، درێژبوونەوەی کاتی خوێنبەربوون، زیادبوونی هەستیاری، زەردی، هەوکردنی جگەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٥٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار لەگەڵ خۆراکدا ڕێی پێ دەدرێت.

## تیجیسایکلین: TIGECYCLINE

**ناوی بازرگانی:** Tygacil

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibacterial

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی بەکتریایی جیاواز و بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی ناوەوەی سك و پێست و شانە نەرمەکان بەکاردێت.



**كاریگەری لاوەكی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سكچوون، ئازاری سك، تێكچوونی گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، گێژی، زیادبوونی بیلیرۆبین، سەرێشە، پەڵە، خوران، هەوكردنی پەنكریاس، زەردی. پەككەوتنی جگەر، كەمی پەرەی خوێن، كەمی پرۆتین.

**بڕی دەرمان:** بە ئینفیوشنی دەماری گەورەكانی سەروی ١٨ ساڵ، سەرەتا ١٠٠ ملیگرام، پاشان ٥٠ ملیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك بۆ ماوەی ٥ تا ١٤ ڕۆژ.

## تیلاكتەیز: TILACTASE

**ناوی بازرگانی:** Colief

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠٠٠ یەكەیی.

**گروپی دەرمان:** d galatosedase Beta

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری كەمی لاكتەیز و بۆ جێگرتنەوەی لاكتەیز لەكەسانی كە توشی كەمی لاكتەیز هاتوون بەكاردێت.

**بڕی دەرمان:** ئەتوانی كە دەرمان لەگەڵ شیردا یان بەرهەمە شیرمەنی یەكانی تر یان پێش لە خواردنی شیرمەنی یەكان بەكاربهێنیت.

## تیلودرۆنەیت: TILUDRONATE

**ناوی بازرگانی:** Skelid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ ملیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Bisphosphonate

**بەكارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی باجەتی ئێسكی بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سكچوون، جیوب، هەوكردنی لوت، دڵەكزە، ئازاری جومگە و سوتانەوە و كۆكە، ئاوسان، تێكچوونی گەدە، ئازاری گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەكان ٤٠٠ ملیگرام بە شێوەی خۆراكی ڕۆژانە بۆ ماوەی ٣ مانگ.

## تیمولول: TIMOLOL

**ناوی بازرگانی:** Betim

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ ملیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Beta Blocker

**بەکارهێنان:** دژی گلوکوما و دژی پەستانی بەرزی خوێن و ئازاری سنگ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بێهێزی، هیلاکی، گێژی، پەککەوتنی دڵ بێهۆشی، لێدانی دڵ هێڵنجدان، سکچوون، دووبینی، پەڵە، کرژبوونی بۆری هەوا، هەڵوەرینی موو. کەم لێدانی دڵ دابەزینی پەستان، لاوازی سێکسی، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** بۆ پەستانی بەرزی خوێن، سەرەتا ١٠ میلیگرام ڕۆژانە لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. ئەگەر پێویست بێت بەتەدریجی زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆر ڕۆژانە ٦٠ میلیگرام بڕی ئاسایی دەرمانی پاراستن ڕۆژانە ١٠ تا ٣٠ میلیگرام (بڕی دەرمانی سەروی ٣٠ میلیگرام لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا دەدرێت). بۆ ئازاری سنگ سەرەتا ٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بە ڕۆژانە ١٠ میلیگرام هەموو ٣ تا ٤ ڕۆژێك، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٣٠ میلیگرامە ڕۆژانە ٢ جار. بۆ پێشگرتن پاش لە خوێنلێبڕانی ماسولکەیی دڵ (MI) سەرەتا ٥ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار. پاش لە ٢ ڕۆژ زیاد دەکرێت بۆ ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار ئەگەر تەحەمولی کرد. بۆ پێشگرتن لە شەقیقە ١٠ تا ٢٠ میلیگرام ڕۆژانە لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## تیمولول: TIMOLOL OPH.

**ناوی بازرگانی:** Timoptic, Timoptol

**شێوەی دەرمان:** جێڵی چاوی شێوە گیراوە ٠.٥ ٪ و ٠,٢٥٪ و گیراوەی ٠,٥ ٪ و ٠,٢٥٪ و حەبی ٥ و ١٠ و ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Beta Blocker

**بەکارهێنان:** دژی گلوکوما (نەخۆشی ئاوی ڕەشی چاو) و دژی زیادبوونی پەستانی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بێهێزی، هیلاکی، گێژی، پەککەوتنی دڵ بێهۆشی، لێدانی دڵ هێڵنجدان، سکچوون، دووبینی، پەڵە، کرژبوونی بۆری هەوا، هەڵوەرینی موو. کەم لێدانی دڵ دابەزینی پەستان.

**بڕی دەرمان:** ١ قەترە ڕۆژانە ١ تا ٢ جار بکرێتە ناو چاوەوە.

## تینیدازۆل: TINIDAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Tindamax

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی و ١ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiprotozoa

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردن بەکاردێت بە هۆی پرۆتۆزواکانەوە (ئەمیبا) وەك (تریکۆمۆناس ڤەجاینیتس، جیاردیاسس،ئەمیبیاسس).



**کاریگەری لاوەکی:** هیلاکی، سەرئێشە، گێژی، هەستکردن بەناخۆشی، نەخۆشی گورچیلەی موحیگی، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، بێهێزی، تێکچوونی گەدە، حەملەکانی تەشەنوج.

**بڕی دەرمان:** تریکۆمۆنیازیس بەهۆی تریکۆمۆناس ڤەجاینێتس گەورەکان ٢ گرام خۆراکی بە شێوەی یەك بڕی دەرمان لەگەڵ خواردن دا، جیاردیاسس بەهۆی جیاردیا لامبلیاوە گەورەکان ٢ گرام خۆراکی بە شێوەی یەك بڕی دەرمان لەگەڵ خواردندا، منالانی گەورەتر لە ٣ ساڵ ٥٠ میلیگرام/کیلۆگرام (تا ٢ گرام) خۆراکی بە شێوەی ڕۆژانە بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ لەگەڵ خواردندا. ئەمیبیایی ڕیخۆڵەیی دروستبوو بەهۆی (ئەنتامۆیبا هیستۆلایتیکا) گەورەکان ٢ گرام ڕۆژانە خۆراکی بە شێوەی ڕۆژانە تا ٣ ڕۆژ لەگەڵ خواردندا. منالانی گەورەتر لە ٣ ساڵ ٥٠ میلیگرام/ کیلۆگرام (تا ٢ گرام) خۆراکی ڕۆژانە تا ٣ ڕۆژ لەگەڵ خواردندا. نەخۆشی ئەمیبیاسسی جگەر گەورەکان ٢ گرام خۆراکی ڕۆژانە٣ تا ٥ ڕۆژ لەگەڵ خواردندا. منالانی گەورەتر لە ٣ ساڵ ٥٠ میلیگرام/ کیلۆگرام (تا ٢ گرام) خۆراکی ڕۆژانە ٣ تا ٥ ڕۆژ لەگەڵ خواردندا.

## تینزاپارین: TINZAPARIN

**ناوی بازرگانی:** Innohep

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠٠٠٠ یەکە/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەکارهێنان:** دژی خوێن مەیین بەکاردێت و دژی مەیینی خوێنی ناو مولولەکان و دژی مەیینی خوێنی سی و مەیینی خوێن لە قولایی دەماردا(DVT) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، بێخەوی، پەڵە، تێکچوونی پێست، شەرا، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، غازات، خوێنبەربوونی کۆم، قەبزی، ئازاری سك، تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە. ئازاری سنگ، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٧٥ یەکە/کیلۆگرام ڕۆژانە ژێرپێستی بەلانی کەمەوە بۆ ٦ ڕۆژ هەتا بڕی دەرمانی وارفارین جێگیر دەبێت.

## تایۆکۆنازۆل: TIOCONAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Monistat١ vagistat١ ,

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی زایەندی ژنان ٦,٥٪.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی کاندیدای زایەندی ژنان بەکاردێت.

پ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، سوتانەوە، برین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان شەوانە ١ جار لە کاتی خەودا.

## تایۆپرۆنین: TIOPRONIN

**ناوی بازرگانی:** Thiola

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Renal Urologic agent

**بەکارهێنان:** بۆ بەرگری لە بەردی گورچیلە بەکاردێت، کە لەوانەیە زیاد بکات بەهۆی زۆربوونی سیستین لە میزدا.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، خوێنبەربوون، کۆکە، دووبینی، ئاوسان، لاوازی ماسولکەیی، ئازاری جومگە، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، بەگرانی هەناسەدان، زەردبوونی چاو و پێست، ئازاری ماسولکە، تا، برینی گەروو، لەرز، پەڵە، خوران، برینی دەم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٨٠٠ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی لە رۆژێکدا لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. منداڵانی ٩ ساڵ و زیاتر ١٥ میلیگرام/کیلۆگرام لە رۆژێکدا لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## تایۆترۆپیۆم: TIOTROPIUM

**ناوی بازرگانی:** Spiriva

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ئیستینشاقی ١٨ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Bronchodilator

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کرژبوونی بۆری هەوا و نەخۆشی موزمینی داخرانی سی و ئیلتیهابی بۆریچکەکان و ئاوسانی سی بەکاردێت

**کاریگەری لاوەکی:** وشکی دەم، هەوکردنی ڕێڕەوی میز، قەبزی، هەوکردنی گەروو، جیوب، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، سەرئێشە، گێژی، هێڵنجدان، زیاد لێدانی دڵ، دڵەکوتێ، گیرانی میز، تێکچوونی بینین، زیادبونی IOP، لەرینەوەی گوێچکەڵەیی، کرژبوونی بۆری هەوا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ کەپسول رۆژانە ١ جار لەڕێگەی ٢ ئیستینشاقی خۆراکی یەوە بە ئامێری ئیستینشاقی هاندیهالێر، نابێت کەپسول قوتبدرێت.



## تیپراناڤیر: TEPRANAVIR

**ناوی بازرگانی:** Aptivus

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی خۆراکی ٢٥٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ١٠٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV، کە دەبێتەهۆی ئایدز بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ئازاری سك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، پەڵە، تا، هیلاکبوون، هەوکردنی پەنکریاس، هەوکردنی جگەر، خوێنبەربوون، تێکچوونی بینین، نەمانی ئارەزوی خواردن، پەڵە، بلۆقکردنی پێست، زۆرمیزکردن، کۆکە، لەرز.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان تیپراناڤیر ٥٠٠ میلیگرام لەگەڵ ڕیتۆناڤیر ٢٠٠ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا.منالآنی ٢ تا ١٨ ساڵ تیپراناڤیر ١٤ میلیگرام/کیلۆگرام لەگەڵ ڕیتۆناڤیر ٦ میلیگرام/کیلۆگرام یان تیپراناڤیر ٣٧٥ میلیگرام/مەتردوجا لەگەڵ ڕیتۆناڤیر ١٥٠ میلیگرام/مەتردوجا خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا.

## تایرۆفیبان: TIROFIBAN

**ناوی بازرگانی:** Aggrastat

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ و ٢٥٠ مایکرۆگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antiplatelet agent

**بەکارهێنان:** دژی مەینی خوێن و پەڕەکانی خوێنە و بۆ بەرگری لە کلۆبوونی خوێن و بۆ چارەسەری نەخۆشی تێژی تەپلەیی (ACS) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، کۆکە، برینی گەروو، سەرئێشە، تا، خوێنبەربوون، زەردی پێست، کەمی پەڕەی خوێن، گێژی، ئازاری گەدە، لەرز، تێکچوونی بینین، ئازاری سنگ، ئارەقکردنەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٤ مایکرۆگرام/کیلۆگرام/خولەك لە ماوەی یەکەم ٣٠ خولەکدا،پاشان ٠,١ مایکرۆگرام/کیلۆگرام/خولەك. لایەنی زۆری ماوەی چارەسەر ١٠٨ سەعاتە.

## تیزانیدین: TIZANIDINE

**ناوی بازرگانی:** Zanaflex,Sirdalud

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤ و ٢ میلیگرامی و کەپسولی ٤ و ٢ و ٦ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant



**بەکارهێنان:** بۆ خاوکردنەوەی پەیکەرەماسولکە و چارەسەری کرژبوونی ماسولکە و نەخۆشی و برینی دڕکەپەتك و فرەڕەقبوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، خەوالویی، تێکچوونی جوڵە، توڕەیی، وشکی دەم، قەبزی، ڕشانەوە، تێکچوونی بینین، دوبارە میزکردن، هەوکردنی میزەڕۆ، هەوکردنی گەروو و لوت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤ تا ٨ میلیگرام خۆراکی کە بەتەدریجی زیاد دەکرێت. هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك ئەتوانی کە بڕی دەرمان دوبارەبکەیتەوە بەڵام نابێت سەرجەمی بڕی دەرمان زیاتر بێت لە ٣٦ میلیگرام لە ٢٤ سەعاتدا.

## تۆبرامایسین: TOBRAMAYCIN

**ناوی بازرگانی:** Nebcin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلیگرام/میلیلیتر (١,٥میلی لیتر) ١٠ و ٤٠ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی و دژی هەوکردنی توندی بەکتریا گرامنێگەتیڤەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سکچوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازار، ئاوسان، سوربونەوەی شوێنی دەرزی، ئازاری گەدە، تەشەنوج، گێژی، کەم میزکردن، لەرز، تا، خوران، ڕوشانی زایەندی ژنان، خوێنبەربوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا لە هەوکردنە توندەکان لایەنی زۆر تا ٥ میلیگرام /کیلۆگرام ڕۆژانە دەماری یان ماسولکەیی بە شێوەی دابەشکراو ڕێی پێدەدرێت.

## تۆبرامایسین ودێکسامیتازۆن: TOBRAMYCIN& DEXAMETASONE

**ناوی بازرگانی:** Tobradex

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی ٠,١٪ و ٠,٣ ٪ و سەسپێنشنی ٠,١٪ و ٠,٣ ٪ و ٠,٠٥٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی چاو و حەساسیەت و ئیلتیهابی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی مەوزوعی، ئۆدیما، گلوکۆما، بەرزبوونەوەی پەستانی ناو چاو، هەوکردن، هەستیاری، ئاوسان، سوربونەوە، خوران.

**بڕی دەرمان:** مەڵهەم هەموو ٣ تا ٨ سەعاتێك، یان قەترە ١ تا ٢ قەترە هەموو ١ تا ٤ سەعاتێك.

## توبرامایسین چاو: TOBRAMAYCIN OPH.

**ناوی بازرگانی:** Tobrex

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم و قەترەی ٠,٣٪.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی بەکتریایی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی چاو، خوران، سوربونەوە، ئاوسان، سوتانەوە.

**بڕی دەرمان:** ١ تا ٢ قەترە هەموو ٤ سەعاتێك، مەڵهەم ڕۆژانە ٢ تا٣ جار. لە کاتی هەوکردنی توند دا هەموو ٣ تا٤ سەعاتێك مەڵهەم، یان ٢ قەترە هەموو ٣٠ تا ٦٠ خولەك، پاشان بڕەکەی کەم دەکرێتەوە.

## تۆکاینایدی: TOCAINIDE HCL

**ناوی بازرگانی:** Tonocard

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەب.

**گروپی دەرمان:** Antiarrhythmic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نارێکی توندی لێدانی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گەدە، گێژی، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، سکچوون، هیلاکبوون، سەرئێشە، تێکچوونی بینین، لەرزین، تا، برینی گەروو، کۆکە، خیزەخیز، ئازاری سنگ، بەگرانی هەناسەدان، نارێکی لێدانی دڵ، برینی دەم، ئاوسان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٤٠٠ میلیگرام خۆراکی هەموو ٨ سەعاتێك، بڕی دەرمانی جێگیرو پارێزراو ١٢٠٠ تا ١٨٠٠ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## تۆسیلیزیوماب: TOCILIZUMAB

**ناوی بازرگانی:** Actemra

**شێوەی دەرمان:** دەرزی IV ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Monoclonal antibody

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ڕۆماتیزمی مامناوەند و توند و هەوکردنی جومگەکان بەکاردێت.

ت: بەرز کردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوور کەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری گەدە، قەبزی، بلۆقکردن و پەڵەی پێست، گێژی، سوتانەوە، خوران، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، برینی گەروو، ئازار و کزانەوە لە کاتی میزکردن، کۆکە، خوێنبەربوون، برینی دەم، تا، هیلاکبورن، کەمبوونەوەی کێش، برینی گەدە، کەمبوونی خڕۆکەی سپی، ئۆدیما، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤ تا ٨ میلیگرام/کیلۆگرام بە IV ئینفیوشن بۆ زیاتر لە ١ سەعات هەموو ٤ هەفتەیەك. منداڵانی ٢ ساڵ و زیاتر ٢٩ کیلۆگرام یان کەمتر ١٢ میلیگرام/کیلۆگرام بە IV ئینفیوشن بۆ زیاتر لە ١ سەعات هەموو ٢ هەفتەیەك ١ جار، منداڵانی ٣٠ کیلۆگرام و زیاتر ٨ میلیگرام/کیلۆگرام بە IV ئینفیوشن بۆ زیاتر لە ١ سەعات هەموو ٢ هەفتەیەك ١ جار.

## تۆلازامید: TOLAZAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Tolinase

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠و ٢٥٠ و ٥٠٠میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Hypoglycemic

**بەکارهێنان:** دژی نەخۆشی شەکرەیە و بۆ کۆنترۆڵکردنی شەکری خوێن و بۆ چارەسەری شەکرەی جۆری٢ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی شەکرەی خوێن، ئازاری سنگ، خوێنبەربوون، کەمبوونەوەی کێش، هەستیاربوونی پێست بۆ تیشکی خۆر، خەواڵویی، بێهێزی، سەرئێشە، هێڵنجدان، دڵەکزە، پەڵە، سووربونەوە، خوران، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠تا ٥٠٠ میلیگرام لەهەر ڕۆژێکدا لەکاتی بەیانی.

## تۆلازولین: TOLAZOLINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Priscoline

**شێوەی دەرمان:** پاودەربۆ دەرزی ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێنی سی یەخوێنبەری ساوایان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سووربونەوە، دابەزینی پەستانی خوێن، شۆك، خوێنبەربوونی سی، زیاد لێدانی دڵ، سەرئێشە، میزی خوێناوی، هەوکردنی جگەر، کەمی پەڕەی خوێن.

**بڕی دەرمان:** منداڵان سەرەتا ١ تا ٢ میلیگرام/کیلۆگرام دەماری بەڕێگەی (scalp vein) لە ماوەی ١٠ خولەکدا ڕێی پێ دەدرێت. پاشان ١ تا ٢ میلیگرام/ کیلۆگرام بەڕێگەی IV ئینفیوشن لەسەعاتێکدا دەرزی لێدەدرێت.



## تۆلبیوتامايد: TOLBUTAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Orinase

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Hypoglycemic

**بەکارهێنان:** بۆ کۆنترۆڵ وچارەسەری نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سەرئێشە، پەڵە، سووربونەوە، خوران، دڵەکزە، نەمانی ئارەزوی خواردن، تامی ناخۆشی ناودەم، کەمبوونەوەی شەکری خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ١ تا ٢ گرام بە شێوەی خۆراکی، بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٠,٢٥ تا ٣ گرام ڕۆژانە بە شێوەی خۆراکی.

## تۆلکاپۆن: TOLCAPONE

**ناوی بازرگانی:** Tasmar

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiparkinson agent

**بەکارهێنان:** لەگەڵ کاربیدۆپا و لیڤۆدۆپا بۆ چارەسەری نەخۆشی پارکینسۆن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، نەمانی ئارەزوی خواردن، گێژی، سەرئێشە، خەواڵویی، تێکچوونی خەو، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە. ئازاری گەدە، تا، ئارەقکردنەوە، لەرزین، میزکردنی بە ئازار، وشکی دەم، خەوزڕان، خرۆشان، خەمۆکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ جار، هەمیشە یەکەم بڕی دەرمان لە ڕۆژێکدا پێکەوەلەگەڵ کاربیدۆپا و لیڤۆدۆپا نەدرێت.

## تولمتین: TOLEMTIN

**ناوی بازرگانی:** Tolectin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلیگرامی و ٦٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ٤٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** دژی ئازار و ئیلتیهاب و ئازار و ئیلتیهابی جومگەکان و ڕۆماتیزم ئیلتیهابی فەقەرەکان و هەوکردنی جومگەی لاوان بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری سك، گێژی، خوران، ڕشانەوە، سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەوالوویی، پەڵە، خوران، هێڵنجدان، قەبزی، سکچوون، کەمخوێنی، تێکچوونی بینین، سوربونەوە، هەڵوەرینی موو، ژەهراویبوونی گورچیلە و جگەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٢ گرامە، منالآنی گەورەتر لە ٢ ساڵ ڕۆژانە ١٥ تا ٣٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## تۆلفیناميك ئەسید: TOLFENAMIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Clotam Rapid

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شەقیقەی تیژ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، خوێنبەربوونی گەدە و ڕیخۆڵە، تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە، میزکردنی بەئازار، شڵەژان، خاوی، ورێنە، هیلاکی، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ٢٠٠ میلیگرام لە سەرەتادا، دوبارەکردنەوەی ١ جار پاش لە ١ تا ٢ سەعات ئەگەر پێویست بێت.

## تولنافتەیت: TOLNAFTATE

**ناوی بازرگانی:** Tinactin,Mycil

**شێوەی دەرمان:** کرێم و گیراوەی مەوزوعی و سپرایی مەوزوعی ١٪.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی کەڕووی پێستی (کەچەڵی سەر، لاشە، سەرەتای قاچ و دەست و پێ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی پێست، خوران.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ جار بەڕووی شوێنی مەبەستدا بیماڵن.

## تۆلتیرۆدین: TOLTERODINE

**ناوی بازرگانی:** Detrol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ و ٢ میلیگرامی و کەپسولی ٢ و ٤ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticholinergic



**بەکارهێنان:** بۆ کەمکردنەوەی کرژبوونی ماسولکەیی میزەڵدان و بۆ زۆر چالاکبوونی میزەڵدان و ڕێژەوی میز و میزکردنی فەوری و میزکردنی دوبارە و میزڕانەگرتن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** دڵەڕاوکێ، هیلاکی، سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، گێژی، ئازاری سنگ، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری سك، وشکی دەم، قەبزی، خراپی هەرس، گیرانی میز، هەوکردنی ڕێڕەوی میز، خوران، پەڵە، هەوکردنی بۆڕیچکەکان، کۆکە، هەوکردنی گەروو، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** بۆ گەورەکان و بەساڵاچوان ۲ میلیگرام خۆراکی ۲ جار لە ڕۆژێکدا، لە ئەوانەی نەخۆشی جگەریان هەیە ۱ میلیگرام خۆراکی ۲ جار لەڕۆژێکدا، کەپسولی ئیکستڕیل ڕۆژانە ٤ میلیگرامە و ئەتوانین بڕی دەرمان بەپێی پێویست بۆ ۲ میلیگرام کەم بکەینەوە. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٤ میلیگرامە.

## تۆلڤاپتان: TOLVAPTAN

**ناوی بازرگانی:** Samsca

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥ و ٣٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Vasopressin receptor antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هایپۆناتریمیا(کەمبوونەوەی صۆدیۆم لە خوێندا) لەو کەسانەی نەخۆشی پەککەوتنی دڵ و نەخۆشی جگەر و هەندێ تێکچوونی هاوسەنگی هۆرمۆنیان هەیە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکبوونەوەی پێست، بێخەوی، نەمانی ئارەزوی خواردن، قەبزی، زۆرمیزکردن، وشکبوونەوەی دەم، بێهێزی، کۆکە، زۆربوونی شەکری خوێن، گێژی، خوێنبەربوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ١٥ تا ٣٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٦٠ میلیگرامە.

## تۆپیرامەیت: TOPIRAMATE

**ناوی بازرگانی:** Topamax

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ و ٢٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ١٥ و ٢٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticovulsant

**بەکارهێنان:** دژی تەشەنوج و فێ و شەقیقە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، هەڵوەرینی موو، گێژی، تێکچوونی هاوسەنگی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچوونی هەرس، غازات، ئازاری سك، سکچوون، ئازاری سنگ، تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** وەك دەرمانی یارمەتیدەری تەشەنوجی جوزئی گەورەکان ٤٠٠ میلیگرام ڕۆژانە لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا ڕێی پێ دەدرێت. چارەسەر بە بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٥٠ میلیگرامی دەست پێ دەکات و بڕی دەرمان بە تەدریجی زیاد دەکرێت.

پێ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## تۆپۆتیکان: TOPOTECAN HCL

**ناوی بازرگانی:** Hycamtin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ۰,۲٥ و ۱ میلیگرامی و دەرزی IV ٤ میلیگرامی و ۱ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی هێلکەدان و شێرپەنجەی سی و هەندێ جۆری شێرپەنجەی گەردن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، ئازاری سك، هەوکردنی دەم، پەڵە، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن، سەرئێشە، هەڵوەرینی موو، تا، هیلاکبوون، کۆکە، لەرز، خیزەخیز، ئازاری سنگ، برینی دەم و قورگ، خوێنبەربوون، تەنگەنەفەسی، کەمبوونەوەی پەرەی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۱,٥ میلیگرام/مەتردوجا بە دەمار بۆ زیاتر لە نیوسەعات ڕۆژانە بۆ ماوەی ٥ ڕۆژی یەك لە دوای یەك.

## تۆریمیفین: TOREMIFENE CITRATE

**ناوی بازرگانی:** Fareston

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦۰ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiestrogen

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی تەشەنەکردووی مەمك پاش لە لەحەیزچونەوە لە ژناندا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئۆدیما، خەمۆکی، گێژی، هیلاکبوون، ئارەقکردنەوە، سووربونەوە، خوێنبەربوونی زایەندی ژنان، سەرئێشە، پەڵە، نەمانی ئارەزوی خواردن، قەبزی، زیادبوونی کێش، تەنگەنەفەسی، بێخەوی، هەڵوەرینی موو، پەککەوتنی دڵ خوێن لێبڕانی ماسولکەی دڵ زیادبوونی کالسیۆم، کەمبوونەوەی پەرەی خوێن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٦۰ میلیگرامە.

## تۆرسیماید: TORSEMIDE

**ناوی بازرگانی:** Demadex

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ۱۰ میلیگرام/میلیلیتر و حەبی ٥ و ۱۰ و ۲۰ و ۱۰۰ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Loop diuretic



**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کۆبوونەوەی ئاو لە لەشدا (ئۆدیما) لەو کەسانەدا کە نەخۆشی پەککەوتنی موزمینی گورچیلە و پەککەوتنی دڵ و جگەریان هەیە و بۆ چارەسەری بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، سەرئێشە، گێژی. لاوازی سێکسی، کەمبوونەوەی بیستن، کۆکەی خوێناوی، ئازار و لاوازی ماسولکە، نارێکی لێدانی دڵ پەڵە، خوران، هەرسنەکردن، هیلاکبوون، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، وشکبوونەوەی دەم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ چارەسەری کۆبوونەوەی ئاو لە لەشدا (ئۆدیما) لەو کەسانەدا کە نەخۆشی پەککەوتنی موزمینی گورچیلەیان هەیە سەرەتا ۲۰ میلیگرام خۆراکی یان دەماری ڕۆژانە ۱ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ۲۰۰ میلیگرام خۆراکی یان دەماری ڕۆژانە ۱ جار. بۆ چارەسەری کۆبوونەوەی ئاو لە لەشدا (ئۆدیما) لەو کەسانەدا کە نەخۆشی پەککەوتنی دڵ یان هەیە ۱۰ تا ۲۰ میلیگرام خۆراکی یان دەماری ڕۆژانە ۱ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ۲۰۰ میلیگرام خۆراکی یان دەماری ڕۆژانە ۱ جار. بۆ چارەسەری کۆبوونەوەی ئاو لە لەشدا (ئۆدیما) لەو کەسانەدا کە نەخۆشی جگەریان هەیە سەرەتا ٥ تا ۱۰ میلیگرام خۆراکی یان دەماری ڕۆژانە ۱ جار بە درێژایی لەگەڵ ڕێگری ئەڵدیسترۆن یان مێزپێکەرەکان.بۆ بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن ٥ تا ۱۰ میلیگرام خۆراکی یان دەماری ڕۆژانە ۱ جار.

## تۆسیتیومۆماب: TOSITUMOMAB

**ناوی بازرگانی:** Bexxar

**شێوەی دەرمان:** دەرزی IV ۱٤ میلیگرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antineoplastic agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن ناهۆجکین لیمفۆما بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچوون، ئازاری گەدە، خوران، پەڵە، سووربونەوە، وشکبوونەوەی پێست، ئازاری جومگە و ماسولکە، سەرئێشە، زەردی، میزی خوێناوی، تا، لەرز، برینی گەروو، زیادبوونی کێش، ئاوسان.

**بڕی دەرمان:** بڕەکەی بەپێ توندی نەخۆشی یەکە دەگۆڕێت.

## ترامادۆل: TRAMADOL HCL

**ناوی بازرگانی:** Ultran

**شێوەی دەرمان:** حەبی(S.R.T) ۱۰۰ میلیگرامی و کەپسولی ٥۰ میلیگرامی حەبی ٥۰ و ۱۰۰ میلیگرامی و دەرزی ٥۰ میلیگرام/میلیلیتر (۱میلی لیتر).



**گرووپی دەرمان:** Opioid analgesic

**بەکارهێنان:** دژی ئازاری مامناوەند و توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالویی، سەرئێشە، بێهێزی، تورەیی، تێکچوونی هاوسەنگی، پەلە، ئارەقکردنەوە، قەبزی، وشکی دەم، سەرگێژبوون، هێڵنجدان، رشانەوە، سکچوون، غازات، تەشەنوج، دڵەراوکێ، گیرانی میز، میزی پرۆتیناوی، تێکچوونی بینین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام خۆراکی یان دەرزی هەر ٤ تا ٦ سەعاتێك ١ جار رێی پێ دەدرێت.
لانی زۆری بڕی دەرمان رۆژانە ٤٠٠ میلیگرامە.

## ترانذۆلاپریل: TRANDOLAPRIL

**ناوی بازرگانی:** Mavic

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ و ٢ و ٤ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و پەککەوتنی دڵ و خوێن لێبڕانی ماسولکەیی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن. زیادبوونی کالسیۆم، کۆکە، تا، لەرز، گێژی، هەرسنەکردن، تێکچوونی جگە، ئۆدیما، پەڵە، هێڵنجدان، تێکچوونی گەدە، ئازاری ماسولکە، خوران، ئاوسان، ئازاری سنگ،خوێنبەربوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ تا٤ میلیگرام لە رۆژێکدا ١ تا٢ جار.

## ترانکسامیك اسید: TRANEXAMIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Cyclokapron

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥٠ میلیگرامی و دەرزی ٢٥٠ میلیگرام/ ٥ میلیلیتر و ١٠٠ میلیگرام/میلیلیتر (٥ میلیلیتر، ١٠میلی لیتر) و حەبی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antfibrinolytic

**بەکارهێنان:** دژی خوێنبەربوونە و بۆ پێشگرتن لە خوێنبەربوون لەکاتی کێشانی ددان، لەو نەخۆشانەی خوێنبەربوونی بۆ ماوەیی هیمۆفیلیایان هەیە و بۆ چارەسەری خوێنبەربوونی لوت (ئیپستاکسیس) و دژی خوێنبەربوونی نەشتەرگەری پرۆستات و میزەڵدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، سوربونەوە، تێکچوونی ڕەنگی بینین، تەشەنوج، گێژی، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن لەکاتی دەرزی دەماری خێرا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان خۆراکی ١ تا ١,٥ گرام خۆراکی، ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار بۆ ماوەی ٣ تا ٤ ڕۆژ. خوێنبەربوونی لوت (ئیپستاکسیس) ئەتوانی کە گیراوەی دەرزی بە مەوزوعی لە لوتدا بەکاربهێنی، یان ١ گرام خۆراکی، ڕۆژانە ٣ جار. بۆ پێشگرتن لە خوێنبەربوون لەکاتی کێشانی ددان، لە نەخۆشانەکانی خوێنبەربوونی بۆماوەیی هیمۆفیلیا گەورەکان ١ تا ١,٥ گرام خۆراکی هەر ٨ سەعاتێك. منداڵان ٢٥ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی.

## ترانیل سیپرومین: TRANYLCYPROMINE

**ناوی بازرگانی:** Parnate

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی خەمۆکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، لەرزین، شێتی، توڕەیی، خرۆشان، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، زیاد لێدانی دڵ، نارێکی لێدانی دڵ، لێدانی دڵ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، سکچوون، وشکی دەم، تێکچوونی بینین، حەساسیەت، بێخەوی، دابەزینی پەستان، کەمبوونەوەی کێش.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار، لایەنی زۆر ڕۆژانە ٦٠ میلیگرامە.

## تراستیوزیوماب: TRASTUZUMAB

**ناوی بازرگانی:** Herceptin

**شێوەی دەرمان:** پاودەر بۆ دەرزی ١٥٠ و ٤٤٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Monoclonal antibody

**بەکارهێنان:** بەتەنها یان لەگەڵ دەرمانەکانی تردا بۆ چارەسەری جۆرەکانی شێرپەنجەی مەمك و بۆ چارەسەری شێرپەنجەی گەدە و سورێنچك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری سك، سکچوون، گێژی، هەڵوەرینی موو، ئارەقکردنەوە، پەڵە، خوران، ئازاری ماسولکە و جومگە، ئازاری ئێسك، تا، لەرز، هەوکردنی جومگە، کەمبوونی کێش، زیپکە، کرژبوونی قاچ، هەوکردنی میزەڕۆ، ئۆدیما، لەرزین، بێخەوی، خەواڵویی، خەمۆکی، تێکچوونی تام، خاوی، قەلەقی، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری سنگ، شەرا، تەنگەنەفەسی، کۆکە، ئازاری پشت، کەمخوێنی،

کەمبوونی خرۆکەی سپی، هەوکردنی لوت و جیوب و گەروو، زیاد لێدانی دڵ پەککەوتنی دڵ هێڵنجدان، ڕشانەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤ میلیگرام/کیلۆگرام بەIV ئینفیوشن بۆ ماوەی زیاتر لە ٩٠ خولەك، بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو بریتی یە لە ٢ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕێگەی ناوەوەی دەمار هەفتانە دەکرێ بەشێوەی IV ئینفیوشن بۆماوەی ٣٠ خولەك.

## تراڤۆپرۆست: TRAVOPROST

**ناوی بازرگانی:** Travatan

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ٠,٠٠٤٪.

**گروپی دەرمان:** Prostaglandin

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی ناو چاو و گلوکۆما (ناوی ڕەشی چاو)ی گۆشەی کراوە و بەرزبوونەوەی پەستانی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی چاو، خوران، سوربونەوەی چاو، هەوکردنی بەکتریایی کۆرنیەی چاو، ئۆدیما، ئازاری سنگ، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، خەمۆکی، قەلەقی، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ١ قەترە ڕۆژانە ١ جار لە ئێواراندا.

## ترازۆدۆن: TRAZODONE HCL

**ناوی بازرگانی:** Desyrel,Molipaxin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥٠ میلیگرامی و کەپسولی ٥٠ و ١٠٠ میلیگرامی و شروبی ٥٠ میلیگرام/٥ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری قەلەقی و نەخۆشی خەمۆکی، بەتایبەتی کاتێك هێوربوونەوەی پێویستە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبونەوەی پەستانی خوێن، زیاد لێدانی دڵ گۆڕانی ECG، قەلەقی، گێژی، خرۆشان، شڵەژان، تێکچوونی خەو، خەواڵویی، تەشەنوج، وڕێنە، شێتی، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، پەڵە، خوران، شەرا، هەڵوەرینی موو، ئارەقکردنەوە، هەستیاربوون بەڕوناکی، گەورەبوونی مەمك، لاوازی سێکسی، گیرانی میز، زیادبوونی شیر، وشکی دەم، تێکچوونی بینین، کەمبوونی صۆدیۆم.

**بڕی دەرمان:** بۆ خەمۆکی گەورەکان سەرەتا ١٥٠ میلیگرام (پیرەکان ١٠٠ میلیگرام) ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا پاش لە خواردن یان وەك ١ بڕی دەرمان لەکاتی خەودا، بڕی دەرمان زیاد دەکرێت بۆ ڕۆژانە ٣٠٠ میلیگرام، نەخۆشی نەخۆشخانە تا لایەنی زۆر ٦٠٠ میلیگرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ قەلەقی گەورەکان ڕۆژانە ٧٥ میلیگرام، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت بۆ ڕۆژانە ٣٠٠ میلیگرام. بۆ منداڵان پێشنیار نەکراوە.



## تریۆسولفان: TREOSULFAN

**ناوی بازرگانی:** Treosulfan

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ۲۵۰ میلیگرامی و دەرزی ۱ و ٥ گرامی.

**گروپی دەرمان:** Alkylating agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی هێلکەدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕەنگبوونی پێست، هەوکردن و حەساسیەتی تورەکەی هەوا. بونەڕیشاڵی سی، خوێنبەربوونی میزەڵدان.

**بڕی دەرمان:** بەپێی پێویست و نەخۆشی یەکە بەکاردێت.

## ترپیرۆستینیل: TREPROSTINIL

**ناوی بازرگانی:** Remodulin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ۱ و ۲,٥ و ٥ و ۱۰ میلیگرام/میلی لیتری و گیراوەی نیستینشاقی ۰,٥ میلیگرام/میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی سی یە خوێنبەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئۆدیما، فراوانبوونی مولولەکانی خوێن، سوربونەوە، ئازاری شوێنی دەرزی، خوێنبەربوونی هەرس، هەوکردنی سی، هەوکردنی مولولەی خوێن، کۆکە، ڕوشانی قوڕگ، گێژی، سەرئێشە، هێڵنجدان، سکچوون، پەڵە، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۰,٦۲٥ تا ۱,۲٥ نانۆگرام/کیلۆگرام/خولەك.

## تریتینۆین: TRETINOIN

**ناوی بازرگانی:** Vasanoid, RetinA

**شێوەی دەرمان:** کرێم و لۆشنی ۰,٥٪ و کەپسولی ۱۰ میلیگرامی و جێڵی مەوزوعی ۰,۰٥ و ۰,۰۲٥.

**گروپی دەرمان:** Retinoid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیپکە و تێکچوونی پێست بەهۆی تیشك و شێرپەنجەی خوێن (پرۆمایلۆسایتیك لیوکیمیا) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تا، ئارەقکردنەوە، هیلاکی، نارێکی لێدانی دڵ هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوێنبەربوونی سك، ئازاری سك، سکچوون، قەبزی، تێکچوونی هەرس، غازات، هەوکردنی جگەر، زۆربوونی چەوری خوێن،

هەوکردنی سی، نەخۆشی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، وشکی پێست، کزانەوە، وەرینی پێست، خورانی مەوزوعی، پەڵە، ئاوبەندی، ڕوشانی پێست، نەمانی ئارەزوی خواردن، پەککەوتنی گورچیلە، ڤێ.

**بڕی دەرمان:** بەشێوەی مەوزوعی پێش لە خەوتن ١ جار ڕووی مەوزوعی پێ دەماڵرێت، ئەگەر وشکی توند دروست نەبوو ئەتوانی ٢ جار لە ڕۆژێکدا ئەم دەرمانە بەکاربهێنی. بە شێوەی خۆراکی بۆ پرۆمایلۆسایتیك لیوکیمیا و تێکچوون و چرچ و لۆچبوونی پێست بەهۆی تیشك گەورەکان و منداڵان ٤٥ میلی‌گرام/مەتردوجا لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لایەنی زۆری ماوەی چارەسەر ٩٠ ڕۆژە.

## ترياسینولون: TRIAMCINOLONE

**ناوی بازرگانی:** Azmacort

**شێوەی دەرمان:** سپرای ١٠٠ مایکرۆگرامی.

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی موزمینی ڕەبۆ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کۆکە، هەوکردنی کەڕوویی کاندیدای ناودەم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ ئیستینشاقی ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار یان ٤ ئیستینشاقی ڕۆژانە ٢ جار.

## تریا مسینولون: TRIAMCINOLONE ACETONIDE

**ناوی بازرگانی:** Kenacort

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٤٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر.

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** کپکەرەوەی سیستمی بەرگری لەشە و بۆ چارەسەری ئیلتیهابی توند بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرخۆشی، سەرئێشە، توڕەیی، بێخەوی، ناجێگیری، زیپکە، پەڵە، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، کاتاراکت، گلوکۆما، زیادبوونی شەکری خوێن، کۆبونەوەی شلەمەنی و صۆدیۆم لەلەشدا، پوکانەوەی ئێسك، پوکانەوەی ماسولکە، زۆربوونی موو، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم، بێهێزی، بۆقژەی دەم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠ تا ٨٠ میلی‌گرام ماسولکەیی IM هەر ٤ هەفتە ١ جار یان ٢,٥ تا ١٥ میلی‌گرام لە ڕێگەی ناوەوەی جومگە یان لە ڕێگەی ناوەوەی چایعەوە لایەنی زۆر ١ میلی‌گرام ڕێی پێ دەدرێت. منداڵان ٤٠ میلی‌گرام ماسولکەیی IMهەر ٤ هەفتە ١ جار یان ٢,٥ تا ١٥ میلی‌گرام لە ڕێگەی ناوەوەی جومگە ڕێی پێ دەدرێت.

## تریا مسینولون: TRIAMCINOLONE ACETONIDE

**ناوی بازرگانی:** Kenalog,Aristocort

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم و کرێم وجیڵی مەوزوعی ٠,١٪ و مەعجونی دەم ٠,١٪ دەرزی ٤٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (١ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی پێستی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبونی شەکری خوێن، سیلی سی، پوکانەوەی ئێسك، کاتاراکت، گلوکۆما، نەخۆشی کوشینگ، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە تا ٤ جار کرێم یان مەڵهەم بە مەوزوعی پێدا دەماڵرێت. منالآن ڕۆژانە ١ تا ٢ جار کرێم یان مەڵهەم بە مەوزوعی پێدا دەماڵرێت.

## تریا مسینولون: TRIAMCINOLONE DIACETATE

**ناوی بازرگانی:** Aristocort

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٤٠ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی پێستی و هەوکردنی جوگە و هەندێ جۆری هەڵوەرینی موو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبونی شەکری خوێن، سیلی سی، پوکانەوەی ئێسك، کاتاراکت، گلوکۆما، نەخۆشی کوشینگ، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٧٥ میلی‌گرام لە هەفتەیەکدا.

## تریامسینولون: TRIAMCINOLONE HEXACETONIDE

**ناوی بازرگانی:** Aristopan

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥ میلی‌گرام/میلی‌لیتر و ٢٠ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری حەساسیەت و ئیلتیهاب بەکاردێت.

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبونی شەکری خوێن، تێکچوونی هەرس،پوکانەوەی ئێسك، کەمبوونەوەی گەشەی لەش، کاتاراکت، سیلی سی، گلوکۆما، نەخۆشی کوشینگ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ تا ٤٨ میلی‌گرام لە ڕۆژێکدا. منالآن ٠,١١ تا ١,٦ میلی‌گرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.



## تریامسینولون نێن. نێن: TRIAMCINOLONE .N .N

**ناوی بازرگانی:** Kenacomb, nasacort

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی مەڵهەمی (تریامسینولون ئەسیتۆناید ١ میلیگرام/گرام + نیۆمایسین سەلفەیت ٢,٥ میلیگرام/گرام + نیستاتین ١٠٠٠٠٠ یەکە/گرام) کرێمی (تریامسینولون ئەسیتۆناید ١ میلیگرام/گرام + نیۆمایسین سەلفەیت ٢,٥ میلیگرام/گرام + نیستاتین ١٠٠٠٠٠ یەکە/گرام).

**گروپی دەرمان:** Glucocorticoid

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی کاندیدیازی پێستی و ئیلتیهابی پێستی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کزانەوە، خوران، ڕوشانی پێست.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار بەمەوزوعی پێدا دەماڵرێت.

## تریامترین: TRIAMTERENE

**ناوی بازرگانی:** Dyrenium

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی کەپسولی ١٠٠ و ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Potassium sparing diuretic

**بەکارهێنان:** میزپێکەرەو بۆ دابەزاندنی پەستانی خوێن و ئۆدیما بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، وشکبوونەوەی دەم، سەرئێشە، هەستیاربوون بەڕوناکی، تێکچوونی جگەر، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن. لاوازی، پەڵە، گێژی، کەمبوونەوەی صۆدیۆم، کەمخوێنی، کەمی پەڕەی خوێن، دابەزینی کێش.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بۆ ئۆدیما ١٠٠ تا ٣٠٠ میلیگرام ٢ جار لە ڕۆژێکدا. بۆ پەستانی خوێن ٥٠ تا ١٠٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.بۆ ئۆدیما منالآن ٢ تا ٤ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.بۆ پەستانی خوێن ١ تا ٢ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا لە ١ تا ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## تریامترین - ئێچ: TRIAMTERENE-H

**ناوی بازرگانی:** Dyazide, maxzide

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەبی (تریامترین ٥٠ میلیگرام + هایدرۆکلۆرثایەزاید ٢٥ میلیگرام).

**گروپی دەرمان:** Potassium sparing diuretic



**بەکارهێنان:** میزپێکەرە و بۆ دابەزاندنی پەستانی خوێن و ئۆدیما بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمی پەرەی خوێن، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سکچوون، وشکبوونەوەی دەم،پەڵە، بێهێزی، کەمخوێنی، دابەزینی کێش.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۱ تا ۲ حەب پاش لە خواردن ۲ جار لە ڕۆژێکدا ڕێی پێ دەدرێت. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٤ حەبە.

## تریازۆلام: TRIAZOLAM

**ناوی بازرگانی:** Halcion

**شێوەی دەرمان:** حەبی ۰,۲٥ و ۰,۱۲٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Hypnotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ماوەکۆتای بێخەوی (insomnia) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکبوونەوەی دەم، تێکچوونی بینین، گێژی، تا، سەرئێشە، زەردی، هیلاکی، خەمۆکی، ناڕێکی لێدانی دڵ، خەواڵویی، ئازاری گەدە، لەرز، خرۆشان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ۰,۲٥ میلیگرام خۆراکی پێش کاتی خەوتن، بەبڕی پێویست، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ۰,٥ میلیگرام. لە پیرەکاندا ۰,۱۲٥ میلیگرام پێش لە کاتی خەوتن.

## ترایکلابێندازۆل: TRICLABENDAZOLE

**شێوەی دەرمان:** حەبی ۲٥۰ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anthelmintic

**بەکارهێنان:** دژی کرمی فاسیۆلیازیس بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۲ بڕی دەرمانی ٥ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ڕێی پێ دەدرێت (پاش لە خواردن و بە ماوەی ٦ تا ۸ سەعات).

## ترینتین: TRIENTINE ۲HCL

**ناوی بازرگانی:** Syprine

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ۲٥۰ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Chelating agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی ویڵسون بەکاردێت لەو نەخۆشانەی کە بەرگەی پەنسیلامین ناگرن.



**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، پەڵە، کەمخوێنی، هەوکردنی دوانزەگرێ و کۆڵۆن. خاوی، دڵەکزە، ئازاری سک، نەمانی ئارەزوی خواردن. کەمخوێنی، کەمبوونی ئاسن، هەوکردنی بۆریچکەکان، ڕەبۆ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٧٥٠ تا ١٢٥٠ میلیگرام خۆراکی لەڕۆژێکدا لە ٢ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢ گرام لە ڕۆژێکدا. منداڵانی ١٢ ساڵ و کەمتر ٥٠٠ تا ٧٥٠ میلیگرام لە ٢ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١,٥ گرام لە ڕۆژێکدا.

## ترای فلوو پیرازین: TRIFLUOPERAZINE

**ناوی بازرگانی:** Trifluzin,Stelazine

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١ و ٢ و ٥ و ١٠ میلیگرامی و دەرزی ١ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی دەرونی مانیا و شیزۆفرینیا و تێکچوونی دەروونی و دژی هێڵنجدان و ڕشانەوەی پاش نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبونەوەی پەستانی خوێن. نەمانی ئارەزوی خواردن، تێکچوونی بینین، وشکبوونەوەی دەم، گێژی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، کەمبوونی خرۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، کەمخوێنی، ئیلتیهابی پێست، گیرانی میز، زیادبوونی کێش، حەساسیەت، هەستیاربوون بەڕوناکی، نارێکی لێدانی دڵ گۆڕانی EKG، سەرئێشە، خەواڵویی، بێخەوی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان خۆراکی ٢ تا ١٠ میلیگرام ٢ جار لە ڕۆژێکدا. منداڵانی ٦ تا ١٢ ساڵ ١ میلیگرام ٢ جار لە ڕۆژێکدا سەرەتایی، بڕی دەرمان بەتەدریجی زیاد دەکرێت بۆ ١٥ میلیگرام لەڕۆژێکدا، بڕەکەی کەمدەکرێتەوە لە نەخۆشە بێ تواناکان و پیرەکاندا.

## ترایفلوپرۆمازین: TRIFLUPROMAZINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Vesprin

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی هەیە.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی دەروونی شیزۆفرینیا و هێڵنجدان و ڕشانەوەی پاش لە نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، قەبزی، گێژی، وشکبوونەوەی دەم، نەمانی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی خرۆکەی سپی خوێن، کەمبوونەوەی پەڕەی خوێن، تێکچوونی بینین.



**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ تا ١٥ میلیگرام ماسولکەیی هەموو ٤ سەعاتێك، لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٦٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا. ١ میلیگرام بە دەمار لەکاتێکدا پێویست بێت،لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٣ میلیگرام لە ڕۆژێکدا. بۆ شیزۆفرینیا ٦٠ میلیگرام ماسولکەیی لەکاتێکدا پێویست بێت، لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ١٥٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا. منالآنی ٢,٥ ساڵ و گەورەتر ٠,٢ تا ٠,٢٥ میلیگرام/کیلۆگرام ماسولکەیی لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا.

## ترایفلوریدین: TRIFLURIDINE

**ناوی بازرگانی:** Viroptic

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ١٪.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی چاو بەهۆی ڤایرۆسی تامێسکی سادەوە بەکاردێت، کە دەبێتەهۆی ئاوسان و برینی پێڵوی چاو و کۆرنیەی چاو.

**کاریگەری لاوەکی:** کزانەوە، فرمێسك ڕشتن، زیادبوونیIOP، سوربونەوە، ڕوشانی چاو.

**بڕی دەرمان:** ١ قەترە هەر ٢ سەعاتێك لەکاتی بێداری دەکرێتە هەر چاوێکی توشبووەوە. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٩ قەترەیە. پاش لە تەواو چاکبوونەوە، هەر ٤ سەعاتێك ١ قەترە بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ ڕێی پێدەدرێت. بۆ منداڵانی بچوکتر لە ٦ ساڵ پێشنیار نەکراوە.

## ترای هێگسی فیندیل: TRIHEXYPHENDYL HCL

**ناوی بازرگانی:** Artan

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ میلیگرامی و ٥ میلیگرامی و ئەلکزیری ٢ میلیگرام/ ٥ میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Anticholinergic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی پارکینسۆن (لەرزینی خۆنەویستی ئەندامەکان) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ناجێگیری، سەرئێشە، تورەیی، بێخەوی، سەرگێژبون، وشکی دەم، تێکچوونی بینین، ترس لەڕوناکی، هێڵنجدان، زیادبوونیIOP، ڕشانەوە، قەبزی، گەورەبوونی سك، قوتدانی بەئازار، گیرانی میز، لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بە بڕی دەرمانی ڕۆژانە ١ میلیگرام دەست پێدەکات و بۆ ماوەی ٣ تا ٥ ڕۆژ، ٢ میلیگرام ڕۆژانە بۆ بڕی دەرمان زیاد دەکرێت. بە پێی پێویست ئەتوانی ڕۆژانە ٦ تا ١٠ میلیگرام لەم دەرمانە بەکاربهێنی.



## ترای میثافان: TRIMETHAPHAN

**ناوی بازرگانی:** Arfonad

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (١٠ میلی لیتر).

**گرووپی دەرمان:** Antihypertensive

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بەرزبونەوەی توندی پەستانی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بێهێزی، شەرا، وشکی دەم، کپبوونەوەی هەناسە، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری سنگ، خوران، قەبزی، زیاد لێدانی دڵ (تاکیکاردی).

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ میلی‌گرام لە ٥٠٠ میلی‌لیتر DW٥٪ بتوێتەوە و بە بڕی دەرمانی ٠,٥ تا ١ میلی‌گرام لە خولەکێکدا بە IV ئینفیوشن بکرێت.

## ترایمیثوبینزاماید: TRIMETHOBEZAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Tigan

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٣٠٠ میلی‌گرامی و دەرزی ١٠٠ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Anticholinergic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هێڵنجدان و ڕشانەوە و هێڵنجدان و ڕشانەوەی پاش نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، بێخەوی، گێژی، تێکچوونی بینین، سکچوون، خەواڵویی، ڤێ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، زەردی، وشکبوونی دەم، لەرزین، خوێنبەربوون، کرژبوونی ماسولکە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠٠ میلی‌گرام خۆراکی ٣ تا ٤ لە جار ڕۆژێکدا یان ٢٠٠ میلی‌گرام ماسولکەیی IM ٣ تا ٤ لە جار ڕۆژێکدا. منالان ٢٠ میلی‌گرام/کیلۆگرام ٣ تا ٤ لە جار ڕۆژێکدا.

## ترامیثوپریم: TRIMETHOPRIM

**ناوی بازرگانی:** Trimpex,trimopan,proloprim

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٢٠٠ میلی‌گرامی و گیراوەی خۆراکی ٥٠ میلی‌گرام /٥ میلی لیتر.

**گرووپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی ڕێرەوی میز و هەوکردنی تیژ و موزمینی بۆریچکەکان و هەوکردنی سی یەکان بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوران، پەڵە، زیادبوونی پۆتاسیۆم، سووربوونەوە، هەستیاربوون بەڕوناکی، حەساسیەت، نارێکی لێدانی دڵ تا، ئازاری جومگە و ماسولکە، سکچوون، خوێنبەربوون، ڕوشانی زایەندی ژنان، هەوکردنی پەردەکانی مێشك.

**بڕی دەرمان:** بۆ هەوکردنی تیژ گەورەکان ٢٠٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك، منداڵی ١ مانگ تا ١٢ ساڵ، ٤ میلیگرام/کیلۆگرام (لایەنی زۆر ٢٠٠ میلیگرام) هەموو ١٢ سەعاتێك. یان ٦ هەفتە تا ٦ مانگ ٢٥ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك، ٦ مانگ تا ٦ ساڵ ٥٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك. ٦ تا ١٢ ساڵ ١٠٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك. بۆ پێشگرتن ١٠٠ میلیگرام لە شەودا، منداڵی خوار ١٢ ساڵ ٢ میلیگرام/کیلۆگرام (لایەنی زۆر ١٠٠ میلیگرام) لە شەودا.

## ترایمیپرامین: TRIMIPRAMINE

**ناوی بازرگانی:** Surmontil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٥ و ١٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ٥٠ میلیگرامی و قەترەی خۆراکی ٤٪.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی خەمۆکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، گێژی، تەشەنوج، لەرزین، سەرئێشە، دڵەڕاوکێ، ئارامی زیاد لەڕادە، تووڕەیی، زیادبوونیIOP، تێکچوونی بینین، جەڵدە، نارێکی لێدانی دڵ پەککەوتنی دڵ ڕشانەوە، هێڵنجدان، زەردی، وشکی دەم، قەبزی، نەمانی ئارەزوی خواردن، گیرانی میز، هەستیاربوون بەڕوناکی، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠ تا ٧٥ میلیگرام ڕۆژانە لەبڕی دەرمانی دابەشکراودا ڕێی پێ دەدرێت. ئەتوانی لە حاڵەتی پێویستدا کەبڕی دەرمان بەتەدریجی تا ڕۆژانە ٣٠٠ میلیگرام زیاد بکەیت. پیرەکان ١٠ تا ٢٥ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار.

## تریپل سەلفا: TRIPLE SULFA

**ناوی بازرگانی:** Sulf,trysuldayto sultrin

**شێوەی دەرمان:** حەبی (سەلفاپیازۆل ١٧٢,٥ میلیگرام + سەلفاسیتامید ١٤٣,٧٥ میلیگرام + سەلفابێنزامید ١٨٤ میلیگرام ). کرێمی زایەندی ژنان (سەلفاپیازۆل ٣,٤٢٪ + سەلفاسیتامید ٢,٨٦٪ + سەلفابێنزامید ٣,٧٪).

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی دەزگای زایەندی ژنان بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە، پەڵە، سووربونەوە.

**بڕی دەرمان:** ١ ئەپلیکاتور یان ١ حەب بەشێوەی زایەندی ژنان، ڕۆژانە ٢ جار بۆ ماوەی ٤ تا ٦ ڕۆژ. پاشان ئەتوانی کە بڕی دەرمان بۆ نیوە یان چارەك کەمبکەیتەوە.

## ترایپرۆلیدین: TRIPROLIDINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Zymine

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی خۆراکی ١,٢٥ میلیگرام/٥میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antihistamine

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردن و حەساسیەتی لوت و حەساسیەتی وەرزی و سەرمابوون و خوران و پژمین و ئاوکردنی چاو و حەساسیەتی پێست بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی بینین، وشکبوونەوەی دەم، هێڵنجدان، ئازاری گەدە، قەبزی، سکچوون، گێژی، بێخەوی، خەوزڕان، گۆڕانی ئارەزوی خواردن، خەمۆکی، وشکبوونەوەی گەروو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢,٥ تا ١٠ میلیگرام لە ڕۆژێکدا. منالان ١,٢٥ تا ٥ میلیگرام لە ڕۆژێکدا.

## تریپتۆریلین: TRIPTORELIN

**ناوی بازرگانی:** Trelstar, decapeptyl, dipherelin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٣,٧٥ میلیگرامی و ١١,٢٥ میلیگرامی و ٢٢,٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتووی پرۆستات و ئیلتیهابی پەردەی ناوپۆشی منداڵدان و بۆ چارەسەری نەزۆکی لەژناندا و زوو باڵغبوون بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، تورەیی، هەڵوەرینی موو، ئازاری سك، ئارەقکردنەوە، زیپکە، کەمبوونی چەوری، تێکچوونەکانی بێ نوێژی، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، کرژبوونی بۆری هەوا، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** بۆ شێرپەنجەی پێشکەوتووی پرۆستات ٣,٧٥ میلیگرام ماسولکەیی IM هەر ٤ هەفتە ١ جار ڕێی پێ دەدرێت. بۆ ئیلتیهابی پەردەی ناوپۆشی منداڵدان ٣,٧٥ میلیگرام ماسولکەیی IM هەر ٤ هەفتە ١ جار ڕێی پێ دەدرێت. (ماوەی چارەسەر ٦ مانگە). بۆ زوو باڵغبوون ١١,٢٥ میلیگرام هەموو ٣ مانگێك.



## ترۆلامین سالیسیلەیت: TROLAMINE SALICYLATE

**ناوی بازرگانی:** Myoflex

**شێوەی دەرمان:** کرێمی مەوزوعی ١٠٪.

**گروپی دەرمان:** Topical analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری پەیکەرەماسولکە و بۆ کەمکردنەوەی ئاوسان و ئیلتیهاب لە ماسولکە و جومگەکاندا و پوکانەوەی ئێسك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سوربونەوە و ڕوشانی پێست، پەڵە، شەرا، خوران، ئاوسان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالان ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا.

## ترۆپیکامید: TROPICAMIDE OPH.

**ناوی بازرگانی:** Midriacyl

**شێوەی دەرمان:** قەترەی چاو ١٪ و ٠,٥٪ (١٠میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Anticholinergic

**بەکارهێنان:** فراوانکەری بیلبیلەی چاوە و بۆ چارەسەری شەلەلی ماسولکەی برژانگی چاو و بۆ لێکۆڵینەوەی چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی ڕەفتار لە منداڵاندا، تێکچوونی بینین، سەرئێشە. تا. وشکی لوت،پێکەوە ئیشنەکردنی ماسولکەکان، زیادبوونی IOP، ترس لە ڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری شەلەلی ماسولکەی برژانگی چاو ١ تا ٢ قەترە دەکرێتە هەر چاوێکەوە، پاش لە ٥ خولەك ١ جاری تر دوبارەدەکرێتەوە. بۆ لێکۆڵینەوەی چاو ١ تا ٢ قەترە دەکرێتە هەر چاوێکەوە (ئەم دەرمانە ١٥ تا ٢٠ خولەك پێش لە لێکۆڵینەوەی چاو بەکاردەهێنرێت.

## ترۆپیسیترۆن: TROPISETRON HCL

**ناوی بازرگانی:** Novaban

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥ میلیگرامی و دەرزی ١ میلیگرام/میلیلیتر (٥ میلی لیتر).

**گروپی دەرمان:** Antiemetic

**بەکارهێنان:** دژی هێڵنجدان و ڕشانەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، سەرگێژبوون، هیلاکی، ئازاری سك، قەبزی، سکچوون، پەڵە، گیرانی میز، ئازاری قەفەسەی سنگ.

**بڕی دەرمان:** بۆ پێشگرتن لە هێڵنجدان و ڕشانەوە بەهۆی چارەسەری کیمیایی یەوە گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ٤ ساڵ نیوسەعات پێش لە دەستپێکردنی چارەسەری کیمیایی، ٥ میلیگرام دەماری ڕێی پێ دەدرێت. پاشا بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ، ٥ میلیگرام ڕۆژانە خۆراکی ڕێی پێ دەدرێت. بۆ پێشگرتن لە هێڵنجدان و ڕشانەوە بەهۆی چارەسەری تیشکی یەوە گەورەکان ٥ میلیگرام خۆراکی، ڕۆژانە ٢ جار.

## ترۆسپیۆم: TROSPIUM CHLORIDE

**ناوی بازرگانی:** Regurin

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ میلیگرامی و کەپسولی ٦٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antispasmodic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کرژبوونی ماسولکەی میزەڵدان و چالاکی زیاد لە ڕادەی میزەڵدان و نیشانەکانی لە میزکردنی دوبارە و بەپەلەمیزکردن و نەتوانینی کۆنترۆلکردنی میزکردن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، تەنگەنەفەسی، وشکبوونەوەی دەم و قورگ، ئازاری ماسولکە و جومگە، وشکبوونەوەی چاو، بێخەوی، پەڵە، تێکچوونی بینین، قەبزی، بەگرانی هەناسەدان، ئاوسان، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی زیاتر لە ١٢ ساڵ ٢٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار پێش خواردن. یان کەپسولی ٦٠ میلیگرامی خۆراکی ڕۆژانە ١ جار لە بەیانیاندا.

## تریپتۆفان: TRYPTOPHAN

**ناوی بازرگانی:** Optimax

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی خەمۆکی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی، هێڵنجدان، سەرئێشە، خرۆشان، شڵەژان، سکچوون، تا، نارەقکردنەوە، ڕشانەوە، گێژی، وشکی دەم، نەمانی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١ گرام ڕۆژانە ٣ جار. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٦ گرامە. بڕی دەرمانی کەمتر ئەگونجێت بەتایبەتی لە پیرەکان و لاوازی جگەر و گورچیلەدا.

**تیوبیرکیولین:** TUBERCULIN

**ناوی بازرگانی:** Aplisol, Tubersol

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥ یەکە/٠,١ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Diagnostic agent

**بەکارهێنان:** بۆ تەشخیصی نەخۆشی سیل بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سووربونەوەی شوێنی دەرزی لێدان، برینی پێستی، پەڵە، ئازار، تێکچوونی شوێنی دەرزی، خوران.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵان ٥ یەکە.

***



## یولیپریستاڵ ئەسیتەیت: ULIPRISTAL ACETATE

**ناوی بازرگانی:** EllaOne

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Contraceptive

**بەکارهێنان:** بەپەلە دژی سکپڕی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سك، گێژی، هیلاکی، سەرئێشە، تێکچوونی بێ نوێژی، ئازاری پشت، ئازاری ماسولکە، لەرزین، کرژبوونی منداڵدان، وشکی دەم، تێکچوونی بینین، خوران، پەڵە، هەستیاری مەمك، سوربونەوە.

**بڕی دەرمان:** ٣٠ میلیگرام وەك یەك بڕی دەرمان دەستبەجێ ئەبێت پاش لە ئەنجامدانی کاری سێکسی بێت. بەڵام نابێت درەنگتر لە پاش ١٢٠ سەعات بێت.

## ئەندیسینوەیتس: UNDECENOATES

**ناوی بازرگانی:** Mycota

**شێوەی دەرمان:** کرێم و پاودەر و سپرای.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** دژی کەڕووە و بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی نێوان پەنجەکانی پێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی مەوزوعی، سوربونەوە، سوتانەوە، خوران.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی کەڕوویی نێوان پەنجەکانی پێ، ڕۆژانە ٢ جار بەکاردێت، بەردەوام دەبێت بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ پاش لە چاکبوونەوەی برینەکە. بۆ پێشگرتن لە هەوکردنی کەڕوویی نێوان پەنجەکانی پێ، ڕۆژانە ١ جار بەکاردێت.



## یوروفۆلیترۆپین: UROFOLLITROPIN

**ناوی بازرگانی:** Fertinex,metrodin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ماسولکەیی ٧٥ یەکەیی.

**گروپی دەرمان:** Gonadotropin

**بەکارهێنان:** دەرمانی سکپڕکردنە و هۆرمۆنی هاندەری هێلکە (FSH) گرنگە بۆ ئەوەی هانی گەشەی هێلکە بدات، بۆ چارەسەری نەزۆکی و بۆ یارمەتی هێلکەدان بۆ دروستکردنی هێلکەی زۆر بۆ بەکارهێنانیان لەسکپڕکردنی ناو شوشەدا (IVF) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** پەڵە، شەرا، هەڵوەرینی موو، وشکی. ئازاری مەوزوعی. سکچوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، غازات، ئازاری سك، زیاد لێدانی دڵ، داخرانی مولولەی خوێن، سەرئێشە، ئازاری ماسولکە، هیلاکی، خوێنبەربوونی ناوەوەی صەفاق.

**بڕی دەرمان:** بۆ یارمەتی هێلکەدان بۆ دروستکردنی هێلکەی زۆر بۆ بەکارهێنانیان لەسکپڕکردنی ناو شوشەدا (IVF) گەورەکان ١٥٠ تا ٢٢٥ یەکە ماسولکەیی لە ڕۆژی ٢ تا ٣ دەورەی بێ نوێژی تا کۆتایی هاتنی قۆناغی هێلکەیی، ١ یان ٢ جار لە ڕۆژێکدا پاش لەئەوە، ٥ تا ١٠ هەزار یەکە، (HCG) ڕێی پێ دەدرێت. بۆ چارەسەری سکپڕنەبوونی ژنان لە نەخۆشی هێلکەدانی فرەتورەکەیی گەورەکان ٧٥ یەکە ماسولکەیی ڕۆژانە ١ جار بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ ١ ڕۆژ پاش لەو ٥٠٠٠ تا ١٠٠٠٠ یەکە، (HCG) ڕێی پێ دەدرێت. ئەتوانی لەکاتی پێویستدا کە بڕی دەرمان تا ١٥٠ یەکە زیادبکەیت. بۆ هاندانی ئەسپێرماتۆجێنیسس (پەککەوتنی هێلکەگونەکان بۆ دروستکردنی تۆو) لە چارەسەری نەزۆکی پیاوان گەورەکان (FSH) ٧٥ یەکە لە ڕۆژێکدا یان ٧٥ تا ١٥٠ یەکە ٢ تا ٣ جار لە هەفتەیەکدا بە بڕی دەرمانی هاوکات ١٠٠٠ تا ٢٠٠٠ یەکە، (HCG) چارەسەر ئەبێت لانی کەم بۆ ٣ تا ٤ مانگ بەردەوام بێت.

## یوروکینەیز: UROKINASE

**ناوی بازرگانی:** Abbokinase

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٧٥ هەزار و ٢٥٠ هەزار یەکە/ڤیاڵ

**گروپی دەرمان:** Fibrinolytic drug

**بەکارهێنان:** دژی مەیین و کلۆبوونی خوێنە و بۆ چارەسەری مەیینی خوێنی خوێنبەری تەپلەیی و داخرانی کاپیتەری (لولەیەکی نەرمە ئەکرێتە ناو مولولەی خوێنەوە) خوێنهێنەری و بۆ تواندنەوەی خوێنی مەییوی گەورە و تیژی سی و مەیینی خوێن لە قوڵایی دەماردا بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، میزی خوێناوی، خوێنبەربوون، کرژبوونی بۆری هەوا، شەرا، تۆدیای سی، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری پشت، تا، تەشەنوج، نارێکی لێدانی دڵ.

**بڕی دەرمان:** بۆ مەیینی خوێنی خوێنبەری تەپلەیی گەورەکان ٦٠٠٠ یەکە لە خولەکێکدا تا کاتێ خوێنبەر دەکرێتەوە (لە ماوەی ١٥ تا ٣٠ خولەکدا). داخرانی کاپیتەری خوێنهێنەری گەورەکان ٥٠٠٠ یەکە لە ناوەوەی کاپیتەری داخراوی تێبینیکراو دەرزی لێ دەدرێت. بۆ تواندنەوەی خوێنی مەییوی گەورە و تیژی سی گەورەکان ٤٤٠٠ یەکە/کیلۆگرام بەدەمار لە ماوەی ١٠ خولەکدا دەرزی لێ دەدرێت. پاشان ٤٤٠٠ یەکە/کیلۆگرام لە سەعاتێکدا بۆ ماوەی ١٢ سەعات لە ڕێگەی ئینفیوشنی دەماری دەبێت. بۆ لایەنی ئینفیوشنی دەماری، پەمپی ئینفیوشن بەکاردەهێنرێت.

## یورسۆدیۆکسیکۆلیك ئەسید: URSODEOXYCHOLIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Ursodiol,ursobil

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٥٠ و ٣٠٠ و میلیگرامی و کەپسولی ٢٥٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ٢٥٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر.

**گروپی دەرمان:** Bile acids

**بەکارهێنان:** بۆ تواندنەوەی بەردەکانی زراو و بۆ چارەسەری سیروزی سەرەتایی زراو، سیروز (نەخۆشی یەکی جگەرە، ئەستور دەبێ و لەپاشا دێتەوەیەك و دەپوکێتەوە و بە ڕەنگی زراو هەڵدەگەرێت) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، خوران، بوون بەکلسی بەردی زراو.

**بڕی دەرمان:** بۆ تواندنەوەی بەردەکانی زراو ٨ تا ١٢ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە وەك یەك بڕی دەرمان لەکاتی خەودا یان لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراودا، بۆ ماوەی تا ٢ ساڵ، چارەسەر بەردەوام دەبێت بۆ ماوەی ٣ تا ٤ مانگ پاش لە توانەوەی بەردەکان. بۆ چارەسەری سیروزی سەرەتایی زراو ١٠ تا ١٥ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە وەك یەك بڕی دەرمان یان لە ٢ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## یوستیکینیوماب: USTEKINUMAB

**ناوی بازرگانی:** Stelara

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٩٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Cytokine modulator

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی پلاگ سۆریاسیسی مامناوەند و توند بەکاردێت.

ئاگادار بێ: دەرمان شوێنەواری خراپ و کاریگەری پێچەوانەی هەیە، ئەگەر بەگوێرەی بەکاربهێنرێت!



**کاریگەری لاوەکی:** هەوکردن، سکچوون، سەرئێشە، هیلاکی، گێژی، خەمۆکی، ئازاری ماسولکە و جومگە، گیرانی لوت، خوران، حەساسیەت، ئازاری گەروو.

**بڕی دەرمان:** بە دەرزی ژێرپێستی بۆ پلاگ سۆریاسس، گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ، کێشی لەشی خوار ١٠٠ کیلۆگرام، سەرەتا ٤٥ میلیگرام، پاشان ٤٥ میلیگرام ٤ هەفتە پاش لە بڕی دەرمانی سەرەتا، پاشان ٤٥ میلیگرام هەموو ١٢ هەفتەیەك، کێشی لەشی سەروی ١٠٠ کیلۆگرام، سەرەتا ٤٥ تا ٩٠ میلیگرام، پاشان ٤٥ تا ٩٠ میلیگرام ٤ هەفتە پاش لە بڕی دەرمانی سەرەتا، پاشان ٤٥ تا ٩٠ میلیگرام هەموو ١٢ هەفتەیەك. بەردەوام نابێت ئەگەر لە ١٦ هەفتەدا کاردانەوەی نەبوو.

***

# V

## ڤالاسایکلوڤیر: VALACYCLOVIR

**ناوی بازرگانی:** Valtrex

**شێوەی دەرمان:** حەبی کەپسولی ٥٠٠ و ١٠٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی ڤایرۆسی تامیسکی لێو و پشتێنەیی و زایەندی و مێکوتە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك، هێلاکی، گێژی، خوران، پەڵە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، تەشەنوج، تێکچوونی هەرس.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ١٢ ساڵ ٥٠٠ میلیگرام تا ٢ گرام ٢ تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## ڤالدیکۆکسیب: VALDECOXIB

**ناوی بازرگانی:** Bextra

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەبی خۆراکی.

**گروپی دەرمان:** NSAID

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازار و ئیلتیهابی جومگەکان و ڕۆماتیزم و ئازاری نارێکی بێ نوێژی سەرەتایی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، ئاوبەندی، پەڵە، ئازاری سك، جیوب، سکچوون، غازات، هەرسنەکردن، هێڵنجدان، ئازاری پشت، گێژی، سەرئێشە، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، هەوکردنی جگەر، پەککەوتنی دڵ ئازاری سنگ، ناتەواوی گورچیلە، سووربوونەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلیگرام بەشێوەی خۆراکی ١جار لەڕۆژێکدا بۆ هەوکردنی جومگەکان و ٢٠ میلیگرام ٢ جار لەڕۆژێکدا بەپێی پێویست بۆ ئازاری نارێکی بێ نوێژی سەرەتایی و ١٠ میلیگرام خۆراکی ١ جار لەڕۆژێکدا بۆ ڕۆماتیزم.



## ڤالگانسیکلۆڤیر: HCL VALGANCICLOVIR

**ناوی بازرگانی:** Valcyte

**شێوەی دەرمان:** حەبی خۆراکی ٤٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی تۆڕی چاو بە هۆی سایتۆمێگالۆڤایرۆس لەو نەخۆشانەی کۆئەندامی بەرگرییان لاوازە و بەتایبەتی لەئایدزدا و بۆ بەرگری لە هەوکردنی سایتۆمێگالۆڤایرۆس لەهەندێ نەخۆشی چاندنی ئەندامدا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ناجێگیری، گێژی، بێخەوی، سەرئێشە، نەخۆشی گورچیلەیی موحیگی، تا، نەخۆشی دەروونی، حەملەی تەشەنوجی، کەمبوونەوەی خرۆکەی سپی و پەرەی خوێن، لاوازی مۆخی ئێسك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمخوێنی، ئازاری سك، تێکچوونی گەدە، هەڵوەرینی موو، ناریکی لێدانی دڵ، هەوکردنی پەنکریاس، نەزۆکی پیاوان، لەرزین، میزی خوێناوی، تێکچوونی بیستن و بینین، برینی دەم، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری ماسولکە و جومگە، ئازاری چاو گوێ، نەمانی ئارەزوی خواردن، قەبزی، غازات.

**بڕی دەرمان:** بۆ هەوکردنی تۆڕی چاو بەهۆی سایتۆمێگالۆڤایرۆسی چالاك لەو نەخۆشانەی توشبوون بەئایدز گەورەکان ٩٠٠ میلی‌گرام خۆراکی لەگەڵ خواردندا بۆ ماوەی ٢١ ڕۆژ. چارەسەری پاراستن ٩٠٠ میلی‌گرام خۆراکی لەگەڵ خواردندا ١ جار لە ڕۆژێکدا. بۆ هەوکردنی تۆڕی چاو بەهۆی سایتۆمێگالۆڤایرۆسی ناچالاك ٩٠٠ میلی‌گرام خۆراکی لەگەڵ خواردندا ١ جار لە ڕۆژێکدا. بۆ پێشگیری لە نەخۆشی سایتۆمێگالۆڤایرۆس لە چاندنی ئەندامدا وەك گورچلیە و دڵ و پەنکریاس گەورەکان ٩٠٠ میلی‌گرام خۆراکی لەگەڵ خواردندا ١ جار لە ڕۆژێکدا، لەماوەی ١٠ ڕۆژ لە چاندنی دەست پێدەکات و تا ١٠٠ ڕۆژ پاش لە ئەوە بەردەوام دەبێت.

## ڤالپۆرەیت سۆدیۆم: VALPROATE SODIUM

**ناوی بازرگانی:** Depacon

**شێوەی دەرمان:** شروبی ٢٠٠ میلی‌گرام/٥ میلی‌لیتر و حەبی ٢٠٠ میلی‌گرامی و کەپسولی ٣٠٠ میلی‌گرامی و حەبی ٢٠٠ و ٥٠٠ میلی‌گرامی (سۆدیۆم ڤالپۆرەیت ٣٣٣ میلی‌گرام + ڤالپرۆیك ئەسید ١٤٥ میلی‌گرام).

**گروپی دەرمان:** Anticonvulsant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری تەشەنوجی مەوزوعی و عمومی و بۆ پێشگرتن لە شەقیقە و بۆ چارەسەری مانیا (شێتی) و تێکچوونی دووجەمسەری بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** ئارامی زیاد لە ڕادە، لەرزین، سەرئێشە، نەخۆشی دەروونی، تێکچوونی ڕەفتار، هێڵنجدان، قەبزی، سەرگێژبوون، ڕشانەوە، سکچوون، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، ئازاری سك، زیادبوونی لیك، دووبینی، هەوکردنی جومگە، پەڵە، هەڵوەرینی موو، گەورەبوونی مەمك، زیادبوونی شیر، زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر، چاوە لەقێ.

**بڕی دەرمان:** بۆ تەشەنوجی سادە و ئاڵۆز و جۆرە جیاوازەکانی تەشەنوج گەورەکان لە سەرەتا ١٥ میلیگرام/کیلۆگرام لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. لە کاتی پێویست بۆ ماوەی ١ هەفتە ئەتوانی ٥ تا ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام بە بڕی دەرمانی ڕۆژانە زیاد بکەیت. لایەنی زۆری بڕی دەرمانی ڕۆژانە ٦٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. لە ساوایاندا تەنها لە فێی مقاوم بەکاردێت. بۆ مانیا ٧٥٠ میلیگرام خۆراکی لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. بۆ پێشگری لە شەقیقەدا ٢٥٠ میلیگرام ٢ جار لە ڕۆژێکدا.

## ڤالپرۆیك ئەسید: VALPROIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Depakene, stavzor

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥٠ میلیگرامی و شروبی ٢٥٠ میلیگرام/٥ میلی لیتری و کەپسولی ١٢٥ و ٢٥٠ و ٥٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Anticonvulsant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری جۆرە جیاوازەکانی نەخۆشی فێ، هەندێ جار لەگەڵ دەرمانەکانی تری نەخۆشی فێ دا و بۆ پێشگری لە شەقیقە و ئەلزایمەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی هەرس، خەواڵویی، گێژی، دووبینی، پەڵە، ئیلتیهابی پەنکریاس، هەڵوەرینی موو، خوێنبەربوون.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری فێ گەورەکان و منداڵان ٣٠ تا ٦٠ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی لە ٢٤ سەعاتدا دابەشکراو لە ڕۆژانە ٣ جاردا، پاش لە دەستپێکردنی ١٠ تا ١٥ میلیگرام/کیلۆگرام لە ٢٤ سەعاتدا. بۆ چارەسەری مانیا ٧٥٠ میلیگرام لە ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. زیاد دەکرێت بۆ ٦٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا. بۆ چارەسەری شەقیقە ٢٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار، زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆر ١٠٠٠ میلیگرام، کەمدەکرێتەوە لەگەڵ لاوازی جگەردا.

## ڤالروبیسین: VALRUBICIN

**ناوی بازرگانی:** Valstar

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی ئینراڤیسیکاڵ ٤٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antineoplastic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی میزەڵدان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی میزەڵدان، بوونی خوێن لە میزدا، هەوکردنی میزەڕۆ، ئازاری سك، هێڵنجدان، سەرئێشە، ئازاری میزەڵدان، میزکردنی بەئازار، میزکردنی شەوانە، کرژبوونی میزەڵدان، گیرانی میز، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن، هەوکردنی سی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٨٠٠ میلیگرام ئینراڤیسیکاڵی (نەکرێتە ناو میزەڵدان) هەفتانە ١ جار بۆ ماوەی ٦ هەفتە.

## ڤاندیتانیب: VANDETANIB

**ناوی بازرگانی:** Caprelsa

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٣٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Tyrosine kinase inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پایرۆیدی نوخاعی (مۆخی) کە ناتوانرێت بەنەشتەرگەری چارەسەر بکرێت یان پێش لەوەی بڵاوبێتەوە بۆ بەشە جیاوازەکانی لەش بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سکچوون، زیپکە، پەڵە، کەمبوونەوەی کالسیۆم و گلوکۆز، ئازاری سك، هەوکردنی کۆڵۆن، نەمانی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، هیلاکی، هەوکردنی سی یەکان، هەوکردنی پەنکریاس، خوێنبەربوون، پەککەوتنی دڵ، ناتەواوی هەناسەدان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠٠ میلیگرام ١ جار لە ڕۆژێکدا.

## ڤالسارتان: VALSARTAN

**ناوی بازرگانی:** Diovan

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٤٠ و ٨٠ و ١٦٠ میلیگرامی و حەبی ٤٠ و ٣٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Angiotensin II Antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەستانی بەرزی خوێن و پەککەوتنی دڵ و جەڵدەی دڵ و شەکرەی نەخۆشی گورچیلەیی بەکاردێت.

بۆ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی

**کاریگەری لاوەکی:** تزمبونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی کالسیۆم، لاوازی گورچیلەیی، تێکچوونی هەرس، بێهۆشی، هیلاکی، کۆکە، سەرئێشە، پەککەوتنی تیژی گورچیلە، کەمبوونی خرۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، ئازاری ماسولکە، پەڵە، خوران، هەوکردنی دەفری خوێن، ئازاری سك، سکچوون، ئازاری جومگە، گێژی، ئازار لەکاتی میز کردن، هێڵنجدان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژانە ٨٠ تا ١٦٠ میلیگرام، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ڕۆژانە ٣٢٠ میلیگرامە.

## ڤانکۆمایسین: HCL VANCOMYCIN

**ناوی بازرگانی:** Vancocin

**شێوەی دەرمان:** سەسپێنشنی ٥٠٠ میلیگرام/ ٦ میلیلیتر و دەرزی ٥٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ١٢٥ و ٢٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antibiotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی توند بەهۆی بەکتریای ستافیلۆکۆکەس ( لە کاتی نەمانی کاریگەری یان قەدەغەبوونی بەکارهێنانی دژەزیندەگی یەکانی تر ) و بۆ پێشگرتن لە هەوکردنی پەردەی ناوەوەی دڵ و بۆ هەوکردنی ڕیخۆڵە و کۆڵۆنی سیدۆمێمبرەین و ستافیلۆکۆکەس بەهۆی دژەزیندەگی یەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی گوێ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ژەهراویبوونی گورچیلە، پەڵە، سوربونەوە، هەوکردنی خوێنهێنەر، تا، تێکچوونی هەرس، تەنگەنەفەسی، زیادبوونی ئیزنۆفیل، لەرز.

**بڕی دەرمان:** بۆ چارەسەری هەوکردنی توند بەهۆی بەکتریای ستافیلۆکۆکەس ( لە کاتی نەمانی کاریگەری یان قەدەغەبوونی بەکارهێنانی دژەزیندەگی یەکانی تر ) گەورەکان ٥٠٠ میلیگرام بەدەمار هەر ٦ سەعاتێك یان ١ گرام بەدەمار هەر ١٢ سەعاتێك یان ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٤ جار. منداڵان ٤٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە خۆراکی یان دەماری دابەشکراو لە هەر ٦ سەعاتێکدا. ساوایان سەرەتا بە ١٥ میلیگرام/کیلۆگرام، پاشان ١٠ میلیگرام/کیلۆگرام ڕۆژانە بەدەمار دابەشکراو هەر ١٢ سەعاتێك بۆ هەفتەی یەکەمی ژیانی و پاش هەر ٨ سەعاتێك تا ١ مانگی. بۆ پێشگرتن لە هەوکردنی پەردەی ناوەوەی دڵ گەورەکان ١ گرام بە ئینفیوشنی دەماری لەسەرخۆ لە ماوەی ١ سەعاتدا، ١ سەعات پێش لە نەشتەرگەری. منداڵان بە کێشی کەمتر لە ٢٧ کیلۆگرام ٢٠ میلیگرام/کیلۆگرام بەدەمار. بۆ هەوکردنی ڕیخۆڵە و کۆڵۆنی سیدۆمێمبرەین و ستافیلۆکۆکەس بەهۆی دژەزیندەگی یەوە گەورەکان ١٢٥ تا ٥٠٠ میلیگرام خۆراکی هەر ٦ سەعاتێك بۆ ماوەی ٧ تا ١٠ ڕۆژ. منداڵان ٤٠ میلیگرام/کیلۆگرام خۆراکی ڕۆژانە دابەشکراو بە بڕە دەرمانەکانی هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك بۆ ماوەی ٧ تا ١٠ ڕۆژ (لایەنی زۆر ڕۆژانە ٢ گرام).



## ڤاردینافیل: VARDENAFIL

**ناوی بازرگانی:** Levitra

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ و ٥ و ١٠ و ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Anti impotence agent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری لەپیاوەتی کەوتن و لاوازی سێکسی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نارێکی لێدانی دڵ جیوب، گێژی، تەشەنوج، ئازاری سنگ، ئارەقکردنەوە، هێڵنجدان، کەمبوونەوەی بیستن، ئاوسانی دەست و پێ، تێکچوونی بینین، سەرئێشە، تێکچوونی هەرس، ئازاری پشت، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچوونی گەدە، سووربونەوە، هەوکردن و حەساسیەتی لوت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥ تا ١٠ میلیگرام ٦٠ خولەك پێش لە ئەنجامدانی کاری سێکسی. لایەنی زۆری یەك بڕی دەرمان ٢٠ میلیگرامە.

## ڤارینکلاین: VARENICLINE

**ناوی بازرگانی:** Chantix,champix

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٠,٥ میلیگرامی و ١ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Smoking cessation agent

**بەکارهێنان:** بۆ یارمەتی تەرکدانی جگەرە و وازهێنان لە کێشانی جگەرە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، سەرئێشە، ئازاری سنگ، غازات، بێخەوی، ڕشانەوە، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، ئازاری سك، تا، تێکچوونی خەو، قەبزی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان لە ڕۆژی ١ تا ٣ بڕی ٠,٥ میلیگرام خۆراکی ١ جار لە ڕۆژێکدا. لەڕۆژی ٤ تا ٧ بڕی ٠,٥ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا. لە ڕۆژی ٨ تا کۆتایی چارەسەر ١ میلیگرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا.

## ڤازوپریسین: VASOPRESSIN

**ناوی بازرگانی:** Pitressin,Diapoid

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٠ یەکە/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antidiuretic hormone

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرەی درۆ ( Diabetes insipidus) و چارەسەری خوێنبەربوونی بەشی سەرەوەی دەزگای هەرس بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بچوکبوونەوەی مولولەکانی خوێن، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، ڕشانەوە، نارێکی لێدانی دڵ، لاوازی ماسولکەیی دڵ، تەسکبونەوەی بۆریچکەکانی سی، سکچوون، سەرئێشە، سەرگێژبوون، لەرزین، زیادبوونی حەساسیەت، ئازاری سك.

**بڕی دەرمان:** بۆ نەخۆشی شەکرەی درۆ گەورەکان ٥ تا ١٠ یەکە ماسولکەیی یان ژێرپێستی ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار لەکاتی پێویست. منالان ٢,٥ تا ١٠ یەکە ماسولکەیی یان ژێرپێستی ڕۆژانە ٢ تا ٤ جار لەکاتی پێویست. بۆ خوێنبەربوونی بەشی سەرەوەی دەستگای هەرس گەورەکان ٠,٢ تا ٠,٤ یەکە لە خولەکێکدا بە خوێنهێنەر و یان ٠,١ تا ٠,٥ یەکە لە خولەکێکدا بەخوێنبەر ڕێی پێدەدرێت.

## ڤیکیورۆنیۆم: VECURONIUM

**ناوی بازرگانی:** Norcuron

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ١٠ و ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Skeletal muscle relaxant

**بەکارهێنان:** بۆ خاوبوونەوە و شلکردنەوەی پەیکەرەماسولکە و پێش لە بەنجی عمومی بۆ نەشتەرگەری بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، خوران، پەڵە، زیادبوونی لێدانی دڵ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قرقینە، سەرئێشە، ئازاری سك، تێکچوونی هاوسەنگی، ئارەقکردنەوە، لەرزین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٠٨ تا ٠,١ میلیگرام/کیلۆگرام/دۆز دووبارەکردنەوەی هەموو سەعاتێك لەکاتێکدا پێویست بێت بەڕێگەی IV بۆڵەس، ئینفیوشنی بەردەوام ٠,٨ تا ١,٢ مایکرۆگرام/ کیلۆگرام/خولەك.

## ڤیلاگلوسیرەیز ئەلفا: VELAGLUCERASE ALFA

**ناوی بازرگانی:** Vpriv

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٤٠٠ یەکەیی.

**گروپی دەرمان:** AntiGaucher

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی بۆماوەیی (Gaucher ١) بەکاردێت، ئەم نەخۆشی یە بەهۆی کەمبوونی هەندێ ئەنزیم لەلەشدا وەك گلوکۆسیریبرۆسیدەیز کە پێویستە بۆ تێکشکاندنی مادده چەوری یەکان.



**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ئازاری سك، زیادبوونی لێدانی دڵ، بەرزبونەوە و نزمبونەوەی پەستانی خوێن، سووربونەوە، سەرئێشە، گێژی، خاوی، تا، ئازاری جومگە، ئازاری ئێسك، ئازاری پشت، حەساسیەت، پەڵە، شەرا.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی ئینفیوشنی دەماری گەورەکان و منالانی سەروی ٤ ساڵ ٦٠ یەکە/کیلۆگرام هەموو ٢ هەفتەیەك ١ جار، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بەپێی کاردانەوەکەی بۆ ١٥ تا ٦٠ یەکە/کیلۆگرام هەموو ٢ هەفتەیەك ١ جار.

## ڤێنلافاکسین: VENLAFAXINE

**ناوی بازرگانی:** Effexor

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٥ و ٣٧,٥ و ٥٠ و ٧٥ و ١٠٠ میلیگرامی و کەپسولی ٣٧,٥ و ٧٥ و ١٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری خەمۆکی و دڵەراوکێ و قەلەقی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سنگ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، ڕشانەوە، ئازاری سك، بوونی خوێن لەمیزدا، خەوالویی، تێکچوونی گەدە، لاوازی سێکسی، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، گۆڕانی کێش، دڵەکوتێ، لەرز، فراوانبوونی مولولەکانی خوێن، باوێشکدان، سەرئێشە، بەگرانی میزکردن، سکچوون، تێکچوونی بیٚ نوێژی، ئارەقکردنەوە، تێکچوونی تام، نارێکی لێدانی دڵ، خوێنبەربوونی گەدە و ڕیخۆڵە، هەڵوەرینی موو، هەوکردنی جگەر و پەنکریاس، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، خوران، شەرا، خرۆشان، توڕەیی، قەلەقی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ٧٥ میلیگرام لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا لەگەڵ خۆراکدا، بەپێی پێویست بڕەکەی زیاد دەکرێت، لایەنی زۆری بڕی دەرمان٣٧٥ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. لایەنی زۆری کەپسولی XR ٢٢٥ میلیگرامە لە ڕۆژێکدا. کەمدەکرێتەوە لە لاوازی جگەر و گورچیلەدا.

## ڤێراپامیل: VERAPAMIL HCL

**ناوی بازرگانی:** Apo-verap,calan,Isoptin,cordilox,securon

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠ و ٨٠ و ١٢٠ و ١٦٠ میلیگرامی و گیراوەی خۆراکی ٤٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و دەرزی ٢,٥ میلیگرام/میلیلیتر (٢ میلی لیتر) و حەبی ٢٤٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Calcium antagonist

**بەکارهێنان:** دژی پەستانی بەرزی خوێن و نارێکی لێدانی دڵ و ئازاری سنگ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نزمبونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، سوربونەوە، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، گێژی، هیلاکی، ئاوبەندی قولەپێ، خوران، شەرا، ئازاری ماسولکە و جومگە، گەورەبوونی مەمك، پەککەوتنی دڵ، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ بێهێزی، ئارەقکردنەوە، ئازاری سك، ئۆدیمای سی.

**بڕی دەرمان:** بۆ ئازاری سنگ گەورەکان ٨٠ تا ١٢٠ میلیگرام خۆراکی، ڕۆژانە ٣ جار. بۆ پەستانی بەرزی خوێن ٨٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ٣ جار ئەتوانی بەپێی پێویستی ئەو برە زیادبکەیت. نارێکی لێدانی دڵی سەرو سکۆڵەیی ٤٠ تا ١٢٠ میلیگرام ڕۆژانە ٣ جار. بۆ پێشگری لە سەرئێشەی شەقیقە و کلاستەر ٢٤٠ تا ٩٦٠ میلیگرام ڕۆژانە لە ٣ تا ٤ بڕی دەرمانی دابەشکراودا. دەرزی ٥ تا ١٠ میلیگرام بەدەمار لە ماوەی ١ تا ٢ خولەکدا.

## ڤێرتیپۆرفین: VERTEPORFIN

**ناوی بازرگانی:** Visudyne

**شێوەی دەرمان:** دەرزی IV ١٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Photosensitizing agent

**بەکارهێنان:** لەگەڵ چارەسەری تیشکی لەیزەر بۆ چارەسەری تێکچوونی مولولەی خوێن لە ناو چاودا بەهۆی تێکچوونی ماسولکەیی پەیوەست بەتەمەن یان نەخۆشی یەکانی تری چاو بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، هێڵنجدان، زیادبوونی کۆلیسترۆڵ خاوی، ئازاری پشت، هەستیاربوون بە ڕوناکی، تێکچوونی بینین، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، تا، خوێنبەربوون، ئازاری سنگ، خوێنبەربوونی ناو چاو، ئازار، کەمبوونەوەی بینین، سوربونەوەی چاو، ئاوسان، خورانی پێڵوی چاو، قەبزی، وشکبوونەوەی چاو، بڕینی قوڕگ، ئازاری جومگە، پەڵە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار. یان ٦ میلیگرام/مەتردوجا ڕووی لەش.

## ڤیدارابین: VIDARABINE

**ناوی بازرگانی:** Vira-A,adenine,arabinosid

**شێوەی دەرمان:** ئینفیوشنی دەماری ١٠٠میلیگرام/٥ میلیلیتر و مەڵهەم.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی چاو (HSV و HZV) ڤایرۆسی تامێسکی سادە HSV و ڤایرۆسی تامێسکی پشتێنەیی HZV بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، نەمانی ئارەزووی خواردن، ڕشانەوە، سکچوون، فێ، وڕێنە، کەمبوونی کێش، بێهێزی، لەرزین، نەخۆشی دەروونی، پێکەوە ئیش نەکردنی ماسولکەکان، هەستیاربوونی چاو بەڕووناکی، خوران، سووربونەوە، ئاوسان، ئازار، کزانەوە، ڕوشانی چاو.

**بڕی دەرمان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی چاو (HSV و HZV) ١٥ میلیگرام/ کیلۆگرام ڕۆژانە بە IV ئینفیوشن لە ماوەی ١٢ تا ٢٤ سەعاتدا. بۆ هەوکردنی ڤایرۆسی چاو مەڵهەم: گەورەکان و منداڵان بۆ هەر چاوێك هەموو ٣ سەعاتێك (٥ جار لە ڕۆژێکدا) بەکاردێت. پاش لە چاکبوونەوەی بڕی دەرمان کەمدەکرێتەوە بۆ ٢ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی زیاتر لە ٧ ڕۆژ.

## ڤیگاباترین: VIGABATRIN

**ناوی بازرگانی:** Sabril

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠٠ میلیگرامی و پاودەری خۆراکی بۆ گیراوەی ٥٠٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Anticonvulsant

**بەکارهێنان:** لەگەڵ دەرمانەکانی تردا بۆ چارەسەر و پێشگری فێی جوزئی ئاڵۆز و بۆ چارەسەری گرژبوون لە ساواکاندا لە منداڵی ١مانگ تا ٢ ساڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، تێکچوونی خەو، پژمین، تا، برینی گەروو، ئازاری جومگە، لەرزین، ئاوسان، تێکچوونی بیر و هۆش، گێژی، سەرئێشە، بێخەوی، پەڵە، تێکچوونی جگەر، زیادبوونی کێش، هەڵامەت، خەواڵوویی، دووبینی، کۆکە، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە و سی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٥٠٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار. بۆ چارەسەری گرژبوونی ساواکان لە منداڵی ١ مانگ تا ٢ ساڵ گیراوەی خۆراکی ٥٠ میلیگرام/کیلۆگرام لە ڕۆژێکدا لە ٢ بڕی دەرمانی دابەشکراو دا.

## ڤیلازۆدۆن: VILAZODONE HCL

**ناوی بازرگانی:** Viibryd

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠ و ٢٠ و ٤٠ میلیگرامی.

**گرووپی دەرمان:** Antidepressant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی خەمۆکی (MDD) بەکاردێت.



**کاریگەری لاوەکی:** دڵەکوتێ، ڕشانەوە، سکچوون، تێکچوونی خەو، گێژی، وشکی دەم، هێڵنجدان، هیلاکی، خەواڵویی، نەمانی ئارەزوی خواردن، لەرزین، نەتوانی کاری سێکسی، ئارەقکردنەوە لەشەودا، تێکچوونی بینین، غازات، ئازاری جومگە، زیادبوونی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ١٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ، پاشان زیاد دەکرێت بۆ ٢٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ و دوای ئەوەش زیاد دەکرێت بۆ ٤٠ میلیگرام ڕۆژانە ١ جار بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ. لەگەڵ خواردندا.

## ڤیلداگلیپتین: VILDAGLIPTIN

**ناوی بازرگانی:** Galvus

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antidiabetic drug

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرەی جۆری ٢ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، تۆدیمای موحیگی، کەمبوونەوەی شەکری خوێن، گێژی، قەبزی، ئازاری جومگە، لاوازی جگەر، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێرەوی هەناسە، هەوکردنی پەنکریاس، گەورەبوونی لوت،لەرزین.

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ، لەگەڵ مێتفۆرمین یان پایۆگلیتازۆن، ٥٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار، لەگەڵ سەلفۆنیلیوریا ٥٠ میلیگرام لە بەیانیاندا.

## ڤین بلاستین: VINBLASTINE

**ناوی بازرگانی:** Velbe,VLB

**شێوەی دەرمان:** ڤیاڵی ٥ و ١٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Vinca alkaloids

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی مەمك و هێلکەگون و سی و کاپۆزی سارکۆما و شێرپەنجەی خوێن هوجکین و ناهوجکین لیمفۆما و نیورۆبلاستۆما بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، ئازاری سك، برین، گیرانی میز، نەمانی ئارەزوی خواردن، خوێنبەربوونی کۆم، کەمبوونی کێش، هەڵوەرینی موو، کەمبوونی خڕۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، نەخۆشی ڕەگ، کرژبوونی بۆری هەوا، بێهێزی، هەوکردنی گەروو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۰٫۱ میلی‌گرام/کیلۆگرام یان ۳٫۷ میلی‌گرام/مەتردوجا بە دەمار هەر هەفتەیەك یان هەر ۲ هەفتەیەك ۱ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ۰٫۵ میلی‌گرام/ کیلۆگرام یان ۱۸٫۵ میلی‌گرام/مەتردوجایە، لە منالآن ۲٫۵ میلی‌گرام/مەتردوجا بەدەمار بەشێوەی یەك بڕی دەرمان هەر هەفتەیەك، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ۱۲٫۵ میلی‌گرام/مەتردوجایە.

## ڤینکریستین: VINCRISTINE

**ناوی بازرگانی:** Oncovin

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ۱ میلی‌گرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Vinca alkaloids

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی خوێن لیمفۆبلاستیك لیوکیمیای تیژ و هوجکین لیمفۆما و نیورۆبلاستۆما و شێرپەنجەی مەك و سی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، کەمبوونی کێش، تا، خرۆشان، نەخۆشی گورچیلەی موحیگی، گیرانی میز، هەڵوەرینی موو، دووبینی، کەمخوێنی، کەمبوونی خرۆکەی سپی، سەرئێشە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۱۰ تا ۳۰ مایکرۆگرام/کیلۆگرام بە دەمار یان ۰٫٤ تا ۱٫٤ میلی‌گرام/ مەتردوجا بە دەمار هەفتەی ۱ جار. منالآن ۱٫٥ تا ۲ میلی‌گرام/ مەتردوجا بە دەمار هەفتەی ۱ جار.

## ڤیندیسین سەلفەیت: VINDESINE SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Eldisine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Vinca alkaloids

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی مەمك و شێرپەنجەی خوێن لیمفۆبلاستیك لیوکیمیای تیژ و لیمفۆما بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەڵوەرینی موو، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، تا، کۆکە، ئازاری سنگ، سەرئێشە، کرژبوونی بۆری هەوا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۳ تا ٤ میلی‌گرام/ مەتردوجا دەماری هەر ۷ تا ۱٤ ڕۆژ. منالآن ٤ میلی‌گرام / مەتردوجا دەماری هەر ۷ تا ۱۰ ڕۆژ.



## ڤینۆریلبین: VINORELBINE

**ناوی بازرگانی:** Navelbine

**شێوەی دەرمان:** دەرزی دەمار ١٠ میلیگرام/میلیلیتر و کەپسولی ٢٠ میلیگرامی و ٣٠ میلیگرامی و ٨٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Vinca alkaloids

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پێشکەوتووی ئەو خانانەی سی کەبچوك نین (NSCLC) و بۆ شێرپەنجەی مەمك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، پەڵە، خوران، ڕشانەوە، سکچوون، قەبزی، ئازاری جومگە و ماسولکە، هەوکردنی پەنکریاس، تەنگەنەفەسی، هەڵوەرینی موو. نەمانی ئارەزوی خواردن، هیلاکی، ئازاری سنگ، نەخۆشی گورچیلەی موحیگی، کەمخوێنی، کەمبوونی خرۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، ئازار و کاردانەوەی شوێنی دەرزی.

**بڕی دەرمان:** بەڕێگەی خۆراکی، ٦٠ میلیگرام/ مەتردوجا هەفتانە ١ جار بۆ ماوەی ٣ هەفتە. ئەگەر تەحەمولی کرد زیاد دەکرێت بۆ ٨٠ میلیگرام/ مەتردوجا هەفتانە ١ جار، لایەنی زۆر ١٦٠ میلیگرام هەفتانە ١ جار. گەورەکان ٣٠ میلیگرام/مەتردوجا بە دەمار هەر هەفتەیەك.

## ڤۆریکۆنازۆل: VORICONAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Vfend

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ٢٠٠ میلیگرامی و دەرزی IV ٢٠٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ٤٠ میلیگرام/میلی لیتری.

**گروپی دەرمان:** Antifungal

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەوکردن بەهۆی هەوێن و جۆرەکانی تری کەڕوو (ئەسپەرجیلۆسس و هەوکردنی توند بەهۆی سیدۆسپۆریۆم و فیوساریۆم ئێس پیی و کاندیدا و هەوکردنی کەڕوویی سی و هەوکردنی کەڕوویی پێستی و هەوکردنی پەردەکانی مێشك و هەوکردنی کەڕوویی ناوەوە) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری سك، سەرئێشە. تێکچوونی بینین، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، پەڵە، ئاوبەندی، تا، هەوکردنی جگەر، تێکچوونی جگەر و گورچیلە، هەوکردنی پەنکریاس، گێژی، خەمۆکی، دڵەڕاوکێ، ئازاری سنگ، برینی گەروو، نەمانی ئارەزوی خواردن. زەردی، جیوب، ورێنە، کەمبوونی خرۆکەی سپی و پەڕەی خوێن، کەمبوونی شەکری خوێن، کەمخوێنی، خوران. هەڵوەرینی موو، هەوکردنی پێڵوی چاو، قەبزی، بێهۆشی، میزی خویناوی، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم.



**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی زیاتر لە ١٢ساڵ و کێشی زیاتر لە ٤٠ کیلۆگرام بەشێوەی خۆراکی ٤٠٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك بۆ ٢ بڕی دەرمان، پاشان ٢٠٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك، زیاد دەکرێت بۆ ٣٠٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك، ئەگەر پێویست بێت.کێشی کەمتر لە ٤٠ کیلۆگرام ٢٠٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك، پاشان ١٠٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك، زیاد دەکرێت بۆ ١٥٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك، ئەگەر پێویست بێت. منالّی ٢ تا ١٢ ساڵ سەسپێنشنی خۆراکی پێشنیارکراو ) ٢٠٠ میلیگرام هەموو ١٢ سەعاتێك. بە IV ئینفیوشن ٦ میلیگرام/کیلۆگرام هەموو ١٢ سەعاتێك بۆ ٢ بڕی دەرمان، پاشان ٤ میلیگرام/کیلۆگرام هەموو ١٢ سەعاتێك (کەمدەکرێتەوە بۆ ٣ میلیگرام/کیلۆگرام هەموو ١٢ سەعاتێك ئەگەر تەحەمولی نەکرد)، لایەنی زۆر بۆ ماوەی ٦ مانگ. منالّی ٢ تا ١٢ ساڵ ٧ میلیگرام/کیلۆگرام هەموو ١٢ سەعاتێك (کەمدەکرێتەوە بۆ ٤ میلیگرام/کیلۆگرام هەموو ١٢ سەعاتێك، ئەگەر تەحەمولی نەکرد)، لایەنی زۆر بۆ ماوەی ٦ مانگ. منالّی ١٢ تا ١٨ ساڵ ٦ میلیگرام/کیلۆگرام هەموو ١٢ سەعاتێك بۆ ٢ بڕی دەرمان، پاشان ٤ میلیگرام/کیلۆگرام هەموو ١٢ سەعاتێك (کەمدەکرێتەوە بۆ ٤ میلیگرام/کیلۆگرام هەموو ١٢ سەعاتێك، ئەگەر تەحەمولی نەکرد، لایەنی زۆر بۆ ماوەی ٦ مانگ.

## **ڤۆرینۆستات:** VORINOSTAT

**ناوی بازرگانی:** Zolinza

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Histone deacetylase inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی پێستی بەهۆی شێرپەنجەی خانەی T لیمفۆمای پێستی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، کەمبوونەوەی کێش، هەڵوەرینی موو، ئاوبەندی، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری سنگ، گێژی، وشکی دەم، کرژبوونی ماسولکە، سەرئێشە، هیلاکی، کۆکە، هەوکردنی بەشی سەرەوەی ڕێڕەوی هەناسە، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی پەڕەکانی خوێن، نەمانی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٤٠٠ میلیگرام خۆراکی ڕۆژانە ١ جار لەگەڵ خواردندا.

***



## وارفارین: WARFARIN

**ناوی بازرگانی:** Coumadin,Jantoven

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ و ٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticoagulant

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری لە مەیینی خوێن و کەمبوونەوە یان ڕێنەدان بە ڕۆیشتنی خوێن لە نەخۆشی ڕۆماتیزمی دڵ یان لەرینەوەی گوێچکەلەیی، بۆ پێشگرتن پاش لە ناشتنی دەستکردی زمانەی دڵ، بۆ پێشگرتن و چارەسەر لە مەیین و کلۆبوونی خوێنی دەمار (خوێنهێنەر) و داخستن و مەیینی خوێنی دەماری سی و بۆ حەملە کۆتاکانی سیسبوون، جەڵدەی دڵ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوێنبەربوون، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، زەردی، خراپی فرمانی جگەر، هەوکردنی پەنکریاس، تا، هەڵوەرینی موو، پەڵە، لیر، هەوکردنی پێست، کەمبوونەوەی خڕۆکەی سپی خوێن، مۆربوونەوەی پەنجەکانی پێ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ تا ٥ میلی‌گرام خۆراکی یان بەدەمار ڕێی پێ دەدرێت. پاشان بەپێی بنچینەی PT و INR ڕۆژانە ڕێکدەخرێت. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە خۆراکی ٢ تا ١٠ میلی‌گرام دەبێت.

***



## زیپامایده: XIPAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Diurexan

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Diuretics

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کۆبونەوەی ئاو لەلەشدا (ئۆدیما) و پەستانی بەرزی خوێن بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، گێژی، تێکچوونی هەرس. تێکچوونی ئەلیکترۆلیتی لەش، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی صۆدیۆم و پۆتاسیۆم و مەگنسیۆم و کلۆر، زیادبوونی کالسیۆم، زیادبوونی شەکری خوێن، زیادبوونی یوریك ئەسید، نەخۆشی پاشاکان، هەوکردنی پەنکریاس، لاوازی سێکسی، نارێکی لێدانی دڵ، هەستیاربوون بە ڕوناکی، کۆبونەوەی ئاو لە سی دا، تێکچوونی بینین، هەوکردنی سی، کەمبوونەوەی خرۆکەی سپی خوێن و پەڕەی خوێن.

**بڕی دەرمان:** بۆ ئۆدیما سەرەتا ڕۆژانە ٤٠ میلیگرام لە بەیانیاندا، زیاد دەکرێت بۆ ٨٠ میلیگرام لە حاڵەتە مقاومەکاندا، بڕی دەرمانی پاراستن ٢٠ میلیگرام لە بەیانیاندا. بۆ پەستانی بەرزی خوێن ڕۆژانە ٢٠ میلیگرام لە بەیانیاندا.

## زایلۆمیتازۆلین: XYLOMETAZOLINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Otrivine,decozal

**شێوەی دەرمان:** قەترەی لوت ٠,١٪ و قەترەی لوتی منداڵان٠,٠٥٪ و سپرای لوت ٠,١٪.

**گروپی دەرمان:** Nasal decongestant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری گیرانی لوت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی مەوزوعی، هێڵنجدان، سەرئێشە، تێکچوونی خەو، وڕێنە، ناجێگیری.

**بڕی دەرمان:** (قەترەی لوت ۱,۰٪) گەورەکان و منالآنی سەرو ۱۲سالٚ ۲ تا ۳ قەترە بۆ هەر کونەلوتێك ڕۆژانە ۲ تا ۳ جار لەکاتێکدا پێویست بێت. لایەنی زۆری ماوەی چارەسەر ۷ ڕۆژە. (قەترەی لوتی منداڵان٥٠,٠٪) منالآنی ٦ تا ۱۲ سالٚ ۱ تا ۲ قەترە بۆ هەر کونەلوتێك ڕۆژانە ۱ تا ۲ جار لەکاتێکدا پێویست بێت. لایەنی زۆری ماوەی چارەسەر ٥ ڕۆژە. (سپرای لوت ۱.۰٪) ۱ سپرای بۆ هەر کونەلوتێك ڕۆژانە ۱ تا ۳ جار لەکاتێکدا پێویست بێت، لایەنی زۆری ماوەی چارەسەر ۷ ڕۆژە. بۆ منداڵانی خوار ۱۲ سالٚ پێشنیارنەکراوە.

***



## یەلۆ فیڤەر ڤاکسین: YELLOW FEVER VACCINE

**ناوی بازرگانی:** YF –Vax

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی ڤیاڵ هەیە.

**گروپی دەرمان:** VACCINE

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگرتن لە ڤایرۆسی زەردەتا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، ئازاری ماسولکە، هەستکردن بەناخۆشی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالانی زیاتر لە ٦ مانگ ٠,٥ میلی‌لیتر ژێرپێستی قوڵ.

## یۆهیمبین هایدرۆکلۆراید: YOHIMBINE HCL

**ناوی بازرگانی:** Yocon,Aphrodyne,Yorital

**گروپی دەرمان:** Alpha ٢ adrinergic receptor blocker

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ میلی‌گرامی.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەتوانینی کاری سێکسی و لاوازی سێکسی لە پیاواندا و بۆ تەشخیصی نەتوانینی کاری سێکسی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، توڕەبوون، گێژی، قەلەقی، سەرئێشە، ڕوشان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢ تا ٥,٤ میلی‌گرام ڕۆژانە ٣ جار. ئەگەر پێویست بێت ئەتوانی کە بڕی دەرمان بۆ ڕۆژانە ٣٠ میلی‌گرام زیادبکەیت.

***

# Z

## زەفیر لۆکاست: ZAFIRLUKAST

**ناوی بازرگانی:** Accolate

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢٠ میلی‌گرامی.

**گرووپی دەرمان:** Leukotriene receptor antagonist

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگری و چارەسەری ڕەبۆ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** نەمانی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، ئازاری ماسولکەکان، سەرگێژبوون، ئازاری سك، سەرئێشە، تێکچوونی هەرس، بێخەوی، خاوی، هەوکردنی جگەر، کەمی پەڕەی خوێن، ئازاری جومگە، زیادبوونی بیلیرۆبین، هەستیاربوون بەڕوناکی.

**بڕی دەرمان:** پێشگیری و چارەسەری ماوە درێژی ڕەبۆ گەورەکان و منالآنی سەرووی ١٢ ساڵ ٢٠ میلی‌گرام خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار، ١ سەعات پێش یان ٢ سەعات دوای خواردن بەکاردەهێنرێت. منالآنی ٥ تا ١١ ساڵ ١٠ میلی‌گرام خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژێکدا، ١ سەعات پێش یان ٢ سەعات پاش لە ڕێی پێ دەدرێت. بۆ پێشگیری لە هەوکردن و حەساسیەتی وەرزی لوت گەورەکان ٢٠ تا ٤٠ میلی‌گرام خۆراکی بە شێوەی یەك بڕی دەرمان پێش لە بەیەك گەیشتن لەگەڵ ئەلیرجینەکانی (ئەو مادانەی ئەبنەهۆی حەساسیەت) موحیگی.

## زالسیتابین: ZALCITABINE

**ناوی بازرگانی:** Hivid

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی خۆراکی.

**گرووپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی HIV کە دەبێتە هۆی ئایدز بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تێکچوونی جگەر، نەمانی ئارەزوی خواردن، هەوکردنی پەنکریاس، پەڵەی پێست، هێڵنجدان، ڕشانەوە، پەڵەی پێست.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٠,٧٥ میلی‌گرام بەشێوەی خۆراکی هەموو ٨ سەعاتێك.



## زالیپلۆن: ZALEPLON

**ناوی بازرگانی:** Sonata

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٥ و ١٠ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Hypnotic

**بەکارهێنان:**: بۆ چارەسەر و کۆنترۆڵکردنی بێخەوی (بەکارهێنانی ماوەکۆتا تا ٢ هەفتە) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، دڵەڕاوکێ، تێکچوونی بینین، خەمۆکی، هێڵنجدان، ئازاری سك، نەمانی ئارەزوی خواردن، وشکبوونەوەی دەم، قەبزی، ئازاری جومگە و ماسولکە وپشت، پەڵەی پێست، بێخەوی، گێژی، فەرامۆشی، وڕێنە، خەواڵویی، تێکچوونی بۆن و بیستن و قسەکردن، هەستیاربوون بەڕووناکی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ میلی گرام بەشێوەی خۆراکی لە کاتی خەودا، پیرەکان ٥ میلی گرام. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ٥ تا ٢٠ میلی گرامە لە ڕۆژێکدا.

## زانامیڤیر: ZANAMIVIR

**ناوی بازرگانی:** Relenza

**شێوەی دەرمان:** لەڕێگەی ئیستینشاقی (.INH)ی ٥ میلی گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری نەخۆشی ئەنفلۆزای جۆری A و B بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، سەرئێشە، هێڵنجدان، سکچوون، ڕشانەوە، جیوب، کۆکە، قورسبوونی هەناسە، هەوکردنی بۆرێچکەکان، هەوکردنی گوێ و لوت و گەروو، پەڵە، کرژبوونی بۆری هەوا، شەرا.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و مناڵانی ٧ ساڵ و گەورەتر ٢ ئیستنشاقی دەمی هەر ١٢ سەعاتێك بەسود وەرگرتن لە ئامێری (دیسك هالیر) بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ. گەورەکان و منالآنی ٥ ساڵ و گەورەتر ٢ ئیستنشاقی دەمی ١جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ.

## زیکۆنۆتاید: ZICONOTIDE

**ناوی بازرگانی:** Prialt

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٢٥ مایکرۆگرام/ میلیلیتر و ١٠٠ مایکرۆگرام/ میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Analgesic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئازاری توندی موزمین بەکاردێت، لەو نەخۆشانەی کە بەئاسایی دەرمان کاریان تێ ناکات.

ن: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تا، سکچوون، نەمانی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، بێخەوی، تێکچوونی خەو، ئازاری گەدە، ئازاری جومگە، گێژی، قەبزی، تێکچوونی بینین، گیرانی میز، جیوب، دووبینی، خەمۆکی، هەوکردن ڕێرەوی میز، بەگرانی میزکردن.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢,٤ مایکرۆگرام لە ڕۆژێکدا (٠,١ مایکرۆگرام لە سەعاتێکدا) لەناو کیفدا لێی دەدرێت.

## زیدۆڤۆدین: ZIDOVUDINE

**ناوی بازرگانی:** Retrovir

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ١٠٠ و ٣٠٠ میلیگرامی و شروبی ٥٠ میلیگرام/٥ میلیلیتر و حەبی ٣٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiviral

**بەکارهێنان:** دژی هەوکردنی ڤایرۆسی (HIV) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خەوالویی، سەرئێشە، نەمانی ئارەزوی خواردن، سەرگێژبوون، تەشەنوج، بێهێزی، خەمۆکی، غازاتی سك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوێنبەربوونی کۆم، کەمخوێنی، کەمبوونی پەرەی خوێن، ئازاری سنگ، قەلەقی.

**بڕی دەرمان:** هەوکردنی ڤایرۆسی (HIV) نیشانەدار گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ١٠٠ میلیگرام خۆراکی هەر ٤ سەعاتێك ١ جار ڕۆژانە ٦٠٠ میلیگرام). منداڵانی ٣ مانگ تا ١٢ ساڵە ١٨٠ میلیگرام/مەتردوجا هەر ٦ سەعاتێك بە عیبارەتێکی تر لایەنی زۆر ٢٠٠ میلیگرام هەر ٦ سەعاتێك. هەوکردنی ڤایرۆسی (HIV) بە بێ نیشانە گەورەکان و منداڵانی گەورەتر لە ١٢ ساڵ ١٠٠ میلیگرام خۆراکی هەر ٤ سەعاتێك لەکاتی بێداری (ڕۆژانە ٥٠٠ میلیگرام). منداڵانی ٣ مانگ تا ١٢ ساڵە ١٨٠ میلیگرام/مەتردوجا هەر ٦ سەعاتێك خۆراکی لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا. لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٢٠٠ میلیگرام هەر ٦ سەعاتێك.

## زیلیوتۆن: ZILEUTON

**ناوی بازرگانی:** Zyflo

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦٠٠ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** Leukotriene inhibitor

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی ڕەبۆی موزمین بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تێکچوونی گەدە، پژمین، سکچوون، بێهێزی، هێڵنجدان، برینی گەروو،ئازاری ماسولکە، خەمۆکی، دڵەڕاوکێ، پەڵە، زەردی، نەمانی ئارەزوی خواردن، تێکچوونی جگەر.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و تەمەنی ١٢ ساڵ و زیاتر ١ حەب ڕۆژانە ٤ جار، یان ٢ حەب ڕۆژانە ٢ جار.

با ئاگادار بین: دەرمان شوێنەواری خراپ و کاریگەری نێگەتیڤ بەجێدەهێڵێت، ئەگەر بەگوێرەی [illegible] بەکاربهێنرێت



## زینك ئەسیتەیت: ZINC ACETATE

**ناوی بازرگانی:** Wilzin

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥ و ٥٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** مادەی کانزایی.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشی ویلسۆن (نەخۆشی کەمبوونی سیریولۆپلازمین بریتی یە لە مس کە پرۆتینی تیدایە لە ناو پلازمای خوێندا خوێندا هەیە. کەمبوونی زگماکی سیریولۆپلازمین نەبێتەهۆی نائاسایی لە مێشك و جگەردا، ئەویش بەهۆی کەڵەکەبوونی مس بەتەنها لە جگەردا نەبێتەهۆی زەردی، سیرۆزیس (نەخۆشی یەکی جگەرە). لەمێشکدا ئەبێتەهۆی لەرزین، لەرزینی ماسولکەیی، شێتی) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی گەدەیی، کەمخوێنی، کەمی خڕۆکەی سپی خوێن.

**بڕی دەرمان:** نەخۆشی ویلسۆن، ٥٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٣ جار. (لایەنی زۆر ٥٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٥ جار)، بڕی دەرمان ڕێکدەخرێت بەپێی کاردانەوەکەی. منالانی ١ تا ٦ ساڵ، ٢٥ میلی‌گرام ڕۆژانە ٢ جار.منالانی ٦ تا ١٦ ساڵ، کێشی لەشی خوار ٥٧ کیلۆگرام، ٢٥ میلی‌گرام ڕۆژانە ٣ جار. کێشی لەشی سەروی ٥٧ کیلۆگرام ٥٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٣ جار. لاوانی ١٦ تا ١٨ ساڵ، ٥٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ٣ جار.

## زینك ئۆکساید: ZINC OXIDE

**ناوی بازرگانی:** Dermite

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی ٣٠٪ و ٢٠٪ کرێم.

**گروپی دەرمان:** Mild astringent

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری وشکی پێست، بۆ پارێزگاری لەپێست، سوتانی سوك، ڕوشان، زیپکە،برینی زەرد، پەڵە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئاوسانی دەم و چاو و لێو و زمان و قوڕگ، پەڵە، لیر.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە چەند جارێك یان بەپێی پێویست بە ڕووی شوێنی مەبەستدا دەماڵرێت.

## زینك سەلفەیت: ZINC SULFATE

**ناوی بازرگانی:** Verazinc,solvazinc,zspan spansule

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٢٠ میلی‌گرامی (٥٠میلی‌گرام زینك ) و شروبی ٥ میلی‌گرام /٥ میلی‌لیتر و حەبی ١٢٥ میلی‌گرامی (٤٥ میلی‌گرامی زینك) و دەرزی ١٤,٦ میلی‌گرام/میلی‌لیتر (٥٠ مایکرۆمۆڵ/میلی‌لیتر زینك).



**گروپی دەرمان:** مادەی کانزایی

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری کەمبوونەوەی زینك بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی گەدەیی، تێکچوونی گەدە، سەرئێشە، ئازاری سك، قورسبوونی هەناسە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، خەواڵوو.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەرووی ٣٠ کیلۆگرام، ١ حەب لە ئاودا ڕۆژانە ١ تا ٣ جار پاش لە خواردن، منداڵانی خوار ١٠ کیلۆگرام، ڕۆژانە نیوەی حەبێك، ١٠ تا ٣٠ کیلۆگرام، نیوەی حەبێك ڕۆژانە ١ تا ٣ جار.

## زینك ئەندیسایلینەیت: ZINC UNDECYLENATE

**شێوەی دەرمان:** بە شێوەی پاودەر هەیە.

**گروپی دەرمان:** Antifungal agent

**بەکارهێنان:** دژی کەڕووی پێست و سەر و نینۆك و کەچەڵی و هەوکردنی کەڕوویی نێوان پەنجەکانی پێ بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** خوران، بەگرانی هەناسەدان، سوتانەوە، بلۆقکردنی پێست، ئاوسان، سووربوونەوەی پێست.

**بڕی دەرمان:** بەپێی پێویست بەڕووی شوێنی مەبەستدا بماڵرێت.

## زیپراسیدۆن: ZIPRASIDONE

**ناوی بازرگانی:** Geodon

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٠ و ٤٠ و ٦٠ و ٨٠ میلیگرامی و سەسپێنشنی ١٠ میلیگرامی و دەرزی ٢٠ میلیگرام/میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** دژی نەخۆشی دەروونی یە و بۆ چارەسەری شیزۆفرینا و خرۆشان و تێکچوونی دووجەمسەری و خەمۆکی شێتی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** گێژی، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ تا، لەرز، برینی دەم، لەرزین، پەڵە، خەمۆکی، سەرئێشە، بێخەوی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، کۆکە، برینی گەروو، زیادبوونی کێش.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان بەشێوەی دەرزی ١٠ تا ٢٠ میلیگرام هەموو ٢ تا ٤ سەعاتێك ، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ٤٠ میلیگرامە. بەشێوەی خۆراکی ٢٠ میلیگرام ڕۆژانە ٢ جار، لایەنی زۆری بڕی دەرمان ١٠٠ میلیگرامە ڕۆژانە ٢ جار.



## زۆلێندرۆنیك ئەسید: ZOLENDRONIC ACID

**ناوی بازرگانی:** Zometa ,Aclasta

**شێوەی دەرمان:** دەرزی ٥٠ مایکرۆگرام / میلیلیتر و ٨٠٠ مایکرۆگرام / میلی لیتر.

**گروپی دەرمان:** Bisphosphonate

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری هەندێ نەخۆشی ئێسکی وەك نەخۆشی باجەت و پوکانەوەی ئێسك و مالتیپل مایلۆما و بۆ چارەسەری زیادبوونی پیسی کالسیۆم بەکاردێت.

**کاریگەریەلاوەکی:** کەمبوونەوەی فۆسفات، کەمخوێنی، ئازاری جومگە و ئێسك و ماسولکە، لەرینەوەی گوێچکەڵە، تێکچوونی هەرس، چاوئێشە، وشکی دەم، هەوکردنی دەم، بەرزبونەوە و نزمبونەوەی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی، تێکچوونی تام، تێکچوونی خەو، کۆکە، لەرزین، زیادبوونی کێش، گێژبوون، سکچوون، تا، سەرئێشە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن.

**بڕی دەرمان:** (دەرزی ٥٠ مایکرۆگرام / میلی لیتر) بۆ چارەسەری نەخۆشی باجەتی ئێسك بە IV ئینفیوشن گەورەکان ٥ میلیگرام، بە ١ بڕی دەرمان لانی کەم بۆ زیاتر لە ١٥ خولەك. بۆ چارەسەری پوکانەوەی ئێسك پاش لە لەحەیزچوونەوەی ژنان و پوکانەوەی ئێسك لە پیاوان دا ( هاندانی پوکانەوەی ئێسکی کۆرتیکۆستیرۆیدی دەگرێتەوە) بە IV ئینفیوشن، ٥ میلیگرام لانی کەم بۆ زیاتر لە ١٥ خولەك ١ جار لە ساڵێکدا. (٨٠٠ مایکرۆگرام / میلی لیتر) بۆ کەمکردنەوەی تێکشکانی ئێسك لە توشبوون بە نەخۆشی پیسی پێشکەوتووی ئێسك بە IV ئینفیوشن، ٤ میلیگرام لانی کەم بۆ زیاتر لە ١٥ خولەك هەموو ٣ تا ٤ هەفتەیەك. بۆ چارەسەری زیادبوونی پیسی کالسیۆم بە IV ئینفیوشن، ٤ میلیگرام وەك ١ بڕی دەرمان لانی کەم بۆ زیاتر لە ١٥ خولەك. بۆ منداڵان پێشنیارنەکراوە.

## زۆلمیتریپتان: ZOLMITRIPTAN

**ناوی بازرگانی:** Zomig

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢,٥ و ٥ میلیگرامی و سپرای ٥ میلیگرامی.

**گروپی دەرمان:** ٥HT١ Receptor agonist

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری سەرئێشەی شەقیقە و کلاستەر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازاری ماسولکە، لاوازی ماسولکەیی، خەوالّویی، تێکچوونی تام، زیادبوونی لێدانی دڵ، جەڵدە، میزن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکی دەم، گێژی، بێخەوی، سەرئێشە، تێکچوونی هەرس، ئازاری سك، دڵەکوتێ.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان سەرەتا ٢,٥ میلی‌گرام و دوبارەکردنەوەی پاش ٢ سەعات، لایەنی زۆر ١٠ میلی‌گرامە لە ٢٤ سەعاتدا، سەرئێشەی کلاستەر ٥ میلی‌گرام (١ سپرای) بۆ هەر کونەلوتێك و دوبارەکردنەوەی پاش ٢ سەعات، لایەنی زۆر ١٠ میلی‌گرامە لە ٢٤ سەعاتدا.

## زۆلپیدیم تارتارەیت: ZOLPIDEM TARTARATE

**ناوی بازرگانی:** Ambien,stilnoct

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥ و ١٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antiepileptics

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەر و کۆنترۆڵکردنی بێخەوی (بەکارهێنانی ماوەکۆتا تا ٤ هەفتە) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی تام، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، گێژی، خەوالّویی، وشکی دەم، دووبینی، لەرزین، بێهێزی ماسولکەیی، جیوب، هەوکردنی گەروو، سەرئێشە، خەمۆکی، ئازاری سنگ، تێکچوونی گەدە، پەڵە، وڕێنە، شڵەژان، کابوسی شەوانە، نەخۆشی مێشکی (فەرامۆشی).

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ ١٠ میلی‌گرام خۆراکی لە کاتی خەوتن، بۆ پیرەکان (بێ تواناکان) ٥ میلی‌گرام لە کاتی خەوتن.

## زۆنیسامایدە: ZONISAMIDE

**ناوی بازرگانی:** Zonegran

**شێوەی دەرمان:** کەپسولی ٢٥ و ٥٠ و ١٠٠ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Anticovulsant

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری فێی جوزئی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، خرۆشان، ئازاری سك، سکچوون، هەرسەکردن، نەمانی ئارەزوی خواردن، گێژی، بێخەوی، خەوالّویی، دووبینی، خەمۆکی، هیلاکی، کەمخوێنی، هەوکردنی میزەڕۆ، کەمبوونەوەی خڕۆکەی سپی خوێن، لەرزین، وڕێنە، شڵەژان، پەککەوتنی گورچیلە، تەنگەنەفەسی، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم، هەوکردنی سی، تا، قەبزی، کەمبوونی کێش.

**بڕی دەرمان:** سەرەتا ڕۆژانە ١٠٠ میلی‌گرام ١جار، زیاد دەکرێت بۆ ٤٠٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ١ جار.



## زۆپیکلۆن: ZOPICLONE

**ناوی بازرگانی:** Zimovane

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٣,٧٥ و ٧,٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Hypnotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری بێخەوی (**بەکارهێنان**ی ماوەکورتا تا ٤ هەفتە) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونی تام، هێڵنجدان، ڕشانەوە، گێژی، خەوالّویی، وشکی دەم، سەرئێشە، خەمۆکی، وڕێنە، شڵەژان، کابوسی شەوانە، نەخۆشی مێشکی (فەرامۆشی).

**بڕی دەرمان:** گەورەکانی سەروی ١٨ ساڵ، ٧,٥ میلی‌گرام لەکاتی خەودا، پیرەکان سەرەتا ٣,٧٥ میلی‌گرام لەکاتی خەودا، ئەگەر پێویست بێت زیاد دەکرێت.

## زیوکلۆپێنتیکسۆل: ZUCLOPENTHIXOL

**ناوی بازرگانی:** Clopixol

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٢ و ١٠ و ٢٥ میلی‌گرامی.

**گروپی دەرمان:** Antipsychotic

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری شیزۆفرینیا (دووبیری، کەرتبوونی ژیری) و نەخۆشی یە دەروونی یەکانی تر بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تێکچوونی هەرس، تەشەنوج، گێژی، پارکێنسۆن. شڵەژان، میز ڕانەگرتن، گیرانی لوت، بەگرانی میزکردن، قەبزی، وشکی دەم، تێکچوونی بینین، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، زیاد لێدانی دڵ، تێکچوونی بێ نوێژی، گەورەبوونی مەمك، زیادبوونی شیر، لاوازی سێکسی. زیادبوونی کێش، پەڵە، کەمی خڕۆکەی سپی، کەمبوونی کێش، زوو زوو میزکردن.

**بڕی دەرمان:** بە ڕێگەی خۆراکی، سەرەتا ٢٠ تا ٣٠ میلی‌گرام ڕۆژانە لە بڕی دەرمانی دابەشکراودا، زیاد دەکرێت بۆ لایەنی زۆری ١٥٠ میلی‌گرام ڕۆژانە ئەگەر پێویست بێت. ئاسایی بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ڕۆژانە ٢٠ تا ٥٠ میلی‌گرامە. لایەنی زۆری ١ بڕی دەرمان ٤٠ میلی‌گرامە. پیرەکان (بێ تواناکان) سەرەتا چارەك تا نیوەی بڕی دەرمانی گەورەکان. بۆ منداڵان پێشنیار نەکراوە.

***

# گیادەرمانی یەکان

## ئەگنوگۆڵ: AGNUGOL

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەب.

**بەکارهێنان:** تێکچوونەکانی لە حەیزچونەوە و پێش و پاش لە بێ نوێژی بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** لەکاتی ئافرەتی سکپڕ و شیردەردا.بەکار هێنانی لەگەڵ ڕێگرەکانی دۆپامین قەدەغەیە و هەروەها ئەم دەرمانە نابێت هاوکات لەگەڵ دەرمانە پرۆجیستڕۆنی یەکان حەبەکانی دژی سکپڕی بەکاربهێنرێت.

**کاریگەری لاوەکی:** هەندێ جار خوران، بلۆق، هێڵنجدان و تێکچونی دەزگای هەرس و زیپکە.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ١ حەب پاش لە خواردن.

## ئەلیکۆم: ALICOM

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی حەب.

**بەکارهێنان:** دابەزینەری پەستانی خوێن و کەمکردنەوەی چەوری خوێن و شەکری خوێن.

**بەکارنایەت:** کەسانی هەستیار بە سیر، برینە تیژەکانی دەستگای هەرس، سکپڕی و شیردەر. بەکارهێنانی زیاد لە ڕادە هۆی خوێنبەربوونی پاش نەشتەرگەری یە.

**کاریگەری لاوەکی:** کزانەوەی گەدە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، بە بەکارهێنانی بڕی زیاد یان خاڵی بوونەوەی گەدە، حەساسیەت و ئیلتیهاباتی پێستی و ڕەبۆ لە کەسانی هەستیار.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٣ جار هەر جارەی ١ تا ٢ حەب پاش لە خواردن.

با ئاگادار بین: دەرمان شوێنەواری خراپ و کاریگەری نێگەتیڤ بەجێدەهێڵێت، ئەگەر بەگوێرەی بەکارنەهێنرێت!



## ئالیۆم -ئێس: ALLIUM–S

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** دابەزێنەری پەستانی خوین و کەمکەرەوەی چەوری.

**بەکارنایەت:** کەسانی هەستیار بەسیر و برینە تیژەکانی دەستگای هەرس، سکپڕی و شیردەر و منالآنی خوار ٥ سالّ.
**بەکارهێنان**ی زیاد لە ڕادە هۆی خوێنبەربوونی پاش نەشتەرگەری یە.

**کاریگەری لاوەکی:** کزانەوەی گەدە، هێلّنجدان، ڕشانەوە، سکچوون، بە بەکارهێنانی بری زیاد یان خالّی بوونەوەی گەدە، حەساسیەت و ئیلتیهاباتی پێستی و ڕەبۆ لە کەسانی هەستیار.

**بری دەرمان:** ١ تا ٢ حەب لە ڕۆژێکدا پاش لە خواردن.

## ئەلفا: ALFA

**شێوەی دەرمان:** جێلّی ١٥٪.

**بەکارهێنان:** سوتان و ئیلتیهاب و ئەکزیمای پێست.

**بەکارنایەت:** هاوکات لەگەلّ دەرمانەکانی تردا. دەورووبەری چاو، برینەکراوەکان، پێشینەی حەساسیەت.

**بری دەرمان:** شەوانە بەکاردێت.

## ئە لثادین: ALTHADIN

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهابی لینجەپەردەی قوڕگ و ئازاری قوڕگ بەبێ تا و دژی ئیلتیهابی دەم و ڕوشانی دەم بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** هەوکردنی قوڕگ، سەلامەتی بەکارهێنان لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**بری دەرمان:** ١ حەب هەر ٢ سەعاتێك.

## ئەلتیب: ALTIB

**شێوەی دەرمان:** پاودەر.

**بەکارهێنان:** بۆ هێورکردنەوە و دلّەڕاوکێ و سەرئێشە و بێخەوی بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** بۆ منداڵان، شۆفێری یان ئەو کارانەی پێویستیان بە هۆشیاری هەیە.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت و ئیلتیهابی پێست و خەوالّویی توند.

**بری دەرمان:** ڕۆژی ٢ جار هەر ١ تا ٢ کەوچکی مرەباخۆری لە پاودەر کەلە یەك پەرداخ ئاوی گەرمدا بۆ ماوەی ٥ خولەك پێدەگات. پاش لە پالاّوتن بیخۆیت.



## ئەنیثەم: ANETHUM

**شێوەی دەرمان:** حەب و گرانیوڵ

**بەکارهێنان:** بۆ دابەزاندنی چەوری خوێن و ئازارەکانی کیسەی زراو بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** نەخۆشی شەکرە. سەلامەتی بەکارهێنان لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی پێست.

**بڕی دەرمان:** حەب ڕۆژی ٣ جار هەرجارەی ٢ تا ٣ حەب لەگەڵ ئاو یان ئاومیوە.

گرانیوڵ: بە ١ کەوچکی مرەباخۆری لە گرانیوڵ هەیە لە پەرداخێکدا، ئاوی گەرم زیاد دەکرێت بۆی و پاش لە ١٠ خولەك بیخۆیت.

## ئەنتی دایەبیتیك: ANTIDIABETIC

**شێوەی دەرمان:** پاودەر.

**بەکارهێنان:** دابەزێنەری شەکری خوێن.

**ئیحتیات:** سەلامەتی بەکارهێنان لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٢ جار هەر جارەی ٢ کەوچکی چێشتخۆری کە وەرگیراوە لەگەڵ یەك پەرداخ ئاوی گەرمی دەم کردوو و پاش لە پالاوتنی بخورێت.

## ئەنتی مایگرەین: ANTI MIGRAINE

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** بۆ پێشگرتن و چارەسەرکردنی سەرئێشە دەمارییەکان و شەقیقە بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** لە ڕەبۆ و برینی گەدەدا.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی بەبەکارهێنانی بڕی زیاد.

**ئیحتیات:** توشبووان بە ڕەبۆ، برینە تیژەکانی هەرس، هیمۆفیلیا، نەخۆشی پاشایان، تێکچوونەکانی مەیینی خوێن، کەمی پرۆپرۆمبینی خوێن و شۆفێری و ئەو کارانەی پێویستیان بە هۆشیاری هەیە. سەلامەتی بەکارهێنان لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**بڕی دەرمان:** ٣٠ تا ٤٠ قەترە لەگەڵ دەستپێکردنی حەملەی شەقیقە یان ٢ جار لە ڕۆژێکدا بۆ پێشگرتن.



## ئەفرۆدیت: APHRODIT

**شێوەی دەرمان:** حەب و قەترە.

**بەکارهێنان:** بۆ زیادکردنی ئارەزووی سێکسی و چارەسەری لاوازی سێکسی و بێ توانایی کاری سێکسی بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** نەخۆشی دڵ، حەساسیەت بە بەشە وەرگیراوەکانی گیایەکە.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرئێشە، تووڕەیی، حەساسیەت، کەمبوونی تەحەمولی هەرس.

**بڕی دەرمان:** ١ حەب (٥٠ تا ٦٠ قەترە)، ٣ جار لە ڕۆژێکدا پاش لە خواردن.

## تی تری ئۆیڵ ئاردن: ARDENE TEA TREE OIL

**شێوەی دەرمان:** کرێم.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیپکە بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** لەدەوروبەری چاو برینەکراوەکان و حەساسیەت بە بەشە وەرگیراوەکانی گیایەکە.

**کاریگەری لاوەکی:** لەوانەیە ببێتە هۆی هەوکردن و هەستیاری پێست.

**بڕی دەرمان:** شەوانە پاش لە شۆردنی پێستی دەم و چاو بە صابوون و ئاوی شلەتێن و وشکردنەوەی، بڕێك لە کرێم کە بەڕووی دەم و چاودا دەماڵرێت تا هەڵی بمژێت.

## ئەڤی پێکت: AVI PECT

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** دژی کۆکەو بەڵغەم دەرکەرە.

**ئیحتیات:** سەلامەتی بەکارهێنان لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی لینجە پەردە، حەساسیەت و هەوکردنی پێست.

**بڕی دەرمان:** ٢٠ تا ٣٠ قەترە ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا لەگەڵ کەمێ شەکراو.

## بابوونە: BABOONEH

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهابی دەم و گەدە و ڕیخۆڵە و کرژبوون و ئازاری هەرس بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** لە ڕەبۆدا، لەکەسانی هەستیار بە بابونە.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت و هەوکردنی پێستی لەکەسانی هەستیار.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٣ جار، گەورەکان هەر جارێك ٣٠ قەترە و منالأن هەر جارێك ١٠ تا ٢٠ قەترە لە یەك فنجان ئاوی شلەتێن. بە عینوانی دەمشۆر ڕۆژی ٣ جار هەر جارێك کەوچکێکی مرەباخۆری لە قەترە لەگەڵ نیو پەرداخ ئاوی شلەتێن تێکەڵکراو غەرغەرەی پێ بکرێت.

## دژی زیپکەی باریجە: BARIJE ANTIACNE

**شێوەی دەرمان:** لۆشن.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری زیپکە بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** حەساسیەت بە بەشە وەرگیراوەکانی گیایەکە.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی پێست لەکەسانی هەستیار.

**بڕی دەرمان:** پاش لە شۆردنی ئەو شوێنە بە ئاوی شلەتێن و صابوونە نەرمەکان و وشککردنەوەی، ڕۆژی ٣ جار، هەر جارەی تا ٢٠ قەترە لە لۆشن ڕووی مەوزوعی پێ دەماڵرێت.

## بیلادۆ مێد: BELADO – MED

**شێوەی دەرمان:** شروب.

**بەکارهێنان:** ئەنتی سپاسمۆدیك ئەنتی کۆلینێرجیك.

**بەکارنایەت:** نارێکی لێدانی دڵ گەورەیی پرۆستات، گرفتی ڕیخۆڵە و گەدە، قەبزی توند، ژنی سکپڕ.

**کاریگەری لاوەکی:** کەمبوونەوەی لیك و وشکی دەم، زیادبوونی لێدانی دڵ تێکچوونی بینین، گیرانی میز، پەرێشانی حەواس.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٣ جار، هەر جارەی ٢,٥ میلی‌لیتر تا ٥ میلی‌لیتر نیو سەعات پێش لە خەوتن.

## بران: BRAN

**شێوەی دەرمان:** پاردەر.

**بەکارهێنان:** ڕەوانکەرە و بۆ چارەسەری قەبزی بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** خوێنبەربوونی کۆم بەهۆکاری نادیار، پەککەوتنی دڵی خوێنتێرراو، هەوکردنی ڕیخۆڵە کوێرە یان نیشانەکانی، داخستنی ڕیخۆڵە و کێشە لە قوتداندا.

**کاریگەری لاوەکی:** قورسی، غازاتی کاتی لە دەستپێکی دەرمان، داخستنی ڕیخۆڵە و قوڕگ و چربوونەوەی لە ڕیخۆڵە لە بەکارهێنانی بڕی زیاد و کەمی شلەکان، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٢ تا ٣ جار هەر جارەی ١ تا ٢ کەوچکی چێشتخۆری تێکەڵ بە شیر، یان ماست ١٥ تا ٣٠ خولەك پێش لە خواردن.



## برۆنکۆتیدی: BRONCHO T.D.

**شێوەی دەرمان:** شروب.

**بەکارهێنان:** دژی کۆکەو بەڵغەم دەرکەرە.

**بەکارنایەت:** نەخۆشی شەکرە، حەساسیەت بە بەشە وەرگیراوەکانی گیایەکە.

**ئیحتیات:** لە سکپڕی و شیردەردا بەپێی ڕاوێژی پزیشك بەکاردەهێنرێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی لینجەپەردەی گەدە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۱ کەوچکی چێشتخۆری (منالان ۱ کەوچکی مرەباخۆری) ۳ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا.

## سی لاکس: C-LAX

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** ڕەوانکەرە و بۆ لابردنی قەبزی بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** تەسکبونەوە و داخرانی ڕیخۆڵە وایلیۆم، ئازارە نەناسراوەکانی سك خوێنبەربوونی کۆم بەهۆکاری نادیار و نەخۆشی یەکانی ئیلتیهابی ڕیخۆڵە، هەوکردنی ڕیخۆڵەکوێرە، بەکارهێنانی بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ، منالانی خوار ٦ ساڵ و شیردەر.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازار و تەشەنوجی سك و سکچوون، تێکچوونی توانای ڕیخۆڵەکان، کەمبوونەوەی ئاو ئەلیکترۆلیتەکان (بەتایبەتی پۆتاسیۆم) میزی ئەلبۆمیناوی و میزی خوێناوی و گۆڕانی ڕەنگی میز و PHی میز. ڕوشانی ڕیخۆڵە، دابەزینی پەستانی خوێن، بێهێزی.

**بڕی دەرمان:** ڕەوانکەر گەورەکان ۱ تا ۲ حەب و منالانی سەروی ٦ ساڵ نیو تا ۱ حەب. مسهل ۲ تا ۳ حەب پێکەوە پێش لە خەوتن.

## سی ئێم: C. M.

**شێوەی دەرمان:** لۆشن.

**بەکارهێنان:** دژی ئازارەو بۆ هێورکەرەوەی مەوزوعی بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** بەشێوەی خۆراکی (هێڵنجدان، ڕشانەوە، دابەزینی پەستانی خوێن بە بەکارهێنانی خۆراکی).

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی پێستی لە کەسانی هەستیار.

**بڕی دەرمان:** ۲۰ تا ٤۰ قەترە ۳ جار لە ڕۆژێکدا ڕووی مەوزوعی پێ دەماڵرێت.



## کالێندیت – ئی: CALENDIT – E

**شێوەی دەرمان:** کرێم.

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهابی پێست.

**بەکارنایەت:** کەسانی هەستیار بە شێوەی مەوزوعی.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٢ تا ٣ جار بە شێوەی مەوزوعی.

## کالێندولا: CALENDULA

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم.

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهابی مەوزوعی و وشکی و قڵیشاوی و خورانی پێست و هەوکردنی پێستی کۆنی منداڵان بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** سەلامەتی بەکارهێنانی لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی مەوزوعی.

**بڕی دەرمان:** پاش لە پاککردنەوەی پێست چەند جار لە ڕۆژێکدا بڕی تەواوی مەڵهەم ڕووی مەوزوعی پێ دەماڵرێت.

## کرێم کاپێکس: CAPEX

**شێوەی دەرمان:** کرێم.

**بەکارهێنان:** دژی ئازاری مەوزوعی و بۆ چارەسەری توشبوونی ماسولکە بەئازار و تەشەنوج بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** لینجە پەردەی چاو وپێستی ترەکیو و کەسانی هەستیار.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازار و کزانەوەی سوك لە چەند ڕۆژی سەرەتادا.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٤ جار هەر جارەی بڕێکی کەم لە مەڵهەم ڕووی مەوزوعی بە ئازاری پێ بماڵرێت و بەباشی پێدا دەماڵرێت.

## کاپسیان: CAPSIAN

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم.

**بەکارهێنان:** بۆ لابردنی ئازار و تەشەنوجی ماسولکە و ڕۆماتیزم و هەوکردنی جومگە بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** لینجە پەردەی چاو وپێستی ترەکیو و کەسانی هەستیار.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازار و کزانەوەی سوك لە چەند ڕۆژی سەرەتادا.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٤ جار هەر جارەی بڕێکی کەم لە مەڵهەم ڕووی مەوزوعی بە ئازاری پێ بماڵرێت و بەباشی پێدا دەماڵرێت.



## کارامین: CARAMIN

**شێوەی دەرمان:** پاودەر.

**بەکارهێنان:** دژی غازات و ئازار و تەشەنوجی سك بەکاردێت.

**ئیحتیات:** سەلامەتی بەکارهێنانی لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**کاریگەری لاوەکی:** هەوکردن و حەساسیەتی پێستی لەکەسانی هەستیار.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ۲ جار، هەر جارەی ۱ تا ۲ کەوچکی مرەباخۆری لە پاودەر کە لە ۱ پەرداخ ئاوی گەرم پێدەگات، نیوسەعات پاش لە خواردن دەخورێت.

## کارەوەی میکسچە: CARAWAY MIXTURE

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی خۆراکی.

**بەکارهێنان:** دژی غازات و خراپی هەرس و دژی ئازار و کرژبوونی هەرس بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** پەککەوتنی جگەر و ئازاری دڵ و داخستنی ڕێڕەوی زراو.

**کاریگەری لاوەکی:** نیشانەکانی حەساسیەت.

بڕی دەرمان منداڵانی تا ٦ مانگ ۱ کەوچکی مرەباخۆری، تەمەنی ٦ مانگ تا ۲ ساڵ ۲ کەوچکی مرەباخۆری، منداڵانی گەورەتر لە ۲ ساڵ ۳ کەوچکی مرەباخۆری، تا ٦ جار لە ڕۆژێکدا.

## کارمینەیتڤ: CARMINATIVE

**شێوەی دەرمان:** پاودەر.

**بەکارهێنان:** دژی غازات و دژی ئازار و کرژبوونی هەرس و خراپی هەرس بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** تێکچوونە توندەکانی هەرس، برینی گەدە، توێکاری دەزگای هەرس، خوێنبەربوون.

**ئیحتیات:** سەلامەتی بەکارهێنانی لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی مەوزوعی پێستی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۱ تا ۲ کەوچکی مرەباخۆری لە پاودەر کەلەگەڵ نیو پەرداخ ئاوی گەرم تێکەڵ دەکرێت و پاش لە خواردن دەخورێت. منداڵانی خوار ۱۲ ساڵ نیوەی بڕی دەرمانی گەورەکان.

## کارمینت: CARMINT

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** دژی غازات و دژی ئازار و کرژبوونی هەرس و خراپی هەرس بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** نارەحەتی جگەر. سەلامەتی بەکارهێنانی لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.



**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٣٠ تا ٤٠ قەترە، (منداڵانی خوار ١٢ ساڵ ١٥ تا ٢٠ قەترە) لە نیو ئیستیکان ئاو پێش یان لەگەڵ هەر ژەمێکی خواردنی سەرەکی.

## سینامۆل: CINNAMOL

**شێوەی دەرمان:** قەترەی شۆردنی دەم.

**بەکارهێنان:** پاککەرەوەی دەم و بۆ لابردنی بۆنی دەم بەکاردێت.

**بڕی دەرمان:** ٢٠ تا ٢٥ قەترە لە نیو پەرداخ ئاوی سارد ٣ جار لە ڕۆژێکدا پاش لە مسواك کردن غەرغەرەی پێ بکرێت.

## کراتاگوس: CRATAEGUS

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** بەهێزکەری دڵ، دابەزێنەری پەستانی خوێن.

**بەکارنایەت:** سکپڕ و شیردەر.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان و ڕشانەوە و ئارەقکردنەوە و پەڵەی پێست (ئاسایی ڕووی دەست) لەکاتی **بەکارهێنان**ی بڕی زیاد ژەهراویبوون (کەمبوونەوەی لێدانی دڵ و کپبوونەوەی هەناسە).

**ئیحتیات:** نەخۆشانێك لە ژێر چارەسەر بە دەرمانەکانی دڵی - مولولەی خوێن.

**بڕی دەرمان:** ٦٠ تا ٧٠ قەترە ٣ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٣ تا ٤ ڕۆژ و بۆ چارەسەری پاراستن ٢٥ قەترە ٣ جار لە ڕۆژێکدا بە شێوەی تواوە لەگەڵ ئاودا.

## کراتاگۆل: CRATAGOL

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** پەککەوتنی دڵ (جۆری٢)، پەستانی بەرزی خوێن و ڕەقبوونی جومگە.

**بەکارنایەت:** سکپڕ و شیردەر.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان و ڕشانەوە و ئارەقکردنەوە و پەڵەی پێست (ئاسایی ڕووی دەست) لەکاتی بەکارهێنانی بڕی زیاد ژەهراویبوون (کەمبوونەوەی لێدانی دڵ و کپبوونەوەی هەناسە).

**ئیحتیات:** نەخۆشانێك لە ژێر چارەسەر بە دەرمانەکانی دڵی- مولولەی خوێن.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٢ تا ٣ جار، ١ حەب لەگەڵ کەمێ ئاو بخورێت.

## کراتاڤیل: CRATAVIL

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** نارێکی لێدانی دڵ و بچوکبوونەوەی مولولەی خوێنی تەپلەیی دڵ بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** **بەکارهێنانی** لە منداڵانی خوار ۱۲ ساڵ قەدەغەیە. بەپێی دەستوری پزیشك ڕێی پێ دەدرێت، **بەکارهێنانی** لە سکپڕ و شیردەردا بەپێی دەستوری پزیشك.

**کاریگەری لاوەکی:** سەرگێژبوون و هێڵنجدان و هیلاکی و پەڵەی پێست (ئاسایی ڕووی دەست) بەکارهێنانی بری زیادی دەرمان ئەتوانێت پەستانی نزمی خوێن، نارێکی لێدانی دڵ، خەواڵویی، دروست بکات.

**بری دەرمان:** لە گەورەکان و منالانی سەروی ۱۲ ساڵ ۱ حەب، ۳ جار لە ڕۆژێکدا لانی کەم ماوەی ٦ هەفتە.

## سینابایل: CYNABILE

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** چارەسەری یارمەتیدەری ژەهراویبوونەکانی جگەر. یارمەتیدەر لە چارەسەری خراپی هەرس بەهۆی تێکچوونەکانی زراو و کەمکردنەوەی چەوری یەکانی خوێن.

**بەکارنایەت:** داخستنی ڕێڕەوی زراو و حەساسیەت بە گیاکانی خێزانی کاسنی.

**کاریگەری لاوەکی:** هەوکردن و حەساسیەت، حەساسیەتی بە پێکهاتەکانی تری گیایەکە.

**ئیحتیات:** سکپڕ و شیردەر.

**بری دەرمان:** ٤٠ قەترە لەگەڵ کەمێ ئاو ۳ جار لە ڕۆژێکدا پاش لە خواردن.

## دی – ریگلیس: D-REGLIS

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** چاککەرەوەی برینی گەدە و دوانزەگرێ.

**کاریگەری لاوەکی:** ئیحتمالی دەرکەوتنی کاریگەری یەکانی شێوە مینرالۆ کۆرتیکۆیدی.

**ئیحتیات:** نەخۆشی یەکانی دڵ و مولولە، پەستانی بەرزی خوێن، سەلامەتی بەکارهێنانی لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**بری دەرمان:** بۆ برینی گەدە ۲ حەب ۳ جار لە ڕۆژێکدا. بۆ برینی دوانزەگرێ ۲ حەب تا ٦ جار لە ڕۆژێکدا.



## دینتۆل: DENTOL

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** هێورکەرەوەی ئازاری ددان.

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوەی لینجە پەردەی دەم.

**بڕی دەرمان:** ١ قەترە بە شێوەی مەوزوعی.

## دێرماتین: DERMATIN

**شێوەی دەرمان:** کرێم.

**بەکارهێنان:** ئیلتیهابی پێستی و هەوکردنی پێستی کۆنی منداڵان، ئەکزیما.

**بڕی دەرمان:** ٢ تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا بە شێوەی مەوزوعی.

## دیلسان: DILLSUN

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** دژی غازات و تەشەنوج و ئازاری هەرس و دابەزینەری چەوری خوێن.

**بەکارنایەت:** بەردی زراو و سیروزی جگەری.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی دەستگای هەرس، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون بە بەکارهێنانی بڕی زیاد ، گێژبوون و کپکبوونەوەی هەناسە، خرۆشان و تەشەنوج و حەساسیەت و هەوکردنی پێستی لە کەسانی هەستیار.

**ئیحتیات:** سەلامەتی بەکارهێنانی لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

لەگەڵ هەر ٣ هەفتە بەکارهێنانی بەردەوام، ١ هەفتە بەکارناهێنرێت.

**بڕی دەرمان:** ٢٠ قەترە لەگەڵ ١ ئیستیکان ئاودا پاش لە خواردن ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## ئێم تی زێد دینە: DINEH M.T.Z

**شێوەی دەرمان:** پاودەر.

**بەکارهێنان:** داخوران و ئیلتیهابی پێست و دژی ئارەقکردن و دژی بۆن.

**بەکارنایەت:** برین یان توێکاری قوڵی پێستی.

**بڕی دەرمان:** پاش لە پاك کردنەوەی پێست، بڕی تەواو لە پاودەر کە بەڕووی ئەو شوێنەی مەبەستمانە بپژێنرێت و بە ئارامی مەساجی پێ بکرێت.



## بخورد پزیشکی دینە: DINEH INHALER

**شێوەی دەرمان:** پاودەر.

**بەکارهێنان:** هێورکەرەوەی نیشانەکانی سەرمابوون و چارەسەری یارمەتیدەری زیپکە.

**بەکارنایەت:** ڕەبۆ، تای بەرز، کۆکەی بەردەوام خوێنبەربوونی دەزگای هەناسەدان.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی لینجە پەردە، حەساسیەت لەکەسانی هەستیار.

**بڕی دەرمان:** ١ کەوچکی سوپخۆری لە پاودەر کە دەکرێتە ١ لیتر ئاوی گەرم سەری پێدا دەهێنرێت و هەڵمەکەی هەڵدەمژرێت. چارەسەری یارمەتیدەری زیپکە ١ کەوچکی سوپخۆری لە وەرگیراوەکان کە دەکرێتە ١ لیتر ئاوی گەرم پاش لە پاڵاوتنی، هەویری بەدەستهێنراو، بە شێوەی پەستاوتنی ڕووی پێست بەکاردەهێنرێت.

## داییوریتیك: DIURETIC

**شێوەی دەرمان:** پاودەر.

**بەکارهێنان:** میزپێکەرە.

**کاریگەری لاوەکی:** هەوکردن و حەساسیەتی پێستی و شەرا لەکەسانی هەستیار بەگیا، تێکچوونی ئاو ئەلیکترۆلیتەکان بەبەکارهێنانی بڕی زیادی دەرمان.

**ئیحتیات:** سەلامەتی بەکارهێنانی لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٢ جار، هەر جارەی ١ کەوچکی چێشتخۆری لە پاودەر کە لە ١ پەرداخ ئاوی گەرم بۆ ماوەی ١٠ خولەك پێ دەگات و پاش لە پاڵاوتن دەخورێت.

## ئیەرگۆڵ: EARGOL

**شێوەی دەرمان:** قەترەی گوێ.

**بەکارهێنان:** نەرمکەرەوەی تەرەشوحاتی گوێ.

**بەکارنایەت:** ئیلتیهاب و هەوکردنی گوێ، کرانەوەی برین یان قوڵبوونی پەردەی صەماخ.

**بڕی دەرمان:** ٤ قەترە ٢ جار لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی ٤ ڕۆژ.

## ئیکی هێرب: ECHIHERB

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** بەهێزکەری سیستمی بەرگری.

**بەکارنایەت:** سیل، کلاژینۆسس، لیکۆزیس، نەخۆشی مێشکی فرەڕەقبوون، ئایدز هەوکردنەکانی HIV، تێکچوونەکانی ئیتوایمیون، حەساسیەت بە گیاکان، سکپڕی، شیردەر، منداڵانی خوار ۲ ساڵ.

**کاریگەری لاوەکی:** کاریگەری حەساسیەتی لەکەسانی هەستیار بە گیاکانی گرووپی کاسنی.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۱ حەب ۳ جار لە ڕۆژێکدا، منداڵان نیوە تا سێ یەکی حەب ۳ جار لە ڕۆژێکدا.

## ئیکینا مید: ECHINA – MED

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** زیادکەری بەرگری لەش.

**کاریگەری لاوەکی:** بلۆقکردنی پێستی، خوران و ئاوسانی دەم و چاو، دابەزینی پەستانی خوێن و سەرگێژبوون و تەنگەنەفەسی.

**بڕی دەرمان:** منداڵانی ٦ تا ١٢ ساڵ ٣ جار لە ڕۆژێکدا، هەر جارێك ١ حەب (لایەنی زۆر ٤ ڕۆژ). گەورەکان ٣ جار لە ڕۆژێکدا، هەر جارێك ١ حەب (لایەنی زۆر ٨هەفتە).

## ئینۆکسۆلۆن: ENOXOLON

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم.

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهابی پێستی و سوتان و نەکزیما و خورانی مەوزوعی و گەستنی مێرووەکان بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** براوەکان و برین و هەوکردنی برین.

**کاریگەری لاوەکی:** کاریگەری مەوزوعی.

**بڕی دەرمان:** پاش لە پاککردنەوەی پێست ڕۆژی ۲ تا ٤ جار هەر جارەی لایەکی ناسك لە مەڵهەم ڕووی مەوزوعی پێ دەماڵرێت.

## ئیوکالیپتوس: EUCALYPTUS INH

**شێوەی دەرمان:** قەترە و گیراوەی ناخۆراکی و پاودەر.

**بەکارهێنان:** هێورکەرەوەی نیشانەکانی سەرمابوون.

**بەکارنایەت:** توشبوون بە تای بەرز، کۆکەی بەردەوام و خوێنبەربوونی دەزگای هەناسەدان.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی لینجە پەردە.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی چەند جارێك، هەر جارێك ۱ کەوچکی سوپخۆری لە گیراوە کە دەکرێتە ئاوی گەرم و بۆ ماوەی ٥ تا ١٠ خولەك سەری پێدا بهێنرێت بۆ ئەوەی هەڵمەکەی هەڵبمژرێت.



## فینیلین: FENNELIN

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** چارەسەرکەری نارێکی بێ نوێژی ئازارداری سەرەتایی، زیادکەری شیری دایك.

**بەکارنایەت:** فێ و سکپڕی و کەسانی توشبوون بە حەساسیەتی ڕەبۆ.

**کاریگەری لاوەکی:** نەخۆشی پێستی بەهۆی ڕوناکی یەوە، زیادبوونی کورتی خوێنبەربوون لە دەورانی بێ نوێژیدا.

**بڕی دەرمان:** ئازاری مانگانەی بێ نوێژی ۲۰ تا ۳۰ قەترە لە سەرەتای نیشانەکانی بێ نوێژی لەگەڵ کەمێ ئاو هەر ٦ سەعاتێك. زیادکەری شیری دایك ۲۰ قەترە لەگەڵ کەمێك ئاو ٤ جار لە ڕۆژێکدا.

## گارسین: GARCIN

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** دابەزێنەری پەستانی بەرزی خوێن و شەکر و چەوری خوێن.

**بەکارنایەت:** کەسانی هەستیار بەسیر و برینە تیژەکانی دەزگای هەرس، سکپڕی و شیردەرو مناڵانی خوار ٥ ساڵ.

**تێبینی:** بەکارهێنانی بڕی زیادی سیر هۆی خوێنبەربوونی پاش لە نەشتەرگەری یە.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونەکانی هەرس (کزانەوەی گەدە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون) بە بەکارهێنانی بڕی زیاد و خاڵی بوونی گەدە، هەوکردن و حەساسیەتی پێستی و حەملەکانی ڕەبۆ لەکەسانی هەستیار.

**بڕی دەرمان:** ۱ حەب ۳ جار لە ڕۆژێکدا پاش لە خواردن.

## گارلیت: GARLET

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** دابەزێنەری پەستانی خوێن و چەوری خوێن.

**بەکارنایەت:** کەسانی هەستیار بەسیر و برینە تیژەکانی دەزگای هەرس، سکپڕی و شیردەرو مناڵانی خوار ٥ ساڵ.

**تێبینی:** بەکارهێنانی بڕی زیادی سیر هۆی خوێنبەربوونی پاش لە نەشتەرگەری یە.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونەکانی هەرس (کزانەوەی گەدە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون) بە بەکارهێنانی بڕی زیاد و خاڵی بوونی گەدە، هەوکردن و حەساسیەتی پێستی و حەملەکانی ڕەبۆ لەکەسانی هەستیار.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ۳ جار، هەر جارەی ۱ تا ۲ حەب پاش لە خواردن.

ن: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## گارلیك: GARLIC

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** دابەزێنەری پەستانی خوێن و چەوری خوێن.

**بەکارنایەت:** کەسانی هەستیار بەسیر و برینە تیژەکانی دەزگای هەرس، سکپڕی و شیردەر و منالآنی خوار ٥ سالّ.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونەکانی هەرس (کزانەوەی گەدە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون) بە بەکارهێنانی بڕی زیاد و خالّی بوونی گەدە، هەوکردن و حەساسیەتی پێستی و حەملەکانی ڕەبۆ لەکەسانی هەستیار.خوێنبەربوونی پاش لە نەشتەرگەری بە بەکارهێنانی بڕی زیادی سیر.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ١ تا ٣ جار هەر جارەی ١٠ قەترە لەگەڵ خواردن یان ئاومیوە.

## گارلیکاپ: GARLICAP

**شێوەی دەرمان:** کەپسول.

**بەکارهێنان:** دابەزێنەری پەستانی خوێن و چەوری خوێن.

**بەکارنایەت:** کەسانی هەستیار بەسیر و برینە تیژەکانی دەزگای هەرس، سکپڕی و شیردەرو منالآنی خوار ٥ سالّ.

**تێبینی: بەکارهێنان**ی بڕی زیادی سیر هۆی خوێنبەربوونی پاش لە نەشتەرگەری یە.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونەکانی هەرس (کزانەوەی گەدە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون) بە بەکارهێنانی بڕی زیاد و خالّی بوونی گەدە، هەوکردن و حەساسیەتی پێستی و حەملەکانی ڕەبۆ لەکەسانی هەستیار.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٣ جار هەر جارەی ١ تا ٢ کەپسول لەگەڵ ١ پەرداخ ئاو پاش لە خواردن.

## گاستیرۆلان: GASTEROLAN

**شێوەی دەرمان:** قەترەی خۆراکی.

**بەکارهێنان:** دژی کرژبوون و ئازاری سك و باویژە و چاککەرەوەی تێکچوونەکانی تەشەنوجی دەزگای هەرس.

**بەکارنایەت:** نەخۆشەکان بەنیشانەکانی ئیلتیهابی گەرووی پێچەوانەیی.

**ئیحتیات:** لەدەورەی سکپڕی و شیردەری دا نەبێت لە بەکارهێنانی ئەم دەرمانە دوور بکەویتەوە.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منالآنی سەروی ٦ سالّ ٢٠ تا ٣٠ قەترە، ٣ تا ٥ جار لە ڕۆژێکدا لەگەڵ شلەمەنی یەکان پێش لە خواردن. منالآنی خوار ٦ سالّ ١٥ تا ٢٠ قەترە، ٣ تا ٥ جار لە ڕۆژێکدا لەگەڵ شلەمەنی یەکان پێش لە خواردن.



## گاستڕۆدین: GASTRODIN

**شێوەی دەرمان:** حەب

**بەکارهێنان:** برینی گەدە و دوانزەگری.

**بەکارنایەت:** دەورانی سکچری، هیپاتیتی موزمین، سیرۆزی جگەری، نەخۆشی یەکانی کۆلیستاتیکی جگەر (زەردی لەگەڵ وەستانی زەرداو لەلەشدا لە ئیلتیهابی لولەی زەرداوی ناوەوەی جگەر)، ئیلتیهابی کیسەیی زراو، تێکچوونە توندەکانی گورچیلە، نارێکی لێدانی دڵ،پەستانی بەرزی خوێن، زیادبوونی پۆتاسیۆم و شەکر (بەهۆی هەبوونی ساکارۆز).

**کاریگەری لاوەکی:** بەهۆی هەبوونی کاریگەری یەکانی مینرالۆکۆرتیکۆیدی هۆی گیرانی پێچەوانەکردنەوەی ئاو و صۆدیۆمە، کە دەفعی پۆتاسیۆم زیاد دەکات.

**بڕی دەرمان:** ١ تا ٢ حەب، ٣ جار لە ڕۆژێکدا پێش لە هەر ژەمێکی خۆراکی. نەتوانی ئەم بڕە بە دەستوری پزیشك تا ١٢ حەب لە ڕۆژێکدا زیادبکرێت.

## گاستڕۆلیت: GASTROLET

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** نەخۆشی ڕێخۆڵەی بزوێنەر پەسەند (IBS)

**بەکارنایەت:** سکپڕ و شیردەر و تێکچوونەکانی هۆرمۆنی پایرۆید و پەستانی بەرزی خوێن.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی لینجە پەردە و سەرگێژبوون و سەرئێشە و ڕشانەوە، هێڵنجدان بە بەکارهێنانی بڕی زیاد.

**بڕی دەرمان:** ٢٠ قەترە لەگەڵ بڕێکی کەم ئاو پاش لە خواردن ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## جێنراڵ تۆنیك: GENERAL TONIC

**شێوەی دەرمان:** پاودەر.

**بەکارهێنان:** مقەویە و ئیشتیهاهێنەرە.

**بڕی دەرمان:** ١ تا ٢ پێوانە تێکەڵ لەگەڵ شیر یان ئاوی گەرم، ٢ تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا.



## جیرانیۆم: GERANIUM

**شێوەی دەرمان:** قەترەی ٣٠ میلی لیتری.

**بەکار هێنان:** بۆ بەرگری و چارەسەری ترەکینی پێست لە کاتی سکپڕی و بەرگری لە ئیلتیهاب و خورانی تەقەڵەکانی پێست پاش لە کارە نەشتەرگەری یەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی پێستی.

**بڕی دەرمان:** ٢ جار لە ڕۆژێکدا، هەر جارەی ١٠ تا ١٥ قەترە لە لۆشن بە شوێنی مەبەستدا دەماڵرێت.

## جینجیتۆن: GINGITON

**شێوەی دەرمان:** کەپسول.

**بەکارهێنـان:** بۆ پێشگرتن لە نەخۆشی هێڵنجدان و ڕشانەوە لەسەفەردا بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان و منداڵانی سەروی ٦ ساڵ ٢ کەپسول نیوسەعات پێش لە سەفەر، پاشان ٢ کەپسول هەر ٤ سەعاتێك.

## جینکۆتیدی: GINKO T.D

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنـان:** بۆ لابردنی نیشانەکانی تێکچوونەکانی ئۆرگانی مێشك بەکاردێت.

**بەکارنـایەت:** منداڵانی خوار ١٢ساڵ، حەساسیەت بە دەرمان.

**کاریگەری لاوەکی:** بەدەگمەن نارەحەتی یە سوکەکانی دەزگای هەرس، سەرئێشە، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٣ تا ٦ حەب لە ٢ تا ٣ بڕی دەرمانی دابەشکراودا.

## جینکۆگۆل: GINKOGOL

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٤٠ میلی گرامی.

**بەکارهێنـان:** زیادکەری حافڤە، چاککەرەوەی تێکچوونەکانی دەماری موحیگی، نەخۆشی ئەلزایمەر.

**بەکارنـایەت:** منداڵانی خوار ١٢ساڵ، حەساسیەت بە دەرمان.

**کاریگەری لاوەکی:** بەدەگمەن نارەحەتی یە سوکەکانی دەزگای هەرس، سەرئێشە، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** ١ حەب، ١ تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## جینگۆ میَد: GINGO -MED

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٦٥٠ میلیگرامی.

**بەکارهێنان:** بۆ لابردنی نیشانەکانی تێکچوونەکانی ئۆرگانی مێشك و چارەسەری خەمۆکی بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** منالآنی خوار ١٢سالّ، حەساسیەت بە دەرمان.

**کاریگەری لاوەکی:** بەدەگمەن نارەحەتی یە سوکەکانی دەزگای هەرس، سەرئێشە، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** کەمبوونەوەی گەیشتنی خوێن بە مولولەی خوێنی مێشك ڕۆژی ٣ جار، هەر جارەی ١ تا ٢ حەب بۆ ماوەی ٣ هەفتە. لە تێکچوونەکانی داخرانی خوێنبەری موخیگی و خوێنبەری دلّی ڕۆژی ٣ جار، هەر جارەی ١ حەب بۆ ماوەی ٣ هەفتە. سەرگێژبوون و سەرئێشە بەهۆی تێکچوونەکانی مولولەکانی خوێن ڕۆژی ٣ جار، هەر جارەی ١ حەب بۆ ماوەی ٦ هەفتە. بێ توانایی سێکسی پیاوان ڕۆژی ٣ جار، هەر جارەی ١ تا ٢ حەب بۆ ماوەی ١٢ تا ١٨ مانگ. بۆ چارەسەری نەخۆشی پێش لە بێ نوێژی ژنان PMS لە نێوان ڕۆژەکانی ١٦ بێ نوێژی تا ڕۆژی ٥ بێ نوێژی دوای ١ تا ٢ حەب. لە چارەسەری خەمۆکی لەگەلّ دەرمانەکانی دژی خەمۆکی سێ ئەلّقەیی ٣ جار لە ڕۆژێکدا، هەر جارەی ١ حەب بۆ ماوەی ٤ هەفتە.

## جینسین: GINSIN

**شێوەی دەرمان:** کەپسول.

**بەکارهێنان:** بۆ بەهێزکردنی هێزی جیسمی و فکری، بۆ لابردنی هیلاکی و بۆ یارمەتی تەرکیز و حەواس.

**بەکارنایەت:** پەستانی بەرزی خوێن، هەوکردنی تیژ و ڕەبۆ، خوێنبەربوونی زیادی بێ نوێژی.

**کاریگەری لاوەکی:** بڕی زیاد لە ڕادە ئەبێتەهۆی بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، بێ ئارامی، ناجێگیری، بێخەوی، سکچوون، بلۆقکردنی پێست.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٢ جار هەر جارەی ٢ کەپسول لەگەلّ کەمێ شلەمەنی یان خواردن.

## گۆلّ -گریپ: GRIP-GOL

**شێوەی دەرمان:** شروب.

**بەکارهێنان:** دژی غازاتی منداڵان، دژی ئازار و کرژبوونی هەرس.

**بەکارنایەت:** ئیلتیهاب و پەککەوتنی گورچیلە، کەسانی هەستیار بە مەپیل پرۆپیل و پارابین، تەمەنی خوار ١ مانگ.

**بڕی دەرمان:** تەمەنی ١ تا ٦ مانگ ١ کەوچکی چایخۆری، تەمەنی ٦ تا ١٢ مانگ ٢ کەوچکی چایخۆری تا ٦ جار لە ڕۆژێکدا.



## گریپ وەتەر: GRIP WATER

**شێوەی دەرمان:** گیراوەی خۆراکی.

**بەکارهێنان:** دژی غازاتی منداڵان، دژی ئازار و کرژبوونی هەرس.

**بەکارنایەت:** داخستنی ڕێڕەوی زراو.

**ئیحتیات:** سەلامەتی بەکارهێنانی لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**کاریگەری لاوەکی:** هەوکردن و حەساسیەتی پێستی لەکەسانی هەستیار.

**بڕی دەرمان:** ساواکان ١ کەوچکی چایخۆری، منالان ١ کەوچکی مرەباخۆری، گەورەکان ١ کەوچکی سوپخۆری تا ٦ جار لە ڕۆژێکدا.

## حەنا: HENNA

**شێوەی دەرمان:** لۆشن.

**بەکارهێنان:** دژی کرێش، دژی قارچك، بەهێزکەری موی سەر، دژی ئارەقکردنی ناو لەپی دەست.

**بڕی دەرمان:** ٣ تا ٥ میلی‌لیتر لە وەرگیراوەکان لە نیو پەرداخ ئاو تێکەڵ بکرێت و بە ڕووی مەوزوعی مەساج بدرێت.

## هێربیلاکس: HERBILAX

**شێوەی دەرمان:** کەپسول.

**بەکارهێنان:** ڕەوانکەرەو دژی قەبزی بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** تەسکبونەوە و داخرانی ڕیخۆڵە وایلنوم، ئازارە نەناسراوەکانی سك خوێنبەربوونی کۆم بەهۆکاری نادیار و نەخۆشی یەکانی ئیلتیهابی ڕیخۆڵە. هەوکردنی ڕیخۆڵەکوێرە، بەکارهێنانی بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ، منالانی خوار ٦ ساڵ و شیردەر.

**کاریگەری لاوەکی:** ئازار و تەشەنوجی سك و سکچوون، تێکچوونی توانای ڕیخۆڵەکان، کەمبوونەوەی ئاو ئەلیکترۆلیتەکان (بەتایبەتی پۆتاسیۆم) میزی ئەلبۆمیناوی و میزی خوێناوی و گۆڕانی ڕەنگی میز و PHی میز.

**بڕی دەرمان:** بە عینوانی ڕەوانکەر گەورەکان ٢ کەپسول پێش لە خەوتن، منالانی سەروی ٦ ساڵ ١ کەپسول لە ڕۆژێکدا. بۆ خاڵی کردنەوەی ڕیخۆڵە ١٠ کەپسول یەکجار لەگەڵ ٢ پەرداخ ئاو.

**هایپیران:** HYPIRAN

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** هێورکەرەوەیە و دژی خەمۆکی و شەقیقە بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** تەداخولی دەرمانی لەگەڵ حەبی دژی سکپڕی، وارفارین، دیجۆگسین.

**کاریگەری لاوەکی:** هەستیاربوون بە ڕوناکی، سەرئێشەی توند، نارەحەتی هەرس. هێڵنجدان و وشکی دەم.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ۲۰ تا ۳۰ قەترە ۲ تا ۳ جار لە ڕۆژێکدا، منالآنی سەرووی ۳ ساڵ ۱۰ تا ۱۵ قەترە ۲ جار لە ڕۆژێکدا، دەکرێتە نیو پەرداخ ئاو یان ئاومیوە و پێش لە خواردن دەخورێت.

**ئیرالڤیکس:** IRALVEX

**شێوەی دەرمان:** جێڵ، گیراوە.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری ئیلتیهابی پوکی ددان و ئافەتی دەم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی لینجە پەردەی پوکی ددان و دەم لەکاتی بەکارهێنانی زیاد لەڕادە.

**بڕی دەرمان:** ۰,۵ تا ۱ سانتیمەتر لە جێڵ (یان لۆکەی تێکەڵکراو لەگەڵ بڕێکی کەمی گیراوە) ڕۆژی ۳ جار ڕووی پوکی ددانی پێ دەماڵرێت.

**کامیل:** KAMIL

**شێوەی دەرمان:** کرێم.

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهابی مەوزوعی.

**بەکارنایەت:** کەسانی هەستیار بە بابوونە.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت و هەوکردنی پێستی لەکەسانی هەستیار.

**بڕی دەرمان:** ۲ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا ڕووی مەوزوعی پێ دەماڵرێت.

**کامیلان:** KAMILAN

**شێوەی دەرمان:** گیراوە.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانی ئیلتیهابی دەم و پوك و قوڕگ بەعینوانی دەمشۆر بەکاردێت

**بەکارنایەت:** حەساسیەت بەگیایی بابوونە و کرۆکی نەعنا و ئانیسون منالآنی بچوکی کەمتر ٦ ساڵ

**کاریگەری لاوەکی:** سوتانەوە و خورانی دەم و پوك لەو کەسانەی هەستیارن بە پێکهاتەکانی دەرمانەکە.

**بڕی دەرمان:** پاش لە هەر ژەمێکی خۆراك ۱ کەوچکی مرەباخۆری کە لەگەڵ کەمێ ئاوی شلەتێن بتوێتەوە و غەرغەرەی پێ بکرێت.



## کامیسۆل: KAMISOL

**شێوەی دەرمان:** گیراوە.

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهاب و دژی ئازار و کرژبوونی دەزگای هەرس.

**بەکارنایەت:** حەساسیەت بەگوڵی بابوونە و بەکارهێنانی بۆ ناوەوەی لینجەپەردە وەك چاو. بەکارهێنانی خۆراکی لە ڤێ و لە نەخۆشیەکانی مێشك و ساوایان و سکپڕی قەدەغەیە.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی دەزگای هەرس و لینجە پەردەی هەناسەدان.

**بڕی دەرمان:** بەشێوەی جیاواز مەوزوعی و خۆراکی و دەمشۆر و هەڵم.

## کامۆدێرما: KAMODERMA

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەمی مەوزوعی.

**بەکارهێنان:** ئیلتیهابی پێست بەهۆی صەدمە میکانیکی یەکانەوە، هەوکردنی پێستی کۆنی منداڵان، سوتانەوە بەتیشکی خۆر.

**کاریگەری لاوەکی:** بەدەگمەن حەساسیەت لەهەندێ کەسدا.

**بڕی دەرمان:** یەك لایەکی ناسکی مەڵهەم، ١ یان چەند جارێك لە ڕۆژێکدا بە ڕووی مەوزوعی بە تێبینی کراوی دەماڵرێت.

## کارامین: KARAMIN

**بەکارهێنان:** دژی غازات، یارمەتی بەهەرسکردنی خۆراك.

## دژی پەڵەو لەکەی لاڤاند: LAVAND ANTISPOT

**شێوەی دەرمان:** لۆشن.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری پەڵەکان بەهۆی سکپڕی و تیشکی خۆرەوە دروستبوون بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** حەساسیەت بە بەشە وەرگیراوەکانی گیایەکە.

**کاریگەری لاوەکی:** بە دەگمەن حەساسیەتی سوکی پێست.

**بڕی دەرمان:** پاش لە شۆردنی ئەو ناوچەیە بە ئاوی شلەتێن و صابونە نەرمکەرەوەکان و وشکردنەوەی، ڕۆژی ٢ جار هەر جارەی ٢ تا ٥ قەترە بەڕووی مەوزوعی دەماڵرێت.

## لاکساریسین: LAXARICIN

**شێوەی دەرمان:** ئیمەڵشن.

**بەکارهێنان:** ڕەوانکەرە.

**بەکارنایەت:** ئازاری سك بەهۆکاری نادیار، داخستنی ڕیخۆڵە، هەوکردنی ڕیخۆڵە کوێرە یان نیشانەکانی، هێلنجدان و ڕشانەوە و حەساسیەت بە ڕۆنی گەرچەك و سکپڕی و منداڵانی خوار ٦ ساڵ.

کاریگەی لاوەکی: ئازار و گرژبوونی سك، سکچوون، هێڵنجدان، قرقینەلێدان، ڕوشانی پێستی دەوری ناوچەی کۆم و بلۆقکردنی پێستی و لەکاتی بەکارهێنانی بڕی زیادی دەرمان و بۆ ماوەی دورو درێژ و بەشێوەی دەگمەن تێکچوونەکانی ئەلیکترۆلیتی ( شلەژان و پشێوی هەست، نارێکی لێدانی دڵ، گرژبوونەکانی ماسولکەیی، بێهێزی یان هیلاکی نائاسایی).

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٥ تا ٦٠ میلی‌لیتر و منداڵانی گەورەتر لە ٦ ساڵ ٥ تا ١٥ میلی‌لیتر بخورێت.

## لیکوفار: LICOPHAR

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** دژی ئیلتیهابی گەروو دژی کۆکە بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** نەخۆشی شەکرە.

**ئیحتیات:** نەخۆشی یەکانی دڵ و مولولەی خوێن، سەلامەتی بەکارهێنانی لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**کاریگەری لاوەکی:** کاریگەری شێوەی مینرالۆکۆرتیکۆیدی بە بەکارهێنانی بۆ ماوەیەکی زۆر، حەساسیەت، ئاوسانی گشتی لەش، بەرزی پەستانی خوێن.

**بڕی دەرمان:** ١ حەب هەر ٦ سەعاتێك بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ.

## ليمۆترش: LIME

**شێوەی دەرمان:** قەترەی خۆراکی.

**بەکارهێنان:** دژی قەڵەوی.

**بەکارنایەت:** پەستانی نزمی خوێن.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٣ جار، هەر جارەی ١٠ تا ٢٠ قەترە لەگەڵ ئیستیکان ئاودا پاش لە خواردن.

## لیڤەرگۆڵ ٧٠: ٧٠ LIVERGOL

**شێوەی دەرمان:** حەبی ڕوکەشدار.

**بەکارهێنان:** پارێزگاری کردنی جگەر،هیپاتیتی تیژ و موزمین و صەفراهێنەر، سیرۆزی جگەری، ئەنتی ئۆکسیدانت.

**کاریگەری لاوەکی:** تێکچوونەکانی دەزگای هەرس.

**بڕی دەرمان:** لە حاڵەتی ئاسایی دا ١ حەب ٣ جار لە ڕۆژێکدا. لە حاڵەتی تیژ ٢ حەب ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## لیڤۆمارین: LIVOMARIN

**شێوەی دەرمان:** کەپسول.

**بەکارهێنان:** دەرمانی یارمەتیدەری جۆرە جیاوازەکانی نەخۆشی یەکانی جگەری، لایەنی تەواوی پاراستنی جگەر.

**کاریگەری لاوەکی:** کاریگەری ڕەوانکەری سوك.

**بڕی دەرمان:** بڕی دەرمانی سەرەتایی ٢ کەپسول، ٣ جار لە ڕۆژێکدا. بڕی دەرمانی جێگیر و پارێزراو ١ کەپسول ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## لۆمێکس: LOMEX

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** دەرمانی یارمەتیدەری سکچوونی بێ هەوکردن.

**بەکارنایەت:** سکچڕی.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرگێژبوون، ئیلتیهابی لینجە پەردە، بە بەکارهێنانی بڕی زیادی دەرمان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ٢٠ قەترە هەر ٦ تا ٨ سەعاتێك، منداڵانی گەورەتر لە ٦ ساڵ ٥ تا ١٠ قەترە هەر ٨ سەعاتێك.

## لوبریتیدی: LUBRI T.D.(LUBRICIN)

**شێوەی دەرمان:** شافی گەورەکان ١ گرام و شافی منداڵان ٠,٤ گرام.

**بەکارهێنان:** ڕەوانکەرە.

**بڕی دەرمان:** ١ تا ٣ شاف ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## نێم، جی: M. G.

**شێوەی دەرمان:** گیراوە.

**بەکارهێنان:** بۆ لابردنی نیشانەکانی مایەسیری و شەقبوونی کۆم بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕوشانی ناوچەی کۆم و هێڵنجدان و حەساسیەتی پێستی لە کەسانی هەستیار و کەمی پەستانی خوێن، وڕێنە بەبەکارهێنانی خۆراکی.

**بڕی دەرمان:** ٣ جار لە ڕۆژێکدا هەر جارەی لۆکەیەکی هەڵکێشراو بە ١٠ تا ١٥ قەترە لە گیراوە بە ناوچەی کۆمدا دەماڵرێت.

## ماسومینت: MASUMINT

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** نەرمکەرەوەی گەروو، دژی غازات، بۆ خورانی گەروو، کۆکە بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** نەخۆشی شەکرە.

**ئیحتیات:** نەخۆشی یەکانی دڵ و مولولەی خوێن، سەلامەتی بەکارهێنانی لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**کاریگەری لاوەکی:** کاریگەری شێوەی مینراڵۆکۆرتیکۆیدی بە بەکارهێنانی بۆ ماوەیەکی زۆر، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** ١ حەب هەر ٢ تا ٣ سەعاتێك.

## ماتریکا: MATRICA

**شێوەی دەرمان:** قەترەی دەمشۆر.

**بەکارهێنان:** پاککەرەوەی دەمە و دژی ئیلتیهاب بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** حەساسیەت بە گیاکانی خێزانی کاسنی، ڕەبۆ، سکپڕی و شیردەر منالی خوار ٦ ساڵ.

**کاریگەری لاوەکی:** بە دەگمەن کرژبوون و ئازاری سك، حەساسیەتی کەم لە قوڕگ، ئانژادیۆم، شەرای بڵاوبووەوە.

**بڕی دەرمان:** لانی کەم ٣ جار لە ڕۆژێکدا هەر جارەی پاش لە مسواك کردن ٢٥ تا ٣٠ قەترە لە دەمشۆر کە دەکرێتە یەك فنجان ئاو بۆ ماوەی ٣٠ چرکە دەمی پێ دەشۆردرێت.



## میلیسان: MELISSAN

**شێوەی دەرمان:** جێلّ.

**بەکارهێنان:** دژی ڤایرۆسی تامێسك.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** ڕوویەکی ناسك لە جێلّ ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژێکدا بە شێوەی مەوزوعی.

## مینثا: MENTHA

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** دژی غازات و ئازار و کرژبوونی هەرسی بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** نەخۆشی شەکرە.

**کاریگەری لاوەکی:** هەستیاری.

**بڕی دەرمان:** ١ حەب لەکاتی پێویست.

## مینثازین: MENTHAZIN

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** نەرمکەرەوەی گەروو، دژی غازات.

**بەکارنایەت:** نەخۆشی شەکرە.

**ئیحتیات:** نەخۆشی یەکانی دلّ و مولولەی خوێن، سەلامەتی بەکارهێنانی لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**کاریگەری لاوەکی:** کاریگەری شێوەی مینرالۆکۆرتیکۆیدی بە بەکارهێنانی بۆ ماوەیەکی زۆر، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** ١ تا ٢ حەب هەر ٢ تا ٣ سەعاتێك.

## مینثول: MENTHOL

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** هێورکەرەوەی نیشانەکانی سەرمابوون و بۆ چارەسەری گیرانی لوت و سەرمابوون , حەساسیەتی وەرزی بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** لەساواکاندا، حەساسیەت بە نەعنا.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی مەوزوعی.

**بڕی دەرمان:** دژی گیرانی لوت: ٢ تا ٣ قەترە بە پشتی لێودا دەمالّرێت. دژی ئازاری مەوزوعی ٥ تا ١٠ قەترە بە ڕووی مەوزوعی دەمالّرێت.



## مینتاجێل: MENTAGEL

**شێوەی دەرمان:** جێلی ١٥ گرامی.

**بەکارهێنان:** بۆ چارەسەری کەچەڵی، پەنجەکانی پێ، بنی ڕان و سوتانە ڕووکاری یەکان و شوێنی گەستنی مێرووەکان بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٢ تا ٣ جار بە بڕی پێویست ئەو شوێنە خراپبووەی پێ دەماڵرێت.

## موسیلیەم: MUSYLIUM

**شێوەی دەرمان:** کیسەی بچوك.

**بەکارهێنان:** دژی قەبزی و مایەسیری.

**بەکارنایەت:** هەوکردنی ڕیخۆڵە کوێرە یان نیشانەکانی، خوێنبەربوونی کۆم بە هۆکاری نادیار، پەککەوتنی دڵی خوێنتێزراو، داخرانی ڕیخۆڵە، شەکرە، کێشە لە قوتدان، منالآنی خوار ٦ ساڵ، مەحدودیەتی بەکارهێنانی صۆدیۆم، ماوەی دورر و درێژ (ئاسایی زیاتر لە هەفتەیەك).

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان، قەبزی توند، غازاتی کاتی، داخستنی ریخۆڵە و قورگ بە بەکارهێنانی بڕی زیادی دەرمان و کەمی شلەمەنی یەکان، حەساسیەت، قورسی.

**بڕی دەرمان:** ١ تا ٣ جار لە ڕۆژێکدا هەر جارەی ١ تا ٢ کیسەی بچوك دەکرێتە یەك پەرداخ ئاوەوە و بەکاردێت.

## مایکۆدێرم: MYCODERM

**شێوەی دەرمان:** قەترەی ٣٠ میلی لیتری.

**بەکارهێنان:** دژی کەڕووی ڕووکاری.

**بەکارنایەت:** دەورانی سکپڕی و توشبوون بەتەشەنوج.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەتی پێست.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٢ جار، لایەنی زۆر ٢٠ تا ٢٥ قەترە بەشێوەی مەوزوعی بە ناوچەی توشبوودا دەماڵرێت، خولی چارەسەر ٢ تا ٣ هەفتە دەبێت.

پێ: بەرزکردنەوەی توانای دەروونی، لایەنێکی گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرمان بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی



## میرتێکس: MYRTEX

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** دژی تامێسکی دەم.

**بەکارنایەت:** لەکاتی بوونی ئیلتیهابی ڕیڕەوی هەرس و سەفراو و نەخۆشی یەکانی جگەری.

**تێبینی:** خۆراکی نی یە، سەلامەتی بەکارهێنان لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**کاریگەری لاوەکی:** بەدەگمەن هێڵنجدان، ڕشانەوە و سکچوون، بە بەکارهێنانی خۆراکی، کرژبوونی قوڕگ و بۆڕیچکەکانی هەوا حەملەکانی وەك ڕەبۆ، ناتەواوی هەناسەدان لەکاتی بەکارهێنانی لە ساوایان و منداڵان، حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** ٥ تا ٦ جار لە ڕۆژێکدا، هەر جارەی لۆکە لە چەند قەترەیەك لەگیراوە هەڵدەکێشرێت و بۆ ماوەی ٣٠ چرکە لە ڕووی ئەو شوێنەی خراپبووە دادەنرێت.

## میرتۆپلێکس: MYRTOPLEX

**شێوەی دەرمان:** مەڵهەم.

**بەکارهێنان:** دژی ڤایرۆسی مەوزوعی (تامێسکی سادە ١و٢)

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت.

**ئیحتیات:** سەلامەتی بەکارهێنانی لە سکپڕ و شیردەردا بە جێگیری نەگەیشتووە.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٣ تا ٥ جار.

## نیورۆگۆڵ: NEUROGOL

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** هێورکەرەوە و خەوڵێخەرە.

**بەکارنایەت:** سکپڕی و شیردەر

**کاریگەری لاوەکی:** توندی کاریگەری هێورکەرەوەکانی تر.

**بڕی دەرمان:** ١ تا ٢ حەب ٢ جار لە ڕۆژێکدا لەگەڵ خواردن یان شلەمەنی یەکان.



## ئۆلیا- کرات: OLEA – CRAT

**شێوەی دەرمان:** پاودەر.

**بەکارهێنان:** دابەزینەری پەستانی خوێن.

**بەکارنایەت:** سکپڕی و شیردەر.

**ئیحتیات:** بەکارهێنانی هاوکات لەگەڵ دەرمانەکانی دڵ و مولولەی خوێن.

**کاریگەری لاوەکی:** هێڵنجدان و هیلاکی و ئارەقکرنەوە وپەڵەی پێست (ڕووی دەست) لە بەکارهێنانی بڕی زیاد ژەهراویبوون ( زیاد لێدانی دڵ و کپکردنەوەی ڕێڕەوی هەناسە).

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٢ تا ٣ جار هەر جارەی ٢ تا ٣ کەوچکی چێشتخۆری لە پاودەر لە یەك پەرداخ ئاوی گەرم و بۆ ماوەی ١٥ خولەك پێ دەگات و پاش لە پالاوتنی دەخورێت.

## ئۆرانج: ORANGE

**شێوەی دەرمان:** قەترەی خۆراکی.

**بەکارهێنان:** دژی خەمۆکی و بۆ کەمکردنەوەی پەستانی بەرزی خوێن و دژی قەڵەوی بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** پەستانی بەرزی خوێن.

**کاریگەری لاوەکی:** زیادبوونی قەبارەی میز.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژی ٣ جار هەر جارەی ١٠ قەترە پاش لە خواردن.

## پاسی –پای: PASY-PAY

**شێوەی دەرمان:** قەترە.

**بەکارهێنان:** هێورکەرەوەیە و شلکەرەوەی ماسولکەیە.

**بەکارنایەت:** تەمەنی خوار ٢ ساڵ سکپڕ و شیردەر و پێشینەی حەساسیەتی خۆراکی یان گیایی، ئەبێت ئیحتیات بکرێت لە شۆفێری و ئەو کارانەی پێویستیان بە هۆشیاری هەیە.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵویی لەکاتی بەکارهێنانی بڕی زیاد، کاریگەری هەرسی (سکچوون یان کرژبوون و ئازاری سك)، هێڵنجدان.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ١٠ قەترە ٣ جار لە ڕۆژێکدا و ٢٥ تا ٣٠ قەترە شەو کاتی خەوتن (لە کەسانی سەروی ٦٥ ساڵ بە بڕی دەرمانی کەم دەست پێ دەکات و بەتەدریجی زیاد دەکرێت. تەمەنی ٢ تا ٦ ساڵ ٦ قەترە ٣ جار لە ڕۆژێکدا و ١٠ قەترە شەو کاتی خەوتن.



## پێرفۆران: PERFORAN

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** دژی خەمۆکی، هێورکەرەوەیە و دژی شەقیقە بەکاردێت.

**ئیحتیات:** حەساسیەت بە گیاکان، سکپڕی و شیردەر.

کاریگەری لاوەکی: حەساسیەت، هەوکردنی پێست بەتیشکی خۆر.

**بڕی دەرمان:** ١ حەب لەگەڵ یەك پەرداخ ئاو ٣ جار لە ڕۆژێکدا.

## پێرسیکا: PERSICA

**شێوەی دەرمان:** قەترەی دەمشۆر.

**بەکارهێنان:** دژی ئازاری دەم و ددان و هەوکردنی دەم و خوێنبەربوون و نەخۆشی یەکانی پوکی ددان و چڵك و پیسبوونی ددان بەکاردێت.

**بەکارنایەت:** سکپڕ ی.

**کاریگەری لاوەکی:** حەساسیەت.

**بڕی دەرمان:** بڕی جیاوازی دەرمان ئاسایی ڕۆژی ٢ تا ٥ جار، هەر جارەی ١٠ تا ٤٠ قەترە دەکرێتە ١٥ سیسی ئاو و بۆ ماوەی ٢٠ چرکە دەمی پێ دەشۆردرێت.

## فایتۆکۆلد: PHYTOCOLD

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنان:** بۆچارەسەری سەرمابوون.

**بەکارنایەت:** لاوازی بەرگری لە سیل و ئایدز، نەخۆشی مێشکی و لیکۆزیس و نەخۆشی یەکان کلاجین. منداڵانی خوار ٥ ساڵ سکپڕ و شیردەر، ڕەبۆ.

**کاریگەری لاوەکی:** نارەحەتی جگەری، بلۆقکردنی پێستی، خوران، ئاوسانی دەم و چاو، کێشەکانی هەناسەدان، دابەزینی پەستانی خوێن و سەرگێژبوون.

**بڕی دەرمان:** گەورەکان ڕۆژی ٣ جار هەر جارەی ٢ حەب، منداڵان ٥ تا ١٢ ساڵ نیوەی بڕی دەرمانی گەورەکان.

